# تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێز

## بەرگی حەڤدەیەم

سوورەتەکانی

(الحج) و (المؤمنون)




عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# الحَجّ و المُؤمِنون


نووسینی: عەلی باپیر



دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٢ك - ٢٠٢١ز

٦٩٦ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەكی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَهَ إلاّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ آل عمران.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾﴾ النساء.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾﴾ الأحزاب .

أَمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلاَمُ اللَّه، وَخَيْرَ الْهَدِي هَدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[١].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - كە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین كتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفكرین و ڕامان، فێركردن، كارپێكردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەكەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

---

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەكرد، پێش هەر قسەیەكی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، الطّبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (**التحدّث بنعمة اللّه**) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (**متفرّغ**) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واته: وه زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆته خوار، تاكو ئه‌وه‌ی بۆ خه‌ڵكی نێرراوه‌ته خوار، بۆیان ڕوون بكه‌یه‌وه، وه به‌ڵكو خۆشیان بیربكه‌نه‌وه.

ئومێدیشم وایه - به یارمه‌تی خوای به‌خشه‌ر ﷻ - شایسته‌یی ئه‌وه‌م هه‌بێ ته‌فسیرو لێكدانه‌وه‌یه‌كی وا بۆ قورئان پێشكه‌ش به مسوڵمانانی كوردستان بكه‌م، كه له قورئان بوه‌شێته‌وه‌و، مایه‌ی به‌هره‌و سوودی خوێنه‌ران بێ، به‌تایبه‌تیش كه زیاتر له سی (٣٠) ساڵه له‌گه‌ڵ قورئانی به‌رزو مه‌زن و ته‌فسیره‌كانی و كتێبه‌كانی سوننه‌تدا خه‌ریكم و، ده‌یان كتێب و به‌رهه‌می جۆراوجۆرم له زۆربه‌ی بواره‌كانی زانسته‌كانی شه‌ریعه‌تدا پێشكه‌ش كردوون.

شایانی باسیشه كه ئه‌و بیست و دوو مانگ زیندانیی كرانه‌م له‌لایه‌ن ئه‌مریكاوه - له (٢٠٠٣/٧/١٠ تاكو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - ده‌رفه‌تێكی گه‌وره‌و گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونه‌وه‌ی كتێبی خوا (تبارك و تعالى)، وه بۆ په‌یدابوونی تێگه‌یشتنی تایبه‌ت له‌باره‌ی زۆرێك له ئایه‌ته‌كانی یه‌وه، ئه‌م ڕاستییه‌ش له مه‌وسووعه‌ی: (**الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى**)دا زۆر چاك دره‌وشاوه‌ته‌وه[1]، به‌ڵام هه‌ڵبه‌ته ناڵێم و هیچكه‌سیش بۆی نیه بڵێ: كه ئه‌م ته‌فسیره‌ی من تێروته‌واوه، چونكه وێڕای سنوورداربوونی تواناو بڕستم، له به‌رانبه‌ر كتێبی له هه‌موو ڕوویێكه‌وه ڕه‌ها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نه‌شمویستوه كه زۆر به‌ملاولادا بچم و بچمه نێو هه‌ندێك ورده‌كارییه‌وه، كه یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئه‌و مه‌وسووعه‌یه كه ئێستا چاپ كراوه‌و، كه‌وتۆته به‌رده‌ستی خوێنه‌ران و، سه‌رجه‌م هه‌شت به‌رگ و ده‌وری سێ هه‌زارو پێنج سه‌د (٣٥٠٠) لاپه‌ڕه‌یه‌و، هه‌وڵمداوه به‌گشتی تێیدا باسی سه‌رجه‌م لایه‌نه‌كانی ئیسلام بكه‌م و، تاكه سه‌رچاوه‌شم قورئان بووه، وێڕای ده‌قه‌كانی سوننه‌ت، كه له هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسه ئه‌و مه‌وسووعه‌یه له چاپی دووه‌می دا، كراوه به دوازده (١٢) كتێبی سه‌ربه‌خۆ، به مه‌به‌ستی ئاسانتر سوودلێ بینرانی.

شـــارەزا نیـم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قوڕئان تێبگات و، بزانێ خـوا (تبـارك وتعـالـی) ڕاستەوخۆ چـی پـێ فـــەرمووە؟!

ئنجا هـــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شـێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هـــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشـتـرین شـــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هـــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و ســەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیـرەماندا بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قوڕئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هـــەر ســـووڕەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی ســەربەخۆیـــەو، ســەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قوڕئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قوڕئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەشـدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســووڕەتەکان، بەرگــەکانی دیــاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵســۆزە ئێســـتاش پـاش تەواوکردنـی نیـوەی زیاتـری قوڕئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کـردوە، کـە ئەگـەر تەمەنمـان بـەردەوام بـێ، هەتـا کۆتـایی ئـەم تەفسیـرە سـەرگەرمی کارەکەی بێ.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرس و وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو، بەپێی پێویست دەستکارییم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە، ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکەییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هەولێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنـەری بەڕێز !**

هەرچـەندە لـە (پێشـەکی گشـتیی) ئـەم تەفسـیرەدا باسـمان کـردوە کـە بـۆ نووسـینی ئـەم تەفسـیرە، لـە هەمـوو ئـەو تەفسـیرە باوانـەی دەسـتم پێیـان گەیشـتوە، بەهرەمەندبـووم، هەروەهـا لـە کۆتایـی هـەر بەرگـێکی ئـەم تەفسـیرەدا، سـەرجەم ئـەو تەفسـیرانەی کـەم و زۆر لێیـان سـوودمەند بـووم، ناوەکانیانمـان بـە ڕیـز نووسـیون، بـەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیـاترو بەرچـاوڕوونیی باشـتر بـۆ ئێـوەی بەڕێـز دەڵێـم :

مـادام نـاوی تەفسـیرەکانمان نووسـیوە، نـە پێویسـت دەکات و نەدەشـگونجێ، بۆ هـەر تێگەیشـتن و بیـرۆکەیەك، کـە زۆربـەی تەفسـیرەکان لەبـارەی ئایەتێکـەوە، یان ڕسـتەو بڕگەیـەکی ئایەتێکـەوە، دەیهێـنین، ئێمـە هەمـوو جارێ نـاوی ئـەو تەفسـیرانە بێنیـن، بەڵام بێگومان هەر کات بیـرۆکەو تێگەیشـتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسـیرەکان هەبێ و بکەوێتـە بەرچـاوم، ئنجـا چ پەسـندی بکـەم، چ ڕەفـزی بکـەم، هـەر کات بـە پێویسـتی بـزانم، بـە تایبـەت ئامـاژەی پێدەکـەم، ئەگەرنـا بـە ئامـاژەی گشـتیی و بـە نووسـینی نـاوی تەفسـیرەکان لـە کۆتایـی هـەر بەرگێك دا، ئیکتیفـا دەکـەم و، زۆریش لـە ئەمانـەتی زانسـتیی (الأمانـة العلميـة) دەخەفـتێم و مەبەسـتمە ڕەچـاوی بکەم، چونکە ئەمینیـی و ئەمانـەت پارێـزیی، ڕەوشـتێکی گـەورەو بەرزی مسـوڵمانەتییە .

شایانی باسیشـە جاری وا هەیـە بیـرۆکەو تێگەیشـتنێکی تایبەتیـی خـۆمم، دەربارەی کۆمەڵـە ئایەتێـك یـان ئایەتێك یـان ڕسـتەو بڕگـەیەکی ئایەتێـك، بۆ دروسـت دەبێ،

وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

## پێشەکی ئەم بەرگە

**الحمدلله حق بحمده، والصلاة والسلام والبركات على عبده محمد، وآله السائرين على دربه .**

ستایشی شایستە بۆ خوای بەخشەری میهرەبان، پشتگیرو هاوکارو کارئاسانکارمان بوو کە ئەم بەرگی حەڤدەیەمە چاپ بکەین، کە بەش (جزء)ی حەڤدەیەمی پێکهاتوو کە لە هەردوو سوورەتی **(الحج والمؤمنون)** دەگرێتە خۆی.

شایانی باسە ئەم بەرگەش بە پێی نەخشەو بەرنامەمان لە کۆی ئەم تەفسیرەدا ئامادەکراوەو، وێڕای ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای ئایەتەکانی هەردووك سوورەتەکە بە حەوت قۆناغ، ئەم بەرگە ژمارەیەك کورتە باس و بابەتی دیکەشی گرتوونەخۆی ، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

**یەکەم : لە سورەتی (الحج) دا:**

١- کورتەباسێك: دوو هەڵوەستە لە بەرانبەر لەرزینەوەی زەوی و ماناکانی (ساعة)دا.

٢- چوار کورتە سەرنج.

٣- سێ هەڵوەستە لە بەرانبەر ئایەتی ژمارە (١٧) دا.

٤- پێنج هەڵوەستەی کورت.

٥- کورتەباسێك: حەوت هەڵوەستە.

٦- کورتە باسێك : لەبارەی حەج و عومرە.

٧- کورتە باسێك: تێفرێدانی شەیتان بۆ نێو مۆزگەی پێغەمبەران.

٨- دوازدە کردەوە و، شازدە سیفەتی بەرزو بێ وێنەی خوا.

**٩-** کورتە باسێك لە بارەی بنەڕەتی ژیانەوە.

**١٠-** کورتەباسێك: لە ئیسلام دا سەغڵەتکردن نیە.

**١١-** واتای بابایەتی ئیبڕاهیم .

**١٢-** کورتە باسێك: ناوی جگە لە (مسوڵمانان) لە ئێمە نەنراوە.

**دووەم: لە سورەتی (المؤمنون) دا :**

**١-** کورتە باسێك: لە بارەی چۆنیەتی دروست بوونی مرۆڤەوە.

**٢-** سەرنجێك لە گەردوون و مشوورخواردنی بەردەوامی خوا بۆی.

**٣-** کورتە باسێك لەبارەی بەرزەخەوە.

پێویستە ئەوەش بڵێم کە سوپاس و ستایش بۆ خوا، ئێستا دەستگەرمانە خەریکی چاپکردنی کۆی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەین، کە بە مەزەننە دەگەنە دەوری سی (٣٠) بەرگ و، هەر بەرگە بەش (جزء)ێکی قورئانی لە (٣٠) بەشەکەی بەردەکەوێ.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

١٤٤٢/٤/١٢ك

٢٠٢٠/١١/٢٧ز

هەولێر

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کە ١٥/ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣٩)ی کۆچییە، بەرانبەر ٢٠١٨/٥/٣١ زایینی، خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سوورەتی **(الحج)**.

## پێناسەی سوورەتی (الحج) و بابەتەکانی

پێناسەی سوورەتی **(الحج)** دەکەین، لە حەوت بڕگەدا:

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە تەنها یەک ناوی بۆ بەکارهێنراوە، ئەویش بریتیە لە **(الحج)**، کە لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ﷺ هەر وشەی **(الحج)** بۆ ئەم سوورەتە بەکارهێنراوەو، ناوێکی دیکەی بۆ بەکارنەهێنراوە بە پێی زانیاری من، لەو بارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: {**عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﷺ، يَقُولُ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ! أَفُضِّلَتْ سُورَةُ الْحَجِّ عَلَى سَائِرِ الْقُرْآنِ بِسَجْدَتَيْنِ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَمَنْ لَمْ يَسْجُدْهُمَا، فَلَا يَقْرَأْهُمَا**} **(أخرجه أحمد: ١٧٤٠٢، وغيره، تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن بطرقه، وشواهده، دون قوله: فَمَنْ لَمْ يَسْجُدْهُمَا، فَلَا يَقْرَأْهُمَا، وقال أحمد شاكر: إسناده صحيح)**.

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر ﷺ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا سوورەتی حەج بەسەر سوورەتەکانی دیکەی قورئاندا بەوە بەرزکراوەتەوە (پلەی

پێدراوە) لەو ڕووەوە کە دوو سەجدەی تێدان؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، هەر کەسێک دوو سەجدەکان نەبات، (واتە: سەجدەی قورئان خوێندن) با نەیانخوێنێ.

هۆی ناونرانی ئەم سوورەتە بە سوورەتی (**الحج**)، ئەوەیە کە خوا ﷻ لەم سوورەتەدا باسی حەج دەکات، کە فەرمانی بە ئیبراهیم کردوە جاڕ بدات بە نێو مرۆڤایەتییداو، خەڵک بانگ بکات بۆ زیارەت و سەردانی ماڵی خوا، کە پێی دەگوترێ: حەج.

## دووەم: جۆری ئەم سوورەتەو، شوێنی دابەزینی:

لەو بارەوە سێ ڕا هەن:

أ)- ڕای یەکەم: ئەم سوورەتە سوورەتێکی مەککەییە.

ب)- ڕای دووەم: ئەم سوورەتە سوورەتێکی مەدینەییە، واتە: لە مەدینە دابەزیوە، یان لە قۆناغی مەدینەدا دابەزیوە، با لە دەرەوەی مەدینەش دابەزیبێ.

ج)- ڕای سێیەم: ئەم سوورەتە، هەم سوورەتێکی مەککەییە، هەم مەدینەییشە، واتە: سوورەتێکی تێکەڵە.

منیش زۆر لێم کۆڵیەوەو سەیری تەفسیرەکانم کردو، بەڕای بەندە ئەم سوورەتە مەککەیی بوونی بەهێزترە، چونکە خوا ﷻ لە ئایەتی (٣٩)ی ئەم سوورەتەدا دەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ﴾، واتە: مۆڵەت درا بەوانەی کە شەڕیان لە دژ دەکرێ و، ستەمیان لێ دەکرێ، بێگومان خوا ﷻ لەسەر یارمەتییدان و پشتگیرییکردنیان بە توانایە، ئنجا لە مەدینە خوا ﷻ نەیفەرمووە: مۆڵەتە جەنگ بکەن، بەڵکو ئەوە پێش کۆچکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە بۆ مەدینە، کە مۆڵەت دراون، مسوڵمانان

بەرگریی لە خۆیان بکەن و، جەنگ لە دژی ئەوانە بکەن کە شەڕیان پێ دەفرۆشن و، موڵک و ماڵیان لێ زەوت کردوون و، لە زێدو نیشتیمانی خۆیان دەریانکردوون، واتە: لە مەدینە جەنگ پێویست کراوە، ئنجا لێرەدا دەفەرمووێ: مۆڵەت درا بەوانەی جەنگیان لە دژ دەکرێ، کە بەرگریی لە خۆیان بکەن، وەک دواییش لە تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتەدا باسی دەکەین، کە وا پێدەچێ ئەم سووڕەتە لە کۆتایی قۆناغی مەککەو، پێش دەستکردن بە قۆناغی مەدینە دابەزیبێ، هەر بۆیەش توێژەرەوانی قورئان مشت و مڕی زۆریان لەسەر ئەوە بووە، کە ئایا مەککەییە یان مەدینەییە؟! لە ڕاستییدا دەکەوێتە سەر سنوورو تخووبی هەردوو قۆناغی مەککەو مەدینە.

## سێیەم: ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە:

زانایان کە ڕاجیاییان هەیە، لە بارەی ژمارەی ئایەتەکانی هەندێک لە سووڕەتەکانەوە، ئەوە نیە کە یەکێکیان بڵێ: فڵان سووڕەت ئەوەندە ئایەتەیە، ئەوی دیکە بڵێ: نەخێر کەمترە، واتە: ڕستەیەک یان بڕگەیەک لە قورئان دا لەسەری ناکۆک بووبن! نەخێر، بەڵکو لە کورتیی و درێژیی ئایەتەکان، لە کوێ دەوەستی و لە کوێ دەست پێ دەکەیەوە؟، لەوەدا زانایان ڕاجیا بوون، نموونەیەکی سادە بێنمەوە: سووڕەتی (**الفاتحة**) کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ ﴾، هەندێکیان لەوێ وەستاون، ئەوەیان کردوە بە ئایەتێکی دیکە: ﴿ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾الفاتحة، بەڵام هەندێکیان هەموویان کردوە بە یەک ئایەت، ئا لێرەداو لەو حاڵەتانەدا ژمارەی ئایەتەکان جیاواز بووە.

ئنجا خەڵکی مەککەو مەدینە ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتەیان بە (٧٧) داناوە.

خەڵکی شام (یانی: زانایانی شام) بە (٧٤)یان داناوە.

خەڵکی بەسڕا بە (٧٥)یان داناوە.

خەڵکی کووفە بە (٧٨)یان داناوە.

(**فخر الدين الرازي**)یش بۆ خۆی بە تەنیا لە تەفسیرەکەی خۆیدا بە (٧٦)ی داناوە، بەڵام ئەو موصحەفانەی لە لای ئێمەومانانن و لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا، زیاتر باون، بە پێی خوێندنەوەی (**حفص** عن عاصم)، ئەو ڕایەیان تەبەننیی کردوە کە ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە (٧٨)ە.

## چوارەم: ڕیزبەندیی دابەزینی و ڕیزبەندیی لە (مصحف)دا:

ڕیزبەندیی لە موصحەفدا (٢٢)یە، واتە: سوورەتی (**الحج**) کە لە سوورەتی (**الفاتحة**)ەوە لە لای ڕاستەوە پێدا دێی، بیست و دوو (٢٢)ەمین سوورەتە، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزینیدا، زانایان ڕاجیاییان هەیە، بۆ وێنە: لێرەدا ئەم دەقە هەیە: (**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَزَلَتْ** (سورة الحج) **بَعْدَ سُورَةِ النُّورِ وَقَبْلَ سُورَةِ الْمُنَافِقِيْن**) وعن ابن الزبير مثله.[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ) ڕای وابووە کە سوورەتی (**الحج**) لە دوای سوورەتی (**النور**)و، پێش سوورەتی (**الْمُنَافِقِيْن**) دابەزیوە.

دیارە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس پێی وایە ئەم سوورەتی (**الحج**)ە مەدینەییە، چونکە هەر کام لە سوورەتی (**النُّورِ**) و (**الْمُنَافِقِيْن**) لە قۆناغی مەدینەدا دابەزیوون.

ئنجا بە پێی ئەم ڕایە ئەم سوورەتە بە سوورەتی سەدو پێنجەمین (١٠٥) لە ڕیزبەندیی دابەزیندا ئەژمارکراوە، کە هەموو قورئان (١١٤) سوورەتە، ئەم سوورەتەیان بە (١٠٥)ەمین داناوە.

---

(١) ذكره السيوطي في (الدر المنثور) (٣/٦)، ونسبها لابن مردويه، الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٢ ص٤٩٧.

بەڵام ژمارەیەکی دیکە لە زانایان کە پێیان وایە ئەم سوورەتە سوورەتێکی مەککەییە، ژمارەی (٩٠)یان بۆ داناوەو، گوتوویانە: لە دوای سوورەتی (**المطففين**) دابەزیوە، ئنجا ئەگەر (٩٠) بێ، کەمتر بێ، یان شتێک زیاتر بێ، گرنگ ئەوەیە ئەم سوورەتە وەک ئێمە ئەو ڕایەمان هەڵبژارد، زیاتر بە سوورەتە مەککەییەکان دەچێ، نەک بە سوورەتە مەدینەییەکان.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:

سوورەتی حەجییش هەمان نێوەڕۆکی سوورەتە مەککەییەکانی دیکەی هەیە، کە ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الأنعام**)دا، بە درێژیی باسی سروشتی سوورەتە مەککەییەکانمان کرد، لەبەر ئەوەی لە ڕیزبەندیی موصحەفدا یەکەمین سوورەت کە پێیگەیشتین سوورەتی (**الأنعام**) بوو، لە سوورەتە مەککەییەکان، هەرچەندە لە بارەی سوورەتی (**الفاتحة**)ەشەوە مشت و مڕ هەیە، کە ئایا سوورەتێکی مەککەییە، یاخود مەدینەییە؟ بەڵام بە هەرحاڵ لە سوورەتە گەورەکان و سوورەتە باوەکان کە سوورەتی مەککەیین، سوورەتی (**الأنعام**) یەکەمین سوورەت بوو، بۆیە لەوێ بە درێژیی قسەمان کردوە لە بارەی سروشت و نێوەڕۆک و چۆنیەتیی قوڕئانی مەککەییەوە، کە دیارە زۆربەی قوڕئان لە قۆناغی مەککە دابەزیوەو، بە ژمارە دەوری (٨٦) سوورەت مەککەیین و، (٢٨) سوورەتیش مەدینەیین، واتە: قوڕئانی مەککەیی دوو لەسەر سێی (٣/٢)ی هەموو قوڕئان زیاترەو، یەک لەسەر سێی (٣/١)یشی لە قۆناغی مەدینەدا دابەزیوە.

## قوڕئانی مەککەیی چەند تەوەرێك دەگرێتە خۆی:

**١)-** باسی خوا ﷻ، چ ناسینی خوا، وەک تاکە بەدیهێنەر، تاکە پەروەردگار، تاکە خاوەن، تاکە مشوورخۆرو، چ وەک پەرستنی خوا، بەندایەتیی بۆ خوا، بە مانای ئەوپەڕی بە

گەورە گرتنی و، ئەوپەڕی خۆشویستنی و، ئەوپەڕی ڕێزلێگرتنیی و، ئەوپەڕی پشت پێ بەستنی و، ئەوپەڕی ملکەچ بۆ کردنی و ... هتد.

٢)- باسی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی و، باسی بەسەرهاتی گەلانی پێشوو لەگەڵ پێغەمبەرەکانیاندا (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**).

٣)- باسی ڕۆژی دوایی و، ڕووداوەکانی ڕۆژی دوایی، بە ئاخیر زەمان (**الساعة**)و بە هەڵسانەوە (**القيامة**)شەوە، (**الساعة**) واتە: ئاخیر زەمان، ئەو کاتەی کە تۆماری ئەم ژیانە دنیاییەی تێدا دەپێچرێتەوە، (**القيامة**) واتە: هەڵسانەوە، قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی، هەرچەندە جاری واش هەیە وشەی (**الساعة**) بۆ کۆی ڕۆژی دوایی و، بە تایبەت بۆ قۆناغی هەڵسان و زیندوو کرانەوەش بەکارهاتوە، هەروەها باسی بەهەشت و دۆزەخ کە لەم سووڕەتەدا جەخت کراوەتەوە لەسەر بەهەشت و دۆزەخ.

٤)- باسی ڕەوشت و ئاکاری بەرزو پەسندو، پاشان باسی خوو خدەی خراپ، بە تایبەتی لەم سووڕەتی حەجدا، باسی شەڕە قسەو دمبەدمەو مشت و مڕی بێبڕوایەکان بە نەزانانەو ملهوڕانە، لە بارەی خوای پەروەردگارەوە، زۆر زەق کراوەتەوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە:

بەپێی سەرنج دانی من بۆ ئەم سووڕەتە، پێنج (٥) تایبەتمەندیی هەن، کە دەگونجێ زیاتریش بن و، دەگونجێ کەسێك هەندێک لەو پێنجانە بخاتەوە نێو یەک، ئەوە بۆ چوون و ئیجتیهادی بەندەیەو، من تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە، لە پێنج (٥) شتاندا دەبینم:

تایبەتمەندیی یەکەم: وا پێدەچێ ئەم سووڕەتە موبارەکە لە کۆتایی قۆناغی مەککەییدا هاتبێتە خوار، واتە: کەوتبێتە نێوان هەردوو قۆناغی مەککەو مەدینە، بۆیەش زۆرێک لە زانایان ئەو ڕایەیان هەڵبژاردوە، کە بڵێن: ئەم سووڕەتە، هەم مەککەییەو، هەم مەدینەییە، بە شێوەیەک کە هەندێک لە زانایان و

توێژەرەوانی قورئـان گوتوویانـە: زۆر زەحمەتـە بتوانیـن ئایەتـە مەککەییـەکان و مەدینەییەکانی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لێـک جیـا بکەینـەوەو، لێکیـان هەڵباوێریـن، بۆیـە گوتوویانـە: ئـەم سـوورەتە، هـەم مەککەییـەو، هـەم مەدینەییـە.

تایبەتمەندیـی دووەم: لـەم سـوورەتەدا زۆر بـە تۆخیـی باسـی خواناسـیی و خواپەرسـتیی لـە لایـەک و، ڕەفزکردنـی کوفـرو شـیرک لەلایەکـی دیکـەوە، کـراوە، بـا تەماشـا بکەیـن:

بـە لای کەمـەوە لـە حـەوت ئایەتانـدا باسـی خواناسـیی کـراوە، ئنجـا خواناسـیی چ وەک تاکـە بەدیهێنـەرو تاکـە پـەروەردگارو تاکـە خـاوەن و تاکـە مشـوورخۆرو تاکـە هەڵسـووڕێنەری کاروبـاری گـەردوون، چ وەک پەرسـتنی و بەندایەتیـی بـۆ کردنـی، ئەوانیـش ئـەم حـەوت (٧) ئایەتانـەن:

**١-** ئایەتی ژمارە شەش (٦) کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ﴾، واتە: ئەوەی باسی کرا بە هۆی ئەوەوەیە، کە بەس خوا هەقە، هەق، واتە: چەسپاو، کە پێچەوانەی هەق بریتیە لە (**باطل**) واتە: شتی پووچ و بێ نێوەڕۆک، هەر خوا هەقە، وەک لە کوردەواریی خۆشماندا دەڵێن: (هەر خوا خوایە، ئەوی دیکە هەمووی کاو بایە)، لە فەرمایشتی پێغەمبەریشدا هاتوە ﷺ فەرموویەتی: {**أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِر، كَلِمَةُ لَبِيدٍ: أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللهَ بَاطِلُ**} (**أخرجه أحمد: ١٠٠٧٦، والبخاري: ٣٦٢٨، ومسلم: ٢٢٥٦، وابن ماجه: ٣٧٥٧، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** ﷺ).

واتـە: ڕاسـترین وشـە کـە شـاعیر گوتوویـەتی، قسـەی لەبیـدە: ئاگاداربـن! هەمـوو شـتێک جگـە لـە خـوا پـووچ و بۆشـە، چونکـە هیـچ شـتێک بوونـی لـە خۆیـەوە نیـەو، هەمـووی خـوا بوونـی پێـداوە: ﴿رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠﴾ طـە، واتـە: پەروەردگارمـان ئـەو زاتەیـە کـە بوونـی بـە هەمـوو شـتێک داوە، دواییـش ڕێنمایـی کـردوەو خسـتوویەتە سـەر ڕێ، چـۆن بەڕێوەبچـێ.

٢- ئایەتی ژمارە (١٨) کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴾، کە خوا باسی ئەوە دەکات: هەموو شتێک کڕنووش بۆ خوا دەبات، هەموو ئەوانەی کە لە زەوی و لە ئاسمانەکاندا هەن، باسی هەموو دروستکراوەکان دەکات، هەموویان بۆ خوا ﷻ ملکەچن و، کڕنووشی بۆ دەبەن.

٣- ئایەتی (٢٨) کە دەفەرموێ: ﴿ لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ ﴾، واتە: با خەڵک بێن بۆ حەج تاکو چەند سوودو کەڵکێک ببینن، بەهرە وەربگرن و، یادی خوا بکەن، لە ڕۆژانێکی دیارییکراودا.

ئەمەش باسی خواپەرستییە.

٤- ئایەتی ژمارە (٣٠) کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ﴾، واتە: ئەوە بەو شێوەیە کە باسکراو، هەر کەسێک حورمەتەکانی خوا (واتە: ئەو شتانەی کە خوا حورمەتی لێناون) بە مەزن بگرێ، ئەوە بۆ ئەو زۆر باشترە.

٥- ئایەتی ژمارە (٣٢) کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴾، واتە: ئەوە بەو شێوەیەو هەر کەسێک دروشمەکانی خوا بە مەزن بگرێ{و، ڕێزیان لێبگرێ و، بەرزیان ڕابگرێ} ئەوە نیشانەی هەبوونی تەقوایە لە دڵ و دەروونیدا.

٦- ئایەتی ژمارە (٣٥) کە دەفەرموێ: ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾، واتە: موژدە بدە بەو بۆ خوا ملکەچانەی کە کاتێک یادی خوا بکرێ، دڵییان ڕادەچڵەکێ (ڕادەچەنێ).

٧- ئایەتی ژمارە (٦٢) کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴾، واتە: ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەس خوا هەقەو، ئەوەی کە لە جیاتی خوا لێی دەپاڕێنەوە، ئەو پووچەو بۆشە (بێ نێوەڕۆکە).

لەوانەیە بگونجێ لەم سوورەتەدا شوێنی دیکەش دەست نیشان بکرێن، کە خوا ﷻ تێیاندا باسی خواناسیی و خواپەرستیی دەکات.

هەروەها لە چەند شوێنێک لەم سوورەتەدا، باسی کوفرو شیرکیش کراوە:

أ- لە ئایەتی ژمارە (٢٥) دەفەرمویێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ٱلَّذِي جَعَلۡنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی کە بێبڕوان و، خەڵک لە ڕێی خوا لادەدەن، لە ڕێی ئەو مزگەوتە حەڕامەوە کە خوا دایناوە، ئەوەی کە لەوێ نیشتەجێیەو ئەوەش کە لە دەرەوە دێ، هەموویان تێیدا یەکسانن و، هەر کەسێک بیەوێ ستەم و ئیلحادو لادانی تێدا بکات، سزایەکی بە ئازاری پێ دەچێژین.

ب- لە ئایەتی ژمارە (٣١)دا دەفەرمویێ: ﴿وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ﴾، واتە: هەر کەسێک هاوبەش بۆ خوا دابنێ، وەک ئەوە وایە لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوارەوەو، باڵندە تێی ڕۆ هاتبن و دەستیان دابێتێ و بیخۆن، ﴿أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ﴾، یان وەک کەسێکە کە با بیڕفێنێ بەرەو شوێنێکی دوور (بەرەو چاڵێکی قووڵ).

کەسێک کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێ سەرەنجامەکەی ئاوایە، لە دنیاو لە دواڕۆژیشدا.

ج- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٧٣)شدا، خوا ﷻ وێنەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێش دێنێتەوە بۆ بێ دەستەڵاتیی ئەو پەرستراوانەی کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، کە دەفەرمویێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾، واتە: ئەی خەڵکینە! وێنەیەک هێندراوەتەوە گوێی بۆ هەڵخەن، ئەوانەی لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوەو دەیانپەرستن، هەرگیز ناتوانن مێشێک دروست بکەن، {نەک هەر ناتوانن مێشێک دروست بکەن}

بەڵکو ئەگەر مێشیش شتێکیان لێ بستێنێ، ناتوانن لێی بستێننەوەو، لە دەستی قوتارو دەربازی بکەن، هەم ئەوەی کە بە دوای {مێشەکە} دەکەوێ {کە شتەکەی لێ بستێنێتەوە} بێهێزە {لە بەرانبەر مێشەکەداو، بێ چارەیەو دەستەوەستانە، شتەکەی پێ لێ ناستێنرێتەوە}و هەم داوا لێکراوەکەش {کە مێشەکەیە ئەویش} هەر بێهێزە.

د- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٧٤)دا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ ﴾، واتە: وەک بۆ خوا شایستەیە، ڕێزیان لە خوا نەگرتوە، {قەدری خوایان نەزانیوە}.

ئەگەر قەدری خوایان زانیبایە، تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنە، هەر ئەویشیان بە پەرستراوو بەبەندایەتیی بۆ کراوی خۆیان دادەنا.

تایبەتمەندیی سێیەم: ئەوەیە کە لەم سوورەتە موبارەکەدا، پانتاییەکی باش بۆ باسی ڕۆژی دوایی و زیندووکرانەوە تەرخانکراوە:

١- لە سەرەتای ئەم سوورەتەدا کە ئاوا دەست پێدەکات، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ١ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢ ﴾، خوا ﷻ بانگی مرۆڤایەتیی دەکات و هۆشدارییان پێ دەدات کە لەرزینەوەو هەژان و ڕاتەکێنرانی زەوی لە ئاخیر زەماندا شتێکی زۆر مەزنە، کە بە تەئکید مەبەست لە (ٱلسَّاعَةِ) ئاخیر زەمانە، ئەگەرنا (**ساعة**) بە مانای ڕۆژی دواییش دێ، دیمەنی وای تێدا هەن، هەرگیز نەتانبینیون:

أ- ئافرەتێک کە شیر دەدات بە منداڵەکەی، لە کاتی شیرپێدانیدا لە هەژمەتی ئەو ڕۆژە، لە کۆرپەی شیرەخۆری خۆی بێ ئاگا دەبێ.

ب- هەموو ئافرەتێک کە منداڵی لە سک دایە، منداڵەکەی لەبەردەچێ.

ج- خەڵک دەبینی وەک سەرخۆش وان، کەچی سەرخۆش نین، بەڵام سزای خوا توندە.

**٢-** ئایەتەکانی (٥ و ٦ و ٧) کە خوا ﷻ باسی زیندوو بوونەوەو، باسی ژیاندنەوەی بۆ مردووان دەکات، دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴾.

واتە: ئەی خەڵکینە! ئەگەر لە دوو دڵییدان، لە هەڵسێنرانەوەو زیندوو کرانەوەدا، {بە هەڵەداچوون} چونکە ئێمە ئێوەمان لە گڵ دروست کردوە، سەرەتای پێکهاتەی جەستەی ئێوە لە گڵە، دوایی دەبێتە نوتفەو دەبێتە عەلەقەو دەبێتە **موضغە، ئنجا** دەبنە منداڵ و لە منداڵدانی دایکتان دێنە دەرێ و، دواییش پێدەگەن و دەگەنە تۆغیان و قۆناغی هێزو پێزی خۆتان، ئنجا هەشتانە پێشتر دەمرێ، هەشتانە دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنێکی پیریی کەنەفت.

دوایی لە ئایەتی شەشەم (٦)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، ئەوەش بە هۆی ئەوەوەیە کە بەس خوا هەقەو، مردووانیش زیندوو دەکاتەوە.

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٧)یش دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ ﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانەی لە گۆڕەکاندان، دەریان دێنێتەوەو هەڵیان دەستێنێتەوە.

**٣-** هەروەها ئایەتەکانی: (٥٥ و ٥٦)ن، کە تێیان دا باسی ڕۆژی دوایی کراوە، لە ئایەتی (٥٥)دا دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً ﴾، هەتاکو ڕۆژی ئاخیر زەمانیان کت

و پڕ بەسەر دادێ، ئنجا لە ئایەتی (٥٦)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡۚ﴾، لەو ڕۆژەدا دەستەڵات و موڵک و دەسترۆیشتوویەتیی، هەمووی هی خوایەو، خۆی دادوەرییان لە نێواندا دەكات.

٤- ئایەتی ژمارە (٦٣) كە خوا تێیدا دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصۡبِحُ ٱلۡأَرۡضُ مُخۡضَرَّةًۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ﴾، كە ئەم مەبەستە لە ئایەتی ژمارە (٤)ی سەرەتای سوورەتی (**الحج**)یشدا هاتوە، كە دەفەرموێ: ئایا سەرنج نادەی خوا لەسەرێوە ئاوی دابەزاندوە! هەر ئەوەندە دەبینی زەوی سەوز هەڵدەگەڕێ، واتە: پڕ دەبێ لە ڕووەک و شینایی و دارو درەخت، یانی: بە هەمان شێوەش، خوا ﷻ وەک چۆن ئەو زەوییە مردووە، ڕەق هەڵاتوو وشک و برینگەی زیندووكردۆتەوە، بەهۆی بارانەوە، بەهەمان شێوەش دەتوانێ ئێوە زیندوو بكاتەوە.

٥- ئایەتی ژمارە (٦٦) كە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۗ﴾، واتە: خوا ئەو زاتەیە كە ئێوەی ژیاندوە (ژیانی پێداون) دواییش دەتانمرێنێ، دواییش زیندووتان دەكاتەوە.

٦- ئایەتی ژمارە (٦٩) كە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، واتە: خوا لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا دادوەرییتان لە نێواندا دەكات.

وەک گوتمان: ئەم سوورەتە بەڕاستیی پانتاییەكی زۆری تێدا تەرخانكراوە، بۆ باسی ئاخیر زەمان و ڕۆژی دوایی بە گشتی و، هەڵسانەوەو زیندووكرانەوە بە تایبەت.

تایبەتمەندیی چوارەم: ئەم سوورەتە (**الغزنوي**) گوتوویەتی، وەک زۆربەی تەفسیرەكان لێیان نەقڵ كردوە، بە تایبەت (**الشوكاني**) لە (**فتح القدير**)دا دەڵێ: {**قَالَ الْغَزْنَوِيّ: وَهِيَ مِنْ أَعَاجِيب السُّوَرِ، نَزَلَتْ لَيْلًا وَنَهَارًا، سَفَرًا وَحَضَرًا، مَكِّيّاً وَمَدَنِيّاً، سِلْمِيّاً وَحَرْبِيّاً، نَاسِخاً وَمَنْسُوخاً، مُحْكَماً وَمُتَشَابِهاً**}[1].

---

(١) ج٣، ص ٥٣١.

واتە: غەزنەویی دەڵێ: ئەم سوورەتە یەكێكە لە سوورەتە سەرسوڕهێنەرەكان، هەم بە شەوێدا دابەزیوە، هەم بە ڕۆژ، (هەندێك لە ئایەتەكانی بە شەو دابەزیون و هەندێك بە ڕۆژ)، هەندێكیان لە سەفەر دابەزیون، هەندێكیان لە كاتێكدا كە پێغەمبەر ﷺ نیشتەجێ بووە (و لە سەفەر نەبووە)، هەندێكیان لە مەككەو هەندێكیان لە مەدینە، هەندێكیان باسی ئاشتیی و ئاشتەوایی دەكەن و، هەندێكیان باسی جەنگ و ڕووبەڕووبوونەوە دەكەن، هەندێكیان نەسخ كەرەوەن و، هەندێكیان نەسخ كراوەن (ئەوە بەڕای وی)، هەندێكیان موحكەم و ڕۆشنن و، هەندێكیشیان زیاتر لە مانایەكیان هەیە، یاخود مانای لێكچوویان هەن.

تایبەتمەندیی پێنجەم و كۆتایی: ئەم سوورەتە لە نێو هەموو سوورەتەكانی قورئاندا، دوو سەجدەی قورئان خوێندنی تێدان.

لەو بارەوە چەند شوێنەوارێكی گێڕدراونەوەو، لەبەرئەوەی سەنەدەكەیان بەهێز نیە نەمهێنان، بەڵام (الشوكاني) لە (فتح القدير)دا دەڵێ: {**وَقَدْ رُوِيَ عَنْ كَثِيرٍ مِنَ الصَّحَابَةِ أَنَّ فِيهَا سَجْدَتَيْنِ، وَبِهِ يَقُولُ ابْنُ الْمُبَارَكِ وَالشَّافِعِيُّ وَأَحْمَدُ وَإِسْحَاقُ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ فِيهَا سَجْدَةً وَاحِدَةً، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانُ الثَّوْرِي، وَأَخْرَجَهُ ابْنُ أَبِي شَيْبَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ وَإِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ**}[1].

شەوكانیی دەڵێ: لە زۆر لە هاوەڵان گێڕدراوەتەوەو لێیانەوە هاتوە، كە ئەم سوورەتە موبارەكە دوو كڕنووش بردنی تێدان، (واتە: كڕنووش بردنی قورئان خوێندن) {كە ئایەتی ژمارە (١٨) و (٧٧)ن} ئەوە ڕای عەبدوڵلای كوڕی موبارەك و شافیعیی و ئەحمەدو ئیسحاقە ڕەحمەتی خوا لە هەموویان، هەندێكیشیان گوتوویانە: ئەم سوورەتە یەك كڕنووشی تێدایە (یەك شوێنی كڕنووش بردن)، ئەویش ڕای سوفیانی سەوریی و، ئیبنو ئەبی شەیبەیە كە لە عەبدوڵلای كوڕی عەبباسەوە هێناویەتی، هەروەها لە ئیبراهیمی نەخەعییشەوە كە یەكێكە لە زانایانی تابیعیین هێناویەتی.

---

(١) ج٣، ص ٦٢١.

ئەمانە ئەو پێنج تایبەتمەندییەی ئەم سوورەتە بوون، کە دەگونجێ زیاتریشی لێ باس بکرێن.

## حەوتەم: دابەشکردنی دەرسەکان:

ئێمە کۆی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە: واتە: هەر (٧٨) ئایەتەکەمان بۆ شەش دەرس دابەش کردووە:

دەرسی یەکەم: ئایەتەکانی: (١ - ١٦)، باسی ڕۆژی دواییە، بە تایبەت ئاخیر زەمان و، باسی زیندوو کرانەوەو، بەڵگە هێنانەوە لەسەر زیندوو کرانەوەو، هەڵسانەوە، پاشان باسی چوار جۆرە کەس و، هەڵوێستیان لە بەرانبەر خواو ڕۆژی دواییدا:

١- کەسانێک کە کوێرانە بەدوای کەسانێکی شەیتان سیفەتی هەڵگەڕاوەو یاخیی لە خوا دەکەون.

٢- کەسانێک کە مشت و مڕ دەکەن لە بارەی خواوە بە نەزانانە، بە بێ زانیاریی و ڕێنمایی و بێ کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەو، دەبنە سەرمەشق و سەرقافڵە بۆ گومڕاکردنی خەڵک و، دوورخستنەوەیان لە خوا.

٣- کەسانێک کە خۆیان بە کەلادا خستوەو لەسەر قەراغن، ئەگەر خێرو خۆشیان تووش بوو، ئەوە دڵ ئاسوودە دەبن و، ئەگەر گرفتاریی و ناڕەحەتییەکیان تووش بوو، هەڵدەگەڕێنەوە.

٤- کەسانێکی بڕواداری کردار باش.

دەرسی دووەم: ئایەتەکانی: (١٧ - ٢٤) واتە: هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی ملکەچیی هەموو دروستکراوەکان بۆ خوا ﷻ و، باسی سزای سەختی بێبڕوایان و، پاداشتی بەرزی بڕواداران.

دەرسی سێیەم: ئایەتەکانی: (٢٥ - ٣٧) واتە: سێزدە (١٣) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی مزگەوتی حەڕام و کەعبەو، دانرانی حەج لە لایەن ئیبڕاهیمەوە بە فەرمانی خواو، جاڕدانی ئیبڕاهیم بە فەرمانی خوا بە نێو مرۆڤایەتییدا، کە بێن بۆ سەردانی ماڵی خواو، ئاماژە بە هەندێک لە خوا پەرستییەکانی حەج و، باسی خراپیی شیرک و سزای سەختی شیرک و، باسی ڕەوشتی بەرزیی خواناسان و، حیمکەتی خواپەرستییەکان، بە تایبەت خواپەرستییەکان (**مناسك**)ی حەج.

دەرسی چوارەم: ئایەتەکانی: (٣٨ - ٤٨)، واتە: یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی مۆڵەت درانی مسوڵمانان بە جەنگ و، بەرگریی لە خۆ کردنیان و، بەڵگەو پاساوی جەنگ و جیهاد، بۆچی خوا ڕێی داوە بە مسوڵمانان دەستەوکەریی بکەن و، بەرگریی لە خۆیان بکەن و، جەنگ و جیهاد بکەن؟ ئنجا ئامانجی ڕێپێدران و، پاشان پێویستکرانی جەنگ و جیهاد؟ هەروەها باسی سەرەنجامی شوومی گەلانی بێبڕوای پێشوو، هەروەها باسی پەلەکردنی بێبڕوایان لە هاتنی سزای خوا ﷻ کە هاتنی سزای خواش مسۆگەرە، بەڵام ڕۆژێک لە لای خوا بە قەدەر هەزار (١٠٠٠) ساڵی ئێمەیە، واتە: پێوەری کات لە لای خوا ﷻ جیایە، وەک لە لای مرۆڤەکان، ئەوەی کە ئەوان پێیان وایە درەنگە لە لای خوای پەروەردگار بە جۆرێکی دیکە تەماشا دەکرێ، بۆیە کە زوو سزایان نادات، خوا ﷻ پەلەی نیە.

دەرسی پێنجەم: ئایەتەکانی: (٤٩ - ٦٦)، واتە: هەژدە (١٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، باسی ئەوەیە کە موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایەو، بۆ هەموو بەشەر ڕەوانەکراوەو، ئاماژە بە سەرەنجامی بڕوادارو، بێبڕوایان لە ڕۆژی دواییداو، باسی هەوڵدانی شەیتان لە دژی پێغەمبەر ﷺو، ئایەتەکانی خواو ﷻ، باسی گەورەیی و پلەو پایەو پاداشتی کۆچ کردن لە ڕێی خوادا (واتە: بەجێ هێشتنی زێدو خەڵک و وڵات) و، باسی درەوشانەوەی کۆمەڵێک لە سیفەتە بەرزەکانی خوا لە ئاوێنەی دیمەنی دروستکراوەکانیداو، خستنە ڕووی کۆمەڵێک لە چاکەو بەخششەکانی خوا لە ژیانی مرۆڤدا.

دەرسی شەشەم: ئایەتەکانی: (٦٧ - ٧٨) واتە: دوازدە (١٢) ئایەت دەگرێتەوە، باسی ئەوە کە خوا ﷻ بۆ هەر ئۆممەتێک کۆمەڵێک خوا پەرستیی و دروشمی داناون، دیارە هەموو ئۆممەتان لە کۆمەڵێک خوا پەرستیی و دروشمدا بەشدارن، وەک نوێژو ڕۆژووو دوعاو هتد...، بەڵام هەر ئۆممەتەش بە فۆرم و شێوازێکی تایبەت خوا پەرستییەکانی بۆ دانراون و، ڕەنگە هەندێکیشیان تایبەت کرابن بە هەندێک خواپەرستییەوەوە باسی چۆنیەتی مامەڵەکردنی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ کافرانی شەڕە قسەکەرو مشت و مڕکەرداو، باسی چەند هەڵوێستێکی زەق و ڕەقی موشریکەکان و، وێنە هێنانەوەی خوا ﷻ بە مێشە ڕەشە، کە ئەگەر مێشێک - کە زیندەوەرێکی بچووکی بێهێزە - شتێکیان لێ بستێنێ لە پەرستراوەکانیان، یان لە خۆیان، بۆیان لێ ناستێندرێتەوە، کەواتە: بزانن ئێوە چەند بێ دەستەڵاتن، نەک لە بەرانبەر خوادا، بەڵکو لە بەرانبەر دروستکراوێکی بێهێزو نابووتی خوادا، کە مێشە ڕەشەیە!

هەروەها باسی هەڵبژاردنی خوا ﷻ بۆ هەندێک لە فریشتەکانی و پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) وەک نوێنەری خۆی و، پاشان خستنە ڕووی کۆمەڵێک ڕێنمایی گەورەو گرنگ بۆ بڕواداران کە سەرجەم هەشت (٨) فەرمان و، شەش (٦) ڕاستیی مەزنیان تێدان، واتە: خوای پەروەردگار چواردە (١٤) شتی خستوونە ڕوو، وەک ڕێنمایی و بەرچاو ڕوونکردنەوە بۆ بڕواداران، بە تایبەت لە دوو ئایەتی کۆتایی دا، ئایەتەکانی: (٧٧و ٧٨) سووڕەتی (**الحج**).

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە شـازدە (١٦) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (**الحـج**) پێـک دێ، کـە ئێمـە لـە حـەوت بڕگـەداو قۆنـاغ بـە قۆنـاغ دەسـت دەکەیـن، بـە شـیکردنەوەو ڕوونکردنـەوەی مانـاو مەبەسـتەکانی ئـەو شـازدە (١٦) ئایەتـە موبارەکـە.

خـوای بـەرزو مـەزن لـەم شـازدە ئایەتـەدا دوو جـاران بـە ناوونیشـانی: ئـەی خەڵکینـە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾! بانگـی مرۆڤایەتیـی دەکات و، لـە بـارەی هاتنـی لەرزینـەوەو هـەژان و تێکـەوە ڕاشـەقانی زەوی لـە ئاخیـر زەمانـدا، پاشـان لـە بـارەی زیندووکرانـەوەوە، دەیاندوێنـێ و، دوو جـۆرە بەڵگـەی سـەرەکییان لەسـەر زیندووکرانـەوە، کـە لـەلای خـوا ﷻ شـتێکی سـێنایە، بـۆ دەخاتـە ڕوو:

بەڵگـەی یەکـەم: چۆنیـەتی دروسـت بوونیـان لـە خـاک، دوایـی نوتفـە، دوایـی عەلەقـە (خوێـن پـارە)، دوایـی پارچـە گۆشـتێکی هێنـدەی زارجـوو (**مضغـة**)، ئنجـا قۆناغـەکانی دیکـە، دوایـی لـە دایـک بوونیـان و، پاشـان پێگەیشـتنیان و بڕینـی قۆناغـەکانی دیکـەی تەمەنیـان، خوایـەک ﷻ توانیبێتـی لـە گڵێکـەوە، پاشـان لـە نوتفەیەکـەوە تـۆ دروسـت بـکات، ئـەی مـرۆڤ! ئایـا ناشـتوانێ کـە بوویـەوە بـە گڵ، جارێکـی دیکـە دروسـتت بکاتـەوە؟!

بەڵگـەی دووەم: زینـدوو بوونـەوەی زەوی بـە ڕووەک و شـینایی، پـاش وشـک هەڵگـەڕان و سـوورو سـەقەتاڵە بـوون و، قاقـڕو دێمـەکار بـوونی، خـوا ئـاوی دەنێرێتـە سـەر، بـە هەرسـێ شـێوەکانی بـاران و بەفـرو تـەرزە، ئیـدی دوایـی دەبینـی ئـەو زەوییە وشـک و قاقـڕو دێمـەکارو بـێ ڕووح و بـێ ژیانـە، دەسـت دەکات بـە جووڵـە، دەسـت دەکات بـە گەشـە، پاشـان ڕووەک و شـیناوردو دارو درەخـت و میوەجـات و گـوڵ و گوڵـزارو، چەنـدان جـۆرە ڕووەکـی تێـدا پەیـدا دەبـێ، بـە هەمـان شـێوە ئێـوەش

کە مردن، وەک خوا ﷻ چۆن ئەو زەوییە مردووە زیندوو دەکاتەوە، دەتوانێ ئێوەش بە هەمان شێوە دەربهێنێتەوە.

هەروەها خوای زاناو توانا لەم ئایەتە بەپێزانەدا، باسی چوار جۆرە کەس و سەرەنجامیشیان دەکات:

١- بابایەکی لاساکەرەوەی شەیتان و، شەڕە قسەکەرێکی نەزان.

٢- بابایەکی مشت و مڕکەر لە بارەی خواوە بەبێ زانیاریی و، بەبێ ڕێنمایی و بەبێ کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەو، گومڕاکردنی خەڵک و لە ڕێ خوا لادانیان.

٣- بابایەکی بە ڕواڵەت خواپەرستیی بە لەقەلەق و هەلپەرست و لەسەر تەل، هەر شتێکی بە دڵ نەبێ هەڵدەگەڕێتەوە، خۆی بە کەلا داخستوە.

٤- ئیماندارێکی کردەوە باش.

کە بێگومان هەر کامێک لەو چوار جۆرە مرۆڤە، سەرەنجامێکی پڕ بە پێستی خۆی لە لایەن خوای دادگەرو کارزانەوە بۆ دیاریی کراوە.

هەروەها خوای باڵا دەست ئەوەش دەخاتە ڕوو کە ناحەزانی خواو، بەرنامەکەی و، پێغەمبەرەکەی ﷺ، جگە لە خۆ فەوتاندن، هیچی دیکەیان لە دەست نایەت، ئەوەی کە لە دەستیان دێ، هەر ئەوەیە کە خۆیان بفەوتێنن، چ بە ویستی خۆیان، چ بە هۆی ئەو کوفرو شیرک و بێبڕواییەوە، کە دەیکەنە پیشە، کە لە ئەنجامدا سەریان بە فەتارەت دەدا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٞ ١ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ٢ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَٰنٖ مَّرِيدٖ ٣ كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ٤ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٖ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٖ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلٗا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٖ شَيْـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجِۢ بَهِيجٖ ٥ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ ٦ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي ٱلْقُبُورِ ٧ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ٨ ثَانِيَ عِطْفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ٩ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلْعَبِيدِ ١٠ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٖۖ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ١١ يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ١٢ يَدْعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦۚ لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ ١٣ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ١٤ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ١٥ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يُرِيدُ ١٦﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، هۆ خەڵكینە! پارێز لە (سزای) پەروەردگارتان بكەن، بە دڵنیایی لەرزینەوە (و ڕاشەقاندنی زەوی) لە ئاخیر زەماندا شتێكی مەزنە ﴿١﴾ لە ڕۆژێكدا ئەو (ڕووداو)ە (سامناكە) دەبینن، هەر ژنێكی شیردەر لە كاتی شیر پێداندا، ئاگای لە شیر پێدراوەكەی نامێنێ و، هەر ژنێكی خاوەن تۆڵ، تۆڵەكەی (كۆرپەكەی) دادەنێ و، خەڵك بە سەرخۆشیی دەبینی و سەرخۆشیش نین، بەڵام سزاو ئازاری خوا سەخت و بێڕەزایە ﴿٢﴾ بابای وا هەیە لە خەڵكی كە بەبێ زانیاریی لە بارەی خواوە، (شەڕە قسەو) مشت و مڕ دەكات و، بە دوای هەموو شەیتانێكی یاخیی (و سەركێش) دەكەوێ ﴿٣﴾ (كە بە پێی سیستمی خوا) لە سەری نووسراوە: هەر كەس دۆستایەتیی بكات گومڕای دەكات و، بەرەو ئازارو سزای كڵپە (ی ئاگری دۆزەخ) دەیبات ﴿٤﴾ ئەی خەڵكینە! ئەگەر لە بارەی زیندوو كرانەوەوە لە دوو دڵییدان، (بە هەڵەداچوون! چونكە) ئێمە لە گڵ دروستمان كردوون، دوایی لە نوتفەیەك، ئنجا لە خوێن پارەیەك، ئنجا لە پارچە گۆشتێكی زارجوو ئاسای بیچم و شێوەدارو، بێ بیچم و شێوە، تاكو بۆتان ڕوون بكەینەوە (لە كوێوە هاتوون و چۆن دروست بوون!) هەروەها ئەوەی بمانەوێ (ببێتە مرۆڤ) تاكو كاتێكی ناوبراو (دیارییكراو) لە نێو منداڵدانانندا سەقامگیری دەكەین، دوایی لە حاڵەتی (كۆرپەی) منداڵدا دەتانهێنینە دەر، پاشان دەگەنە قۆناغی تین و تاقەتتان، هەشتانە دەمرێندرێ و هەشتانە دەگێڕدرێتەوە خراپترین تەمەن (پیرو كەنەفت دەبێ)، تاكو سەرەنجام دوای ئەوەی زانیاریی هەبووە، هیچ نەزانێ، هەروەها (بەڵگەیەكی دیكە لەسەر ئاسانیی زیندوو كرانەوەتان لەلایەن خواوە ئەوەیە كە) زەوی بێ ڕووەك بێ جووڵە دەبینی، بەڵام هەر كە ئاومان بەسەردا ناردە خوار، جووڵە جووڵی كردو پۆز بووو،

لە هەر ڕووەکێکی بە ڕەونەق و دڵ پشکوێنەری ڕواند ﴿٥﴾ بۆیە ئەوەشمان بۆ خستنە ڕوو، تاکو بزانن کە بەس خوا هەقەو، کە مردووان دەژیێنێتەوەو، کە لەسەر هەموو شتێکیش توانایە ﴿٦﴾ هەروەها کە (دڵنیا بن) ئاخیر زەمان دێ، گومانی تێدانیە، هەروەها کە (بزانن) خوا ئەوانەی لە گۆڕەکاندان زیندوویان دەکاتەوە (دەریان دێنێتەوە) ﴿٧﴾ هەروەها بابای وا هەیە لە خەڵکی کە بەبێ زانیاریی و، بەبێ ڕێنمایی و، بێ کتێبێکی ڕوونکەرەوە، لە بارەی خواوە (شەڕە قسەو) دمبەدمە دەکات ﴿٨﴾ بە فیزەوە خۆی با دەدات (خۆی دەنووشتێنێتەوە) تاکو (خەڵکی) لەڕێی خوا گومڕا بکات، لە دنیادا دووچاری ڕیسوایی دەبێ و، لە ڕۆژی هەڵسانەوەش دا سزای سووتێنەری پێ دەچێژین ﴿٩﴾ (پێی دەڵێین:) ئەو (سزایە) بە هۆی ئەوەوەیە کە دەستەکانت (کردوویانەو) پێشیان خستوەو، (دڵنیا بە) کە خوا ستەم لە بەندەکانی ناکات ﴿١٠﴾ هەروەها لە خەڵکی، بابای وا هەیە لەسەر قەراغ خوا دەپەرستێ (بە کەلادا دەکەوێ)، ئنجا ئەگەر چاکەی تووش بوو، پێی دڵ ئاسوودە دەبێ، بەڵام ئەگەر بەڵایەکی تووشبوو، (پاشەو پاش) لەسەر ڕووی هەڵدەگەڕێتەوە (سەرەنجام) دنیاو دواڕۆژان لە دەست دەدات، ئا ئەوەشە زیانباریی ڕوون ﴿١١﴾ (لە جیاتی خوا) لە کەسێک دەپاڕێتەوە کە نە زیانی لێ دەدات و، نە سوودی پێ دەگەیەنێ، ئا ئەوەشە گومڕایی دوور ﴿١٢﴾ لە کەسێک دەپاڕێتەوە کە زیانی لە سوودی نزیکترە: ئا ئەوەیە خراپترین دۆست و خراپترین هاوەڵ ﴿١٣﴾ بە دڵنیایی خوا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان کردوون، دەخاتە چەند باغ و بێستانێکەوە، کە ڕووباریان بەژێر (کۆشکەکان)دا دەڕۆن، بێگومان خوا ئەوەی بیەوێ دەیکات ﴿١٤﴾ هەر کەس پێی وایە خوا لە دنیاو دواڕۆژدا سەری ناخات (یان پێغەمبەرەکەی سەرناخات)، با پەتێک بۆ سەقف درێژ بکات و پێیەوە ببەستێ و، خۆی هەڵبواسێ و نەفەسی خۆی ببڕێ، ئنجا با سەرنج بدات، ئایا فێڵەکەی، ئەوەی ڕقی لێدەبێتەوە لای دەبات؟ ﴿١٥﴾ بەو شێوەیەش ئایەتە ڕۆشنەکانمان دادەبەزێنین و، بە دڵنیایی خوا هەر کەس بیەوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ ﴿١٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(زَلْزَلَةَ): (التَّزَلْـزُلُ: الإضْطِـرَابُ وَتَكرِيـر حُـرُوف لَفْظِـهِ، تَنْبِيـهٌ عَـلَى تَكْرِيـرِ مَعْنَـى الزَّلَـلِ فِيْـهِ)، (تَزَلْـزُل) بـە مانـای هاتـن و چوونـە، جووڵانـە، هەژانـەو، پیتـەکانی بێژەکـەی کـە دووبـارە بوونـەوە، {هـەر کام لـە (زاء، لام) دووبـارە بوونـەوە} ئاگادارکردنەوەیـە بـۆ ئـەوە کـە (زَلَـل) کـە بـە مانـای خلیسـکان و جووڵانـە، تێیـدا دووبـارە بۆتـەوە.

(ٱلسَّـاعَةِ): (السَّـاعَةُ: جُـزْءٌ مِـنْ أَجْـزَاءِ الوَقْـتِ وَيُعَـبَّرُ بِـهِ عَنِ القِيَامَةِ)، وشـەی (سـاعَة) بەشـێکە لـە بەشـەکانی کات، مانـا باوەکـەی ئێسـتای ئەوەیـە بەشـێکە لـە (٢٤) بـەشی کاتی شـەوو ڕۆژ، هەردووکیـان پێکـەوە، بـەڵام ئـەوە مانایەکـی عورفییـەو، لـە زمـانی عەڕەبییـداو لـە قورئانـدا (سـاعَة) یـانی: کاتێـک، کـەم بـێ یـان زۆر بـێ، بـۆ مانـای قیامەتیـش بەکارهاتـوە، واتـە: کاتی هەڵسـانەوەو، بـە مانـای ڕۆژی دواییـش بـە گشـتی بەکارهاتـوەو، (سـاعَة) مەبەسـت پێـی قیامەتـە لێـرەدا، لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ وشـەی (سـاعَة) بـە مانـای کۆتایـی هاتنـی سـەدەیەک و جیلێـک هاتـوە، وەک ڕۆژێـک پێغەمبـەر ﷺ پرسـیاری لێکـرا دەربـارەی (سـاعَة)؟

{عَـنْ عَائِشَـةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَـا، قَالَـتْ كَانَ رِجَـالٌ مِـنْ الْأَعْـرَابِ جُفَـاةً يَأْتُـونَ النَّبِـيَّ ﷺ فَيَسْـأَلُونَهُ مَتَـى السَّـاعَةُ؟ فَـكَانَ يَنْظُـرُ إِلَى أَصْغَرِهِـمْ، فَيَقُـولُ: إِنْ يَعِـشْ هَـذَا لَا يُدْرِكْـهُ الْهَـرَمُ حَتَّـى تَقُـومَ عَلَيْكُـمْ سَاعَتُكُمْ، قَـالَ هِشَـامٌ يَعْنِـي مَوْتَهُـمْ} (أخرجـه البخـاري: ٦١٤٦).

عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ گوتوویـەتی: پیاوانێکـی وشـک و ناحاڵیـی لـە عەڕەبـە خێڵەکییـەکان، دەهاتنـە لای پێغەمبـەر، ئنجـا لێیـان دەپـرسی: ئاخیـر زەمـان کەیـە؟ ئەویـش سـەرنجی گچکەترینیـانی دەداو دەیفەرمـوو: ئەگـەر ئەمـە بـژی، مـردنی ناگاتـێ تاکـو ئاخیـر زەمـانی ئێـوە دێ، هیشـام گوتوویـەتی: مەبەسـتی مردنیـان بـووە.

واتە: ئەو خەڵکەی ئێستا هەن، لەم سەدەیەدا، هەمووتان کۆتاییتان پێ دێ.

هەروەها وشەی (**ساعَة**) بە مانای مردنی مرۆڤیش هاتوە، بە تەنیا، وەک خوای دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً ...﴿٣١﴾﴾**الإنعام**، واتە: هەتا کاتێک کە (**سَاعَة**) (واتە: مردن)یان بۆ هات کتوپڕ.

هەروەها وەک گوتمان بە مانای قیامەتیش هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقۡسِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ مَا لَبِثُواْ غَيۡرَ سَاعَةٖۚ كَذَٰلِكَ كَانُواْ يُؤۡفَكُونَ ﴿٥٥﴾﴾**الروم**، واتە: کاتێک (**ساعَة**) ئاخیر زەمان دێ، تاوانبارەکان سوێند دەخۆن: تەنیا یەک سەعات ماونەوە، (**سَاعَة**)ی یەکەم بە مانای ئاخیر زەمانە، یاخود بە مانای هاتنی قیامەتەو (**سَاعَة**)ی دووەم بە مانای بڕێکە لە کات.

(**تَذۡهَلُ**): (**الذُّهُولُ: شُغْلٌ يُورِثُ حُزْنَاً وَنِسْيَانَاً**)، واتە: (**ذُهُول**) سەرقاڵ بوونێکە دەبێتە هۆی خەمباریی و لە بیرچوونەوە، (**تَذۡهَلُ**) یانی: بێئاگا دەبێ لە ئەنجامی خەفەتباریی و دڵ ناڕەحەتیی دا، لە بیری دەچێتەوەو لێی بێ ئاگا دەبێ.

(**مُرۡضِعَةٍ**): (**المُرْضِعَةُ: المَرْأةُ فِي حَالَةِ الإرْضَاعِ لِوَلَدِهَا**)، (**مُرْضِع**) یانی: شیر پێدەر، (**مُرۡضِعَةٍ**) یانی: شیرپێدەر، ئەدی جیاوازییان چیە؟! جیاوازییان ئەوەیە کە (**مُرْضِع**) واتە: کاتێک کە شیر بە منداڵ دەدات، بەڵام مەرج نیە ئێستا لە کاتی شیر پێدانیدا بێ، بەڵام کە گوترا: (**مُرۡضِعَةٍ**) واتە: ئەو ئافرەتەی کە لە حاڵەتی شیر پێدان دایە، بە منداڵەکەی، ئەو (ة) بۆیە زیادکراوە، ئەگەرنا ئەو سیفەتانەی کە تایبەتن بە ئافرەتانەوە، پێویستییان بە (ة: **تاء التأنيث**) ناکات، وەک (**حامل**) پێویست ناکات بڵێی (**حاملة**)، چونکە هەر ئافرەتە تۆڵدارو دووگیان دەبێ، هەروەها هەر دەبێ ئافرەت شیر بە منداڵ بدات.

(**سُكَٰرَىٰ**): (**جَمْعُ سَكْرَان**) واتە: (**سُكَارى**) کۆی (**سَكْرَان**)ە، یانی: سەرخۆش، (**وَالسُّكْرُ: حَالَةٌ تُعْرِضُ بَيْنَ المَرْءِ وَعَقْلِهِ**)، واتە: سەرخۆشیی حاڵەتێکە بۆ مرۆڤ دێتە پێش، دەکەوێتە نێوان مرۆڤ و عەقڵەوەو هۆشی لە دەست دەدات، کە زیاتر بە هۆی ماددە سەرخۆشکەرەکانەوەیە.

(مَّرِيدٍ): (المَارِدُ والمَرِيْدُ: المُتَعَرِّي مِنَ الخَيْرَاتِ، شَجَرٌ أَمْرَد: إِذَا تَعَرَّى مِنَ الوَرَقُ وَغُلَامٌ أَمْرَد)، واتە: وشەی (مَارِدْ) و (مَرِيد) هەردووکیان، واتە: دارِندراو لە خێرو چاکە، دەگوترێ: (شَجَرٌ أَمْرَد) کە درەختێکە گەڵای پێوە نەمابێ و، (وَغُلَامٌ أَمْرَد) کوڕێژگەیەک کە جارێ مووی لێ نەهاتبێ و بێ موو بێ.

(نُّطْفَةٍ): (النُّطْفَةُ: الْـمَاءُ الصَّافِي وَيُعْبَّرُ بِه عَنْ مَاء الرَّجُل)، واتە: (نُطْفَةُ) ئاوێکی ڕوون و زوڵاڵ، بەکاریش دەهێنرێ وەک ناو بۆ ئاوی پیاو، واتە: ئەو ئاوەی کە پیاو لە کاتی جووت بووندا دەیخاتە نێو منداڵدانی ئافرەتەوەو، لە ئەنجامی یەکگرتنی ئاوی پیاوەکەو ئافرەتەکەدا، منداڵ دروست دەبێ.

(عَلَقَةٍ): (العَلَقُ: الدَّمُ الجَامِدُ، وَمِنْهُ العَلَقَةُ الَّتي يَكُوْنُ مِنْهَا الوَلَدُ، وَالعَلَقُ: التَّشَبُثُّ بِالشَّيءِ)، وشەی (عَلَق) واتە: خۆ بە شتێکەوە هەڵواسین، ئنجا (عَلَق) بریتیە لە خوێنێکی وشک بوو، (عَلَقَةٍ) ئەو خوێنە وشک بووەوەیە، کە منداڵی لێ دروست دەبێ، هێندەی پارچە زەروویەکی لێ دێت ئەو نوتفەیە و، دوایی گەشە دەکات و، خۆی بە دیواری منداڵدان هەڵدەواسێ، وەک چۆن زەروویەک خۆی هەڵدەواسێ.

(مُّضْغَةٍ): (المُضْغَةُ: القِطْعَةُ مِنَ اللَّحْمِ قَدْرَ مَا يُمْضَغُ وَلَمْ يَنْضُجْ)، واتە: (مُّضْغَةٍ) پارچەیەک گۆشت بە ئەندازەی ئەوە کە بجوورێ، زارجوو، بەڵام لە حاڵێکدا کە نەکوڵیبێ، کە بە قۆناغی دوای (عَلَقَة) دەگوترێ، ئەو منداڵە کە (نُطْفَة)یە، دوایی دەگۆڕدرێ بۆ ژیاندارێکی بچووکی بە قەدەر زەروویەک، دواییش دەگۆڕدرێ بۆ ژیاندارێکی بچووکی هێندەی پارچە گۆشتێکی وەک زارجوو.

(مُّخَلَّقَةٍ): (أي: مُصَوَّرَة) واتە: وێنە کێشراو، بیچم پێدراو، وێنەدار، (وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ) جارێ شکڵ و شێوەی وەرنەگرتوە.

(أَشُدَّكُمْ): قۆناغی تین و تاقەت و هێزو پێز، قۆناغی گەنجێتیی و دوای گەنجێتیی، کامڵ بوون.

(**أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ**): (**الـرَّذْلُ: المَرْغُـوبُ عَنْـهُ لِرَدَائَتِـه**)، (**رَذْل**) شـتێکە نەویسـتریٚ لەبـەر خراپیـی، یـان لەبـەر بـێ کەڵکیـی، ئنجـا (**أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ**)، یـانی: (**أَسْـوَءُ العُمُـر**) یـانی: خراپتریـن تەمـەن، خراپتریـن تەمـەنی مرۆڤیـش ئەوەیـە کـە پیـرو کەنەفـت دەبـێ و، هێـزو پێـزی نامێنـێ و، وای لێـدێ کـە بـۆ بەڕێوەچـوون و بەخێوکـرانی، پێویسـتیی بـە غەیـری خـۆی دەبـێ، کـە لـە ڕاسـتییدا ئـەوە تەمەنێکـی خراپـە، هـەر بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ لـە پاڕانـەوەی خۆیـدا پەنـای بـە خـوا گرتـوە، کـە بگێڕدرێتـەوە بـۆ ئـەو تەمەنـە خراپـەو، خـواش دوعاکـەی قبـوڵ کـردوەو، نەگەڕاوەتـەوە ئـەو تەمەنـە.

(**هَامِدَةً**): (**هَمَـدَتِ النَّـارُ: طفئَـتْ، أَرْضٌ هَامِـدَةٌ: لاَ نَبَـاتَ فيهَـا**)، (**هَمَـدت النَّـارُ**): واتـە: ئاگرەکـە کوژایـەوە (**أَرْضٌ هَامِـدَةٌ**)، واتـە: ڕووەکـی تێدانیـە، سـوورو سـەقەتاڵەیە و، وشـک و برینگـە قاقـڕو دێمـەکارە.

(**ٱهۡتَزَّتۡ**): (**الهَـزُّ: التَّحْرِيْـكُ الشَّـدِيْد**)، (**هَـزّ**) بـە مانـای جووڵاندنێکـی بەهێـزە، دەگوتـرێ: (**هَـزَزْتُ الرَّمْحَ فَاهْتَـزَّ**)، واتـە: ڕمەکـەم ڕاوەشـاندو جـووڵا، (**آهْتَـزَّ النَّبَـاتُ: تَحَـرَّكَ لِنَضَارَتِـهِ**) (**آهْتَـزَّ النَّبَـاتُ**) واتـە: ڕووەکەکـە (**اهْتِـزَاز**)ی کـرد، واتـە: جـووڵاو، جـوان و ڕەونەقـدار بـوو گەشـەی کـرد.

(**وَرَبَتۡ**): (**رَبَا: زَادَ وَعَلاَ**) واتە: زیادی کردو هەڵکشیو بەرز بۆوە.

(**زَوۡجِۢ**): (**زَوْج**) بـە (**أَزْوَاج**) کۆدەبێتـەوە، (**أَزْوَاج**) واتـە: (**أَصْنَـاف، وَأَنْـوَاع**) واتـە: چەنـد جـۆرو شـێوەیەک، بـەڵام ئێسـتا لـە ڕووی زانسـتییەوە سـەلمێنراوە کـە ڕووەکیش هەمـووی نێـرو مێـی هەیـە، بۆیـە خـوا ﷻ زۆرجـار لـە جیـاتی (**نَبَـات**) دەفەرمـوێ: (**زَوْج**)، چونکـە هـەر ڕووەکێـک نێـرو مێـی تێدایـە، کەواتـە: لێـرەدا (**مِن كُلِّ زَوۡجِۢ بَهِيجٖ**)، واتـە: لـە هـەر ڕووەکێکـی دڵخۆشـکەرو ڕەونەقـدارو دیمـەن جـوان، ئـەو زەوییـە سـەوزی دەکات.

(**بَهِيجٖ**): (**البَهْجَـةُ: حُسْـنُ اللَّـوْنِ وَظُهُـورُ الـسُّرُورِ فِيْـهِ**)، (**بَهْجَـة**) بریتیـە لـە ڕەنـگ و دیمـەنی جـوان، دەرکەوتنـی شـادمانیی تێیـدا، ئنجـا ڕووەک کـە ئـاو دەدرێ، ئنجـا

دانەوێڵەیە، سەوزەیە، تەڕەکارە، دارو درەختە، پێش ئەوەی ئاو بدرێ، سیس و پەژموردە دەبێ، ئەگەر تینوو بێ، دوای ئەوەی کە ئاو دەدرێ، دەیبینی گەش و جوان بە ڕەونەق دەبێ و، هەستی پێ دەکەی شادمان و دڵخۆشە.

(ثَانِیَ عِطۡفِهِۦ): (لَاوِيـاً جَانِبَـهِ)، (ثـانِي) یانی: (لَاوِي)، واتە: نووشتێنەرەوە، (لَـوَاهُ) لەگەڵ (ثَنَـاهُ) یەک مانایان هەیە، واتە: نوشتاندیەوە، (عِطْـف)، یانی: (جَانِـبْ)، واتە: کەلەکە، تەنیشت، کەواتە: (ثَنَـاهُ)، واتە: (عَطَفَـهُ) نوشتاندیەوە، (العَطْـفُ: ثَنْـيُ أَحَـدِ طَـرَفِي الـشَّيء إلَى الآخَـر)، (ثَنِـي) بریتیە لەوەی شتێک دوو لای هەبن، لایەکیان بخەیە سەر لایەکەی دیکە، واتە: بینووشتێنیەوەو قەدی بکەی، بەڵام لێرەدا مەبەست لە: (ثَانِیَ عِطۡفِهِۦ) واتە: خۆ بادان و فیزو کەشخە نواندن.

(حَرۡفٍ): وشەی (حَرۡفٍ) بە مانای پیت دێ و، بە مانای قەراغ و لێواری شتێکیش دێ، دەڵێ: (حَـرْفُ الـشَّيء: طَرَفُـهُ، جَمْعُـهُ أَحْـرُفْ وَحُـرُوف، حَـرْفُ السَّـفِيْنَةِ وَالجَبَـلِ)، واتە: ئەگەر بڵێی حەرفی ئەو شتە، واتە: قەراغەکەی، کەنارەکەی، لێوارەکەی، کە بە (أَحْـرُفْ، وَحُـرُوف) کۆدەکرێتەوە، بۆ وێنە: دەگوترێ: (حَـرْفُ السَّـفِيْنَة) قەراغی کەشتییەکە، (حَـرْفُ الجَبَـل) کەناری چیاکە، (حَـرْفُ التـلِّ) کەناری گردەکە، بەڵام لێرە خوا ﷻ کەسێک کە هەلپەرست و بەڕواڵەت مسوڵمانەو خۆی بە کەلا داخستوە، ئەگەر خێرو خۆشیی هاتە ڕێ، پێی دڵخۆش و ئاسوودە دەبێ، دەمێنێتەوە لەسەر مسوڵمانەتییەکەی، بەڵام ئەگەر تووشی بەڵاو گرفتارییەک بێ، هەڵدەگەڕێتەوەو، واز لە مسوڵمانەتییەکەی دێنێ، ئا ئەو کەسەی چواندوە بە کەسێک کە لەسەر قەراغێک ڕاوەستاوە، هەر شتێکی بە دڵ نەبێ، خۆی بەردەداتەوە بەولادا یان بەولادا.

(ٱلۡعَشِيرُ): (العَشِيْرُ: المُعَـاشِرُ قَرِيْبَـاً، أو مُعَارِفَـاً)، وشەی (عَشِيْر) بە مانای هاوەڵ و دۆست، کەسێک لەگەڵ کەسێک تێکەڵە و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات و ڕازو نیازی لەگەڵدا دەبێ، ئنجا چ وەک خزمایەتیی لێی نزیک بێ، چ وەک ناسیاوەتیی.

(**بِسَبَبٍ**): یـانی: هـۆكار، بـەڵام لێـرەدا (السَّـبَبُ: الحَبْـلُ الَّـذِي يُصْعَـدُ بِـهِ النَّخْـلُ) واتـە: ئـەو پـەت و گوریسـەی كـە مـرۆڤ پێیـدا سـەردەكەوێ بـۆ دارخورمـا، بـەوە گوتوویانـە: (السَّـبَبُ) (وَسُـمِّيَ كُلُّ مَـا يُتَوَصَّـلُ بِـهِ إلى شَيءٍ: سَـبَبَاً)، واتـە: هـەر شـتێک كـە هـۆكار بـێ بـۆ گەیشـتن بـە ئامانجێـک، پێـی گوتـراوە: (السَّـبَب)، ئەگەرنـا لـە ئەصڵـدا (سَـبَب) یـانی: پـەت، گوریـس، كـە خۆیـان پـێ هەڵواسـیوە بـۆ ئـەوەی پێـی بـە دارخورمـا هەڵگەڕێـن، بـۆ متوربەكـردنی، یـان چنینـی.

(**لِيُقْطَعْ**): (قَطْـع) بـە مانـای بڕیـن دێ، (ل)ەكـە بـۆ فەرمانـە، (**لِيُقْطَعْ**) (لِيَمْنَـع) واتـە: بـا ڕێگریـی لـێ بـكات، یاخـود بـا پەتەكـە ببـڕێ و بكەوێتـە خـوار، یاخـود بـا هەناسـەی خـۆی ببـڕێ، یـان بـا كات و تەمـەنی خـۆی ببـڕێ و، كۆتایـی بـە خـۆی بێنـێ.

(**يَغِيظُ**): (الغَيْـظُ: أَشَـدُّ الغَضَـبِ) (غَيْـظ) بریتیـە لـە ئـەو پـەڕی تـووڕە بـوون، (**مَا يَغِيظُ**) واتـە: (مَـا يَغْضَـبُ مِنْـهُ وَيُثْـيرُ غَيْظَـهُ)، واتـە: شـتێک كـە بەهۆیـەوە تـووڕە دەبـێ و، ڕقـی هەڵدەسـتێنێ و، پەسـت و بێـزاری دەكات.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خـوای پـەروەردگار ئـەم سـوورەتە موبارەکـە ئـاوا دەسـت پێـدەکات: (بسـم اللـه الرحمـن الرحیـم) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە.

شـایانی باسـە: لـەکاتی گوتنـی ئـەم ڕستە بەپێـزەدا پێویسـتە بـەلای کەمـەوە چـوار واتـاو مەبەسـت لـە نێـو دڵـی مـرۆڤ دا ئامادەبـن:

١- ئەم کارە - قورئانخوێندن یان هەرکارێکی دیکە - بەناوی خواوە دەکەم.

٢- بە مەبەستی ڕازییکردنی خوا دەیکەم.

٣- بەپێی بەرنامەی خوا دەیکەم.

٤- بە وزەو توانایەک کە خوا بۆی ڕەخساندووم دەیکەم، نەک بەشان و شەوکەت توانای سەربەخۆی خۆم.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ ﴾، ئـەی خەڵکینـە! پارێـز لـە پـەروەردگاری خۆتـان، لـە بەڕێوەبـەرو مشـوورخۆرتان بکـەن، واتـە: پارێـز لـە سـزایەکەی بکـەن، ﴿ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴾، بـە دڵنیایـی لەرزینـەوەو ڕاتەکێـنرانی ئاخیـر زەمـان، شـتێکی مەزنـە، بێگومـان ڕاتەکێندرانەکـە بـۆ زەوییـە، واتـە: کـە زەوی ڕادەتەکێنـدرێ و دەهـەژێ، شـتێکی زۆر مەزنـە، ئەوەنـدە مەزنـە، وشـەو تەعبیـر دەستەوسـانن ئـەو مانـاو مەبەسـتە گەورەیـە بخەنـە نێـو خۆیـان.

﴿ يَوْمَ تَرَوْنَهَا ﴾، ئـەو ڕۆژە کـە دەیبینـن، واتـە: لەرزینەوەکـە دەبینـن، کـە بەسـەر زەویـدا دێـت، ئـەو هـەژان و ڕاتەکێنرانـەی زەوی دەبینـن، چـی دەبـێ؟! ﴿ تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ ﴾، هەمـوو ئافرەتێکـی شـیر پێـدەر لـەوەی

شیری پێدەدا، بێ ئاگا دەبێ، ئنجا ئافرەت هەر بۆ خۆی زۆر بە ڕەحم و سۆزە، بە تایبەت ئافرەت لە کاتێکدا شیر دەدات بە کۆرپەکەی، زۆر عەتف و سۆزی لەسەریەتی، ئنجا ئەگەر ئەو ئافرەتە وای لێبێ، ئاگای لەو شیرپێدراوەی خۆی نەمێنێ، مانای وایە شتێکی زۆر سامناک و گەورە ڕووی داوە، لە حەژمەتان ئاگای لە کۆرپە شیرە خۆرەکەی خۆی نەماوە، ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا﴾، هەموو خاوەن تۆلێک، هەموو ئافرەتێکی دووگیان، کۆرپەکەی خۆی دادەنێ، واتە: لەبەری دەچێت، ئەمە ئەگەر مەبەست لە ئاخیر زەمان ئەو کاتە بێ کە خەڵک لەسەر زەوییە، مانای وایە وەک واقیع ئافرەتانی دووگیان، حەملەکەیان لەبەردەچێ، بەڵام ئەگەر مەبەست ڕۆژی قیامەت بێ، واتە: ئەگەر گریمان ئافرەتێک هەبێ لەو کاتەدا شیر بە منداڵەکەی بدا، ئاگای لە شیر پێدراوەکەی نامێنێ و، ئەگەر ئافرەتێک هەبێ تۆلی هەبێ، تۆلەکەی لە بار دەچێت، ﴿وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ﴾، خەڵکی دەبینی سەرخۆشن، بەڵام سەرخۆشیش نین، ﴿وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾، بەڵام سزای خوا زۆر سەخت و توندە، سزای خوا کە لەو ڕۆژەدا دێتە پێش، بۆ ئەهلی کوفر دێتە پێش، ئەگەرنا ئەهلی ئیمان خوا ﷻ دەیانخاتە ژێر سایەی بەزەیی خۆیەوە.

ئنجا لەگەڵ ئەوەش دا، ئەو ڕۆژە سامناکە چاوەڕێی مرۆڤایەتیی دەکات، کەچی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ﴾، لە نێو خەڵکیدا، بابای وا هەیە، بەبێ زانیاریی لە بارەی خواوە مشت و مڕو شەڕە قسە دەکات، ﴿وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَٰنٍ مَّرِيدٍ﴾، دەشکەوێتە شوێن هەر شەیتانێکی لە خوا یاخیی و سەرکێش و، لەخێر دوورو نەگبەت و نەگریس، واتە: هەر کەسێکی لێ هەڵکەوێ لە خوای دووربخاتەوە، شوێنی دەکەوێ، ﴿كُتِبَ عَلَيْهِ﴾ {بەپێی سیستمێک کە خوا دایناوە لە ژیانی مرۆڤدا} لەسەری پێویستکراوە، یانی: وای بۆ دانراوەو وا هەڵخراوە، ﴿أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهْدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾، ئەو شەیتانە، ئنجا مرۆڤە یان جندە، هەر کەسێک شوێنی بکەوێ و دۆستایەتیی بکات و لێی

نیزیک بێ، بە دڵنیایی گومڕای دەکات و، بەرەو سزای ئاگری کڵپەداری دۆزەخ ڕێنمایی دەکات.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەوە، کە زیندوو کرانەوەی ڕۆژی دوایی بۆ خوا ﷻ شتێکی زۆر سێناو ئاسانە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ ﴾، ئەی خەڵکینە! ئەگەر ئێوە لە دوو دڵییدان لە زیندوو کردنەوەو هەڵسێنرانەوەدا، بەهەڵە داچوون، ﴿ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ﴾، چونکە بە دڵنیایی ئێمە ئێوەمان لە گڵ دروست کردوە، چ مەبەست پێی ئادەم بێ، کە ئادەم لە گڵ دروست بووە، هەروەها حەوواش، چ مەبەست پێی هەر کامێک لە مرۆڤەکان بێ، کە دیارە مرۆڤ لە ئاوی باب و دایکی دروست دەبێ، ئەو ئاوەش، چ ئاوی باب، چ ئاوی دایک، بێگومان لەو خواردن و خواردنەوانە دروست دەبن، کە دایک و بابیان دەیانخۆن، ئەو خواردنانەش لە زەوی پەیدادەبن، بۆیە سەرەنجامەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زەوی، ﴿ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ﴾، سەرەتای دروست بوونی ئێوە لە گڵەوەیە، ﴿ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ﴾، دوایی لە تۆوە وەیە، (نُّطْفَةٍ) ئاوی پیاوو ژنە کە دەچێتە نێو منداڵدانی ئافرەتەوە، ﴿ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ﴾، دوایی لە خوێن پارەیەکەوە، ﴿ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ ﴾، دوایی لە پارچە گۆشتێکی هێندەی زارجوویەکەوە، ﴿ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ ﴾، وێنە کێشراوو، وێنە نەکێشراو، بیچم و شێوە پێدارو، بیچم و شێوە پێنەدراو، ﴿ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ﴾، بۆیە ئەوەتان بۆ باس دەکەین، تاکو بۆتان ڕوون بکەینەوە، ئێوە چۆن دروست بوون و لە کوێوە هاتوون و چۆن هاتوون؟ ﴿ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، هەرشتێکیش لە منداڵدانەکاندا سەقامگیر دەکەین و دەهێڵینەوە، کە بمانەوێ، تاکو کاتێکی ناوبراوو دیارییکراو، واتە: ئەوەی خوا ﷻ بیەوێ بیکاتە مرۆڤ، دەیهێڵێتەوە لە نێو منداڵدانی دایکیدا، ئەگەرنا بە نوتفەیی، یان بە عەلەقەیی، یان بە موضغەیی لە بار دەچێ، یاخود بە گەورەتریش لە بار دەچێ، بەڵام ئەوەی خوا ﷻ بیەوێ بیکاتە مرۆڤ، لە نێو منداڵداندا

دەیهێڵێتەوە، ﴿ ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ﴾، دوایی بە شێوەی منداڵ دەرتاندێنین، ﴿ ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ﴾، دواییش بۆ ئەوەی بگەنە قۆناغی تاقەت و هێزو پێزتان، ﴿ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ ﴾، هەشتانە پێش ئەوە دەمرێنرێ، ﴿ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ ﴾، هەشتانە دەگێردرێتەوە بۆ تەمەنێکی خراپ (پیرو کەنەفت دەبێ) ﴿ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ﴾، تاکو بگاتەوە حاڵەتێک دوای ئەوەی شتی زانیوە، هیچ نەزانێ، ﴿ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً ﴾، زەوییش دەبینی بێ هەست و خوست و جووڵەیە، مردوویە، ﴿ فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ﴾، هەر کاتێک ئاومان داباراندە سەری، دەجووڵێ و، پۆز دەبێ و گەشە دەکات، ﴿ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴾، لە هەر رووەکێکی دیمەن جوان و دڵخۆشکەرو بە رەونەق دەڕوێنێ، ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾، ئەوەش بەهۆی ئەوەوەیە کە هەر خوا ﷻ هەقە، ﴿ وَأَنَّهُۥ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، هەروەها بە هۆی ئەوەیە کە خوا ﷻ دەتوانێ مردووان زیندوو بکاتەوە، مردووان دەژیێنێتەوە، ﴿ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، هەروەها خوا ﷻ لەسەر هەموو شتێک بە توانایە.

﴿ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا ﴾، هەروەها ئەو کاتەی دنیا کۆتایی دێ، هیچ دوو دڵیی تێدانیە، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ ﴾، هەروەها خوا ﷻ ئەوانەی لە گۆڕەکاندان، دەریان دێنێتەوەو هەڵیان دەستێنێتەوە.

ئنجا دێتە سەر باسی جۆری دووەم لەو مرۆڤانەی، کە لە بەرانبەر خوادا ﷻ هەڵوێستێکی نەرێنیی و خراپیان هەیە:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴾، هەروەها لە خەڵکی هەیە، بابای وا کە لە بارەی خواوە مشت و مڕو شەڕە قسە دەکات، بە بێ زانیاریی و، بەبێ ڕێنمایی و، بەبێ کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە، واتە: نە بەڵگەی زانیاریی بەدەستەوەیە، نە بەڵگەی عەقڵیی بە دەستەوەیە، نە بەڵگەی نەقڵیی بە دەستەوەیە، ﴿ ثَانِىَ عِطْفِهِۦ ﴾، کەلەکەی خۆی دەنووشتێنێتەوە، یان

خۆی بادەدا، ﴿ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، تاکو خەڵک لە ڕێی خوا لابدات و گومڕا بکات، ﴿ لَهُۥ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ وَنُذِيقُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴾، لە دنیادا ڕیسوایی و سەرشۆڕیی بۆ هەیەو، لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا سزای سووتێنەری پێ دەچێژین، ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ ﴾ {پێی دەگوترێ:} ئەوە بە هۆی ئەوەوەیە، کە هەردوو دەستەکەت پێشیان خستوە، واتە: ئەوە شوێنەوارو بەرهەمی شوومی کردەوەکانی خۆتە، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾، بە دڵنیایی خوا ستەمکار نیە بۆ بەندەکانی.

ئنجا دێتە سەر باسی جۆری سێیەم، لەو مرۆڤانەی کە هەڵوێستێکی نەیارانەو نەرێنییانەی خراپیان بەرانبەر بە خوا ﷻ هەیە:

﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ ﴾، دیسان لە خەڵکی هەیە، بابای وا کە لەسەر قەراغ خوا دەپەرستێ، خۆی بە کەلادا خستوە، ﴿ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦ ﴾، ئەگەر خۆشیی و چاکەی تووش بوو، پێی ئاسوودە دەبێ و ئارام دەگرێ، ﴿ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ ﴾، بەڵام ئەگەر بەڵایەکی تووش بوو، ناڕەحەتییەکی تووش بوو، لەسەر ڕووی هەڵدەگەڕێتەوە، پاشەو پاش دەکشێتەوە، ﴿ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةَ ﴾، دنیاو دواڕۆژان لە دەست دەدا، هەردووک لایان دەدۆڕێنێ، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴾، ئا ئەوە زیانباریی ئاشکرایە.

﴿ يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ ﴾، لە جیاتی خوا ﷻ لە شتێک دەپاڕێتەوە، کە نە زیانی پێدەگەیەنێ و، نە سوودی پێدەگەیەنێ، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴾، ئا ئەوە گومڕایی دوورە، هێندە دوور گومڕا بووە، هێندە دوور ڕۆیشتوە، بە زەحمەت دێتەوە سەر ڕێ، ﴿ يَدْعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦ ﴾، لە جیاتی خوا ﷻ لە کەسێک دەپاڕێتەوە، کە زیانەکەی لە قازانجەکەی نیزیکترە، ﴿ لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ ﴾، بابای وا کە زیانی لە قازانجی نیزیکتر بێ، خراپترین دۆست و خراپترین هاوەڵ و هاوڕازە.

ئنجا خوا ﷻ باسی جۆری چوارەم لە مرۆڤەکان دەکات، دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، دەخاتە چەند نێو باغ و بێستانێکەوە کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ هەرچی بیەوێ دەیکات.

﴿ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ﴾، هەر کەسێک پێی وایە خوا ﷻ سەری ناخات، خۆی سەر ناخات، یاخود پێغەمبەرەکەی ﷺ سەرناخات، لە دنیاو دواڕۆژدا، ﴿ فَلۡيَمۡدُدۡ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ﴾، با پەتێک درێژ بکات بەرەو ئاسمان، ﴿ ثُمَّ لۡيَقۡطَعۡ ﴾، با بچێ لەوێ هاوکاریی خوا ﷻ لە پێغەمبەر ﷺ ببڕێ، ئەوە واتایەکی، یاخود: با پەتێک بە سەقفی خانووەکەی هەڵبواسێ و، خۆی پێدا بکاو، خۆی بخنکێنێ، ﴿ فَلۡيَنظُرۡ هَلۡ يُذۡهِبَنَّ كَيۡدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴾، ئنجا با تەماشا بکات: ئایا فێڵەکەی کە دەیکات (کە خۆ هەڵواسینە، یاخود چوونە ئاسمانە، کە ناتوانێ!)، ئایا ئەوەی مایەی ڕق لێبوونەوەیەتی لای دەبات؟ بە دڵنیایی نەخێر!

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يُرِيدُ ﴾، ئاوا بەو شێوەیە ئایەتە ڕۆشنەکانمان دابەزاندوون و، بە دڵنیایی خوا ﷻ هەر کەسێک بیەوێ دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، ئەگەر نا وەک ڕێنمایی، ڕێنمایی هەموو لایەکی کردوە، بەڵام هەر کەسێک بیەوێ دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ، لەبەرئەوەی ئارەزووی ئەوەی هەیە، بەرەو خوا ﷻ ڕێ بگرێتەبەر.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

١)- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١١﴾.

لەو بارەوە دوو هۆی هاتنە خوار باسکراون:

**یەکەم:** {**عَنْ عَبْدِ الله بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يَقْدَمُ المَدِينَةَ، فَإِنْ وَلَدَتِ امْرَأَتُهُ غُلاَمًا، وَنُتِجَتْ خَيْلُهُ، قَالَ: هَذَا دِينٌ صَالِحٌ، وَإِنْ لَمْ تَلِدِ امْرَأَتُهُ، وَلَمْ تُنْتَجْ خَيْلُهُ، قَالَ: هَذَا دِينُ سُوءٍ**} (**أخرجه: البخاري برقم: ٤٧٤٢**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ) دەگێڕێتـەوە، کـە جـاری وا هەبـوو پیاوێـک دەهاتـە مەدینـە، (واتـە: لـە عەڕەبـە خێڵەکییـەکان لـە دەرەوەی مەدینـە دەهاتـن بـۆ مەدینـە، لـەوێ مسـوڵمان دەبـوون و، دەهاتنـە نێـو ئیسـلامەوە)، ئەگـەر ژنەکـەی کـوڕی بووبایـەو، ولاخـە بەرزەکانیـشی بێچوویـان بووبایـە (ماینەکەیـان زابایـە)، دەیگـوت: ئـەوە دینێکـی باشـە، (واتـە: ئەگەر لـە ڕووی دنیاییـەوە بەرژەوەندییـەکانی بـۆ دابیـن بووبـان، دڵـی بـە ئیسـلام خـۆش دەبـوو، دەیگـوت: دینێکـی باشـە)، بـەڵام ئەگـەر ژنەکـەی منداڵـی (کـوڕی) نەبووبایـەو، ماینەکەشیان نەزابایـە، دەیگـوت: ئـەوە دینێکـی خراپـە، (واتـە: پێـوەرو تەرازوویـان بـۆ هەڵسـەنگاندنی دینـی ئیسـلام، بەرژەوەندییـە ماددییەکانیـان بـوون! کـە بێگومـان ئـەوە شـتێکی زۆر هەڵەیـە).

**دووەم:** {**عَنْ عَبْدِ الله بنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ يَأْتُونَ النَّبِيَّ ﷺ فَيُسْلِمُونَ، فَإِذَا رَجَعُوا إِلَى بِلَادِهِمْ، فَإِنْ وَجَدُوا عَامَ غَيْثٍ وَعَامَ خِصْبٍ، وَعَامَ وَلَادٍ حَسَنٍ**

قَالُوا: إِنَّ دِينَنَا هَذَا لَصَالِحٌ فَتَمَسَّكُوا بِهِ، وَإِنْ وَجَدُوا عَامَ جُدُوبَةٍ، وَعَامَ وِلَادٍ سُوءٍ، وَعَامَ قَحْطٍ قَالُوا: مَا فِي دِينِنَا هَذَا خَيْرٌ، فَأَنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١١﴾، (أخرجه ابن أبي حاتم في تفسيره، كما في تفسير ابن كثير: ج ٥، ص٥١٧ ، ٥١٨، وفتح الباري: ج٨، ص ٤٤٣. وابن مردويه في تفسيره كما في «الدر المنثور»: ج ٦، ص ١٣، ومن طريقه الضياء المقدسي في «الأحاديث المختارة»: ص ١١٨)[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: کەسانێک لە عەڕەبە دەشتەکییەکان، (عەڕەبەکانی دەرەوەی مەدینەو، بیاباننشینەکان)، دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ مسوڵمان دەبوون، کاتێک کە دەگەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان، ئەگەر ساڵەکە ساڵێکی باراناویی بووایەو، ساڵێکی بە پیت بووایەو، ساڵێک بووایە کە زاوزێی باشی تێدا بووایە، دەیانگوت: ئەم دینەمان دینێکی باشە، باش دەستی پێوەبگرن، بەڵام کە دەگەڕانەوە، ئەگەر ساڵێکی وشکە ساڵی بووایەو، ساڵێکی بێ زاوزێ بووایەو، ساڵێکی گرانیی و قات و قڕیی بووایە، دەیانگوت: ئەم ئایینەمان هیچ خێری تێدا نیە! خوا لەو بارەوە ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١١﴾.



(١) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٢، ص: ٥٠٢ وقال المؤلِّفان: وَسَنَدُهُ حَسَنٌ.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**بانگکردنی خوا ﷻ بۆ مرۆڤایەتیی و، هۆشداریی پێدانیان لە بارەی مەزنیی و ترسناکیی لەرزینەوەو هەژانی زەوی لە ئاخیر زەماندا:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ١﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

**١)-** ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْ﴾، خوا ﷻ لە سەرووی دروستکراوەکانی خۆیەوە، لە سەرووی حەوت ئاسمانەکانەوە، وەک بۆ خۆی شایستەیە ئەو لە سەروو بوونە، بانگی مرۆڤایەتیی دەکات، ئەی خەڵکینە! هۆ خەڵکینە! پارێز لە پەروەردگارتان بکەن، واتە: پارێز لە سزایەکەی بکەن، چونکە بێگومان خوا ﷻ لە زاتی خۆی دا پارێزی لێ ناکرێ، واتە: پارێز لەوە بکەن، کە تووشی سزای خوا بن، بە هۆی سەرپێچییتانەوە لە بەرنامەی خوا، بە هۆی لاملییتانەوە لە فەرمانەکانی خوا.

**٢)-** ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ﴾، واتە: بێگومان لەرزینەوەی ئاخیرزەمان (ٱلسَّاعَةِ) شتێکی مەزنە، دوای باسی دەکەین، کە وشەی (ٱلسَّاعَةِ) بە پێنج واتایان هاتوە لە قورئان و لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ، بەڵام لێرەدا دەڵێ: **(السَّاعَةُ: عَلَمٌ بِالْغَلَبَةِ فِي اصْطِلَاحِ الْقُرْآنِ عَلَى وَقْتِ فَنَاءِ الدُّنْيَا)**، واتە: وشەی (ساعَة) ناوو نیشانە بە شێوەی زاڵبوون، لە زاراوەی قورئاندا بۆ تێکچوونی دنیا، بۆ پێچرانەوەی لاپەڕەی ئەم ژیانی دنیایە، بۆ کۆتایی پێ هاتنی ئەم قۆناغەی ژیانی مرۆڤ، کە ژیانیەتی لەسەر خڕۆکەی زەوی.

ئەو وشانەی زیاتر لە واتایەک هەڵدەگرن، دەبێ بەپێی ڕەوت (**سیاق**)ە کەیان و، بەپێی ئەو هەل و مەرج و ئەو بابەتە کە لێی دەدوێن، تەماشای چەمک و واتاکەیان بکەین و، بزانین کام لەم چەمک و واتایەی کە هەینی، لەگەڵ ئەو شوێنەدا دەگونجێ؟

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ﴾، بێگومان لەرزینەوەی ئاخیر زەمان، ئنجا لەرزینەوەکەش هی خڕۆکەی زەوییە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دەزانرێ زەوییە دەلەرزێتەوە، بۆیە باسی زەوی نەکراوە، ئەگەر نا لە ئاخر زەماندا کوێ دەلەرزێتەوە؟! بێگومان ئەو زەوییەی کە ئێمە لەسەرینی، واتە: (**إِنَّ زَلْزَلَةِ الأَرْضِ عِنْدَ السَّاعَةِ شَّيءٌ عَظِيمٌ**)، لەرزینەوەو هەژان و تێکەوە ڕاشەقانی خڕۆکەی زەوی لە کاتی هاتنی ئەو کاتەدا، کە دنیایی تێدا کۆتایی دێ، شتێکی مەزنە.

وشەی (شَىۡءٌ)یش بەکاردێ بۆ هەر شتێک کە بوونی هەبێ، بەبێ ئەوەی بزانرێ چییە؟ بەڵام لێرە کە دەفەرموێ: ﴿شَىۡءٌ عَظِيمٌ﴾، شتێکی زۆر مەزنە، واتە: شتێکە، بەڵام زۆر لەوە مەزنترە، کە عەقڵ و خەیاڵ و ئەندێشە بتوانێ دەوری بداو، دەرکی بکات و، وەک خۆی پێی ئاشنابێ، لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: ئەو لەرزینەوەو هەژان و تێکەوە ڕاشەقانەی زەوی لە ئاخیر زەماندا، وەک ئەو لەرزینەوانەی دیکە نیە، کە بەسەر گۆی زەوی دێن، بەڵکو ئەو بوومەلەرزەیەی کە دێ، بوومەلەرزەیەکی تایبەتە.

## کورتەباسێک: دوو هەڵوەستە

## لەبەرانبەر لەرزینەوەی زەوی و، ماناکانی (ساعة)دا

**هەڵوەستەی یەکەم:** خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ١﴾، واتە: لەرزینەوەو هەژان و تێکەوە ڕاشەقانی زەوی لە کاتی ئاخیر زەماندا شتێکی مەزنە، ئەمە لە سوورەتی (الزلزلة)دا، خوا ﷻ شی کردۆتەوەو، ڕوونی کردۆتەوە چۆنە، کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ١ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ٢ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ٣ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ٤ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ٥ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ٦ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ٨﴾.

ئەم سوورەتە موبارەکە کە لە هەشت ئایەت پێک دێ، تیشکێکی باشمان بۆ دەخاتە سەر ئەو ڕووداوو کارەساتە کە خوا ﷻ بە مەزن ناوی دێنێ:

خوا ﷻ دەفەرموێ: بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە.

هەر کاتێک زەوی لەرزیەوە، ئەو لەرزینەوە تایبەتەی کە بۆی دیارییکراوە.

واتە: لەرزینەوەی کۆتا ساتەکانی تەمەنی گۆی زەوی، هەڵبەتە لەرزینەوەو بوومە لەرزەکانی دیکەش کە بەسەر زەویدا دێن، هەر هی زەوین، بەڵام ئا ئەوەیان شتێکی تایبەتە، چونکە دەبێتە هۆی نەمانی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی و، دەبێتە هۆی نەمانی گۆی زەوی و تەفرو توونا بوونی و، پێکدادرانی چیاکانی و، گڕ گرتنی دەریاکانی و، گۆڕانی گۆی زەوی، لەم حاڵەتەی کە ئێستا دەیبینین، بۆ حاڵەتێکی دیکە، کە بەس خوا ﷻ دەزانێ چۆنە!

﴿وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ٢﴾، زەوی قورساییەکانی خۆی دەرهاویشت.

هەندێک لە زانایان گوتوویانە: قورساییەکانی خۆی، واتە: ئەو خەزنەو زێڕو زەمبەرەی کە مرۆڤ کردوویاننە خەزنەو لە ژێر زەویدا شاردوویاننەوە، بەڵام وێڕای ئەوە (أَثْقَالَهَا) دەگونجێ مەبەست پێی مردووەکان بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو کانزاو ماددە قورسە گەرم و گڕگرتووانە بێ، کە لە نێو ناخی زەویدان، یاخود مەبەست پێی هەموو ئەوانە بێ.

﴿وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾﴾، ئینسان دەڵێ: ئەوە چییەتی؟ واتە: زەوی چی لێهاتوە وا بەو شێوەیە؟! تاکو ئێستا ئارام و سەقامگیر بووەو ئێمە توانیومانە بە ئارامیی لەسەری بژین، ئێستا چیەتی وا دەلەرزێتەوەو دەهەژێ؟!

﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾﴾، لەو ڕۆژەدا هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە پەروەردگاری پەیامی بۆ ناردوە (پەیامی پەنهان)، واتە: زەوی کە وا دەکات لە خۆیەوە وا ناکات! بەڵکو بە پێی ئەو سروش و پەیامە کە خوا ﷻ بۆی ناردوە، بەو شێوەیە دەکات، هەڵبەتە زەوی بە زمانی حاڵ ئەو هەواڵانەی خۆی دەگێڕێتەوەو، حاڵەکەی تەعبیر لە وتار (قال)ەکەی دەکات، ئەگەرنا مانای وانیە کە زەوی لەو کاتەدا دێتە گۆ[1].

﴿يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾﴾، لەو ڕۆژەدا خەڵک کۆمەڵ کۆمەڵ دەڕۆن و دێنەدەر لە زەوی، تاکو کردەوەکانی خۆیان پێشان بدرێ و بخرێتە بەرچاویان.

﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾﴾، ئنجا هەر کەسێک بەقەدەر گرانایی، گەردێک چاکەی کردبێ، دەیبینێتەوەو، هەر کەسێک هێندەی گرانایی گەردێک خراپەی کردبێ، دەیبینێتەوە، واتە: هەموو شتێک دەکەوێتەوە بەرچاوی مرۆڤ.

---

(١) هەرچەندە هەندێک زانایان ڕایەکی وایان هەیە، بەڵام ڕای ڕاست و دروست ئەوەیە کە گوتمان وەک لە تەفسیری (سورة الزلزلة)دا باسمان کردوە.

قورئـان بـەو شـێوەیە، بۆیـە زانایـان زۆر جوانیـان گوتـوە: (**الْقُـرْآنُ يُفَـسِّرُ بَعْضُـهُ بَعْضًـا**)، واتـە: قورئـان هەندێکـی هەندێکـی تەفسـیر دەکات، لێـرەدا ئـەم (زَلْزَلَةَ)یـە، نازانیـن چۆنـە! بـەڵام لـە سـوورەتی (**الزلزلـة**)دا، خـوا ﷻ جـوان جـوان لـەو هەشـت ئایەتـەدا بـۆی شـیی کردووینـەوە، کـە ئـەو لەرزینـەوەو بوومەلـەرزە مەزنـە چۆنـەو مـرۆڤ لـەو کاتـەدا هەڵوێسـتی چـی دەبـێ و، سـەرەنجامیش چ دەرهاویشـتەیەکی دەبـێ؟!

**هەڵوەسـتەی دووەم:** هەڵوەسـتەیەک لەسـەر وشـەی: (ٱلسَّاعَةِ)، لە: ﴿إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ﴾دا، کـە لێـرەدا وەک گوتمـان: زیاتـر مانـای ئاخیـر زەمـان دەگەیەنـێ، ئـەو کاتـە دیارییکـراوەی کـە ژیـانی مرۆڤـی لـەم سـەر زەوییـە تێـدا کۆتایـی دێ، بـەڵام بـە سـەرنجدانی کـۆی ئایەتـەکانی قورئـان و هەنـدێ لـە فەرمایشـتەکانی پێغەمبەریـش ﷺ بۆمـان دەردەکـەوێ، کـە وشـەی (ٱلسَّاعَةِ) پێنـج واتـای هـەن، هەڵبەتـە ئـەوەی مـن بـۆم دەرکەوتـوە، چونکـە ئـەوە هەڵهێنجـانی خۆمـەو، ڕەنگـە مانـای زیاتریـشی هەبـن:

١- (**وَقْتٌ مُحَدَّدٌ مِنَ الزَّمَن** الواسع) کاتێکی دیارییکراو لە کاتی فراوان، چ کەم بێ، چ زۆر، پێی دەگوترێ: (ٱلسَّاعَةِ) ئەوە لە زاراوەی قورئان و زمانی عەرەبییشدا، بەڵام ئێستا کە ئێمە دەڵێین: سەعاتێک، یانی: یەک لەسەر بیست و چوار (٢٤/١)ی شەوو ڕۆژێک، بەشێک لە (٢٤) بەشی شەوو ڕۆژێک، ئەوە مانایەکی باوە، مانایەکی زاراوەییە، خەڵکی ئەم ڕۆژگارە وایان داهێناوە، ئنجا ئایا چۆن دەزانین ئەم واتایە هەیە، لە قورئاندا؟ خوا ﷻ لە سوورەتی (**الروم**) ئایەتی (٥٥)دا دەفەرموێ: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە (**ساعة**) (ئاخیر زەمان) دێ، تاوانبارەکان سوێند دەخۆن جگە لە سەعاتێک نەماونەوە، لەم ئایەتەدا (ٱلسَّاعَةِ)ی یەکەمیان، واتە: ئاخیر زەمان، بەڵام (ٱلسَّاعَةِ)ی دووەم واتە: ماوەیەکی کەم و دیارییکراو لە کات.

٢- (**عَلَمٌ عَلَى فَنَاءِ الدُّنْيا**) ناوونیشانێکی تایبەتە بە تێکچوون و نەمانی ژیانی دنیا، وەک لە سوورەتی (**الأعراف**) ئایەتی (١٨٧)دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا

﴿قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّيۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَۚ ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗۗ يَسۡـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِيٌّ عَنۡهَاۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ١٨٧﴾، واتە: لە بارەی (**ساعة**)ەوە پرسیارت لێ دەکەن، کەی لەنگەر دەگرێ؟ بڵێ: زانیارییەکەی تەنها لە لای خوایە ﷻ {تەنیا خوا دەزانێ ئەو (**ساعة**) ئاخیر زەمانە} کەی دێ؟ ﴿لَا يُجَلِّيهَا لِوَقۡتِهَآ إِلَّا هُوَ﴾، تەنیا خۆی (خوا) لە کاتە دیارییکراوەکەی دا ئاشکرای دەکات و دەری دەخات، ﴿ثَقُلَتۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، ئەو (**ساعة**) {ئاخیر زەمانە} لەسەر ئاسمانەکان و زەوی قورسە، ﴿لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗ﴾، کت و پڕ نەبێ، نایەت، کت و پڕ، دێ، یانی: بێ ئەوەی خەڵک چاوەڕوانیی بکات.

کەواتە: ئەوەی کە ئێستا باس دەکرێ: زەوی نیزیکەی چوار ملیارو نیو ساڵ تەمەنی بەڕێ کردوەو، خۆر پێنج ملیار ساڵ تەمەنی بەڕێ کردوەو، بە مەزەندە بایی پێنج ملیار ساڵیش گازی هایدرۆجینی ماوە، بیسووتێنێ و بیکات بە هیلیۆم، ئەو تیشکەش دەدات بە ئێمە، هەروەها هەندێک لە زانایان لە ڕوانگەی ئەو مەزەندانەوە باسی کۆتایی هاتنی زەوی دەکەن، بۆ وێنە: (**رشيد الخطيب الموصلي**) لە کتێبی (**أولى ما قيل في تفسير التنزيل**)دا دەڵێ: کاتێک زەوی یان خۆر تەمەنی سروشتی بەڕێ دەکەن، ئەو کاتە قیامەت دێ!

بەڵام ئەوە لێکدانەوەیەکی هەڵەیە! چونکە ئەگەر بەو شێوەیە بووایە، دەبووایە کەس جاری چاوەڕێی قیامەت نەکات، تاکو چوار پێنج ملیار ساڵی دیکە! بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا تَأۡتِيكُمۡ إِلَّا بَغۡتَةٗ﴾، واتە: کت و پڕ نەبێ بۆتان نایەت، واتە: لە کاتێک دا دێ، خەڵک چاوەڕوانیی ناکات، ئنجا ئەگەر ئەو کاتە قیامەت بێ و ، ئەو کاتە ئاخیرزەمان (**ساعة**) بێ، کە خۆر تیشکی نامێنێ و، تەمەنی زەوی بەشێوەی سروشتیی کۆتایی پێ دێ، بەپێی یاسای دووەمی دینامیکی گەرمیی (The Second low of Thermodynamic)، کە دەڵێ: کاتێک دێ، ئەو گەرمییەی لە تەنە گەرمەکانەوە دەچێ بۆ تەنە ساردەکان، یەکسان دەبن، ئەو کاتە ئەو جموجۆڵە لە کۆمەڵەی خۆرو لە ئەستێرەو کاهکەشانەکاندا

نامێنێ، ئەوەش کاتێکی دیاریکراوەو، ئەگەر زانست زیاتر بەرەو پێشەوە بچێ، دەتوانن زیاتریش دیاریی بکەن، بەڵام نەخێر، خوا ﷻ دەفەرموێ: کەس نایزانێ، کەواتە: ئەوەی کە زانست دەریخستوە، کە دوای ئەوەندە ملیار ساڵەی دیکە، تیشکی خۆر نامێنێ، ئا ئەوەش مرۆڤ دەیزانێ، کەواتە: ئەوە ئەو کاتە نیە، کە ژیانی مرۆڤی لەم سەر زەوییەدا تێیدا کۆتایی پێ دێ، چونکە:

**أ/** خوا دەفەرموێ: جگە لە خوا ﷻ خۆی کەسی دیکە نایزانێ.

**ب/** دەشفەرموێ: کت و پڕ نەبێ نایەت.

**٣-** (**نِهَايَةُ كُلِّ قَرْنٍ مِنَ النَّاس**)، کۆتایی هەر سەدەیەک لە خەڵک، ئەمەش دیسان وشەی (**سَاعَة**)ی بۆ بەکارهاتوە، وەک لەم فەرموودەیەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**عَنْ أَنَسٍ** ﷺ، **أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنِ السَّاعَةِ، وَعِنْدَهُ غُلَامٌ مِنَ الْأَنْصَارِ، يُقَالُ لَهُ: مُحَمَّدٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَنْ يَعِشْ هَذَا الْغُلَامُ، فَعَسَى أَلَّا يُدْرِكَهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ**} (**أخرجه مسلم: ٢٣٦٩**).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (**سَاعَة**) کەنگێ دێ؟! پێغەمبەریش ﷺ منداڵێک لە ئەنصارییەکان کە ناوی موحەممەد بوو، لەوێ لە نیزیکیەوە وەستا بوو، ئاماژەی بۆ کردو فەرمووی: ئەگەر ئەمە تەمەن بکات، ڕەنگە نەکەوێتە تەمەنی پیرییەوە کە (**سَاعَة**) دێ.

واتە: ئەم جیلەی ئێوەو ئەم سەدەیەی ئێوە، کەستان نامێنێ لەسەر زەوی و، (**سَاعَة**)ی ئێوە دێ، ئنجا خەڵکێک کە سەرکێڵ بن، یاخود لە بیانوو بن، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ، وەک لە هەندێ کتێباندا ئەوە هاتوەو گوتوویانە: تەماشا بکەن! موحەممەد نەیزانیوە کەی ئاخیر زەمان دێ، ئەوەتا وایزانیوە دوای ئەوەی ئەو کوڕە گەنجە دەکەوێتە تەمەنەوە، ڕەنگە نەگاتە تەمەنی پیریی کە ئاخیر زەمان دێ، بەڵام نا! بەڵکو مەبەستی پێ ئاخیر زەمانی ئەو سەدەو خەڵک و کۆمەڵگایە بووە، کە ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ لە نێویاندا بوو.

٤- هەروەها (ساعة) وەک ناو بۆ ڕۆژی قیامەتیش بەکارهاتوە، واتە: ڕۆژی هەڵسانەوەو زیندوو بوونەوە، چونکە ڕۆژی دوایی دوو قۆناغی سەرەکییە:

قۆناغی یەکەم: تێکچوونی ئەم سیستم و واقیعەی ئێستا.

قۆناغی دووەم: دروست بوونەوەی ژیانێکی دیکەو، داڕشتنەوەی گەردوون، یان ئەوەی کە بەس خوا ﷻ دەیزانێ چییە، بە شێوەیەکی دیکە.

وەک لە سوورەتی (**إبراهیم**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە زەوی وەک خۆی نامێنێ و، ئاسمانەکانیش وەک خۆیان نامێنن و، بۆ خوای تاکی مل پێ کەچکەر دێنە گۆڕێ.

هەروەها لە سوورەتی (**الزمر**)یش دا ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: جارێک فوو بە کەڕەنا داکرا (بۆ جاری یەکەم) هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویی دایە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، ئەگەرنا هەموویان کۆتاییان دێ، (مەگەر ئەوەی خوا ﷻ بیەوێ، وا پێ دەچێ مەبەست پێی فریشتەکان بێ)، دوایی جارێکی دیکە فوو بە کەڕەنادا کرا، هەموویان هەڵدەستنەوەو چاوەڕێ دەکەن.

ئنجا وشەی (**سَاعَة**) بۆ قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی، کە (**قِيَامَة**)ی پێ دەڵێن، بەکارهاتوە، وەک لە سوورەتی (**الروم**)، ئایەتی(٥٥)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە (**سَاعَة**) دێ، بەڵگەمان چییە، لێرەدا: (ٱلسَّاعَةُ) مەبەست پێی قیامەتە؟!

چونکە دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی کە قیامەت دێ، تاوانبارەکان سوێند دەخۆن، کە جگە لە

سەعاتێک نەماونەوە، کەواتە: ئەوە دوای ئەوەیە کە زیندوو کراونەوەو ئەو سوێندە دەخۆن و، دەڵێن: ئەوەندەی ماوینەوە (کە مەبەستیان پێ ژیانی بەرزەخە، یاخود ژیانی دنیایە) تەنیا سەعاتێکە لە چاو ئەو کاتە درێژو نەبڕاوەیەی کە لە قیامەتدا بەسەریان دادێ.

**٥-** هەروەها (ساعة) ناوە بۆ کاتی مردن (أَجَلْ)ی هەر تاکێک، وەک ئەو ئایەتەی سوورەتی (**الأنعام**) دەلالەتی لەسەر دەکات، کە دەفەرموێ: ﴿قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱللَّهِ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا۟ يَٰحَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانە زیانبار بوون، کە دیداری خوایان بە درۆ دانا، تاکو کاتێک کە (سَاعَة) کت و پڕ بۆیان هات، گوتیان: داخ و خەفەت بۆ ئێمە، لەسەر ئەوەی کەمتەرخەمییمان کرد لە ژیانی دنیادا.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿جَآءَتْهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً﴾، ئاشکرایە جارێ نە ئاخیر زەمان هاتووەو، نە قیامەتیش هاتوە، کەواتە: ئەو (سَاعَة)یەی ئەوان کە هاتوە، واتە: ئەو کاتی مردن (أَجَلْ)ە تایبەتییەی هەر کامێک لەوان.

**مەسەلەی دووەم:**

**پێناسەی (سَاعَة) لەمیانی چەند شتێکدا کە تییدا دەقەومێن: شیردەر ئاگای لە شیرەخۆری نامێنێ و، خاوەن تۆل حەملەکەی لەبار دەچێ و، خەڵک وەک سەر خۆشان دەبینرێن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

دوای ئەوەی خـــوا ﷻ باسی (ٱلسَّاعَةِ)ی کردو، باسی لەرزینەوەی ئاخیرزەمان (ٱلسَّاعَةِ)ی کرد، ئنجا بۆمان پێناسە دەکات، کە چی دەقەومێ، دەفەرموێ:

١)- ﴿ يَوْمَ تَرَوْنَهَا ﴾، واتە: ئەو ڕۆژە کە دەیبینن، چی دەبینن؟! واتە: لەرزینەوە دیارییکراوەکەی کە لە ئاخیر زەماندا دەقەومێ، دەبینن، ئنجا ئایا کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَ تَرَوْنَهَا ﴾، دوێنراوان کێن؟! دوێنراوان هەر کەسێکن کە بگونجێ لەو کاتەدا شت ببینن، ئایا چی دەبینن؟!

٢)- ﴿ تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ ﴾، لەو ڕۆژەدا کە ئێوە لەرزینەوەی تایبەتی گۆی زەوی دەبینن لە ئاخیر زەماندا، هەر ئافرەتێکی شیردەر بێ ئاگا دەبێ و دەخافڵێ و ناپەڕژێتە سەر شیرە خۆرەکەی خۆی.

وشەی (تَذْهَلُ) لە (ذُهُول)ەوە هاتوە، دەڵێ: (**الذُّهُولُ: نِسْيَانُ مَا مِنْ شَأْنِهِ أَنْ لَا يُنْسَى لِوُجُودِ مُقْتَضِي تَذَكُّرِهِ**)، (**ذُهُول**) بریتیە لە لەبیرچوونی شتێک کە حاڵی وابێ، نابێ لە بیر بکرێ، لەبەر ئەوەی کە داخوازیی بیر هاتنەوەی هەیە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ﴾، واتە: هەموو ئافرەتێکی شیردەر، لە زمانی عەڕەبییدا: ئەو کردارانەی تایبەتن بە ئافرەتەوە، پێویست ناکات (ة)ی مێینەیان بچێتە سەر، بۆ وێنە: تەنیا ئافرەت شیر دەدات بە منداڵ و پیاو شیر نادات بە منداڵ! بۆیە پێویست ناکات بڵێین: (**مُرْضِعَة**)، دەڵێین: (**إِمْرَأَةٌ مُرْضِعْ**)، کە بە (**مَرَاضِعْ**) کۆدەکرێتەوە، یاخود بەس ئافرەت تۆلدار دەبێ و پێویست ناکات، بڵێین: (**حَامِلَة**) بەڵکو دەڵێین: (**أَمْرَاةٌ حَامِل**)، بەڵام لێرەدا بۆچی (ة)ی مێینە خراوەتە سەر (**مُرْضِعَةٍ**)؟

بنچینەیەک هەیە لە زمانی عەڕەبییدا، دەڵێ: ئەو وشانەی تایبەتن بە ئافرەتانەوە، کاتێک (ة)ی مێینەیان دەچێتە سەر، ئەو واتایە دەگەیەنن: کە ئەو ئافرەتە لەو حاڵەتەدا ئەوکارە دەکات، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ﴾، واتە: هەموو ئافرەتێکی شیردەر لە کاتی شیرپێدانی منداڵەکەیدا، لە منداڵەکەی بێ ئاگا دەبێ! چونکە کە دەڵێن: ئەو ئافرەتە شیردەر (**مُرْضِعْ**)ە، واتە: کۆرپەی هەیە، بەڵام مەرج نیە ئێستا لەو حاڵەتەدا شیری پێ بدات، بەڵام کە گوتت: (**هَـٰذِهِ المَرْأَةُ مُرْضِعَةٌ**)، واتە: ئێستا شیردەدا بە منداڵەکەی، ئنجا ئافرەت لە ئان و سات و کاتێکدا کە منداڵەکەی بە بەر مەمکیەوەتی و شیری پێ دەدات، لێی بێ ئاگا بێ، گرنگترە لەوە کە منداڵەکەی بە بەر سینگیەوە نەبێت و، گۆی مەمکی لە زاری منداڵەکەیدا نەبێ، بۆیە خوا ﷻ ئەو (ة)ی زیاد کردوە بۆ وشەی (**مُرْضِعْ**)، تەماشا بکەن! فەرمایشتی خوا ﷻ چەند وردە!

ئنجا دەشفەرموێ: ﴿تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ﴾، هەموو ئافرەتێکی شیردەر، بۆ ئەوەی پێت وا نەبێ کە ڕەنگە ئەو ئافرەتە هەر غیرەتی کەم بێ، یان ئەو ئافرەتە ڕەنگە دڵی بێهێز بێ، بۆیە لە منداڵە شیرە خۆرەکەی بێ ئاگا بووە، نا!! هەر ئافرەتێک هەرچەندە دڵی بەهێز بێ، هەرچەندە ڕەحمی بەقوەت بێ، یان هەر چۆنێک بێ، هەموو ئافرەتێک لە کاتێکدا کە ئەو لەرزینەوە مەزنە ڕوو دەدات، لە منداڵە شیرە خۆرەکەی خۆیان بێ ئاگا دەبن.

﴿ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ ﴾، واتــە: لــە شــیر پێدراوەکــەی، نەیفەرمــووە: (عَــنْ رَضِيْعِهَــا)، وشــەی (مَــا) (مَوصُولة)یــە، (يَعْنِــي عَــنْ الَّــذِي أرْضَعَتْــهُ)، واتــە: لــەو کۆرپەیــەی کــە شــیری پــێ دەدات، لێــی بــێ ئــاگا دەبــێ.

٣)- ﴿ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا ﴾، ئنجا نەک هەر ئافرەتی شیردەر لە منداڵی شیرە خۆرەی خۆی، لەو کاتەدا بێ ئاگا دەبێ و، ناپەڕژێتە سەری، بەڵکو هەر ئافرەتێک کە تۆلیشی هەیەو، دووگیانە، ئەوانیش هەموویان تۆڵەکەیان دادەنێن، واتە: منداڵەکەیان لەبەر دەچێ، (الحَمْلُ: مَصْدَرٌ فِي مَعْنَى المَفْعُول بِقَرِيْنَةِ التَّعَلُّق بِفِعْلِ تَضَعُ)، یانی: وشەی (الحَمْلُ) چاوگە، بەڵام بە واتای بەرکار (مَفعول)ە، واتە: کۆرپەیەک کە هەڵگیراوە لە سکدا، ئەویش بە نیشانەی ئەوە کە پەیوەست کراوەتەوە بە وشەی (تَضَعُ) دایدەنێ، هەر خاوەن تۆڵێک تۆڵەکەی خۆی دادەنێ، بۆچی خوا ﷻ نەیفەرمووە: (وَتَضَعُ كُلُّ حَامِلٍ حَمْلَهَا)؟ بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا ﴾، بۆ ئاگادارکردنەوە لەوە کە ئەو تۆڵە زۆر پەیوەستە بەو تۆڵدارەوە، ئەو کۆرپەیە زۆر پێیەوە پەیوەستە، بۆیە کاتێک کە دایدەنێ و لە باری دەچێ، دیارە هۆکارێکی زۆر بێ ڕەزا هاتۆتە پێش، ئەگەرنا منداڵ لە سکی دایکیدا، وا بە ئاسانیی نایەتە دەرێ و لە باری ناچێ.

ڕووداوێکی دیکە کە ڕوو دەدات:

٤)- ﴿ وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ ﴾، ﴿ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ ﴾ واتە: خەڵکی دەبینی سەر خۆشن، بەڵام سەر خۆشیش نین، واتە: وەک سەر خۆشان دەیانبینی، ئەمە لە ڕووی ڕەوان بێژییەوە پێی دەگوترێ: (التَّشْبِيهُ البَلِيْغ)، واتە: وێک چواندنێکی ئەوپەڕیی، کە گەیشتۆتە کۆتایی لە شێوازی وێک چواندندا، خەڵک دەبینی سەرخۆشن، کەچی سەرخۆشیش نین، وشەی (سُكَٰرَىٰ) کۆی (سَكْرَان)ە، هەڵبەتە بە (سَكْرَى)ش خوێنراوەتەوەو وشەی (سَكْرَى) کە لەسەر کێشی (عَطْشَى)یە و، کۆی (عَطْشَان)ە، ئنجا چ بە (سَكْرى) چ بە (سُكَارى) بخوێندرێتەوە، هەردووکیان تاکەکەیان بریتیە لە (سَكْران)، وەک چۆن تاکی (عَطْشى) بریتیە لە (عَطشان) واتە: تینوو، تینووەکان، (سَكْران) کە کۆیەکەی

(**سُكارى**)یە، یاخود (**سَكْرى**)یە، کەسێکە هۆشی لە لای خۆی نەماوە، ئنجا بە هەر هۆیەکەوە بێ، بەهۆی مەی خواردنەوەوە بێ، یان بەهۆیەکی دیکەوە کەسێک لە هۆش خۆی بچێ، یاخود بەنج دەکرێ و هۆش و هەستی لە لای خۆی نامێنێ.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ﴾، ئەمە دیارە لە شوێنی حاڵدایە، یانی: حاڵی خەڵکیش وایە سەرخۆش نین، ئەدی بۆچی وا دێنە بەرچاو؟! چونکە سەر خۆش کەسێکە هاوسەنگیی تێکدەچێ و، هۆشی لە لای خۆی نیە، هەم قسەی بێجێ دەکات، هەم هەڵسوکەوتی بێ جێ دەکات، هەم هاوسەنگیی تێکچووەو بەولاو بەولادا دەچێ، وەک ئەوەی لە حاڵی سەر خۆشان دەیبینن، ئنجا خەڵک لەو ڕۆژەدا ئاوایان لێ دێ، بۆچی وایان لێ دێ؟! ئایا بەهۆی سەرخۆشییەوەیە؟! نەخێر! بەڵکو بە هۆی ئەوەوەیە کە:

٥)- ﴿وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ﴾، بەڵام سزای خوا سەخت و توندە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا﴾، ئەمە ئەگەر مەبەست پێی ئاخیر زەمان بێ، واتە: پێش ئەوەی ئەم دنیایە کۆتایی بێ و، لە گەرمەی کۆتایی پێ هاتنی ئەم دنیایەدا، ئەو کاتە دەگونجێ بڵێین: مەبەست لە لەبەر چوونی ئافرەت بۆ کۆرپەکەی، مانای ڕاستەقینەی خۆیەتی، چونکە لەو کاتەدا، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا عَلَى شِرَارِ الْخَلْقِ**} (**أخرجه مسلم: ٥٠٦٦، وابن حبَّان: ٦٨٣٦، وأبو عوانة: ٧٥٠٧**).

واتە: ئاخیر زەمان تەنیا بەسەر خراپترینی خەڵک دادێ، بێگومان ئەو کاتە ئافرەتیش دەبن و، ئافرەتی سکپڕو تۆڵداریش دەبن و، کۆرپەکانیان لەبەردەچن لە حەژمەتان کە ئەو لەرزینەوەیە دەبینن.

بەڵام ئەگەر مەبەست پێی قیامەت بێ، لەو کاتەدا ئافرەت تۆلیان نیە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: بۆ ئەو کاتەش دەگونجێ ئەو ئافرەتەی، کاتێک دووگیان بووەو مردووە، بەو شێوەیە زیندوو بێتەوەو، لەو کاتەدا منداڵەکەی

لەبەر دەچێ، بەڵام ئەوەم پێ مانایەکی بێ هێزە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە ئەگەر گریمان ئافرەتێک لەو کاتەدا تۆڵی هەبووایە، لە باری دەچوو، ئەگەر ئافرەتێک لەو کاتەدا منداڵی بە بەرۆکی وەبووایەو، شیری پێدابایە، ئاگای لێ نەدەما، ئەو کاتە ماناکەی دەبێ ئاوا لێکبدرێتەوە، بەڵام هەندێک لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا دەگونجێ مەبەست لە (ٱلسَّاعَةِ) قیامەت و، قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی بێ، بەڵام من پێم وایە: مەبەست پێی ئاخیر زەمانەو، ئەو کاتەیە کە ئەم ژیانە دنیایەی ئێرەی تێدا کۆتایی پێ دێت.

**مەسەلەی سێیەم:**

**پێناسەی مرۆڤێکی لەگەڵ خوادا نا تەبای، بەبێ زانیاریی مشت و مڕکەری، لاساییکەرەوەی کەسانی خەڵک لە خوا دوور خەرەوەی، سەر کێش و بێ خێر، کە هەر کەس شوێنیان بکەوێ، بەرەو دۆزەخ و ئاگری بە گڵپەی دەبەن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيۡهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، هەروەها لە خەڵک هەن.

لێرەدا خوا ﷻ خەڵک پۆلێن دەکات بەپێی هەڵوێستیان لە بەرانبەر خواو دیداری خواداو، لە بەرانبەر بڕوا بوونیان بە هاتنی ئاخیر زەمان، پاشان هەڵسانەوەدا، خەڵک پۆلێن دەکات بۆ چوار جۆر.

**٢)-** ﴿ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ ﴾، ئەمە جۆری یەکەمیانە، دەفەرموێ: لە خەڵک هەیە، لە بارەی خواوە مشت و مڕ دەکات بەبێ زانیاریی، واتە: بە نەزانیی باسی خوا ﷻ دەکات و، لە بارەی خواوە ﷻ دەدوێ.

**٣)-** ﴿ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ﴾، بە دوای هەر شەیتانێکی یاخیی و سەر کێش و بێ خێر دەکەوێ، لێرەدا مەبەست لە شوێنکەوتنی شەیتان، ملدانی ئەو مرۆڤەیە بۆ شەیتان و پەیڕەو کردنیەتی لە وەسوەسەو دنەدانی شەیتان، مەبەست لە شەیتانیش مەرج نیە، تەنیا شەیتانی جیننیی بێ، بەڵکو وشەی شەیتان، واتە: هەر کەسێک کە خەڵک لە هەق دوور دەخاتەوەو لە (شَطَنَ)ەوە هاتوە، (شَطَنَ يَعْنِي بَعُدَ) شەیتان، یانی: کەسێک کە لە هەق دوورە، ئنجا چ مرۆڤ بێ، چ جینن بێ، (مَّرِيدٖ) دەڵێ: (المَرِيدُ مِن مَرَدَ عَلَى عَمَلٍ إِذَا عَتَا فِيهِ، وَبَلَغَ الغَايَةَ الَّتِي تَتَجَاوَزُ مَا يَكُونُ عَلَيْهِ أَصْحَابُ ذَلِكَ العَمَلِ، وَهُوَ صِفَةٌ مُشَبَّهَةٌ بِالْفِعْلِ)،

واتە: وشەی (مَّرِيدٍ) لە (مَرَدَ)ەوە هاتوە، کەسێکە لە کارێکدا بگاتە ئەوپەڕی و، لەوانە تێپەڕێنێ کە لەو کارەدان و خاوەنی ئەو کارەن، ئنجا کە دەگوترێ: (مَّرِيدٍ)، یانی: لە هەمووانی تێپەڕاندوە، هەر شەیتانێک کە لە خراپەدا پێش هەموو کەس کەوتۆتەوەو، هیچ کەس ناتوانێ هێندەی وی خراپ بێ، ئەوانەی کە بەبێ زانیاریی لە بارەی خواوە مشت و مڕ دەکەن، بە دوای هەر شەیتانێکی ئاوا دەکەون، بە دوای هەر خەڵک لە خوا دوور خەرەوەیەکی ئاوا دەکەون.

هەندێکیش دەڵێن: وشەی (مَّرِيدٍ) هەروەها (مارِد) (أَيْ المُتَجَرِّد مِنَ الخَيْر) واتە: کەسێک کە لە خێرو چاکە داڕنراوە، هیچ خێری پێوە نەماوەو پیس و نەگریسە، ئنجا ئایا ئەوە حاڵی چۆنە؟!

٤)- ﴿كُتِبَ عَلَيۡهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ﴾: واتە: لەسەری پێویست کراوە (ئەو شەیتانە)، کە هەر کەسێک شوێنی بکەوێ، لەگەڵی دابێ، پەیڕەویی لێبکات و دۆستایەتیی بکات.

٥)- ﴿فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾: ئەوە بە دڵنیایی ئەو بەرەو سزای کڵپەی دۆزەخ ڕێنمایی دەکات و، پێشی دەکەوێ و دەیگەیەنێتە ئەوێ.

﴿كُتِبَ عَلَيۡهِ﴾، (إِسْتِعَارَةٌ لِلثبُوتِ وَاللُّزُومِ أَي: وَجَبَ عَلَيْهِ) واتە: کە دەفەرموێ ﴿كُتِبَ عَلَيۡهِ﴾، ئەمە خوازراوەتەوە بۆ ئەوە کە ئەو شەیتانە بە پێی سیستمێک کە خوا ﷻ دایناوە، سروشتەکەی وایە، هەر کەسێک شوێنی بکەوێ و لەگەڵیدابێ و دۆستایەتیی بکات، گومڕای دەکات، واتە: (كُتِبَ عَلَيْهِ إِضْلاَلُ مَنْ تَوَلَّاهُ)، واتە: لەسەری پێویست کراوە، گومڕاکردنی هەر کەسێک کە شوێنی بکەوێ، ئنجا هەر دە (١٠) جۆرە قورئان خوێندنەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە وشەی (كُتِبَ) دەبێ هەر بە (كُتِبَ) بخوێنرێتەوە، واتە: (بِضَمِّ الكَافِ عَلَى أَنَّهُ مَبْنِيٌّ لِلنَّائِبِ)، هەروەها هەر دە (١٠) جۆرە قورئان خوێندنەوەکان، لەسەر ئەوەش پێکهاتوون، کە هەر کام لە: ﴿أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ﴾ و ﴿فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ﴾، هەردووکیان بە سەری هەمزەکە بخوێندرێنەوە، بە (أَنَّ)، نەک بە (إِنَّ).

## چوار کورتە سەرنج

**١-** کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٍ﴾، واتە: بەبێ زانیاریی و بە نەزانیی لە بارەی خواوە مشت و مڕ دەکات، کەواتە: بە زانیارییەوە لە بارەی خواوە دوان، شتێکی پەسندە، هەر بۆیەش زانایانی ئیسلام زانستێکی تایبەتیان لەو بارەوە بەرهەمهێناوە، پێی دەگوترێ: (**عِلْم التّوْحيد**)، یان (**عِلْم العَقِيْدة**)، یان (**عِلْم الكَلَام**)، یان (**عِلْم أُصول الدِّيْن**)، یاخود (**عِلْم الفِقْه الأَكْبَر**).

**٢-** کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ﴾، واتە: هەر کەسێکی چنگ بکەوێ لە شەیتانانی گومڕاکەر، شوێنی دەکەوێ و، هیچ کامیان جەب نادات.

(**سبحان الله**) هەندێ کەس هەیە سروشتەکەی هێندە خراپە، هەر کەسێکی خراپی چنگ بکەوێ، لەگەڵی دادەبێ و، پشتگیریی دەکات و، خۆشی دەوێ و، دۆستایەتیی دەکات، وەک مێشە ڕەشە، چۆن هەر شتێکی پیسی چنگ بکەوێ، لەسەری دەنیشێ، بۆیە دەفەرمویٚ: ﴿كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ﴾، واتە: یەک شەیتان جەب نادات، هەر شەیتانێکی بێ خێرو نەگریس و پیسی چنگ بکەوێ، لەگەڵی دادەبێ.

ئێستا کەسی وا هەیە، لێرە لەم هەرێمی کوردستانە، لە عێراق، یان لە هەر شوێنێکی دیکەی دنیادا، لە هەموو گەل و نەتەوەکان، دەگەڕێ و دەسووڕێ و دەپشکنێ، لە کوێ ئینسانێکی بێ دین و مولیحدو خراپەکار هەیە، دەیدۆزێتەوەو خۆشی دەوێ و دۆستایەتیی دەکات، هەوڵ دەدات لێی نیزیک بێ و، لێی بەهرەمەند بێ!

**٣-** کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿كُتِبَ عَلَيۡهِ﴾، واتە: بە پێی سیستمی خوا ﷻ ئەو شەیتانانە، ئەوە بەرهەمیانە، نەک خوا ﷻ ئەوەی لەسەر پێویست کرد بن، واتە: خوا ﷻ لەسەر

شەیتانەکەی پێویست نەکردوە، کە دەبێ خەڵکی گومڕا بکەی! بەڵام خوا ﷻ بە پێی سیستم (**نظام**)ێک کە لە گەردوون و ژیانی مرۆڤدا دایناوە، ئەو شەیتانە حاڵەتی وایە، هەر کەسێک ڕەگەڵی بکەوێ و بە دوای بکەوێ، گومڕای دەکات، بە پێی سیستمی خوا ﷻ وایە، هەروەک چۆن کەسێک ژەهر بخواتەوە، پێی دەمرێ، خوا ﷻ سروشتی ژەهری وا هەڵخستوە هەر کەسێ بیخواتەوە، پێی دەمرێ، نەک خوا ﷻ بەو ژەهرەی فەرموو بێ: دەبێ وابکەی، نا! بەڵام سروشتەکەی وایە، ئەو شەیتانەش سروشتەکەی وایە، نەک خوا ﷻ لەسەری پێویست کردبێ، چونکە خوا ﷻ شتی خراپ لەسەر کەس پێویست ناکات، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ ۝٢٨﴾ إبراهيم، واتە: خوا فەرمان ناکات بە ناقۆڵاو خراپە.

٤- کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ﴾، واتە: ڕێنمایی دەکات، یاخود دەیگەیەنێتە سزای بە کڵپە، (ٱلسَّعِيرِ) واتە: ئاگری کڵپەدارو بڵێسەدار، ئەمە یان:

أ- جۆرێکە لە گاڵتە پێکردن، چونکە ئەوە چ هیدایەت و ڕێنماییەکە، سەرەنجام ئینسان بچێتە نێو ئاگری دۆزەخەوە!

ب- دەشگونجێ بڵێین: ئەمە واقیعێکەو ئەو شەیتانە بێ خێرە، هەر کەسێک شوێنی بکەوێ، ئنجا ئەگەر مرۆڤە، ئەگەر جیننە، هەر کەسێک شوێنی بکەوێ، سەرەنجام دەیگەیەنێتە سزای بەکڵپە، نەک هەر ڕێی پێشان دەدات، چونکە وشەی (وَيَهۡدِيهِ) هەم مانای: ڕێ پێشاندان دەگەیەنێ، هەم بە مەنزڵگە گەیاندنیش دەگەیەنێ، کە لێرەدا هەردووکیان دەگونجێن، واتە: هەم ڕێی کڵپەی دۆزەخی پێشان دەدا، هەم دەشیگەیەنێتە نێو بڵێسەی دۆزەخ.

**مەسەلەی چوارەم:**

**بەڵگە هێنانەوەی خوا ﷻ لەسەر ئاسانیی زیندوو کرانەوە، بە چۆنیەتی دروست بوونی مرۆڤ و، تێپەڕاندنی بە حەوت قۆناغانداو، زیندوو کردنەوەی زەوی بە دابەزاندنی ئاو بە سەریداو، تێدا ڕوانی چەندان جۆرە ڕووەکیی جوان و ڕەونەقدار:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ ۚ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنۢ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنۢبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ۝٥﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەژدە بڕگەدا:

١)- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، ئەی خەڵکینە! جاری یەکەم خوا ﷻ فەمووی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ﴾، ئەم جارە بانگیان دەکاتەوە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾! جاری یەکەم بانگی کردن بۆ هۆشداریی پێدان و وریا کردنەوە، لەوەی خۆیان ئامادە بکەن بۆ لەرزینەوەی ڕۆژی دوایی، یاخود بزانن کە ئەم ژیانە دنیاییە ئارامەی ئێستا دەیگوزەرێنن، هەروا بەردەوام نابێ، کاتێک دێ، دەپێچرێتەوەو کۆتایی پێ دێ، ئەویش بە چی؟ بەو لەرزینەوە مەزنەی کە بۆ زەوی دیارییکراوە، ئەم جارە بانگیان دەکات، بۆ ئەوەی بەڵگەیان بۆ بێنێتەوە لەسەر ئەوە کە زیندوو کردنەوەو هەڵساندنەوەیان لە لایەن خواوە، شتێکی ئاسانە، دوو بەڵگەیان بۆ دێنێتەوە، یەکەمیان: لە زاتی خۆیاندا، دووەمیشیان: لە دەوروبەریاندا.

٢)- ﴿إِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّنَ ٱلْبَعْثِ﴾، ئەگەر ئێوە لە دوو دڵییدان، لە زیندووکرانەوە، لێرەدا (إِن)، (إِنْ الشَّرْطِيَة)یە، هەرچەندە دوو دڵییەکەیان شتێکی جێی دڵنیاییە، بەڵام

خوا ﷻ بۆیە لێرەدا (إِنْ) بەکاردێنێ، واتە: ئەگەر لە دوو دڵییدان، یانی: نەدەبوو بکەونە دوو دڵییەوە، ئەگەرنا دوو دڵییەکەیان شتێکی واقیعەو چەسپاوە.

٣)- ﴿ فَإِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن تُرَابٍ ﴾، ئەگەر لە دوو دڵییدان لە زیندوو کرانەوەو هەڵسێنرانەوە، ئێمە ئێوەمان لە گڵ دروستکردوە، واتە: ئاگادارتان دەکەینەوە کە وەک چۆن لە گڵ دروستمان کردوون، کاتێک دەبنەوە بە خاک و خۆڵیش، دەتوانین جارێکی دیکە دەرتان بێنینەوە، چونکە سەرەتا نەبوون و خوا ﷻ دەری هێناون لە زەوی، ئنجا دوای ئەوەش کە دەچنەوە نێو زەوی و دەمرن و، جەنازەکەتان دەبێتەوە بە خاک و خۆڵ، هەروەک پێشترتان لێدێتەوە، پێشێ چۆنی بۆ دروستکران، دواییش دەتوانێ دروستتان بکاتەوە.

شتێکی زۆر نامەنتیقییە کەسێک بڵێ: ئەو خوایەی دروستی کردووم، دوای ئەوەی دەمرم ناتوانێ دروستم بکاتەوە، ئەدی پێشێ چۆن توانی؟ هەمیشە دروستکرنەوەی شتێک لە دروستکردنی یەکەمی ئاسانترە، هەڵبەتە خوای پەروەردگار وشەی ئاسان و قورسیشی بۆ بەکارناهێنرێن و، هەموو کارەکان بۆ خوای پەروەردگار وەک یەکن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ئێوەمان لە گڵ دروستکردوە، لەبەر ئەوەیە ڕاستەوخۆ ئادەم و حەوا لە گڵ دروست بوون، یاخود لەبەر ئەوەیە ئەو تۆوەی لە نێو منداڵدانی ئافرەتدایە (تۆوی پیاوو ئافرەت)، پێشێ نوتفەیەو ئنجا دەبێتە عەلەقەو دەبێتە موضغە، دوایی دەبێتە کۆرپەلەیەک و لە منداڵدانی دایک دێتە دەرێ، بە شێوەی منداڵ، ئەو نوتفەیە لە خوێن دروست دەبێ، خوێنیش لەو خواردن و خۆراکەیە کە لە زەوی پەیدادەبێ.

کەواتە: بە هەردووک باران دا: جەستەی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ زەوی، دەگەڕێتەوە بۆ گڵ و خاک، چ بە ئیعتیباری بابمان ئادەم، چ بە ئیعتیباری ئەو نوتفەیەی باب و دایکمان، کە ئێمەی لێ دروست بووین.

٤)- ﴿ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ﴾، پێشێ لە گڵ، دوایی لە نوتفەیەک، واتە: تۆویلکەیەک، نوتفەش زیندەوەرێکی بچووکە لە دوو بەشان پێک دێ:

**أ-** لە نێو ئاوی پیاودا، لە نێو هەر دڵۆپەیەکیدا چەند ملیۆن ژیانداری تۆویی **(الحيوان المنوي)** حەیمەن هەن، ئنجا یەکێکیان یەکدەگرێ لەگەڵ هێلکۆڵە **(بُوَيضَة)**ی نێو ئاوی ئافرەتداو لە هەردووکیان ژیاندارێکی دیکە پێک دێ، (٤٦) کرۆمۆسۆمی تێدان و، سیفەتەکانی باب و دایک لەوێدا کۆدەبنەوە، واتە: خانەیەک پێک دێ، لەو دوو زیندەوەرە بچووکەی کە لە نێو ئاوی پیاوو ئافرەتدا هەن.

٥)- ﴿ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ﴾، دوایی ئێوەمان لە عەلەقەیەک دروستکردوە، دوای ئەوەی ئەو نوتفەیە گەورەتر دەبێ، دەبێتە زیندەوەرێکی بچووک، کە خۆی بە منداڵدانی دایک هەڵدەواسێ، وەک زەروویەک، واتە: زیندەوەرێکی زەروو ئاسا.

٦)- ﴿ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾، دوایی لە پارچە گۆشتێکی بە قەدەر زارجوویەک بجوورێ، وێنە بۆ کێشراوو بیچم پێدراو، یاخود وێنە بۆ نەکێشراوو بیچم پێ نەدراو، بێگومان (مُّضْغَةٍ ) پێش ئەوەی بکەوێتە قۆناغی وێنە بۆ کێشران و بیچم و شێوە پێدرانەوە، بێ بیچم و شێوەیە، بەڵام خوای کارزان بۆیە ﴿مُّخَلَّقَةٍ﴾ی پێش ﴿وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ﴾، خستوە، چونکە ئەوەیان زیاتر جێی تێوەڕامان و سەرنجە، کە ئەو ژیاندارە بچووکە لە نێو منداڵدانی دایکدا وردە وردە سەرو سیمای دەردەکەوێ، ئەوە سەریەتی و، ئەوە چاویەتی و، ئەوە گوێیەتی و، ئەوە دڵیەتی و، ئەوانە لاقنی، ئەوانە دەستنی، ئنجا دیارە قۆناغی {غَيْرِ مُخَلَّقَةٍ}، قۆناغێکی لە پێشترە لە ﴿مُّخَلَّقَةٍ﴾، یانی: کە جارێ وێنەی پێنەدراوەو بیچمی پێ نەدراوە، ئەوە قۆناغێکی لە پێشترەو بەپێی ڕیزبەندیی کاتیی بووایە، دەبووایە فەرمووبای: (**مُضْغَةٍ غَيرِ مُخَلَّقَةٍ وَمُخَلَّقَةٍ**)، بەڵام لەبەر ئەو حیکمەتەی باسمان کرد ﴿مُّخَلَّقَةٍ﴾ پێش ﴿ **غَيْرِ مُخَلَّقَةٍ** ﴾ خراوە.

٧)- ﴿لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ﴾، [بۆیە ئەوەتان بە وردیی بۆ باس دەکەین]، تاکو بۆتان ڕوون بکەینەوە، خوا ﷻ چیمان بۆ ڕوون بکاتەوە؟ بەرکار(مفعول)ەکەی قرتێنراو (**مَحذُوف**)ە، یانی:

**أ-** تاكو بۆتان ڕوون بكەینەوە كە ئێمە دەسەڵاتمان هەیە، زیندووتان بكەینەوە.

**ب-** یان: بۆتان ڕوون بكەینەوە چۆن دروست دەبن.

**ج-** یان: بۆتان ڕوون بكەینەوە، چۆن هاتوون؟

**د-** یان: بۆتان ڕوون بكەینەوە چەند نابووت بوون! هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، (**حُذِفَ المَفْعُولُ لِيَذْهَبَ الذِّهْنُ كُلَّ مَذْهَب**)، بۆیە بەركارەكەی قرتێندراوە، تاكو زەین بە لای هەموو شتێكدا بچێ، بەڵام ئەگەر دیاریی كردبایە یەك شت دەبوو.

**٨)-** ﴿وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى﴾، لە نێو منداڵداندا نیشتەجێ و سەقامگیر دەكەین، هەر شتێك بمانەوێ، تاكو كاتی دیارییكراو، نەیفەرمووە: (**مَنْ نَشَاءُ**)، چونكە جارێ نەبۆتە مرۆڤ، بەڵكو فەرموویەتی: ﴿مَا نَشَآءُ﴾، ئەوەی كە بمانەوێ، ئنجا لە حاڵەتی نوتفەدا، یان لە حاڵەتی عەلەقەدا، یان لە حاڵەتی موضغە دا، دەیهێڵینەوە لە نێو منداڵداندا، ئەوەی خوا ﷻ بیەوێ بیكاتە مرۆڤ.

ئنجا بۆچی پێشێ بە كرداری ڕابردوو هێناویەتی: ﴿فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ﴾، ئەوانە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ: ﴿خَلَقۡنَٰكُم﴾، بەڵام لێرەدا بۆچی دەفەرموێ: ﴿وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ﴾، واتە: بە كرداری داهاتوو هێناویەتی؟

پسپۆڕان گوتوویانە: (**عُدِلَ عَنِ المَاضِي إِلَى المُضَارِعِ لاستِحْضَارِ الصُّورَةِ**)، ئەمە لە فەرمایشتی خوادا ئەو عادەتە زۆرە، بۆ ئەوەی وێنەكەت بێنێتە بەرچاو، تەماشا بكە! ئەوە خوا دەیهێڵێتەوە ئەو نوتفەیە، ئەو عەلەقەیە، ئەو موضغەیە، لە نێو منداڵداندا دەیهێڵێتەوە، تاكو كاتی دیارییكراو.

**٩)-** ﴿ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا﴾، دوایی بە شێوەی منداڵ دەرتان دێنین، لێرەدا ﴿ثُمَّ﴾، (**لِلتَرتِيب الرُّتبِي**)، بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، چونكە دوای ئەوە دەبێ بە منداڵ.

وشـەی ﴿طِفۡلٗا﴾، مەبەسـت پێـی جینـسی منداڵانـە، ئەگەرنـا دەبووایـە فەرمووبـای: (ثُـمَّ نُخْرِجُكُـم أَطْفَـالاً)، بـەڵام ﴿ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا﴾، واتـە: (**نخـرجُ كُلَّ وَاحِدٍ مِنْكُم طِفْلاً**)، هـەر کام لـە ئێـوە لـە شـێوەی منداڵێکـی تایبـەت دا دەر دێنیـن.

١٠)- ﴿ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ﴾، دواییش بۆ ئەوەی بگەنە قۆناغی تین و تاقەت و تۆغیان هێزو پێزتان، (**أَشُدّ**) یان: کۆی (**شِدَّة**)ەیە، وەک (**أَنْعُم**) کۆی (**نعمة**)ەیە، یان (**أَشدّ**) وشەیەکە تاکی نیە، یانی: بگەنە قۆناغی تین و تاقەتەکانتان، لە ڕووی جەستەوەو، لە ڕووی حاڵەتی عەقڵەوەو، لە ڕووی حاڵەتی دەروونییەوەو، لە ڕووی حاڵەتی عاتیفییەوە، دەگەنە قۆناغی کامڵبوون و تێرو تەواو بوون.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡ﴾، واتـە: دوایـی بـۆ ئـەوەی بگەنـە قۆناغـی تیـن و تاقەتـان، ئایـا لێـرەدا بۆچـی ئـەم قۆناغـە کـراوە بـە ئامانـج؟ چونکـە لـە هەمـووی زیاتـر نیعمـەتی خـوای تێـدا دەدرەوشـێتەوە.

جێـی سـەرەنجە کـە لـە سـوورەتی (غافـر) ئایـەتی (٦٧)دا، لـەو سـیاقەدا کـە بـە هەمـان شـێوەی ئێـرە بـاسی دروسـت بـوونی مـرۆڤ دەکات، سـەرەڕای ئـەوە، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخٗا ٦٧﴾، واتـە: تاکـو دوایـی بگەنـە حاڵـەتی پیریـی، بچنـە قۆناغـی پیرییـەوە، ئـەدی باشـە بۆچـی لێرەدا وەک سـوورەتی (غافـر) باسـی قۆناغـی پیریەتیـی نـاکات؟ دەڵێیـن: لێـرەدا ئـەوە ناخـوازێ، چونکـە لێـرە خـوا ﷻ دەیـەوێ دەسـتەڵاتی خۆیـمان پێشـان بـدات، ئنجـا دەسـتەڵاتی خـوا ﷻ زیاتـر لـە حاڵـەتی تۆغیـان و تیـن و تاقەتـدا دەردەکـەوێ، نـەک لـە حاڵـەتی پیـرو کەنەفتیـی دا، بۆیـە لێرەدا نەیخواسـتوە بـاسی تەمـەنی پیریـی بکـرێ.

١١)- ﴿وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ﴾، هەشتانە دەمرێندرێ، واتە: پێش ئەوەی بگاتە ئەو قۆناغانە، دەمرێ، کۆتایی دێ، چونکە مردن بۆ هەمووانە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی، پێش گەیشتنە بە قۆناغی تین و تاقەت، یانی: پێش ئەوە دەمرێندرێ، ئەگەرنا هەموویان هەر دەمرێندرێن، بەڵام هەیانە پێش ئەوەی بگاتە ئەو قۆناغانە، دەمرێ.

١٢)- ﴿ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ ﴾، هەشتانە دەگێڕدرێتەوە بۆ خراپترین تەمەن، واتە: تەمەنی پیرو کەنەفتیی و کەلەلایی.

﴿ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ ﴾، خراپترین تەمەن، پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای لێ بە خوا گرتوە، وەک لەم فەرموودەیەدا هاتوە: {**أَللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ ٱلْبُخْلِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ ٱلْجُبْنِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ ٱلدُّنْيَا، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ ٱلْقَبْرِ**} (**أخرجه البخاري: ٢٨٢٢، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ** رضي الله عنه).

واتە: ئەی خوایە! من پەنات پێ دەگرم لە چرووکیی و ڕژدیی و، پەنات پێ دەگرم لە ترسنۆکیی و، پەنات پێ دەگرم لەوە کە بگێڕدرێمەوە بۆ خراپترین تەمەن، پەنات پێ دەگرم لە بەڵای دنیاو لە سزای گۆڕ، واتە: لە سزایەک کە دوای ئەوەی مرۆڤ دەخرێتە گۆڕەوە، دەست پێ دەکات لە قۆناغی بەرزەخ دا.

١٣)- ﴿ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ ﴾، تاکو دوای ئەوەی شتی زانیوە، هیچ نەزانێ، (**أَي: لاَ يَستَفِيدَ مَعْلُوماً جَدِيْداً بَعْدَ أَنْ كَانَ بِإِمكَانِهِ كَسْبُ العِلْمِ**)، واتە: بۆ ئەوەی هیچ زانیاریی تازە فێر نەبێ، دوای ئەوەی کە دەیتوانی شت فێر ببێ، ئینسان کە زۆر دەکەوێتە تەمەنەوە، خانەکانی مێشکی زانیاریی تازە تۆمار ناکەن، ئەوە واتایەکیەتی.

واتەیەکی دیکەی ئەوەیە: ﴿ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ ﴾، دوای ئەوەی شتی زانیوە، ئێستا هیچ نەزانێ، نەک زانیاریی تازە تۆمار نەکەن، بەڵکو ئەوەی پێشێشیان لە بیر بچێتەوە! هەمووتان بینیوتانە هی وا هەیە، کە زۆر دەکەوێتە تەمەنەوە، دوایی ناوی منداڵەکانی خۆیشی لە بیردەچێتەوە، بەڵکو جاری وایە ناوی خۆیشی لە بیردەچێتەوەو خانەکانی مێشکی فۆڕمات دەبنەوەو، هیچ زانیارییان تێدا نامێنێ.

واتە: خوا ﷻ ئاوا ئێوە بەو قۆناغانەدا دێنێ و، ئاواش باڵا دەستە بەسەرتاندا، ئەگەر زۆر تەمەن بکەن ئاواشتان لێ دێ، ناشتوانن واتان لێ نەیەت.

ئەمە بەڵگەی یەکەم: خوا بەو شێوەیە ئێوەی دروست کردووەو، بەو قۆناغانەی داهێناون، کە سەرجەم حەوت قۆناغن:

**یەکەم:** قۆناغی دروستکران لە گڵ (ئادەم و حەووا، یان ماددەو کەرەستەی تۆوی ژن و پیاو).

**دووەم:** تۆویلکە (نطفة).

**سێیەم:** خوێنپارە (علقة).

**چوارەم:** زارجووە گۆشت (مضغة).

**پێنج:** قۆناغی منداڵیی (نخرجکم طفلاً).

**شەشەم:** قۆناغی تین و تاقەت و تێرو تەواویی (لتبلغوا أَشُدَّکم).

**حەوتەم و کۆتایی:** قۆناغی پیرو کەنەفت بوون و کەلەلایی (ومنکم من یُردُّ إلی أرذل العمر).

ئنجا بەڵگەی دووەم دێنێتەوەو دەفەرموێ:

**١٤)-** ﴿ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً ﴾، بەڵگەیەکی دیکە لە سەر ئەوە کە زیندوو کردنەوەی ئێوە لە لای خوا ئاسانە، ئەوەیە کە: زەوی دەبینی بێ هەست و خوست، دەڵێ: (**الهُمُودُ: قَرِيبٌ مِنَ الخُمُودِ خَمَدَتِ النَّارُ: طفئت**): ئاگرەکە کوژایەوە، خەفە بوو، کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ هَامِدَةً ﴾، واتە: وەک چۆن ئاگرێک کوژاوەتەوەو هیچ ترووسکایی تێدا نیەو، گەرمایی تێدا نیە، زەویش دەبینی هیچ ژیانی تێدا نەماوە، وشک و سوورو سەقەتاڵەو بێ ڕووەکە، ئاوای دەبینی.

**١٥)-** ﴿ فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ﴾، بەڵام کاتێک کە ئاومان دابەزاندە سەری، ئاو: باران، بەفر، تەرزە، بۆیە خوا وشەی ﴿ ٱلْمَآءَ ﴾ بەکاردێنێ، چونکە ئەگەر هەر کامێکیانی بەکار هێنابایە، ئەوانی دیکەی نەدەگرتەوە، کاتێ ئاومان دابەزاندە سەری، ئاومان بەسەردا هەڵڕشت.

١٦)- ﴿ اَهْتَزَّتْ ﴾، جووڵا، هەژا، (**الإهتِزَازُ: التَّحرُّكُ إلى أَعْلَى**)، (**إهتِزاز**) بریتیە لە جووڵان بەرەو سەرێ، (**وَالمَقصُودُ: إرتِفَاعُ الأَرْضِ بِالماءِ بِمَا عَلَيْهَا مِنَ العُشْبِ وَالنَّبَات**)، مەبەست لەوەیە کە زەوی دوای ئەوەی ئاوی دادەبەزێتە سەر، ئاوی دەڕژێتە سەر، لە ئاسمانەوە بەشێوەی بەفرو باران و تەرزە، ئەو زەوییە وردە وردە ڕووەکەکانی چەقەرە دەدەن و زەوییەکە بەرز دەکەنەوە، چەقەرەی ڕووەکەکان، ئنجا دانەوێڵەیە، گژو گیایە، دارو درەخت و میوەیە، تەڕەکارە، سەوزەیە، ... هتد.

١٧)- ﴿ وَرَبَتْ ﴾، پۆز دەبێت، (**حَصَلَ لَهَا رَبْوٌ**)، (**الرَّبوُ: هُوَ ازْدِيَادُ الشَّيءِ**)، (**ربو**) بریتیە لە زیاد بوونی شتێک، (**رَبَا، يَرْبُو، رَبْوَاً، أي زَادَ، يَزِيدُ، زِيَادَةً**)، مەبەست پێی هەڵاوسانی زەوییە، وشەی (**رَبَتْ**) خوێنراویشەتەوە: (**رَبَئَت، أَي إرتَفَعَت**) بەرز بۆوە.

١٨)- ﴿ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴾، لە هەر ڕووەکێکی دڵخۆشکەر دەڕوێنێ، لە هەر ڕووەکێکی بە ڕەونەق و جوان، کە کەسێک ببینێ پێی دڵخۆش بێ، دڵی پێی بپشکوێ، ئەو زەوییە قاقڕو دێمەکارو بێ هەست و خوست و بێ ژیان و جووڵەیە، دوای ئەوەی ئاوی دەنێترینە سەر، ئاوا پڕ دەبێ لە ژیان و ، پڕ دەبێ لە ڕووەک و سەوزایی.

(**البَهِيجُ: الحَسَنُ المَنظَرِ السَّارُّ لِلنَاظِر**)، (**بَهِيجٌ**) ئەوەیە کە دیمەنی جوان بێ و، دڵخۆشکەر بێ بۆ کەسێک کە تەماشای بکات.

ئەمە هەردوو بەڵگەکە، زۆر بە کورتیی.

کەواتە خوا ﷻ کاتێ ئێوەی بەو قۆناغانەدا هێناوەو، زەوی بەو شێوەیە، ساڵانە زیندوو دەکاتەوە، دەتوانێ ئێوەش زیندوو بکاتەوە، ئێوەی لە گڵەوە هێناوەو بەو قۆناغانەدا هێناونی، دەشتوانێ جارێکی دیکە دروستتان بکاتەوە، هەروەها زەویش دوای ئەوەی کە مردووە، زیندووی کردۆتەوە، بە ڕووەک، بە هەمان شێوە خوایەک کە لە نەفسی ئێوەدا ئەوەی کردوەو، لە دەوروبەریشتاندا ئاوا دەکات، دەتوانێ ئێوەش زیندوو بکاتەوەو، هیچ دوو دڵیی و گومانتان نەبێ.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**باسکردنی دروستکرانی مرۆڤ بەو جۆرە سەرسووڕهێنەرەو، زیندوو کردنەوەی زەوی، بەهۆی دابەزاندنی ئاوەوە، مەبەست پێی دەرککردنی ڕاستییەتی ڕەهاو تەنیای خوای تاک و پاک و، مسۆگەریی هاتنی قیامەت و، زیندوو کرانەوەی مردووانە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

**١)-** ﴿ذَٰلِكَ﴾، واتە: ئەوەی کە پێشتر باسکرا، دەربارەی چۆنیەتی دروستکردنی مرۆڤ و زیندوو کردنەوەی زەوی، ئەمە سێ واتای هەن:

واتای یەکەم: ئەوەی باسکرا بۆ ئەوەیە کە ئەی مرۆڤ! بزانی وەک چۆن خوا تۆی ئاوا دروستکردووەو، زەوی ئاوا زیندوو دەکاتەوە، بەو شێوەیەش خوا هەق و چەسپاوە.

واتای دووەم: ئەوەی باسکرا بە هۆی ئەوەوەیە کە خوا ﷻ وەک چۆن مرۆڤی وا دروست کردووەو زەوی ئاوا دەژیێنێتەوە، ئاواش خوا هەق و ڕاست و چەسپاوە.

واتای سێیەم: ئەوەی باسکرا بەڵگەی ئەوەیە کە خوا ﷻ هەقەو، لەسەر هەموو شتێک بە توانایەو، مردووانیش زیندوو دەکاتەوەو، ئەوانەش لە گۆڕەکاندان دەریاندێنێتەوە.

**٢)-** ﴿بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ﴾، خوا ﷻ هەق و چەسپاوە، خوا خاوەنی هەموو سیفەتێکی بەرزو پەسندە، یەکێک لە سیفەتەکانی ئەوەیە کە لەسەر هەموو شتێک بە توانایە، کەواتە: لەسەر زیندوو کردنەوەی ئێوەش بە توانایە.

٣)- ﴿ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴾، هەروەها ئەوەی باسکرا، کە دروست کردنی مرۆڤەو، ساڵانە ژیاندنەوەی زەوییە، بەهۆی ئەوەوەیە کە خوا ﷻ مردووان زیندوو دەکاتەوە.

٤)- ﴿ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾، هەروەها ئەوەی باسکرا بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو (خوا) لەسەر هەموو شتێکیش بە توانایە.

٥)- ﴿ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا ﴾، هەروەها ئەوەی باسکرا، بەڵگەی ئەوەیە کە ئاخیرزەمان (ٱلسَّاعَةَ) دێ و، هیچ دوو دڵیی تێدانیە.

٦)- ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ﴾، هەروەها بەڵگەی ئەوەشە، کە خوا ﷻ ئەوانەی لە گۆڕەکاندان، دەریان دێنێتەوە.

تەفسیرەکان زۆر لەسەر ئەوە چوون، ئەم شەش حاڵەتە: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٦ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡعَثُ مَن فِي ٱلۡقُبُورِ ٧ ﴾، هەموویان پەیوەست دەبنەوە بە: ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ەوە، واتە:

**یەکەم:** ئەوەی کە باسکرا، بەڵگەی ئەو شەشانەیە:

١- خوا ﷻ هەقە.

٢- خوا ﷻ مردووان زیندوو دەکاتەوە.

٣- خوا ﷻ لەسەر هەموو شتێک بە توانایە.

٤- ئاخیر زەمانیش دێ.

٥- هیچ دوو دڵیی و گومانی تێدانیە.

٦- هەروەها خوا ﷻ ئەوانەی لە گۆڕەکاندان دەریان دێنێتەوە.

**دووەم:** یاخود: ئەوەی باسکرا بە هۆی ئەوەوە پەیدا بووە، کە خوا ﷻ هەقەو مردووان زیندوو دەکاتەوەو ... هتد.

**سێیەم:** یاخود: ئەوەی باسکرا بۆ ئەوەیە تۆ بزانی: کە خوا ﷻ هەقە، مردووان زیندوو دەکاتەوە، لەسەر هەموو شتێک بە توانایەو، ئاخیر زەمان دێ و، گومانی تێدانیە، هەروەها خوا ﷻ ئەوانەی لە گۆڕەکاندان دەریان دێنێتەوە.

هەرسێک ماناکانیش گونجاون.

## مەسەلەی شەشەم:

**باسی جۆرە کەسێکی دیکەی مشت و مڕکەر لە بارەی خواوەو، بەبێ زانیاریی و ڕێنمایی و کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە، خۆ بادەرو خەڵک گومڕاکەر لەڕێی خوا ﷻ، کە سەرەنجام لە دنیادا ڕیسوایی و، لە دواڕۆژدا سزای سەختی بە مل دادێ:**

{ئەمە جۆری دووەمی ئەو مرۆڤانەیە، کە خوای پەروەردگار پۆلێنیان دەکات، لە بەرانبەر ڕۆژی دواییدا، بە پێی هەڵوێستیان لە بەرانبەر ئاخیر زەمان و هاتنی ڕۆژی دواییدا}.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ٨ ثَانِيَ عِطۡفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ٩ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ١٠ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ (٩) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، لە خەڵکی جۆرە کەسێکی دیکە هەیە ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، بە زۆریی لە قورئاندا بۆ حاڵەتی زەمکردن و سەر زەنشت بەکارهاتوە، وەک لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨ ﴾البقرة، هەروەها لە سوورەتی (العنكبوت)دا: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ ١٠ ﴾، بە زۆریی بۆ حاڵەتی سەرزەنشتکردنە، بۆیە لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، لە خەڵک هەیە کەسانێک:

٢)- ﴿ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ ﴾، لە بارەی خواوە موناقەشە دەکات و، مشت و مڕو، شەڕە قسە دەکات، واتە: لە بارەی بەدیهێنەرایەتیی خواوە، لە بارەی بوونی خواوە، کە مولحیدەکانن، یان لە بارەی ناوو سیفەتەکانی خواوە ﷻ، یان لە بارەی تەنیا پەرستراوێتیی خواوە ﷻ کە موشریکەکانن، هەموویان دەگرێتەوە، بەڵام کە موناقەشەو مشت و مڕ دەکات:

٣)- ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ﴾، بەبێ زانیاریی و ڕێنمایی و کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە، هی یەکەمیان (لە ئایەتی پێشووتردا) لەبەر ئەوەی لاساییکەرەوە (**مُقلِّد**) بوو، چاولێکەر بوو، فەرمووی: ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ﴾، بێ ئەوەی زانیاریی هەبێ، بەڵام لێرەدا دەفەرمووێ: ﴿بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ﴾، ئەمانە ئەوانەن کە خەڵک پەیڕەوییان لێ دەکات و سەرمەشقن و، پێش خەڵک دەکەون (**مُقلَّدْ**)ن، ئەوەی پێش خەڵک بکەوێ، دەبێ زانیاریی هەبێ و، هیدایەت و ڕێنمایی هەبێ و، کتێبێکی ڕوونکەرەوەشی بەدەستەوە بێ، ئنجا زانایان دەڵێن:

**أ-** مەبەست لە زانیاریی (عِلۡمٖ) بریتیە لە بەڵگە نەویستە عەقڵییەکان (**البديهيات العقلية**)، واتە: عەقڵێکی سەلیمی هەبێ و، ئەو شتانەی خوا ﷻ لە هەموو عەقڵێکی سەلیمدا دایناون، زۆر باش لە عەقڵی ئەودا کار بکەن، وەک یاسای هۆکاریی: {هەموو پەیدابوویەک پەیداکەرێکی هەیە}، {هەموو ڕێکخراوێک ڕێکخەرێکی هەیە}، {هەموو مشوور لێخوراوێک مشوورخۆرێکی هەیە}، یان: (٢ + ٢ = ٤)، ئەو بەڵگە نەویستە عەقڵییانە، وشەی (**علم**) یان بۆ بەکاردێ.

**ب-** وشەی ڕێنمایی (هُدٗى)، واتە: توانای بەڵگە هێنانەوەی هەبێ، هەندێک (هُدٗى)یان بە بەڵگە هێنانەوە، لێکداوەتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: (هُدٗى) بەرهەمی ئەو تەقوایەیە کە ئینسان ئەگەر ئەهلی تەقوا بوو، خوای پەروەردگار هیدایەتی پێ دەبەخشێ، هەروەک خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ١٧﴾محمد، هەروەها دەفەرمووێ: ﴿...إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا... ٢٩﴾الأنفال.

**ج-** پاشان دەبێ وەحییشی لەبەر دەستدا بێ (**كتاب مُنير**)، دەبێ عەقڵی باش کار بکات و، توانای بەڵگە هێنانەوەی هەبێ و، ڕۆشنایی دڵ و دەروونی هەبێ، بە هۆی تەقواوە (فورقانی هەبێ)، سەرەڕای ئەمانەش دەبێ کتێبێکی ڕێ ڕۆشنکەرەوەشی لەبەردەستدا بێ (**وحي**).

کەواتە: ئەو کەسە شایانی ئەوەیە خەڵک پەیڕەویی لێ بکات و، لە بارەی خواوە قسە بکات، دەبێ کەسێک بێ هەم عەقڵێکی سەلیمی هەبێ، هەم

دەروونێکی پاک و چاک و، ڕۆشنی هەبێ، هەم شوێنکەوتووی وەحیی خواو، کتێبی ڕێ ڕۆشنکەرەوەی خوای پەروەردگاریش بێ، ئا ئەوانە شایانی ئەوەن لە بارەی خواوە ﷻ قسە بکەن، هەروەها لە بەڵگەو سەلماندن بکۆڵنەوە.

٤)- ﴿ثَانِيَ عِطْفِهِۦ﴾، نووشتێنەرەوەی کەلەکەو تەنیشتیەتی، ئەو کەسە تەنیشتی خۆی دەنووشتێنێتەوە، (**ثَانِي: أَيْ لَاوِي، لَوَى: ثَنَى**)، واتە: نوشتاندیەوە، وشەی (**عِطْف**) بە مانای (**جَنب**) کەلەکە، تەنیشت، دێ، زەمەخشەریی گوتوویەتی: (**ثَنْيُ العِطْفِ عِبارَةٌ عَنِ الكِبْرِ وَالخُيَلَاءِ كَتَصْعِيرِ الخَدِّ وَلَيِّ الجِيدِ**)، واتە: نوشتاندنەوەی تەنیشت، تەعبیری پێ دەکرێ لە خۆ بەزلگریی و فیزو کەشخە، وەک ڕوو وەرچەرخاندن و، مل بادان.

واتە: ئەو کەسە بەبێ زانیاریی و بەپێخواسیی بەنێو کەوتوەو، تفەنگ بە تاریکییەوە دەنێ لە بارەی خواوە، ئنجا سەرباری ئەمەش، بەخۆ بادان و بە فیزو کەشخەشەوە مامەڵە دەکات.

وشەی (**عِطْف**) خوێنراویشەتەوە: (**عَطْف**)، دەڵێ: (**ثَانِي عَطْفِهِ: أَيْ مَانِعَ لُطْفِهِ عَلَى غَيرِهِ**)، واتە: سۆزو بەزەییەکەی خۆی لە خەڵکی دەگرێتەوە.

٥)- ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، تاکو خەڵک لە ڕێی خوا لابدا، کەواتە: ﴿لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، ئەمە هۆکارو عیللەتی موجادەلەو شەڕە قسەکەیەتی، واتە: بۆیە شەڕە قسە دەکات، تاکو خەڵک لە ڕێی خوا لابدات، لێرەدا ﴿لِيُضِلَّ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**لِيَضِلَّ عَنْ سَبِيْلِ الله**)، (**يُضِلَّ**)، گومڕا بکات، (**يَضِلَّ**)، گومڕا ببێ، واتە: بەو جۆرە موناقەشەو شەڕە قسە دەکات بەبێ زانیاریی، تاکو سەرەنجام گومڕا ببێ.

٦)- ﴿لَهُۥ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٌ﴾، لە دنیادا سەرشۆڕیی و زەبوونیی بۆ هەیە، ئەم ئایەتە ئەگەر وەک لە تەفسیرەکاندا باسکراوە، مەبەست پێی ئەو زلەزلانەی قوڕەیش بن، کە لە جەنگی بەدردا کوژران، ئەوە ئیعجازێکی هەواڵییە، یانی: لە دنیادا ئەوانە زەبوون و سەر شۆڕو ڕیسوا دەبن، وەک لە جەنگی بەدردا کەوتبوون، فڕێدرانە قەلیبی بەدرەوە، یاخود مەبەست ئەوەیە کە بابای خۆ بەزلگرو فیزو کەشخەکەر بەسەر خەڵکدا، هەر

لە نێو خەڵكدا ڕیسواو زەبوون و، بە كەم تەماشا كراوە، با خۆیشی خۆی پێ زل بێ، بەڵام خەڵك بە كەم تەماشای دەكات، هەمیشە خەڵك مرۆڤی خۆ بەزلگرو بە دەمارو كەشخەكەرو خۆ پێ زۆریان، پێ كەمە.

٧)- ﴿ وَنُذِيقُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴾، لە ڕۆژی هەڵسانەوەش دا، سزای سووتێنەری پێ دەچێژین.

﴿ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴾، سزای سووتێنەر، ﴿ ٱلۡحَرِيقِ ﴾، واتە: (النَّار)، دەڵێ: (الإِحْرَاقُ: إيقَاعُ نَارٍ ذَاتِ لَهَبٍ فِي الشَّيءِ)، واتە: (إِحْراق) بریتیە لەوە كە ئاگرێكی خاوەن بڵێسە، بەریدەیە شتێك، ئەوە (إِحْراق)ە، كە چاوگە، (حَرِيق)یش، واتە: ئاگرێك كە دەسووتێنێ.

٨)- ﴿ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ يَدَاكَ ﴾، پێی دەگوترێ: ئا ئەوە بەهۆی ئەوەیە كە دوو دەستەكانت پێشیان خستوە، واتە: ئەو سزادرانە لە دوارۆژداو، ئەو ڕیسوا بوونە لە دنیادا، كردەی دەستی خۆتە.

٩)- ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴾، هەروەها بە دڵنیایی خوا ﷻ ستەمكار نیە بەرانبەر بە بەندەكانی، سیفەتەكانی خواش هەموویان لەوپەڕدان بۆیە (ظلاّم) بەكار هاتوە، یان ئەگەر خوا ستەمی لە بەندەكانی كردبایە، ستەمێكی گەورەو زۆری دەكرد - پاكیی بۆ خوا لە ستەم و كەم و كوڕیی - .

## مەسەلەی حەوتەم:

**باسی جۆرە کەسێکی دیکەی لە خواپەرستییدا لەسەر تەل و لە بیانوو، کە بە خۆشیی ئاسوودە دەبێ و، بە گرفتاریی ئاڵۆز دەبێ و، لە شتانێک دەپاڕێتەوە کە زیان و سوودیان نیەو، لە کەسێک دەپاڕێتەوە زیانی نیزیکترە لە سوودی:**

{لێرەدا خوا ﷻ باسی جۆری سێیەممان بۆ دەکات، لەو کەسانە کە بە پێی هەڵوێستییان لە بەرانبەر کارەساتی مەزنی کە بەسەر زەویی دا دێ، کە لەرزینەوە گەورەو مەزنەکەیە، جۆری کەسایەتییان دیاریی دەکرێ}.

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَٰلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُ وَمَا لَا يَنفَعُهُ ذَٰلِكَ هُوَ الضَّلَالُ الْبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدْعُو لَمَن ضَرُّهُ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِ لَبِئْسَ الْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ الْعَشِيرُ ﴿١٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ ﴾، لە خەڵکی هەیە، جۆرە کەسێک کە لەسەر قەراغ، خوا ﷻ دەپەرستێ، لەسەر پەڕو لە قەراغ و تەنیشت، کە بە دڵنیایی لێرەدا مەبەست پێی مسوڵمانێکی ڕووکەش و بە لەقە لەقە، کە لە جیاتی ئەوەی بچێتە نێو جەرگەی دیندارییەوە، لەسەر قەراغێ ڕاوەستاوە، نەچۆتە نێو قووڵاییەکەی.

٢)- ﴿ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ ﴾، ئنجا ئەگەر خۆشیی و ئەو شتەی بە بەرژەوەندیی دەزانێ، تووشی بێ، پێی ئاسوودە دەبێ.

٣)- ﴿ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِ ﴾، بەڵام ئەگەر بەڵایەکی بەسەر بێ، لە سەر ڕووی هەڵدەگەڕێتەوە.

واتە: لەپەو ڕوو دەکەوێ، چونکە ئەگەر مەبەست پێی پاشگەزبوونەوە بووایە، دەیفەرموو: (اِنقَلَبَ عَلَى عَقِبَيهِ)، واتە: بەسەر دوو پاژنە پێیەکەیدا هەڵگەڕایەوە، بەڵام لێرە یانی: لەپەو ڕوو دەکەوێ، پێشێ ڕێک وەستاوە لەسەر ڕاستە شەقامی خوا ﷻ، بەڵام دوایی لەپەو ڕوو دەکەوێ، بە هۆی بەڵایەکەوە کە بەسەری دێ.

لەوبارەوە ئەم فەرمووده هەیە:

**{عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ أَعْرَابِيًّا بَايَعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى الإِسْلَامِ، فَأَصَابَ الأَعْرَابِيَّ وَعْكٌ بِالْمَدِينَةِ، فَأَتَى الأَعْرَابِيُّ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، ثُمَّ جَاءَهُ، فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى؛ ثُمَّ جَاءَهُ فَقَالَ: أَقِلْنِي بَيْعَتِي، فَأَبَى؛ فَخَرَجَ الأَعْرَابِيُّ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّمَا الْمَدِينَةُ كَالْكِيرِ تَنْفِي خَبَثَهَا وَيَنْصَعُ طِيبُهَا} (أخرجه أحمد: ١٥١٧١، والبخاري: ٦٨٩١، ومسلم: ١٣٨٣، والترمذي: ٣٩٢٠، والنسائي: ٤١٨٥، وابن حبان: ٣٧٣٢).**

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: عەڕەبێکی خێڵەکیی بەڵێنی بە پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەر مسوڵمان بوون، بەڵام دوایی کە لە مەدینە تووشی نەخۆشییەک بوو، هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بەڵێنەکەم وێبدەوە، (واتە: مسوڵمانیەتییەکەی ڕەت بکاتەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی نەبوو، پاشان هاتەوە گوتی: بەڵێنەکەم وێبدەوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) ڕازی نەبوو (مسوڵمانیەتییەکەی لێ وەربگرێتەوە)، پاشان هاتەوە گوتی: بەڵێنەکەم وێبدەوە، (پێغەمبەری خوا ﷺ) ڕازی نەبوو، ئیدی ئەو عەڕەبە خێڵەکییە لە مەدینە چووە دەر (واتە: وازی لە ئیسلام هێناو لە شار ڕۆیشتە دەرێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شاری مەدینە وەک مووشەدەمە وایە، ژەنگ و پیسییەکەی فڕێ دەداتە دەرێ و، بۆنی خۆی خۆش دەکات {مووشەدەمە کاتێک ئاسنێ دەخەیە نێو کوورەوە، ئەو ژەنگەی بەو ئاسنەوە بێ، لێی دەکاتەوە}.

٤)- ﴿ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَ ﴾، دنیاو دوارۆژی لە دەستچوون، دۆڕاندوون، کەسێک کە ئاوا دەکات، کاتێک بەڵایەکی تووش دەبێ، لەپەو ڕوو دەکەوێ و واز لە ئیسلام دێنێ،

ئەوە هەم دنیای لە دەست چووە، چونکە بەڵای بەسەرهاتوە، واتە: دنیایەکەی نیە، هەروەها دواڕۆژیشی لە دەست چووە، بەهۆی ئەوەوە کە خۆڕاگر نەبووە، تاکو خوا پاداشتی بداتەوە، لەسەر ئەو بەڵایەی کە بەسەری هاتوە.

٥)- ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴾، ئا ئەوە زیانباریی ئاشکرایە، زیانبارییەک کە هیچ کەس لێی پەنهان نیە.

٦)- ﴿ يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ ﴾، لە جیاتی خواو لە خوار خواوە، لە شتانێک دەپاڕێتەوە، (کە مەبەست پێی بت و صەنەمەکانن) نە زیانی لێدەدەن و، نە سوودی پێ دەگەیەنن، واتە: سوودی پێ ناگەیەنن، ئەگەر لێیان بپاڕێتەوەو بیانپەرستێ، هەروەها زیانیشی پێ ناگەیەنن، ئەگەر لێیان نەپاڕێتەوەو نەیانپەرستێ، یانی: نە سوودی بۆ دێنن و، نە زیانیشی لێ دەدەن، هەڵبەتە لێرەدا دەردەکەوێ کە ئەو مسوڵمانە وەک لە سەرەتاوە گوتمان، مسوڵمانێکی ڕووکەشییەو بە لەقە لەقە، ئەگەرنا مسوڵمان چۆن لە جگە لە خوا دەپاڕێتەوە، کە بت و صەنەمەکانن؟!

٧)- ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴾، ئا ئەوە گومڕایی دوورە، واتە: گومڕاییەکە کە لە گومڕاییەکەی دا زۆر دوورکەوتۆتەوە، بە ئاسانیی نایەتەوە سەر ڕاستەهێڵ، یانی: گومڕاییەکە هیچ گومڕاییەکی ناگاتێ.

٨)- ﴿ يَدْعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦ ﴾، لە کەسێک دەپاڕێتەوە کە زیانی لە قازانج و سوودی نیزیکترە، زانایان لەو بارەوە گوتوویانە: وشەی ﴿ لَمَن ﴾، ئەم (مَن)ە، نابێ (ل)ی بچێتە سەر!! بەڵام لە ڕاستیی دا قورئان دادگایی ناکرێ بەو بنەمایانەی ڕێزمانی عەرەبی کە دوایی زانایان دایانناون، بەڵکو ڕێزمانی عەرەبی دەبێ پابەند بێ بە قورئانەوە، بۆی:

١- هەندێک گوتوویانە: (لَمَن: لَامُ الإبتداءِ وَهِيَ تُفِيدُ مَضْمُون الجُملَة الوَاقِعَةِ بَعْدَهَا)، واتە: ئەم (ل)ە بۆ دەست پێکردنەو، نێوەڕۆکی ئەو ڕستەیەی لە دوایی دێ، بەهێز دەکات.

**٢-** هەندێکیش گوتوویانە: (ل)کە، لە ئەسڵدا ئاوایە: (**يَدعُوا مَنْ لَضَرُّهُ أَقْرَبُ مِنْ نَفْعِهِ**)، واتە: لە کەسێک دەپاڕێتەوە کە زیانی نیزیکترە لە سوودی، کە لە زمانی عەرەبی دا، ئەو بنچینەیەش هەیە کە (ل) کە لە ئەسڵدا هی وشەی دواترە، بخرێتە سەر (**مَنْ**).

**٣-** هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ يَدۡعُواْ ﴾، لێرەدا بە مانای (**يَقُولُ**) دێ، واتە: (**يَقُولُ لَمَنْ ضَرُّهُ أَقْرَبُ مِنْ نَفْعِهِ هُوَ مَوْلَاهُ، أَي هُوَ مَعْبُودِه**)، دەڵێ: کەسێک کە زیانی نیزیکترە لە سوودی، ئەوە پەرستراوی ویە، یانی: بە زمانی حاڵ وا دەڵێ.

ئەوەی پێشێ فەرموویەتی: ﴿ يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥ ﴾، بە (ما) هێناویەتی، کە مەبەست پێی بت و صەنەمەکانن، کە خاوەن هەست و هۆش نین، بەڵام هی دواتر دەفەرموێ: ﴿ يَدۡعُواْ لَمَن ﴾، بە (مَن) هێناویەتی، کە بۆ خاوەن هەست و شعوورو عەقڵان بەکاردێ، بۆیە هی یەکەمیان لەوانەیە مەبەست پێی بت و صەنەمەکان بێ، هی دووەمیان مەبەست پێی تاغووت و فیرعەونەکان بێ، یاخود ئەو سادین و کاهینانەی کە سەرپەرشتیی بتەکانیان کردووە، جار جار خەڵک لەوانیش پاڕاونەتەوە.

**٩)-** ﴿ لَبِئۡسَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَلَبِئۡسَ ٱلۡعَشِيرُ ﴾، کەسێک زیانی لە قازانجی نیزیکتر بێ خراپترین دۆستەو خراپترین هاوەڵ و هاودەمە.

**مەسەلەی هەشتەم:**

**باسی جۆرێکی دیکەی مرۆڤی جیاواز لەو سێ جۆرەی پێشوو، کە بریتیە: لە بڕواداری کردار باش، لێرەدا خوا ﷻ باسی جۆری چوارەمی مرۆڤەکان دەکات، لەو خەڵکانەی کەسایەتییان دیاریی دەکرێ لە بەرانبەر کارەساتی مەزنی ڕۆژی دوایی دا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ ١٤﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ ئەوانەی بڕوایان هێناوە {بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ} هەروەها کردەوە باشەکانیش دەکەن، واتە: هەموو کردەوە باشەکان دەکەن، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، ئەوانە خوا ﷻ دەیانخاتە:

٢)- ﴿جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾، چەند باغ و بێستانێکەوە، کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، ڕووبار بە ژێر کۆشکەکانیاندا دەڕۆن.

٣)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ هەرچی بیەوێ، ئەنجامی دەدات.

ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، ئەوانەی ئیمانیان هەیەو کردەوە باشەکان دەکەن، لە بەرانبەر ئەوانە دایە کە بەبێ زانیاریی لە بارەی خواوە قسە دەکەن، ئەوانەی ئیمانیان بە خوا ﷻ هەیە، لەسەر بناغەی عەقڵ و عیلم و فیترەت و وەحیی، چونکە ئیمانی ڕاست و دروست، دەبێ هەڵقوڵاوی عەقڵ و، هەڵقوڵاوی فیترەت و، هەڵقوڵاوی زانست و، هەڵقوڵاوی وەحیی بێ.

هەروەها لە بەرانبەر کەسانێک دایە، کە لەسەر قەراغن لە خواپەرستییانداو بە کەلادا کەوتوون، ئنجا ئەوانە خوا ﷻ دەیانخاتە نێو باغ و بێستانەکانی خۆیەوە، کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يُرِيدُ﴾، خوا ﷻ هەرچی بیەوێ دەیکات، یانی: بێگومان خوا هیچ شتێکی لەبەر عاسێ نابێ، هەروەها لە شوێنی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ١٦﴾ البروج، واتە: خوا ئەنجامدەری هەر شتێکە کە بیەوێ.

بەڵام لێرەدا بە دڵنیایی مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا ﷻ ئەو هۆکارانەی کردەوەی بەندەکان لەسەریان بەندن، ئەو هۆکارانە دەڕەخسێنێ، بەپێی سیستمێک کە دایناوە، هەروەها خێرو شەڕ لەیەک جیا دەکاتەوەو، پاداشت و سزای داناون.

ئنجا بە هۆی ئەو سیستمەوە کە خوا ﷻ دایناوە، کە ئەگەر تۆ چاکە بکەی، ئەوە پاداشتتەو، ئەگەر خراپە بکەی، ئەوە سزاتە، پاشان خوا چاکەو خراپەشی لە یەک جیا کردوونەوە، لەسەر ئەو بناغەیە خوا ﷻ هەرچی بیەوێ دەیکات، نەک بە هەڕەمەکیی و گۆترەکاریی، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٥٦﴾ هود، واتە: بەدڵنیایی پەروەردگاری من لەسەر ڕێیەکی ڕاستە، واتە: خوا ﷻ بەپێی ئەو سیستم و یاساو وردو دادگەرو کاربەجێیانەی کە دایناون، مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات، نەک بە هەڕەمەکیی و لە گۆترە!

بۆیەش ئەوە ڕوون دەکەمەوە، چونکە ڕەنگە کەسێک بە هەڵە لەو ئایەتە موبارەکە تێبگات، بەڵام لەڕاستیی دا مەبەست پێی ئەوەیە: دەسەڵاتی خوا ڕەهایە، خوا ﷻ دەست بەستراو نیە، ویست (**إرادة**)ی خوا بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە، بەڵام ویستی خواو دەسەڵاتی خوا، لەمیانی ئەو یاسایانەدا کە خۆی داینـاون، لەمیانی ئەو سیستمە دادگەرانەیەدا، کە دایناوە لە ژیانی مرۆڤدا، لەمیانی ئەوەدا خوا ﷻ ویست و دەسەڵاتەکەی جێ بەجێ دەبێ.

## مەسەلەی نۆیەم:

**باسی دەستە پاچەیی بابای بەد گومان بەرانبەر بە خوا ﷻ، کە جگە لە خۆ کوشتن و خۆهەڵواسین، هیچی دیکەی لە دەست نایەت:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأَخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴾.

پێویستە ئەوە بڵێین کە: ڕوونکەرەوەکانی ماناو مەبەستەکانی قورئان، ڕاجیاییان هەیە، کە ئایا ئەوەی لەم ئایەتەدا مەبەستە، کەسی دووەمە؟ لەو کەسانەی کە نەیارن بەرانبەر بە ئیسلام و، هەڵوێستێکی نەرێنییان هەیە بەرانبەر بە هاتنی ئاخیر زەمان و ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت؟ یاخود مەبەست پێی کەسی سێیەمە؟ ئەو کەسەی کە لەسەر قەراغ خوا دەپەرستێ و، هەر لە بیانووە بۆ هەڵگەڕانەوە؟ یاخود مەبەست پێی کەسێکی دیکەیە؟

من زیاتر ئەو ڕایەم پێ پەسندە کە مەبەست پێی کەسێکی دیکە بێ، کە دەگونجێ ئەویش مسوڵمانێکی ڕوو کەشیی و ڕواڵەتیی بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی هەر مرۆڤێک بێ، کە دەستی هیدایەتی خوای نەگەیشبێتێ، لەگەڵ هەردووکیاندا دەگونجێ، بە پێی جۆری تەفسیر کردنەکە.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأَخِرَةِ ﴾، هەر کەسێک گومانی وایە، کە خوا لە دنیا و دوارۆژدا سەری ناخات لێرەدا (**ظَنّ**) بە مانای گومانە، کەواتە: ﴿ يَظُنُّ ﴾، واتە: گومان دەبات، کە جاری وایە ئێمە بۆ (**يظن**) وشەی: پێی وایە، یاخود: وای دادەنێ، بەکار دێنین.

﴿ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ ﴾، کە خوا ﷻ سەری ناخات و یارمەتیی نادات، ئایا ئەو ڕاناوە بۆ کێ دەچێتەوە؟ بۆ ئەو کەسە کە گومانەکە دەبات؟ کە ئەوەیان نزیکترە، یاخود

مەبەست پێی پێغەمبەری خوایە ﷺ؟ واتە: هەر کەسێک پێی وایەو گومانی وایە، کە خوا ﷻ پێغەمبەرەکەی خۆی (موحەممەد) ﷺ سەرناخات و، یارمەتیی نادات لە دنیاو لە دواڕۆژدا، هەردوو واتاکان ڕێیان تێدەچێ، بەڵام لەبەر ئەوەی باسی پێغەمبەر ﷺ نەکراوە، هەرچەندە جاری وایە لە سیاقێکدا باسی کەسێک دەکرێ، ئنجا ئەگەر پێغەمبەری خوایە ﷺ، یان باسی جیبریلە، یان باسی هەر کەسێکی دیکەیە، ناویشی نەهاتوە، بەڵام سیاقەکە دەیگەیەنێ، بەڵام لێرەدا ئەو ڕایە زیاتر پێ دەچێ، کە مەبەست پێی خودی ئەو کەسە بێ، کە ئەو گومانە دەبات، هەر کەسێک گومانی وایە کە خوا ﷻ سەری ناخات لە دنیاو دواڕۆژدا، واتە: گومانی خراپ بەرانبەر بە خوا ﷻ دەبات و بەدبینە بەرانبەر بە خوا ﷻ.

٢)- ﴿فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ﴾، با پەتێک (گوریسێک) درێژ بکات، بەرەو سەرێ.

ئنجا وەک چۆن لە بارەی ڕاناوی (هُ)ەوە لە وشەی ﴿يَنصُرَهُ﴾دا، زانایان ڕاجیاییان هەبووە، کە ئایا مەبەست پێی خودی ئەو کەسەیە کە گومانەکە دەبات، یاخود مەبەست پێغەمبەری خوایە ﷺ، کە گوایە خوا ﷻ موحەممەد سەر ناخات؟

لێرەشدا دیسان دەربارەی ﴿ٱلسَّمَآءِ﴾، زانایان ڕاجیاییان هەیە، ئایا مەبەست پێی سەقفی خانووەکەیە، واتە: با پەتێک بە سەقفی خانووەکەیەوە هەڵبواسێ، یاخود مەبەست پێی ئاسمانە؟ واتە: با هۆکارێک بگرێتەبەر بەرەو ئاسمان، چونکە وشەی (سَبَب)، هەم بە مانای پەت و گوریس دێ، کە لە ئەسڵدا (سَبَب) بەو پەت و گوریسە گوتراوە لە خۆیان بەستوەو، پێیدا سەرکەوتوون بۆ دارخورما، بۆ ئەوەی خورمایەکان لێبکەنەوە، یاخود متوربەی بکەن، دوایی وشەی (سَبَب) بەکارهێنراوە بۆ هەر ئامرازێک کە ئینسان پێی دەگاتە ئامانج و مەبەستێک، کەواتە: ئەگەر (سَبَب) مەبەست پێی گوریس و پەتەکە بێ، واتە: با ئەو گوریس و پەتە، بە سەقفی خانووەکەوە هەڵبواسێ و، خۆی پێ هەڵواسێ، ملی خۆی پێدا بکات، دەشگونجێ مەبەست لە (سَبَب) هۆکار بێ، واتە: با ئامرازو هۆکارێک بگرێتە بەرو پێی بچێتە ئاسمان، ئنجا چی بکات؟

٣)- ﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾، دوایی با ببڕێ، چی ببڕێ؟ لێرەدا پیتی (لْ) زەنە (ە)ی لەسەرە، کە لە ئەسڵدا ئەگەر لە سەرەتای ڕستەوە بێ، (ل) کە ژێر (كَسْرة)ی دەبێ، بەڵام ئەگەر لە نێو قەدی ڕستەدا بێ، وەک ئێرە: ﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾، (ل) کە زەنە (ە)ی دەبێ.

هەندێک لە زانایان بۆ ڕستەی: ﴿ ثُمَّ لْيَقْطَعْ ﴾، دەڵێن: مەبەست ئەوەیە: با خۆی بخنکێنێ، (يَعْنِي: لِيَقْطَع نَفَسَهُ)، واتە: هەناسەی خۆی ببڕێ، ئەوە ئەگەر مەبەست پێی هەڵواسینی پەت و گوریسێک بێ، بە سەقفی خانووەکەوە.

بەڵام ئەگەر مەبەست پێی گرتنەبەری ئامرازێک بێ، بۆ بەرز بوونەوە بۆ ئاسمان، ئەو کاتە ﴿ لْيَقْطَعْ ﴾، واتە: با خۆی ببڕێ لە زەوی، خۆی هەڵبڕێ لە زەوی، واتە: لاقی خۆی بەرز بکاتەوە، ئەمە بۆ هەردوو واتایەکان دەگونجێ، واتە: ئەگەر بیەوێ خۆی بخنکێنێ، با لاقی خۆی لە زەوی ببڕێ و بەرزی بکاتەوە، یاخود ئەگەر بیەوێ بەرز بێتەوە بۆ ئاسمان، با لاقی خۆی بەرز بکاتەوە بە پێچەوانەی هێزی کێشندەوە، کە لێرەدا مەبەست ئەوەیە: ناتوانێ ئەوە بکات.

ئنجا ئایا بۆچی بچێ بۆ ئاسمان؟! تاکو ئەوەی کە پێی وایە خوا ﷻ بۆی ناکات، بچێ بیهێنێتە خوار و وەدەستی بێنێ! کە بێگومان ئەوەشی بۆ ناکرێ.

ئەمە ئەگەر مەبەست لە ڕانەوەکە، ئەو کەسە بێ کە گومانەکە دەبات.

بەڵام ئەگەر بەپێی مانای دووەمیان بێ، کە ڕاناوەکە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بچێتەوە واتە: با ئەو وەحییەی کە بۆ موحەممەد ﷺ دێت، یان ئەو یارمەتیی و سەرکەوتنەی کە لە خواوە بۆی دێ، بچێت بیبڕێ، واتە: با ئەو یارمەتیی و سەرکەوتنە ببڕێ لە ئاسمان، یاخود با ئەو وەحییەی بۆ پێغەمبەر ﷺ دێت، ئەویش پێی قەڵسە، ئەو بابا بەد گومانە بەرانبەر بە خوا ﷻ پێی قەڵسەو، پێی نارەحەتە، با بچێ بیبڕێ.

٤)- ﴿ فَلْيَنظُرْ ﴾، دوایی با سەرەنج بدات، تەماشا بکات.

٥)- ﴿ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴾، ئایا ئەو فێڵ و پیلانەی کە دەیکات، ئەوەی کە ڕقی هەڵدەستێنێ و، ئەوەی کە پەستی کردوە، ئەوە دەبڕێ و کۆتایی پێ دێنێ؟! لێرەدا دیارە ئەوەی کە ﴿ يَغِيظُ ﴾ی پێوە پەیوەستە، ڕاناوی (ه)ی قرتێنراوە، چونکە زانراوە، واتە: (**يَغِيظُهُ**)، (**غَاظَهُ**) ڕقی هەستاندو پەستی کرد، (**يَغِيظُهُ**)، ڕقی هەڵدەستێنێ، (**غَاظَهُ، يَغِيظُهُ، غَيْظاً، أَي أَغْضَبَهُ**)، ئنجا وەک بە (**غَاظَ**)، هاتوە، بە (**أَغَاظَ**)ش هەر هاتوە، لە زمانی عەرەبییدا، بە هەر دوو ڕێژگە (**صيغة**)کە هاتوە.

کەواتە: لێرەدا کەسێک کە بەد گومانە بەرانبەر بە خوای خۆی و، پێی وایە خوا ﷻ سەری ناخات لە دنیاو دوارۆژداو، لەگەڵی میهرەبان نیە، خوا ﷻ پێی دەفەرمویْ: چیت لە دەست دێ، بیکە! یان خۆت بخنکێنە، یان بچۆ لە ئاسمان ئەوەی کە مەبەستتە بە دەستی بێنە، کە خۆ خنکاندنەکە، لە زەرەری خۆیەتی و، چوونە ئاسمانەکەشی مەحاڵە.

ئەگەر مەبەستیش ئەوە بێ کەسێک کە بە پێغەمبەری خوا ﷺ قەڵسە، لەبەر ئەوەی خوا ﷻ سەری دەخات، یان لەبەر ئەوەی خوا ﷻ وەحیی بۆ دەنێرێ، واتە: تۆ ئەگەر پێتوایە خوا ﷻ پێغەمبەری خۆی ﷺ لە دنیاو دوارۆژدا سەر ناخات، لە حاڵێکدا کە سەریشی دەخات، تۆش هەر ئەوەت لە دەست دێ، یان خۆت بخنکێنی، یان بچی بۆ ئاسمان، خۆ خنکاندنەکە ئەوە هیچ! چونکە زەرەری خۆتە، هەروەها چوونە ئاسمانەکەش مەحاڵە، کەواتە: دەستە پاچەی و لە بەرانبەر خوادا هیچت لە دەست نایەت، بۆیە ئەو پیلان و فێڵەی دەیکەی، ئەوەی کە مایەی ڕق هەڵساندن و تورەبوونتە، لای نابات و ئەو پیلانە گرفتەکەت چارەسەر ناکات.

وەک پێشتریش گوتمان: لە نێوان زانایاندا ڕاجیایی هەیە، ئایا مەبەست پێی ئەوانەیە کە مشت و مڕ دەکەن، لە بارەی ئایەتەکانی خواوە، بەبێ زانیاریی و بەبێ ڕێنمایی و بەبێ کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە، یان مەبەست پێی کەسانێکن کە

لەسەر تەل وەستاون بۆ بەندایەتیی بۆ خوا كردن و، ئەگەر وەزعەكەیان بە دڵ بوو، بەردەوامن، ئەگەرنا هەڵدەگەڕێنەوەو، لەپەو ڕوو دەكەون؟

یاخود مەبەست پێی كەسانێكە كە ڕقیان لە پێغەمبەری خوا ﷺو لە هاوەڵانی بەڕێزی بووە؟ هەروەها لە تەفسیرەكاندا باسكراوە كە دەشگونجێ مەبەست پێی كەسانێک بێ كە مسوڵمان بوون، بەڵام دوایی كە كافرەكان ئەشكەنجەو ئازاریان داون و ، ناڕەحەتیان كردوون، هاتنی یارمەتی خوایان پێ درەنگ بووەو پێیان وابووە كە دەبوو خوا ﷻ یارمەتییان بداو، سەریان بخات و، هاوكارییان بۆ بنێرێ و، دەربازیان بكات، خوای كاربەجێش لێرەدا سەرزەنشتیان دەكات، كە ئێوە دوو ڕێتان لە پێشن، ئەگەر بەو سیستم و بەرنامەیەی خوا ڕازی نەبن، كە خوا دایناوە، كە دەبێ، خۆڕاگرو پشوو درێژبن، ئەگەر وا دڵ گچكەو تەنگە پرێسكەن و، پەلە پەل دەكەن و، بە بڕیاری خواو حوكمی خوا ڕازی نین، دوو حاڵتان لە پێشن:

أ- یان خۆتان بخنكێنن و خۆتان لەبەین بەرن.

ب- یان بچن بۆ ئاسمان، كە هەردوو تەگبیرو فێڵەكان، ئەوەی كە هۆكاری ناڕەحەتییتانە، لای نابەن.

## مەسەلەی دەیەم و کۆتایی:

**خوا ﷻ ئایەتەکانی قورئانی بە ڕۆشنیی دابەزاندوون و هەر کەسێکی بوێ، دەیخاتە سەر ڕاستە ڕێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكَذَٰلِكَ ﴾، واتە: هەروەها بەو شێوە سەرسوڕهێنەرە، کە ئەمە هەواڵەکەی دوایی دێ، ئەو شێوە سەرسوڕهێنەرە بۆ چییە؟

٢)- ﴿ أَنزَلْنَٰهُ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴾، ئێمە قورئانمان دابەزاندوە، چەندان ئایەتی ڕۆشنی گرتوونە خۆی و ئەم قورئانەش بریتیە: لەو ئایەتە ڕۆشنانە.

٣)- ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ ﴾، بە دڵنیاییەوەش خوا ﷻ هەر کەسێکی بوێ، ڕاستە ڕێی دەکات، دەیگەیەنێتە ئامانج، نەک ڕێنمایی دەکات، هەرچەندە زۆر لە تەفسیرەکان وایان لێکداوەتەوە، بەڵام وەک زۆرجار گوتوومانە: وشەی (**هِدایة**) لە هەندێ شوێن لە قورئاندا بە مانای ڕێنمایی و ڕێ پیشاندانە، بەڵام لە هەموو شوێنان بە مانای ڕێ پیشاندان و ڕێنمایی نایەت، بۆ وێنە: لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يُرِيدُ ﴾، ئایا یانی: بە دڵنیایی خوا ﷻ هەر کەسێکی بوێ ڕێنمایی دەکات؟ نا! چونکە خوا ﷻ ڕێنمایی هەمووانی کردوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾آل عمران، یانی: ڕێنماییە بۆ جیهانییان، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى ٱلْهُدَىٰ ...﴿١٧﴾ ﴾فصلت، واتە: گەلی سەموودمان هیدایەت دابوون، ڕێنماییمان کردبوون، بەڵام کوێرییان بەسەر ڕێنمایی دا هەڵبژارد.

کەواتە: هیدایەتەکە بۆ هەموو لایەک دەستەبەر کراوە، هیدایەت بە مانای ڕێنمایی کردن و ڕێ پیشاندان، ئەوەیان نەبەستراوەتەوە بەوەوە کە خوا ﷻ

بۆ کەسانێکی تایبەتی تەرخان کردوە، بەڵکو بۆ هەمووانی بە گشتی فەڕاهەم هێناوەو دەستەبەری کردوەو، ڕێ پێشاندان و ڕێنمایی خوا گشتییە، بەڵام بە مانای خستنە سەر ڕاستە ڕێ و، ڕاستە ڕێ کردن و، بە ئامانج گەیاندن، کە ئەمە مانای دووەم و مانای تایبەتی هیدایەتە، ئا ئەوەیان خوا ﷻ بەستوویەتەوە بە ویستی خۆیەوە، کە دیارە ویستی خواش ﷻ پەیوەستە بە حیکمەتی خواوە، بە ڕەحمەتی خواوە، بە زانیاریی خواوە، خوا ﷻ لە ئەسڵدا هیدایەتەکەی بۆ هەمووان ناردوە، ڕێنمایی و ڕێ پێشاندانەکەی بۆ هەمووان ناردوە، بەڵام تەنیا هەندێکیان قبووڵیان کردوە، ئنجا لێرەدا: ﴿يَهۡدِي مَن يُرِيدُ﴾، ئەوانە دەگرێتەوە، ئەوانەی ڕێنمایی خوایان قبووڵ کردوە، خوا ﷻ دەیەوێ بیانگەیەنێ بە ئامانج و مەنزڵ، بەڵام ئەوانەی هیدایەتی خوایان ڕەفز کردوە، ویستی خوا ﷻ وانیە بیانخاتە سەر ڕاستە ڕێ و، بیانگەیەنێ بە ئامانج، بۆچی؟ چونکە کەسێک نەیەوێ بەرەو خوا بچێ، خوا ﷻ بە تۆبزیی ملی ناگرێ، تاکو ملی پێ وەربسووڕێنێ بەرەو لای خۆی، ئەو کاتە تۆبزیی (جبر) کردن ڕوودەدا، خواش ﷻ نەیویستوە زۆر لە بەندەکانی بکات و ، تۆبزییان لێ بکات و ناچاریان بکات.

کەواتە: ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يُرِيدُ﴾، واتە: هەر کەسێک کە ڕێنمایی خوای قبووڵ کردبێ، خوا ﷻ ویستی بۆی هەیە کە بیگەیەنێ بە ئامانج و مەنزڵ و، ڕاستەڕێی بکات و، دوای ئەوەی کە هیدایەتی خوای بە مانا گشتییەکەی وەرگرتوە، هیدایەتی بە مانای تایبەتییشی بۆ بڕەخسێنێ، وەک لە سووڕەتی (محمد)یشدا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ١٧﴾، یانی: ئەوانەی ڕێنمایی خوایان وەرگرتوە، خوا ﷻ هیدایەتی بۆ زیاد کردوون، ئەو هیدایەتە زیادەش بریتیە لەوەی بیانگەیەنێ بە ئامانج و مەنزڵ، هەروەها پارێزکارییشیان پێ ببەخشێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەكانی: (١٧ - ٢٤)، خوا ﷻ لەم هەشت (٨) ئایەتەدا، سێ بابەتی سەرەكیی باس دەكات:

١)- خوا ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەریی لە نێوان بڕواداران و جوولەكەو صابیئەو نەصرانیی و مەجووسیی و هاوبەش بۆ خوا دانەرەكاندا دەكات، ئەو شەش (٦) كۆمەڵە خوا ﷻ لە ڕۆژی دوایی دا لێكیان جیا دەكاتەوەو، دادوەرییان لە نێواندا دەكات.

٢)- هەرچی دروستكراوانی خوان، بە سەرو خوارو، هۆشدارو بێ هۆش و، ژیاندارو بێ ژیانەوەو، هەر كەس لە ئاسمانەكان و لە زەوی دا هەیە، هەروەها خۆرو مانگ و ئەستێرەكان و، چیایەكان و دارو درەخت و ئاژەڵان و، زۆرێك لە خەڵكیش، هەموویان ملكەچی خوان و، كڕنووش بۆ خوا دەبەن، هەروەها ئاماژەش بەوە دەكات: كەسانێكیش سزای خوایان لەسەر پێویست بووە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە بۆ خوا ملكەچ نین.

٣)- باسی دوو كۆمەڵی پێكەوە ناكۆكی بێبڕواو بڕوادار دەكات، كە خوای دادگەر هەر كامێكیان، سزا یان پاداشتێكی پڕ بە پێست و تێرو تەواوی بۆ ساز كردوون، لە ڕۆژی دوایی دا.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ۩ ﴿١٨﴾ ۞ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُواْ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ

وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخْرُجُواْ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، ئەوانەی بوونە جوولەکەو، صابیئەکان و، نەصرانییەکان و، مەجووسیی و، ئەوانەی هاوبەشیان (بۆ خوا ﷻ) داناوە، بێگومان خوا ﷻ لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا لێکیان جیا دەکاتەوە (دادوەرییان لە نێواندا دەکات)، بە ڕاستیی خوا ئاگادارو چاودێری هەموو شتێکە ﴿١٧﴾ ئایا (بە چاوی عەقڵ و دڵ) نابینی کە هەر کەس لە ئاسمانەکان و هەر کەس کە لە زەوی دایەو، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و، چیایەکان و دارو درەخت و ژیانداران و، زۆرێک لە خەڵکی، کڕنووش بۆ خوا ﷻ دەبەن و، زۆرێکیش (لە خەڵک) سزاو ئازاریان لەسەر پێویست بووە، هەر کەسێکیش خوا ﷻ ڕیسوای بکات، هیچ ڕێزگرێکی نابێ، بێگومان خوا ﷻ چی بیەوێ دەیکات ﴿١٨﴾ ئەمانە دوو کۆمەڵی پێکەوە دژن لە بارەی پەروەردگاریانەوە کەوتوونە ناکۆکیی، ئنجا (لە ڕۆژی دوایی دا) ئەوانەی بێبڕوان، پۆشاکیان لە ئاگر بۆ دەبڕدرێ و، ئاوی کوڵاویان بەسەر سەردا دەکرێ ﴿١٩﴾ (سەرەنجام) هەرچی لەنێو سکیان دایەو پێستیشیانی پێ قاڵ دەبێتەوە (دەتوێتەوە) ﴿٢٠﴾ هەروەها گورزی ئاسنیشیان بۆ داندراون (بۆ لێدانیان) ﴿٢١﴾ هەر کات ویستیشیان لەبەر بێزاریی و خەم و ناسۆر لێی بچنە دەرێ (لە دۆزەخ)، دەگێردرێنەوە نێوی (و پێیان دەگوترێ:) سزای سووتێنەر

بچێژن! ﴿٢٢﴾ بە دڵنیایی خوا ﷻ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو چاکەکان ئەنجام دەدەن، دەیانخاتە بە هەشتانێکەوە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن و، بە بازنە زێڕەکان و بە گەوهەریش دەڕازێندرێنەوەو، پۆشاکیشیان ئاوریشمە ﴿٢٣﴾ ڕێنماییش کران بۆ قسەی پاک و چاک و، ڕێنماییش کران بۆ ڕێبازی (خوای) ستایشکراو ﴿٢٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ): (الفَصْلُ: إبَانَةُ أَحَدِ الشَّيئَيْنِ مِنَ الأَخَرِ، وَيَومُ الفَصْلِ: اليَوْمُ الَّذِي يُبَيِّنُ اللهُ الحَقَّ مِنَ البَاطِلِ، وَيَفْصِلُ بَيْنَ النَّاسِ بالحُكْمِ)، (فَصْل) بریتیە لە لێک جیاکردنەوەی دوو شتان لە یەکدی (يَومُ الفَصْلِ) ئەو ڕۆژەیە کە خوا ﷻ هەق لە ناهەق جیادەکاتەوەو، دادوەریی لە نێوان خەڵکدا دەکات و، لێکیان هەڵداوێرێ.

(خَصۡمَانِ): وشەی (خَصْم)، واتە: کەسی ناکۆک، دژ، ئنجا هەم بۆ تاک بەکار دێ، هەم بۆ دووان، هەم بۆ کۆو، هەم بۆ نێر، هەم بۆ مێش، دەگوترێ: (هذَا خَصمٌ، وَهذَانِ خَصْمَانِ، وَهؤلَاءِ خَصْمٌ، وَ هَذِهِ خَصْمٌ)، لێرەدا ﴿هَٰذَانِ خَصۡمَانِ﴾، ئەم دوو کۆمەڵە پێکەوە ناکۆکن، ناکۆکییان هەیە، ﴿هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡۖ﴾، لە بارەی پەروەردگاریانەوە کەوتوونە ناکۆکیی و مشت و مڕەوە.

(يُصَبُّ): (صَبُّ المَاءِ: إراقَتُهُ مِنْ أَعلَى)، (صَبُّ المَاءِ)، ئەو ئاوەی لەسەرێوە هەڵبڕژێتە خوارێ.

(ٱلۡحَمِيمُ): (الحَميمُ: المَاءُ الشَّدِيْدُ الحَرَارَة)، ئاوی زۆر گەرم، یان ئاوی کوڵاو.

(يُصۡهَرُ بِهِۦ): پێی قاڵ دەبێتەوە، پێی دەتوێتەوە، (الصَّهْرُ: إذَابَةُ الشَّحْمِ)، (صَهْر) بریتیە لە تواندنەوەو قاڵکردنەوەی بەزو چەوریی.

(**مَّقَٰمِعُ**): کۆی (**مِقْمَعَة**)یە (**وهي ما يُضرَبُ بِهِ وَيُذَلُّ**)، ئەویش هەر ئامرازێکە کە پێی لە کەسێک بدرێ و ، پێی زەبوون و داماو بکرێ، بە کوردیی (**مِقْمَعْ**) یان (**مِقْمَعة**)، یانی: گورز، یاخود قەمچی، بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو گورزە، ئەو قەمچییە، لە ئاسنە.

(**غَمٍّ**): واتە: خەم و خەفەت و ناسۆرو، بە مانای دڵتەنگیی و تەنگە نەفەسیش دێ، (**غَمّ**)و (**غُمّة**) وەک (**كَرْب**)و (**كُرْبَة**)، بە مانای غەم و خەفەت دێ و، بە مانای تەنگە نەفەسییش دێ و، بە مانای بێزاریی و پەستییش دێ.

(**يُحَلَّوْنَ**): واتە: دەڕازێندرێنەوە، (**حَلِيَ، يَحْلَى**)، واتە: ڕازێنرایەوە، دەڕازێنرێتەوە، دەگوترێ: (**حَلِيَ الشَّيءُ فِي عَينِي**)، واتە: شتەکە لە چاوم دا جوان بوو، (**وحَلْيَتِ المَرأَةُ حَلْيَاً**)، ئافرەتەکە خشڵی بە خۆیدا کرد، خۆی پێ ڕازاندەوە.

(**أَسَاوِرَ**): کۆی (**أَسْوِرَة**)یە، (**أَسوِرَة**)ەش، کۆی (**سِوَارَ**)ە، (**سِوَار**): بازن، کەواتە: (**أَسَاوِرَ**)، کۆی کۆ، (**جَمْعُ الجَمْع**)یە.

(**وَلُؤْلُؤًا**): واتە: گەوهەر، دەگوترێ: (**تَلَئْلأَ الشَّيءُ: لَمَعَ لَمْعَانَ اللّؤلُؤِ**)، واتە: وەک چۆن گەوهەر دەترووسکێ و دەدرەوشێتەوە، ئەویش ئاوا درەوشایەوە.

(**المُعْجَمُ الوَسِيط**)[1] ئاوا پێناسەی (**لُؤلُؤ**)، دەکات: {**اللُّؤلُؤ: الدُّرُّ يَتَكَوَّنُ فِي الأَصْدَافِ مِنْ رَوَاسِبَ، أَو جَوامِدَ صَلْبَة، لَمَّاعَة مُسْتَدِيرَة، فِي بَعْضِ الحَيْوانَاتِ المَائِيَّةِ الدُّنْيَا مِنَ الرَّخَوِيَّات**}، واتە: (**لُؤلُؤ**) کە بە عەرەبی (**دُرّ**)یشی پێ دەڵێن و بە کوردیی دەڵێین: گەوهەر، لە نێو قۆزاخە نیشتووەکان، یان وشکە ڕەقەکان دا پێک دێ، ئەو گەوهەرە بریسکە دەداتەوەو، خڕە، لە هەندێک لەو ژیانداره ئاوییانەی کە لە ڕووی پلەی ژیانداریییەوە لە خوارێن، ئەوانەی نەرمن و، ئێسقانیان نیە.

---

(١) ص ٨١٠.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە موبارەکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ ﴾، .

لـەو بـارەوە ئـەو فەرموودەیـە هەیـە: {**عَـنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ، نَزَلَـتْ فِي الَّذِيـنَ بَـرَزُوا يَـوْمَ بَـدْرٍ: حَمْـزَةَ، وَعَـلِيٍّ، وَعُبَيْـدَةَ بْـنِ الْحَـارِث، وَعُتْبَـةَ وَشَـيْبَةَ ابْنَـيْ رَبِيعَـةَ، وَالْوَلِيـدِ بْـنِ عُتْبَـةَ**} (**أخرجـه البُخـاري: ٤٧٤٣، ومُسـلِم: ٣٠٣٣**).

واتـە: ئەبـوو زەڕ ﷺ، دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە لـە بـارەی ئەوانـەوە هاتـە خـوار، کـە لـە جەنگـی بـەدردا، تـەن بـە تـەن بـۆ یەکـدی چوونـە مەیدانـێ، لـە مسـوڵمانان: حەمـزەو عـەلی و عوبەیـدەی کـوڕی حاریـس، {هـەر سـێکیان خـزم بـوون، حەمـزە مامـی عـەلی بـووە خـوا لێیـان ڕازی بـێ، عوبەیـدەی کـوڕی حاریسـیش ئامـۆزای بـوو} لـە بەرانبەریشـدا لـە کافـرەکان: عوتبـەو شـەیبەی کـوڕانی ڕەبیعـەو، وەلیـدی کـوڕی عوتبـەش، {ئەوانیـش دوو بـراو برازایـەک}.

ئنجـا هەندێـک دەڵێـن: ئـەو ئایەتـەو ئایەتـەکانی دوایـی، لـە مەدینـە هاتوونـە خـوارێ، بـەڵام ئـەوی دیکـە سـوورەتەکە هەمـووی مەککەییـە، دەشـگونجێ ئـەو ئایەتانـە هەموویـان لـە مەککـە هاتبنـە خـوار، بـەڵام دوایـی میصداقەکەیـان (ئـەوەی کـە بەسـەریدا دەچەسـپن)، لـە پێـش هەمـوو کەسـەوە ئـەو شـەش کەسـە بوون، سـێ لـە بڕواداران: حەمـزەو عـەلی لەگـەڵ عوبەیـدەی کـوڕی حاریـس، خـوا لێیـان ڕازی بـێ، هەروەهـا سـێ نەفەریـش لـە کافـرەکان: عوتبـەو شـەیبەی کـوڕانی ڕەبیعـەو، وەلیـدی کـوڕی عوتبـە، پێـش هەمـوو کـەس ئـەم ئایەتـە بەسـەر ئـەم دوو کۆمەڵـەدا،

کە بۆ یەکدی چوونە مەیدان، تەن بە تەن، بەسەر ئەواندا دەچەسپێ، کە دوایی کافرەکان، هەرسێکیان دەکوژرێن و، لە مسوڵمانانیش عوبەیدە بریندار دەبێ و، دوایی ئەویش شەهید دەبێ، ئەگەرنا مەرج نیە ئایەتەکە بە هۆی ئەوانەوە هاتبێتە خوار، بەڵام پێش هەموو کەس بەسەر ئەواندا دەچەسپێ و، دەشگونجێ ئەو ئایەتانە لە مەدینە هاتبنە خوار.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بڕگەی: (ئەوانەی بڕوایان هێناوە) ئەمە بۆتە نازناوێک بۆ مسوڵمانان، چونکە لەڕاستییدا خەڵکی دیکەی غەیری مسوڵمانان، بە ئیماندار لە قەڵەم نادرێن، بە خواناس لە قەڵەم دەدرێن و، بە پێغەمبەر ناس لە قەڵەم دەدرێن، خوا ﷻ دەناسن و، پێغەمبەر دەناسن و، دەزانن ڕۆژی دوایی هەیە، بەڵام بە مانا زاراوەییەکەی، بە بڕوادار دانادرێن.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، واتە: بە دڵنیاییەوە ئەوانەی بڕوایان هێناوە، (واتە: مسوڵمانان)، ﴿ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾، جوولەکەکان و ﴿ وَٱلصَّـٰبِـِٔينَ ﴾، صابیئەکان و ﴿ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ ﴾، نەصرانییەکان و ﴿ وَٱلْمَجُوسَ ﴾، مەجووس و ﴿ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ ﴾، ئەوانەش کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، هەر کام لەو شەشانە، یاخود هەموو ئەو شەش کۆمەڵە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، بە دڵنیایی لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، خوا ﷻ لێکیان جیا دەکاتەوە، یاخود دادوەرییان لە نێواندا دەکات، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرەو، لە هەموو شتێک ئاگادارە.

لێرەدا خوا ﷻ کە ئەو شەش کۆمەڵە باس دەکات، کە یەکێکیان ئەهلی ئیمان و ئەهلی ئیسلامە (مسوڵمانان)، پێنجەکەی دیکە، هەموویان ئەهلی کوفرن، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لە ئیسلامدا زۆر بە سینە فراوانیی و باخەڵ فەڕاحیی مامەڵە دەکرێ لەگەڵ نامسوڵماناندا، ئنجا ئەو نامسوڵمانانە: چ ئایینێکی ئاسمانییان هەبێت، کە دوایی تێکیاندا بێ و گۆڕیبیان، یاخود ئایینی ئاسمانییشیان نەبێت و، بتپەرست بن و، ئاگر پەرست بن و، ئەستێرەو خڕۆکە پەرست بن و ، یاخود هەرچی بن، ئیسلام زۆر بە باخەڵ فەڕاحیی و بە سەماحەتەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا دادوەرییان لە نێواندا دەکات، واتە: ئێوە لێیگەڕێن و پێکەوە یەکدی تەحەممول بکەن، پێکەوە تەبا بن، پێکەوە بژین، بەڵام ئەوە عایدی خوایە: کێ سزای چەندەو، کێ پاداشتی چۆنە! ئەوە خوای پەروەردگار بۆ کەسی بەجێ نەهێشتوەو، عایدی خۆیەتی، هەروەها ئەویش چاودێرو ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکەوە.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە ئەم گەردوونە بە سەرو خواریەوە، بە بینراوو نەبینراویەوە، بە ژیاندارو بێ ژیانیەوە، بە هۆشدارو بێ هۆشیەوە، هەمووی بۆ خوا ﷻ ملکەچەو، کڕنووش بۆ خوا دەبات: ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾، ئایا نابینی؟ بە دڵنیایی لێرەدا مەبەست لە دوێنراو (**مخاطب**)ی (ئایا نابینی؟) هەر کەسێکە کە بتوانێ سەرنج بدا، چونکە لێرەدا مەبەست لە دیتن (**رؤية**) بینینی عەقڵ و دڵ و زانینە، نەک بینینی چاو، چونکە هیچ کەس نیە، کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، ببینێ کە کڕنووش بۆ خوا دەبات، هەروەها مانگ و خۆرو ئەستێرەو، چیاو دارو درەخت و ژیانداران ببینێ، کەواتە: لێرەدا مەبەست لە بینین ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾، واتە: (**ألَم تعلَم**)، ئایا نابینی بە چاوی عەقڵ و دڵ؟ ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، کە کڕنووش بۆ خوا دەبات، هەر کەسێک کە لە ئاسمانەکاندا هەیەو، هەر کەسێک کە لە زەوی دا هەیە، کە

ئەوەی لە ئاسمانەکاندا هەیە، بە دڵنیایی بە پلەی یەکەم فریشتەکانن، نازانین ڕەنگە خوای پەروەردگار لە ئاسمانەکاندا دروستکراوی دیکەشی هەبن، بەڵام ئەوانەی لە زەویی دان بە پلەی یەکەم مرۆڤەکان و ، جینن و، ئەو فریشتانەشن کە لەگەڵیاندان لە سەر زەوی، ﴿ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ ﴾، خۆرو مانگ و ئەستێرەکانیش، ئەوانەش کڕنووش بۆ خوا دەبەن، ﴿ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ ﴾، چیایەکان و دارو درەخت و ژیاندارانیش، (**دَوابّ**) کۆی (**دَابَّة**)ەیە، (**كُلُّ مَا يَدُبُّ عَلَى الأَرْض**)، واتە: هەرچی بە زەویی دا دەڕوات، بەڵام دوایی واتایەکی گشتییتریشی بۆ دانراوە، واتە: ژیانداران، ئەوانەی کە ژیانداررن و، خاوەنی هەستن، نەک خاوەنی عەقڵ و هۆش، بەڵکو خاوەنی هەستن، هەر لە ژیاندارێکی یەک خانەیی وەک ئەمیباوە بگرە، تاکو هەموو ئەو ژیاندارە گەورانەی، وەک نەهەنگی شین و فیل و کەرگەدەن و... هتد.. ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ﴾، زۆرێکیش لە خەڵک، واتە: زۆرێکیش لە خەڵک کڕنووش بۆ خوا دەبەن، کە ئەوانە ئەهلی ئیسلامن، ئەگەر مەبەست پێی خواپەرستیی ڕاستەقینە بێ، یاخود هەموو ئەوانەن کە بە جۆرێک لە جۆرەکان خوا دەپەرستن، ئەگەر مەبەست پێی کڕنووش بردنی ڕەهاو پەرستن و ملکەچیی ڕەها بێ، چ لە لای خوا ﷻ قبووڵ بێ، چ قبووڵ نەبێ، ئەو کاتە جوولەکەو نەصرانیی و صابیئەو هەموو ئەوانەی کە بە جۆرێک لە جۆرەکان خوا دەپەرستن، هەمووان دەگرێتەوە، ﴿ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ﴾، زۆرێک لە خەڵکیش سزای لەسەر پێویست بووە، واتە: زۆرێک لە خەڵکی ملکەچ نابن بۆ خواو، کڕنووش بۆ خوا نابەن و، بەندایەتیی بۆ خوا ناکەن، بۆیە سزایان لەسەر پێویست بووە، ﴿ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ﴾، هەر کەسێکیش خوا سووکی بکات، هیچ ڕێزگرێکی بۆ پەیدا نابێ، هیچ کەسێک نابێ ڕێزی لێ بگرێ، ئنجا ئایا خوا ﷻ بۆچی خەڵک سووک دەکات؟ لە ئەنجامی ئەوەدا کە سەرپێچیی لە فەرمانی خوا دەکەن، بەندایەتیی بۆ خوا ناکەن، پێچەوانەی ئەو سیستمە گشتییەی خوا دەجووڵێن، کە خوا دایناوە لە گەردووندا، کەسێک وابێ و بەهۆی سەرپێچیی

کردنی خواوە، خۆی بێ ڕێز کرد بێ، هیچ ڕێزگرێکی بۆ پەیدا نابێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ﴾، بە دڵنیایی خوا هەرچی بیەوێ دەیکات.

ئنجا خوا ﷻ باسی سەرەنجامی ئەوە دەکات: کەسانێک بۆ خوا ملکەچن و کڕنووشی بۆ دەبەن و، کەسانێکیش کە سزای خوایان لەسەر پێویست بووە، دەفەرموێ: ﴿هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡ﴾، ئا ئەمانە دوو کۆمەڵن، لە بارەی پەروەردگاریانەوە بە دەمەقاڵ هاتوون، ناکۆکیی و دووبەرەکییان هەیە، ﴿فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، باسی بێبڕوایەکان دەکات، کە سزایان چۆنە؟ ئنجا ئەوانەی بێبڕوان: ﴿قُطِّعَتۡ لَهُمۡ ثِيَابٞ مِّن نَّارٖ﴾، لە ئاگر پۆشاکێکی ئاگریان بۆ دەبڕدرێ، ﴿يُصَبُّ مِن فَوۡقِ رُءُوسِهِمُ ٱلۡحَمِيمُ﴾، ئاوی داغ و کوڵاویشیان بەسەر سەردا دەکرێ،

﴿يُصۡهَرُ بِهِۦ مَا فِي بُطُونِهِمۡ وَٱلۡجُلُودُ﴾، هەرچی لە هەناویاندا هەیە، لە نێو سکیاندا هەیەو، پێستیشیان پێی دەتوێتەوە (قاڵ دەبێتەوە)، ﴿وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنۡ حَدِيدٖ﴾، گورزو قامچی ئاسنیشیان بۆ هەن (بۆیان داندراون) کە پێیان لێیان بدرێ، ﴿كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا﴾، هەر کاتێک ویستیان لە تەنگە نەفەسیان و لە خەم و مەراق و بێزارییان، لێی بچنە دەر (واتە: لە ئاگری دۆزەخ)، ﴿أُعِيدُواْ فِيهَا﴾، دەگێڕدرێنەوە نێوی، ﴿وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ﴾، پێشیان دەگوترێ: سزای سووتێنەر بچێژن.

بە نسبەت کۆمەڵی یەکەمەوە، کە نەیارن بەرانبەر بە پەروەردگاریان، ئەوە چارەنووسیانە کە خوای دادگەر لە پێنج بڕگەدا باسی سزایەکەیان دەکات.

ئنجا دێتە سەر باسی پاداشتی ئیمانداران، ئەویش هەر لە پێنج بڕگەدا دەخاتە ڕوو: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾، شێوەی تەعبیرەکە دەگۆڕێ بۆ سەرنج ڕاکێشانی بیسەر: بە دڵنیایی خوا ﷻ کەسانێک کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، دەخاتە نێو چەند باغ و بێستانێکەوە، کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە:

ڕووبار بە ژێر کۆشکەکانیاندا دەڕۆن، ﴿ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ﴾، دەڕازێنرێنەوە لەوێدا بە بازنەی زۆری زێڕو گەوهەر، ﴿ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴾، پۆشاکیشیان لەوێدا ئاوریشمە، مرۆڤ لە جۆری قوماشان، لە ئاوریشم جوانترو نایابترو بە نرختری پێ شک نایەت، کە بیکاتە بەرگ و پۆشاک، بۆیە خوا ﷻ باسی ئاوریشم دەکات، چونکە خوا بە پێی عەقڵی ئێمە، ئێمە دەدوێنێ، ئەگەرنا بە دڵنیایی ئاوریشمێک کە خوا لە ڕۆژی دواییدا دەیکاتە پۆشاک بۆ بڕواداران، جیایە لەوەی لە دنیادا هەیە، هەروەها هەموو نیعمەتەکانی دیکەی بەهەشت، جیان لەوانەی دنیا، ﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ ﴾، هەروەها ڕێنمایی دەکرێن بۆ قسەی چاک و پاک و ﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴾، ڕێنمایی دەکرێن بۆ ڕێی خوای شایستەی ستایش و مەدح و سەنا، ئەمەش پاداشتی ئیمانداران، خوا لە پێنج بڕگەدا خستوویەتە ڕوو.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**خوا ﷻ لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەریی لە نێوان مسوڵمانان و جوولەکەو صابیئەکان و نەصڕانییەکان و مەجووسییەکان و، هاوبەش بۆ خوادانەرەکاندا دەکات و، خواش ﷻ ئاگاداری هەموو شتێکە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوە، جێی سەرنجە کە لە شێوەی ئەم ئایەتە موبارەکەدا، هەم لە سوورەتی (**البقرة**)دا هاتوە، هەم لە سوورەتی (**المائدة**)شدا هاتوە، بەڵام لە سوورەتی (**البقرة**)و (**المائدة**)دا، باسی مەجووسییەکان، هەروەها باسی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش نەکراوە، بەڵکو تەنها باسی چواریان کراوە: بڕواداران و جوولەکەو نەصڕانیی و صابیئە، واتە: تەنیا لێرەدا (**الحج**)دا، بە یەکەوە باسی ئەو شەش جۆرە خەڵکە کراوە، مسوڵمانان و ئەو پێنج جۆرە نامسوڵمانانە، کە جوولەکەو صابیئەو نەصڕانیی و مەجووسیی و موشریکەکانن، کاتی خۆی ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**البقرة**) شدا گوتوومانە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، ئەوە نازناوە بۆ مسوڵمانان کە ئەهلی ئیمانن، چونکە خەڵکی دیکە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بە ئەهلی ئیمان لە قەڵەم نادرێن، چونکە بەڵێ خاوەن کتێبەکان خۆیان بە بڕوادار بە

خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی، دادەنێن، بەڵام ئەوەی ئەوان پێیان وایە بڕوا هێنانە: بە خواو، فریشتەکانی و کتێبەکانی پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە کەم و کوڕیی زۆری تێدا هەیە، کە لێرەدا دەرفەت نیە باسی بکەین.

کەواتە: نازناوی ﴿ءَامَنُواْ﴾، تەنیا بۆ مسوڵمانان بەکاردێ و لە قورئاندا تەنیا بۆ مسوڵمانان بەکار هاتوە، بەڵێ دەگونجێ بۆ جوولەکەکان و نەصرانییەکانیش و بۆ خاوەن کتێبەکانی دیکەش بەکار هاتبێ، بەڵام لە کاتی خۆیدا کە بەڕاستیی بڕوایان هەبووە بە خواو بە پێغەمبەرانی خواو، بە ئایینە دەستکاریی نەکراوو ڕاست و دروستەکەی خۆیان.

**٢)-** ﴿وَٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾، مەبەست پێی جوولەکەکانە، ئنجا ئایا بۆچی گوتراوە: ﴿هَادُواْ﴾؟ وەڵام:

**أ-** لەوەوە هاتوە کە لە سوورەتی (الأعراف)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ ﴿١٥٦﴾﴾، (**هُدْنَا: يَعْني: رَجَعْنا**)، ئێمە گەڕاینەوە بۆ لای تۆ، (**هَادَ، يَهُودُ**): (**رَجَعَ، يَرجِعُ**)، لەبەر ئەوەی جوولەکەکان گەڕاونەوە بۆ لای خوا ﷻ.

**ب-** بۆیە پێیان گوتراوە: (هَادُواْ)، چونکە شوێنکەوتووی یەهوودا بوون، کاتی خۆی جوولەکە دەوڵەتێکیان دروستکردوە، ئەوەی دەوڵەتەکەی بنیاتناوە، لە نەوەی یەهوودا بووە، کە یەکێک بووە لە کوڕەکانی یەعقووب، کتێبی جوولەکەکانیش لە ڕوانگەی ئیسلامەوە تەنیا بریتیە: لە تەوڕات، بەڵام ئێستا ئەوان پەیمانی کۆنیان هەیە، کە (٣٩) یاخود[١] (٤٩) سیفرە، یانی: ئەوەندە کتێبەیە.

**٣)-** ﴿وَٱلصَّٰبِـِٔينَ﴾، واتە: صابیئەکان، ئەمانیش کتێبێکیان هەیە، پێی دەڵێن: (**كَنْزا رَبَّا أو الكَنزُ العَظِيم**)، هەروەها کتێبیکی دیکەشیان هەیە بەناوی: (**دِراشَة أَدِهِيَا مَواعِظ وتَعالِيم يَحيَى بنُ زَكَرِيًّا**)، کە ئەوان خۆیان بە شوێنکەوتووی یەحیای کوڕی زەکەرییا دادەنێن، ئەوانەی ئێستا هەن.

---

(١) بە پێی دوو سەرژمێری جیاوازی مەزهەبە جۆراوجۆرەکانی نەصرانیەکان.

٤)- ﴿وَالنَّصَارَىٰ﴾، واتە: نەصارا، کە کۆمەڵی چوارەمن خوا ﷻ لە ڕۆژی دواییدا دادوەرییان لە نێواندا دەکات، ئەوانیش خوا ئینجیلی بۆ عیسا ناردوە (عَلَيْهِ السَّلَام)، بەڵام ئێستا نەصرانییەکان هەم پەیمانی کۆن و هەم پەیمانی نوێشیان هەیە! دیارە پەیمانی کۆن وەک گوتمان: (٣٩) یاخود (٤٩) کتێبە، بەپێی جیاوازیی ڕاو بۆچوونی: (کاثولیك و ئەرثذوکس و پرۆتسانتەکان) کە لە جێی دیکەدا بە درێژیی باسی ئەوەمان کردەوە[١].

هەروەها پەیمانی نوێشیان هەیە، کە چوار ئینجیلە: (مەتتاو لۆقاو مەرقووس و یوحەننا)، هەروەها کۆمەڵێک کتێبی دیکەشن: (أَعمَال الرُّسل)، نامەکانی بۆڵص، کە چواردە نامەن، هەشت نامەی دیکەش، ئەوانیش هەموویان (٢٦) کتێبن، ئەوە هەمووی پەیمانی نوێ پێک دێنێ، ئنجا نەصرانییەکان پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ هەردووکیانیان تەبەننیی کردوون و پێکەوەش چاپیان کردوون.

٥)- ﴿وَالْمَجُوسَ﴾، مەجووسییەکان، ئەوانیش بانگەشەی ئەوە دەکەن، کتێبێکی ئاسمانییان هەیە، بە ناوی (ئاڤێستا) یاخود (ئاوێستا) بەڵام مەجووسییەکان لە نێو هەموو ئەوانەدا بەوە جیادەکرێنەوە کە بڕوایان بە دوو بەدیهێنەر، بە دوو پەروەردگار هەیە، چونکە ئەوانەی دیکە هەموویان دەڵێن: یەک بەدیهێنەر هەیە، بۆ نموونە: نەصرانییەکان دەڵێن خوا ﷻ خواو کوڕو گیانی پیرۆز، بەڵام دەڵێن: بەدیهێنەر هەر یەکە، بەڵام عیسا بە کوڕی خوا ﷻ دادەنێن و، جیبریلیش یاخود (رُوح القُدُس)یش کە وا پێدەچێ مەبەست پێی جیبریل بێ، بە (گیانی پیرۆز)ی دادەنێن، دەڵێن: بە هەرسێکیان خوا ﷻ پێکدێنن، ئنجا مەجووسییەکان لافی ئەوەش لێ دەدەن کە وەختی خۆی زەردەشت پێغەمبەری خوا بووە، کە لە سەدەی شەشەمی پێش زایینیدا ژیاوە.

٦)- ﴿وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا﴾، ئەوانەی کە هاوبەشیان داناوە، واتە: هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، کە مەبەست پێی هەموو ئەوانەن کە بت پەرستن، واتە: (الوَثَنِيُّون)، ئەوانەی کە لەگەڵ خوادا شتی دیکەش دەپەرستن.

---

(١) بڕوانە: مەوسووعەی: {درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد لەبەر تیشکی: زگماک و عەقل و زانست و وەحیی، دا} چاپی دووەم/ ٢٠٢٠ز، بەرگی دووەم.

٧)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، بە دڵنیایی خوا لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، لێکیان جیا دەکاتەوە (هەموو ئەو کۆمەڵانە)، واتە: دادوەرییان لە نێواندا دەکات.

٨)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴾، بە دڵنیایی و بە مسۆگەریی خوا ﷻ بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێرەو، لە هەموو شتێک ئاگادارە.

## سێ هەڵوەستە لە بەرانبەر ئایەتی ژمارە (١٧)دا:

**یەکەم:** لە شوێنی دیکەدا[١] بە درێژیی باسی جوولەکەو صابیئەو مەجووسیی نەصرانییەکان و کتێبەکانیانمان کردوە، واتە: تەورات و ئاڤێستا ئینجیل و (**كَنْزا رَبَّا أو الكَنْزُ العَظِيْم**)، (**دراشة أديها**)یاخود: پەیمانی کۆن و پەیمانی نوێ و، ئاڤێستاو، هەردوو کتێبی صابیئە.

**دووەم:** مەجووس کتێبێکیان هەیە، بە ناوی (ئاڤێستا) هەروەها کتێبەکە شەرحێکی هەیە، بە ناوی (زەند ئاڤێستا)، تایبەتمەندیی مەجووسییەکان ئەوەیە کە بەحیساب خۆیان پاراستوە لە پەرستنی بت و صەنەمەکان، بەڵام ئەوان بڕوایان بە دوو پەروەردگاران هەیە، کاتی خۆی مەجووسییەکان لە قۆناغی حوکمڕانیی سابووری کوڕی ئەردەشیردا، کە لە نێوان ساڵانی (٢٣٨ - ٢٧١)ی زایینیی دا ژیاوە، مەجووسییەکان پێیان گوتراوە: (**المانَوِيَّة**) و شوێنکەوتوویی مانیی بوون، کە ئەویش بە حیساب لەسەر ڕێبازی زەردەشت ڕۆیشتوە.

هەروەها لە قۆناغێکی دیکە لە سەردەمی قوباد دا، کە ئەویش هەروەک سابووری کوڕی ئەردەشیر یەکێک بووە لە پادشاکانی فارس و لە نێوان ساڵانی (٤٨٧ - ٥٢٣)ی زایینیی دا ژیاوە، لەو سەردەمەدا پێیان گوتراوە: (**المَزْدَكِيَّة**)، شوێنکەتووی موزدەک (یان مەزدەک) بوون،

ئنجا بە نسبەت مەجووسییەکانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ**}[٢]، وەک خاوەن کتێبەکان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، لەبەر

---

(١) مەوسووعەی: ئیمان و ئیلحاد.

(٢) {أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ذَكَرَ الْمَجُوسَ فَقَالَ: مَا أَدْرِي كَيْفَ أَصْنَعُ فِي أَمْرِهِمْ؟ فَقَالَ عَبْدُ

ئـەوەی ئەوانیـش بانگەشـەی ئـەوە دەكـەن، كتێبێكـی ئاسـمانییان هەیـەو پێـی دەگوتـرێ: ئاڤێسـتا.

ئنجا (**محمد حسين الطّباطبائي**) لە تەفسیرەكەیدا[1] دەڵێ:

مەجـووس ئـەوەی كـە زانـراوە لـە بارەیانـەوە، ئەوانـەن كـە بڕوایـان بـە زەردەشـت هەبـووە، {كـە ئـەو بـە (سەردەشـت) هێنـاوە} كتێبـە موقـەددەس و پیرۆزەكەشـیان پێـی دەگوتـرێ: ئاوێسـتا.

بـەڵام مێـژووی ژیـانی زەردەشـت و، كاتی دەركەوتنـی زۆر نەزانـدراوە، هـەروەك ئەوەیـە كـە كەسـێك ون بووبـێ و، شـوێن بـزر بووبـێ و، هەواڵـی نەزاندرابـێ، لەبـەر ئـەوەی كاتێـك ئەسـكەندەری مەقدۆنیـی ئێـران داگیـر دەكات، لـەو كاتـەدا ئـەو كتێبـە پیـرۆزەی خۆیـان كـە ئاڤێسـتایە لێیـان ون بـووە، دوایـی لـە سـەردەمی پادشـاكانی ساسـانییەكاندا، كتێبەكـە دووبـارە نووسراوەتـەوە، هـەر بۆیـە كەسـێك بیـەوێ حەقیقـەتی مەزهـەب و ڕێبازەكەیـان بزانـێ، زۆر بـۆی قورسـە[2]، بـەڵام ئـەوەی كـە سـەلمێندراوە ئەوەیـە كـە ئەوانـە بـۆ بەڕێوەبـردنی جیهـان بڕوایـان بـە دوو پرەنسـیپ هەیـە: (**مَبْـدَأ الخَـيْر وَمَبْـدَأ الـشَّرّ**)، كـە یـەزدان و ئەهریمەنـن، یاخـوود ڕووناكیـی و تاریكییـن، هەروەهـا مەجووسـییەكان فریشـتەكانیش بـە بـەرز دەگـرن و، خۆشـیانیان لـێ نیزیـك دەخەنـەوە، بـەڵام بـت و پەیكەریـان بـۆ دانانێـن، وەك بتپەرسـتەكان، هەروەهـا مەجووسـییەكان ڕێـز لـە توخمـەكان دەگـرن، واتـە: لـە ئـاوو هـەواو گڵ و ئاگـر (بـە تایبـەت ئاگـر)، كاتی خـۆشی خانـووی تایبەتیـان هەبـووە بـە ئاگـر تێـدا كرانـەوە، لـە ئێـران و لـە چیـن و لـە هینـدو لـە غەیـری ئـەو وڵاتانـەش،

---

الرَّحْمَـنِ بْـنُ عَـوْفٍ: أَشْـهَدُ لَسَـمِعْتُ رَسُـولَ اللـه ﷺ يَقُـولُ: سُـنُّوا بِهِـمْ سُـنَّةَ أَهْـلِ الْكِتَـابِ} أخرجـه مالك: ٩٦٨.

(١ ) تفسير الميزان: ج١٤، ص٣٥٨.

(٢) بەڵام من دەڵێم: مەحاڵە.

هەروەها ئەوانە دەڵێن: چ ئەهریمەن و چ یەزدانیش، هەردووكیان دەكەونەوە ژێر دەستی ئاهۆڕامەزدا، كە پەیداكەری هەموو شتێكە، واتە: ئەو دووانەش كە لە نێو خۆیاندا ناكۆكن، یەكێكیان: خاوەنی خێرەو، ئەوی دیكە هی شەڕە، یاخود یەكێكیان هی بەدیهێنەری چاكەكان و، یەكێكیان بەدیهێنەری خراپەكانە، هەردووكیان دەكەونەوە بەر دەستی ئاهۆڕامەزدا.

**سێیەم:** ئەم ئایەتە سەماحەت و دڵ فراوانیی و تەبایی ئیسلاممان بۆ دەردەخات لە بەرانبەر نەیارەكانی دا، ئەوەتا خوا ﷻ باسی پێنج كۆمەڵ لە نامسوڵمانان دەكات، كە جوولەكەو صابیئەو نەصرانیی و مەجووسیی و هاوبەش بۆ خوا دانەرەكانن، هەروەها خوا ﷻ دەفەرمووێ: ئا ئەوانە هەموویان خوا لە ڕۆژی دوایی دا دادوەرییان لە بەیندا دەكات، واتە: مسوڵمانینە! ئێوە بەتەما مەبن، لە دنیادا تەصفیە حیسابیان لەگەڵدا بكەن و، لەگەڵیان لێكدەر بكەن، چونكە ئەوە عایدی خوایە، وەک خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ إِلَيۡنَآ إِيَابَهُمۡ ٢٥ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا حِسَابَهُم ٢٦ ﴾الغاشية، واتە: بە دڵنیایی گەڕانەوەیان بۆ لای ئێمەیە، دوایی لێپرسینەوەشیان بەس لەسەر ئێمەیە.

### مەسەلەی دووەم:

**کڕنووش بۆ خوا بردنی تێکڕای ئەوانەی کە لە ئاسمانەکان و ئەوانەی کە لە زەویی دان و، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و، چیاکان و درەخت و ژیانداران و زۆرێک لە خەڵک، زۆرێکیش سزادرانیان مسۆگەر بووە، بەهۆی لا ملیی کردنیانەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿١٨﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دە (١٠) بڕگەدا:

**١)- ﴿أَلَمْ تَرَ﴾**، ئایا نەتبینیوە؟ (**الرُّؤيَةُ عِلْمِيَّةٌ والخِطَابُ لِغَيْرِ مُعَيَّنٍ**)، مەبەست لە بینین لێرەدا زانینە، ئایا بە چاوی عەقڵ و دڵ نەتبینیوەو سەرەنجت نەداوە؟ ڕووی دواندنیش لە کەسێکی دیارییکراو نیە، بەڵکو هەر کەسێک بتوانێ سەرەنج بدا لە بوونەوەرو دەوروبەری، ڕووی دواندن لە هەموویانە، هەروەها پرسیارکردنەکەش پرسیار کردنێکی نکووڵیی لێکەرانەیە بۆ کەسێک کە زانیاریی نیە بەوە کە هەرچی لە گەردووندایە، بۆ خوا ملکەچە، بەڵام ئەگەر ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خاتەم بێ ﷺ، ئەو کاتە پرسیارکردنەکە پرسیارکردنێکی دان پێپێداهێنەرانە، (**إِستِفهامٌ تقريري**)یە، چونکە پێغەمبەر ﷺ زانیویەتی کە هەموو بوون (گەردوون) بە سەرو خواریەوە بۆ خوا ملکەچەو کڕنووش بەرە.

**٢)- ﴿أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ﴾**، کە خوا کڕنووشی بۆ دەبات. وشەی (**سُجُود**) کڕنووش بردن، مانا ڕاستەقینەکەی ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەر حەوت ئەندامان کڕنووش بۆ خوا دەبات: نێو چاوانی (تەوێڵی) و، هەردوو لەپە دەستی و، هەردوو ئەژنۆی و، هەردوو سینگی پێی، ئا ئەوە کڕنووش بردنی ڕاستەقینە، یاخود کڕنووش بردنی زاراوەییە.

کڕنووش بردنێکی دیکەی مەجازییمان هەیە، کە بریتیە لە ملکەچیی و مل دانەواندن و تەسلیم بوون، ئنجا لەم ئایەتە موبارەکەدا وشەی (**سُجُود**) بە هەردوو مانای ڕاستەقینەو، بە مانای مەجازییش بەکارهاتوە، دوایی ڕوونی دەکەینەوە لەبەر چی؟

٣)- ﴿مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾، (کڕنووش بۆ خوا دەبات) هەر کەسێک کە لەنێو ئاسمانەکاندان، بە دڵنیایی ئەوانەی لە ئاسمانەکاندان، فریشتەکانن بە پلەی یەکەم، نازانین خوای پەروەردگار چ جۆرە دروستکراوێکی دیکەشی هەن، بەڵام ئەوەی بۆ ئێمەی باسکردوە، هەر فریشتەکانن لە ئاسمان.

٤)- ﴿وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ﴾، هەروەها هەر کەسێک کە لە زەویدا هەیە، ئەوەش هەم فریشتەکان دەگرێتەوە، ئەوانەی سەروکاری مرۆڤ و جند دەکەن و ، هەم جند دەگرێتەوەو، هەم مرۆڤیش دەگرێتەوە.

٥)- ﴿وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ﴾، هەروەها کڕنووش بۆ خوا دەبات، هەریەک لە خۆرو مانگ و ئەستێرەکان.

٦)- ﴿وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ﴾، چیاکان و دارو درەخت و ، پێڕۆیەکان (کە لەسەر زەوی دەڕۆن) واتە: ژیانداران بە گشتی.

٧)- ﴿وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، هەروەها زۆرێکیش لە خەڵکی، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، ئەوە ناچارمان دەکات بڵێین: وشەی (**سُجُود**) تەنیا مەبەست پێی مانا مەجازییەکەی نیە، کە بریتیە: لە ملکەچیی و تەسلیم بوون، بەڵکو مانا ڕاستەقینەکەیشی دەگرێتەوە، چونکە زۆرێک لە خەڵک (**وكثير من الناس**) مەبەست پێی ئەوانەن کە ئەهلی ئیمان و ئیسلامن و، کڕنووشی ڕاستەقینە بۆ خوا دەبەن، لەسەر حەوت لە ئەندامەکانیان، وەک باسمان کرد.

بۆیەش خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾، ئەمە خۆ پاراستن (**إحتراس**)ە لەوە کە تەنیا مانا مەجازییەکەی پێ مەبەست بێ، چونکە

ئەگـەر تەنیـا مانـا مەجازییەکـەی مەبەسـت بـێ، واتـە: ملکەچیـی بـۆ خـوا، کافـرو مسـوڵمان هەموویـان، گەردیلـەکانی کـە خانـەکانی لەشـیان لێیـان پێـک دێـن و، خانـەو ئەندامـەکانی لەشـیان، ملکەچـن بـۆ خـوا، بـە پێـی ئەو سیسـتمە کـە خـوا ﷻ دایناوەو، لـە جەسـتەیاندا کار دەکـەن و بەڕێـوە دەچـن، کەواتـە: کافـرو مسـوڵمان لـە ڕووە ناویسـتەکەیان (لا إرادي)ەوە، بـۆ خـوا ملکەچـن، بـەڵام لـە ڕووە ئیرادییەکەیانـەوە، تەنیـا مسـوڵمانان بـۆ خـوا کڕنـووش دەبـەن و ملکەچیـی بـۆ دەنوێنـن، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ﴾، زۆرێـک لـە خەڵکـی، ئـەدی بەشـەکەی دیکـە:

٨)- ﴿ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ﴾، زۆریشیان سزای خوایان لەسەر پێویست بووە، کە لێرەدا واتە: کڕنووشی ڕاستەقینە بۆ خوا نابەن، ملکەچیی ئازادانە بۆ خوا ناکەن، ملکەچییەک کە بە ویست و خواستی خۆیانە، بۆ خوای ئەنجام نادەن، ئەگەرنا ملکەچییەک کە بە ویست و خواستی خۆیان نیە، ئەوە ئازایەتیی نیە، چونکە ئەوە مانگ و خۆرو ئەستێرەو دارو بەردو ژیاندارو بێ ژیان، هەمووی ئەو جۆرە ملکەچییەی بۆ خوا هەیە، بەڵام بۆ مرۆڤ، ئازایەتیی لەوەدایە کە ملکەچیی ئیختیاریی بۆ خوا هەبێ، ئەگەرنا هەموو دروستکراوەکان وەک ملکەچیی ناچاریی، بۆ خوا ملکەچن.

لێـرەدا نەیفەرمـووە: (لا يَسْـجُدُونَ للـهِ)، بەڵکـو تەنهـا دەفەرمـوێ: ﴿ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ﴾، واتـە: دەرەنجامـی کڕنـووش نەبردنەکـەی باسـکردوە، نـەک خـودی کڕنووش نەبردنەکـە، واتـە: پەیداکـراو (مُسـبَّب)ەکەی باسـکردوە، نـەک هـۆکار (سـبب)ەکە، هـۆکار کڕنـووش نەبردنـە، بـەڵام پەیداکـراو (مُسَـبَّبْ) بریتیـە لـەوە کـە سـزای خوایـان لەسـەر پێویسـت بـووە.

٩)- ﴿ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ﴾، هەر کەسێکیش خوا ﷻ سووکی بکات، ڕیسوای بکات، هیچ ڕێزگرێکی بۆ پەیدا نابێ، ئایا خوا ﷻ بە چی سووکی کردوون و، بێ نرخی کردوون؟ بەوە کە سزایان دەدات، چونکە سزای دواڕۆژ وەک چۆن بۆ جەستەیە، بە هەمان شێوە بۆ ڕووحیشە، زۆرجار خوا ﷻ لە قورئاندا کە باسی سزای کافران دەکات، لە

پێشدا باسی سزا مەعنەوییەکەیان دەکات، وەک دەفەرموێ: ﴿فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ ...﴾ ﴿٢٠﴾ الأحقاف، واتە: ئەمڕۆ سزای ڕیسواکەر دەچێژن.

کەواتە: خوا ﷻ بەوە سووک و بێ نرخی کردوون و، ڕیسوای کردوون، کە سزایان دەدات، لەبەرچی سزایان دەدات؟ لەبەر ئەوەی خۆیان بە هەڵبژاردنی خۆیان بۆ خوا ملکەچ نەبوون و، بەندایەتییان بۆ خوا نەکردوە.

ئنجا کە باسی کڕنووش بردن دەکرێ، لەبەر ئەوەیە کە ئەو پەڕی بەندایەتیی مرۆڤ و ئەو پەڕی ملکەچیی مرۆڤ، بە ئیختیاریی بۆ خوا، لە کڕنووش بردندا بەرجەستە دەبێ، بۆیە کەسێک خوا ڕیسوای بکات و زەبوونی بکات، بە تەئکید بە هیچ کەس ڕێزو حورمەتی بۆ پەیدا ناکرێتەوە.

١٠)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ﴾، بێگومان خوا ﷻ هەرچی بیەوێ دەیکات، خوا ﷻ کاری بە گۆترە ناکات، بەڵکو ویستی خوا شوێن زانیارییەکەی و حیکمەتەکەی دەکەوێ.

لەم سوورەتەداو لە چەند شوێنی دیکەی قورئانیشدا، هەم وشەی **(إرادة)** بەکارهاتوە، هەم وشەی **(مشيئة)** کە هەندێک لە زانایان دەڵێن: یەک واتایان هەیە، بەڵام بە سەرنجدانی ئەو ئایەتانەی ئەم سوورەتە، وا دێتە بەرچاو، وشەی **(إرادة)** تایبەت بێ بە ژیاندارانەوە، بەڵام وشەی **(مشيئة)** بۆ مامەڵە کردنی خوا ﷻ بێت لەگەڵ ژیاندارو بێ ژیان، واتە: وشەی **(مشيئة)** چەمکەکەی گشتییتر بێ، هەندێکیش دەڵێن: نەخێر! وشەی ئیرادە چەمکەکەی گشتییترە، گرنگ ئەوەیە جۆرێک لە جیاوازیی وردیان لە نێواندا هەیە، با زانایانیش لەسەر ئەو جیاوازییە وردە ڕێک نەکەوتبن.

چونکە من قەناعەتم وایە کە وشەی هاو واتا **(مُتَرَادِف)** لە قورئاندا نیە، ئەوە کە دوو وشە هەبن، یەک واتایان هەبێ و هیچ جیاوازییان نەبێ، پێم وایە شتی وا لە قورئاندا نیە، بەڵکو هەر وشەیەک کە بەکارهاتوە، مانایەکی تایبەت

بەخۆی هەیە، جاری وا هەیە کە دوو سێ وشە وێکدەچن، بە دڵنیایی جیاوازیی وردیان لە بەیندا هەن.

لێرەدا خوا ﷻ باسی کڕنووش دەکات و، وەک زانایان گوتوویانە: وشەی (**سُجُود**)، لێرەدا هەم بە مانای ملکەچیی تەکوینیی و، هەم بە مانای ملکەچیی شەرعیی دێ، کە هی یەکەمیان مەجازیی و، هی دووەمیان ڕاستەقینەییە.

بەڵام سەرەڕای ئەو دوو واتایە، دەشگونجێ مەبەست لەو کڕنووش بردنەی دروستکراوەکانی خوا، بە مانایەک بێت کە ئێمە نازانین چۆنە! هەروەک لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئاماژەی پێکراوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الإسراء)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: حەوت ئاسمانەکان و زەویی و هەرچی تیایاندا هەیە، خوا بە پاک دەگرێ و ، هیچ شتێک نیە کە خوا بە پاک نەگرێ بە ستاییش کردنیشیەوە، بەڵام ئێوە لە خوا بە پاکگرتنەکەیان تێناگەن، بێگومان خوا هێدیی و مەندو لێبوردەیە.

کە دەفەرموێ: تێی ناگەن، کەواتە: هەموو دروستکراوەکان، جۆرێک لە خوا بە پاکگرتن و ستاییش کردنی خوایان هەیە، کە بۆ ئێمە زاندراو نیە، هەرچەندە هەندێ لە زانایانیش گوتوویانە: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡ ﴾، ڕووی دواندن لە کافرەکانە، واتە: ئێوە تێی ناگەن، ئەگەرنا مەبەست پێی هەر ئەو ملکەچییە گشتییەیە کە بۆ خوا ملکەچن، بەڵام کافرەکان ئەوە نازانن کە ئەوانە هەموویان بۆ خوا ملکەچن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡ ﴾، بەڵام ئەگەر ڕووی دواندن لە ئەهلی ئیمان بێ، ئیمانداران دەزانن کە هەموو دروستکراوەکان بۆ خوا ملکەچن (ملکەچیی تەکوینیی)، خوا وای خوڵقاندوون، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی خوا بە پاکگرتنێکی دیکە بێ، کە بۆ ئێمەی ئیماندار زانراو نەبێ، کەواتە: جۆرێکی دیکەیە لە بە پاکگرتنی خوا.

هەروەک لە سووڕەتی (النور)دا خوا ﷻ ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾﴾، واتە: ئایا سەرەنج نادەی! کە هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، خوا بە پاک دەگرێ، هەروەها باڵندەکانیش هەموویان ڕێک دەوەستن (بەڕیز دەفڕن)، هەر کامێکیان پاڕانەوەی خۆی و خوا بە پاکگرتنی خۆی چاک دەزانێ و، خوا زانایە بەوەی ئەنجامی دەدەن.

بە دڵنیایی ئەم دوو ئایەتە - هی **(الإسراء)** و **(النور)** - لەگەڵ ئەم ئایەتی سووڕەتی **(الحج)**ە، ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە کە دروستکراوەکان هەموویان بە جۆرێک لە جۆرەکان، خوا بە پاک دەگرن، کە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی **(الإسراء)**دا، لەو بارەوە وردەکاریی زیاترمان باسکردوە.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

باسی دوو کۆمەڵی ناکۆک و تێکگیراو لە بارەی پەروەردگاریانەوە: (بێبڕواو بڕوادار)، ئنجا وەسفی سزای بێبڕوایان و پاداشتی بەرزو پەسندی بڕواداران:

خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنْ حَدِيدٍ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَلُؤْلُؤًا ۖ وَلِبَاسُهُمْ فِيهَا حَرِيرٌ ﴿٢٣﴾ وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ هَٰذَانِ خَصْمَانِ ﴾، ئەم دوو کۆمەڵە پێکەوە ناکۆکە، وشەی ﴿ هَٰذَانِ ﴾ خوێندراویشەتەوە (**هَذَانِّ**)، هەردوو خوێندنەوەکان هاتوون.

٢)- ﴿ ٱخْتَصَمُوا۟ فِى رَبِّهِمْ ﴾، لە بارەی پەروەردگاریانەوە کەوتوونە دەمەقاڵێی و ناکۆکیی و دوو بەرەکیی، ئایا ئەو دوو کۆمەڵە کێن؟

أ- کۆمەڵێکی بڕوادارو کۆمەڵێکی بێبڕوا.

ب- یاخود بڕوادارو مولحید.

ج- یاخود خوا بە یەکگر (**مُوحِّد**) و هاوبەش بۆ خوا دانەر (**مُشْرك**).

د- یاخود فەرمانبەر بۆ خوا (**مُطيع لله**) و سەرپێچییکار؟

(**الإخْتِصامُ: الإفْتِعَالُ مِنَ الخُصُومَةِ وَهِيَ الجَدَلُ وَالإخْتِلاَفُ بِالقَوْل**)، واتە: (**إِختِصام**) لەسەر کێشی (**إِفتِعال**)ە، لە (**خُصُومَة**)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە شەڕە قسەو ڕاجیایی، بەڵام بە قسە.

ئنجا باسی سزای كۆمەڵی یەكەمیان دەكات، كە كۆمەڵی نەیارانن بەرانبەر بە خوا ﷻ، كۆمەڵی بێبڕوایەكان، دەفەرموێ:

٣)- ﴿ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ئنجا ئەوانەی كە بێبڕوان، واتە: بێبڕوان بە خوا ﷻ بە پلەی یەكەم، ئنجا هەر كەسێك بێبڕوا بوو بە خوا، بێبڕواش دەبێ بە پێغەمبەرانی خوا (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، بە كتێبەكانی خوا، بە فریشتەكانی خوا، بە دیداری خوا، بە بەهەشت و دۆزەخ، بە قەدەر، ئەوانەی بێبڕوان واتە: ئەهلی كوفر بە هەموو پۆل و بەشەكانیانەوە.

٤)- ﴿ قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ ﴾، لە ئاگر پۆشاكیان بۆ بڕدراوە، (التَّقْطِيعُ: مُبالَغَةٌ فِي القَطْعِ، يَعْنِي: يُهَيَّأُ لَهُمْ ثَوْبٌ نَارِيٌّ مُحْرِقَةٌ لِلجلُودِ)، واتە: وشەی (تَقْطِيع) زێدەڕۆییە لە (قَطع)دا، واتە: زۆر باش بۆیان دەبڕدرێ، پۆشاكێكی ئاگرینیان بۆ ئامادە دەكرێ، ئەو ماددە ئاگرییە پێستیان دەسووتێنێ، ئێمە نازانین چۆنە، لە لای ئێمە ئاگر ناكرێتە پۆشاك، بەڵام ماددەی وا هەیە وەك ئاگر دەسووتێنێ و ، دەشگونجێ پۆشاكی لێ دروست بكرێ، حاڵ و باڵی قیامەتیش لەهی دنیا جیایە، بڕگەی یەكەمی سزاكەیان ئەوەیە كە پۆشاكی ئاگرینیان بە بەردا دەكرێ.

٥)- ﴿ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُءُوسِهِمُ ٱلْحَمِيمُ ﴾، بڕگەی دووەمی سزاكەیان ئەوەیە: ئاوی داغ و كوڵاویان بەسەر سەردا دەكرێ، هەر بەوەندە وازیان لێ ناهێنرێ بەرگی پۆشاكی ئاگرینیان بەبەردا بكرێ، بەڵكو ئاوی داغ و كوڵاویشیان بەسەر سەردا دەكرێ.

٦)- ﴿ يُصْهَرُ بِهِۦ مَا فِى بُطُونِهِمْ وَٱلْجُلُودُ ﴾، بڕگەی سێیەمی سزاكەیان ئەوەیە: كە بەو ئاوە كوڵاوو داغە، هەرچی لە نێو سكیان دایە، لە نێو هەناویان دایە، دەتوێتەوە، ڕیخۆڵەو گەدەو جەرگ و سیی و هەموو ئەوانەیان دەتوێنێتەوە، هەڵبەتە ئێمە نازانین پێكهاتەی جەستەی مرۆڤەكان لە ڕۆژی دوایی دا چۆن دەبێ؟ چ ئەوانەی ئەهلی بەهەشتن، چ ئەوانەی ئەهلی دۆزەخن، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: (مَا فِى بُطُونِهِمْ) هەرچی لە هەناویاندا هەیە، ﴿ وَٱلْجُلُودُ ﴾، هەروەها پێستیشیان پێی دەتوێتەوە، بەو ئاوە داغ و كوڵاوە.

(الإِصْهَارُ: الإِذَابَةُ، أَصْهَرَه وَصَهَرَهُ: أَذَابَهُ)، (إِصْهَار) بە مانای تواندنەوەو قاڵكردنەوەیە، دەگوترێ: (أَصهَرَهُ) و دەشگوترێ: (صَهَرَهُ)، هەردووكیان بە یەك واتان.

٧)- ﴿ وَلَهُم مَّقَـٰمِعُ مِنۡ حَدِيدٖ ﴾، ئەمە بڕگەی چوارەمی سزاکەیانە: گورزو قامچیی لە ئاسنیشیان بۆ هەن، قەمچییەکانیشیان بۆ داندراون بۆ لێدرانیان، ﴿ مَّقَـٰمِعُ ﴾، کۆی (مِقْمَع) یاخو (مقمعة)یە، دەڵێ: (آلَةُ القمعِ)، کە بە کوردیی گورزو قامچیی، پێ دەڵێن.

٨)- ﴿ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا ﴾، بڕگەی پێنجەمی سزاکەیان ئەوەیە: هەر کاتێک لە داخ و خەفەتان، لەبەر بێزاریی و لەبەر تەنگە نەفەسیی و ناڕەحەتیی، ویستیان لێی بچنە دەر لەو ئاگری دۆزەخە، دەگێڕدرێنەوە نێوی.

دەگوترێ: (**الغَمُّ: الكَرْبُ، إغتَمَّ: تَغَطَّى وَحَزِنَ، وَاحْتَبَسَ نَفَسُهُ عَنِ الخُرُوجِ**)، وشەی (**إغتَمَّ**) هەم بە مانای خۆی داپۆشیی، هەم بە مانای دڵتەنگ بوو، هەم بە مانای هەناسەو پشووی سوار بوو، هەناسەی تەنگ بوو، هەناسەی بە زەحمەت بۆ هاتەدەر، دێ.

کەواتە: ئەوانە لە دۆزەخدا، هەم دڵتەنگیش دەبن، هەم پشووشیان سوار دەبێ، هەم بێزارو ناڕەحەتیش دەبن، ئنجا کە دەیانەوێ بچنەدەر، دەگێڕدرێنەوە نێوی.

٩)- ﴿ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴾، پێشیان دەگوترێ: بیچێژن سزای سووتێنەر.

ئنجا دێتە سەر پاداشتی بڕواداران، بەڵام شێوازەکەی دەگۆڕێ، بۆ ئەوەی سەرنج ڕابکێشێ، ئیدی نافەرموێ: (**وَالَّذِينَ آمَنُوا**)، بەڵکو دەفەرموێ:

١٠)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ ئەوانەی بڕوایان هێناوە (بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ) و، چاکەکانیشیان ئەنجام داون، بە هەموو جۆرەکانیانەوە، چ کردەوەی دڵ بن، چ هی زمان بن، چ هی ئەندامەکان بن، چ بینراو بن، چ نەبینراو بن، چ پەیوەندییان بە ژیان و هەڵسوکەوتی تاکییەوە هەبێ، چ خێزانیی و، چ کۆمەڵایەتیی و، چ سیاسیی و.. هتد، ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾، هەمووی دەگرێتەوە، هەموو کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن، بە پێی توانای خۆیان، ئەوانەی وا دەکەن، خوا ﷻ دەیانخاتە نێو:

**١١)- ﴿ جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾**، ئەمە بڕگەی یەکەمی پاداشتەکەیانە: چەند باغێک، ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، وشەی ﴿ جَنَّٰتٍ ﴾، کۆی (**جَنَّة**)یە، وشەی (**جَنَّة**) واتە: باغ و بێستان، گوڵ و گوڵزار، بە کوردیی ئێمە بە بەهەشت دەڵێین: بەهەشت، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (**جَنَّة**).

کەواتە: خوا ﷻ دەیانخاتە چەند بەهەشتانێکەوە، چەند باغ و گوڵزارانێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبار بە ژێر درەختەکاندا دەڕۆن، یاخود بەژێر کۆشکەکانی کە تێیاندا نیشتەجێن، دەڕۆن.

**١٢)- ﴿ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ ﴾**، بڕگەی دووەمی پاداشتەکەیان، ئەوەیە: دەڕازێندرێنەوە بە بازنەی لە زێڕ دروستکراو و، بە گەوهەریش، وشەی ﴿ أَسَاوِرَ ﴾ کۆی (**أَسْوِرَة**)یە، (**أَسْوِرَة**)ەش کۆی (**سِوَار**)ە، (**سِوَار**) واتە: بازن، (**أَسوِرَة**) کۆیەکەیەتی، کەواتە: (**أَسَاوِر**) کۆی کۆیەکەیەتی، بۆیەش خوا ﷻ کۆی کۆ (**جَمْعُ الجَمْع**)ی بەکارهێناوە، تاکو بزانرێ ئەو بازنانە زۆر زۆرن، ئنجا ڕەنگە لە ڕووی عورفییەوە خەڵک پێی سەیر بێ، باشە ئەوە ئافرەتەکان بازنەی زێڕیان لە دەست دەکرێ، خرخاڵیان لەپێ دەکرێ، بەڵام پیاوان چۆن؟! بەڵام بێگومان حاڵ و باڵی بەهەشت جیایە لە هی دنیا، ئەگەرنا خوا ﷻ لێرەدا بە گشتی باسی پیاوان و ئافرەتانی کردوە، هەموو ئەوانەی کە بەهەشتیین دەڕازێندرێنەوە لە بەهەشتەکاندا، بە بازنەی لە زێڕ دروستکراو و، بە گەوهەریش.

**١٣)- ﴿ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴾**، بڕگەی سێیەمی پاداشتەکەیان: پۆشاکیشیان لەوێدا (لە بەهەشتدا) بریتیە: لە ئاوریشم، ئەو قوماشەی کە پۆشاکی ئەوانی لێ دروست دەکرێ، ئاوریشمە.

**١٤)- ﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ ﴾**، بڕگەی چوارەمی پاداشتیان: ڕێنماییش دەکرێن بۆ قسەی پاک و چاک، واتە: کە قسەی پاک و چاک بکەن و قسەی ناڕێک نەکەن.

**١٥)- ﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡحَمِيدِ ﴾**، بڕگەی چوارەمی پاداشتیان: ڕێنماییش دەکرێن بۆ ڕێی ستایشکراو، واتە: کردەوەی چاک، یاخود ڕێی خوای ستایشکراو، یانی: بەو شێوەیە مامەڵە بکەن، لە بەهەشتدا کە ڕێبازی خوا ﷻ دەیخوازێ.

## پێنج هەڵوەستەی کورت

١- ﴿ يُحَلَّوْنَ ﴾، (التَّحْلِيَةُ: وَضْعُ الحُلِيِّ عَلَى أَعْضَاءِ الجِسْمِ، حَلَّاهُ: أَلْبَسَهُ الحُلِيَّ، مِثْلُ: جَلْبَبَهُ)، وشەی (تَحلِيَة) واتە: دانانی خشڵ لەسەر ئەندامەکانی جەستە، دەگوترێ: (حَلَّاهُ) واتە: خشڵی لەبەر کرد، وەک: (جَلْبَبَهُ) واتە: جیلبابی لەبەر کرد.

٢- ﴿ أَسَاوِرَ ﴾ کۆی (أَسْوِرَة)یە، (أَسْوِرَة)ش کۆی (سِوَار)ە، کە ئەمە ئاماژەیە بەوەی ئەو بازنانە زۆر زۆرن.

٣- ﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴾، دەگونجێ مەبەست پێی بەهەشت بێ، واتە: لە بەهەشتدا هەر قسەی باشیان فێر دەکرێ، وەک پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {إِنَّهُمْ يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالتَّحْمِيدَ، كَمَا يُلْهَمُونَ النَّفَسَ} (أخرجه مُسلِم: ٢١٨٠).

واتە: ئەهلی بەهەشت فێر دەکرێن کە خوا بە پاک بگرن و ستایشی بکەن، وەک چۆن هەناسە دەدەن و پێیەوە ماندوو نابن.

چونکە لە بەهەشتدا عیبادەت و تاعەتی لێ نیە، بۆیە دەگونجێ ﴿ وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ... ﴾ مەبەست پێی بەهەشت بێ، هەم بۆ قسەی باش و، هەم بۆ کردەوەی باش ڕێنمایی دەکرێن، چونکە لە بەهەشتدا نابێ قسەی ناڕێکی لێ بگوترێ و، نابێ کردەوەی ناڕێکی لێ بکرێ، ئنجا لەوێ ئەوان هەم ڕێنمایی دەکرێن بۆ قسەی باش و پاک و چاک، هەم بۆ ڕێبازی ستایشکراو، کە دەگونجێ ستایشکراو سیفەت بێ بۆ ﴿ صِرَٰطِ ﴾، واتە: ڕێبازێک کە مامەڵەی باشی پێ بکەن، یاخود ستایشکراوەکە سیفەتی خوای پەروەردگارە، خوای ستایشکراو، خوایەک کە شایستەی هەموو ستایش و مەدح و سەنایەکە، ڕێ

پێشانی بەهەشتیان دەدا کە لە بەهەشتدا بە شێوەیەک مامەڵە بکەن، شایستەی ئەهلی بەهەشت بێ.

دەشگونجێ کە دەفەرموێ: ﴿وَهُدُوٓاْ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ﴾، مەبەست پێی ئەوە بێ: ئەمە بەرهەمی ئەوەیە کە لە دنیادا ڕێنمایی کرابوون بۆ قسەی باش، کە وشەی خوا بە یەکگرتن (**توحید**) لەپێش هەموو قسەیەکی باشەوەیە، هەروەها خوا بە پاکگرتن و ستایشکردن و بە گەورە گرتنی، هەروەها ڕێنماییش کرابوون بۆ ڕێبازی خوای شایستەی ستایش، کە ئیسلامەو بەندایەتییە بۆ خوا ﷻ.

**٤-** وشەی: گەوهەر (**لُؤْلُؤْ**) کە (**درّ**) و (**جُمان**)یشی پێ دەگوترێ، هەروەها جەوهەریشی پێ دەگوترێ، جۆرە ماددەیەکە دەنکی سپی و زەردن، درەوشاوەن، لە صەدەف دەردەهێنرێ، ئەویش بریتیە لە ژیاندارێکی ئاوی (وەک قۆزاخە)، ئەو ماددەیە دەخاتە نێو بەدەنی خۆیەوە و، دەیمژێ، دوایی ئەو صەدەفە دەردەهێنرێ و دەشکێنرێ، ئەو گەوهەرەی تێدایە، ئەو گەوهەرەش جاری وا هەیە بچووکەو، جاری وا هەیە گەورەیە، جاری وا ڕەنگەکەی سافترەو، جاری واش هەیە بە جۆرێکی دیکەیە.

**٥-** بە نسبەت ئاوریشمەوە: ئاوریشمیش لە کرمێک پەیدادەبێ، پێی دەگوترێ: کرمی ئاوریشم (**دُودَةُ القَزّ**)، لیکی ئەو کرمەیە بە دەوری خۆیدا دەیچنێ، کە لە شێوەی پاقلەی سوودانیی دایە، پاشان ئەو کرمە لە نێویدا دەمێنیتەوە، تاکو دوای باڵی لێ دەڕوێن، دەبێتە پەپوولەیەک و لێی دێتە دەرێ، دواتریش خەڵک ئەو قۆزاخەیە کە دروستی کردوە، دەخەنە نێو ئاوێکی گەرمی کوڵاوەوە، تاکو ئەو ماددە لینجەی کە پێی لێک بەستراوە، شل ببێتەوە، دواییش وەک دەزوویەک دەری دەکێشن، پێنج هەزار (٥٠٠٠) ساڵ لەمەو بەر، لە چین ئاوریشم زانراوە بەکاربهێنرێ، بە زۆریی کرمی ئاوریشم، لە سەر درەختی (توو) دەبێ، دەیخوات و، ئاوریشمی لێ دروست دەکات[١].

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

---

(١) التحرير والتنوير: ١٧، ص٢٣٤ - ٢٣٣.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی (٢٥ - ٣٧)، واتە: سێزدە (١٣) ئایەت دەگرێتە خۆی و تەوەری سەرەکیی ئەم سێزدە ئایەتەش بریتیە لە باسی دروستکردنی کەعبە (**البیت الحرام**)، لە لایەن ئیبراهیمەوە بە فەرمانی خوا صەڵات و سەلامی خوا لەسەر ئیبراهیم و هەموو پێغەمبەرانی خوا بێ، پاشان باسی حەج، یانی: سەردان و زیارەتی ئەو ماڵە تایبەتەی خوا ﷻ بۆ بەرجەستە کردنی خوا بە یەکگرتن و، تەنیا خوا پەرستن، لەمیانی جێبەجێ کردنی خوا پەرستییەکانی حەج و عومرەدا کە پێیان دەگوترێ: (**مناسك**).

ئنجا لەم سێزدە ئایەتەدا، وێڕای ئەوەی خوا ﷻ ئەوە ڕادەگەیەنێ کە ئیبراهیم بە فەرمانی ڕاستەوخۆی خوا ﷻ، لەو جێیەی خوا بۆی دیاریی کردوە، کەعبەی دروست کردوە، وێڕای ئەوە کۆمەڵێ لە خوا پەرستییەکانی حەج و عومرەش لەم ئایەتانەدا باس کراون، وەک سەربڕانی ئاژەڵەکان و، دابەش کردنی گۆشتەکەیان بەسەر هەژاراندا و، سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا و، لابردنی چڵک و چەپەر و پیسییەکان لە جەستە، دوای ئەنجامدانی ژمارەیەک لە خواپەرستییەکانی حەج و، ئیحرام شکاندن، کە مەبەست پێی ئیحرام شکاندنی گچکەیە، (التَّحَلُّلُ الأَصْغَر)، وەک دوایی بە تەفسیل باسی دەکەین، ئنجا خۆپاراستن لە قسەی خراپ و، هاوبەش بۆ خوا دانان (**شرك**) و، بە مەزنگرتنی دروشم و حورمەتەکانی ئایینی خوا ﷻ و، خوا یاد کردن و، لە خۆدا بەرجەستە کردنی تەقوا و، ملکەچیی بۆ خوا و، بەرپا کردنی نوێژ و، بەخشین و...هتد.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ٱلَّذِي جَعَلۡنَٰهُ لِلنَّاسِ
سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِۚ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٢٥﴾ وَإِذۡ
بَوَّأۡنَا لِإِبۡرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلۡبَيۡتِ أَن لَّا تُشۡرِكۡ بِي شَيۡـٔٗا وَطَهِّرۡ بَيۡتِيَ لِلطَّآئِفِينَ
وَٱلۡقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ
ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴿٢٧﴾ لِّيَشۡهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمۡ وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ
فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ
ٱلۡفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لۡيَقۡضُواْ تَفَثَهُمۡ وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ
﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦۗ وَأُحِلَّتۡ لَكُمُ
ٱلۡأَنۡعَٰمُ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ
قَوۡلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ
فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ﴿٣١﴾ ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ
فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلۡبَيۡتِ
ٱلۡعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكٗا لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ
بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۗ فَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَلَهُۥٓ أَسۡلِمُواْۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ
ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ
﴿٣٥﴾ وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞۖ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا
صَوَآفَّۖ فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ
لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡۚ
كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمۡ لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوا بوون و ڕێگریی (خەڵکی) دەکەن، لە ڕێی خواو، ئەو مزگەوتی حەڕامەی کە بە یەکسانیی بۆ خەڵکی نیشتەجێ و دەرەکییمان داناوەو، هەر کەسێکیش ستەمکارانە بیەوێ لادانی تێدا بکات، ئازارێکی بە ئێشی پێ دەچێژین ﴿٢٥﴾ یادیش بکەوە! کاتێک شوێنی ماڵ (ی خوا)مان بۆ ئیبڕاهیم دەستنیشان و ساز کرد، (پێشمان فەرموو:) هیچ شتێک مەکە هاوبەشم و ماڵەکەشم بۆ سووڕاوان (بە دەوری کەعبەدا)و ڕاوەستاوان بۆ (خواپەرستیی) و ڕکووعبەران و کڕنووشبەران، پاک بکەوە ﴿٢٦﴾ هەروەها جاڕیش بە نێو خەڵکدا بدە بۆ حەج کردن، کە بە پیادەو بە سواری هەر وڵاخێکی لاواز (ئەگەر هیچی دیکەیان چنگ نەکەوت)، لە هەر ڕێیەکی دوورەوە بێن ﴿٢٧﴾ تاکو ئامادەی چەندان سوود و بەرژەوەندییان ببن، لە ڕۆژانێکی زانراودا و، ناوی خوا لەسەر ئاژەڵە چوار پێیەکان بێنن، (لە کاتی سەر بڕینیاندا، هەر کاتێکیش سەرتان بڕین)، لێیان (لە گۆشتەکەیان) بخۆن و دەرخواردی بابای داماوی هەژاریشی بدەن ﴿٢٨﴾ ئنجا با دوایی چڵک و چەپەری خۆیان لابەرن و، نەزرەکانیان بەجێ بێنن و، بە دەوری ماڵی دێرینیشدا بسووڕێنەوە (تەواف بکەن) ﴿٢٩﴾ ئەوە (بەو شێوەیە باسکرا) و، هەر کەسێک ڕێزلێگیراوەکانی خوا بە مەزن بگرێ، (ئەو خواپەرستییانەی خوا ڕێزو حورمەتیی تایبەتی بۆ داناون)، ئەوە لە لای پەروەردگاری بۆی باشترەو، ئاژەڵەکانیشتان تێکڕا بۆ ڕەوا کراون، جگە لەوانەی بە سەرتاندا دەخوێندرێنەوە (لە قورئاندا)، دەجا خۆتان لە پیسیی بتەکان دوور بگرن و، خۆشتان لە گوتنی درۆ بە دوور بگرن ﴿٣٠﴾ بۆ خوا ساغ بووەوە بن و هاوبەش بۆ دانەری مەبن، هەر کەسێکیش هاوبەش بۆ خوا دابنێ، وەک

ئەوە وایە لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوار و، باڵندە (ی لاشەخۆر) تێی ڕۆهاتبن، یان با بیڕفێنی بەرەو شوێنێکی قووڵی دوور ﴿٣١﴾ ئەوە (بەو شێوەیە ڕوونکرایەوە)و، هەر کەسێکیش دروشمەکانی خوا بە مەزن بگرێ، بە دڵنیایی ئەو کارە لە پارێزکاریی دڵانەوەیە ﴿٣٢﴾ سوودگەلێکتان تێیاندایە (لە ئاژەڵانی قوربانیی دا)، تاکو کاتی ناوبراو، دوایی شوێنی تایبەتییان (بۆ سەربڕان) لە لای ماڵی دێرین (ی خوای)ە ﴿٣٣﴾ بۆ هەر ئۆممەتێکیش (شوێن و دروشمی) خواپەرستیی تایبەتمان داناوە، تاکو ناوی خوا لەسەر ئەو ئاژەڵە چوار پێیانە بێنن، کە پێی داون، پەرستراویشتان یەک پەرستراوە، ئنجا بۆ وی ملکەچ بن و، مژدەش بدە بە خۆ بە کەمگران (لە بەرانبەر فەرمانی خوادا) ﴿٣٤﴾ ئەوانەی کاتێک باسی خوا دەکرێ، دڵیان ڕادەچڵەکێ و، خۆ ڕاگران لەسەر ئەوەی تووشیان بووەو، بەرپاکەرانی نوێژو، ئەوانەی لەوەی پێمان داون دەبەخشن (مژدەی پاداشتی بەرزی خوایان پێ بدەن) ﴿٣٥﴾ حوشترە قەبەو بەدەوەکانیشمان لە دروشمەکانی خوا گێڕاون، سوود گەلی زۆریشیان بۆتان تێدایە، ئنجا لە حاڵێکدا کە بە ڕیز وەستاون، ناوی خوایان لەسەر بێنن، (بۆ سەربڕین)، ئنجا کە تەنیشتیان کەوتنە سەر زەوی، لێیان (لە گۆشتەکەیان) بخۆن و دەرخواردی بابای سواڵکەر و (بە ناڕاستەوخۆ) داواکەریشی بدەن، بەو جۆرە ئاژەڵەکانمان بۆ دەستەمۆ کردوون، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن ﴿٣٦﴾ بێگومان نە گۆشتەکەیان و نە خوێنەکەیان ناگاتە خوا، بەڵکو پارێزکاریی لە ئێوەوەی پێ دەگات، بەو شێوەیە (خوا) بۆتانی دەستەمۆ و ڕام کردوون، تاکو بە هۆی ئەوەوە کە ڕێنمایی کردوون، خوا بە گەورە بگرن و، مژدەش بدە بە چاکەکاران (کە لە دنیاو دواڕۆژدا پاداشتیان هەیە) ﴿٣٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**ٱلْعَـٰكِفُ**): (**العُكُـوفُ: الإِقْبَـالُ عَـلَى الـشَّيءِ وَمُلازَمَتـه عَـلَى سَـبِيْلِ التَّعْظِيـمِ لَـهُ**)، (**عكُـوُف**) بریتیـە لـە ڕووکردنـە شـتێک و پێـوە پەیوەسـتبوونی بـە شـێوەی بـە مەزنگرتنـی، (**وَالإِعتِـكَافُ فِي الـشَّرْعِ: هُـوَ الإِحتِبَـاسُ فِي المَسْـجِدِ عَـلَى سَـبِيلِ القُـرْبَى**)، (**إعتکاف**) لـە زاراوی شـەرعدا، بریتیـە لـە خـۆ هێشـتنەوە لـە مزگەوتـدا، بـە نیـەتی لـە خـوا نیزیـک بوونـەوە.

(**وَٱلْبَادِ**): (**البَـدو: خِـلَافُ الحَـضَرِ**)، (**بَـدُو**)، واتـە: بیابانشـین، دەشتنشـین، یاخـود لادێ نشـین، پێچەوانـەی (**حَـضَر**)ە، واتـە: نیشـتەجێی شـار، (**البَـادِ: المُقِيـمُ فِي البَادِيَـة**)، (**بَادِ**) کـە هـەم بـە ژێـر (**كـسْرة**) خوێندراوەتـەوە، هـەم بـە (**ي**) (**بـادي**)، وەک دوایـی بـاسی دەکەیـن، واتـە: نیشـتەجێی دەشـت و چۆڵایـی و بیابـان و سـارا.

(**بِإِلْحَـادِۭ**): واتـە: لادان، (**لَحَـدَ القَـبرَ وَأَلحَـدَهُ: أَمَالَـهُ، وَجَعَـلَ حُفْـرَةً مَائِلَـةً فِي وَسَـطِهِ**)، (**لَحَـدَ القَـبْرَ وَأَلحَـدَهُ**)، بـە کوردیـی دەڵێیـن: گۆڕیچـە، هەندێـک وایـان لێکداوەتـەوە، لـە نێـو گـۆڕدا گۆڕیچەیـەک لـێ دەدرێ و، هەندێکیـش بـە لا گـۆڕ لێکیـان داوەتـەوە، کـە ئـەوەی دووەمیـان زیاتـر پـێ دەچـێ مەبەسـت بـێ، لاگـۆڕ ئەوەیـە کـە دوای ئـەوەی گۆڕەکـە لـێ دەدرێ، بـە لایەکـی دا هەڵبقەنـرێ لە بنـەوە و، دوایـی جەنازەکە بخرێتـە نێـوی، نـەک بخرێتـە نێـو خـودی گۆڕەکـە، بخرێتـە ئـەو لاگـۆڕەی کـە لـە ژێـر دیـواری گۆڕەکـەدا لێـدراوە، کەواتـە: ئیلحـاد، یـانی: لادان.

(**بَوَّأْنَـا**): (**البَـوَاءُ: مُسَـاوَاةُ الأَجْـزَاءِ**)، (**بَـوَاء**) دەگوتـرێ: (**أَرْضٌ بَـوَاء**)، واتە: (**أَرْضٌ مُسـتَوِيَة**) زەوییەکـی یەکسـان، هەمـوو بەشـەکانی یەکسـان بـن، هیچـی لـە هیچـی بەرزتـر نەبـێ، (**مَـكَانٌ بَـوَاء**)، واتـە: تەخـت و ڕێـک، هەمـوار، (**بَوَّأْتُ لَـهُ مَكَانَـاً: سَـوَّيْتُهُ**)، (**بَـوَّأْتُ لَـهُ مَكَانَاً**)، واتـە: شـوێنم بـۆ دیارییکـردن، یاخـود شـوێنەکەم بـۆ ڕێکخسـت و بـۆم سـاز کـرد.

(**وَأَذِّن**): (**أَذِنْتُهُ وَآذَنْتُهُ: أَعْلَمْتُهُ**)، ئاگادارم کردەوە، هەم (**أَذِنتُهُ**)، هەم (**آذَنْتُهُ**) یانی: ئاگادارم کردەوە، (**المُؤَذِّنُ: كُلُّ مَنْ يُعْلِمُ بِشَيءٍ نِدَاءً**)، (**مُؤَذِّن**) هەر کەسێکە شتێک بە بانگکردنەوە خەڵکی لێ ئاگادار دەکاتەوە، واتە: جاڕدان، بە کوردیی دەڵێین: جاڕدان، ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ ﴾، واتە: جاڕ بە نێو خەڵکیدا بدە، بێن بۆ حەج.

(**رِجَالًا**): (**الرَّجِلُ وَالرَّاجِلُ: المَاشِي**)، (**رَجِل**) و (**رَاجِل**) یانی: پێڕۆ، (**وَالجَمْعُ رِجَال**)، واتە: پێڕۆیەکان، (**مِثْلُ رِكَاب جَمْعُ رَاكِب**)، (**رِكَاب**) کۆی (**رَاكِب**)ە، (**رَاكِب**) یانی: سوار، (**رِكَاب**) واتە: سوارەکان.

(**رِجَال**)، لێرەدا بە مانای (**مُشَاة**) دێ، کە کۆی (**مَاشِي**)یە، یانی: پێڕۆ، (**رُكْبَان**) یان (**رِكَاب**) یانی: سوارەکان، یانی: بەراورد دەکرێن، وەک لە سوورەتی (**الإسراء**) دا، کاتێک شەیتان (ئیبلیس) کڕنووش نابات بۆ ئادەم، کڕنووشی ڕێز لێگرتن، خوا ﷻ پێی دەفەرموێ: ﴿ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ ... ﴿٦٤﴾ ﴾الإسراء، (**خَيل**) واتە: وڵاخیی سواریی کە مەبەست پێی سوارەیە، ﴿ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم ﴾، واتە: بەسەریان وەرکە، سوارەکانت و پیادەکانت، یانی: سوارەو پێڕۆیان بەسەر وەرکە، واتە: هەرچی هێز و سووپای هەتە، بۆ مرۆڤەکانی دەنگ بدە.

(**ضَامِرٍ**): (**الضَّامِرُ: مِنَ الفَرَسِ: الخَفِيفُ اللَّحْمِ مِنَ الأَعْمَالِ لَا مِنَ الهُزَالِ**)، (**ضَامِر**) لە ئەسپان ئەوەیە کە گۆشتەکەی کەم بێ، لە ئەنجامی زۆر کار کردندا، یا زۆر مەشق پێ کران و، ڕاهێندراندا، نەک لەبەر لاوازیی و بێ هێزیی، دەگوترێ: (**نَاقَةٌ ضَامِر، وَنَاقَةٌ ضَامِرَة، وَفَرَسٌ ضَامِر**)، حوشترێکی (**ضامِر**) یان حوشترێکی هەم (**ضَامِرة**)، ئەویش بە هەمان شێوە واتە: کەم گۆشت، یاخود ورگی بە پشتیەوە نووسابێتەوە، ورگن نەبێ، چونکە ورگنیی و سکی زل، بۆ ئاژەڵ بە تایبەت بۆ حوشتری بارە بەر و ئەسپ و ماین و وڵاخە بەرزە، دەبێتە هۆی ئەوەی لە ڕۆیشتندا و لە ڕاکردندا سست بن.

(فَجٍّ عَمِيقٍ): (**الفَجُّ: شُقَّةٌ يَكْتَنِفُهَا جَبَلانِ**)، (**فَجّ**) کەلێنێکە دابڕاوابییە کە دەکەوێتە نێوان دوو چیایانەوە و، (**عَميق**)، واتە: قووڵ، بەڵام لێرەدا مەبەستی پێ دوورییە، بۆیە گوتراوە: (**وَالأَصْلُ فِي العُمْقِ: البُعْدُ سُفْلاً**)، واتە: دوور بێ بەڵام بە چوونە خواردا دوور بێ، واتە: قووڵ، بنەکەی قووڵ بێ، کەواتە: لێرە ﴿يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾، واتە: لە هەر ڕێیەکەوە کە بە نێو چیایەکاندا دێ، بە هەر دۆڵ و شیوێکی دووردا بێن، کەواتە: ﴿فَجٍّ عَمِيقٍ﴾، یانی: (**الطَّرِيقُ الوَاسِع**)، هەر ڕێیەکی فراوان کە دەکەوێتە نێوان چیایەکانەوە، (**فِجَاج**) کۆی (**فَجّ**)ە، یانی: دۆڵ و شیوەکانی، یاخود کەلێنەکانی نێوان چیایەکان.

(بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ): (**البَهِيْمَةُ: مَا لَا نُطْقَ لَهُ لِمَا فِي صَوْتِهِ مِنَ الإِبْهَامِ، وَخُصَّ فِي التَّعَارُفِ بِمَا عَدَى السِّبَاعِ وَالطَّيرِ**) (**بَهِيْمَة**) هەر ژیاندارێکە کە قسەو دوانی نەبێ، لەبەر ئەوەی دەنگەکەی موبهەمە، {واتە: لێی حاڵی نابی}، بەڵام لە ڕووی زاراوەییەوە، تایبەت کراوە بە هەموو ئەو ئاژەڵانەی جیا لە دڕندەو باڵندە، کەواتە: هەموو ئاژەڵەکان دەگرێتەوە، بەڵکو لە عورف و باوێکی تایبەتتردا، وشەی ﴿ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾، ئەو چوار جۆرە ئاژەڵە دەگرێتەوە: (وشتر و، ڕەشە وڵاخ و، مەڕ و، بزن)، کە دەگونجێ بڵێین: حوشتر بە نێر و مێوە: هەم (**ناقة**)، هەم (**جَمَل**)، ڕەشە وڵاخیش بە نێر و مێوە: هەم گا، هەم مانگا، هەروەها گامێش و کەڵیش بە هەمان شێوە و، ئاژەڵی وردیش بە نێر ومێوە: بەران و نێریی و، مەڕ و بزن، بە ڕەش و سپیی و مەرەزەوە، بەڵام ﴿بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾، بە هۆی وشەی (**بهيمة**) وە، وشەی (**أنعام**) واتاکەی فراوانتر دەبێ، لەو چوار جۆرە ئاژەڵە و، هەموو ئەوانی دیکەش دەگرێتەوە.

(ٱلۡبَآئِسَ): واتە: داماو، بێچارە، دەگوترێ: (**بَئِسَ الرَّجُلُ: اشْتَدَّتْ حَاجَتُهُ هُوَ بَائِس**)، پیاوێک کە زۆر ئاتاج بێت، زۆر هەژارو نەدار بێ، دەگوترێ: (**بَئِسَ**)، واتە: ئەو پیاوە زۆر داماوو بێچارەیە، (**بائِس**)، ناوی بکەر (**إسم فاعِل**)ەکەیەتی.

(لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ): (لِيُزِيلوا وَسْخَهُم)، با چڵک و چەپەریان لابەرن، دەگوترێ: (قَضَى الشَّيءُ يَقْضِي، إذْا قَطَعَهُ وأَزَالَهُ)، کاتێک کە بڕیی و لایبرد، وشەی (قَضَى) ی، بۆ بەکاردێ، (وَأَصلُ التَّفَثِ وَسْخُ الظُّفْرِ وَغَيْرِ ذَلِكَ)، چڵکی نینۆک و جگە لە نینۆکیش و، ئەو مووانەی کە لە هەندێ شوێنی جەستەی مرۆڤ دێن، وشەی (تَفَث)یان بۆ بەکاردێ، واتە: با خۆیان پاکبکەنەوە، کە وەک دوایی باسی دەکەین، مەبەست پێی ئیحرام شکاندنی گچکەیە، دوای ئەوەی کە لە عەرەفات دێنە خوارو شەو لە موزدەلیفە دەمێننەوەو، دوایی دێن بۆ مینا، ئەمە پێی دەگوترێ: ئیحرام شکاندنی گچکە.

(نُذُورَهُمْ): (النَّذرُ: أَنْ تُوجِبَ عَلَى نَفْسِكَ مَا لَيْسَ بِوَاجِبٍ لِحُدُوثِ أَمْرٍ)، (نَذْر) ئەوەیە شتێک لەسەر خۆت پێویست بکەی، کە لە سەرت پێویست نەبێ، لەبەر ڕوودانی کارێک، بەڵام وشەی (نُذُور) کە کۆی (نَذر)ە، بە مانای ئەو ئاژەڵانەیە کە سەر دەبڕدرێن، واتە: قوربانییەکان، لێرەدا بەو مەبەستە بەکارهاتوە.

(ٱلْعَتِيقِ): (العَتِيقُ: المُتَقَدِّمُ فِي الزَّمَانِ أَوِ المَكَانِ أَوِ الرَّقَبَةِ)، (عَتِيق) واتە: دێرین، لە ڕووی کاتەوە و، لە ڕووی شوێنەوە، یاخود لە ڕووی گەردنەوە، واتە: بەو واتایە لەمێژینە بێت، بە کات و کاتی زۆری بەسەردا چوو بێت، یاخود شوێنێک بێت دێرین بێت، یاخود ماوەیەکی زۆر بێت هەبێت، هەروەها وشەی (عَتِيق)، واتە: بە مانای بەخشندە و، بە مانای ئازاد و، بە مانای شوێنێک کە هیچ کەس دەستی بەسەردا نەگرتبێ، بەو مانایانەش هاتوە.

(حُرُمَٰتِ): (حُرْمَةُ الرَّجُلِ: أَهْلُهُ)، حورمەتی پیاو بریتیە لە خێزانی پیاو، بەڵام ﴿حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ﴾، (مَا حَرَّمَهُ اللهُ)، حورمەتەکانی خوا ﷻ ئەو شتانەن کە خوا ﷻ قەدەغەی کردوون، یاخود قەدەغەی کردوون، کە دەستیان بگەیەندرێتێ و دەستیان بۆ ببرێ.

(ٱلزُّورِ ): (**الـزُّورُ: الكَـذِبُ**)، (**زُور**) بـە مانـای درۆ دێ، کـە لێـرەدا بـە مانـای شـیرکە، چونکـە لـە ڕاسـتیی دا شـیرک گەورەتریـن جـۆری درۆیـە کـە بگوتـرێ: خـوا هاوبـەشی هەیـە، بـەڵام (**زَوْر**)، واتـە: (**ضَیْـف**)، (**الزَّائِـرُون**)، ئەوانـەی سـەردان دەکـەن.

(حُنَفَآءَ ): (**حُنَفَـاء**)، کـۆی (**حَنِیْـف**)ە، (**الحَنَـفُ: المائِـلُ مِـنَ الباطِـلِ إلَى الحَـقِّ، عَكـسُ الجَنَـف**)، (**حَنَـفَ**)، واتـە: لـە ناهەقـەوە گەڕایـەوە بـۆ هـەق، بـە پێچەوانـەی (**جَنَـفَ**)ە، واتـە: لـە هەقـەوە لایـدا بـۆ ناهـەق، کەواتـە: (**حَنِیـف**)، یـانی: مسـوڵمانێکی خـۆ بـۆ خـوا سـاغکەرەوە.

(خَرَّ ): یانی: (**سَقَطَ**)، کەوت، بەڵام بە مەرجێک لە بەرزییەوە بکەوێتە خوار.

(فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ ): (**الخَطـفُ: الإِسـتِلَابُ**)، (**خَطْـف**) واتـە: ڕفانـدن، بـە کـت و پـڕ دەسـتی بدەیـە و بیرفێنـی، (**إِختَطَفَـهُ، وَتَخَطَّفَـهُ**)، واتـە: ڕفانـدی و، تێبرۆهـات، بـە کوردیـی بـە (تێبرۆهاتـن) مانـام کـردوە، لـە مانـای دەقـاو دەقەکەیـدا، کـە ئـەو وشـەیە ڕەنگـە هەنـدێ کـەس تێـی نـەگا، بـەڵام وشـەیەکی ڕەسـەنی کوردییـە، لـە زاری موکریانیـی دا، هـەروەک زۆر وشـەی دیکـەش لـە زاری موکریانیـی دا هـەن، ڕەنگـە ئێسـتا لـە نێـو شـوێنەکانی دیکـەی کوردسـتاندا نەمـا بـن، یاخـود سـپات بووبنـەوە، یاخـود خەڵکێکـی کـەم بیانزانـێ.

(سَحِيقٖ): (**بَعِیـد**)، بـە مانـای دوور دێ (**أَسـحَقَهُ اللـه: أَبعَـدَهُ اللـه**)، واتـە: خـوا دووری بخاتـەوە.

(مَنسَكٗا ): (**النُّسُـكُ: العِبـادَةُ**)، (**نُسُـك**) یـان (**نُسْـك**)، بـە مانـای خواپەرسـتیی دێ، (**النَّسِـیكَةُ: الذَّبِیحَـةُ**)، ئـەوەی کـە سـەر دەبـڕدرێ، سـەربڕاو بـۆ خـوا ﷻ (**وَالجَمـعُ نُسُـك وَنَسـائِك**)، بـە (**نُسُـك**) و بـە (**نَسـائِك**) کۆدەکرێتـەوە، (**مَنسِـك**) یـان (**مَنسَـك**) بـە هـەردوو شـێوەکەی هاتـوە، ئەو شـوێنەی کـە (**نَسـائِك**)ی یاخـود (**نُسُـك**) قوربانییەکانی تێـدا سـەر دەبڕدرێـن.

(ٱلْمُخْبِتِينَ): واتە: ملکەچان و نەرم و نیانان، لە (خَبْت)ەوە هاتوە، (الخَبْتُ: المُطْمَئِنُّ مِنَ الأَرْض)، شوێنێکی گۆملایی و نزمایی لە زەوی، دوایی وشەی (خَبْت) یان (مُخْبِت) بەکارهێنراوە بۆ نەرمیی و خۆ بە کەمگریی لە بەرانبەر خوادا ﷻ و، لەگەڵ بەندەکانی خواشدا، ئینسان دەبێ خۆ بە کەمگر و نەرم و میهرەبان بێ.

(وَٱلْبُدْنَ): (البُدنُ: جَمْعُ بَدَنَة: التَّي تُهْدَى، نَاقَة أَو بَقَرَة)، (بُدْن)، کۆی (بَدَنَة)یە، (بَدَنَة) ئەو حوشترەیە، یاخود ئەو ڕەشە وڵاخەیە (بە ڕای هەندێک لە زانایان، هەردووکیان دەگرێتەوە) کە دەکرێتە دیاریی و خەڵات و لە کاتی خواپەرستییەکانی حەجدا سەر دەبڕدرێ.

(شَعَـٰٓئِرِ): (جَمعُ شَعِيرَة، البَدَنَةُ تُهدَى، والشَّعائِرُ أَعْمالُ حَجٍّ وَكُلُّ مَا جُعِلَ علاقة لِطاعَةِ اللـه)، ﴿ شَعَـٰٓئِرِ ﴾، (شَعَائِر) کۆی (شَعِيرَة)ەیە، (شَعِيرَة) واتە: دروشم، هەندێکیان (شَعِيرَة)یان بە (بَدَنَة) لێکداوەتەوە، واتە: ئەو حوشترە، یاخود ئەو ڕەشە وڵاخەی سەر دەبڕدرێ، بەڵام لە ڕاستییدا وشەی (شَعَائِر) واتە: کۆی کردەوەکانی حەج، بەڵکو هەموو ئەو تاعەت و فەرمانبەرییانەی بۆ خوا ئەنجام دەدرێن، چ پەیوەندییان بە حەجەوە هەبێت و، چ جگە لە حەجیش.

(صَوَآفَّ): دەگوترێ: (صَفَّتِ الإِبِلُ قَوائِمَها فَهِيَ صافَّةٌ وَصَوَافٌّ)، (صَوَافّ) کۆی (صَافَّة)یە، کاتێک کە حوشتر ڕێک دەوەستێ، پێیەکانی جووت دەکات، ئەو وشەیەی بۆ بەکاردەهێنرێ، کە وەک دوایی باسی دەکەین، سوننەتە حوشتر بەپێوە سەر ببڕدرێ، نەک یەخ بدرێ.

(وَجَبَتْ جُنُوبُهَا): (وَجَبَ المَيِّتُ: سَقَطَ، وَوَجَبَ الحائِطُ: سَقَطَ)، مردوویەک کە دەمرێ دەگوترێ: (وَجَبَ)، یانی: کەوت، هەروەها دیوارێک کە دەڕووخێ دەگوترێ: (وَجَبَ)، یانی: کەوت، کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَبَتْ جُنُوبُهَا ﴾، کاتێک لا تەنیشتەکانیان کەوتنە سەر زەوی، واتە: دوای ئەوەی سەر دەبڕدرێ، ئەو حوشترە یان ڕەشە وڵاخە، تەنیشتی دەکەوێتە سەر زەوی و، حەتمەن بەلایەکدا دەکەوێ.

(ٱلۡقَانِعَ ): (القنُوعُ: السُّؤالُ: التَّذَلُّلُ)، (قَانِع) و (قَنِوع) واتە: کەسێک کە بە داماویی داوات لێ دەکات.

(وَٱلۡمُعۡتَرَّ): ئەو کەسەی کە بە لەبەر ڕاهاویشتنەوە، بە کنارە داوات لێ دەکات، نەک بە ئاشکراو بە زەقیی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

خـوا ﷻ پشـتیوان بـێ، ئێمـە لـە کۆتایـی ئـەم دەرسـەدا، باسـێکی تایبـەت لـە بـارەی حـەج و عومـرەوە دەکەیـن، لـە نـۆزدە خاڵـدا، لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەوەدا کـە کاتی خـۆی لـە مەوسـووعەی: {خواپەرسـتیی ئیسـلامیی} (بەرگـی چـوار)دا، لـە بـارەی حـەج و عومـرەوە باسـم کـردوە، پوختەیەکـی لـە نـۆزدە (١٩) خاڵـدا، دەخەینـە ڕوو، بۆیـە مانـای گشـتی ئایەتـەکان کـە هەندێکـی وردەکاریـی زۆری هەیـە، لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا بـاس دەکەیـن، بـەڵام هەندێکیـشی هەڵدەگریـن بـۆ ئـەو لێکۆڵینـەوە کـورت و پوختـەی لـە بـارەی حـەج و عومـرەوە، دوای تەفسـیری ئـەم ئایەتانـە، دەیخەینـە ڕوو.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بێبـڕوان و، لـە ڕێـی خـوا و لـە مزگـەوتی حـەڕام لادەدەن، کـێ لا دەدەن؟ خەڵـک لادەدەن، یاخـود خۆیـان لادەدەن، چونکـە (**صَـدَّ عَـنْ سَـبِيلِ اللـه**)، یـانی: (**إمتَنَـعَ**)، واتـە: خـۆی سـەرپێچیی کـردو لایـدا لـە ڕێـی خـوا و، لایـدا لـە مزگـەوتی حـەڕام کـە خـوای تێـدا بپەرسـترێ، هەروەهـا (**صَـدَّ عَـنْ سَـبِيلِ اللـه**)، وەک چـۆن بـە بـەرکار نەخـواز (**لازِمْ**) هاتـوە، واتـە: خـۆی لایـدا، بـە بەرکارخـواز (**مُتَعَدِّي**)یـش هاتـوە، واتـە: خەڵکـی لادا.

ئەوانـەی بێبـڕوان (ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ) ئەمـە بۆتـە ناوێکـی عەلـەم بـۆ نـا مسـوڵمانان، ئەوانـەی کافـرن، وەک چـۆن ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، بۆتـە نـاوی عەلـەم بـۆ مسـوڵمانان، ئەمـەش بۆتـە ناوێکـی عەلـەم، بـۆ کـۆی نامسـوڵمانان،

ئنجا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بێبـڕوان، واتـە: نامسـوڵمانانێک (ئەهـلی کوفـر) کـە عادەتیـان وایـە خەڵـک لەڕێـی خـواو لـە مزگـەوتی حـەڕام لادەدەن، ئـەو مزگـەوتی حەڕامـەی کـە بـۆ خەڵکیـمان یەکسـان کـردوە، چ ئەوانـەی کـە لـە دەورو بـەری نیشـتەجێن و، چ ئەوانـەش کـە لـە دەرەوە ڕادێـن.

ئنجـا خــوا ﷻ فەرموویـەتی: ئەوانــەی وا دەکــەن، بــەڵام دوایــی هەواڵەکــەی نەهێنـاوە و بـە هـۆی ڕەوت (سـیاق)ەکەیەوە دەزانـرێ، واتـە: ئەوانـەی وا دەکـەن، خـوا سـزای سـەختیان دەدات، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ﴾، هـەر کەسێک بیـەوێ ستەمکارانە لادان بـکات، لـە مزگـەوتی حەڕامـدا، لـە سـزای بـە ئـازاری پـێ دەچێژیـن.

ئەوە هەمووی باسی پێگەو پایەی بەرزی مزگەوتی حەڕامە.

ئنجـا دێتە سـەر بـاسی خـودی کەعبـە، ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ﴾، یـاد بکـەوە! کاتێـک شـوێنی ماڵـمان {ماڵـی تایبەتیـی خـوا ﷻ، شـوێنەکەمان} بـۆ ئیبراهیـم دیاریـی کـرد، یـان بۆمـان سـازو ئامـادە کـرد، ﴿أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا﴾ {پێـمان فەرمـوو:} هیـچ شـتێک مەکـە هاوبەشـم ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾، ماڵەکەشـم پـاک بکـەوە، {یـان پاکـی ڕابگـرە} بـۆ سـووڕاوان، {سـووڕاوان بـە دەوری کەعبـەدا} و ڕاوەسـتاوان {بـۆ تاعـەت و بەندایەتیی ئەنجامـدان بـۆ خـوا ﷻ} و ڕکـووع بـەران و، کڕنـووش بـەران.

یـانی: لـە کاتێـک دا شـوێنەکەمان بـۆ دیارییکـرد، کـە چـۆن کەعبـە دروسـت بکات؟ ئـەو شتانەشـمان پـێ فەرمـوون. ئێمـە لـە کاتی تەفسـیری سـوورەتی ئیبراهیمـدا لـە میـانی سەرگوزشـتەو بەسـەرهاتی ئیبراهیمـدا ﷺ بـە تەفسـیڵ باسـمان کرد، چـۆن خوا ﷻ فەرمـانی بـە ئیبراهیـم کـردو، لەگـەڵ ئیسـماعیلی کـوڕی کەعبەیـان دروسـتکرد و، دوایـی هاجـەری خێـزانی و ئیسـماعیلی کۆرپـەی کـوڕی، کـە تاقـە منداڵ و تاقـە کـوڕی بـوو - تاکـو ئـەو کاتـە - لـەوێ نیشـتەجێی کـردن، بـە فەرمـانی خـوا ﷻ.

﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ ﴾، هەروەها بە نێو خەڵکیدا جاڕ بدە، کە بێن بە پێیان (پێڕۆ) و بە سواریی هەر وڵاخێک کە سکی بە پشتیەوە نووساوەتەوە، واتە: هەر وڵاخێک کە لە ئەنجامی هاتن بە ڕێی دووردا، قەڵەویی و ورگنیی نەماوە، یاخود ئەگەر هیچیان دەست نەکەوێ، جگە لە وڵاخێکی لەڕ و لاواز، با سواری بن و پێی بێن، واتە: چ بە پێیان، چ بە سواری هەر جۆرە وڵاخێک، کە ئێستا سەیارە و تەیارەو کەشتیی و شەمەندەفەر، شوێنی ئەوانە دەگرنەوە، یانی: هەر ئامرازێکی سوارییان دەست دەکەوێ، با پێی بێن ﴿ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴾، لە هەر ڕێیەک و لە هەر شیوو دۆڵێکی دوور و، قووڵەوە بابێن.

﴿ لِّيَشۡهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمۡ ﴾، تاکو ئامادەیی کۆمەڵێ سوود و بەرژەوەندیی بن، بۆ خۆیان.

سوود و بەرژەوەندیی دنیایی و دواڕۆژیی، دنیاییەکان وەک: بازرگانیی و، یەکدی ناسین و، پێک ئاشنا بوون و، لە ڕووی سیاسییەوە، ئاگاداری حاڵ و باڵی یەکدی بوون، لە سوودە مەعنەوییەکانیش وەک: ئەنجامدانی دروشمەکانی خوا پەرستیی و، بەرجەستەکردنی تەنیا خوا پەرستیی و خوا بە یەکگرتن، لەمیانی ئەنجامدانی خواپەرستییەکانی دیکەدا، ﴿ وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ﴾، یادی خوا ﷻ بکەن، ناوی خواش بێنن، لە ڕۆژانێکی زانراودا، یانی: ئەو ڕۆژانەی حەجیان تێدا ئەنجام دەدرێ، بەتایبەت کە لە (**يَومُ التَّروِيَة**)، هەشتی (**ذِي الحِجَّة**)ەوە، دەست پێ دەکەن، تاکو ڕۆژەکانی دوایی ﴿ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ ﴾، ناوی خوا بێنن لە ڕۆژانێکی دیاریکراودا، لەسەر ئەو ئاژەڵە چوار پێیانەی پێی داون، ﴿ فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡبَآئِسَ ٱلۡفَقِيرَ ﴾، ئنجا دوای ئەوەی ناوی خوایان لەسەر هێنان و سەریان بڕین، با هەم خۆشیان لە گۆشتەکەیان بخۆن و، هەم دەرخواردی هەر هەژارێکی داماوی بێ دەرەتانیشی بدەن.

دوایی سێ شتی دیکەیان پێ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُواْ بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴾، دوای ئەوەی ڕۆژی هەشتەم (يَومُ التَّروِيَة)، دەچن شەو لە مینا دەمێننەوە، ڕۆژەکەی - کە نۆ (٩)ی (ذا الحِجَّة)یە - دەچن لە عەرەفات ڕادەوەستن، تاکو ئێوارەی شەوەکەی دێنەوە بۆ موزدەلیفە، شەو لەوێ دەمێننەوە و، بەیانییەکەی دێن حەوت بەرد وچکە بە جەمرەی گەورەدا دەدەن و، سەری خۆیان دەتاشن، یان کورتی دەکەنەوە، ئنجا با ئەو چڵک و چەپەرەی خۆیان لابدەن، خۆیان بشۆن و، بەرگی ئیحرام دابنێن، ﴿ وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ ﴾، هەروەها نەزرەکانیشیان جێبەجێ بکەن، قوربانییەکان سەر ببڕن، ﴿ وَلْيَطَّوَّفُواْ بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴾، دواییش بچن بسووڕێنەوە بە دەوری ماڵی دێریندا.

﴿ ذَلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ ﴾، ئەوەی باسکرا بەو شێوەیە، زۆر ڕوونە و، هەر کەسێک حورمەتەکانی خوا ﷻ بە مەزن بگرێ، واتە: ئەو شتانەی خوا ﷻ قەدەغەی کردوون، ئەویش بە مەزنیان بگرێ و توخنیان نەکەوێ، یان ئەو شتانەی خوا ﷻ ڕێزی لێناون، ئەویش ڕێزیان لێ بنێ، ﴿ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ عِندَ رَبِّهِ ﴾، ئەوە باشترە بۆی لە لای پەروەردگاری، ﴿ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ الْأَنْعَامُ إِلَّا مَا يُتْلَى عَلَيْكُمْ ﴾، ئاژەڵەکانیشتان هەموو بۆ حەڵاڵ کراون، {سەریان ببڕن و لێیان بەهرەمەند بن} جگە لەوەی بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوە {لە قورئاندا} ﴿ فَاجْتَنِبُواْ الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُواْ قَوْلَ الزُّورِ ﴾، خۆشتان دوور بگرن لە پیسیی بتەکان (پەیکەرەکان) و، خۆتان دوور بگرن لە قسەی درۆ، گەورەترین قسەی درۆش بریتییە لە هاوبەش بۆ خوا دانان، ﴿ حُنَفَاء لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِ ﴾، خۆتان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، ملکەچیی و بەندایەتیی خۆتان بۆ خوا ساغ بکەنەوە، هاوبەش بۆ خوا دانەر مەبن، هیچ شتێ مەکەنە هاوبەشی، ﴿ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ ﴾، هەر کەسێک هاوبەش بۆ خوا دابنێ، ﴿ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاء فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ ﴾، وەک کەسێک وایە لە ئاسمانێ کەوتبێتە خوار و باڵندە

تیی ڕۆهاتبن (باڵندەی لاشە خۆر پڕیان دابێتێ) ﴿أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴾، یاخود با بیڕفێنێ بۆ شوێنێکی دووری قووڵ (بیباتە چاڵێکی قووڵەوە).

﴿ ذَٰلِكَ ﴾، ئەوەی کە باسکرا بەو شێوەیە، ڕوونە: ﴿وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴾، هەر کەسێک دروشمەکانی خوا ﷻ بە مەزن بگرێ، ئەوە لە پاریزکاریی دڵانەوەیە و تەقوای لە دڵدا هەیە.

﴿ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، ئەو قوربانییانە کە دەیانهێنن سەریان ببڕن، هەتا کاتی دیارییکراو، سوود گەلی زۆریان تێدا هەیە، بۆ ئێوە، دەتوانن ئەگەر شیریان هەبوو، لە شیرەکەیان بەهرە وەربگرن، ئەگەر پشتیان هەبوو، دەتوانن بۆ بارو سوار بەکاریان بێنن، بە تایبەتی حوشتر، هەتا کاتی دیارییکراو، ﴿ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴾، دوایی شوێنی دیارییکراویان بۆ تێدا سەربڕان، لایماڵی دێرینی خوایە، بەڵام مەرج نیە ببرێتە لای کەعبە، یانی: ئەو دەوروبەرەیە، ناوچەی حەڕەم.

﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴾، بۆ هەر کۆمەڵێک شوێنێکمان دیاریی کردوە، کە قوربانییەکانی تێدا سەر ببڕن، ناوی خوا بێنن لەسەر ئەو ئاژەڵە چوار پێیانەی پێمان داون، واتە: حوشترو ڕەشە وڵاخ و مەڕ و بزن، ناوی خوایان لەسەر بێنن و سەریان ببڕن، ﴿ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾، ئنجا پەرستراوی ئێوە یەک پەرستراوە، {کە خوایە ﷻ} ﴿ فَلَهُۥٓ أَسْلِمُوا۟ ﴾، بەس بۆ وی ملکەچ بن، ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُخْبِتِينَ ﴾، مژدەش بدە بە ملکەچان و خۆ بە کەمگران لە بەرانبەر فەرمانی خوادا.

ئایا ئەوانە کێن؟

﴿ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴾، ئەوانەی کاتێک باسی خوا ﷻ دەکرێ، دڵیان ڕادەچڵەکێ، ﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمْ ﴾، هەروەها خۆڕاگران لەسەر ئەوەی کە تووشیان دێ، ﴿ وَٱلْمُقِيمِى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، دیسان بەرپاکەرانی نوێژ، ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴾، ئەوانەش کە لەوەی پێمان داون، دەبەخشن.

لـە کۆتایـی دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ﴾، حوشـترەکان (حوشـترە قەڵـەو و بـەدەو و بـە کەلەشـەکان، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی ڕەشـە وڵاخەکانیـش بێ، بەپێـی هەندێک بۆچـوون) ئەوانەمـان گێڕاون لـە دروشـمەکانی خـوا، بـۆ ئێـوە سـوودو بەرژەوەندیـی زۆری دنیایـی و دوارۆژییـان تێدایـە، ﴿ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ ﴾، ئنجـا کاتێـک بـە ڕیـز وەسـتاون، نـاوی خوایـان لەسـەر بێنـن و سـەریان ببڕن بـە پێـوە، ﴿ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا ﴾، ئنجا کاتێک تەنیشـتیان کەوتنـە زەوی (مـردن و ژیانیـان تێـدا نەمـا دوای سـەربڕان) ﴿ فَكُلُوا۟ مِنْهَا ﴾، ئنجـا لـە گۆشـتەکەیان بخـۆن، ﴿ وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ ﴾، هەروەهـا لـە گۆشـتی ئـەو سـەر بڕاوانـە دەرخـواردی کەسـێک بـدەن، کـە بـە داماویـی داوا دەکات، یاخـود کەسـێک کـە بەشـەرمێکەوە تێیدەگـەی داوا دەکات، بـەشی هەردووکیـانی لـێ بـدەن، واتـە: سـواڵکەرێکی ئاشـکرا و، ئاتاجێـک کـە بـە پەنهانیـی داوا دەکات، ﴿ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، ئـاوا بـەو شـێوەیە بۆمـان ڕام و دەسـتەمۆ کـردوون، تاکـو سوپاسـگوزاریی بـۆ خـوا ئەنجـام بـدەن.

﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا ﴾، هەرگیـز نـە گۆشـتەکەیان، نـە خوێنەکەیـان ناگاتـە خـوا ﷻ، ئـەدی چی دەگاتـە خـوا ﷻ؟ ﴿ وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ﴾، بەڵکو تەقـوا لـە ئێـوەوە دەگاتـە خـوا، واتـە: ئـەوەی خـوا ﷻ جێـی بایەخیـەتی، بریتیـە لـەو تەقوایـەی کـە لـە دڵ و دەروونتانـدا هەیـە و پاڵتـان پێـوە دەنـێ، ئـەو ئاژەڵانـە سـەر ببـڕن، ئەگەرنـا خـوا ﷻ بەهرەمەنـد نابـێ، نـە لـە گۆشـتەکەی نـە لـە خوێنەکـەی، ﴿ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ ﴾، ئـاوا بـەو شـێوەیە (خـوا) بـۆ ئێـوەی دەسـتەمۆ و ڕام کـردوون (ئـەو ئاژەڵانـە) ئەگـەر خـوا ﷻ بـۆی دەسـتەمۆ و ڕام نەکردبانایـە، بـە سـەد پیـاو بـە حوشـترێک ناوێـرن، گایـەک کـە شـێت دەبـێ، خەڵـک لەبـەری ڕا دەکات، ﴿ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ ﴾، تاکـو ئێـوەش خـوا ﷻ بـە هـۆی ئـەوەوە، کـە ڕێنمایـی کـردوون، بـە گـەورەی بگـرن، ﴿ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، مـوژدەش بـدە بـە چاکـەکاران، (کـە لـە دنیـاو دوارۆژدا سـەربەرزیی و پاداشـتی مەزنیـان هەیـە).

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بێبڕوایانی ڕێگرییکار لەڕێی خواو لە مزگەوتی حەڕام، چ خەڵکی نیشتەجێی دەوروبەری مزگەوتی حەڕام و، چ خەڵکی غەوارەو دەرەکیی، کە لە مزگەوتی حەڕامدا یەکسان کراون لەلایەن خواوە، ئەوانە دەیانەوێ ستەمکارانە لادانی تێدا بکەن، خوا ﷻ لە سزای بە ئێش و ژانیان پێ دەچێژێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوان، بێبڕوان بەچی؟ بێبڕوان بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، هەروەک دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، ناوی عەلەمە بۆ نامسوڵمانان، هەروەک ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، بۆتە ناوی عەلەم و ناوی ناسینەوە، بۆ ئەهلی ئیسلام.

٢)- ﴿ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، خۆیان، یان خەڵکی لادەدەن لەڕێی خوا ﷻ، چونکە (**صَدَّ عَن سَبِيلِ الله**)، دەگونجێ بە مانای (**إمتَنَعَ**)، واتە: لاملیی کرد لە ڕێی خوا، کە لێرەدا (**صَدَّ**)، کە کرداری ڕابردووە، لازیمە و پێویستیی بە بەرکار (**مفعول به**) ناکات، (**صَدَّ عَن سَبِيلِ الله**)، یانی: سەرپێچیی کرد لە ڕێی خوا ﷻ، هەروەک دەگونجێ بەکارخواز (**متعدّي**) بێ،

﴿ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، كە لێرەدا ئەو واتایەیان بەهێزترە، واتە: ئەوانەی خەڵک لا دەدەن لە ڕێی خوا ﷻ، (يَمنَعُونَ الناس عَن سَبِيلِ الله)، ڕێی خواش ﷻ، یانی: ئیسلام دینداریی و مسوڵمانەتیی و خوا بە یەکگرتن، کێ لا دەدەن؟ بێگومان خەڵک لا دەدەن، بەڵام وەک زۆرجاران گوتومانە: هەر وشەیەک سیاقەکە بیگەیەنێ و بە عەقڵ و سەلیقە دیار بێ، خوای پەروەردگار نەیخستۆتە نێو فەرمایشتە بەهێز و پێزەکەی خۆیەوە.

ئنجا بۆیە وشەی (يَصُدُّونَ)، (النَّاس)ی بۆ زیاد نەکردوە، تاکو وێڕای مانای دووەم، مانای یەکەمیشیان بگەیەنێ، واتە: وێڕای خەڵك، خۆشیان لا دەدەن و سەرپێچیی دەکەن لە ڕێی خوا ﷻ و، لە مزگەوتی حەڕام دوور دەکەونەوە کە خوای تێدا بە پاک بگرن، بە یەک بگرن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، بۆچی بە کرداری ئێستا (فعل المضارع) هێناویەتی؟ تاکو ئامادەی بکات لەبەر چاو و، ئەوەش بگەیەنێ کە ئەوە عادەت و پیشەیانە و بەردەوام ئەوە لە ژیانیاندا تازە دەبێتەوە.

٣)- ﴿ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ﴾، خەڵک لادەدەن لە مزگەوتی حەڕام، هەڵبەتە مزگەوتی حەڕامیش هەر لە نێو ڕێبازی خوا (سَبِيلِ الله) دایە، بەڵام بۆ زیاتر گرنگیی پێدان و، بۆ ئەوەی لەوێوەش لە باسی مزگەوتی حەڕامەوە، بگوازێتەوە بۆ چۆنیەتی دروستکردنی کەعبە، لە لایەن ئیبراهیم ﵇ەوە، بە فەرمانی خوا.

ئنجا پێناسەی مزگەوتی حەڕام دەکات و دەفەرموێ:

٤)- ﴿ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ ﴾، کە ئێمە بۆ خەڵکیمان گێڕاوە، ئنجا ئەمە نیهاد (مُبْتَدأ)ە، ئەدی گوزارە (خَبَر)ەکەی چییە؟ یان: ئەوانەی بێبڕوان و خەڵک لادەدەن لەڕێی خواو لە مزگەوتی حەڕام، هەمووی نیهاد (مُبْتَدأ)ە و گوزارە (خَبَر)ەکەی، یان ئەوەیە کە دوایی دەفەرموێ: ﴿ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، لە ئازاری بەئێشی پێ دەچێژین، یان هەواڵ (خبر) ێکی تایبەتیی خۆی هەیە، کە قرتێندراوە لەبەر ئەوەی عەقڵ و سەلیقە دەیزانێ، واتە: ئەوانەی وا دەکەن، شایستەی سزای بێ ڕەزای خوای کاربەجێن، ئنجا پێناسەی مزگەوتی

حەڕام دەکات و دەفەرمویّ: ﴿ ٱلَّذِى جَعَلۡنَٰهُ لِلنَّاسِ ﴾، کە ئێمە بۆ خەڵکیمان گێڕاوە، چۆنی بۆ گێڕاون؟

٥)- ﴿ سَوَآءً ٱلۡعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلۡبَادِ ﴾، چ ئەوەی نیشتەجێیە لەوێ، لەو دەوروبەرە لە سنووری حەڕەمدا و، چ ئەوەی دەرەکییە، غەوارەیە و لە دەرەوە دێ، هەموویانی تێدا یەکسان کردوون، واتە: وەک یەک بەشیان پێوەی هەیە، کە بێن لەوێدا خوا ﷻ پەرستییەکان ئەنجام بدەن.

وشەی (سَوَاء) بە ﴿ سَوَآءً ﴾ و بە (سَوَاءٌ)، واتە: بە سەر (**نصب**) و بە بۆر (**رفع**)یش خوێنراوەتەوە، (**باد**)یش، هەم بە ژێر (**كَسْر**) خوێندراوەتەوە و، هەم بە (**ي**)ش، بە تایبەت ئەگەر لە سەری بوەستین (**الباد**)، (**البادي**)یش واتە: ئەو کەسەی کە لە (**بادي**)یە، لە بیابان و سارا، یاخود لە دەرەوەی شار نیشتەجێن، کە مەرج نیە، تەنیا مەبەست پێی بیابان و دەشت و سارا بێ، یانی: هەر کەسێ لە دەرەوەی ناوچەی حەڕەم نیشتەجێیە و لە شوێنەکانی دیکەوە دێن، هەرچەندە زۆربەی زانایان بۆ وشەی (**بادي**) گوتوویانە: ئەو کەسەی بیابانشین (**أَی ساكِنُ البَادِیَة**)ە، بەڵام پێم وایە (**بادي**) یانی: دەرەکیی، ئنجا با لە بیابانیش نەبێ، بۆ وێنە: خەڵک لێرەوە دەچێ و لە هەموو چوار تەرەفی دنیاوە خەڵک دەچێ بۆ وێ، ئنجا ئەوانەی لەوێن نیشتەجێن، پێیان دەگوترێ: (**عَاكِف**)، بەڵام ئەوانەی لە دەرەوە دەچن، مەرج نیە تەنیا هی بیابان و دەشت بن، بەڵکو هەر کەس لە دەرەوە دێ، واتە: دەرەکیی و غەوارە، هەموویان وشەی (**بادي**) دەیانگرێتەوە، ئنجا هەموویان لەوێدا یەکسانن، خەڵکی ئەوێ و هی دەرەکیی و غەوارە.

٦)- ﴿ وَمَن يُرِدۡ فِيهِ بِإِلۡحَادِۭ بِظُلۡمٖ ﴾، هەر کەسێک بیەوێ لادان بکات بە ستەم لەوێدا، لە مزگەوتی حەڕام دا.

٧)- ﴿ نُّذِقۡهُ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾، ئەوەی پێشێ هەمووی نیهاد (**مُبْتَدأ**) بوو، گوزارە (**خَبَر**)ەکەی ئەوەیە لە سزای بە ئێشی پێ دەچێژین.

وشەی (إلحاد)یش پێشتر باسمانکرد، یانی: لادان، لادان لە ڕاستە شەقام، لادان لە هەڵوێستی ڕاست، ئەو (ب)یەی کە خراوەتە سەر: ﴿بِإِلْحَادٍ﴾، زیاد کراوە، لە ئەسڵدا ئاوایە (وَمَن يُرِد فِيهِ إلحاداً)، هەر کەسێک لەوێدا بیەوێ لادان بکات، بەڵام بۆچی (ب)ی خراوەتە سەر؟ چونکە ماناکەی تۆختر دەکاتەوە.

هەروەها وشەی ﴿بِظُلْمٍ﴾، ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ﴾، یانی: **(وَمَن يُرِد فِيهِ إلحَاداً ظُلْمَاً)**، هەر کەس بیەوێ لادانی تێدا بکات لە حاڵێکدا کە ستەم دەکات، ئەمیش دیسان (ب)ی تێکەڵیی **(ملابسة)**یە، یانی: لە کاتێکدا و لە حاڵێکدا کە خۆی ئاوێتە کردوە لەگەڵ ستەمدا، بۆیە دەیەوێ لادان بکات، ئنجا کەسی وا سزای بە ئازاری پێ دەچێژین، چونکە لە ڕاستیی دا کەسێک بیەوێ لادان و تاوان و خراپە بکات، لە چوارچێوەی مزگەوتی حەڕام و دەوروبەری مزگەوتی حەڕامدا، لە حەڕەمدا، ستەم دەکات و، ستەمکارانە ئەوە دەکات.

زانایان گوتوویانە: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍ بِظُلْمٍ﴾، هەر کەسێک بیەوێ لەوێدا ستەمکارانە، لادان بکات، ئێمە سزای پێ دەچێژین، هەر کەسێ بیەوێ و، هەر نیەتی هەبێ، ئەوە سزایەتی، چ جای بە کردەوە بیکات! لە زۆربەی تەفسیرەکاندا لێرەدا مەسەلەیەکی فیقهیی وروژێنراوە: ئایا دروستە خانووەکانی مەککە لە سنووری حەڕەم دا، خەڵک و خاوەنەکانیان بیانفرۆشن و بە کرێیان بدەن و، خەڵکی دیکە بیانکڕێ یان بە کرێیان بگرێ؟

هەندێک گوتوویانە: نەخێر دروست نیە، کاتی خۆی ئەو مەسەلە فیقهییە بووە، بەڵام ئێستا پێم وانیە کەس ئەوە باس بکات، چونکە ئێستا خەڵکی مەککە بە تەئکید خانووەکان هی خۆیانن و، بۆیان هەیە بیانفرۆشن و بە کرێیان بدەن، کاتی خۆی خەڵک کەم بووە و خەڵکی مەککەش ڕەنگە پێیان عەیب بووبێ، بە کرێیان بدەن و بیانفرۆشن، وەک چۆن ئێستاش لە هەندێک شارۆچکەی هەرێمی کوردستاندا ئوتێلی لێ نیە، خەڵکەکە پێیان عەیبە و دەڵێن:

چۆن دەبێ ئێمە ماڵمان هەبێ و میوان بچێ بۆ ئوتێل؟ ئەوانەش ماڵەکانی خۆیانیان چۆڵکردوون بۆ ئەو حاجییانەی هاتوون و دەرفەتیان داوە لێیان بەهرەمەند بن، بەڵام بە تەئکید ئێستا ئەو چەند ملیۆن خەڵکەی دەچێ بۆ سنووری ناوچەی حەڕەم و مەککە، ناگونجێ ئەو خەڵکە لەو ماڵانەدا بحەوێنەوە و لە هوتێلەکانیشدا بە زەحمەت دەحەوێنەوە و، خەڵکێکی زۆریش لە دەرەوەی هوتێلەکان و، لە دەشت و دەر و لە نێو مزگەوت و لە کووچەو کۆڵانەکان دەبن، چونکە پارەیان نیە، کرێی ئوتێلی بدەن، بەڵام ئەو مەسەلەیەی کاتی خۆی لە هەندێ تەفسیرەکاندا باسکراو، وەک (**محمد الطاهر بن عاشور**) دەڵێ: لە ڕاستییدا ئەمە هیچ پەیوەست نیە، بەم ئایەتە موبارەکەوەو، ئەم ئایەتە کەم و زۆر ئەوە ناگەیەنێ، ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە خەڵکی ئەوێ کاتی خۆی موشریک و بتپەرست بوون و، ئەهلی ئیسلام و ئەهلی تەوحیدیان مەنع کردوە، لەوەی بێن خوا پەرستیی بکەن و، خوا پەرستییەکانی حەج و عومرە، لەوێ ئەنجام بدەن، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: خەڵکی نیشتەجێی ئەوێ و، خەڵکی غەوارەو دەرەکیی تێیدا یەکسانن، یانی: خەڵکی ئەوێ بۆیان نیە، خەڵکەکەی دیکە بە بیانووی ئەوە کە ئەهلی تەوحیدن و بت ناپەرستن، ڕێگرییان لێ بکەن، لەوەی خواپەرستییەکانی حەج و عومرە، لە دەوری کەعبەو مزگەوتی حەرام، ئەنجام بدەن.

**مەسەلەی دووەم:**

**دیارییکرانی شوێنی کەعبە لەلایەن خواوە ﷻ بۆ ئیبراهیم ؑ و، فەرمان پێکرانی ئیبراهیم بە پاک ڕاگرتنی کەعبە، بۆ تەوافکاران و نوێژکاران و، ڕکووعبەران و کڕنووش بەران و، فەرمان پێکرانی بە جاڕدان بە نێو خەڵکدا بۆ هاتنیان بۆ حەج و عومرە، کە بە هەر شێوەیەک بووە، بە پێرۆ و یاخود بە سواریی و، بە هەر ئامرازێک خۆیان بگەیەننە ئەو شوێنەی خوا پەرستییەکانی حەج و عومرەیان تێدا ئەنجام دەدرێن، تاکو بەهرەمەند بن و، ناوی خواش لەسەر ئاژەڵەکانیان بێنن و، سەریان ببڕن و، بەشی بابای هەژاری داماو و بێ دەرەتانیشی لێ بدەن لە گۆشتەکەیان و، دوایش چڵک و چەپەری خۆیان لابەرن و، قوربانییەکانیان سەر ببڕن و، تەوافی ئەو ماڵە دێرینەی خوای پەروەردگار بکەن (حەوت جاران بە دەوریی دا بسووڕێنەوە):**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِى شَيْـًٔا وَطَهِّرْ بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۖ فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا۟ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە (١٤) بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ﴾، یاد بکەوە! کاتێک ئێمە شوێنی ماڵمان (شوێنی ئەو ماڵە دێرینە کە کەعبەیە)، بۆ ئیبراهیم دیارییکرد، ئامادە کرد.

﴿بَوَّأْنَا﴾، بە مانای (هَيَّأْنَا)، ئامادەمان کرد، (سَوَّيْنَا) ڕێکمانخست و سازمان کرد بۆ نیشتەجێ کردن، وشەی ﴿ٱلْبَيْتِ﴾، (ال)ەکە بۆ ناساندنە و

مەبەست پێی عەهدە، واتە: ماڵەکە، ئەو ماڵە تایبەت و دیارییکراوەی خوا ﷻ کە دەزاندرێ کامەیە، ئەو ماڵی خوایەی، یەکەم ماڵ و یەکەم پەرستگا بووە، لەسەر زەوی بنیات نراوە، بە دەستی ئیبراهیم ﷺ کە پێشتر بە تەفسیل لە تەفسیری سوورەتی ئیبراهیمدا باسمانکرد، خوا ﷻ لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾، یەکەمین ماڵێک، پەرستگایەک، بۆ خەڵک لەسەر زەویی دانراوە، ئەوەیە کە لە مەککەییە، بەککەو مەککە هەر یەکن.

**٢)-** ﴿ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا ﴾، کە هیچ شتێك مەکە هاوبەشم، یانی: (**قائِلِينَ لَهُ**)، پێشمان فەرموو، یان: فەرمانمان پێ کرد: (**آمِرِينَ بِهِ أَنْ لَا تُشْرِكْ بِي شَيْئاً**)، بەڵام ئەم (**قائِلِينَ**)یان (**ءَامِرِينَ**)ی نەهێناوە، چونکە بە سیاق و سەلیقە دیارە، پێشمان ڕاگەیاند، فەرمانمان پێکرد: هیچ شتێک مەکە هاوبەشی من، خوا ﷻ کە ئاوا بە ئیبراهیم ﷺ دەفەرموێ، مەبەست سەرزەنشتکردنی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانە، ئەگەرنا ئیبراهیم ﷺ خاوەنی خوا بە یەکگرتنێکی ڕەها بووە.

**٣)-** ﴿ وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ ﴾، ماڵەکەشم پاک بکەوە، پاکی ڕابگرە، بۆ تەوافکەران و ڕاوەستاوان و ڕکووعبەران و کڕنووشبەران، واتە: فەرمانمان پێکرد، کە ئەو ماڵە دروست بکات و، دواییش کە دروستی کرد، پاکی ڕابگرێ، لەوە کە شتی پیس و پۆخەڵی تێدا بێ، یان ڕواڵەت و دیاردەکانی شیرکی تێدا بن، وەک پەیکەر و وێنەکانی بت و صەنەمەکان، کە لێرەدا ﴿ وَطَهِّرْ بَيْتِيَ ﴾، ماڵەکەی من پاک بکەوە، پاکی ڕابگرە، هەم پاک ڕاگرتنی ماددیی دەگرێتەوە، هەم پاک ڕاگرتنی مەعنەوییش، پاکڕاگرتنی ماددیی ئەوەیە کە شتی پیس و پۆخەڵ و شتی بۆن ناخۆش و ئەوانەی لێ نەبێ و، پاکڕاگرتنی مەعنەوییش یانی: بتەکان و پەیکەر و وێنەی بتانی لێ نەبن، هەروەها وشەی شیرکی تێدا نەگوترێ، ئنجا بۆ کێ؟

**١-** بۆ تەوافکەران (**الطائفين**) کە دوایی باسی تەواف دەکەین، سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا، کە حەوت جارە، چۆن دەبێ؟

**٢-** ڕاوەستاوان ﴿وَٱلۡقَآئِمِينَ﴾، یانی: ئەوانەی کە ڕوو بە کەعبە ڕادەوەستن و، دەپاڕێنەوە، یاخود ئەوانەی کە ڕوو بە کەعبە نوێژ دەکەن، بە پێوە، چونکە پایەی گەورەو گرنگی نوێژ بریتیە: لە ڕاوەستان (**قیام**)، کە سووڕەتی (**فاتیحة**) و، قورئانی دیکەی تێدا دەخوێنرێ.

**٣و٤-** چەماوان و کڕنووشبەران ﴿وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ﴾، ﴿وَٱلرُّكَّعِ﴾، کۆی (**رَاكِع**)ە، یانی: چەماوەی ﴿ٱلسُّجُودِ﴾یش، کۆی (**ساجد**)ە، واتە: کڕنووشبەر، (**سجود**) کۆی (**ساجد**)ە، وەك (**ركوع**) و (**قعود**)، کۆی (**راكع**) و (**قاعد**)ن.

یانی: ئەو ماڵە، هەم بۆ ئەوانەی تەواف بە دەوردا دەکەن، هەم بۆ ئەوانەی نوێژی تێدا دەکەن، هەم بۆ ئەوانەی ڕکووعی تێدا بۆ خوا دەبەن و سەجدەی تێدا دەبەن، کە بە تەئکید ڕاوەستان و ڕکووع بردن و سەجدە بردن، بە هەموویان نوێژ پێک دێنن، بەڵام بۆیە خوا ﷻ بە تایبەت باسیان دەکات، تاکو بزانین ئەو سێیەیان: ڕاوەستان لە نوێژدا و، ڕکووع بردن و، سەجدە بردن، سێ پێکهێنەری گرنگ و زۆر سەرەکیی نوێژن و، ئەو پەڕی بەندایەتیی مرۆڤ بۆ خوا ﷻ لەو سێ حاڵەتەدا، بەرجەستە دەبێ:

**أ-** لە بەرانبەر ماڵی خوادا، بە ملکەچیی ڕاوەستان: ﴿...وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾﴾البقرة.

**ب-** ڕکووع بردن و چەمانەوە.

**ج-** کڕنووش بردن، کە ئەو پەڕی ملکەچیی و زەبوونیی مرۆڤە لە بەرانبەر پەروەردگار و خاوەنی خۆی دا، کە دیارە کاتێک مرۆڤ ئەو پەڕی ملکەچیی بۆ خوا پێشان دەدات، ئەو پەڕی سەربەرزیشی دەبێ، لە بەرانبەر غەیری خوادا، وەک: (**محمَّد إقبال**) دەڵێ: (**وَسَجدَةٌ لِلَّهِ الأَحَدِ تُنجِيكَ مِن أَلفِ سَجدَةٍ لِلعَبِيدِ**)، یانی: کڕنووش بردنێک بۆ خوای یەکانەی تاک، دەربازت دەکات لە هەزاران کڕنووش بردن بۆ بەندەکان، بۆ مرۆڤەکان.

**٤)-** ﴿وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ﴾، هەروەها پێمان فەرموو، فەرمانمان پێ کرد: بە نێو خەڵکدا جاڕ بدە بۆ حەج، (**التَّأذِينُ: رَفْعُ الصَّوْتِ بِالإِعْلَامِ بِشَيءٍ**)، (**تَأذِين**) بریتیە لە دەنگ بەرزکردنەوە بە جاڕدان بە شتێک، بە نێو خەڵک دا جاڕ بدە، بێن بۆ حەج، بەڵام چۆن بێن؟

٥)- ﴿ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ ﴾، بەپێرۆ بێن و، بە سواری هەر وڵاخێکی لەڕ و لاواز، یاخود: هەر وڵاخێک کە لەبەر زۆر ڕۆیشتن، سکی بە پشتیەوە نووساوەتەوە، واتە: کەم گۆشت و بێ ورگ، ئنجا لە کوێوە بێن؟

٦)- ﴿ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴾، لە هەر ڕێیەکی دوور و قووڵەوە بێن، (**فَجّ**): (**الشَّقُّ بَيْنَ جَبَلَيْنِ**)، دابڕاوایی نێوان دوو چیایانە، شیو و دۆڵ (**عَمِيق**)یش، واتە: قووڵ، مەبەست پێی ڕێی دوورە، یاخود: لە شوێنی پڕ چیا و چۆڵەوە، کە دۆڵ و شیوی قووڵ دەکەونە نێوان چیا بەرزەکانەوە، با بێن، کە ئەو شوێنەی مەککەی لێیە، بیابانە، واتە: لە شوێنە دوورەکانەوە کە خاوەن ڕێی دوورن، با بێن.

سێ وشە هەن:

أ- (**أَذِنَ**) واتە: (**سَمِعَ**)، گوێی لێ بوو.

ب- (**آذَنَ: أَي أَعلَمَ، وَأَخبَرَ**)، هەواڵی پێدا و ئاگاداری کردەوە.

ج- (**وَأَذَّنَ: أَي: أَعلَمَ، وَأَعْلَنَ**)، ئاگاداری کردەوە و جاڕی دا و ئاشکرای کرد.

کە دەفەرموێ: ﴿ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴾، بۆچی نەیفەرموە: (**يَأْتُونَ**)؟ خەڵکەکە بابێن لە هەر شیو و دۆڵێکی قووڵەوە، یان لە هەر ڕێیەکی دوورەوە؟ چونکە ﴿ يَأْتِينَ ﴾، سیفەتە بۆ ﴿ كُلِّ ضَامِرٍ ﴾، (**ضَامِر**)یش، وڵاخێکە کە پشتی بە سکییەوە نووسا بێتەوە و، یاخود کەم گۆشت، ئنجا ﴿ كُلِّ ضَامِرٍ ﴾، هەر وڵاخێک، ئەوە دەبێتە کۆ و وشەی: ﴿ يَأْتِينَ ﴾ی بۆ بەکارهێنراوە، یاخود ﴿ يَأْتِينَ ﴾، سیفەت نیە بۆ ﴿ كُلِّ ضَامِرٍ ﴾، بەڵکو حاڵە (حاڵێکی دووەمینە) بۆ ڕاناوی کۆ، کە دەفەرموێ: ﴿ يَأْتُوكَ ﴾، ﴿ يَأْتُوكَ ﴾، خەڵکەکە با بێن، ﴿ رِجَالًا ﴾، بە پێرۆ، کە (**رِجَال**)، کۆی (**رَاجِل**)ە، واتە: پێرۆ، پیادە، ﴿ وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ ﴾، هەروەها بە سوارییی، ئنجا ئەمە حاڵی دووەمە لە ﴿ يَأْتُوكَ ﴾، بەڵام بۆیە نیشانەی مێینەی لەسەرە ﴿ يَأْتِينَ ﴾، چونکە خەڵکەکە کۆمەڵ کۆمەڵ دێن، کۆمەڵ (**جماعة**)ش مێینەی مەجازییە، وەک گوتراوە: (**كُلُّ جَمْعٍ مُؤَنَّثٌ**)، یانی: (**يَأْتُوكَ جَمَاعَاتٍ**)، کۆمەڵ کۆمەڵ با بێن، ئنجا بۆچی بێن؟

٧)- ﴿ لِّيَشۡهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمۡ ﴾، تاكو ئامادەی سوودگەلێك بن بۆ خۆیان.

٨)- ﴿ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ ﴾، لە ڕۆژانێكی زانراودا، كە ڕۆژانی تێدا ئەنجامدرانی خوا پەرستییەكانی حەجن، ﴿ لِّيَشۡهَدُواْ ﴾، (**أَي: لِيَحضَرُوا**)، ئامادە بن لەوێدا، یان (**لِيَروا**) تاكو ببینن، وشەی ﴿ مَنَٰفِعَ ﴾، بە نەزانراو (**نكرة**) هاتوە، بۆ بە مەزنگرتن، واتە: سوود گەلێكی زۆر گەورە، هەم سوود گەلی مەعنەویی، هەم ماددیی، هەم هی تاكیی، هەم هی بە كۆمەڵ، ئنجا ئایا ﴿ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ ﴾، ڕۆژانێكی زانراو، مەبەست پێیان چییە و چ ڕۆژانێكن؟

## لەو بارەوە چەند دەقێك دێنین:

**یەكەم:** {**عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا قَالَ: الأَيَّامُ المَعلُومات: أَيَّامُ العَشْرِ، وَعَلَّقَهُ البُخارِيُّ عَنهُ بِصِيغَةِ الجَزْمِ بَهِ، وَرُوِيَ مِثلُهُ عَن أَبِي موسى الأَشعَرِيّ وَمُجاهِد وَقَتادَة وَعَطَاء وَابْنُ جُبَير وَالحَسَن وَالضَّحَّاك وَعَطَاءِ الخُراساني وَ إِبراهِيم النَّخَعِي**}[1].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، گوتوویەتی: (**الأَيَّامُ المَعلُومات: الأَيَّامُ العَشرِ**)، ڕۆژە زانراوەكان، ڕۆژی دە شەوەكانن، واتە: كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡفَجۡرِ ١ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ٢ ﴾الفجر، ڕۆژی دە شەوەكان كە ڕۆژانی سەرەتای مانگی (**ذِا الحِجَّة**)ن، لە یەكەوە تاكو دە (١٠)، گوتوویەتی: مەبەست پێی ئەو دە ڕۆژانەن، كە زۆربەی خوا پەرستییەكانی حەج لەو دە ڕۆژانەدان، كە لە هەشتەمەوە دەست پێ دەكەن، لە (**يَومُ التَّروِيَة**)ەوە، تاكو ڕاوەستان لە عەرەفات و، دوایی ڕۆژی دەیەمیش، زۆر لە خواپەرستییەكان لەو ڕۆژەدا ئەنجام دەدرێن:

١- هەم وردە بەرد هاویشتنی جەمرەی گەورە.

٢- هەم سەری خۆ تاشین یان كورت كردنەوە.

٣- پاشان قوربانیی سەربڕین.

---

(١) المِصباحُ المُنِير فِي تَهذيب تفسير ابن كَثير، ص٨٩٢.

٤- دوایی تەوافی (إفاضَة) یان تەوافیی پایە.
٥- ئیحرام شکاندنی گچکە.

ئەوانە هەموویان لەو ڕۆژەدا ئەنجام دەدرێن.

**دووەم:** {**عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا مِنْ أَيَّامٍ أَعْظَم عِنْدَ الله وَلا أَحَبَّ إِلَيْهِ فِيهِنَّ الْعَمَلُ مِنْ هَذِهِ الأَيَّامِ: عَشْر ذِي الحجة «أَوْ قَالَ: الْعَشْرُ» فَأَكْثِرُوا فِيهِنَّ من التَّهْلِيلَ والتسبيح ، وَالتَّكْبِيرَ وَالتَّحْمِيدَ**}[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ ڕۆژانێک نین کردەوە لە لای خوا تێیاندا مەزنتر بێ و بۆ لای خوا خۆشەویستتر بێ، لەو ڕۆژانە [دە ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی (**ذي الحجة**)]، ئەو ڕۆژانەی کە بە دوای ئەو دە شەوانەدا دێن، بۆیە زۆریان تەهلیل و تەکبیرو تەحمید تێدا بکەن، واتە: زۆر (**لَا إِلـه إِلاَّ الله، أَللهُ أَكْبَر، الحَمدُ لله**)، لەو ڕۆژانەدا بکەن.

هەروەها بوخاریی گێڕاویەتەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو ئەبوو هوڕەیڕە (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەچوونە بازاڕ لەو دە (١٠) ڕۆژانەدا و، (**أَللهُ أَكْبَر**)یان دەکردو، خەڵکیش لەگەڵ ئەواندا (**أَللهُ أَكْبَر**)ی دەکرد.

ئەویش بە چەند شێوەیەک هاتوە، یەکێک لە صیغەکانی ئەو (**أَللهُ أَكْبَر**) گوتنانە کە لە ڕۆژی دەیەمی زیلحیججەو سێ ڕۆژەکەی دوایی دا کە پێیان دەگوترێ: (**أَيَّامُ التَّشرِيق**) دەکرێ، ئەمەیە: (**أَللهُ أَكْبَرُ، أَللهُ أَكْبَرُ، أَللهُ أَكْبَرُ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ وَلِلهِ الْحَمْدُ**).

---

(١) حديث ابن عمر: أخرجه أحمد: ٥٤٤٦، والبيهقي في شعب الإيمان: ٣٧٥١، وحديث ابن عباس: أخرجه الطبراني في الكبير: ١١١١٦، قال الهيثمي: رجاله رجال الصحيح .. وَقَالَ الْبُخَارِيُّ: (كَانَ ابنُ عُمَرَ، وَأَبُو هُرَيرَة يَخرُجَانِ إِلى السُّوقِ فِي أَيَّامِ العَشْرِ فَيُكَبِّرَانِ وَيُكَبِّرُ النَّاسُ بتَكبِيرِهِما) المِصباحُ المُنير فِي تَهذيب تفسير ابن كَثير، ص٨٩٢.

**سێیەم:** {**عَن أَبِي قَتادَةَ ﷺ، قالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ عَرَفَةَ؟ فَقَالَ: أَحتَسِبُ عَلَى اللهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ المَاضِيَة وَالأَتِيَة**} (**أخرجه مسلم: ٨١٩**).

واتـە: ئەبـوو قەتـادە ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ پرسـیاری لێکـرا لـە بـارەی بـە ڕۆژوو بـوون لـە ڕۆژی عەرەفـەدا، واتـە: ڕۆژی نۆیەمـی (**ذِي الحِجَّـة**)، {بـۆ غەیـری ئەوانـەی کـە لـە حەجـن، ئەگەرنـا بـۆ بابـای حاجـی، سـوننەت نیـە، بـە ڕۆژوو بـێ، چونکـە دەبێ لـەو ڕۆژەدا زۆر بپاڕێتـەوەو بلاڵێتـەوەو بکڕووزێتـەوە، بۆیـە تاقـەتی هەبـێ و بـەڕۆژوو نەبـێ باشـە، بـەڵام بـۆ غەیـری حەجکـەران، لێپرسراوە لـە خێـرو پاداشـتی بـە ڕۆژوو بـوون لـەو ڕۆژەدا} فەرموویـەتی: لـە لای خـوا ﷻ وا حیسـاب دەکـەم، کـە گوناهـی سـاڵی ڕابـردوو و سـاڵی داهاتـوو بسـڕێتەوە {لـەو کەسـەی کـە تێیـدا بـە ڕۆژوو دەبـێ}.

٩)- ﴿وَيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۖ﴾، ئەو خەڵکە جاڕیان بۆ بدە، بێن بۆ سەردان و حەجی ماڵی خوا، سوود گەلێکی زۆر ببینن و، وێڕای ئەوەش ناوی خوا لەسەر ئەو ئاژەڵانە (ئەو وڵساتە) بێنن، کە پێمان داون، واتە: لە کاتی سەر بڕینیاندا ناوی خوایان لەسەر بێنن.

وشـەی ﴿بَهِيمَةِ﴾، بـە کوردیـی یـانی: بـە بەسـتەزمان، یـان وڵسـات و چـوار پـێ، ﴿ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾یـش، بـەو چـوارە دەگوتـرێ: حوشـتر و ڕەشـە وڵاخ و مـەڕ و بـزن، بـەڵام وشـەی ﴿بَهِيمَةِ﴾، واتاکـەی فراوانـترە لـەو چوارانـەش، بۆیـە وشـەی ﴿بَهِيمَةِ﴾، (**الأنعـام**)ی پاڵدراوەتـەلا: ﴿بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾، تاکـو بزانـرێ کـە مەبەسـت پێـی ئـەو چوارەیـە، بـە شـێوەکی سـەرەکیی.

١٠)- ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا﴾، دوای ئەوەی ناوی خواتان لەسەر هێنان و سەرتان بڕین، لێیان بخۆن، واتە: لە گۆشتەکەیان بخۆن، لەو بارەشەوە ئەمە گێڕدراوەتەوە: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ نَحَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الْحَجِّ مِائَةَ بَدَنَةٍ، نَحَرَ بِيَدِهِ مِنْهَا سِتِّينَ، وَأَمَرَ بِبَقِيَّتِهَا فَنُحِرَتْ، وَأَخَذَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بَضْعَةً فَجُمِعَتْ فِي قِدْرٍ، فَأَكَلَ مِنْهَا وَحَسَا مِنْ مَرَقِهَا، وَنَحَرَ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ**} **أخرجه أحمد: ٢٨٨٢، تعليق شعيب الأرنؤوط : إسناده ضعيف.**

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سەد (١٠٠) حوشتری سەر بڕین، شەست دانە خۆی و چلیش بەفەرمانی وی و، فەرمانی کرد لە هەر حوشترێک کە سەری بڕیوە، پارچە گۆشتێکی لێ بکەنەوە و بکوڵێنرێ، ئنجا لە گۆشتەکەی خوارد و، دوایی لە گۆشتاوەکەشی خواردەوەو سەری بڕی لە ڕۆژی حودەیبییەدا.

هەر لەوبارەوە ئەم شوێنەوارەش هاتووە: {عَنْ مُجاهِد: ﴿ فَكُلُواْ مِنْهَا ﴾، قَالَ: هِيَ كَقَولِهِ، ﴿ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْ ...﴿٢﴾ ﴾المائدة، ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ...﴿١٠﴾ ﴾الجمعة}[1] کە ئەمە ڕای بژاردەی (**إبن جرير الطّبري**)یە.

واتە: موجاهید گوتوویەتی: ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُواْ مِنْهَا ﴾، لێی بخۆن، {لە گۆشتی ئەو ئاژەڵانە کە بۆ خوا ﷻ سەرتان بڕیون، لە قوربانییەکان بخۆن} دەڵێ: وەک فەرمایشتی خوایە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْ ...﴿٢﴾ ﴾المائدة، واتە: هەر کاتێ ئیحرامتان شکاند، ڕاو و شکار بکەن، هەروەها وەک فەرمانی خوایە کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ...﴿١٠﴾ ﴾الجمعة، واتە: هەر کاتێک نوێژ تەواو بوو (نوێژی جومعە)، بە زەوی دا بڕۆن و لە بژیوی خوا داوا بکەن، کارو کاسبیی بکەن، کە بە تەئکید نە ڕاو و شکار واجبە لە دوای ئیحرام شکاندن و، نە بازرگانیی کردن و کار و کاسبیی کردن واجبە، لە دوای نوێژی جومعە، کەواتە: ئەو دوو فەرمانە پێیان دەگوترێ، لێرەدا فەرمان بۆ ڕەواییە، چونکە پێشێ لێیان قەدەغەیە، هەتا ئیحرامیان بەستوە، لێیان قەدەغەیە ڕاو و شکار بکەن و، هەتا لە کاتی نوێژی جومعە دان، لێیان قەدەغەیە بازرگانیی و مامەڵە بکەن.

بۆیە زانایان دەڵێن: هەر فەرمانێک لە دوای قەدەغە، زیاتر مانای ڕەوا (**مباح**) بوون دەگەیەنێ، کەواتە: لەوێش کە دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُواْ مِنْهَا ﴾، لێ خواردنیان فەرز نیە و مەبەست پێی ڕەوا (مباح) بوونی لێخواردنیانە.

---

(١) (إبن كثير) گوتوویەتی: وَهَذَا اختيارُ ابنُ جَرِير فِي تَفسِيرِه: ج ١٨، ص ٦١١، المِصباحُ المُنِير: ص ٨٩٢.

**١١)- ﴿ وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴾**، هەروەها لە گۆشتەکەیان دەرخواردی هەژاری داماو بدەن، بەڵام پێدانی گۆشتەکەیان بە هەژار و داماویش پێویست نیە، بەڵکو هەردووکیان هەم لێ خواردنەکە و، هەم خێر و چاکە کردنەکە، ڕەوان و، دەبێ بەڵگەی دیکە هەبێ لەسەر ئەوە کە هەرکامیان ئایا واجبە، یان هەر لەسەر حاڵەتی ڕەوایی خۆی دەمێنێتەوە، یاخود سنوورێکی میانجیی هەیە، کە سوننەتەو شتێکی پەسندە، ئەگەر لێی بخورێ و گۆشتەکەی بەشی خەڵکی لێ بدرێ؟ هەڵبەتە لەو بارەوە وردەکاریی زیاتر هەیە، کە دوایی باسی دەکەین، زانایانیش لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە.

بەڵام وا پێدەچێ کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴾، هەم لێی بخۆن و، هەم بەشی هەژاری داماو و بێ دەرەتانی لێ بدەن، وا پێدەچێ کە ئەمە بەلای کەمەوە سوننەت و پەسند بێ، وێرای ئەوەی ڕەواشە، بەڵام بۆیە بەو تەعبیرە هاتوە، چونکە کافرەکان عادەتیان وابووە، لێیان نەخواردوە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: لێی بخۆن، ئەوان پێیان وابووە کە نابێ لێی بخورێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: لێشی بخۆن و بەشی هەژارانیشی لێ بدەن، ئنجا ئەم دەربڕینە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو بیرو بۆچوونە هەڵەیەی ئەوانە.

(**البَائِسُ: الَّذِي أَصَابَهُ البؤسُ**)، کەسێک کە داماویی و مەینەتیی بەسەر هاتوە، بەهۆی هەژارییەوە، ئنجا لە تەفسیرەکاندا هاتوە: (**ذِكْرُ البائِسِ الفَقِيرِ لِتَرْقِيقِ قُلُوبِ النَّاس**)، کە دەفەرموێ: (**الفَقِير**) یانی: هەژار، (**بائِس**)یش، یانی: داماو بێ دەرەتان، ئنجا کە هەردووکیان پێکەوە باسکراون، بۆ دڵ نەرمکردنی خەڵکە، یانی: بەزەییتان پێیان دابێ، ئەها چەند داماو و بێ دەرەتانن، هیچ شک نابەن بیخۆن!!

**١٢)- ﴿ ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ ﴾**، دوایی با چڵک و چەپەری خۆیان لابەرن، پێشەوا (**طبري**) لە تەفسیرەکەی دا[1] ئەم دەقە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دێنێ، بۆ تەفسیری: ﴿ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ ﴾، {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: هُوَ وَضْعُ الإِحْرَامِ، وَحَلْقُ الرَّأْسِ، وَلَبْسُ الثِّيَابِ، وَقَصُّ الأَظَافِرِ، وَنَحوِ ذَلِكَ**}.

---

(١) جامع البيان، ج١٨، ص٦١٣.

واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەبـبـاس (خـوا لێیـان ڕازیبـێ)، دەڵـێ: ﴿لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ﴾، (تَفَث) بریتیـە لـە لابـردنی پۆشـاكیی ئیحـڕام (ئـەو دوو پارچـە قوماشـە) و، سـەری خـۆ تاشـین و، پۆشـینی پۆشـاكی ئاسـایی و، نینـۆك كـردن و وێنـەی ئەوانـە، كـە پێشـتر ئەوانەیـان هەمـوو لـێ قەدەغـە بـوون.

چونكـە هەندێـك لـە زانایانیـش گوتوویانـە: ﴿لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ﴾، واتـە: بـا خـوا پەرستییەكان ئەنجـام بـدەن، بـەڵام لـە ڕاستییدا وشـەی (تَفَثٌ)، بـە نینـۆك و چڵـك و چەپـەر و ئەوانـە زیاتـر دەگوتـرێ، (أَي: لِيُزِيلُوا وَسْخَهُم، وَأَصْلُ التَّفَثِ وَسْخُ الأذنِ)، واتە: بـا چڵـك و چەپـەری خۆیـان لابـەرن، كـە پێشـتر بەهـۆی ئـەوەوە كـە نەدەبـوو بـۆنی خـۆش لـە خۆیـان بـدەن و، نەدەبـوو مـووی خۆیـان و نینۆكـی خۆیـان لابـەرن، وا بكـەن كـە خزمـەتی جەسـتەیان بكـەن، بۆیـە چڵـك و چەپەریـان لـێ كۆبۆتـەوە، هەروەهـا بەهـۆی قەڵەباڵغیـی و هاتـن و چـوون لـە نێـو ئـەو خەڵكـە و حەشـاماتەدا، وشـەی (تَفَث)یـش بـە چڵكـی گـوێ، دەگوتـرێ.

هەندێكیـش لـە زانایـان گوتوویانـە: (تَفَث)، یـانی: كـردەوەكانی حـەج، كـە (**محمد الطاهـر بـن عاشـور**) ئـەو ڕایـەی زاڵكـردوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا، ڕا زاڵ كردنەكـەی بـێ هێـزە، چونكـە هـەم لـە زمـانی عەرەبییـدا، وشـەی (تَفَث) زیاتـر بـە مانـای چڵـك و چەپـەر هاتـوە و، بـە پێـی سـیاقیش دوای قوربانیـی سـەر بڕیـن و، دوای ئـەو خـوا پەرسـتییانە، ئنجـا ئیحـڕام شـكاندنی یەكـەم (**التَّحَلُّل الأَصغَـر**)، دێتـە پێشـێ، بۆیـە: ﴿لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ﴾، زیاتـر ئـەوە دەگەیەنـێ.

١٣)- ﴿وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ﴾، هەروەها ئەو ئاژەڵانەی لەسەر خۆیانیان نەزر كردوون، با وەفایان پێ بكەن و، جێبەجێی بكەن، سەریان ببڕن.

وشـەی (نَـذر)، بریتیـە لـە خـۆ پابەنـد كـردن بـە خـوا پەرسـتییەكەوە كـە دەتـەوێ لـە خـوای بـەرزت نیزیـك بكاتـەوە و، لەسەریشـت پێویسـت نیـە، بـەڵام بیبەسـتیەوە بـە شـتێكەوە كـە پێـت خـۆش بـێ، ئەو شـتەت بـۆ پەیـدا بـێ، یاخـود نەشیبەسـتیەوە.

بـۆ وێنـە: کەسـێک دەڵـێ: خوایـە! دە (١٠) ڕۆژووم لەسـەر نـەزر بـن، ئەگـەر فـلان شـتە ببـێ، یـان فـلان نەخۆشـە چـاک ببـێ، یاخـود بـۆ خـۆ لـە خـوا نزیـک خسـتنەوە، دەڵـێ: خوایـە! ئـەوەم لەسـەر نـەزر بـێ، بـۆ ئـەوەی خـۆی زیاتـر لـە خـوا نزیـک بخاتـەوە، دەشـگونجێ بـە شـتێکی واوە نەبەسـترێتەوە.

١٤)- ﴿وَلۡيَطَّوَّفُواْ بِٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ﴾، هەروەها با تەوافی ماڵی کۆن بکەن.

ماڵی کۆنی خوا، ماڵی دێرینی خوا، مەبەست پێی کەعبەیە.

ڕستەی ﴿وَلۡيُوفُواْ نُذُورَهُمۡ﴾، خوێندراویشەتەوە: (وَلْيُوَفُّوا نُذُورَهُم).

وشـەی (عَتِيـق)، هـەم بـە مانـای ئـازاد دێ، کـە نەکەوتبێتـە ژێـر ڕکێفـی خەڵـک، هـەم بـە مانـای دێریـن و لەمێژینـەش دێ.

ئنجا هەر کام لەو سێ وشانە:١- ﴿لۡيَقۡضُواْ﴾، ٢- ﴿وَلۡيُوفُواْ﴾، ٣- ﴿وَلۡيَطَّوَّفُواْ﴾، بە دوو جـۆر خوێندراونەوە:

أ- بە زەنەی لامەکەیان: (لْيَقضُوا)، (لْيُوفُوا)، (لْيَطَّوَّفُوا).

ب- بە ژێری لامەکەش: (لِيَقضُو)، (لِيُوفُو)، یان (ليوفُّوا)، (لِيطوَّفوا) زانایانیش لەسەر ئەو دوو جۆرە خوێندنەوانەش یەک دەنگن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بـە مەزنگرتنـی ڕێزلێگیـراوەکانی خـوا ﷻ {ئـەو شـتانەی خـوا ﷻ ڕێـزی لێگرتـوون و حورمـەتی بـۆ داناون} مایەی پاداشـتی لای خوایـەو، جگە لە ئاژەڵـە هەڵاوێردراوەکانیش {ئەوانـەی هەڵاوێـردراون، لـەوە کـە حـەڵاڵ بـن} هەموویـان ڕەوان و، پێویسـتە دوورە پەرێزیـی بکـرێ لـە پیسـیی بتـەکان و، قسـەی درۆ و شـیرک، کـە بابـای هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر، وەک کەسـێکە لـە ئاسـمانەوە بکەوێتـە خـوار و باڵنـدە تێیرۆبـێ، یاخـود با ڕایماڵێتـە شـوێنێکی دوورو قـووڵ، چاڵێکـی قووڵ.**

**بـە بەرزگرتنـی دروشـمەکانی خـواش، نیشـانەی تەقـوای نێـو دڵانـە و، شـوێنی سـەربڕانی قوربانییانیـش، نزیـک ماڵـی دێرینـی خوایـە ﷻ {کـە مەبەسـت ئـەوە نیـە، بچنـە لای کەعبـە، بەڵکـو لـەو جوغـز و سـنوورەدا، کـە پێـی دەگوتـرێ: حـەڕەم}:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾ حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە (١٤) بڕگەدا:

١)- ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، ئەمە ناوی ئاماژە (**إسم الإشارة**)یە، بۆ لێک جیاکردنەوەی دوو قسانە، یاخود دوو ڕووی یەک قسە و، مەبەست لێی ئاگادار کردنەوە و بایەخدانە بەوەی کە لەمەودوا دێ، ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، واتە: ئەوە ڕۆیی باسکرا، ڕوونکرایەوە، ئنجا بابەتێکی دیکەش، هەیە یاخود: ئەوە ڕووێکی ئەو بابەتە بوو، ئنجا ڕووێکی دیکەشی ئەمەیە.

٢)- ﴿ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، هەر کەسێک حورمەتەکانی خوا ﷻ بە مەزن بگرێ، واتە: ئەو شتانەی کە خوا ڕێزی لێناون و، قەدری لێناون، ئنجا چ بە باری قەدەغەکرانیاندا بێ، چ بە باری فەڕزکرانیاندا بێ، هەردووکیان دەگرێتەوە، ئەگەر قەدەغە کراون، دەبێ تۆش بە مەزنیان بگری و توخنیان نەکەوی، ئەگەر خوا فەڕزی کردوون، دەبێ تۆش بە مەزنیان بگری و ئەنجامیان بدەی، بۆیە وشەی: ﴿ حُرُمَٰتِ ﴾ی، بەکارهێناوە، بۆ ئەوەی هەم بارە سەلبییەکە بگەیەنێ، هەم بارە ئیجابییەکەی، هەم قەدەغە کراوەکان بگەیەنێ، هەم فەڕزکراوەکان.

(**الحُرُمَـات: جَمْـعُ الحُرْمَـة، مَـا يَجِـبُ احْتِرَامَـهُ، وَالإِحْـتِرَامُ اعْتِبَـارُ الـشَّيءِ ذَا حَـرَمٍ، كِنَايَـةٌ عَـنْ عَـدَمِ الدُخُـولِ فِيـهِ**)، (**إِحْتِرَام**) بریتیـە لـەوەی تـۆ ئـەو شـتە بـە خـاوەن حـەرەم دابنێـی، ئەمـەش کنارەیـە بـەوەی کـە نابـێ بچیـە نێـوی و ئەگـەر قەدەغـە بـێ، بیشـکێنی و، ئەگـەر واجـب بـێ بیچوێنـی، ئنجـا کەسـێک حورمەتـەکانی خـوا بـە مـەزن بگـرێ:

٣)- ﴿ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ﴾، بە دڵنیایی ئەوە بۆ وی زۆر شتێکی باشە و باشترین شتە لە لای پەروەردگاری، چونکە وشەی ﴿ خَيْرٌ ﴾، دەگونجێ بە مانای باش یان باشتر و، دەشگونجێ بە مانای باشترین بێ، وەک دەڵێ: (**خَيْرُ النَّاسِ مَنْ يَنْفَعُ النَّاس**)، باشترینی خەڵک ئەوەیە سوودی بۆ خەڵک هەبێ، هەروەها: (**شَرُّ النَّاس مَنْ أَكرَمَهُ النَّاسُ مَخَافَةَ شَرِّهِ**)، خراپترین خەڵک ئەوەیە کە خەڵک بە ناچاریی ڕێزی لێبنێ، لەبەر ئەوەی لە زیان و خراپەی بە دوور بێ، کەواتە: وشەی ﴿ خَيْرٌ ﴾، دەگونجێ بە مانای باش بێ و، دەشگونجێ بە مانای باشترین بێ، کە لێرەدا بە مانای دووەمیانە، واتە: هەر کەسێک حورمەتەکانی خوا ﷻ بە مەزن بگرێ، ئەوە باشترین شتە بۆ وی لە لای پەروەردگاری، چونکە تۆ دەبێ بە پێوەری خواو بە تەرازووی خوا مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا بکەی، هەر شتێک خوا ڕێزی لێناوە، تۆش ڕێزی لێ بنێی و، هەر شتێک خوا ﷻ قەدەغەی کردوە، لە لای تۆش قەدەغە بێ و، هەر شتێک لە لای خوا پێویستە، لە لای تۆش پێویست بێ و، وەک ئەرکێکی سەر شانت تەماشای بکەی.

٤)- ﴿ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾، ئاژەڵەكانیشتان بۆ ڕەوا و حەڵاڵ كراون (سەریان ببڕن)، جگە لەوانەی كە بەسەرتان دەخوێنرێنەوە، واتە: لە قورئاندا بەسەرتاندا خوێندراونەوە، كە كاتی خۆی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، كۆمەڵێك لە ئاژەڵانیان لە خۆیان قەدەغە دەكردن، بە ناو لێنانی بێ بەڵگە، بۆیە خوا ﷻ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: خوا هیچ بەحیرەو هیچ سائیبەیەك و هیچ وەصیلەیەك و هیچ حامێكی دانەناوە، كە ئەوانە چوار جۆرە ئاژەڵ بوون، - وەك پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (المائدة)دا باسمان كردوە - كافرەكان لە خۆیانیان قەدەغە كرد بوون.

بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: هەموویان بۆتان حەڵاڵن، جگە لەوەی كە بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوە، یان بەسەرتاندا خوێندراوەتەوە، ئەوانیش بریتین لە: مردار، خوێن، گۆشتی بەراز، بۆ جگە لەخوا سەربڕاو، كە پێشتر باسكراون.

٥)- ﴿ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ ﴾، خۆتان لە پیسیی بتەكان بپارێزن، ئنجا بتەكان هەر پیسن، ئایا پیسیی بتەكان یانی چی؟ ئەم ﴿ مِنَ ﴾ە، (**بَيانٌ لِمُجمَلِ الرِّجْسِ**)، لە (من) بۆ ڕوونكردنەوەی چەمكی گشتی پیسییە، پیسیی زۆر جۆری هەیە، لێرەدا مەبەست پیسیی بت و صەنەمەكانە، چونكە وشەی ﴿ ٱلرِّجْسَ ﴾، پیسیی بتەكان و هی غەیری بتەكانیش دەگرێتەوە.

پیسیی بتەكانیش ئەوەیە كە وەك پەرستراو مامەڵەیان لەگەڵدا بكرێ و، بكرێنە هاوبەشی خوا ﷻ.

٦)- ﴿ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴾، دیسان خۆتان لە قسەی درۆ بپارێزن و، بە دوور بگرن، (**زُور**)، یانی: (**كَذِب**)، درۆ، وەك ئەوە كە خوا ﷻ هەم لە سوورەتی (**الأنعام**)دا و، لە سوورەتی (**المائدة**)دا، هەروەها لە سوورەتی (**یونس**)دا، باسیكردوە كە هەر لە خۆوە

دەیانگوت: ﴿ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ ﴾، ئەوە حەلاڵەو ئەوە حەرامە، لە خۆوە بەبێ بەڵگە، خۆتان لەو جۆرە قسە درۆیە بپارێزن.

هەروەها ﴿ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴾، قسەی درۆ و شیركیش دەگرێتەوە، كە لە ڕاستییدا شیرك گەورەترین جۆری درۆیە، پاڵ بدرێتە لای خوا ﷻ كە گوایە هاوبەشی هەیە.

لەوبارەوە ئەم دەقە دێنین: {**عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِأَكْبَرِ الْكَبَائِرِ ثَلاثًا؟ قَالُوا: بَلى يا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: الإِشْرَاكُ بِاللهِ، وَعُقُوقُ الْوالِدَيْنِ، وَجَلَسَ، وَكَانَ مُتَّكِئًا، فَقالَ: أَلا وَقَوْلُ الزّورِ، قَالَ، فَما زَالَ يُكَرِّرُهَا، حَتَّى قُلْنا: لَيْتَهُ سَكَتَ**} (**أخرجه البخاري: ٢٦٥٤، ومسلم: ٨٧، والترمذي: ٢٣٠١**).

واتە: ئەبوو بەكرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان پێبدەم بە گەورەترینی گوناهە گەورەكان؟ سێ جاران وایفەرمووو، گوتیان: با، ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان و، ئازاردانی دڵی باب و دایك و، شایەدیی دانی بە درۆ و قسەی درۆیە، پێغەمبەر ﷺ لەو كاتەدا پاڵیدابوۆوە، دوایی هەڵساو، ئەوەی زۆر دووبارە كردەوە، هەتا گوتمان: بریا بێدەنگ بووبایە، واتە: هێندە خۆی ئەزیەت نەدابایە.

٧)- ﴿ حُنَفَآءَ لِلَّهِ ﴾، خۆساغكەرەوانە بۆ خوا، ئەمە حاڵە، واتە: ئەگەر ئێوە خۆتان پاراست لە پیسیی بتەكان و، خۆتان پاراست لە قسەی درۆ و شیرك، ئەو كاتە مانای وایە خۆتان بۆ خوا ساغ كردۆتەوە، ﴿ حُنَفَآءَ ﴾، كۆی (**حَنِیف**)ە، یانی: (**خَالِص**)، خۆتان بۆ خوا ساغ و پاك ڕاگرتوە.

٨)- ﴿ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ﴾، ئێوە هاوبەشی بۆ دامەنێن، لە هاوبەش دانەران مەبن، لەوانەی هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، كە ئەمە لەبەر ڕاهاویشتنی هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، یانی: ئێوە وەك ئەوان مەبن.

دوایی وێنای بابای موشریكمان بۆ دەكات، حاڵی چۆنە؟

٩)- ﴿ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ﴾، هەر کەسێکیش هاوبەش بۆ خوا دابنێ، وەک کەسێک وایە لە ئاسمان کەوتبێتە خوار، باڵندە (باڵندەی لاشخۆر) تێی ڕۆ هاتبن {﴿ فَتَخۡطَفُهُ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**فَتَخَطَّفُهُ**)، تێی ڕۆهاتبن} یاخود با ڕاپێچی بکات و ڕایماڵێتە شوێن و چاڵێکی قووڵەوە.

کەسێک کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێ، حاڵی وەک حاڵی ئەو دوو جۆرە کەسە وایە، یان لە ئاسمان بکەوێتە خوار و باڵندە بیڕفێنێ و تێی ڕۆبێ، یاخود با ڕایماڵێتە شوێنێکی دوور و چاڵێکی قووڵەوە کە بنەکەی دوور بێ.

١٠)- ﴿ ذَٰلِكَ ﴾، ئەوەی باسکرا، بەو شێوەیە ڕوونکرایەوە.

١١)- ﴿ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ﴾، هەر کەسێکیش دروشمەکانی خوا ﷻ بە مەزن بگرێ، ئەوە لە پارێزکاریی دڵانەوەیە، ئەو پارێزکارییەی کە لە دڵاندا هەیە، پێشتریش گوتمان: ﴿ شَعَٰٓئِرَ ﴾، کۆی (**شَعِيرة**)ەیە، کە سەرکێشی (**فعيلة**)یەو بە مانای (**مَفعُولَة**)، واتە: نیشانەدار کراو، ئەو شتانەی کە کراون بە نیشانە، بۆ ئەنجامدانی بەندایەتیی بۆ خوا، مەبەست پێیان ئەو نیشانانەن کە لە حەجدا ئەنجام دەدرێن، یاخود کۆی خواپەرستییەکان، کە بۆ خوا ئەنجام دەدرێن، لە نێویشیاندا خواپەرستییەکانی حەج، بە (مناسک) تەعبیریان لێکراوە.

١٢)- ﴿ لَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ﴾، ئێوە لەو دروشمانەی خوادا: قوربانییەکان، ئەو ئاژەڵانەی سەریان دەبڕن، سوودگەلێکتان تێیاندا هەیە، ﴿ مَنَٰفِعُ ﴾، کۆی (**منفعة**)یە و ناوە بۆ سوود (**نَفْع**)، یانی: دەتوانن لێیان بەهرەمەند بن.

١٣)- ﴿ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ﴾، تاکو کاتی دیارییکراو، کە کاتی سەربڕانیانە.

١٤)- ﴿ ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴾، دوایی شوێنیان (واتە: شوێنی لێ سەربڕانی ئەو قوربانییانە ئەو ئاژەڵانە) لای ماڵی دێرین و کۆنە.

ئه‌مه وه‌ک ئه‌و ئایه‌ته‌یه که خوا ﷻ ده‌فه‌رموێ: ﴿هَدْيًا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ ...﴿٩٥﴾﴾ المائدة، یانی: ده‌بێ قوربانییه‌که بگاته که‌عبه، که مه‌به‌ست ئه‌وه نیه به‌که‌عبه‌وه بچه‌سپێنرێ، به‌ڵکو مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه بگاته نیزیک که‌عبه و چوارچێوه‌ی حه‌ره‌م، وشه‌ی (مَحِلّ)یش، (المَحِلّ: مَصْدَرٌ مِيمِيٌّ من حَلَّ بِالمَكَان) چاوگێکی (ميمي)یه، واته: له‌و شوێنه ئاماده بوو، واته: له حه‌ره‌می مه‌ککه‌دا سه‌ر ببڕدرێ.

کۆتایی ئه‌م مه‌سه‌له‌یه به‌م فه‌رمایشته دێنین: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** ﷺ، **أَنَّ رَسُولَ اللهِ** ﷺ **رَأَى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً، فَقَالَ: ارْكَبْهَا فَقَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، فَقَالَ: ارْكَبْهَا قَالَ: إِنَّهَا بَدَنَةٌ، قَالَ: ارْكَبْهَا وَيْلَكَ فِي الثَّالِثَةِ أَوْ فِي الثَّانِيَةِ**} **(أخرجه البخاري: ١٦٨٩، ومسلم: ١٣٢٢).**

واته: ئه‌بوو هوره‌یره ﷺ ده‌گێڕێته‌وه ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پیاوێکی بینی حوشترێکی لێ ده‌خوڕی، (حوشترێکی قوربانیی)، فه‌رمووی: سواری به، (حوشتر بۆ سوارییه)، کابرا گوتی: ئه‌وه به‌ده‌نه‌یه (واته: بۆ قوربانییه، بۆ سه‌ربڕانه) فه‌رمووی: سواری به، دووباره گوتی: ئاخر ئه‌وه بۆ قوربانییه {واته: سه‌ری ده‌بڕم، له کاتی حه‌جدا} له جاری دووه‌م یان سێیه‌مدا فه‌رمووی: سواری به هاوار بۆ تۆ. واته: بۆت هه‌یه لێی به‌هره‌مه‌ند ببی، تاکو کاتی سه‌ر بڕانی.

هه‌روه‌ها له جابیری کوڕی عه‌بدوڵڵاوه خوا لێیان ڕازی بێ، هاتووه که له باره‌ی سوار بوونی (هَدِي) {واته: ئه‌و ئاژه‌ڵانه‌ی که ده‌کرێنه قوربانیی} پرسیاری لێکراوه، ئه‌ویش گوتوویه‌تی: {**سَمِعتُ النَّبِيَّ** ﷺ **يَقُولُ: إِركَبها بِالمَعرُوفِ، إِذَا أُلجِئْتَ إِلَيهَا حَتَّى تَجِدَ ظَهْرًا**}، **(أخرجه مسلم برقم: ٣٢٤، وأبو داود برقم: ١٧٦١).**

واته: گوێم له پێغه‌مبه‌ر ﷺ بووه فه‌رموویه‌تی: به شێوه‌یه‌کی په‌سند سواری به، ئه‌گه‌ر ناچار بووی، تاکو پشتت ده‌ستده‌که‌وێ و سواری وڵاخێکی دیکه ده‌بی، ئه‌گه‌ر پێویستی پێی بوو، لێی به‌هره‌مه‌ند ببه.

**مەسەلەی چوارەم:**

**خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: بـۆ هـەر ئۆممەتێـک جێگایەکـی تایبەتییـمان بـۆ خـوا پەرسـتیی {یـان قوربانیـی سـەربڕین} دانـاوە، تاکـو بـە نـاوی خـوا هێنـان ئاژەڵەکانیـان سـەربڕن، بـۆ خـوای تاکـە پەرسـتراوی هـەق و، ئەوانـەش کـە بـەو شێوەیە قوربانییەکانیـان سـەر دەبـڕن، شایسـتەی مـوژدەی خۆشـی خوان و، سیفەتە سـەرەکییەکانی ئـەو جـۆرە کەسـانەش، ئەوانـەن کـە نـەرم و نیـان و ملکەچـن بـۆ خـوا ﷻ، دڵ ڕاچڵەکیـون بـە یـادی خـوا و، خۆڕاگـرن لەسـەر گرفتارییـەکان و، نوێـژ بەرپاکـەرن و، ماڵـی خـۆ بەخشـەرن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا لِّيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّن بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ ۗ فَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ فَلَهُ أَسْلِمُوا ۗ وَبَشِّرِ الْمُخْبِتِينَ ﴿٣٤﴾ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَالصَّابِرِينَ عَلَىٰ مَا أَصَابَهُمْ وَالْمُقِيمِي الصَّلَاةِ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ  ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ (٩) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا ﴾، هەروەها بۆ هەر کۆمەڵە خەڵکێک، [یان بۆ هەر کۆمەڵگایەکی دیندار]، شوێنێکی خواپەرستییمان دیاریی کردوە، یاخود: جۆرێک لە خواپەرستییمان داناوە، یاخود: شوێنێکمان بۆ تێدا سەربڕینی ئاژەڵان بۆ خوا ﷻ داناوە.

وشـەی (مَنْسَـك) خوێندراویشـەتەوە: (مَنْسِـك)، هـەردوو خوێندنەوەکـەی هاتـوون و بەمانـای (مَـكَانُ ذَبْـحٍ) أو (مَـكَانُ تَعَبُّـدٍ) أو (نَوْعـاً مِـنْ تَعَبُّـدٍ)، هـەر سـێ واتاکـەی هاتـوون: أ- شـوێنی سـەربڕین، ب- یـان شـوێنی خواپەرسـتیی تێـدا ئەنجامـدان، ج- یاخـود جۆرێـک لـە خـوا پەرسـتیی، یانـی: خـوا ﷻ پێـمان دەفەرمـوێ: ئـەوە بـەس ئۆممەتـی پێغەمبـەر ﷺ نیـە، کـە ئـەو خواپەرسـتییانەی بـۆ دیارییکـراون، بەڵکـو بـۆ

هەموو ئوممەتانی دیکەش هی هەموو پێغەمبەرەکان: (مَنْسَك) یان (مَنْسِك)یان بۆ دیارییکراوە.

**٢)-** ﴿لِّيَذْكُرُواْ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَـٰمِ﴾، تاكو ناوی خوا بێنن، (تاكو ناوی خوا بێنن) لەسەر ئەوەی پێمان داون، لە چوار پێیانی ئاژەڵان، پێشتریش گوتمان: (بَهِيمَة) ئاژەڵێكە تێی ناگەی، بە كوردیی دەڵێن: بەستەزمان، یانی: زمانی بەستراوە و ناتوانێ بدوێ، لێی تێ ناگەی، وشەی **(الأنعام)**یش هەر بە مانای ئاژەڵ دێ، بەڵام چوار ئاژەڵی سەرەكیی دەگرێتەوە كە ئەمانەن:

**أ-** حوشتر.

**ب-** ڕەشەوڵاخ، (گاو مانگاو گامێش و كەڵ).

**ج-** مەڕ، (ئاژەڵی سپی ورد)، كە هەم مەڕیش كە مێیەكەیەتی، هەم بەرانیش كە نێرەكەیەتی، دەگرێتەوە.

**د-** بزن، (ئاژەڵی ڕەسی ورد)، ئنجا چ ڕەش بێ، چ مەرەز بێ، ئەویش هەم بزن كە مێیەكەیەتی و، هەم نێریی، كە نێرەكەیەتی دەگرێتەوە.

یانی: تاكو ناوی خوا بێنن لەسەر ئەو ئاژەڵانەی پێمانداون، واتە: لە كاتی سەربڕینیاندا ناوی خوایان لەسەر بهێنن.

**٣)-** ﴿فَإِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ﴾، ئەمە جەختكردنەوەی خوا بەیەكگرتنە، واتە: پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، بێگومان ئەمە بەرپەرچدانەوەی هاوبەش بۆ خوادانەرەكانە، كە لەگەڵ خوای بەرزدا، شتەكانی دیكەشیان دەپەرستن، خوا ﷻ دەفەرموێ: پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، یانی: پەرستراوی بە هەق، بەڵام پەرستراوی ساختەو پووچ و بێ بنەما، زۆر زۆرن، هەر بۆیە دروشمی سەرەكیی ئیسلامەتیی بریتیە لە **(لَا إلهَ إلاَّ الله)**، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوا **(الله)** ﷻ، یانی: هیچ پەرستراوێكی بە هەق نیە، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق زۆرن.

٤)- ﴿فَلَهُۥٓ أَسۡلِمُواْۗ﴾، ئنجا بەس بۆ ئەو ملکەچ بکەن ئەمە شێوازی کورت هەڵهێنان (**حصر**)ە: یانی: تەنیا بۆ وی، نەک بۆ جگە لەوی، تەنیا بۆ وی ملکەچ بن، ئەگەرنا لە ئەسڵ دا ئاوایە: (**أَسْلِمُوا لَهُ**)، بۆوی ملکەچ بن، بەڵام کە کار و بکەر (**فعل و فاعل**) دوادەخرێن و بەرکار (**مفعول به**) پێش دەخرێ، کورتهەڵێنان دەگەیەنێ وەک: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ۝﴾الفاتحة، بەس تۆ دەپەرستین، ﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝﴾الفاتحة، بەس پشت بە تۆ دەبەستین، لێرەش (**فَلَهُ أَسْلِمُوا**)، تەنیا بۆ وی ملکەچ بن.

ئنجا خوای بەرز ومەزن بە چەند سیفەتێکی پەسند وەسفیان دەکات، سەرەتا دەفەرموێ:

٥)- ﴿وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ﴾، موژدەش بدە بە خۆبەکەمگر و میهرەبانان (ٱلۡمُخۡبِتِينَ)، (**مُخْبِت**)، کە بە (**مُخْبِتِين**) و (**مُخْبِتُون**) کۆ دەکرێتەوە، لە (**أَخْبَت**)ەوە هاتوە، (**أَخْبَتَ، يُخْبِتُ، إِخْبَاتاً، فَهُوَ مُخْبِت**)، کە ناوی بکەر (**إسم فاعل**)ە، (**مُخْبِت**) لە ڕیشەدا لە (**خَبْت**)ەوە هاتوە، (**خَبْت**) واتە: شوێنی نزم و گۆملایی و تەخت، ئنجا (**مُخْبِتْ**) کەسێکە دەچێ بۆ شوێنێکی لەو جۆرە، دوایی لەوەوە خوازراوەتەوە بۆ کەسێک کە نەرم و نیان و هێور و مەند بێ و، ملکەچ و خۆنەویکەر و خۆبەکەمگر، (**مُتَوَاضِع**) بێ و، خۆ بەرز نەکاتەوە، یانی: موژدە بدە بە خۆ بەکەمگران و میهرەبانان و نەرم و نیانان، لە بەرانبەر خوادا ﷻ، یانی: (**المُتَوَاضِعِيْنَ أَمَامَ الله، وَلَيْسَ المُتَكَبِّرِيْنَ عَنْ طَاعَتِه**)، ئەوانەی لە بەرانبەر خوادا خۆیان بەکەم دەگرن، کە هەر کەمیشن، هەروەها خۆیان بچووک دەنوێنن، نەک ئەوانەی خۆیان بەرز دەگرن و سەرکەشیی دەکەن.

ئنجا خوا دوای سیفەتی یەکەم بە چەند سیفەتێکی دیکە وەسفیان دەکات: سیفەتی دووەمیان:

٦)- ﴿ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ﴾، ئەوانەی کاتێک باسی خوا ﷻ دەکرێ، دڵیان ڕادەچڵەکێ، (**وَجَلُ القَلْبِ: ارْتِجَافُهُ بِسَبَبِ ذِكْرِ اللهِ وَاسْتِشْعَارُ عَظَمَتِهِ**)، دڵ ڕاچڵەکین ئەوەیە کە دڵ بهەژێ بە هۆی یادی خواوە و، بە هۆی هەست پێکردن و هێنانە نێو دڵی خۆی، مەزنیی و بەرزیی بێ وێنەیی خوا ﷻ.

٧)- ﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ ﴾، سیفەتی سێیەمیان: هەروەها خۆڕاگران لەسەر ئەوەی کە تووشیان دێ، یانی: ئەوەی کە لە ئازار و ناڕەحەتیی تووشیان دێ، لە پێناوی خواو لە ڕێی خوادا.

٨)- ﴿ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، سیفەتی چوارەم: دیسان بەرپاکەرانی نوێژ، بەرپاکەری نوێژ ئەوەیە کە نوێژەکەی بەو شێوەیە، کە خوا ﷻ فەرموویەتی، جێبەجێی بکات.

٩)- ﴿ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴾، سیفەتی پێنجەم: هەروەها لەوەی پێمان داون، دەبەخشن، ئەمەیانی بە ڕستەی کرداریی **(الجُمْلَة الفِعْلية)** هێناوە، چونکە بەخشینیان بە پێی حاڵەتە جۆرا و جۆرەکان، دووبارە دەبێتەوە.

کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ ئەو بەندانەی خۆی، کە ئەهلی خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا دەپەرستن، بە پێنج سیفەتان وەسف کردوون:

١- **(الإخْبَات)**: **(التَسْلِيْمُ لله)** واتە: بۆ خوا ملکەچ بوون، کە ئەمە ئیمان و عەقیدە دەگرێتەوە.

٢- **(وَجَل القَلْبِ عِنْدَ ذِكْرالله)**: واتە: دڵ ڕاچڵەکین لە کاتی یادی خوادا، ئەمیش هەست و نەستی نێو دڵ و دەروون دەگرێتەوە.

٣- **(الصَبْر)**: خۆڕاگریی لەسەر بەڵاو گرفتارییەکان لە ڕێی خوادا.

٤- **(الصَّلاة)**: نوێژ بەرپاکردن.

٥- **(الإنْفَاق)**: ماڵ بەخشین.

ئنجا لەمەوە ئەنجامگیریی دەکەین، کە دینداریی ڕاست و ڕێک و ڕەسەن، هاوسەنگیی تێدایە و، ئەو هاوسەنگییە کە لەم ئایەتانەدا خوا ﷻ بۆی بەرجەستە کردووین، لە گەلێک شوێنی دیکە لە قورئاندا هەیە، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی **(السجدة)**دا، خوا ﷻ دەفەرمویێ: ﴿ إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدٗا وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

واتە: تەنیا ئەوانە بڕوا بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن، کە کاتێک دەخرێنەوە بیریان، بە کڕنووشدا دەکەون و، خۆیان بە زل ناگرن و، تەنیشتەکانیان لەسەر جێیەکانیان بەرزدەبنەوە، {شەوانە هەڵدەستن شەو بێداریی دەکەن، شەو نوێژ دەکەن} لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە بە ترس و هیواوە، {هەم ترسیان هەیە، لە سزای خوا و، هەم ئومێدو هیوایان هەیە بە پاداشتی خوا} و لەوەی پێمان داون دەبەخشن.

ئەوانە ئەهلی ئیمانن، کە خاوەنی ئەو شەش سیفەتەن:

١) کارلێککردن لەگەڵ ئایەتەکانی خوادا ﷻ.

٢) بە کڕنووشدا کەوتن.

٣) خۆ بە زل نەگرتن.

٤) شەونوێژ کردن.

٥) پاڕانەوە لە پەروەردگاریان بە ترس و هیواوە.

٦) بەخشین.

کەواتە: مسوڵمان دەبێ هاوسەنگ بێ، نەک هەر بە باریکە ڕێیەکدا بڕوا، نەک تەنیا دوو سێ شتان بزانێ و خوویان پێوە بگرێ و، دینداریی خۆی لەواندا کورت هەڵێنێ، وەک زۆربەی مسوڵمانانی ئەم ڕۆژگارە بەو شێوەیەن، یەکێ بەس ئەهلی زیکرە، یەکێک تەنیا ئەهلی فیکرە، یەکێ بەس ئەهلی عیلمە، یەکێک هەر عیبادەتی شەخصی دەکات، ئەوی دیکە تەنیا سەر گەرمی سیاسەتە، یەکێک هەر خەریکی بانگەوازە، یەکێ بەس خەریکی پەروەردەیە، یەکێ هەر خەریکی جەنگ و جیهادە، نا دەبێ لەهەر شوێنێک کە شەریعەت فەرمانی پێکردووی، ئامادە بی، دەبێ بەس یەک کار نەزانی و لە هەموو مەیدانەکان دا هەوڵ بدەی ئەسپی خۆت تاو بدەی و، لە هەر شوێنێک بی، کە شەریعەت

فەرمانی پێکردووی، هەروەک یەکێک لە زانایان و خواناسان پێناسەیەکی جوانی تەقوا دەکات و دەڵێ:

(**التَّقْوَى: هُوَ ألاَّ يَجِدَكَ اللە حَيْثُ مَنَعَكَ، وَألاَّ يَفْتَقِدَكَ حَيْثُ أمَرَكَ**)، واتە: تەقوا ئەوەیە خوا ﷻ تۆ لە شوێنێک نەبینێ کە لێی قەدەغە کردووی و، لە شوێنێکیش غایب نەبی کە لەسەری فەرز کردووی.

یانی: هەموو ئەرکەکان جێبەجێ بکەی و، خۆشت لە سەرجەم قەدەغەکان بپارێزی.

**ب-** هەروەها لە سووڕەتی (**الذاريات**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ ﴾، واتە: بێگومان پارێزکاران لە نێو باخ و گوڵزارو کانیی و سەرچاوەکاندان {پارێزکاران، کە خۆیان دەپارێزن لەو شتانەی خوا پێی ناخۆشن، خواش دوو شتی سەرەکیی پێ ناخۆشن:

**أ-** فەرمانەکانی (ئەرکەکانی) کە لەسەری پێویست کردووی، بیانچوێنی.

**ب-** قەدەغەکانی و حەڕامکراوەکانی بشکێنی}.

یەکەمین سیفەتیان ئەوەیە: ﴿ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ﴾، لە ڕۆژی دوایی دا ئەوەی پەروەردگاریان پێی داون، وەرگرینی، پاداشتی خوایان وەرگرتوە، بۆچی؟

﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴾، چونکە پێش ئەوە لە چاکەکاران بوون، واتە: هەم خوا پەرستییەکەیان بە شێوەیەکی زۆر چاک ئەنجام دەدا، هەم خەڵک دۆستییەکەیان بە شێوەیەکی زۆر باش بوو، هەم بەندەی خوا بوون و بۆ خوا ﷻ، صوڵحا و بوون، هەم کەسێکی باش بوون لە نێو کۆمەڵگادا.

﴿ كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ﴾، دوای ئـەوەی بـە تەقـوا و بـە ئیحسـان پێناسـی کـردن، ئنجـا باسـی شـەو و نوێژیـان دەکات و دەفەرمـوێ: بـە کەمیـی نەبـێ لـە شـەوێ دا نەدەخەوتـن.

﴿ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴾، ئنجـا کـە کەمیـش دەخەوتـن و شـەوگاریان بـە خـوا پەرسـتیی و تاعـەت دەبـردە سـەر، وە نەبـێ پێـی لـە خۆبایـی بـن، بەڵکـو پێـش ئـەوەی شـەبەقی بەیانـی بـدا، پێـش ئـەوەی نوێـژی بەیانیـی ببـێ، داوای لێبوردنیـان لـە خـوا ﷻ دەکـرد، وەک شـەوگارەکەیان بـە گونـاە بردبێتـە سـەر، داوای لێبوردنیـان لـە خـوا دەکـرد!!

ئنجـا: ﴿ وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ ﴾، لـە مـاڵ و سامانیشـیان دا هـەق هەبـوو بـۆ کەسـێ کـە داوای لـێ دەکـردن و، بـۆ کەسـی بـێ بەشـیش، داواکار **(سـائل)** ئەوەیـە کـە دێتـە بـەر دەرگات، بـێ بـەش **(محـروم)** ئەوەیـە کـە هـەژارە، بـەڵام ڕووی نایـێ داوا بـکات، کـە بەوانـە خێرتـرە، لـە سـواڵکەرێک کـە دێتـە بـەر دەرگات، چونکـە سـواڵکەرەکە پەکـی ناکـەوێ و داوا دەکات، بـەڵام ئـەوی دیکـە پێـی عەیبـە داوا بـکات.

## مەسەلەی پێنجەم:

**حوشترانی بە کەلەش و بەدەو و لە دروشمەکانی خوان و، سەر بەخێرن و، پێویستە لە کاتی وەستانیاندا بە ڕیز، بە ناوی خوا هێنانەوە سەر ببڕدرێن، پاشان لە گۆشتەکەیان بخورێ و بەشی ئاتاجانی جۆرا و جۆریشی لێ بدرێ و، بێگومان ئەوەی خواش مەبەستیەتی، تەقوای نێو دڵانە، نەک خوێن و گۆشتی ئاژەڵان، خواش بۆیە ئەو ئاژەڵانەی ڕام و دەستەمۆ کردوون، کە سوپاسگوزاریی بۆ بکرێ و بە گەورەو مەزن بگیرێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ فَٱذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا صَوَآفَّ فَإِذَا وَجَبَتْ جُنُوبُهَا فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْقَانِعَ وَٱلْمُعْتَرَّ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە (١١) بڕگەدا:

**١)- ﴿ وَٱلْبُدْنَ جَعَلْنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ ﴾**، خوا ﷻ دەفەرموێ: حوشترە قەڵەو و بە کەلەش و بەدەوەکانمان گێڕاون لە دروشمەکانی خوا ﷻ (کە بۆ خوا ﷻ سەربربڕدرێن)، وشەی (بدن) بە (بُدْن) و (بُدُن)یش خوێندراوەتەوە، هەردووکیان کۆی (بَدَنة)ن، **(البَدَنَةُ: هِيَ البَعِيرُ العَظِيمُ، وَهُوَ اسْمٌ مَأْخُوذٌ مِنَ البَدَانَةِ، وَهِيَ عِظَمُ الجثَّةِ وَالسِّمَنِ مِثْلُ خُشُب جَمْعُ خَشَبَة)**، (بَدَنة) بە حوشترێکی مەزن دەگوترێ، ناوێکە لە (بَدَانة)ەوە هاتوە، (بَدَانة) یانی: بە کەلەش، مەزن، یاخود زۆر قەڵەو و بەدەو، وەک (خُشُب) و (خَشَبة)، (خُشُب) کۆیە و (خَشَبة) تاکە، (بُدُن) یان (بُدْن)یش کۆیە و (بَدَنَة) تاکە.

**٢)- ﴿ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ ﴾**، بۆ ئێوە سوود و بەرژەوەندیی زۆریان تێدایە، واتە: هەم لە دنیا و هەم لە دواڕۆژدا، حوشتر هەموو شتێکی بە کەڵک دێ، هەم گۆشتەکەی، هەم

چەورییەکەی، هەم شیرەکەی، تەنانەت میزیشی بە کەڵک دێ، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بۆ هەندێک نەخۆشیی پێست، هەروەها شیاکە و ڕیخەکەشی کاتی خۆی سوودی لێوەرگیراوە، وەک سووتەمەنیی، ئنجا بۆ سوارییش بە کەڵک دێ و، بۆ بار لێنانیش بە کەڵک دێ و، سەرباری هەموو ئەمانەش، لە پێناوی خوادا سەر دەبڕدرێ، وەک دروشمێکی خواپەرستیی و بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞ﴾، وشەی (خیر)، واتە: سوود (**نَفْع**)، بەڵام بە نەناسراو (**نَكِرة**) هێناویەتی، یانی: سوود و بەرژەوەندییەکی گەورە و زۆر و جۆرا و جۆر.

٣)- ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ﴾، ئنجا لە کاتێکدا بە ڕیز وەستاون، بە پێوە ناوی خوایان لەسەر بێنن، ئاژەڵەکانی دیکە بە پاڵخراویی سەر دەبڕدرێن، بەڵام حوشتر سوننەتە بە پێوە سەر ببڕدرێ، (صَوَآفَّ) کۆی (**صَافَّة**)یە، (**نَاقَةٌ صَافَّة**)، واتە: حوشترێک کە وەستاوە، (صَوَآفَّ) یانی: ئەوانەی بە ڕیز وەستاون، ناوی خوایان لەسەر بێنن، یانی: سەریان ببڕن لەو کاتەدا، (**يُقَالُ صَفَّ إذَا كَانَ مَعَ غَيْرِه صَفاً بِأنَ اتَّصَل بِه**)، (**صَفاً**) واتە: ڕیز بوو لە پەنای یەکدا کە پاڵیان وێکداوە.

٤)- ﴿فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا﴾، هەرکات تەنیشتیان کەوت، (**أي: سَقَطَتْ عَلَى الأَرْضِ**)، واتە: تەنیشتیان کەوتە زەوی، چونکە ئاژەڵ کە سەر دەبڕدرێ، بەلا تەنیشتدا دەکەوێ، نە لەسەر پشت دەکەوێ و نە لە سەر دەم دەکەوێ، ئەمە کنارەیە بۆ ئەوە کە ژیانیان تێدا نەما، یانی: هەر لەگەڵ ژیانیان تێدا نەما، گەرماو گەرم، مەبەست پێی پەلەکردنە لە دابەشکردنی گۆشتەکەیاندا.

٥)- ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ﴾، (لە گۆشتەکەیان) خۆشتان لێی بخۆن و، بەشی بابای (**قَانِع**)ی لێبدەن و، هەم بەشی بابای (**المُعْتَرّ**)یشی لێبدەن.

ئەم (**ف**)یەی سەر (فَكُلُواْ مِنۡهَا) بۆ بەدوا داهاتن (**تعقيب**)ە، یەکسەر بە دوایدا، گەرماو گەرم و ز و و لە گۆشتەکەی بەهرەمەند بن، هەم بۆ خۆتان و، هەم بۆ ئاتاج و هەژارو نەدارانێک، کە دوایی شیی دەکەینەوە: (ٱلۡقَانِعَ) و (وَٱلۡمُعۡتَرَّ) یانی چی؟

کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّ﴾، خۆشـتان لـە گۆشـتەکەیان بخـۆن و، بەشـی (ٱلۡقَانِعَ )و (وَٱلۡمُعۡتَرَّ)یشـی لێبـدەن، ئەمـە فەرمانـە (فَكُلُـوا)، ئـەم فەرمـان (أمـر)ە، دەگونجـێ بـۆ پێویسـت بـوون بـێ، دەشـگونجێ بـۆ پەسـند بـوون بـێ، دەشـگونجێ بـۆ ڕێپێـدان بـێ، (يَحْتَمِـلُ الأَمْـرُ الوُجُـوبَ وَالنَّـدْبَ وَالإِبَاحَـة)، لـەو بـارەوەش شـەرعزانان ڕا جیاییـان هەیـە، کـە دوایـی باسـی دەکەیـن.

(القَانِـعُ: مِـنْ قَنَـعَ قُنُوعَـاً: سَـأَلَ بِتَذَلُّـلٍ)، (قَانِـع) کەسـێکە بـە کڕووزانـەوەوە داوا بـکات، ئـەوە (قَنَـعَ قُنُوعَـاً)ە، بـەڵام (قَنِـعَ قَناعـةً) مانایەکـەی جیایە، (قَنَـعَ قُنُوعَـاً)، واتە: داوای کـرد بـە کڕووزانـەوەو لاڵانـەوە، بـەڵام (قَنِـعَ قَنَاعَـةً) واتـە: ئەهلـی قەناعـەت بـوو، بـە کـەم ڕازیـی بـوو.

(المُعْـتَرُّ: اسْـمُ فَاعِـل مَـنِ اعـتَرَّ إذا تَعَـرَّضَ للعَطَـاء)، واتـە: (مُعْـتَرّ) نـاوی بکـەر (فاعـل)ە لـە (إعـتَرّ)، یانـی: وایکـرد پێـی بـدرێ و، داوای نەکـرد بـە ڕوون و ڕاشـکاویی، بـەڵام بـە زمانـی حـاڵ، لێـی تێدەگەیشـتی کـە ئاتاجـەو پێویسـتیی بـە هاوکاریـی هەیـە.

کەواتـە: (قَانِـع) کەسـێکە بـە ئاشـکرا داوا دەکات و بـە کڕووزانـەوەوە، ئـەوەی دیکـە (مُعْـتَرّ) بـە شـەرمەوە و، بـە ئەدەبـەوە، ڕەفتـار دەکات و، داوا نـاکات، بـەڵام بـە زمانـی حـاڵ وا دەکات تێـی بگـەی کـە پێویسـتە هاوکاریی بکـرێ، خـوا ﷻ دەفەرموێ: بەشـی هەردووکیانیـان لـێ بـدەن، ئنجـا لێـرەدا (إبـن كثـير) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی[1] دا دەڵـێ: {إحْتَـجَّ بِهَـذِهِ الْآيَـة الْكَرِيمَـة مَـنْ ذَهَـبَ مِـنْ الْعُلَـمَاء إِلَى أَنَّ الْأُضْحِيَّـة تُجَـزَّأ ثَلَاثَـة أَجْـزَاءٍ: فَثُلُـثٌ لِصَاحِبِهَـا يَـأْكُلُ مِنْهـا، وَثُلُـثٌ يُهْدِيـه لِأَصْحَابِـهِ، وَثُلُـثٌ يَتَصَـدَّق بِـهِ عَـلَى الْفُقَـرَاء}.

واتـە: ئـەو زانایانـەی کـە گوتوویانـە: قوربانیـی دەکـرێ بـە سـێ بەشـەوە، ئـەم ئایەتەیـان بـە بەڵگـە هێناوەتـەوە، گوتوویانـە: سـێیەکی قوربانیـی گۆشـتەکەی بـۆ خاوەنەکەیەتـی کـە سـەری بڕیـوە لێـی دەخـوات و، سـێیەکیشـی دەکاتـە دیاریـی

---

(١ ) المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير ص٨٩٦.

بـۆ هاوەڵانـی و ناسـیاوانی و، سێیەکیشـی دەکاتـە خێـرو صەدەقـە بەسـەر هـەژارو نەدارانــدا، دابەشــی دەکات.

لـەو بـارەوە ئـەم فەرموودەیـەی پێغەمبەریـش هەیـە ﷺ کـە دەفەرمـوێ: {**إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ لُحُومِ الْأَضَاحِيِّ فَوْقَ ثَلَاثٍ، كَيْمَا تَسَعَكُمْ، فَقَدْ جَاءَ اللَّهُ عَزَّ وتَعَالَى بِالْخَيْرِ، فَكُلُوا وَتَصَدَّقُوا وَادَّخِرُوا، وَإِنَّ هَذِهِ الْأَيَّامَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ**} (**أخرجه أحمد: ٢٠٧٤٨، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط مسلم، والنسائي: ٤٢٣٠، وابن ماجه: ٣١٦٠**).

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: مـن لێـم قەدەغـە کردبـوون قوربانیی پاشـەکەوت بکـەن و هەڵیبگـرن لـە سـێ ڕۆژان زیاتـر، بـۆ ئـەوە بـەشی هەمووانتـان بـکات، بـەڵام ئێسـتا خـوا عـز وجـل خێـر و چاکـەی هێنـاوە، بۆیـە بخـۆن و خێریـش بکـەن و پاشەکەوتیش بکەن، ئەم ڕۆژانەش ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

لـەو بـارەوە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّ ﴾، کاتێـک کـە بـە ڕیـز وەسـتاون، نـاوی خوایـان لەسـەر بێنـن، لـەو بـارەوە ئـەم فەرموودەیـە هەیـە:

{**عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ رَأَى رَجُلاً قَدْ أَنَاخَ بَدَنَتَهُ وَيَنْحَرُهَا، فَقَالَ: ابْعَثْهَا قِيَامًا مُقَيَّدَةً سُنَّةَ مُحَمَّدٍ ﷺ**} (**أخرجه البخاري: ١٧١٣، ومسلم: ٣٢، وأبو داود: ١٧٦٨، وابن حبان: ٥٩٠٣**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر (خـوا لێیـان ڕازیبـێ)، پیاوێکـی بینی حوشـترەکەی خـۆی یـەخ دابـوو، سـەری دەبـڕی، فەرمـووی بـەری بـدە، بـا بـە پێـوە بـێ، بـەڵام ببەسـترێتەوە، ئـەوە ڕێبـاز و ڕێ و شـوێنی (**محمـد** ﷺ)ە.

زانایـان گوتوویانـە: ئـەم دەقـە وەک فەرمـوودەی بـەرز کراوەیـە بـۆ لای پێغەمبـەر (**لـە حکـم الرفـع**)، چونکـە هـاوەڵان کـە شـتێک دەڵێـن، ئەگـەر بـەرزی نەکەنـەوە

بۆ لای پێغەمبەر ﷺ پێی دەڵێن: (**موقوف**)، واتە: وەستێندراوە لەسەر هاوەڵان، بەڵام ئەو شتانەی کە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازاندرێن و پاڵ دەدرێنە لای پێغەمبەر ﷺ، با نەشیگوتبێ: پێغەمبەری خوام بینی ئاوای کردو، ئاوای فەرموو، ئەوە حوکمی دەقی بەرزکراوەی هەیە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لە خۆی بابی ڕازی بێ)، لە خۆوە ناڵێ ئەوە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ، دەبێ دڵنیا بێ کە پێغەمبەر ﷺ ئاوا حوشترەکەی سەر بڕیوە، ئنجا وا دەڵێ، بۆیە ئەمە حوکمی فەرموودەی بەرزکراوەی هەیە، بۆ لای پێغەمبەر ﷺ.

هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمووێ: {**عَنِ الْبَرَاءِ** ﷺ، **قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ** ﷺ: **إِنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا، أَنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، مَنْ فَعَلَهُ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلُ، فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لِأَهْلِهِ، لَيْسَ مِنْ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ**} (**أخرجه أحمد: ١٨٥٠٤، والبخاري: ٥٢٢٥، ومسلم: ١٩٦١، وأبو داود: ٢٨٠٠، والترمذي: ١٥٠٨، والنسائي: ٤٣٩٥) ، والدارمي: ١٩٦٢)**.

واتە: بەرائی کوڕی عازیب ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لە ڕۆژی جەژنی قوربان دا بووە)، فەرمووی: یەکەمین شتێک کە لەم ڕۆژەماندا دەیکەین و دەستی پێدەکەین ئەوەیە کە نوێژ دەکەین، دوایی دەگەڕێینەوە (ئاژەڵەکان قوربانییەکان) سەر دەبڕین، هەر کەسێک وایکرد، بە پێی ڕێبازی ئێمە ڕەفتاری کردوە، بەڵام هەر کەسێک ئاژەڵەکەی خۆی سەربڕیبوو، پێش ئەوەی نوێژ بکات، ئەوە هەر گۆشتێکە بۆ خاو و خێزانی خۆی پێشکەشی کردوە و، ئەوە بە قوربانیی لە قەڵەم نادرێ.

ئایا قوربانیی چ کاتێک سەر دەبڕێ؟ لەوبارەوە ئەم دەقە دێنینەوە:

{**عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ** ﷺ، **أَنَّ رَسُولَ اللهِ** ﷺ **قَالَ: أَيَّامُ التَّشْرِيقِ كُلُّهَا ذَبْحٌ**}، (**أخرجه البيهقي فِي الكُبرى: ١٩٧١٧، والبزَّار: ٣٤٤٣، والدارقطني: ٤٧، والديلمي: ١٦٧٦)**.

واتە: جوبەیری کوڕی موتعیم ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژانی تەشریق هەموویان ڕۆژی سەربڕینن، سەربڕینی قوربانیین.

(**أَيَّامُ التَّشْرِيقِ**) ئەم چوار ڕۆژەن، ڕۆژانی: (**١٠و ١١و ١٢و ١٣ ذي الحجة**)، ڕۆژی جەژن و، سێ ڕۆژی دوای جەژن، لە هەر چواریاندا قوربانیی سەر دەبڕدرێ.

٦)- ﴿ كَذَٰلِكَ سَخَّرْنَٰهَا لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، ئاوا بەو شێوەیەی ئێوە دەبینن (ئەو حوشترە زلانە و ئەو ڕەشەوڵاخانە: گایە، مانگایە، گامێشە و کەڵە) ئێمە بۆمان ڕام و دەستەمۆ کردوون، بۆمان ملکەچ کردوون، بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن.

ئەگەرنا بە سەد (١٠٠) نەفەر بە حوشترێک ناوێرن، کە لێیان بەلەسە ببێ، هەروەها بە گایەک و بە گامێشێک و بە کەڵێک، ناوێرن.

٧)- ﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا ﴾، لێرەدا خوا ﷻ حەقیقەتێکی دیکە باس دەکات دەفەرموێ: گۆشتەکەیان (هی ئەو قوربانییانە) و، خوێنەکەیان، ناگاتە خوا. (**النَّيْلُ: الإِصَابَة**) تووشبوون، گەیشتن نە گۆشتی ئاژەڵەکان کە سەرتان بڕیون و نە خوێنەکەشیان، ناگاتە خوا، وشەی: ( لَن يَنَالَ ٱللَّهَ)، خوێندراویشەتەوە: (**لَنْ تَنَالَ اللهَ**) چونکە (**لُحُوم**) و (**دِمَاء**) کۆن، ئنجا لەبەر ئەوە مێینەی مەجازیی (**المؤنث مجازي**)ن، هەردووک لایان تێدا دروستن، بە هەردوو شێوەکان خوێندراونەوە، ئەدی ئایا چی دەگاتە خوا ﷻ؟

٨)- ﴿ وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقْوَىٰ مِنكُمْ ﴾، بەڵکو پارێزکاریی لە ئێوەوە بە خوا ﷻ دەگات، ئەمەش دیسان خوێندراوەتەوەش: (**وَلَكِنْ تَنَالُهُ التَّقْوَى مِنْكُم**)، چونکە تەقواش، هەم بە نێر (**مُذَكَّر**) دێ و، هەم بە مێ (**مُؤَنَّث**)یش دێ، کەواتە: ئەوەی جێی سەرنجی خوای پەروەردگارە، ڕواڵەتی گۆشتەکەو ڕواڵەتی خوێنەکەیان نیە، کە دەیرێژن لە پێناوی خوادا، بەڵکو ئەو هاندەرو پاڵنەرەیە کە پاڵتان پێوە دەنێ ئەو ئاژەڵانە سەر ببڕن بۆ خوا، کە بریتیە لە تەقوای نێو دڵ، تەقوای نێو دڵان بە خوا دەگات، نەک گۆشت و خوێنی ئاژەڵان.

دوایی جارێکی دیکە خوا ﷻ دەفەرموێ:

٩)- ﴿كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ﴾، ئاوا بەو شێوەیە کە دەیبینن، خوا ﷻ بۆ ئێوەی دەستەمۆ و ڕام و ملکەچ کردوون، بۆ ئێوەی بەردەست کردوون.

١٠)- ﴿لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ﴾، تاکو لەسەر ئەوەی خوا ﷻ ڕێنمایی ئێوەی کردوە و خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، بە گەورەی بگرن (**أَللهُ أَكْبَر**) بکەن، بەڵام (**أَللهُ أَكْبَر**) کردنەکە بە زار، دەبێ پێشێ لە دڵ دابێ و، گەورەیی و بەرزیی و بێ وێنەیی خوا ﷻ لە دڵدا هەبێ.

١١)- ﴿وَبَشِّرِ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، موژدەش بدە بە چاکەکاران، ئەوانەی باش خواپەرستیی دەکەن و چاک بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ ئەنجام دەدەن.

کە دەفەرموێ: ﴿لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ﴾، یانی: خوا بە گەورە و مەزن بگرن، کە خوا ﷻ بەو شێوەیە، قوربانیی سەربڕینی بۆ ئێوە ڕوون کردۆتەوەو، پێشانی ئێوەی داوە و ڕێنمایی کردوون: چۆن مامەڵە بکەن لەگەڵ ئاژەڵ سەربڕین و قوربانیی سەربڕیندا، کە لەو بارەوە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، چ لە نیوە دورگەی عەرەبیی و گەلی عەرەب و، چ لە دەرەوەی نەتەوەی عەرەب لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و، لە یۆنان و، ڕۆمان و، میسر و، میزۆپۆتامیا و، شام و، لە هەموو دنیادا، غەڵەت و پەڵەتی زۆر هەبووە.

## كورتە باسێك: حەوت هەڵوەستە

لێرەدا پێویستە حەوت هەڵوەستە بكەین، لە بەرانبەر كۆمەڵێك شت دا كە لەم دوو ئایەتە موبارەكە وەردەگیرێن:

**١- پێناسەی (بَدَنَة):** زانایان ڕاجیاییان لەو بارەوە هەیە، كە ئایا وشەی (**بُدُن**)، یان (**بُدْن**) كە كۆی (**بَدَنَة**)یە، ئایا تەنیا بە حوشتر دەگوترێ، یاخود بە ڕەشە وڵاخیش دەگوترێ؟

**أ-** (عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودو عەطاء و شافیعیی) گوتوویانە: بە ڕەشە وڵاخ ناگوترێ و تەنیا بە حوشتر دەگوترێ: (**بَدَنَة**).

**ب-** (مالیك و ئەبوو حەنیفە) گوتوویانە: وشەی (**بُدُن**) یان (**بُدْن**) كە كۆی (**بَدَنَة**)یە، هەم بە حوشتر دەگوترێ، هەم بە ڕەشە وڵاخیش، واتە: گاو مانگاو گامێش و كەڵ.

سوودی ئەو ڕاجیاییەش ئەوەیە كە ئەگەر كەسێك نەزرێكی كرد و گوتی: خوایە! بەدەنەیەكم لەسەر نەزر بێ و، حوشتری دەست نەكەوت و ڕەشە وڵاخێكی دەستكەوت، وەك: گا یان مانگا، ئایا لەسەری لا دەچێ؟ بە پێی قسەی مالیك و ئەبوو حەنیفە بێ، بەڵێ، بەڵام بە پێی قسەی ئیبنو مەسعوودو شافیعیی و عەطاء بێ، نەخێر، هەڵبەتە (**القرطبي**) ئەم مەسەلەیەی هێناوە[1]، دوایی ئەو ڕایە بەهێزتر دەكات كە شافیعی و عەتا و ئیبنو مەسعود و ئەوان هەڵیان بژاردوە، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە بارەی ڕۆژی جومعەوە فەرموویەتی: {**مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الجُمُعَةِ غُسْلَ الجَنَابَةِ، ثُمَّ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الأولى فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَدَنَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ، فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً**} (**أخرجه البخاري: ٨٨١، ومسلم: ٨٥٠**).

---

(١) الجامع لأحكام القرآن ج١٢، ص٥٤.

واتـە: هـەر کەسێک ڕۆژی هەینی خۆشۆردنی لەشگرانیی ئەنجام بدات، پاشان لـە کاتی یەکەمی ڕۆژی هەینی دا بچێ بۆ نوێژی جومعە، وەک بەدەنەیەکی سەر بڕیبێ (واتە: حوشترێک) و هەر کەسێک لە کاتی دووەمی دا بچێ، وەک مانگایەکی سەر بڕیبێ.

بەڵام من پێم وایە ڕای مالیک و ئەبوو حەنیفە ڕاسترە، بەڵێ ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ یش هەیە، بەڵام دەڵێین: وشەی (**بَدَنة**) ئەگەر لەگەڵ (**بقرة**)دا بەکار بێ، (**بَدَنة**)، یانی: حوشتر، (**بقرة**)ش یانی: مانگا، بەڵام ئەگەر (**بُدُنْ**) بە ڕەهایی بەکاربێ، ڕەشە وڵاخیش دەگرێتەوە، هەروەک چۆن خوا ﷻ هەندێک وشان بەکاردێنێ، ئەگەر بە بە تاککراوەیی (**منفرد**) هاتن، مانایەکەیان گشتگیر دەبێ، بەڵام ئەگەر بە جووت کردن و بە بەراورد کردن لەگەڵ وشەی دیکەدا بەکارهاتبن، ماناکەیان تەسک دەبێتەوە، بۆ وێنە:

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ ٩٠﴾النحل.

یان ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ٢﴾المائدة.

وشەی (**ٱلۡبِرِّ**) ئەگەر بە تەنیا بێ، (**التَّقْوَى**)ش دەگرێتە نێو خۆی، بەڵام کە لەگەڵ (**التَّقْوَى**)دا دێ، (**ٱلۡبِرِّ**)، واتە: چاکەکاریی، (**التَّقْوَى**) واتە: پارێزکاریی، هەروەها وشەکانی (**الإيمَان**) و (**الإسْلَام**)، وشە(**الإيمَان**) ئەگەر بە تەنیا بێ (**الإسْلَام**)یش دەگرێتە نێو خۆی، بەڵام ئەگەر (**الإيمَان**) و (**الإسْلَام**) هەردووکیان هاتن، (**الإيمَان**) یانی: حاڵەتی پەنهانی دینداریی و (**الإسْلَام**) یانی: حاڵەتی ڕواڵەتیی و ئاشکرا.

**٢- مەرجەکانی قوربانیی:** ئەم فەرموودەیە هەیە لە بارەی ئەو قوربانییەوە کە سەر دەبڕدرێ: {**عَنِ اَلْبَرَاءِ بنِ عَازِبٍ** ﷺ، **قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللهِ** ﷺ **فَقَالَ: أَرْبَعٌ لاَ تَجُوزُ فِي اَلضَّحَايَا: اَلْعَوْرَاءُ اَلْبَيِّنُ عَوَرُهَا، وَالْمَرِيْضَةُ اَلْبَيِّنُ مَرَضُهَا، وَالْعَرْجَاءُ اَلْبَيِّنُ ظَلْعُه، وَالْكَسِيرَةُ اَلَّتِي لاَ تُنْقِي**} (**أخرجه مالك: ١٠٢٤، وأحمد: ١٨٥٣٣، وأبو داود: ٢٨٠٢، والترمذي: ١٤٩٧، والنسائي: ٤٣٦٩، وابن ماجه: ٣١٤٤، والدارمي: ١٩٥٠، وابن حبان: ٥٩٢١، والحاكم: ١٧١٨، وقال: صحيح**).

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چوار سیفەت ئەگەر لە قوربانییاندا هەبن، هەر کامێکیان ببێ، بە کەڵکی قوربانیی نایەت:

**١-** ئاژەڵێک کە کوێر بێ و، کوێرییەکەی زۆر ئاشکراو ڕوون بێ.

**٢-** ئاژەڵێک کە نەخۆش بێت و، نەخۆشییەکەی زۆر دیار بێ و، لەڕو لاوازی کرد بێ.

**٣-** ئاژەڵێک شەل بێ، شەلییەکەی زۆر زەق و دیار بێ.

**٤-** ئاژەڵێک کە یەکێ لە چوار پەلەکانی شکابێ، بەشێوەیەک کە ڕێی قەڵەو بوون و بە گۆشت بوونی لێ بگرێ.

**٣- خواردن لە گۆشتی قوربانیی:** وەک پێشتر گوتم ئەمە ڕاجیایی تێدایە:

**أ)-** مالیک (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، گوتوویەتی: ڕەوایە، بەڵکو پەسندە مرۆڤ لە گۆشتی قوربانیی بخوات، بەڵام نەک قوربانییەک کە واجب بووبێ، بەڵکو ئەوەی کە وەک سوننەت سەردەبڕدرێ، بەڵام قەدەغەیە لە گۆشتی ئاژەڵێک بخورێ کە وەک قەرەبوو (فدیة) سەربڕاوە، هەروەها ئەوەی کە سزای نێچیر کوشتن بێ و، ئەوەی کە بۆ هەژارو نەداران نەزر کرابێ، نابێ ئەوانە لێیان بخورێ.

**ب)-** ئەبوو حەنیفە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، دەڵێ: هەر ئاژەڵێک دروستە لێی بخورێ، کە لە حەجی (**تَمَتُّع**) و حەجی (**قِران**)دا - کە دوایی باسیان دەکەین و حەجی (**تَمَتُّع**) ئەوەیە کە ئینسان ئیحرام بە عومرە ببەستێ، عومرەکەی تەواو بکات و دوایی حەجەکەی بکات، حەجی (**قِران**)یش ئەوەیە کە نیەت بۆ هەردووکیان پێکەوە بێنێ - ئەبوو حەنیفە دەڵێ: دروستە لێیان بخورێ، بەڵام قوربانییەک کە حاجی لە کاتی ئیحرام بەستندا، لەسەر خۆی پێویست کردوە، نابێ لێی بخورێ.

**ج)-** شافیعیی (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، دەڵێ: نابێ لە گۆشتی قوربانییان بە هیچ شێوەیەک بخورێ، بە هەر جۆرێک بێ.

**د)-** ئەحمەد (ڕەحمەتی خوای لێ بێ)، دەڵێ: لە گۆشتی ئەو قوربانییانەی کە واجبن، دەخورێ، جگە لەوەی سزای نێچیر کوشتن بێ، یاخود بەهۆی نەزرو لە خۆگرتنەوە بێ.

**٤- پێناسەی (قانع):** پێشتر باسمان کرد کە (قانِع) یانی: کەسێک کە سیفەتی (**قُنُوع**)ی هەیە، ئەویش بریتیە لە ملکەچیی و داماویی و زەبوونیی پێشاندان، بەڵام قەناعەت لە: (**قَنِعَ، يَقْنَعُ، قناعة**) هاتوە و ئەوی دیکە لە: (**قَنَعَ**)ەوە.

(**الخفاجي**) گوتوویەتی:

العَبْدُ حُرٌّ إنْ قَنِعَ        وَالحُرُّ عَبْدٌ إنْ قَنَعَ
فَاقْنَعْ ولاَ تَقْنَعْ فَمَا        شَيءٌ يشِينُ سِوَى الطَّمعِ

واتە:

کۆیلە ئازادە ئەگەر قەناعەت بکات
بەڵام ئازاد کۆیلەیە ئەگەر زەبوونیی پێشانبدا

قەناعەتت هەبێ و زەبوونیی پێشان مەدە
هیچ شت مرۆڤ ناشیرین ناکات جگە چاوبرسیەتیی

**٥- پێغەمبەر چۆن قوربانیی سەربڕیوە؟:** جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لێیان ڕازی بێ، باسی ئەوەی کردوە، کە پێغەمبەر ﷺ چۆن قوربانییەکانی سەر بڕیوە: {**عَنْ جَابِرٍ أَنَّ الْبُدْنَ الَّتِي نَحَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَانَتْ مِائَةَ بَدَنَةٍ نَحرَ بِيَدِه ثَلاَثًا وَسِتِّينَ وَنَحَرَ عَلِيٌّ مَا غَبَرَ، وَأَمَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ ثُمَّ شَرِبَ مِنْ مَرَقِهَا**} (**أخرجه أحمد: ١٤٥٨٩ تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح**).

دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ سەربڕگە {ئەو شوێنەی لێی سەر دەبڕدرێ، کوشتارگە} و، بە دەستی خۆی، شەست و سێ (٦٣) حوشتری سەربڕی، دوایی چەقۆ گەورەکەی دایە دەست عەلی ئەوانەی کە مابوون {لەو سەد (١٠٠) حوشترە، کە دەکاتە (٣٧)} ئەویش ئەوانی سەربڕی، پێغەمبەر فەرمانی کرد

لەهەر حوشترێك پارچە گۆشتێك بخرێتە مەنجەڵێکەوە، دوایی لە گۆشتاوەکەی خواردەوە.

**٦- مامەڵەی دروست لەگەڵ گۆشتی قوربانیی دا:** لەو بارەوە کە ئایا دروستە ئەو قوربانییانەی دەهێنرێن، ئەگەر بزانی خەسار دەبن و، گۆشتەکەیان بۆگەن دەبێ، ئایا دروستە ئەو قوربانییانە هەڵبگیرێن بۆ کاتێکی دیکە؟

لەو بارەوە ڕاجیایی هەیە، بەڵام وەک: (**محمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا دەڵێ: {**يُفْعَلُ ما هو أَنْفَعُ للفُقَرَاء**} دەبێ ئەوە بکرێ کە بۆ هەژاران باشترە، قوربانییەکان دانراون لە شوێنی خۆیان، بەڵام مەرج نیە هەر هەمان ڕۆژ سەر ببڕدرێن، بەڵکو دەگونجێ بهێڵدرێنەوە بۆ کاتێکی دیکە، بۆ ئەوەی ئەو گۆشتە هەمووو بەسەریەکدا نەترشێ.

**٧- تێهەڵسووونی خوێن لە دەرو دیوار:** تێهەڵسوونی خوێن لە دارو دیواری کەعبە لە سەردەمی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و، بت پەرستەکاندا هەبووە و، خوای پەروەردگار ئەوەی قەدەغە کردوە، هەروەها سووتاندنی قوربانییەکان لە نێو جوولەکەکاندا و، لە نێو زۆرێک لە گەلاندا هەبووە، کە شتێکیان کردۆتە قوربانیی، گوتوویانە: دەبێ بیسووتێنین، چونکە تایبەت بۆ خوایە و، نابێ هیچ کەس لێی بخوات، ئەوانە هەموویان عادەتی سەردەمی نەفامیی و بتپەرستەکانن.

هەر بۆیە خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا ﴾، یانی: نە خوێنەکەی لە دارو دیوار هەڵسوون و، نە گۆشتەکەشی بسووتێنن، بەڵکو بۆ خۆتان لێی بەهرەمەند بن، چونکە ئەوەی دەگاتە خوا ﷻ و ئەوەی جێی سەرنجی خوایە، بریتیە لەو تەقوایەی کە لە دڵ و دەروونتاندا هەیە.

## کورتە باسێک لە بارەی حەج و عومرەوە

لێـرەدا کورتـە باسـێک لـە بـارەی حـەج و عومـرەوە دەخەینـە ڕوو، ڕاسـتەوخۆ لـە مەوسـووعەی: (خواپەرسـتیی ئیسـلامیی لەبـەر ڕۆشـنایی قوڕئـان و سـوننەتدا)[1] وەریدەگریـن، مـەرج نیـە کـت ومـت هەمـووی، بەڵکـو بـە پوختکردنـەوەوە.

ئەو کورتە باسەش لەم نۆزدە (١٩) بڕگەیەدا دەخەینە ڕوو:

١)- پێناسەی حەج و عومرە.

٢)- پلەو پایەی حەج و عومرە.

٣)- حوکمی حەج و عومرە.

٤)- جۆرەکانی حەج و عومرە.

٥)- مەرجەکانی حەج و عومرە.

٦)- حەج کردنی ئافرەت.

٧)- کاتەکانی ئیحرام بەستن بە حەج و عومرە.

٨)- شوێنەکانی ئیحرام بەستن بە حەج و عومرە.

٩)- کردەوەکانی حەج.

١٠)- پایەکانی حەج.

١١)- فەرزەکانی حەج.

١٢)- پایەو فەرزەکانی عومرە.

١٣)- ئەو شتانەی لە ماوەی ئیحرامدا قەدەغەن.

---

(١) بەرگی ٤، لاپەڕە: (١٤٥ - ٣٣٣)، چاپی دووەم.

**١٤)**- ئەو شتانەی لە ماوەی ئیحرامدا ڕەوان (مباح)ن.

**١٥)**- چۆنیەتیی ئیحرام شکاندن.

**١٦)**- چۆنیەتیی حەجیماڵئاوایی پێغەمبەر ﷺ **(حجة الوداع)**.

**١٧)**- چۆن حەج و عومرە ئەنجام دەدەی؟

**١٨)**- بەرهەم و سوودەکانی حەج و عومرە.

**١٩)**- دوا قسەم لە بارەی حەج و عومرەوە.

شایانی باسە: کاتێ خۆی لە ساڵی (١٩٩٩)ز دا، ئەم مەوسووعەیەم: (خواپەرستیی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا)، لە چوار بەرگدا نووسیومە و، ئەم باسەش کە لە بارەی حەج و عومرەوە لە نۆزدە (١٩) برگەدا، دەیخەمە ڕوو، لە کۆمەڵێک سەرچاوە بەهرەم وەرگرتوە[1]، کە لە پەراوێزدا دەیاننووسم.

---

(١) لێرەدا هەم ناوی سەرچاوەکان و، هەم ژمارەی بەرگ و لاپەڕەکانیان دەخەمەڕوو:
١- (كتاب الموطأ للإمام مالك، كتاب الحج)، لاپەڕەكانی: (٢٦٠ - ٢٧٣).
٢- (المغني والشَّرح الكبير)، بەرگی: (٣)، لاپەڕەكانی: (١٥٩ - ٥٩١).
٣- (المجموع شرح المهذب، للنووي)، بەرگی: (٧) هەمووی، هەروەها بەرگی: (٨)، لاپەڕە: (٣١٨).
٤- (شرح صحيح مسلم للنووي)، بەرگەكانی: (٥ و ٦)، لاپەڕەكانی: (٣١٥٥ - ٣٧٢٥).
٥- (أحكام القرآن لابن العَرَبي)، بەرگی: (١)، لاپەڕەكانی: (١٦٧ - ٢٠٢).
٦- (الجامع لأحكام القرآن للقرطبي)، بەرگی: (١)، لاپەڕەكانی: (٦٦٠ - ٧١٥) و، بەرگی: (٢)، لاپەڕەكانی: (١ -- ١٤).
٧- (مجموع الفتاوى لابن التيمية)، بەرگی: (٢٨) هەمووی.
٨- (زاد المعاد في هدي خير العِباد، لابن القيم)، بەرگی: (١)، لاپەڕەكانی: (١٧١ - ٢٤٧).
٩- (المُحَلَّى شرح المُجَلَّى لابن حزم الأندلسي)، بەرگی: (٧)، لاپەڕەكانی: (١ - ٢٠٩).
١٠- (بداية المجتهد لابن رشد)، بەرگی: (١)، لاپەڕەكانی: (٣٣٠ - ٣٩٦).
١١- (فتح الباري لابن حجر العسقلاني)، بەرگی: (٤)، لاپەڕەكانی: (١٥٢ - ٥٩١).
١٢- (سُبلُ السلام شرح بلوغ المرام)، بەرگی: (٢)، لاپەڕەكانی: (٩١٩ - ١٠١٢).
١٣- (العُدَّة على الأحكام، شرح العمدة)، بەرگی: (٣)، لاپەڕەكانی: (٢٧٥ - ٤٢٧).
١٤- (الرَّوضَة النَّدية شرح الدُّرَر البَهيَّة)، بەرگی: (١)، لاپەڕەكانی: (٣٥٦ - ٤٠٨).

## ا)- پێناسەی حەج و عومرە:

### أ)- لە ڕووی زمانەوانییەوە:

تێکڕای زانایانی زمان لەسەر ئەوە پێکهاتوون، کە وشەی (**الحَج**) کە بە (**حَج**) و (**حِج**) دەبێژرێ، لە ئەسڵی زمانی عەرەبیی دا، بە مانای جێی مەبەست (**قَصْد**) دێ، هەندێکیشیان بۆ وێنە: (**خليل بن أحمد الفراهِيدي**)، وشەی (**حَجّ**) یان بە: (**كَثْرَةُ القَصْدِ إلى مُعَظَّم**)، واتە: زۆر ڕوو کردنە شتێکی بە مەزنگیراو، مانایان کردوە و، ئەوە بە نسبەت (**الحَجّ**)ەوە.

وشەی (**العُمْرَة**)ش لە ئەسڵی زماندا، بە مانای سەردان و زیارەت دێ.

### ب)- لە زاراوەی شەرعدا:

**یەکەم:** (**الحَجّ**) بە چەند جۆرێک پێناسە کراوە، کە لە نێوەڕۆکدا دەبنەوە یەک، (**فتح الباري**) هەروەها (**شرح صحيح مسلم**)، کە یەکەمیان هی: (**إبن الحجر العسقلاني**) و دووەمیان هی: (**النووي**)یە، بەم شێوەیە وشەی (**الحَج**)یان لە زاراوەی شەرعییدا مانا کردوە: (**القَصْدُ إلى البَيْتِ الحَرَام بِأعْمَالٍ مَخْصُوصَة**)، واتە: ڕوو تێکردنی ماڵی حەرام (کەعبە) بە چەند کردەوەیەکی تایبەت، هەروەها هەندێکیان ئاوایان پێناسە کردوە، کە لەو دوو سەرچاوەی پێشوودا هاتوە: (**الحَجُّ: قَصْدُ مَوْضِع مَخْصُوصٍ وَهُوَ البَيْتُ، بِصِفَةٍ مَخْصُوصَةٍ، فِي وَقْتٍ مَخْصُوصٍ،**

---

١٥- (الأدلَّة الرضيَّة)، لاپەڕەکانی: (١٤٠ - ١٦٢).

١٦- (الفقه على المذاهب الخسمة، لِمحمد جواد مُغْنية)، لاپەڕەکانی: (١٨٩ - ٢٨٨).

١٧- (فقه السنة، للسيد سابق)، بەرگی: (١)، لاپەڕەکانی: (٦٢٣ - ٧٨١).

١٨- (المفصَّل فِي أحكام المرأة والبيت المسلم، للدكتور عبدالكريم زيدان)، بەرگی: (٢)، لاپەڕەکانی: (١٤٧ - ٤٦٠).

١٩- (الفقه الإسلامي وأدلته، للدكتور وهبة الزحيلي)، بەرگی: (٣)، لاپەڕەکانی: (٢٠٦١ -- ٢٤١٦).

٢٠- (الوجيز فِي فقه السنةِ والكتاب العزيز، تأليف عبدالعظيم بن بدوي)، لاپەڕەکانی: (٢٢٩ -- ٢٧٦).

٢١- (فتاوى مُهمَّة تتعلق بالحج والعمرة، للشيخ عبدالعزيز بن عبدالله بن باز). ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ و خوا پاداشتیان بداتەوە و پایەوپلەیان هەردەم بەرز بکاتەوە.

بِشَرائِطَ مَخْصُوصةٍ)، واتە: (حَجّ) بریتیە لە مەبەستێکی تایبەت، ڕوو کردنە شوێنێکی تایبەت کە کابەیە، بە شێوەیەکی تایبەت و، لە کاتێکی تایبەتدا و، بە چەند مەرجێکی تایبەت.

**دووەم:** (عومرە): سەردانی ماڵی خوایە، بە ئیحرام بەستن و، سووڕانەوە بە دەوری کەعبەداو، هاتن و چوون لە نێوان صەفاو مەڕوەداو، تاشینی قژی سەر یان کورت کردنەوەی[1].

بە کورتیی: هەر کام لە حەج و عومرە، لە زاراوەی شەرعدا: بریتین لە سەردانی ماڵی خوا کە کەعبەیە (**بَيْتُ اللهِ الحَرَام**) و، هەر کامێکیان لە چەند پایەو فەرزو سوننەتێک پێک دێن، ئەوەندە هەیە حەج چەند ئیمتیازێکی بەسەر عومرەدا هەن، کە گرینگترینیان ڕاوەستانە لە عەرەفات، کە پایەو کۆڵەکەی سەرەکیی حەجە، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**الحَجُّ عَرَفَةُ**} (**أخرجه أحمد: ١٨٧٩٦، وأبو داود: ١٩٤٩، والترمذي: ٨٨٩، والنسائي ٣٠٤٤، وابن ماجه: ٣٠١٥**).

واتە: حەج عەرەفەیە، یانی: وەستان لە عەرەفات.

لەگەڵ هەندێک تایبەتمەندیی دیکەدا، کە شەو مانەوە لە موزدەلیفەداو، شەو مانەوە لە میناو، وردە بەرد هاویشتنەکانن.

## ٢)- پلەو پایەی حەج و عومرە:

هەم خوا ﷻ و، هەم پێغەمبەری سەروەریشمان ﷺ، لە زۆر دەقی قورئان و سوننەتدا، باسی حەج و عومرەو پایەو فەرزو سوننەتەکانیان کردوون و، بەرزیی پلەو پایەیان و، گەورەیی و خێرو پاداشتی ئەنجامدەرانیان خستۆتە ڕوو، کە ئێمە هەر بۆ نموونە، چەند ئایەتێک و چەند فەرموودەیەک دێنین:

### أ- چەند ئایەتێک:

١- خوا ﷻ لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ ١٩٦﴾، واتە: حەج و عومرە بە تەواویی ئەنجام بدەن (یان: تەواویان بکەن) بۆ خوا.

---

(١) المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم، لعبد الكريم زيدان، وفقه السنة، للسيد سابق.

**٢-** لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا دەفەرمویٚ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾﴾، واتە: بۆ خوا ﷻ لەسەر خەڵک پێویستە، سەردانی ماڵی خوا بکەن، بۆ هەر کەسێک کە دەتوانێ، هەر کەسێکیش بێبڕوا بێ، خوا بێنیازە لە جیهانییان.

بۆیە هەندێک لە زانایان کە گوتوویانە: چۆن بە نەکردنی نوێژ مرۆڤ کافر دەبێ و، بە زەکات نەدان کافر دەبێ، بە حەج نەکردنیش کافر دەبێ، ئەم ئایەتەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە، کەسێک لە توانایدا هەبێ و بە ئەنقەست نەیکات، ئەوە ڕای هەندێک لە زانایانە.

**٣-** هەروەها لە سووڕەتی (**الحج**)یشدا، خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾﴾، واتە: جاڕ بە نێو خەڵکیدا بدە، بۆ حەجێ بێن، بە پێیان و بە سواریی هەر وڵاخێک کە سکی بە پشتیەوە نووساوەتەوە، لە هەر ڕێیەکی دوورو قووڵەوە با بێن.

### ب- چەند دەقێکی سوننەت:

پێغەمبەر ﷺ لە بارەی پلە وپایەی حەج و عومرەوە فەرمایشتی زۆرن، بۆ وێنە:

**١-** {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: إِيمَانٌ بِاللهِ وَرَسُولِهِ، قِيلَ: ثُمَّ ماذا؟ قَالَ: الْجِهادُ فِي سَبيلِ اللهِ، قِيلَ: ثُمَّ ماذا؟ قَالَ: حَجٌّ مَبْرورٌ**} (**أخرجه أحمد: ٧٥٨٠، والبخاري: ١٤٤٧، ومسلم: ٨٣، والترمذي: ١٦٥٨، والنسائي: ٣١٣٠، وابن حبان: ٤٥٩٨**).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرا: چ کردەوەیەک چاکترە؟ فەرمووی: بڕوایەکی پتە و بە خواو پێغەمبەرەکەی، گوترا: ئەدی دوای ئەو؟ فەرمووی: تێکۆشان لە پێناوی خوادا، گوترا: ئەدی دوای ئەو؟ فەرمووی: حەجێکی تێر و تەواو.

**٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ حَجَّ فَلَمْ يَرْفُثْ، وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ} (أخرجه أحمد: ٧٣٧٥، والبخاري: ١٤٤٩، والترمذي: ١٦٥٨، والنسائي: ٢٦٢٧، وابن ماجه: ٢٨٨٩، وابن حبان: ٣٦٩٤).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: هەر کەسێ حەجێک بکات، (تێیدا) قسەی بێ جێ نەکات و، کرداری ناشایستە نەکات، ئەو ڕۆژە کە دەگەڕێتەوە، وەک تازە لە دایک بووبێ، ئاوا دەگەڕێتەوە.

واتە: چڵکی گوناهانی پێوە نامینێ، پاک و چاک دەبێ.

**٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ}، (أخرجه مالك: ٧٦٧، وأحمد: ٩٩٤٩، والبخاري: ١٦٨٣، والترمذي: ٩٣٣، والنسائي: ٢٦٢٩، وابن ماجه: ٢٨٨٨، وابن حبان: ٣٦٩٦).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: عومرە تاکو عومرە، نێوان خۆیان دەسڕنەوە، حەجی تێرو تەواویش جگە لە بەهەشت، پاداشتێکی دیکەی نیە.

**٤- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ! نَرَى الجِهَادَ أَفْضَلَ العَمَلِ، أفلا نُجَاهِدُ؟ قَالَ: لَكُنَّ أَفْضَلُ الجِهَادِ: حَجٌّ مَبْرُورٌ}، (أخرجه البخاري: ١٥٢٠).**

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ دەبینین، جیهاد چاکترین کردەوەیە، ئایا ئێمەش جیهاد نەکەین (وەک ئافرەتان)؟ فەرمووی: بۆ ئێوەی ئافرەت حەجی تێرو تەواو، لە جیهاد چاکترە.

**٥- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: عُمْرَةٌ فِي رَمَضَانَ تَعْدِلُ حَجَّةً، أَوْ حَجَّةً مَعِي} (أخرجه البخاري: ١٨٦٣، ومسلم: ١٢٥٦).**

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: عومرەیەک لە مانگی ڕەمەزاندا، بارتەقای حەجێکە، یاخود حەجێکە لەگەڵ مندا.

**٦- {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ} (أخرجه مسلم: ١٣٤٨، والنسائي: ٣٠٠٣، وابن ماجه: ٣٠١٤، وابن خزيمة: ٢٨٢٧).**

واتـە: عائیشـە (خـوا لێـی ڕازیبـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: لـە هیـچ ڕۆژێكـدا، خـوا بەنـدەكان لـە سـزای ئاگـر ئـازاد نـاكات، زیاتـر لـەوەی لـە ڕۆژی عەرەفـەدا ئازادیـان دەكات.

## ٣)- حوكمی حەج و عومرە:

### أ/ حـوكمـی حـــەج:

حـەج یەكێكـە لـە پێنـج پایەكانـی ئیسـلام و، زانایـان لەسـەر ئـەوە یـەك دەنگـن، كـە لەسـەر هـەر مسـوڵمانێكی عاقـڵ و باڵـغ و ئـازاد و خـاوەن توانـا، فـەرزی عەینـە، چونكـە دەقەكانـی قورئـان و سـوننەت لـەو بـارەوە زۆرن و ڕاشـكاون، هەروەهـا زانایانیـش لەسـەر ئـەوە یـەك دەنگـن، كـە ژن و پیـاو تێیـدا یەكسـانن و، لـە تەمەنیشـدا یەكجـار فـەرزە، لـەو بـارەوە فەرمـوودە زۆرن، ئێمـە پێشـتر ئایەتەكانمـان هێنـان، بـۆ وێنـە:

١- لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾﴾، واتە: بۆ خوا لەسەر خەڵك پێویستە كە سەردانی ماڵ {ماڵی خوا} بكەن {كە كەعبەیە} بۆ كەسێك كە بتوانێ، بۆی بچێ و بیگاتێ و، هەر كەسێكیش بێبڕوا بێ، خوا لە جیهانییان بێنیازە.

٢- هەروەها لە سووڕەتی (**البقرة**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ﴿١٩٦﴾﴾، واتە: حەج و عومرە بە تەواویی ئەنجام بدەن، ئەوە مانایەكیەتی، مانایەكی دیكەی ئەوەیە: حەج و عومرە كە دەستتان پێكردن، تەواویان بكەن.

هەروەها ئەم دوو فەرموودەیەی خوارەوەش دێنین:

**١- {عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بُنِيَ الإسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ البَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ} (أخرجه البخاري: ٨، ومسلم: ١٦).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئیسلامەتیی لەسەر پێنج پایان بنیات نراوە: شایەدیی دان بەوە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە و، موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە و، نوێژ بەرپاکردن و، زەکات دان و، حەجی ماڵی خوا و، ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان.

کە دەفەرموێ: (**بني الإسلام**)، واتە: مسوڵمانەتیی شەخصیی، لەسەر ئەو پێنج پایە بنیات نراوە، بۆ ئەوەی بزانین کەسێک مسوڵمانە یان نا؟ تەماشا دەکەین بزانین شایەتمان دێنێ، کە ئەوە تەعبیرکردنە لە ئیمان و عەقیدەکەی، ئنجا تەماشا دەکەین: ئایا نوێژی هەیە، پێنج نوێژە فەرزەکان، هەروەها زەکاتی هەیە و، حەجی هەیە و، ڕۆژووی هەیە؟ ئەمانە پێنج پایە و دروشمەکانی مسوڵمانەتیی شەخصیین، ئەگەرنا ئەو ئیسلامە پان و پۆڕە کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، هەمووی لەو پێنج شتانەدا خوڵاصە نابێ، بەڵکو وەک تاک کەسێ بتەوێ بزانی مسوڵمانە یان نا؟ تەماشای ئەو پێنجەی دەکەی، بۆ ئیمان و عەقیدەکەی، تەماشای شایەتمانی دەکەی، بۆ شتەکانی دیکەشی پەیوەندیی لەگەڵ خوا، تەماشای نوێژی دەکەی، بۆ پەیوەندیی لەگەڵ خەڵک، تەماشای زەکاتی دەکەی، هەروەها تەماشای ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزانی دەکەی، وەک لایەنی ڕووحیی و، تەماشای حەج کردنەکەی دەکەی، بۆ کەسێک لە توانایدا هەبێ.

**٢-** فەرموودەیەکی دیکە لەو بارەوە: **{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ! قَدْ فَرَضَ اللهُ عَلَيْكُم الحَجَّ فَحُجُّوا، فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟ فَسَكَتَ،**

**حَتَّى قَالَهَا ثَلاَثًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَوْ قُلْتُ نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ} (أخرجه مسلم: ١٣٣٧).**

واتە ئەبوو هورەیرە ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێک وتاری بۆ داین، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! خوا حەجی لەسەرتان پێویست کردوە، حەج بکەن، پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! هەموو ساڵێک؟ بێ دەنگ بوو، سێ جاران دووبارەی کردەوە، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر گوتبام، بەڵێ، لەسەرتان پێویست دەبوو، نەشتاندەتوانی (هەموو ساڵێ) بیکەن.

### ب/ حوکمی عومرە:

لە بارەی عومرەوە زانایان ڕاجیاییان هەیە:

(**شافعي والثوري وأحمد وإسحاق وأبو داود الظاهري وابن عبيد**) بە فەرزیان زانیوە، وەک لەو سەرچاوانەدا کە پێشتر ئاماژەم پێدان هاتوە، هەروەها (**البخاري وابن حزم والشوكاني**)یش هەر هەمان ڕایان هەیە.

بەڵام (**أبو حنيفة وأبو الثور والنخعي**) عومرەکردنیان بە سوننەت داناوە و، هەر کام لە (**إبن تيمية والصنعاني وإبن العربي**)یش پشتگیریی ئەو ڕایەیان کردوە.

واش دێتە بەرچاو ڕای ئەوانە ڕاستتر بێ، کە عومرە بە فەرز نازانن، چونکە وەک گوتوویانە: هیچ بەڵگەیەک لەو بارەیەوە نیەو، ڕستەی: ﴿ وَأَتِمُّواْ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ١٩٦ ﴾البقرة، نابێتە بەڵگە، چونکە ڕای بەهێزتری توێژەرەوانی قورئان لەو بارەوە ئەوەیە، کە خوای پەروەردگار فەرمانی کردوە بە تەواوکردن و بە تەواویی بەجێهێنانی حەج و عومرە، پاش دەست پێکردنیان، ئەمەش بەڵگە نیە، لەسەر فەرز بوون لەسەرەتاوە.

ئنجا ئایا حەج هەروەها عومرە لەسەر ڕای ئەوانەی کە دەڵێن: فەرزن، ئایا پێویستە دەستبەجێ (**فوراً**) ئەنجام بدرێن، یان بە لەسەرخۆ و کاوەخۆ (**التراخي**)؟

زانایـان لـەو بـارەوە ڕاجیاییـان هەیـە: (**أبـو حنیفـة ومالـك وأحمـد ویوسـف**) و هەندێـک لـە هاوەڵانـی شـافیعیی ڕایـان وایـە، پێویسـتە دەسـتبەجێ ئەنجام بـدرێ.

بـەڵام (**شـافعي والأوزاعـي والثـوري ومحمـد بـن حسـن**) ڕایـان وایـە، ئەگـەر بـە کاوەخـۆش ئەنجـام بـدرێ، مـادام پێـش مـردن ئەنجـام بـدرێ، ئـەو کەسـە گوناهبـار نابـێ.

بـەڵام وا پێدەچـێ ڕای یەکـەم بەهێزتـرو چاکـتر بـێ، چونکـە وێـڕای هەبوونـی چەنـد دەقێکـی سـوننەت، دووربینیشـی تێدایـە، هیـچ کەسـیش نازانـێ تـا سـبەینێ چـی بەسـەر دێ.

ئـەم دەقـەش بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە حـەج و عومـڕە پێویسـتە دەسـتبەجێ ئەنجـام بدرێـن، بـە تایبەتـی حـەج: {**عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِي اللـه عَنْهُـمَا، أَنَّ رَسُـولَ اللـه ﷺ قَـالَ: مَـنْ أَرَادَ الْحَـجَّ فَلْيَتَعَجَّـلْ، فَإِنَّـهُ قَـدْ يَمْـرَضُ الْمَرِيـضُ، وَتَضِـلُّ الرَّاحِلَـةُ، وَتَعْـرِضُ الْحَاجَـةُ**} (**أخرجـه أحمـد: ٣٣٤٠، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: صحيـح**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لێیـان ڕازیبـێ)، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: هـەر کەسـێک ویسـتی حەجێـک بـکات، بـا پەلـە بـکات، چونکـە ئینسـان نەخـۆش دەبـێ و، وڵاخ {یـان وەسـیلەی سـواریی} بـزر دەبـێ و، ئیـش و کاری دیکـەی دێتـە پێـش.

## ٤)- جۆرەکانی حەج و عومڕە:

تێکـڕای زانایـان لەسـەر ئـەوە یـەک دەنگـن، کـە جۆرەکانـی حـەج سـیانن و هـەر سێکیشـیان دروسـتن، کـە ئەمانـەن:

١- (**إِفْرَاد**) تاککردنەوە، کە بریتیە لەوەی لە پێشدا، ئیحرام بە حەج ببەسترێ و کارەکانی حەج تەواو بکرێن، دوایی عومڕە بکرێ.

٢- (**تَمَتُّع**) بەهرە وەرگرتن، کە بریتیە لەوەی لە مانگەکانی حەجدا، عومرە بکرێ، پاشان ئیحرام بشکێنرێ و، دوایی دووبارە ئیحرام بە حەج ببەسترێ و، حەجەکەش ئەنجام بدرێ.

٣- (**قِران**) جووتکردن، کە بریتیە لەوەی لە یەک کاتدا، وێکرا ئیحرام بە حەج و عومرە ببەسترێ و پێکەوە ئەنجام بدرێن.

بەڵام دوای ئەوەی زانایان لەسەر ئەوە یەک دەنگن کە هەر سێکیان دروست و ڕەوان، لەسەر ئەوەی کامیان باشترن؟ ڕاجیاییان هەیە:

أ- هەندێکیان کە شافیعییەکان و مالیکییەکانیان لە نێودان، ڕایان وایە کە تاککردنەوەی حەج (**إفْرَاد**) چاکترە.

ب- هەندێکیشان کە حەنەفییەکانیان لە نێودان، جووتکردنی حەج و عومرە (**قِران**) بە چاکتر دەزانن.

ج- هەندێکیشان کە حەنبەلییەکانیان لە نێودان، جۆری (**تَمَتُّع**) لە هەموویان بە چاکتر دادەنێن.

شیعەی ئیمامییەش ڕایان وایە کە هەر کەسێک (٤٨ میل) لە مەککەوە دوور بێ، مەگەر زۆر ناچار بێ، ئەگەرنا جۆری (**تَمَتُّع**) نەبێ، هیچ جۆرێکی دیکەی حەج کردنی بۆ نیە، بەڵام شایانی باسە کە: هەر کام لە جۆری (**تَمَتُّع وقِران**) لەسەر خاوەنەکانیان خوێن پێویست دەبێ، کە سەربڕینی مەڕێکە یان بزنێکە، یان یەک لەسەر حەوتی ڕەشە وڵاخێک، یان حوشترێکە، ئەگەر نەیبوو، پێویستە دە (١٠) ڕۆژان بەڕۆژوو بێ، سێیان لە کاتی حەجدا و، حەوتیشیان دوای گەڕانەوەی.

چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْيِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ﴿١٩٦﴾ ﴾ البقرة، واتە:

هەر کەسێک عومرەی کرد و، دوایی ئیحرامی شکاند، ئنجا ئیحرامی بە حەج بەستەوە، پێویستە ئەوەندەی بە دەستیەوە دێ، قوربانیی سەر ببڕێ و هەر کەسێک نەیبوو، سێ ڕۆژان لە حەجێ دا بەڕۆژوو بێ و، حەوت ڕۆژیش کە گەڕایەوە، ئەوە دە (١٠) ڕۆژی تەواو.

## ٥)- مەرجەکانی حەج و عومرە:

بەڕای تێکڕای زانایان مەرجەکانی حەج و عومرە، پێنج (٥)ن، دەبێ ئەو کەسەی حەج و عومرە ئەنجام دەدات، ئەو پێنج مەرجەی تێدابن:

١- مسوڵمان بوون.

٢- عاقڵ بوون.

٣- باڵغ بوون.

٤- ئازاد بوون.

٥- بۆ لوان و بۆ گونجان (توانا هەبوون).

ئنجا ئەم مەرجانەش دەبنە سێ بەش:

١- مەرجی فەرز بوون و دروست بوون، ئەگەر وانەبێ نە لە سەری فەرز دەبن، نە بۆی دروست دەبن، کە بریتین لە مسوڵمان بوون و عاقڵ بوون، چونکە حەج لەسەر بابای کافرو شێت، نە فەرز دەبێ، نە ئەگەر ئەنجامیشی بدات، دروستە.

٢- جۆری دووەمی مەرجەکان کە مەرجی فەرز بوون و بۆ بەرکەوتن **(إجزاء)**، کە باڵغ بوون و ئازادبوونن، بەڵام مەرجی دروست بوون واتە: وەبەرکەوتن نین، چونکە منداڵ و کۆیلەش حەجەکەیان دروستە، یانی: ئەو دووە کە بریتین لە باڵغ بوون و ئازاد بوون، مەرجی فەرز بوونن، هەروەها بۆشی وەبەردەکەون، بەڵام مەرجی دروست بوون نین، چونکە منداڵ و کۆیلەش ئەگەر حەج و عومرە بکەن، بۆیان دروستە، بەڵام کەلێنی فەرزی

حەجیان بۆ ناگرێ و، هەر کاتێ کۆیلە ئازاد بوو، دەبێ حەجێ بکاتەوە، منداڵەکەش کە باڵغ بوو، دەبێ حەجی فەڕز بکات، ئەگەرنا هەر خێری دەگاتێ و، خێرەکەشی بۆ خۆی و بۆ دایک و باوکیشی دەبێت.

٣- جۆری سێیەمی ئەو مەرجانە، بریتیە لە مەرجی فەڕز بوون، ئەویش توانا هەبوون و بۆ لوانە (إسْتِطَاعَة)، چونکە کەسێک توانای نیەو بۆی نالوێ حەج بکات، ئەگەر خۆی ماندوو کردو هەرچوو بۆ ئەوێ و حەجی کرد، ئەوە حەجەکەی دروستەو بەردەکەوێ و، حەجیشی لەسەر لادەچێ، بەڵام ئەگەر نەچێ، مادام لە توانایدا نیەو بۆی هەڵناسووڕێ، گوناهبار نیە، بەڵام ئەگەر هەرچۆنێکی بێ خۆی گەیاندە ئەوێ، حەجەکەی دروستەو لەسەریشی لادەچێ.

هەر کام لەو پێنج مەرجەش بەڵگەی خۆیان هەیە، بۆ وێنە:

مەرجی یەکەم: لە بارەی ئەوەوە بابایەک کە حەج و عومرە دەکات، دەبێ مسوڵمان بێ، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يُؤۡمِنُواْ فَأَحۡبَطَ ٱللَّهُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ١٩﴾الأحزاب، واتە: ئەوانە ئیمانیان نەهێناوە، خوا ﷻ کردەوەکانی هەڵوەشاندوونەوە، واتە: بەبێ ئیمان، کردەوەی چاک جێ ناگرێ و قبووڵ نابێ.

مەرجی دووەم و سێیەم: کە عاقڵ بوون و باڵغ بوونن، بەڵگەکەیان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنْ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنْ الصَّبِيِّ حَتَّى يَشِبَّ، وَعَنْ الْمَعْتُوهِ حَتَّى يَعْقِلَ} (أخرجه أبو داود: ٤٤٠٣، والترمذي: ١٤٢٣، وقال: حسن غريب، والنسائي في الكبرى: ٧٣٤٦، وابن ماجه: ٢٠٤٢، والحاكم: ٨١٧٠، عَنْ عَلِيٍّ ﷺ).

واتە: قەڵەمی گوناح نووسین لەسەر سێ جۆرە کەسان هەڵگیراوە: لەسەر نووستوو هەتا بێدار دەبێتەوە و، لەسەر منداڵ هەتا دەبێتە گەنج و باڵغ دەبێ و، لەسەر شێت تاکو عەقڵی دێتەوە سەر.

مەرجی چوارەم: کە ئازاد بوونە و دەبێ کۆیلە نەبێ، ئەمیش چەندان دەقی لەسەر هەن، کە بەبێ ڕێپێدانی خاوەن و گەورەکەی، بۆی نیە بەملاو ئەولادا بڕواو سەفەری دوور بکات.

مەرجی پێنجەم: توانا هەبوون (**الإسْتِطَاعَة**)، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾البقرة، واتە: خوا ﷻ هیچ شتێک لەسەر هیچ کەس پێویست ناکات، مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەبێ، هەروەها ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴿٩٧﴾ ﴾آل عمران، لەسەر خەڵک پێویستە سەردانی ماڵەکەی خوا بکەن بۆ هەر کەسێک کە توانای هەبێ خۆی بگەیەنێتی، ئەگەر نەیتوانی لەسەری پێویست نیە.

## ٦)- حەج کردنی ئافرەت:

ئایا حەج کردنی ئافرەت جیاوازیی چییە، لەگەڵ حەج کردنی پیاودا؟

حەج و عومرەکردنی ئافرەت، جگە لەو مەرجانەی ڕابردن، زۆربەی هەرە زۆری زانایان، لەسەر بە مەرجگرتنی مەرجێکی دیکەش، ڕێککەوتوون، کە دەڵێن:

ئەگەر ئافرەت مێردی لەگەڵ نەبوو، لە سۆنگەی ئەوەوە کە مێردی نەکرد بوو، یان مرد بوو، یان لەگەڵی نەهاتبوو، پێویستە خزمێکی مەحرەمی، یان کۆمەڵە ئافرەتێکی متمانە پێکراوی لەگەڵ دا بن، ئەگەرنا حەجەکەی لەسەر پێویست نابێ، چونکە دروست نیە، بەبێ لەگەڵ بوونی مێرد، یان مەحرەمێک، یان کۆمەڵە ئافرەتێکی متمانەپێکراو، سەفەر بکات، نە بۆ حەج و نە بۆ غەیری حەجیش، مادام سەفەرەکە دوور بێ[١].

بەڵام هەندێک لە زانایان، وەک (**داود الظاهري وابن حزم**) و هەندێک لە شافیعییەکان و شیعەی دوازدە ئیمامییش، ڕایان وایە کە ئافرەت هەر کات حەجی

---

(١) ئەو سەرچاوانەی کە پێشتر ئاماژەم پێدان، زۆربەیان ئەوەیان هێناوە.

لەسەر فەرز بوو، مێردیشی نەبوو، یان هەیبوو، بەڵام لەگەڵی نەچوو، کەسی مەحرەمیشی چنگ نەکەوت لەگەڵی بچێ، ئەوە نەک هەر بۆی هەیە حەجەکەی بکات، بگرە لەسەری فەرزە بچێ و، ئەنجامی بدات، مادام ڕێ سەلامەت بێ.

ئنجا کاتی خۆی من ڕای زۆربەی زانایانم پێ بەڵگەدارترو بەهێزتر بووە، لەبەر ئەوەی گوتوومە: چەند دەقێکی لەسەرن.

بەڵام ئێستا ئەو ڕایەی دووەمم پێ بەهێزترە، چونکە دەقەکان بۆ هەل و مەرج و کاتی خۆی گوتراون، وەک من لە مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا) لە تەوەری پێنج (٥)دا، لەو بارەوە قسەم کردوە، بۆ وێنە: با تەماشا بکەین و بزانین دەقەکان چۆنن؟:

فەرموودەی یەکەم: {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: **لَا تُسَافِرُ الْمَرْأَةُ إِلَّا مَعَ ذِي مَحْرَمٍ، وَلَا يَدْخُلُ عَلَيْهَا رَجُلٌ إِلَّا وَمَعَهَا مَحْرَمٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَخْرُجَ فِي جَيْشِ كَذَا وَكَذَا، وَامْرَأَتِي تُرِيدُ الْحَجَّ، قَالَ: اخْرُجْ مَعَهَا**} **(أخرجه البخاري: ١٧٦٣)**.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئافرەت لەگەڵ مەحرەمیدا نەبێ سەفەر ناکات و، هیچ پیاوێک لێی وەژوور ناکەوێ مادام مەحرەمی لەوێ نەبێ، پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! من دەمەوێ لەگەڵ سوپایەکی ئاوا و ئاوادا دەربچم بۆ جەنگ، ژنەکەشم دەیەوێ حەج بکات، فەرمووی: لەگەڵی بڕۆ (بۆ حەج).

فەرموودەی دووەم: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: {**لاَ تُسَافِرُ الْمَرْأَةُ مَسِيرَةَ يَوْمَيْنِ لَيْسَ مَعَ زَوْجَهَا، أو ذُو مَحْرَمٍ**} **(أخرجه البخاري: ١٧٦٥)**.

واتە: ئافرەت ماوەی دوو ڕۆژان سەفەر ناکات، کە مێردەکەی لەگەڵی نەبێ و، خاوەن مەحرەمێکی لەگەڵی نەبێ (واتە: باب، برا، کوڕ... هتد).

فەرمـوودەی سـێیەم: پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: {لاَ یَحِـلُّ لامْرَأَةٍ تؤْمِـنُ بِاللـهِ وَالْیَوْمِ الآخِـرِ أَنْ تُسَـافِرَ مَسِـیرَةَ یَـوْمٍ وَلَیْلَـةٍ لَیْـسَ مَعَهَـا حُرْمَـةٌ} (أخرجـه البخـاري: ١٠٣٨).

واتـە: هـەر ئافرەتێـک بـڕوای بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هەبـێ، بـۆی نیـە بـۆ مـاوەی شـەوو ڕۆژێـک بـە سـەفەر بچـێ، مـادام خزمێکـی مەحرەمـی لەگـەڵ نەبـێ.

ئنجـا وەڵامـی ئـەو زانایانـەی کـە ڕای دووەمیـان هەیـە، کـە دروسـتە ئافـرەت (بەڵکو هەندێکیـان دەڵێـن: واجبـە لەسـەری) هـەر بچـێ بـۆ حەج، بـا مێردیشـی هەبـێ، مادام لەگەڵـی نەچـێ و، بـا مەحرەمێکیشـی دەسـت نەکـەوێ، ئەوەیـە: کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ مەبەسـتی ئـەو کاتـە و ئـەو هـەل و مەرجـە بـووە، کـە ڕێـگا ئەمیـن نەبـووە، بـەڵام ئێسـتا ئافـرەت لێـرە سـواری فڕۆکـە دەبـێ، یەکسـەر لـە جیـددە، یـان لـە مەدینـە دادەبـەزێ بـە سـەلامەتیی و، خەڵکـی دیکەشـی لەگـەڵ دایـە و، لەوێـش دەچێتـە هوتێـل و، هەمـوو پێکـەوەن، هیـچ مەترسـییەکی لەسـەر نیە، ئێسـتا جیایـە و، پێغەمبەر ﷺ ئـەو فەرموودانـەی فەرموونـی، دەبـێ تەماشـا بکـەی، لـە چ کاتێکـدا فەرموویـنـی؟!

ئـەو کاتـە کـە ڕێـگا ئەمیـن نەبـووە، بـە بـارو سـوار چـوون، بـە پێیـان چـوون، بـە ڕێـی مەترسـییداردا چـوون، ئەگـەری هەبـووە ڕێگـر هەبـێ، ئەگـەری هەبـووە لـە تینـووان و لـە برسـان بمـرن، دزو جەردەیـان بێتـە ڕێ، بـەڵام ئێسـتا ئـەو ئەگەرانـە هیچیـان نەمـاون.

کەواتـە: دەبـێ فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەر ﷺ وەک خـۆی مەبەسـتی بوون، ئـاوا لێیان تێبگەیـن و، شـتێکی کـە بـۆ کاتێـک فەرمـووە، دەبـێ لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو هـەل و مـەرج و بارودۆخـەدا کـە بـۆی فەرمـووە، تەماشـای بکەیـن، ئنجـا وێـڕای ئـەو بەڵگـە عەقڵییـە، ئـەم بەڵگـە نەقڵییـەش هەیـە لەوبـارەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ:

{وَاللـهِ لَیُتِمَّـنَّ اللـه هَـذَا الأَمْـر حَتَّـى تسـیر الظَّعینـةُ مِـنْ صَنْعَـاءَ إِلَى حَضْرَمـوتَ لاَ تَخَافُ إِلاَّ اللـهَ والذِّئـب عَـلَى غَنَمِهـا، وَلَکِنَّکُـم تَسْـتَعْجِلُونَ} (أخرجـه أحمـد: ٢١٠٩٥، والبخـاري: ٣٤١٦، وأبـو داود: ٢٦٤٩، والنسـائي في الكـبرى: ٥٨٩٣).

واتـە: بەخـوا خـوا ئەم ئایینـە تەواو دەكات و سـەقامگیری دەكات، تاكـو كەژاوەدارێك (ئافرەتێـک) لـە صەنعـاوە دەچـێ بـۆ (**حَضْرَمـوتَ**) بێجگـە لـە خـوا لـە كـەس ناترسـێ، مەگـەر ترسـی گورگیشـی هەبـێ لـە مەڕەكـەی، بـەڵام ئێـوە پەلـە دەكـەن.

لێـرەدا باسـی ئافرەتێـک دەكات چونكـە (**ظَعِينَةً**) بە ئافرەتێـک دەگوترێ: كـەژاوەدار بـێ و لەسـەر پشـتی وشـتر بـێ، واتـە: دروسـتە ئافرەتێـک بـە تەنیـا لـە صەنعـاوە بچـێ بـۆ (**حَضْرَموتَ**)، مـادام ڕێ ئەمیـن و ئەمـان بـێ، باسـی مەحرەمیشـی نەكـردوە.

## ٧)- كاتەكانی ئیحرام بەستن بە حەج و عومرە:

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ۝١٨٩﴾ البقـرة، واتـە: دەربـارەی مانگـەكان (دەركەوتنـی مانگـی یـەک شـەوەو دوو شـەوەو سـێ شـەوەو تاكـو پـازدەو، دوایـی كـەم دەكات) لێـت دەپرسـن، بڵـێ: ئەوانـە كاتـی دیارییكـراون بـۆ خەڵـک، كـە حـەج و خواپەرسـتییەكانیان تێدا ئەنجام بـدەن.

زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان ڕایـان وایـە، كـە مانگەكانـی حـەج تێدا كـردن، بریتین لـە: (**شـوال و، ذي القَعِـدَة**) و، دە (١٠) ڕۆژی سـەرەتای مانگـی (**ذي الحجـة**)، هـەر كام لـە (**أبـو حنيفـة والشـافعي وأحمـد والنخعـي والثـوري وأبـو الثـور وداود الظاهـري**)، لـە نێـو ئـەو زانایانـەدان كـە ڕایـان وایـە، ئەوەنـدە هەیـە، (**الشـافعي والنخعـي والثـوري وأبـو الثـور وداود الظاهـري**)، ڕایـان وایـە كـە ڕۆژی دەیـەم كـە ڕۆژی قوربانیـی سـەربڕین (**یـوم النحـر**) و، ڕۆژی جەژنـە، كاتـی حـەج نیـە و تەنیـا شـەوەكەی هـەوە، بـەڵام ئەوانـی دیكـە دەڵێـن: ڕۆژەكـەو شەوەكەشـی كاتـی حەجـە.

(**مالیك**)یـش ڕای وایـە كـە وێـڕای (**شـوال و ذي القعـدة**)، سـەرجەم مانگـی (**ذي الحجـة**)ش كاتـی حـەج تێـدا كردنـە.

واش پێدەچـێ ڕای ئەوانـە بەهێزتـر بـێ كـە دەڵێـن: لە غەیـری مانگەكانـی حەجدا، ئیحـڕام بـە حـەج دانامـەزرێ، چونكـە بوخاریـی هێناویەتـی: {**قَالَ ابْنُ عُمَر رَضِيَ اللهُ**

**عَنْهُمَا، أَشْهُرُ الْحَجِّ: شَوَّالٌ وَذُو الْقَعْدَةِ وَعَشْرٌ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ، وَقَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: مِنَ السُّنَّةِ أَلَّا يُحْرَمَ بِالْحَجِّ إِلَّا فِي أَشْهُرِ الْحَجِّ}** (**أخرجه: البخاري ١٦٠٣**).

واتە: ئیبنو عومەریش (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گوتوویەتی: مانگەکانی ئیحرام تێدابەستنی حەج بریتین لە: (**شَوَّالٌ وَذُو الْقَعْدَةِ وَعَشْرٌ مِنْ ذِي الْحِجَّةِ**)، هەروەها ئیبنو عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گوتوویەتی سوننەتە ئیحرام بە حەج نەبەسترێ، مەگەر لە مانگەکانی حەجدا.

ئنجا ئەمانە کاتەکانی ئیحرام بەستنن بە حەج، بەڵام بۆ عومرە، زانایان لەسەر ئەوە یەک دەنگن، کە هەموو مانگەکانی ساڵ بۆ عومرە تێدا کردن، ڕەوان، بەبێ جیاوازیی.

## ٨)- شوێنەکانی ئیحرام بەستن بە حەج و عومرە:

زانایان لەسەر ئەم پێنج شوێنە، کە میقاتی ئیحرام تێدابەستنی بابای حاجیی و عومرەکار (**الحاج والمعتمر**)ن، لە هەر پێنج لای کەعبەوە، یەکدەنگن:

١- میقاتی خەڵکی مەدینە (**ذو الحُلیفة**)یە، کە (**آبارُ علي**)شی پێدەڵێن، کە ماوەی شەش میل لە مەدینەوە دوورە و، چوارسەدو شەست (٤٦٠) کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە و، دوورترین میقاتە لە مەککە.

٢- میقاتی خەڵکی شام تونس و مەغریب کە (**جُحْفَة**)یە و، (**رَابح**)یشی پێ دەڵێن و، دووسەدو چوار (٢٠٤) کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە.

٣- میقاتی خەڵکی عێراق و غەیری عێراقیش، ئەوانەی لە ڕۆژهەڵاتی مەککەوە دێن، (**ذات عِرْق**)ی پێدەڵێن و، سەدو نەوەدو چوار (١٩٤) کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە.

٤- میقاتی خەڵکی نەجدو کوەیت و ئیمارات و تائیف، کە (**قرن المنازل**)ە و، (**قرن الثَّعالیب**) یشی پێ دەڵێن و، لە نزیک شوێنێکە کە ئێستا (**سَیْل**)ی پێ دەڵێن، نەوەدوچوار (٩٤) کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە.

٥- میقاتی خەڵکی یەمەن و تیهامەو هیند، کە (يَلَمْلَم)ی پێ دەڵێن.

هەر کەسێک لە هەر ڕێیەکەوە بڕوا، چ وشکانیی، چ دەریا، چ هەوایی، کە بکەوێتە نێوان دوو میقاتەوە، دروستە کە هەر کاتێ گەیشتە ئاقار (ئاستی) یەکێک لە میقاتەکان، ئیحرام ببەستێ، بەڵام پێویستە بۆ دوور بینیی، بەر لەوەی بگاتە ئاستی ئەو شوێنە، ئیحرامەکەی ببەستێ، چونکە ئەگەر لێی تێپەڕی، تازە ئیحرام بەستنەکەی بۆ وەبەرناکەوێ، وەک گوتمان: چ لە ڕێی وشکانیی و، چ دەریا و، چ هەواییەوە، بڕوا، هەر هەمان حوکمی هەیە.

بێگومان دیارییکردنی ئەو میقاتانەش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما **قَالَ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَقَّتَ لأَهْلِ الْمَدِينَةِ: ذَا الْحُلَيْفَةِ، وَلأَهْلِ الشَّامِ: الْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ: قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلأَهْلِ الْيَمَنِ: يَلَمْلَمَ، هُنَّ لَهُنَّ، وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِهِنَّ مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ، فَمِنْ حَيْثُ أَنْشَأَ، حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ مِنْ مَكَّةَ {وَفِي رِوَايَةٍ لَهُمَا: فَمَنْ كَانَ دُونَهُمَا فَمَهِلُه مِنْ أَهْلِهِ} (أخرجه البخاري: ١٥٢٤، ومسلم: ١١٨١).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ) دەفەرمونێ: پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵکی مەدینە (**ذا الحليفة**) دیاریی کردوە و {ئەوێ میقاتی شوێنی ئیحرام تێدا بەستنە} بۆ خەڵکی شام (**الجحفة**) و، بۆ خەڵکی نەجد (**قرن المنازل**) و، بۆ خەڵکی یەمەن (**يلملم**) و، هەم بۆ خەڵکی ئەو شوێنانەن و، هەم خەڵکی غەیری ئەو شوێنانەش کە لە پشت وانەوە دێن و بەو شوێنانەدا دێن، بەڵام خەڵکی دیکەی لەوان نیزیکتر لە کابەوە، بۆ وێنە: خەڵکی مەککە هەر لە مەککە و لە ماڵی خۆیانەوە ئیحرام بە حەج یان بە عومرە دەبەستن.

هەروەها خەڵکی عێراقیش: {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: **أَنَّ النَّبِيَّ الله ﷺ وَقَّتَ لِأَهْلِ الْعِرَاقِ ذَاتَ عِرْقٍ} (أخرجه أبو داود برقم: ١٧٣٩).**

واتە ئەو شوێنەی کە خەڵکی عێراق ئیحرامی لێ دەبەستن {(**أَللهُ أكبر**)ی حەج و عومرەکردنی لێدەکەن، دەڵێن: (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ حَجَّة**) یان (**لَبَيْكَ اللَّهُمَّ عمرة**) یان (**لَبَيْكَ اللَّهُمَّ حجَّة وعمرة**)} ئەوە (**ذَاتِ عِرْقٍ**)ە، کە پێشتر باسمان کرد.

## ٩)- کردەوەکانی حەج:

کردەوەکانی حەج بە گشتیی، واتە: چ پایە بن، چ فەرز بن، ئەم یازدە (١١) کردەوەیەن:

١- ئیحرام بەستن، کە بریتیە لە نیەت هێنان بە ئەنجام دانی حەج، یان عومرە، یان هەردووکیان.

٢- چوونە نێو شاری مەککە لەلای سەروویەوە، پاشان مزگەوتی حەڕام و، دوایی تەوافی چوونە مەککە (**طواف القدوم**).

٣- شەو مانەوە (**المبيت**) لە مینا کە شەوی نۆیەمی (**ذي الحجة**)یە.

٤- ڕاوەستان لە عەرەفات، کە لە ڕۆژی نۆیەمدایە.

٥- شەو مانەوە لە موزدەلیفە، لە شەوی دەیەمی (**ذي الحجة**)دا.

٦- بەرد تێفرێدانی سێ جەمرەکان، کە لە ڕۆژی دەیەمی (**ذي الحجة**)دا، تەنیا یەکەمیان ئەنجام دەدرێ جەمرەی گەورە و، پاشان هی هەر سێک جەمرەکان لە ڕۆژانی: (١١و١٢و١٣)دا و، سەرجەم حەفتا (٧٠) وردە بەرد فڕێ دەدات (٧+٢١+٢١+٢١=٧٠).

٧- قوربانیی سەربڕین، پاش حەوت وردکە بەرد تێفرێدانی جەمرەی عەقەبە، کە پێشی دەگوترێ جەمرەی گەورە (**الجمرة الكُبْرَى**)، کە لە ڕۆژی دەیەمی (**ذي الحجة**)دا ئەنجام دەدرێ.

٨- سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوەی، پاش سەربڕینی قوربانیی هەر لە ڕۆژی دەیەمدا.

**٩-** تەوافی دەوری کەعبە، کە بە تەوافی پایە (**طواف الركن**)، یان (**طواف الإفاضة**) تەوافی هاتنە خوار لە عەرەفات ناودەبرێ.

**١٠-** هاتن و چوون (**السعي**)ی نێوان صەفا و مەڕوە، حەوت (٧) جاران کە لە صەفاوە دەست پێدەکات، جارێک دەچێتە مەڕوە و دەبێتە جارێک، لە مەڕوەوە دێتەوە صەفا دەبێتە دوو، بەو شێوەیە لە صەفا دەست پێدەکات و لە مەڕوە کۆتایی پێ دێ.

**١١-** تەوافی خواحافیزیی (**طواف الوداع**) واتە: ماڵئاوایی لە حەرەم.

کردەوەکانی عومرەش چوارن، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئیحرام بەستن.

٢- تەواف کردن.

٣- هاتن و چوون لە نێوان صەفاو مەڕوەدا.

٤- سەری خۆتاشین، یاخود کورت کردنەوە.

## ١٠) پایەکانی حەج:

پێشتریش باسمان کرد، حەج چوار پایەی سەرەکیی هەن:

١- ئیحرام بەستن.

٢- ڕاوەستان لە عەرەفات.

٣- تەواف، حەوت سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا.

٤- هاتن و چوونی نێوان صەفاو مەڕوە.

ئەوانە پایەکانی حەجن، بە ڕای زۆربەی زانایان، واتە: بەبێ هیچ کام لەو چوارە، حەج وەبەر ناکەوێ و دورست نابێ.

**پایەی یەکەم: ئیحڕام بەستن:**

بریتیە لە نیەت هێنان بە ئەنجامدانی حەج، کە بە ڕای زۆربەی زانایان ئیحڕام بەستن، پایەیە، بەڵام حەنەفییەکان بە مەرجی دادەنێن، جیاوازییەکەش لە نێوانی پایە بوون و مەرج بوونی ئیحڕام بەستندا بۆ حەج، هەر ئەوەیە، کە پایە لە نێو خودی حەج دایە، بەڵام چ بە نسبەت ئێرەوە و، چ بە نسبەت هەرشتێکی دیکەوە، مەرج لە دەرەوەی پایەکانی ئەو کردەوەیە کە ئەنجام دەدرێ، چۆنیەتی ئیحڕام و نیەتەکەش، ئەوەیە کە بەدەنگی بەرز بڵێ: (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ بِحجَّةٍ**)، یان (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ بِحجَّةٍ وَعُمرَةٍ**)، یان: (**نَوَيْتُ الْحَجَّ لِلَّهِ تَعَالَى**)، یان (**نَوَيْتُ الْحَجَّ والعمرة لِلَّهِ تَعَالَى**)، یان بە کوردیی بڵێ: (نیەتم وایە حەج دەکەم)، یان (نیەتم وایە حەج و عومرە دەکەم)، مەرج نیە، تەنها بە زمانی عەرەبیی بێ، لەو بارەوەش با ئاماژە بە چەند دەقێک بکەین:

**یەکەم:** {**عَنْ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﵁ ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى**} (**أخرجه البخاري: ١، ومسلم برقم: ٤٥**).

واتە: عومەر ﵁ دەڵێ: گوێ بیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، دەیفەرموو: بێگومان کردەوەکان بەپێی نیاز و مەبەستەکانی نێو دڵن و، بۆ هەر مرۆڤێک بەپێی ئەوە کە نیاز و مەبەستی لە دڵدا هەیە، کردەوەکەی بۆ بەردەکەوێ.

ئەوە بە گشیی لە بارەی نیەت هێنانەوە،

**دووەم:** بە تایبەت دەربارەی ئیحڕام بەستن و نیەت هێنان بە حەج، ئەم فەرموودەیە هەیە: {**عَنْ أَنَسٍ ﵁، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ مَعًاً**} (**أخرجه إبن حبان: ٣٩٣٢ قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري**).

واتە: ئەنەس ﵁ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەی خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: {**لَبَّيْكَ بِحَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ مَعًاً**}، وشەی: (**لَبَّيْكَ**)، واتە: لە خزمەتدام، ئامادەم، کە حەج و عومرە بەجێ بێنم.

**سێیەم:** {**عَنْ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ، أَخْبَرَنِي عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُهِلُّ مُلَبِّدًا**} (**أخرجه البخاري برقم: ١٥٤٠، و مسلم برقم: ١١٨٤**).

واتە: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەڕ (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە بابیەوە، واتە: لە عەبدوڵڵاوە، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، ئیحرامی دەبەست، لە کاتێکدا کە قژی کۆ کردبۆوە سەر یەک.

(**يُهِلُّ**) واتە: دەنگی بەرز دەکردوە بە ئیحرام بەستن.

ئەو ئیحرام بەستنەش دەبێ، لە میقات بێ: {**عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللهِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ، يَقُولُ: «مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَّا مِنْ عِنْدِ الْمَسْجِدِ، يَعْنِي مَسْجِدَ ذِي الْحُلَيْفَةِ**} (**أخرجه البخاري: ١٥٤٢، ومسلم: ١١٨٦**).

واتە: سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە بابیەوە هێناویەتی کە گوێی لێ بووە گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ، تەنها لە لای مزگەوت ئیحرامی بەست، دەنگی بەرز کردەوە بە ئیحرام بەستن، واتە: مزگەوتی (**ذِي الْحُلَيْفَةِ**)، کە میقاتی خەڵکی مەدینەیە.

لە کاتی ئیحرام بەستندا سوننەتەو، هەندێکی بە پێویستیان داناوە، بەڵام وا پێدەچی هەر سوننەت بێ، ئەم زیکرە بخوێنرێ کە پێی دەگوترێ: تەلبییە:

**چوارەم:** {**عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ تَلْبِيَةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ: لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ**} (**أخرجه البخاري: ١٥٤٩**).

واتە: نافیع لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (خوا لێیان ڕازیبێ) دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: تەلبییەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بوو: (ئەی خوایە! بە دەم فەرمانتەوە هاتم و لە خزمەتدام، لە خزمەتدام هیچ هاوبەشت نین، لە خزمەتدام بێگومان ستایش و چاکە و موڵک هەر هی تۆیە و بەس، هیچ هاوبەشت نیە.

هەڵبەتە لە کاتی ئیحرام بەستن و نیەت هێناندا، پێویستە بابای ئیحرام بەستوو (مُحْرِم) بەرگ و پۆشاکی ئاسایی دابنێ، ئافرەتان هەر بەرگ و پۆشاکی ئاسایی خۆیان لەبەر دەکەن، بەڵام پیاوان دەبێ بەرگ و پۆشاکی ئاسایی دابنێن و، دوو پارچە قوماش لە خۆیان وەر بپێچن، یەکێکیان لە پشتیان بەرەو ژێریان، ئەوی دیکەش لە پشتیان بەرەو ژووریان، وەک لەم فەرموودەیەوە دیارە و، زۆر فەرموودەش لەم بارەوە هەن:

**پێنجەم:** {**عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلًا قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لاَ يَلْبَسُ الْقُمُصَ، وَلاَ العَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ البَرَانِسَ، وَلاَ الخِفَافَ إِلَّا أَحَدٌ لاَ يَجِدُ نَعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ، فَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ أَوْ وَرْسٌ**} (**أخرجه البخاري: ١٥٤٣**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ بابای ئیحرامگرتوو چ جۆرە جل و بەرگێک دەپۆشێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نابێ نە کراسان لەبەر بکات و، نە مێزەران لەسەر بکات و، نە شەڕواڵان لە پێ بکات و، نە کڵاوان لەسەر بنێ و، نە خووف و پێڵاوان لەپێ بکات، مەگەر کەسێ نەعلی نەبن، ئەوە با دوو خوف، یان دوو پێڵاوان لەپێ بکات، لە خوار گوێزنگەکانەوە {لە خوار قولە پێیەوە بیانبڕێ} هەروەها هیچ بەرگێک یان هیچ قوماشێک لەبەر مەکەن، کە زەعفەران، یان وەرسی پێکەوتبێ {کە دوو جۆرە بۆنی خۆشن}.

وەک گوتمان: ئەوە بە نسبەت پیاوانەوە، بەڵام بەنسبەت ئافرەتانەوە، هەر بەرگی ئاسایی خۆیان لەبەر دەکەن، وەک لەم دەقەدا دیارە:

**شەشەم:** {**عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ نَهَى النِّسَاءَ فِي إِحْرَامِهِنَّ عَنِ الْقُفَّازَيْنِ، وَالنِّقَابِ، وَمَا مَسَّ الْوَرْسُ، وَالزَّعْفَرَانُ مِنَ الثِّيَابِ، وَلْتَلْبَسْ بَعْدَ ذَلِكَ مَا أَحَبَّتْ مِنْ أَلْوَانِ الثِّيَابِ مُعَصْفَرًا، أَوْ خَزًّا، أَوْ حُلِيًّا، أَوْ سَرَاوِيلَ، أَوْ قَمِيصًا، أَوْ خُفًّا**} (**أخرجه أبو داود برقم: ١٨٢٧، والحاكم برقم: ١٧٨٨، ورجاله رجال صحيح، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر (خـوا لێیـان ڕازیبـێ)، بیسـتوویەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئافرەتـانی لـە کاتی ئیحرامیانـدا، لـە پۆشـینی دەسـتکێش و پەچـە و هـەر بەرگێـک، کـە وەرس و زەعفـەرانی لـێ درابـێ، قەدەغـە کـردوون، {کـە دوو جـۆرە بـۆنی خـۆش بـوون، دوو جـۆرە، گوڵـن بـۆنی خۆشـیان هەیـە} بـەڵام جگـە لـەوە بـا هـەر جـۆرە بەرگێکـی حەزیـان لێیـەتی، بیپۆشـن لـە ڕەنگکـراو بـە ڕەنگـی سـوور، یـان ئاوریشـم، یـان خشـڵ، یـان دەرپـێ، یـان کـراس، یـان پێـڵاو.

ئەمـە بـە نسـبەت پایـەی یەکەمـی (حـەج)ەوە: ئیحـرام بەسـتن یاخـود نیـەت هێنـان.

## پایەی دووەم: ڕاوەستان لە عەرەفات:

هەمـوو زانایـان لەسـەر ئـەوە یـەک دەنگـن، کـە ڕاوەسـتان لـە عەرەفـات پایـەی بنەڕەتیـی و هـەرە مـەزنی حەجـە، چونکـە پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: {**الحَـجُّ عَرَفَـةٌ**} (**أخرجـه أحمـد: ١٨٧٩٦، وأبـو داود: ١٩٤٩، والترمـذي: ٨٨٩، والنسـائي ٣٠٤٤، وابـن ماجـه: ٣٠١٥**).

واتە: حەج بریتیە لە وەستان لە عەرەفات.

## چـــوار برگـــە دەربـــارەی ڕاوەستان لە عەرەفات

برگـەی یەکـەم: شـوێنی لـێ ڕاوەسـتان، دەبـێ لـە کـوێ بوەسـتێ؟ زانایـان لەسـەر ئـەوە یـەک دەنگـن، کـە لـە هـەر بەشـێکی عەرەفاتـدا بوەسـتێ، دروسـتە، بـەڵام چاکـتر وایـە لـە نیزیـک و دامێـن چیـای ڕەحمەتـەت (**جَبَـلُ الرَّحْمَـة**)وە بـێ، لـە لای تاشـە بـەردە زلـەکان و، ڕوو بـە کەعبـە بوەسـتێ، بەڵگـەش لەسـەر ئـەوە کـە دەشـتی عەرەفـات هەمـووی دروسـتە، لێـی بوەسـتێ، ئـەو فەرموودەیـەی پێغەمبـەرە ﷺ کـە دەفەرمـوێ: {**قَـدْ وَقَفْـتُ هَـا هُنَـا وَعَرَفَـةُ كُلُّهَـا مَوْقِـفٌ**} (**أخرجـه: أبـو داود برقـم: ٦١٧٣، وَصَحَّحَـهُ الألبـاني**).

واتـە: ئـەوە مـن لێـرە وەسـتام و عەرەفاتیـش {هـەم کێوەکـەی (**جَبَلُ الرَّحْمَـةِ**)، هـەم دەشـتەکەی} هەمـووی شـوێنی لـێ وەسـتانە.

بڕگـەی دووەم: بـۆ کاتی وەسـتان لـە عەرەفـات، زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان ڕایـان وایـە: کاتی ڕاوەسـتان لـە عەرەفـات لـەو کاتـەوە دەسـت پێدەکات، کـە خـۆر لـە نێوەڕاسـتی ئاسـمان بـەرەو لای ڕۆژئـاوا لادەدات، لـە ڕۆژی نۆیەمـی (**ذِي الْحِجَّـةِ**)دا، کـە پێـی دەگوتـرێ: ڕۆژی عەرەفـە و، هەتـا سپێدەی بەرەبەیـانی ڕۆژی دەیـەم دەخایەنـێ.

بـەڵام حەنبەلییـەکان دەڵێـن: لـە بەرەبەیـانی ڕۆژی نۆیەمـەوە دەسـت پـێ دەکات، نـەک لـە کاتی لادانی خـۆر لـە نێوەڕاسـت، بـەڵام دەڵێـن: دەبـێ دوای نیوەڕۆکـەشی هـەر بـەردەوام بـێ، هەروەهـا زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، کـە هـەر کەسـێک بـەر لـە لادانی خـۆر لـە نێوەڕاسـتی ئاسـمان بـەرەو لای ڕۆژئـاوا، عەرەفـات بەجـێ بهێڵـێ، ڕاوەسـتانەکەی بەرناکـەوێ، هەروەهـا زۆربـەی زانایـان کـە حەنەفییـەکان و مالیکییـەکان و حەنبەلییەکانیـان لـە نێـودان، دەڵێـن: فـەرزە هەتـا دوای خۆرئـاوا بـوون، بوەسـتێ، بـۆ ئـەوەی شـەو و ڕۆژان پێکـەوە کۆبکاتـەوە لـە ڕاوەسـتانەکەیدا، بـەڵام شـافیعییەکان تەنهـا بـە سـوننەتی دەزانـن و، ڕای جەماوەریـش بەڵگەدارتـرە.

بڕگـەی سێیەم: ئەنـدازەی ڕاوەسـتانەکە، زانایـان لەسـەر ئـەوەش یـەک دەنگـن، کە ئەوەنـدە بەسـە بـۆ ڕاوەسـتان (**وُقُـوف**)، لـە عەرەفـات کـە ماوەیەکـی کـەم لـە دوای لادانی خـۆرەوە هەتـا بەرەبەیـان بمێنێتـەوە، هەروەهـا لەسـەر ئـەوەش یـەک دەنگـن، کـە پاکیـی و، دەسـت نوێـژ هەبـوون و، خۆداپۆشـین و، ڕووکردنـە قیبلـە، هیـچ کامیان مـەرج نیـن بـۆ ڕاوەسـتان لەسـەر عەرەفـە، ئنجـا ئایـا واباشـە بـە سـواریی، بـێ یـان بە پیـادە؟ زانایـان لـەو بـارەوە ڕاجیاییـان هەیـە.

بڕگـەی چـوارەم: حوکمـی ڕانەوەسـتان لـە عەرەفـات، وەک پێشـتر گوتمـان: ڕاوەسـتان لـە عەرەفـات پایـەی بنەڕەتیـی و هـەرە گـەورەی حەجـە و، هـەر کەسـێک لـە دەسـتی بچـێ، ئـەوە حەجەکـەی بەرنەکەوتـوە، واتـە: دەبـێ لـە دوای نیـوەڕۆی

ڕۆژی نۆیەمی (**ذِي الْحِجَّة**)وە، هەتا دەگاتە سپێدەی ڕۆژی دەیەم، دەبێ، کاتێک ئەگەر کەمیش بێ، فریای وەستان لە عەڕەفات بکەوێ، ئەگەرنا مانای وایە وەستان لە عەڕەفاتی نەبووە و، ئەو پایە مەزنەی حەجیش ئەگەر نەبوو، مانای وایە حەجەکەی بەر نەکەوتوە.

## پایەی سێیەم: تەواف کردن:

واتە: حەوت جار سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا، کە تەوافەکانی حەج، سێ جۆرن:

١- تەوافی هاتنە نێو مەککە، کە پێی دەگوترێ: (**طَوَافُ الْقُدُوم**)، واتە: تەوافی بە دەوری کەعبەدا، سووڕانەوەی هاتن بۆ نێو شاری مەککە، کە زۆربەی زانایان بە سوننەتی دەزانن.

٢- تەوافی هاتنە خوار لە عەڕەفات، کە پێی دەگوترێ: (**طَوَافُ الإِفَاضَة**)، یان (**طَوَافُ الرُّكْن**) و یان (**طَوَافُ الزِّيَارَة**)یشی پێ دەگوترێ، هەموو ئەو ناوانەی بۆ بەکاردێن، ئەمە بە یەک دەنگیی زانایان پایەیە.

٣- تەوافی بە جێهێشتنی مەککە و مزگەوتی حەڕام، (**طَوَافُ الْوِدَاع**)، واتە: تەوافی خواحافیزیی، کە زۆربەی زانایان بە فەڕزی دەزانن.

ئەم ئایەتە موبارەکەش کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُواْ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ﴾الحج، واتە: دوایی با چڵک و چەپەری خۆیان لابدەن و، با قوربانییەکانی خۆیان ئەنجام بدەن و، با بە دەوری ماڵی دێریندا، بخولێنەوە (بە دەوری کەعبەدا)، مەبەست پێی: (**طَوَافُ الرُّكْن**)ە، کە (**طَوَافُ الإِفَاضَة**)یشی پێ دەڵێن و (**طَوَافُ الزِّيَارَة**)یشی پێ دەڵێن، مەبەست پێی ئەو تەوافەیە،

لەو بارەوەش فەرموودە زۆرن، بۆ وێنە: دەربارەی تەوافی هاتنە نێو مەککە، ئەم فەرموودەیە هەیە: {**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَوَّلَ شَيْءٍ بَدَأَ بِهِ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ، أَنَّهُ تَوَضَّأَ، ثُمَّ طَافَ بِالْبَيْتِ**} (**أخرجه البخاري: ١٥٦٠، ومسلم: ٣٠٦٠**).

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ یەکەمین کارێک کە دەستی پێ کرد، کاتێک چووە نێو شاری مەککە، ئەوە بوو کە دستنوێژی گرت و بە دەوری ماڵی خوادا خولایەوە (سووڕایەوە) {واتە: حەوت جاران}.

ئنجا سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا، زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، کە ئایا مەرجە دەست نوێژ هەبێ، یان نا؟ بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەگەر کەسێک لەش پیسیی گەورەی لەسەر بێ، یان ئافرەت بێ نوێژ بێ و لە حەیزدابێ، یان لە زەیستانیی دابێ، بۆی نیە ئەو تەوافە بکات، وەک لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

**{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهَا حِيْنَ حَاضَتْ، وَهِيَ مُحْرِمَةٌ: اصْنَعِي مَا يَصْنَعُ الْحُجَّاجُ غَيْرَ أَنْ لَا تَطُوفِي بِالْبَيْتِ حَتَى تَغْتَسِلِي} (أخرجه البخاري: ٣٠٥، ومسلم: ١٢١١، وأبو داود: ١٧٨٨).**

واتە: لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازیبێ) هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ کاتێک عائیشە کەوتە بێ نوێژییەوە، لە ئیحڕامیش دابوو پێی فەرموو: حاجییەکان چی دەکەن، تۆش بیکە، بەڵام بە دەوری ماڵی خوادا مەخولێوە، تاکو خۆت نەشۆی.

### پایەی چوارەم: هاتن و چوون لە نێوان صەفاو مەڕوەدا:

ئەمیش لەسەر ڕای زۆربەی زانایان پایەیە و، پێویستە لە دوای تەوافیشەوە بێ، زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە دەبێ حەوت کەڕەت بێ و، لە صەفاوە دەست پێ بکرێ و، لە مەڕوە کۆتایی پێ دێ، هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن، کە چوون لە صەفاوە بۆ مەڕوە، جارێکە و، گەڕانەوە لە مەڕوەوە بۆ صەفا، جارێکی دیکەیە، بۆیە لە صەفا دەست پێ دەکات و لە مەڕوە کۆتایی دێ.

چونکە هەندێ کەس وا دەزانێ، کە لە صەفاوە دەچێ بۆ مەڕوە، دەبێ بێتەوە بۆ صەفا، ئنجا جارێکە، کە ئەوە دەکات چواردە (١٤) جار، بەڵام وانیە و

هەر چوونێک لە صەفاوە بۆ مەڕوە، جارێکە و، هەر هاتنەوەیەک لە مەڕوەوە بۆ صەفا، جاریکی دیکەیە.

زانایان زۆربەیان لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون، کە هاتن و چوونی نێوان صەفاو مەڕوە، لەش پاکیی و دەست نوێژ هەبوونی تێدا بە مەرج نەگیراوە، ئنجا سوننەتە یان فەڕزە، لە صەفاوە دەست پێ بکرێ و لە مەڕوە کۆتایی پێ بهێنرێ، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِۖ فَمَنۡ حَجَّ ٱلۡبَيۡتَ أَوِ ٱعۡتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَاۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ﴾ البقرة.

واتە: بێگومان صەفا و مەڕوە لە دروشمەکانی خوان، ئنجا هەر کەسێک سەردانی ماڵی خوای کرد، یاخود عومرەی کرد، گوناهی ناگاتێ کە (لە نێوانیاندا بێت و بچێ و) بە دەوریاندا بسووڕێتەوە.

بۆیەش بەو تەعبیرە فەرموویەتی، چونکە کافرەکان کاتی خۆی بتێکیان لەسەر صەفا دانا بوو و، بتێکیان لەسەر مەڕوە دانا بوو، ئنجا مسوڵمانان هەستیان بەسەغڵەتیی دەکرد، لە نێوان ئەو دوو تەپۆڵکە چیایانەدا بێن و بچن، کە کاتی خۆی بتیان لەسەر بوون، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: هەر کەسێک حەجی کرد یان عومرەی کرد، گوناهی ناگاتێ لە نێوانیاندا بێت و بچێ.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**يَا أَيُّهَا النَّاسُ اسْعَوْا، فَإِنَّ السَّعْيَ قَدْ كُتِبَ عَلَيْكُمْ**} (**أخرجه الدارقطني: ٢٥٨٢، والبيهقي: ٩٦٣٤، بإسناد حسن**)، واتە: ئەی خەڵکینە! لە نێوان صەفاو مەڕوەدا بێن و بچن، چونکە بێگومان هات و چوونتان لەسەر پێویست کراوە، لە نێوان صەفا و مەڕوەدا.

ئەو چوار کردەوە گرنگ و گەورەیەی کە ڕابردن: ١- (ئیحرام بەستن و، نیەت هێنان بە حەج و، ٢- ڕاوەستان لە عەرەفات و، ٣- تەوافی ماڵی خوا (کابە) دوای هاتنە خوار لە عەرەفات و مینا و، ٤- هاتن و چوونی نێوان صەفاو مەڕوە)، بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان هەر چواریان کۆڵەکەو پایەی پێکهێنەری حەجن.

هەندێکیشیان - لە زانایان - هەندێک کردەوەی دیکەی حەجیش، بە پایە دەزانن، بۆ وێنە: شافیعییەکان زۆربەیان تاشینی سەر یان کورت کردنەوەی (**حَلْقُ الرَّأْسِ أَو التَّقْصِيرِ**)، بە پایە دەزانن و، هەشیانە شەو مانەوە لە موزدەلیفە (**الْمَبِيتُ بِمُزْدَلِفَة**) بە پایە دەزانن.

بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان، وەک گوتمان: ئەو چوارەی گوتمان بە پایە دەزانن و، کردەوەکانی دیکەی حەجیان بە فەرز یان بە سوننەت داناون، جیاوازیی نێوان پایە (**رُكْن**) و، پێویست (**فَرْض، وَاجِب**) و، پەسند (**سُنَّة، مَنْدُوب**)یش بە کورتیی، ئەوەیە کە هەبوونی پایە مەرجی دروستبوون و، وەبەرکەوتنی حەجە و، بە نەبوونی ئەو پایە، کردەوەکە، کە حەجە، پەکی دەکەوێ و نایەتە دی و، هیچ شتێکیش قەرەبوو (**تعويض**)ی ناکاتەوە.

بەڵام فەرز پەکی ئەصڵی کارەکە ناخات و، بە خوێن {قوربانیی سەر بڕین} یش قەرەبوو دەبێتەوە، سوننەتیش: بە هەبوونی خێرو پاداشتی زیاتر دەبێ و، کارەکە چاکتر و تێر و تەواتر دەبێ، بەڵام نەبوونی زیانێکی ئەو تۆ لە کارەکە نادات، کە پێویستیی بەقەرەبوو کردنەوە بکات، ئەوە بە کورتیی جیاوازیی نێوان هەر کام لە: (پایە و، فەرز و، سوننەت)ە، لە حەجدا.

## II)- فەرزەکانی حەج:

پایەکانی حەج چوار بوون، بەڵام فەرزەکانی حەج، شەشن:

**١- ئیحرام بەستن لە میقات:** خودی ئیحرام بەستن و نیەت هێنان، پایەیە، بەڵام ئەوە کە دەبێ لە میقات بێ، فەرزە و، زۆربەی هەرە زۆری زانایان، کە شوێنکەوتووانی هەر چوار مەزهەبەکە لە نێویاندان، ئیحرام لە میقات، بە فەرز دەزانن.

بەڵام شیعەی دوازدە ئیمامیی لە فەرز بە گەورەتری دەزانن و بە پایەی دەزانن، مەبەستیش لە میقات، هەر کام لە میقاتەکانی کاتیی و شوێنیی (**المواقيت الزمانية والمكانية**)ن، کە پێشتر باسمان کردن.

ئنجا پێویست بوونی ئیحرام بەستران لە میقاتی شوێنییدا، تایبەتە بە کەسانێکەوە کە لە دەرەوەی مەککە و، دەرەوەی سنووری حەرەم و سنووری نێوان میقاتەکانی شاری مەککەدان یانی: لە دەرەوەی ئەو شوێنە تاکو دەگاتە ئەو جێیەی کە میقاتەکەی تێدا دیاریی کراوە.

**٢- وەستان یان شەو مانەوە لە موزدەلیفە:** سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە وەستان لە موزدەلیفە، لە بەشێکی شەوگاردا، پاش هاتنە خوار لە عەرەفات لە شەوی دەیەمی (**ذِي الْحِجَّة**)دا، فەرزە و، هەندێکیشیان شەو مانەوەی سەرجەم شەوی ناوبراو بە فەرز دەزانن، واتە: دەبێ شەوەکە هەمووی بمێننەوە، واشپێدەچێ ئەم ڕایەی دووەم بەهێزتر بێ، کە ڕای: (**عطاء، والزهري، وقتادة، وأبو الثور، وإسحاق، وأحمد، وزيد وبعض الشَّافعِيَّة**)یە، چونکە خوا ﷻ ئاماژەی پێکردووە وەک دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِۖ وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ وَإِن كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ١٩٨ ﴾البقرة، واتە: کاتێک هەڵڕژانە خوارێ لە عەرەفات، {یان هاتنە خوار لە عەرەفات، چونکە عەرەفات بەرزە} لە لای (ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِ)، یادی خوا بکەن {کە (**المشعر الحرام**) مەبەست پێی هەموو موزدەلیفەیە، یاخود چیای (**قُزَح**) لە لای موزدەلیفە} یادی (خوا) بکەن، وەک چۆن ڕێنمایی کردوون و، خستوونیە سەر ڕێی ڕاست، کە بە دڵنیایی پێشتریش لە گومڕایان بوون.

**٣- بەردۆچکە بارانکردنی سێ جەمرەکان:** ئەمیش بە یەکدەنگیی زانایان فەرزە، ئنجا بەردۆچکە بارانکردنی سێ جەمرەکان، بە دوو قۆناغ تەواو دەبێ:

قۆناغی یەکەم: کە لە ڕۆژی دەیەمی (**ذِي الْحِجَّة**)دا - کە ڕۆژی جەژنە - دەکرێ، ئەویش ئەوەیە کە تەنها جەمرەی گەورە (**الجمر الكُبْرَى**)، حەوت وردە بەردی پێدا دەدرێن، دوای ئەوەی موزدەلیفە بە جێدەهێڵدرێ، پێش نیوەڕۆیەکەی، یان بەرەبەیانییەکەی، بە یەک دەنگیی زانایانیش پەسند و سوننەت وایە لە دەمی چێشتەنگاودا بێ.

بەڵام مالیكییەكان و حەنەفییەكان كاتی ناوبراو بە فەرز دەزانن، نەك هەر بە سوننەتیش، زانایان لەسەر ئەوەش یەكدەنگن، كە ڕۆژی جەژن، تەنها جەمرەی گەورە بەردۆچكە باران دەكرێ و، دەبێ حەوت دانە بەردۆچكەی وەك بەردی پەلاپیتكە، كە لە دەنكە نۆك گەورەترە و هێندەی دەنكە پاقلەی ئاسایی دەبن، بهاویشترێن و، دەبێ حەوت بەردۆچكەكان بە حەوت كەڕەتان فڕێ بدات، نەك هەموویان بە یەك چەنگ فڕێ بدات و، ئەگەر هەر حەوتیان بە یەك جار فڕێ بدات، بە یەك بەردۆچكە بۆی حیسابە، ئەوە قۆناغی یەكەمی بەردۆچكە بارانكردنی جەمرە.

قۆناغی دووەم: بریتییە لە بەردۆچكە بارانكردنی هەر سێ جەمرەكان، واتە: جەمرەی گچەكە و جەمرەی نێوەنجیی و جەمرەی گەورە، لە هەر سێ ڕۆژەكانی: (**الأيام التشريق**)دا، كە ڕۆژانی یازدە و دوازدە و سێزدەی (**ذِي الْحِجَّة**)ن و، دەبێ لە هەر كام لەو سێ ڕۆژەدا، پاش لادانی خۆر (**زوال الشمس**)، بەرەو ڕۆژئاوا، هەر كام لەو سێ جەمرەیە بەردۆچكە باران بكات، یەكی حەوت وردكە بەرد.

كەواتە: حەوت جارانی سێی بكە (٧ × ٣ = ٢١)، دەكاتە بیست و یەك، ڕۆژەكانی: یازدەیەم و دوازدەیەم و سێزدەیەم، هەر ڕۆژە بیست و یەك وردە بەرد باوێ، سێ بیست و یەكی دەكاتە: شەست و سێ، حەوتەكەی ڕۆژی دەیەمیش، ئەوە حەفتا (٦٣+٧=٧٠).

بەڵام ئەگەر كەسێك پەلەی بێ بۆ گەڕانەوە، دەتوانێ بەس دوو ڕۆژ لە سێ ڕۆژەكانی: (**الأيَّام التشريق**) جەمرەكان بەرد باران بكات، واتە: دوای نیوەڕۆی ڕۆژی دووەم، مینا بەجێ بهێڵێ و تەنها چل و نۆ بەرد بهاوێژێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ لِمَنِ اتَّقَىٰ ﴿٢٠٣﴾﴾البقرة، واتە: لە ڕۆژانێكی ژمێردراودا، یادی خوا بكەن، ئنجا هەر كەسێك لە دوو ڕۆژاندا پەلەی كرد،

گوناهی ناگاتێ و، هەر کەسێکیش دوا بکەوێ، هەر گوناهی ناگاتێ، واتە: هەر کەسێک تەنها چل و نۆ بەرد باوێ، تەنها لە دوو ڕۆژی (**الأيام التشريق**) و، لەگەڵ ڕۆژی یەکەمیش، کە دە (١٠)ی (**ذِي الْحِجَّة**)یە، حەوت (٧) لە وێ و دووو بیست و یەک (٢١+٢١) لە وێ، دەکاتە: چل و نۆ، گوناهی ناگاتێ و، کەسێکیش بمێنێتەوە و خۆی دوابخات و، حەفتا بەردەکە تەواو بکات، هەر گوناهی ناگاتێ، لەو بارەوە با تەماشای ئەم فەرموودەیە بکەین:

{**عَنْ جَابِرٍ ﷺ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ، وَيَقُولُ: «لِتَأْخُذُوا عَنِّي مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لاَ أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ**} (**أخرجه مسلم: ٣١٠، وأحمد: ١٤٦١٨، والنسائي: ٣٠٦٢**).

واتە: جابیر ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی، جەمرەی بەرد باران دەکرد، (واتە: جەمرەی گەورە)، بەسەر وڵاخەکەیەوە لە ڕۆژی قوربانیی سەر بڕیندا و، دەیفەرموو: بۆ ئەوەی خوا پەرستییەکانتانم لێ فێر بن، چونکە من نازانم ڕەنگە لە پاش ئەم حەجەم، هیچ حەجی دیکە نەکەم.

ئەوەش ئاماژە بووە بۆ ئەوە کە دوای ئەو حەجە، کۆچی دوایی دەکات و وەک دوایی ناونرا، دەبێتە حەجی ماڵئاوایی (**حجة الوداع**).

پێویستە بزانرێ: جەمرەی گچکە کە لە میناوە دێی، لە پێشەوەیە و، دوایی جەمرەی نێوەنجیی و، جەمرەی گەورەش بە لای کەعبەوەیە، بابای حاجی ڕۆژی یەکەم جەمرەی یەکەم و دووەم، یان گچکە و نێوەنجیی، دەبوێرێ و، یەکسەر دێ جەمرەی گەورە وردکە بەردانی پێدا دەدەت، کە بە لای مەککەوەیە، بەڵام ڕۆژی یازدەیەم و دوازدەیەم و سێزدەیەم، بە ڕیز پێیان دادێ، لە گچکەوە بۆ نێوەنجیی و بۆ گەورە، هەروەها لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە:

{**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بعَثَ بِضَعَفَةِ أَهْلِهِ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ لَا يَرْمُوا الْجَمْرَةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ**}، (**أخرجه أحمد: ٢٠٨، وأبو داود: ١٩٤، والترمذي: ٨٩٣، وقال: حسن صحيح، والنسائي: ٣٠٦٤، وابن ماجه: ٣٠٢٥**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ خاو خێزانە بێهێزەکەی، (واتە: ئافرەتان و منداڵ و یاخود خەڵکی بە تەمەنی دەنارد) فەرمانی پێکردن کە پێشتر بڕۆن، {لە ڕۆژی دەیەمی (ذِي الْحِجَّة)دا، ڕۆژی جەژن} بەڵام فەرمووی: هەتا خۆر هەڵنەیەت، وردکە بەردان بە جەمرەی گەورەدا مەدەن.

چۆنیەتیی بەرد باران کردنەکەش، لەم دەقە هاتووە: {**عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ، فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا، مِثْلُ حَصَى الْخَذْفِ**} (**أخرجه مسلم: ١٤٧، وإبن ماجه: ٣٠٧٤، والنسائي: ٣٠٥٤**).

واتە: جابیر ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ هات بۆ لای جەمرە، {لە ڕۆژی قوربانیی سەر بڕین دا} حەوت وردکە بەردی پێدادان، لەگەڵ هەر وردکە بەرد هاویشتنێکدا (**أَللَّهُ أَكْبَر**)ی دەکرد و، وردکە بەردەکان بە قەدەر بەردی پەلەپیتکە بوون، (واتە: لە نۆک گەورەتر و وەک پاقلە، یاخود بچووکتر).

لەو بارەوە ئەم فەرموودەیەش هاتووە: {**عَنْ جَابِرٍ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ رَمَى الْجَمْرَةَ أَوَّلَ يَوْمٍ ضُحَى ثُمَّ لَمْ يَرِمْ بَعْدَ ذَلِكَ حَتَّى زَالَتِ الشَّمْسُ**} (**أَخْرَجَهُ البيهقي في سننه الكبرى: ٩٤٤٧**).

واتە: جابیر ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی یەکەم دەمی چێشتەنگا و جەمرەی بەردۆچکە بارانکرد (جەمرەی گەورە) پاشان دوای ئەوە هەتا خۆر لای نەدا، بەلای ڕۆژئاوادا بەردۆچکەکانی نەدەهاویشتن.

واتە: ڕۆژی یازدە و دوازدە و سێزدە، دەبێ دوای نیوەڕۆ وردە بەردەکان بهاویشترێن.

**٤- سەری خۆتاشین، یاخود کورت کردنەوە:** ئەمیش زانایان لەسەر پێویست بوونی یەکدەنگن، بەڵکو هەندێکیان وەک شافیعییەکان بە پایەی دەزانن.

ئنجا هەرچەندە زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن، کە هەر کام لە بەردۆچکە هاویشتن (**رَمِيُ الْجِمَار**) و قوربانیی سەربڕین و، سەری خۆ تاشین،

یـان کورتکردنـەوە، دروسـتە پـاش و پێشـیان پـێ بکـرێ، بـەڵام لەسـەر ئـەوەش ڕێککەوتـوون، کـە پەسـند و سـوننەت وایـە، بەردۆچکـە هاویشـتن، بخرێتە سـەرەتاوە، ئنجـا قوربانیـی سـەربڕین و، سـەری خـۆ تاشـین، یاخـود کـورت کردنـەوە.

زانایـان لەسـەر ئـەوەش یەکدەنگـن کـە سـەری خۆتاشـین بـۆ پیـاوان، لـە کورتکردنـەوەی یـان هەڵپاچینـی باشـترە، بـۆ ئافرەتانیـش بـە تەئکیـد تەنیا قژ کـورت کردنەوەیـە و، تاشـین، نـەک فـەڕز و سـوننەت نیـە، بەڵکـو هـەر دروسـتیش نیـە، ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (الفتح)یـش، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾.

واتـە: بـە دڵنیایـی خـوا ﷻ خـەونی پێغەمبـەری خـۆی ﷺ هێنایـە دی، دەچنـە مزگـەوتی حەڕامـەوە، ئەگـەر خـوا ﷻ بیـەوێ بـە هێمنیـی، ترسـتان لەسـەر نابـێ و، (هەندێکتـان) سـەری خۆتـان دەتاشـن و (هەندێکیشـتان) کـورتی دەکەنـەوە.

هـەردووک لایـان دروسـتن، بـەڵام بـە دڵنیایی سـەری خۆتاشـین خێری زیاتـرە، وەک لـەم فەرموودەیـەدا دەردەکـەوێ: {عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللـهِ ﷺ: «أَللَّهُـمَّ اغْفِـرْ لِلْمُحَلِّقِـينَ»، قَالُـوا: يَـا رَسُـولَ اللـهِ وَالْمُقَصِّرِيـنَ؟ قَالَ:«أَللَّهُـمَّ اغْفِـرْ لِلْمُحَلِّقِـينَ» ثَلَاثًـا قَالُـوا: يَـا رَسُـولَ اللـهِ وَالْمُقَصِّرِيـنَ؟ قَالَ:«وَالْمُقَصِّرِيـنَ»} (أخرجـه مالـك: ٨٨٦، والطيالسـي: ١٨٣٥، وأحمـد: ٥٥٠٧، والبخـاري: ١٦٤٠، ومسـلم: ١٣٠١، وأبـو داود: ١٩٧٩، والترمـذي: ٩١٣، وقـال: حسـن صحيـح، وابـن ماجـە: ٣٠٤٤).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمووی: ئـەی خوایـە! لەوانـەی سـەری خۆیـان تاشـیوە ببـوورە، گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ ئـەدی ئەوانـەی کورتیـان کردۆتـەوە؟ دووبـارە فەرمـووی: ئـەی خوایـە! لەوانـە ببـوورە کـە سـەری خۆیـان تاشـیوە، گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ ئـەدی ئەوانـەی کورتیـان کردۆتـەوە؟ بـۆ جـاری سـێیەم فەرمـووی: لەوانـە ببـوورە کـە سـەری

خۆیان تاشیوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەوانەی کورتیشیان کردۆتەوە؟ ئنجا دوای جاری سێیەم فەرمووی: لەوانەش کە کورتیان کردۆتەوە.

کەواتە: سەری خۆتاشین لە حەجدا هەروەها لە عومرەشدا، باشترە، لە کورت کردنەوەی.

**٥- شەو مانەوە لە مینا لە شەوەکانی: (أَيَّامُ التَّشْرِيقِ)دا:** واتە: شەوەکانی: دەیەم - کە لە موزدەلیفە دەبێ - و شەوی یازدەیەم و دوازدەیەم و سێزدەیەم، لە میناداً، ئەمە زۆرێک لە زانایان بە فەرزیان زانیوەو، هەندێکیشیان بە فەرزی دانانێن، ئنجا هەندێکیان گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ بۆ هەندێکیان مۆڵەتی داوە، ئەگەر نەشمێننەوە، بۆیە کەسێک بیانوویێکی ڕەوای هەیە، شەو لە میناش نەمێنێتەوە، دوای ئەوەی وردە بەردەکان، داوێ، قەیناکات.

**٦- تەوافی خواحافیزیی (طَوَافُ الوِدَاع):** ئەویش زۆربەی زانایان کە حەنەفییەکان و شافیعییەکان و حەنبەلییەکانیان لە نێودان، بە فەرزی دەزانن، بەڵام مالیکییەکان تەنها بە سوننەتی دەزانن، واش پێدەچێ ڕای زۆرینە ڕاستتر بێ، چونکە چەند دەقێک لەو بارەوە هەن، یەکێک لەوانە: {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إِلَّا أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الحَائِضِ**} (**أخرجه البخاري: ١٧٥٥، ومسلم: ١٣٢٨**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد، کە کاتێک حەڕەم بەجێ دێڵن، دواشت ئەوە بێ، کە بە دەوری ماڵی خوادا دەخولێنەوە، بەڵام بۆ ئافرەتێک کە کەوتۆتە بێ نوێژییەوە (**حِیَض**)ە، لە سەری سووک کراوە.

## ١٣)- ئەو شتانەی کە لە ماوەی ئیحرامدا حەرامن، چ ئیحرامی حەج و، چ ئیحرامی عومرە:

پێنج شتی سەرەکیی قەدەغەن، لە کەسێک کە ئیحرامی بەحەج، یان بە عومرە بەستوە:

**یەکەم:** پۆشینی بەرگ و پۆشاکی ئاسایی، کە تەقەڵ و درووومان یاخود جێداری تەقەڵ و درووومانی هەبێ، وەک قۆپچەو زریزە و قرتێنە، زانایان گوتوویانە: (**لُبْسُ الْمَخِيطِ وَمَا فِي مَعْنَاهُ**)، لەبەرکردنی درووماندار، یاخود ئەوەی لە شوێنی دروومانە.

**دووەم:** خزمەتکردنی جەستە (**تَرْفِيهُ الْبَدَن**)، بە هەر شێوەیەک بێ، وەک بۆن خۆشکردن و لابردنی موو و و کردنی نینۆک و... هتد.

**سێیەم:** لەگەڵ هاوسەردا جووت بوون، کە ئەمە وێڕای قەدەغە بوونی، مایەی تێکدان و هەڵوەشاندنەوەی حەج و عومرەشە.

**چوارەم:** هەر قسەو کردەوەیەکی لە خودی خۆیدا خراپ، یان لەگەڵ کەش و هەوای حەج و عومرەدا نەگونجاو، وەک دمبەدەمە و شەڕە قسەو، جنێو و، گاڵتە پێکردن و ئازاردان و، قسە و باسی جینسیی و، دەستبازیی لەگەڵ هاوسەر و، خوازبێنیی ژن و مارەکردن و لێ مارەکران و ... هتد.

**پێنجەم:** ڕاو و شکار و کوشتنی هەر ژیاندارێک، جگە لەوانەی کە شەرع ڕێی پێداون بکوژرێن، کە چەند ژیانداریکی زیان بەخشن.

### یەکەم: لەو شتانەی کە قەدەغەن، لە کاتی ئیحرام دا:

پۆشینی بەرگ و پۆشاکی ئاسایی تەقەڵدار (**لُبْسُ الْمَخِيط**) وەک: پێشتر فەرمووودەکەمان هێنا، لە بوخاریی و موسلیمەوە، کە پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: بابای ئیحرام بەستوو چ پۆشاکیک لەبەر دەکات؟ (واتە: بە نسبەت پیاوانەوە، چونکە ئافرەتان

هەر بەرگی ئاسایی خۆیان لەبەر دەکەن)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نابێ کراس لەبەر بکات و، نابێ مێزەر لەسەر بنێ و، نابێ شەڕواڵ لە پێ بکات و، نابێ کڵاو لەسەر بنێ و، نابێ پێڵاو لەپێ بکات، مەگەر کەسێک نەعلی دەست نەکەون، ئەوە دروستە پێڵاوەکانی لای سەرێیان ببڕێ لە خوار گوێزینگیانەوە، وەک نەعلیان لێ بکات و، نابێ پۆشاکێکیش لەبەر بکات کە بۆنی خۆش بێ، ئەو فەرموویەتی: زەعفەران و وەڕس کە دوو جۆرە گوڵی بۆنخۆشن، یانی: نابێ بۆنی خۆشی لێدرا بێ.

**دووەم: کە لە بابای ئیحرام بەستوو قەدەغەیە، خزمەتکردنی جەستەی (تَرفِيهُ الْبَدَن)ە:**

لەو بارەوە ئەو فەرموودەیە هەیە: {**عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَامَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: مَنِ الحَاجُّ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الشَّعِثُ التَّفِلُ**} (**أخرجه الترمذي: ٢٩٩٨، وإبن ماجه: ٢٨٩٦**).

واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان ڕازیبێ) دەڵێ: پیاوێک هەڵسا و هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! حاجی کێیە؟ فەرمووی بابای سەرو قژ ئاڵۆز و چڵکن.

خواش ﷻ کە لە سوورەتی (**الحج**)دا، دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا۟ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ﴾، دوایی با چڵک و چەپەری خۆیان لاببەن و، با نەزرەکانیان جێبەجێ بکەن و، با بە دەوری ماڵی دێریندا بخولێنەوە.

ئەوەش هەر ئەوە دەگرێتەوە.

تەنانەت کەسێک کە ئیحرامی بەستوەو کۆچی دوایی دەکات و دەمرێ، ئەویش نابێ بۆنی خۆشی لێ بدرێ، پێغەمبەر ﷺ لە بارەی حاجییەکەوە کە مرد بوو، فەرمووی: {**لاَ تُحَنِّطُوهُ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ القِيَامَةِ مُلَبِّيًا**} (**أخرجه البخاري: ١٢٦٥، ومسلم: ٩٣، و أبو داود: ٣٢٣٨، والنسائي: ٢٨٥٣**).

واتە: حەنووتی لێ مەدەن {حەنووت جۆرە بۆنێکی خۆشە} و، سەریشی دامەپۆشن، چونکە ڕۆژی دوایی بە (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ**)، گوتنەوە، زیندوو دەکرێتەوە.

هەروەها خوا ﷻ لە سوورەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَحۡلِقُواْ رُءُوسَكُمۡ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡهَدۡيُ مَحِلَّهُۥۚ ١٩٦﴾، واتە: سەری خۆتان مەتاشن، تاكو قوربانییەكان دەگەنە جێی خۆیان.

**سێیەم: لەو شتانەی قەدەغەن لە حەجدا، چوونە لای هاوسەر (جِمَاعُ الزَّوْجَةِ):**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّۗ ١٩٧﴾البقرة، واتە: كاتی حەجكردن چەند مانگێكی زانراوە، هەر كەسێك تێیاندا حەجی لەسەر خۆی پێویست كرد، نابێ گوناهو دەم بە دمە بكات، لە كاتی حەجكردندا.

لێرەدا مانای: ﴿رَفَثَ﴾، بە چوونە لای هاوسەر، لێكدراوەتەوە، چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمۡ لَيۡلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمۡۚ ١٨٧﴾البقرة، واتە: لە شەوی بە ڕۆژوو بووندا، دروستە بچنە لای هاوسەرانتان، وشەی: ﴿رَفَثَ﴾، بۆ جووت بوون (**جماع**) بەكارهاتوە.

**چوارەم: كە حەڕامە لە كاتی ئیحرام بەستندا، هەر قسەو گوفتارێكی گوناح، یان نەگونجاوە لە حاڵەتی ئیحرامدا:**

كە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّۗ ١٩٧﴾البقرة، واتە: مانگەكانی حەج تێدا ئەنجامدران، چەند مانگێكی زاندراون، ئنجا هەر كەسێك حەجی تێدا لەسەر خۆی پێویست كردن، نابێ نە قسەی گوناه بكات، یاخود: قسە و باسی جنسیی و، نە لادان، نە مشت و مڕ و شەڕە قسە.

**پێنجەم: لەو شتانەی كە لە بابای ئیحرام بەستوو قەدەغەن، بریتیە لە ڕا و و شكاركردن لە سەر زەوی و لە وشكانییدا:**

وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ ٩٦﴾المائدة، واتە: ڕاوكردنتان لە وشكانیی دا لێ قەدەغە كراوە، تاكو لە ئیحرامدابن.

قەدەغە بوونی ڕاو و شکاریش لە کاتی ئیحرامدا، زانایان هەموویان لەسەری یەکدەنگن، وەک (**النووي**) گوتوویەتی، بەڵام کە ڕاو و شکار قەدەغەیە، کوشتنی ئەو ژیاندارانە کە زیان بەخشن، قەدەغە نیە، وەک ئەو فەرموودەیە، ڕوونی کردۆتەوە:

{**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: خَمْسٌ مِنَ الدَّوَابِّ، كُلُّهُنَّ فَاسِقٌ، يُقْتَلْنَ فِي الْحَرَمِ: الْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْفَأْرَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ**} (**أخرجه البخاري: ١٨٢٩، ومسلم: ١١٩٨، واللفظ للبخاري**).

واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج ژیاندار کە هەموویان خراپەکارن، بابای خاوەن ئیحرام لە حەرەمدا بۆی هەیە بیانکوژێ: قەلەبەڵەکە و، باشوو و، دووپشک و، مشک و، سەگی خەڵک گر (سەگێک خەڵک بگرێ).

## ١٤)- ئەو شتانەی کە لە ماوەی ئیحرامدا ڕەوا (مباح)ن بۆ کەسێك کە حەج، یاخود عومرە ئەنجام دەدات:

### ١- خۆشۆردن:

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەوە شتێکی ڕەوایە، بابای ئیحرامگرتوو بە ئاو - بەڵام بۆنی خۆش نا - خۆی بشوات و، خۆی لە ئاوێدا نوقم بکات، بەڵگەشیان ئەو دەقەیە: {**عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﵁، رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَغْتَسِلُ وَهُوَ مُحْرِمٌ**} (**أخرجه الطبراني في الكبير: ٣٩٧٨**).

واتە: ئەبوو ئەییوب ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە کاتێکدا لە ئیحرام دابوو، خۆی دەشۆری.

پێشتریش باسمان کردوە کە (ئەبوو حەنیفەو مالیک) ڕایان وایە: ئەگەر بە صابوون و شتێکی وەک وی بێ و، مەبەستی خۆ خاوێن کردنەوە و لابردنی چڵک و چەپەر بێ، دروست نیە و فیدیەشی دەکەوێتە سەر.

بەڵام هەندێک دەڵێن: دروستە صابوون بەکاربێنێ، مادام مەبەستی بۆن خۆشیی نەبێ، بەڵکو مەبەستی لابردنی چڵک و چەپەر بێ و، ئەو دەقەش دەکەنە بەڵگە لەو بارەوە: حاجییەک کە وڵاخەکەی فڕێی دابوو مردبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ} **(مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البخاري: ١٢٦٥، ومسلم: ١٢٠٦)**.

واتە: بە ئاو و سیدر بیشۆن (سیدریش گیایەکی بۆنخۆشە) بۆیەش هەندێک لە زانایان دەڵێن: بە صابوون و بۆنی خۆش خۆشۆردن، بە مەبەستی لابردنی چڵک و چەپەر، ناپەسندە، بەڵام ناتوانین بڵێین: حەرامە.

منیش ئەم ڕایەم پێ بەهێزترە.

## ٢- چوونە ژێر سێبەر و سێبەر لەخۆ کردن:

زۆربەی زانایان بە ڕەوای دەزانن و، هەندێکیان بە ناپەسندی دەزانن، لەو بارەوەش ئەو دەقە هەیە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ڕەوایە:

**{عَنْ أُمِّ الْحُصَيْنِ رضي الله عنها، قَالَتْ: حَجَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ حَجَّةَ الْوَدَاعِ، فَرَأَيْتُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ وَبِلَالًا وَأَحَدُهُمَا آخِذٌ بِخِطَامِ نَاقَةِ النَّبِيِّ ﷺ وَالْآخَرُ رَافِعٌ ثَوْبَهُ يَسْتُرُهُ مِنَ الْحَرِّ، حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ} (أخرجه مسلم ٣١٩٩، وابن حبان: ٣٩٤٩، وابن خزيمة: ٢٦٨٨)**.

واتە: ئوممو حوصەین (خوا لێی ڕازیبێ)، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ حەجیماڵئاواییم کرد، ئوسامە و بیلالم بینین (خوا لێیان ڕازیبێ)، یەکێکیان ڕێشمەی حوشترەکەی پێغەمبەری بە دەستەوە بوو، ئەوی دیکەشیان پۆشاکەکەی خۆی بڵند ڕاگرتبوو، لەبەر گەرما سێبەری لێدەکرد، تاکو بەردۆچکەکانی بە جەمرەی عەقەبەدا دان.

## ٣- سەر و ڕیش شانەکردن و، خۆ خوراندن بە نینۆک:

ئەمیش زانایان لەسەری یەکدەنگن، کە دروستە بابای ئیحرامگرتوو، بێجگە لە سەر و ڕیشی، هەموو جەستەی خۆیشی بخورێنێ و، بەڵگەشیان ئەم دەقەیە:

{عَـنْ عَلْقَمَـةَ بْـنِ أَبِي عَلْقَمَـةَ، عَـنْ أُمِّـهِ أَنَّهَـا قَالَـتْ: سَـمِعْتُ عَائِشَـةَ زَوْجَ النَّبِـيِّ ﷺ تُسْأَلُ عَـنِ الْمُحْـرِمِ، أَيَحُـكُّ جَسَـدَهُ؟ قَالَـتْ: نَعَـمْ فَلْيَحْكُكْـهُ، وَلْيَشْـدُدْ، وَلَـوْ رُبِطَـتْ يَـدَايَ، وَلَـمْ أَجِـدْ إِلَّا رِجْلِـي لَحَكَكْـتُ}، (أخرجـه مالـك: ١٣١٠).

واتــە: عەلقەمــەی کــوڕی ئــەبی عەلقەمــە لــە دایکییــەوە دەگێڕێتــەوە، کــە گوتوویــەتی: گوێــم لــە عائیشــە بــوو خــوا لێــی ڕازی بــێ، هاوســەری پێغەمبــەر ﷺ، پرسـیاری لـێ دەکـرا لـە بـارەی کەسـێکەوە کـە ئیحرامـی بەسـتوە، ئایـا جەسـتەی خـۆی دەخورێنـێ؟ عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، گـوتی: بەڵـێ بـا خـۆی بخورێنـێ و بـە توندییـش خـۆی بخورێنـێ، ئەگـەر مـن هـەردوو دەستیشـم بەسـترا بـن، تەنیـا بـە لاقەکانـم خـۆم پـێ بخورێنـدرێ، خـۆم دەخورێنـم (واتـە: دروسـتە).

**٤- چاو ڕشتن بە کل و قەترە و دەرمان تێکردنی چاو:**

ئەمیـش زانایـان لەسـەری یەکدەنگـن کـە بـە مەبەسـتی چارەسـەر، کل تێکـردنی چـاو و قەتـرە و دەرمـان، دروسـتە و، هیچیـان لەسـەر نیـە و ئەگـەر پێویسـت بـوو، بۆ چارەسـەر، کلی چاویـش بـۆنی خـۆشی تێبکـرێ، واتـە: جۆرێـک لـە میسـک یـان شـتی دیکـە، کـە بـۆ کلەکـە پێویسـت بـێ، بـۆ چارەسـەر، دیسـان دروسـتە، دەڵێـن: بـەڵام دوایـی فیدیـەی دەکەوێتـە سـەر، بـەڵام ئەگـەر هـەر بـە شـێوەی ئاسـایی - بەبـێ نەخۆشـیی - کل بڕێژێتـە چـاوی و، بـۆنی خـۆشی تێدابـێ، ئـەوە هەندێکیـان دەڵێـن: ناپەسـندە و، هەندێکـی دیکەشیان دەڵێـن: ڕەوایـە و هیچـی ناکەوێتـە سـەر.

**٥- کەڵەشاخ لە خۆگرتن و خوێندان و خوێن تێکران:**

زۆربـەی هـەر زۆری زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، کـە بابـای ئیحرامگرتـوو، بـۆی هەیـە کەڵەشـاخ لـە خـۆی بگـرێ و، خوێـن بـدات و خوێنیـشی تێبکـرێ، وەک لـەم فەرموودەیـەدا هاتـوە: {عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا: أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ احْتَجَـمَ وَهُـوَ مُحْـرِمٌ} (أخرجـه البخـاري: ١٨٣٥، ومسـلم: ١٢٠٢).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا کە لە ئیحرام دابوو، کەڵەشاخی لە خۆی گرت.

## ٦- پۆشینی پەشتەماڵی ڕەنگدار (لُبسُ ثیابٍ مُصْبَغة):

ئەمیش زۆربەی زانایان بە ناپەسندی دەزانن، کە ڕەنگدار بێ، بە مەرجێک بۆندار نەبێ، ئەگەرنا بە حەرامی دەزانن، بەڵگەی ناپەسند بوونیشی ئەو دەقەیە کە مالیک لە (**الموطأ**)دا هێناویەتی: {**عَنْ نَافِعٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَسْلَمَ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يُحَدِّثُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ رَأَى عَلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ثَوْبًا مَصْبُوغًا وَهُوَ مُحْرِمٌ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: مَا هَذَا الثَّوْبُ الْمَصْبُوغُ يَا طَلْحَةُ؟ فَقَالَ طَلْحَةُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّمَا هُوَ مَدَرٌ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: إِنَّكُمْ أَيُّهَا الرَّهْطُ أَئِمَّةٌ يَقْتَدِي بِكُمُ النَّاسُ، فَلَوْ أَنَّ رَجُلاً جَاهِلاً رَأَى هَذَا الثَّوْبَ لَقَالَ: إِنَّ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ قَدْ كَانَ يَلْبَسُ الثِّيَابَ الْمُصْبَغَةَ فِي الإِحْرَامِ، فَلاَ تَلْبَسُوا أَيُّهَا الرَّهْطُ شَيْئًا مِنْ هَذِهِ الثِّيَابِ الْمُصْبَغَةِ} أخرجه مالك: ٧١٠، والبهقي في الكبرى: ٩٣٨٤.**

واتە: ئەسلەمی خزمەتکاری عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازیی بێ)، لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەگێڕێتەوە، کە عومەر (خوا لێی ڕازیی بێ) تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵای بینی، بەرگێکی ڕەنگ کراویی لەبەر بووە و لە ئیحرامیش دابوو، گوتی: ئەی تەڵحە! ئەو بەرگە ڕەنگکراوە چییە؟ تەڵحە گوتی: ئەی فەرماندەی بڕواداران! ئەوە هەر ڕەنگ خاکییە؟ عومەر گوتی: ئەی ئەو کۆمەڵەی کە خەڵک تەماشاتان دەکات و، دەتانکاتە سەر مەشق! ئەگەر پیاوێکی بێ ئاگا تۆ ببینێ ئەو پۆشاکەت لەبەردایە، دەڵێ: تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا لە کاتێکدا کە لە ئیحرامدابوو، پۆشاکی ڕەنگکراوی لەبەر دابوو، بۆیە ئەی ئەو کۆمەڵەی خەڵک تەماشاتان دەکات! ئەو جۆرە بەرگە ڕەنگکراوانە مەپۆشن، (بۆ ئەوەی خەڵک بە هەڵەدا نەچێ).

### ٧- تەماشـاكردنی ئـاوێنـە:

زۆربـەی هـەرە زۆری زانایان ڕایـان وایە تەماشـاكردنی ئاوێنە ڕەوایە، هەندێكیشـیان گوتوویانـە: ناپەسـندە، بـەڵام بـە دڵنیایـی ڕای زۆرینـە ڕاسـترە و، لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە هەیـە: {**عَـنْ نَافِـعٍ عَـنِ ابْـنِ عُمَـرَ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا: أَنَّـهُ نَظَـرَ فِي الْمِـرْآةِ وَهُـوَ مُحْـرِمٌ**} (**أخرجـه الشـافعي فِي المسـند: ١٦٧٩، والبيهقـي فِي الكبـير: ٩٤١١**)، واتـە: نافیـع دەڵـێ: عەبدوڵـڵای كـوڕی عومـەر (خـوا لێیـان ڕازیبـێ) تەماشـای ئاوێنـەی كـرد، لـە كاتێكـدا كـە لـە ئیحڕامـدا بـوو.

عەبدوڵڵاش زۆر سەختگیر بووە لە شوێنكەوتنی سوونەتی پێغەمبەردا ﷺ.

### ٨- قسـەكردنـی ئـاسایی:

هەمـوو زانایـان لەسـەر ئـەوە یەكدەنگـن، كـە بابـای ئیحڕامـدار بـۆی هەیـە، هـەر جـۆرە قسـەیەكی ئاسـایی بـكات و ڕەوایـە، بـەڵام هەمووشـیان بـە پەسـندی دەزانـن، كـە بەزۆریـی سـەرگەرمی زیكـر و فیكـر و پاڕانـەوە بـێ و، ئەگـەر قسـەشی كـرد، جگـە لـە قسـەی خێـر و چاكـە هیچـی دیكـە نـەكات و، خـۆی لـە قسـەی پـووچ و بـێ كەڵـك بپارێـزێ و، هـی حەڕامیـش ئـەوە نابێـت هـەر بیـكات، چونكـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: {**مَـنْ كانَ يُؤْمِـنُ بِاللَّـهِ وَالْيَـوْمِ الْآخِـرِ فَلْيَقُـلْ خَـيْرًا أَوْ لِيصْمُـتْ**}، (**مُتَّفَـقٌ عَلَيـهِ: البخـاري: ٦١٣٨، ومسـلم: ٧٤**)، واتـە: هـەر كەسـێک بـڕوای بـە خـوا و ڕۆژی دوایـی هەیـە، بـا چاكـە بڵـێ، ئەگـەر نـا بێدەنـگ بێـت.

### ١٥)- ئیحڕام شكاندنی یەكەم، یان گچكە:

ئیحـڕام شـكاندنی گچكـە، ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (**الحـج**) ئامـاژەی پێـداوە، كـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ لْيَقْضُواْ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُواْ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُواْ بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ٢٩ ﴾، زانایـان دەڵێـن: ئیحـڕام شـكاندنی گچكـە، دوای ئەنجامـدانی دوو شـت لـە سـێ شـتان، دێتـە دی، سـێ شـتەكان:

١- وردە بەرد هاویشتن بۆ جەمرەی گەورە (**جمرة العقبة**).

٢- سەری خۆ تاشین، یان کورتکردنەوە.

٣- بەدەوری کەعبەدا سووڕانەوە، پاش شۆڕبوونەوە لە عەرەفات.

هەر کەسێک لەو سێیانە دووان ئەنجام بدات، بۆی هەیە ئیحرام شکاندنی گچکە، یان یەکەم، ئەنجام بدات، وەک لەو بارەوە ئەم دەقە هەیە:

{**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ ﷺ: «إِذَا رَمَيْتَ الْجَمْرَةَ فَقَدْ حَلَّ لَكَ كُلُّ شَيْءٍ إِلَّا النِّسَاءَ**} (**أخرجه البيهقي فِي الكبير: ١٠٢٩٤**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر وردکە بەردت بە جەمرەی گەورەدا دان، هەموو شتێکت بۆ ڕەوایە، جگە لە ئافرەت (سەرجێی ئافرەتتان بۆ دروست نیە).

لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە: {**عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِذَا رَمَى أَحَدُكُمْ جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ، وحَلَقَ رأْسَهُ، فَقَدْ حَلَّ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ إِلاَّ النِّسَاءُ**} (**أخرجه أبو داود: ١٩٨٠، وَصَحَّحَهُ الألباني**) واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان وردکە بەردی هاویشتن بۆ جەمرەی گەورە و سەری خۆی تاشیی، هەموو شتێکی بۆ ڕەوایە، {وەک بۆنی خۆش لە خۆدان و، پۆشاکی ئاسایی لەبەر کردن} جگە لە چوونە لای ئافرەت.

شایانی باسە: ئیحرام شکاندنی گەورە کە ئیحرام شکاندنی دووەمیشی پێ دەڵێن:

دوای ئەنجامدانی شتی سێیەم، لەو سێ شتانەی باسمان کردن، دێتە دی، کە بە زۆری زانایان ڕایان وایە، بریتیە لە تەوافی پایە (**طواف الرُّكن**)، چونکە وردە بەرد هاویشتن بۆ جەمرەی یەکەم و سەری خۆتاشین، بە دوایی یەکدا دێن، بەڵام حاجی دوایی دەچێ بۆ مەککە و تەوافی پایە ئەنجام دەدات.

## ١٦)- باسی حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەری خاتەم ﷺ (حَجَّةُ الوِدَاع):

لەوبارەوە ئەو فەرموودەیە هەیە، کە زانایان زۆر گرنگییان پێداوە:

ئێمە لێرە تەنیا دەقە کوردییەکەی دێنین و، بۆ پاراستنی ئەمانەتی زانستیی، ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکەین لە خوارەوە[1]:

پێشەوا موسلیم دەڵێ: ئەبوو بەکر ئیبنو ئەبی شەیبەو، ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم، لە ئیبنو حاتەمەوە بۆیان باسکردم، ئەبوو بەکر گوتی: حاتەمی کوڕی ئیسماعیلی مەدەنیی لە جەعفەری کوڕی موحەممەد (واتە: جەعفەری صادیق) ئەویش لە بابیەوە (واتە: موحەممەدی باقر) بۆی گێڕامەوە، گوتوویەتی:

چووینە لای جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەویش لە خەڵکەکەی پرسی تاکو گەیشتە من، گوتم من موحەممەد کوڕی حسێنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیبم، ئەویش دەستی بۆ لای سەرم ڕاکێشا و قۆپچەی سەرەوەی کراسەکەم و پاشان قۆپچەی خوارەوەی کردەوە، ئەو کاتە من تازە دەگەیشتمێ، دەستی خستە سەر دڵم (سەر سینگم)، ئنجا گوتی: برازای خۆم! بەخێر بێی {دیارە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا چاوی نەبینیوە و لەو کاتەدا کوێر بووە و ویستوویەتی بیلاوێنێتەوە، وەک یەکێک لە بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ} چیت دەوێ، پرسیار بکە، منیش پرسیارم لێ کرد، ئەو کاتە کوێر بوو، کاتی نوێژ هات، هەڵسا و عەبایەکەی لە خۆوە گرت، لەبەر تەسکیی و بچووکیی کە دەیخستە سەر شانی، ئەملا وملای نەدەگەیشتنەوە یەک، کراسەکەشی لە تەنیشتیەوە لەسەر هەرزاڵێک دانرابوو، نوێژی بۆ کردین.

ئنجا گوتم: دەربارەی حەجی پێغەمبەر ﷺ هەواڵم بدەیە، ئەویش بە دەستی ژمارەی نۆی دروست کردو گوتی: پێغەمبەری خوا نۆ ساڵان مایەوە، حەجی

---

(١) أخرجه مسلم: كتاب الحج، باب حَجَّة النَّبِيِّ : ١٢١٩.

نەکرد، ئنجا لە ساڵی دەیەمدا لە نێو خەڵکیدا جاڕی دا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ حەج دەکات، خەڵکێکی زۆر هاتنە مەدینەوە، هەموویان دەیانویست چاو لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن و وەک وی بکەن، لە کاتی ڕۆیشتن دا، کە گەیشتینە (**ذَا الْحُلَيْفَة**)، لەوێ ئەسمائی کچی عومەیس (واتە: خێزانی ئەبوو بەکری صیددیق خوا لە هەردووکیان ڕازی بێ)، موحەممەدی کوڕی ئەبوو بەکری بوو، بۆ لای پێغەمبەری خوای ﷺ نارد، چیبکەم! فەرمووی: خۆت بشۆ و بە پەڕۆیەک خۆت بپێچەوە و ئیحرام ببەستە.

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوتێ نوێژی کرد و سواری حوشترەکەی بوو، کاتێک بە سواری حوشترەکەی گەیشتە دەشت و، تەماشای بەردەمیم کرد، هەتا چاو بڕ دەکات لە سوار و پیادە، خەڵک هەبوو، هەروەها لە لای ڕاست و لە لای چەپی و لە پشتیەوە، بە هەمان شێوە[1].

پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوماندا بوو، قورئانی بۆ دەهاتە خوارێ و ئەویش مەبەستەکەی دەزانی و، هەرچی فەرمانی پێ کردبایەن، ئێمەش کارمان پێ دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ دەنگی بە خوا بەیەکگرتن: (**لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ، وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لَا شَرِيكَ لَك**) بەرزدەکردەوە و خەڵکیش هەر بەو وشانەی کە ئێستا دەنگی پێ بەرز دەکەنەوە، دەنگیان بەرز دەکردەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ بەرپەرچی هیچ وشەیەکیانی نەداوەتەوە، {واتە: ئەوان مەرج نیە ڕێک وەک پێغەمبەریان گوتبێ ﷺ، بەڵام ئەوانیش هەر (**لَبَّيْكَ**) یان گوتوە و پێغەمبەر ﷺ بەرپەرچی نەداونەوە، گرنگ ئەوەیە بڵێ: پەروەردگارم! لە خزمەت دام و تۆ تاکی و پاکی و هاوبەشت نین و هەموو شتێک هی تۆیە}.

---

(١) کە بە مەزەندە وەک لە هەندێک فەرموودان‌دا هاتوە: سەد هەزار کەس (١٠٠٠٠٠)، یاخود سەدو بیست هەزار کەس لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ لە ساڵی دەیەمی کۆچییدا، حەجیان کرد.

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر تەلبیەکەی بەردەوام بوو، جابیر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: جگە لە حەجێ بە تەمای هیچ شتێکی دیکە نەبووین، عومرەمان نەدەزانی (واتە: نەیانزانیوە کە عومرەش دەکەن)، هەتا لەگەڵی هاتینە لای ماڵی خوا، ئنجا دەستی گەیاندە بەردە ڕەشەکە (دیارە ئەوە تەوافی هاتن بووە) و سێ جاریان بە خێرایی و چواریان بە ڕۆیشتنی ئاسایی بە دەوری کەعبەدا سووڕایەوە، دوایی چووە لای مەقامی ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێ و، ئەمەی خوێند: **(وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى)** و مەقامی خستە نێوان خۆی و کەعبە وە و نوێژی دابەست، بابم دەیگوت: پێشم وایە هەر لە پێغەمبەرەوە باسی دەکرد: لە دوو ڕکاتەکاندا: **(قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)** و **(قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)**ی دەخوێندن، پاشان گەڕایەوە بۆ لای بەردە ڕەشەکە و، دەستی گەیاندەوە پێی و دوایی لە دەرگاکەوە چوو {کە لێی نیزیک بووە و دوای ئەوەی حەوت سووڕانەوەکەی تەواو کردوون،} ئنجا ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ﴾ی خوێند و فەرمووی: **(أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ)** بەوە دەست پێدەکەم کە خوا لەوەوە دەستی پێ کردوە، لە صەفاوە دەستی پێکرد و، سەرکەوتە سەری و، کاتێک ماڵی خوای بینی، ڕووی کردە قیبلە و، تاکیەتیی و گەورەیی خوای ڕاگەیاند و فەرمووی: **(لَا إِلَـهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَـهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ)**، لە نێوانیشیاندا دەپاڕایەوە، جابیر دەڵێ: سێ جاران ئاوای کرد، پاشان بەرە و مەڕوە هاتە خوار، هەتا کاتێک کە پێیەکانی بەرە و نزمایی شیوەکە شۆڕبوونەوە، بە گورگە لۆقە ڕۆیشت (بە نەرمە غار) بەڵام کە بەرەو سەرێ تێهەڵکشایەوە، بە ڕۆیشتنی ئاسایی ڕۆیشت، هەتا گەیشتە مەڕوە و، لەسەر صەفا چیی کردبوو، لەسەر مەڕوەش کردی، ئنجا لە جاری کۆتایی سەر مەڕوەدا فەرمووی: ئەگەر ئەوەی تێپەڕی، بۆم بێتەوە پێش، قوربانیی لەگەڵ خۆم ناهێنم و ئەمیان دەکەمە عومرە، ئنجا هەر کامێکتان قوربانیی نەهێناوە، با ئیحرام بشکێنێ و ئەو تەواف و

هاتن و چوونەی نێوان صەفاو مەڕوە بکاتە عومرە، لەو کاتەدا (**سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُم**) هەڵسا و گوتی ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئایا هەر بۆ ئەم ساڵمانە، یان بۆ هەمیشەیە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ پەنجەکانی هەردوو دەستی خستنە نێو یەک و دوو جاران فەرمووی: عومرە چووە نێو حەجەوە، نەخێر بۆ هەتا هەتایە.

ئنجا عەلی (خوا لێی ڕازی بێ)، کە لە یەمەنەوە هاتبۆوە و حوشتری هێنابوون، چووە لای پێغەمبەر ﷺ و فاتیمەی بینی (هاوسەری خۆی و کچی پێغەمبەر ﷺ)، لەوانە بوو کە ئیحرامیان شکاندوە و بەرگ و پۆشاکی ڕەنگداری پۆشیوە و چاوی ڕشتبوون، عەلییش لەو بارەوە گلەیی لێ کرد، ئەویش گوتی: بابم بەمە فەرمانی پێکردووم، ئنجا عەلی لە عێراق دەیگوت: منیش چوومە لای پێغەمبەر ﷺ گلەیی لە فاتیمە بکەم و پێغەمبەری لێ هانبدەم، کە لێپرسینەوەی لەگەڵ دا بکات، لەسەر ئەوەی کردوویەتی و، لەو بارەوە کە لە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە، لێی بپرسم، بەڵام کە هەواڵم پێدا کە لەو بارەوە گلەییم لێ کردوە، فەرمووی: ڕاست دەکات، ڕاست دەکات.

ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئایا کاتێک کە ئیحرامت بە حەج بەست، چیت گوت: ئەی عەلی؟ دەڵێ: گوتم: ئەی خوایە! ئەو من دەنگ بەرز دەکەمەوە و ئیحرام دەبەستم، بەو شتەی کە پێغەمبەرەکەت ئیحرامی پێ بەستوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەجا من قوربانییم هێناون و، تۆش جارێ ئیحرام مەشکێنە، ئنجا ئەو کۆمەڵە قوربانییەی کە عەلی لە یەمەنەوە هێنابوونی و ئەوەی کە پێغەمبەر هێنا بوونی، سەد (١٠٠) سەر بوون، سەد حوشتر، ئیدی سەرجەم خەڵکی ئیحرامیان شکاندو سەری خۆیان کورتکردەوە، بێجگە لە پێغەمبەر ﷺ و لەو کەسانەی کە قوربانییان هێنابوو، {ئەوانەی قوربانیی لەگەڵ خۆیان بێنن، نابێ ئیحرام بشکێنن، تاکو عومرە و حەج هەردووکیان ئەنجام دەدەن و، قوربانییەکانیان سەر دەبڕن}.

ئنجا لە ڕۆژی تەڕویە (**یَوْمُ التَّرْوِیَة**)دا ڕوویان کردە مینا {واتە: ڕۆژی هەشتەمی (**ذو الحجة**)} و ئیحڕامیان بە حەج بەست، ئەوانەش کە عومرەیان کرد بوو، ئیحڕامیان شکاند بوو، ئیحڕامیان بە حەج بەست و، پێغەمبەری خواش ﷺ سوار بوو، نوێژەکانی نیوەڕۆ و عەصر و ئێوارە و خەوتنان و بەیانیی، لە مینادا کردن، ئنجا هەتا خۆرکەوتن مایەوە و، فەرمانی کرد کە چادرێکی لە موو چنرا وی لە نەمیرە (**نَمِرة**) {واتە: لە عەڕەفات} بۆ هەڵبدەن.

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ڕێ و قوڕیشییەکان وایانزانی لە لای (**الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ**)، دەوەستێ {کە شاخۆلکەیەکە لە موزدەلیفە پێی دەگوترێ: قوزاح و، هەندێکیان گوتوویانە: موزدەلیفە هەمووی (**الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ**)ە} وەک چۆن قوڕەیش لە سەردەمی نەفامێتیی دا، دەیانکرد، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ڕەتبوو، هەتا هاتە عەڕەفات و بینی چادرەکەی لە نەمیرە بۆ هەڵدراوە و، لەوێ دابەزی و سەقامگیر بوو، هەتا کاتێک کە خۆر لایدا بە لای خۆرئاوادا، فەرمانی کرد حوشترەکەیان بۆ جل کردو هێنا و، هاتە لای (**بطن الوادي**)ی، کە دۆڵی (**عَرَنَة**)شی پێدەگوترێ و، لەوێ وتاری بۆ خەڵک دا {کە وتارەکەی پێغەمبەر ﷺ وتارێکی زۆر گەورە و مێژووییە و من دەقەکەی بە عەڕەبیی دەخوێنمەوە و دوایی مانای دەکەین} فەرمووی:

{**إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلَا كُلُّ شَيْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَيَّ مَوْضُوعٌ، وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ، وَإِنَّ أَوَّلَ دَمٍ أَضَعُ مِنْ دِمَائِنَا دَمُ ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ، كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِي بَنِي سَعْدٍ، فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ، وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ، وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُ، رِبَانَا رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ، فَاتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ، وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ، وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَقَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ كِتَابَ اللهِ، وَأَنْتُمْ تُسْأَلُونَ عَنِّي فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ؟ قَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ، وَأَدَّيْتَ، وَنَصَحْتَ، فَقَالَ بِإِصْبَعِهِ**

**السَّبَّابَةِ يَرْفَعُهَا إِلَى السَّمَاءِ وَيَنْكُتُهَا إِلَى النَّاسِ: «أَللَّهُمَّ اشْهَدِ، أَللَّهُمَّ اشْهَدْ»، ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ أَذَّنَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئاً، ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ}.**

واتە: بێگومان خوێنتان و ماڵتان و سامانتان، وەک قەدەغەی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتاندا و، لەم وڵاتەتاندا، لێتان قەدەغەیە، بزانن کە هەر شتێک پەیوەندیی بە نەفامێتییەوە بێ، لە ژێر ئەم دوو پێیەم دایە، خوێنەکانی سەردەمی نەفامێتیی بە فەوتاو بە هەدەر دادەنرێن و، یەکەمین خوێن کە بە بە زایە چووی دادەنێم، لە خوێنەکانمان، خوێنی (**ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ**)ە، کە لە نێو تیرەی بەنی سەعددا بەدایەن درابوو، تیرەی (**هُذَيْل**) کوشتیان {خوێنی خزمەکەی خۆی، پێشێ بە بەفیڕۆ چوو دانا، مادام لە سەردەمی نەفاییدا بووە}، هەروەها سوودی سەردەمی نەفامێتیی بە فەوتاو دادەنێم و، یەکەمین سوود کە بە بە زایە چووی دادەنێم، سوودی خۆمانە سوودی (**عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ**)، هەمووی بە فەوتاو حیسابە {واتە: هیچ کەس بۆی نیە، داوای ئەو جۆرە خوێن و سوودانە بکاتەوە و، پێشی خوێنی نیزیکانی خۆی، هەروەها ئەو سوودەی مامی لەسەر خەڵکی بووە، دەبێ لە خۆتەوە دەست پێ بکەی}، دەربارەی ژنان پارێز لە خوا بکەن، چونکە ئێوە بە ئەمانی خوا وەرتانگرتوون و، بە ئیزن و فەرمانی خوا داوێنیانتان حەڵاڵ کردوە، مافی ئێوەیە لەسەریان کە هەر کەسێک حەز لە چارەی نەکەن، نەهێڵن بێتە ماڵتان و فەرموویان لێ نەکەن و، ئەگەر ئەوەیان کرد {واتە: بە ئامۆژگاریی کردن و وازهێنان لەسەرجێی چاک نەبوون} ئەوە بۆ تەمبێ کردنیان بە شێوەیەک کە زۆر توند نەبێ، لێیان بدەن، {ئافرەتێک کە یاخیی دەبێ لە مێردی} مافی ئەوانیشە لەسەر ئێوە، بە چاکە و بە شێوەی باو و پەسند و بژین و، بەرگ و پۆشاکیان بۆ دابین بکەن.

شتێکم لە نێوتاندا بە جێ هێشتوە کە ئەگەر چاک دەستی تێبگرن، هەرگیز پاش پەیڕەوییتان لێی سەرگەردان نابن، ئەویش کتێبی خوایە ﷻ.

ئێـوەش لـە بـارەی منـەوە پرسـیارتان لـێ دەکـرێ، ئایـا چیـی دەڵێـن؟ گوتیـان: شـاهێدیی دەدەیـن بـە ڕاسـتیی تـۆ پەیامـی خـوات پێڕاگەیاندوویـن، جێبەجێـت کـردو دڵسـۆزیی و پەرۆشـییت نوانـد، ئەویـش بـە پەنجـەی شـایەتمانی ئاماژەی بـەرەو ئاسـمان کـردو، بـەرزی کـردەوە و، ڕووی پێکـردە خەڵکەکـەو فەرمووی: خوایە! شـایەد بـە، خوایـە! شـایەد بـە، خوایـە! شـایەد بـە، ئەمـەی سـێ جـاران دووبـارە کـردەوە، دوایـی بانـگ درا و قامـەت خوێنـدرا ، نوێـژی نیـوەڕۆی کـرد و، دوایـی دووبـارە قامەت خوێنـدرا و نوێژی ئێـوارەی کـرد و، لـە نێوانیانـدا هیـچ نوێـژی نەکـرد، ئنجـا پێغەمبـەر ﷺ سـوار بـوو هەتـا گەیشـتە شـوێنی ڕاوەسـتان {لـە عەرەفـات}

ئنجـا ڕووی کـردە قیبلـە و زگـی حوشـترەکەی کـە بـە **(قَصْوَاء)** نـاسراوە، کـردە تاتـە بـەردەکان و، ڕێچکـە و ئاپـۆرای خەڵکەکـەی خسـتە بەردەمـی خـۆی، ئنجـا هـەروا بـە ڕاوەسـتاوەیی مایـەوە و زیکـر و پاڕانـەوەی کـرد، هەتـا خـۆر ئـاوا بـوو، زەردەش تـۆزی ڕۆیشـت و قـورسی خـۆر ون بـوو، ئنجـا پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە ئوسـامەی لـە پشـت خۆیـەوە سـوار کـرد بـوو، بـەرە و موزدەلیفـە شـۆڕبۆوە، دوای خۆرئـاوا بـوون، لـە کاتێکـدا کـە هێنـدە جڵـەوی حوشـترەکەی توند کـرد بـوو، سـەری لـە قەرپـووزی کورتانەکـەی دەدا {سـەری حوشـترەکە} بـە دەسـتی ڕاسـتی ئامـاژەی دەکـرد و دەیفەرمـوو: ئـەی خەڵکینـە! ئارامیـی، ئارامیـی، {یـانی: دەنگـە دەنـگ و قـرە قـڕ مەکـەن} هـەر کاتێـک دەگەیشـتە گردێـک لـە گردۆلکـەکان تۆزێـک جڵـەوی بـۆ حەشـترەکە شـل دەکـرد، تاکـو لێـی سـەر دەکـەوت، {پێشـێ بۆیـە جڵـەوی بـۆ تونـد کـردوە، تاکـو بـە پەلـە نـەڕوات و بـە خەڵـک بڵـێ: ئـارام بـن} هەتا گەیشـتە موزدەلیفـە و، لـەوێ نوێـژی شـێوان و خەوتنـانی بـە بانگێـک و دوو قامـەت کـرد و، هیـچ نوێـژی سـوننەتی لـە نێوانیـان دا نەکـرد.

پاشـان پێغەمبـەر ﷺ هەتـا سـپێدەی بەیانیـی ڕاکشـا و خـەوت، کاتێـک بەیانیـی بـۆ ڕۆشـن بـۆوە، بـە بانگێـک و قامەتێـک نوێـژی بەیانیـی کـرد، ئنجـا سـواری حەشـترەکەی بـۆوە، تاکـو هاتـە لای **(الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ)**، لـەوێ ڕووەو قیبلـە وەسـتا و

لە خوا پاڕایەوە و (**أَللهُ أكبر ولا إله إلاَّ الله**)ی کرد و، یەکتایی خوای ڕاگەیاند، هەروەها بە ڕاوەستاوەیی مایەوە، تاکو دنیا تەواو ڕووناک داهات، ئنجا بەر لەوەی خۆر دەربکەوێ، کەوتە ڕێ بەرەو مینا.

پاشان فەزڵی کوڕی عەبباسی ئامۆزای لە پشت خۆیەوە سوار کرد، کە پیاوێکی قژ جوان و سپی پێست و بەرچاو بوو، کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ڕێ، چەند ئافرەتێک کە دەڕۆیشتن بە لایدا ڕەت بوون، (**الْفَضْلَ**)یش دەستی کرد بە سەرنجدانی ئافرەتەکان و، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستەسەر ڕووی فەزڵ، فەزڵیش ڕووی بە لایەکەی دیکەدا سوڕاندەوە و، هەر تەماشای دەکردن و دووبارە پێغەمبەر ﷺ بە لایەکەی دیکەدا دەستی خستە سەر دەم و چاوی فەزڵ و، ڕووی لە لایەکەی دیکەش، وەری چەرخاند، چونکە هەر تەماشای ئافرەتەکانی دەکرد، هەتا گەیشتە دۆڵی موحەسسیر (**وادي مُحَسِّر**)، توزێک وڵاخەکەی خێرا کرد، پاشان ئەو ڕێیەی نێوەڕاستی گرت کە بەرەو جەمرەی گەورە دەچێ، تاکو هاتە لای ئەو جەمرەی کە لە لای درەختەکەیە (واتە: جەمرەی کە لە مەککەوە نیزیکترە)، حەوت بەردۆچکەی تێگرتن و، لەگەڵ هەر بەردۆچکەیەکدا (**أَلله أكبر**)ی دەکرد، وەک بەردۆچکەی پەلا پیتکە بوون و، لە (**بطن الوادي**)یەوە دەیهاویشتن و بۆ جەمرەی گەورە، دوایی بەرەو کوشتارگە (**الْمَنْحَر**) چوو و، لەوێ شەست و سێ (٦٣) حوشتری بە دەستی خۆی بە نێزەکەی (ئەو چەقۆیە گەورەی کە پێیبوو) سەربڕین، دوایی نێزەکەی دایە دەست عەلیی و ئەوەی مابوون، بیست و حەوت (٢٧) دانە بوون، ئەویش سەری بڕین و، لە قوربانییەکانی خۆیدا بەشداری کرد، پاشان فەرمانی کرد، کە لە گۆشتی هەر حوشترێک پشکێک گۆشت بخرێتە مەنجەڵێکەوە، ئنجا کوڵێندرا و، لەگەڵ عەلیی گۆشتەکەیان خوارد و لە چەلاوەکەشیان خواردەوە.

دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ سوار بۆوە و بەرەوماڵی خوا ڕۆیشتەوە و تەوافی کرد و، نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد، ئنجا هاتە لای بەنو عەبدلموتتەلیب، خزمانی پشتی خۆی کە لە سەرچاوەی ئاوی زەمزەم ئاویان دەدا بە خەڵکی،

فەرمووی: ئەی وەچەی عەبدولموتتەلیب! هەڵهێنجن، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە، کە خەڵکی ئەو ئاو پێدانەتان لێ بستێنن، منیش لەگەڵتان هەڵم دەهێنجا، {یانی: بۆ ئەوەی دوایی خەڵک نەڵێن: پێغەمبەر ﷺ چووە ئاوی داوە بە حاجییان، دەبێ ئێمەش وا بکەین، بۆیە بەشدار نابم} پاشان دۆلکەیەکیان دایە لێی خواردەوە.

ئەمە چۆنیەتیی حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەر ﷺ بوو، کە تەنیا ئەو حەجەی کردوە.

## ١٧)- چۆن حەج و عومرە دەکەین:

پێشترش باسمان کرد کە حەج و عومرەکردن، سێ جۆرە:

**١-** جۆری (**تَمَتُّع**)، ئەوەیە کە نیەت بە عومرە بێنی و، دوایی ئیحرام بشکێنی و، ئنجا هەر لەو شوێنەی ئیحرامت لی شکاندوە کە مەککەیە، جارێکی دیکە ئیحرام بە حەج ببەستیەوە، بەڵام خوێنکت دەکەوێتە سەر.

**٢-** (**قِران**) ئەوەیە کە نیەت بە هەردووکیان (حەج و عومرە) بێنی، ئەویش دیسان هەر خوێنت دەکەوێتە سەر.

**٣-** (**إفراد**)یش ئەوەیە کە نیەت بە حەج بێنی و دوای ئەوەی حەجت تەواو کرد، ئنجا عومرەش بکەی، هەڵبەتە هەر کەسێک ئیحرام بە حەج و عومرە ببەستێ: یەک تەواف و یەک سەعیی (هاتن و چوونی نێوان صەفا و مەروە) بۆی وەبەری حەج و عومرەش دەکەون، وەک دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: {**وَأَمَّا الَّذِينَ جَمَعُوا الحَجَّ وَالعُمْرَةَ، فَإِنَّمَا طَافُوا طَوَافًا وَاحِدًا**} (**أخرجه البخاري: ١٤٨١، ومسلم: ٢٩٦٨**).

واتە: ئەوانەی حەج و عومرەیان پێکەوە کرد، یەک تەوافیان کرد.

واتە: حەوت جار بە دەوری کەعبەدا سووڕانەوە (ئەمە تەوافێکە) هەروەها هاتن و چوونی نێوان صەفا و مەروە، بەس جارێکیان کرد.

**بەم شێوەیە حەج و عومرە دەکرێ :**

**١-** کاتێک وەختی بە ڕێکەوتن بۆ سەفەری حەج نیزیک بۆوە، دەبێ مرۆڤ جوان خۆی بشوات و نینۆکەکانی بکات و، ئەگەر پیاو بێ، دەبێ سمێڵی خۆی کورت بکاتەوە، ئنجا ئەگەر زۆری نەمابوو بۆ گەیشتنە میقات، ئەو مرۆڤە دەتوانێ بەرگی ئیحرامیش بپۆشێ، کە چاکتر وایە دوو پەشتەماڵ، یان دوو پارچە قوماشی سپی پاک بن، ئەگەرنا هەر ڕەنگێکی دیکەش بن، هەر دەبێ، دەتوانێ سەعاتێک یان کەمتر پێش گەیشتنە میقات، پۆشاکەکانی بپۆشێ و، دەشگونجێ هەر لەو کاتەدا، نیەت بێنێ بەڵام ئەگەر بە سواری فڕۆکە بوو، دەبێ دووربینیی (**إحتياط**) بکرێ و پێش گەیشتن بە میقات، نیەت بهێنرێ و ئەگەر لێی تێپەڕیی، تازە لە میقات ئیحرامی نەبەستوە و خوێنی دەکەوێتە سەر.

**٢-** کە چووە نێو شاری مەککە و، چوو مزگەوتی حەڕام و چاوی بە کەعبە کەوت، وا باشە سێ جاران (**أَللّهُ أكبر ولا إله الاَّ الله**) بکرێ و، لە خوا بپاڕێتەوە، دوایی یەکسەر تەوافی چوونە کەعبە (**طواف القدوم**) بکرێ، ئنجا ئەگەر ئەو کەسە نیەتی بە حەجی (**تَمَتُّع**)هێنا بوو، وا باشە یەکسەر دوای تەوافی کەعبە، هاتن و چوونی نێوان سەفا و مەڕوەش بکات و، قژی کورت بکاتەوە و عومرەکەی تەواو بکات.

**٣-** بەڵام ئەگەر ئەو کەسە (**مُفْرِد**) بوو و تەنیا ئیحرامی بە حەج بەستبوو، یاخود (**قَارِن**) بوو و نیەتی هەردووکیانی هێنا بوو، ئەوە ئیحرامەکەی هەر هەیە و، دروست نیە ئیحرامەکەی بشکێنێ، تاکو مەناسیکەکانی حەج تەواو دەکات، بەڵام حەجی (**تَمَتُّع**) جیایە و عومرەکەی تەواو دەکات و ئیحرام دەشکێنێ و، دوایی ئیحرام بە حەج دەبەستێتەوە.

**٤-** لە عەرەفات لە هەر شوێنێک بوەستێ، هەر دروستە، بەڵام باشتر وایە لە لای تاتە بەردەکان ڕوو بە قیبلە بوەستێ، تاکو خۆرئاوا بوون و، بە گەرمیی لە خوا بپاڕێیتەوە .

**٥-** پاش خۆرئاوا بوون بە تەواویی و لەگەڵ بوولێڵدا، دەبێ بەرە و موزدەلیفە بچێ و لەوێش پاش نوێژکردنی شێوان و خەوتنان بە کۆکراوەیی و کورتکراوەیی، هەتا بەیانی ئیسڕاحەت بکات و، پاش نوێژی بەیانی دنیا کە ڕووناک بۆوە بەرەو مینا بکەوێتە ڕێ.

٦- ئنجا کە چووە مینا، سەرەتا حەوت بەردۆچکە بە جەمرەی گەورەدا بدات، پاشان ئەگەر قوربانیی هەبوو، یان خوێنی لەسەر بوو، سەری ببڕێ، پاشان سەری بتاشێ، یاخود کورتی بکاتەوە، ئنجا ئەوە پێی دەگوترێ: ئیحرام شکاندنی گچکە، یاخود یەکەم.

٧- پاشان بەرە و مەککە و مزگەوتی حەرام بچێ و تەوافی پایە (**طواف الركن**) یاخود تەوافی داپەڕین (**طواف الإفاضة**) بکات و، ئەگەر (**مُفْرِد**) یاخود (**قارن**) بوو و دوای تەوافی هاتن، سەعیی نەکرد بوو، سەعییش بکات و، ئەگەر کردبووشی ئەوە یەک سەعیی وەبەر هەردووکیان دەکەوێ، دوای ئەوەش دەگاتە قۆناغی دووەم و کۆتایی ئیحرام شکاندن و، دوای تەواوکردنی بەردۆچکە هاویشتن بۆ سێ جەمرەکان، لە ڕۆژانی یازدە و دوازدە و سێزدەدا، ئەوە بە یەکجاریی خوا پەرستییەکانی حەجیشی تەواو کردوون و، دوایی تەوافی خواحافیزیی (**طواف الوداع**) دەکات و، شاری مەککەی موبارەک بە جێدێڵێ و دەگەڕێتەوە شوێن و وڵاتی خۆی.

## ١٨)- بەرهەم و سوودەکانی حەج:

١- پاک بوونەوە لە چڵک و چەپەری گوناهو، هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی سپی لەگەڵ خوادا ﷻ، وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَنْ حَجَّ فَلَم يرْفُثْ، وَلَمْ يفْسُقْ، رَجَعَ كَيَومِ ولَدتْهُ أُمُّهُ**} (**أخرجه أحمد: ٧٣٧٥، والبخاري: ١٤٤٩، والترمذي: ١٦٥٨، والنسائي: ٢٦٢٧، وابن ماجه: ٢٨٨٩، وابن حبان: ٣٦٩٤**).

واتە: هەر کەسێک حەجێ بکات و، قسەی بێ جێ نەکات و، کرداری ناڕێک نەکات، وەک ئەو ڕۆژەی لە دایکی خۆی بووە، ئاوا دەگەڕێتەوە، واتە: پاک بۆتەوە.

لە بارەی عومرەشەوە فەرموویەتی: {**الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ**} (**أخرجه مالك: ٧٦٧، وأحمد: ٩٩٤٩، والبخاري: ١٦٨٣، ومسلم: ١٣٤٩، والترمذي: ٩٣٣، والنسائي: ٢٦٢٩، وابن ماجه: ٢٨٨٨، وابن حبان: ٣٦٩٦**).

واتە: عومرە بۆ عومرە، نێوان خۆیان دەسڕنەوە و، حەجی وەرگیراویش جگە لە بەهەشت پاداشتێکی دیکەی نیە.

٢- پتەوتر بوونی ئیمان و، تازەکردنەوەی پەیمانی بەندایەتیی و، زیادبوونی پارێزکاریی، کە هەموو خواپەرستییەکانی حەج، بێگومان باشترین بەندایەتیی بۆ خوا کردن و، خوا بە یەکگرتنیان، تێدا بەرجەستە دەبێ: هەم نیەت هێنان و ئیحرام بەستن و، هەم سووڕانەوە بە دەورەی ماڵی خوادا و، هەم ڕاوەستان لە عەرەفات لە خزمەت خوادا ﷻ و، هەم شەومانەوە لە موزدەلیفە و لە مینا، هەروەها وردە بەرد پێدادانەکانی سێ جەمرەکان، کە ڕەمزی بەرد بارانکردنی شەیتان و بە قسە نەکردنیەتی و، هەموو کردەوەکانی دیکەی حەج، بەندایەتیی مرۆڤ بۆ خوا، بە باشترین شێوە بەرجەستە دەکەن.

٣- ڕاهاتن لەسەر ڕەوشت بەرزیی و، هێمنیی و، ئارامیی و، خۆ دوورگرتن لە گوناهو هەڵە، وەک پێشتر ئایەتەکەمان هێنا، کە مرۆڤ لە کاتی هەبوونی ئیحرامدا، دەبێ خۆی لە هەموو ئەو شتانە بپارێزێ، کە قەدەغەن، زیاتر لە حاڵەتی ئاسایی و، هەندێک شتی دیکەش کە لە شوێنی دیکە و لە کاتی دیکەدا، قەدەغە نین، دەبێ هەر خۆییان لێ بپارێزێ.

٤- لەبەر چاو بەرجەستەو نمایان بوونی و سیرە و ژیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، کاتێک دەچیە ئەو شوێنانە، بۆ وێنە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو بەردە ڕەشەی ماچکردوە و دەستی لێداوە، بە دەوری کەعبەدا سووڕاوەتەوە و، لە عەرەفات وەستاوە و، شەوێ لە موزدەلیفە و لە مینا ماوەتەوە و، هاتن وچوونی نێوان سەفا و مەڕوەی کردوە، هەروەها هاوەڵانی بەڕێزی، ئەوە هەمووی لەبەر چاوت، نمایان و بەرجەستە دەبێ.

٥- بە بەرجەستەیی دیتنی زۆر لە بەها بەرزەکانی ئیسلام، وەک یەکسانیی و، ئازادیی و، فەرمانبەریی بۆ خوا و، دۆستایەتیی لەگەڵ هەموو ئەهلی ئیمان دا، هەر ڕەنگ و زمانێکیان هەبێ، پاشان بەرد بارانکردنی سێ جەمرەکان: کە ئەوە نیشانەو هێمای هەڵگەڕانەوەیە لە شەیتان و، بە قسەنەکردنی شەیتانە.

٦- خۆ بەختکردن و قوربانیی دان لە پێناوی خوادا ﷻ، کە لە قوربانیی سەربڕیندا و لە خوێن ڕشتن لە پێناوی خوادا، خۆی دەبینێتەوە.

٧- ڕاهاتن بە گوێڕایەڵیی و فەرمانبەرییەوە، کە لە کاتی ئیحرام بەستندا، دەبێ ئینسان زۆر وریا و هۆشیاربێ و، هیچ شتێک نەکات، کە نا فەرمانبەریی خوا ﷻ بێ.

٨- حەج و عومرە سەربازگەیەکن بۆ مەشق و ڕاهێنان و، لە ڕاستییدا مرۆڤ حاڵەتی سەربازیی و حاڵەتی ئامادەیی و هۆشیاریی لە خۆیدا بەرجەستە دەکات، لە کاتی حەج و عومرەدا.

٩- هەڵگرتنی باری دینداریی و بە جێهێنانی ئەرکی بەندایەتیی، بەشداریی کردن و دەستبارگرتنی هەموو ئەندامانی، پێویستە، هەروەک لە حەجدا ئێمە هەموو ئەو شتانە دووبارە دەکەینەوە کە ئیبراهیم و هاجەری خێزانی و ئیسماعیلی کوڕی (**علیهم الصلاة والسلام**) کردوویانن، کە بێگومان کۆمەڵگای مسوڵمان، هەمیشە لە پیاو و ئافرەت و منداڵ پێک دێ و، هەمووشیان دەستبارگروهاوکارن.

کەواتە: دینداریی و هەڵگرتنی ئەرکی بەندایەتیی و مسوڵمانەتیی، هەموو کۆمەڵگای پێویستە بە پیاوان و ئافرەتان و، بە ورد و درشتەوە.

١٠- کۆمەڵێک بەرژەوەندیی دیکەی سیاسیی و، ئابووریی و، فەرهەنگیی و، کۆمەڵایەتیی، لە حەج و عومرەدا هەن، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ ﴾ الحج: ٢٨، لە ڕووی سیاسییەوە مسوڵمانان ئاگاداری حاڵ و باڵی یەکدی دەبن و، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە پتر پێک ئاشنا دەبن و، لە ڕووی ئابوورییەوە بازرگانیی و مامەڵە دەکەن و، لە ڕووی فەرهەنگییەوە، شارەزای کلتوور و عادەتی گەلان و نەتەوەکانی دیکە دەبن و، زانیارییان زیاد دەکات، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: کۆمەڵێک بەرژەوەندیی دێنە دی، کە لە ڕاستییدا لە حەج و عومرەدا نەبێ، ئەو جۆرە بەرژەوەندییانە نایەنە دی.

## ١٩)- دوا قسەم لە بارەی حەج و عومرەوە:

لـە پێنـج بڕگـەدا، بـە کورتیـی دوا قسـەی خـۆم لـە بـارەی حـەج و عومـرەوە دەکـەم:

**١)-** براو خوشکی بەڕێزم! ئەگەر خوا قسمەتی کرد و ویستت حەج و عومرە بکەی، بەر لە هەموو شتێک دوای نیاز و مەبەستی خۆ ساغکردنەوە بۆ خوا ﷻ، هەوڵبدە بە وردیی شارەزای حەج و عومرە بی، بە پایە و فەرز و سوننەتەوە و، بەرچاو ڕوونانە ئەو سەفەرە موبارەکە بکە و، بزانە چی دەکەی و چۆنی دەکەی؟

**٢)-** ئەگەر خوا کردی حەج و عومرەت کردو گەڕایەوە، ڕێژەی ئەندازەی قبووڵکران و قبووڵ نەکرانی حەج و عومرەکەت، بەوە بزانە کە تاکو چ ڕاددەیەک گۆڕیویانی و پاک و چاکیان کردووی و، بەرەو خوایان بردووی، ئنجا ئەگەر حەجەکەت قبووڵ و، سەعییەکەت سوپاسکراو (**حَجٌّ مبرورٌ، وسعي مَشكورٌ**) و، بێ گوناهەکەشت لێبوردرا و (**ذنْبٌ مغفور**) بێ، ئەوە لە ڕاستییدا بۆ خۆت بە مراد گەیشتووی و، ئامانجێکی گەورەی دینداریت هێناوەتە دی، بەڵێ دوای حەج دەبێ تەماشای خۆت بکەی: تا چ ڕاددەیەک گۆڕاوی و چاک بووی.

**٣)-** زۆر وریا بە حەج و عومرە کردن، جگە لە هی فەرز، نەکەیە خولیا و ئاواتی خۆت و چوونە حیجازت لێ ببێتە نەخۆشیی و، هەموو ساڵێک: حیجاز بگرە و هاتم! چونکە زۆر کاری چاک و تاعەت و فەرمانبەریی هەن، لە حەجی سوننەت و، عومرەی سوننەت خێرترن و، دەبێ مرۆڤ بە پێوەر و تەرازووی شەریعەت شتەکان هەڵسەنگێنێ، نەک بە میزاجی خۆی.

**٤)-** بازرگانیی مامەڵەکردن لە حەجدا شتێکی ڕەوا (**مباح**)یە، بەڵام نابێ هەموو کرد و کۆشش و تەقەلاشمان ببێتە ئابووریی و بازرگانیی و، لە حەجیشدا هەر سەرگەرمی دنیا و شتومەک و کەل وپەل بین و، مرۆڤ لەبەر شت کڕین و دیاریی کڕین، ئاگای لە زۆر شت

نەمێنێ و دالْغە و خولیای هەر لە لای ئەوەیە: کە فڵانکەس چی بۆ بێنێ و، فیسارکەس چی بۆ بێنێ؟ یان هی وایە بۆ قازانجکردن، شت لەگەڵ خۆی دێنێتەوە دەیفرۆشێ!

٥)- ئاشکرایە حەج لەسەر کەسێک فەرز نابێ، توانایی ماڵ و سامانی نەبێ و، مەسەلە تەنیا چوونە حەج و عومرە نیە، بەڵکو لەوەش گرنگتر ئەوەیە، کە ئینسان بە ماڵی حەڵاڵ و زەلاڵ بچێ، چونکە لە ئیسلامدا وێڕای ئامانج، پێویستە ئامرازی شەرعیی چاکیش بەکاربێنین و، لە ڕێی پاکەوە بەرە و ئامانجی چاک هەنگاو بنێین، ئەگەرنا خوا نەکردە، مرۆڤ ڕەنج بە خەسار و شەرمەزار دەبێت.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات: هەم حەج و عومرە، هەم هەموو ئەو خواپەرستییانەی ئەنجامیان دەدەین، بە باشترین شێوە ئەنجامیان بدەین و، باشترین بەرهەم و ئامانجیشمان لێیان دەستگیر ببێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە بریتین لە ئایەتەکانی: (٣٨ - ٤٨)، تەوەری سەرەکییان بریتیە لە مۆڵەتدرانی مسوڵمانان بە جەنگ و بەرگریی لە خۆکردن و خستنەڕووی بەڵگەو پاساوەکانی جیهادو جەنگ و ئامانجەکانی.

پاشان ئاماژەیەکی زۆر کورت بە چارەنووسی شوومی گەل و کۆمەڵگایە پێشووەکان، لە ئەنجامی کوفرو ستەم و ملهووڕییاندا، دەکات، کە جێی خۆیەتی پەندیان لێ وەربگیرێ، نەک هەمان هەڵەو ئەزموونی تاڵی ئەوان دووبارە بکرێتەوە، کە بێگومان هەمان سەرەنجامی شوومیشی بەدوادا دێ.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾ أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴿٤١﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوۡمُ إِبۡرَٰهِيمَ وَقَوۡمُ لُوطٖ ﴿٤٣﴾ وَأَصۡحَٰبُ مَدۡيَنَۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمۡلَيۡتُ لِلۡكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئۡرٖ مُّعَطَّلَةٖ وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَتَكُونَ لَهُمۡ قُلُوبٞ يَعۡقِلُونَ بِهَآ أَوۡ

ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٨﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی خوا بەرگریی لە بڕواداران دەکات (چونکە) بێگومان خوا هەموو زۆر خیانەتکارێکی سپڵەی خۆشناوێ ﴿٣٨﴾ ئەوانەی جەنگیان لە دژ دەکرێ، بە هۆی ئەوەوە کە ستەمیان لێکراوە، مۆڵەتدران (تۆڵەبسێننەوە)و مسۆگەر خواش لەسەر سەرخستنیان توانایە ﴿٣٩﴾ ئەوانەی بەبێ هیچ هەقێک لە ماڵەکانیان وەدەرنران، جگە لەوەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایەو، ئەگەر خوا هەندێک لە خەڵکیشی بە هەندێکیان پاڵپێوە نەنابایە (بە بڕواداران بێبڕوایانی ڕاونەنابایە) دێرو کڵیساو کەنیشتەو مزگەوتانێک کە زۆر یادی خوایان تێدا دەکرێ دەڕمێنران و، بێگومانیش هەر کەس (بەرنامەی) خوا سەربخات، خوا سەری دەخات، بە دڵنیایی خوا ئەو پەڕی بەهێزی زاڵە ﴿٤٠﴾ ئەوانەی هەرکات لە زەویدا دەسترۆیشتوومان کردن: نوێژ بەرپا دەکەن و، زەکات دەدەن و، فەرمان بە پەسند دەکەن و، ڕێگریی لە ناپەسند دەکەن و، سەرەنجامی کارەکانیش هەر بۆ لای خوا دەچێتەوە ﴿٤١﴾ ئنجا ئەگەر (بێبڕوایان) بە درۆشت دابنێن، پێش وانیش (هەرکام لە:) گەلی نووح و (گەلی) عادو (گەلی) سەموودو ﴿٤٢﴾ گەلی ئیبراهیم و گەلی لووطو ﴿٤٣﴾ هاوەڵانی مەدیەن، (پێغەمبەرانیان بە درۆدانان) و مووساش (لەلایەن فیرعەون و گەلەکەیەوە) بە درۆ دانراو، مۆڵەتی کافرانم داو دوایی گرتمن (و سزام) دان، ئنجا نکووڵیکردن (و سزادان)م چۆن بوو! ﴿٤٤﴾ زۆر

ئاوەدانییشـمان فەوتانـدووون، لـە حاڵێکـدا کـە سـتەمکار بـوون، ئێسـتا دیوارەکانیـان بەسـەر سـەربانەکانیاندا کەوتـوون (تێـک ڕووخـاون) و بیـری (ئـاوی) پەکخـراوو، کۆشـکی بـەرزی سـپیکارکراو (یـان لـێ جێـماون) ﴿٤٥﴾ ئنجـا ئایا بـە زەویـدا نەڕۆیـون (بـۆ سـەرنجدانی شـوێنەواری گـەلانی پێشـوو) عەقـڵ و دڵیـان هەبـن، پێیـان تێبگـەن و گوێیـان هەبـن پێیـان ببیسـتن! بێگومـان چاوەکانیـان کوێـر نیـن، بەڵکـو ئـەو دڵانـەی لـە سـینەکانیاندان، کوێـرن ﴿٤٦﴾ پەلەشـت لـێ دەکـەن بـە هاتنـی سـزاو، خـواش گفتـی خـۆی ناشـکێنێ، ڕۆژێکیـش لـە لای پـەروەردگارت وەک هـەزار ساڵە لـەوەی ئێـوە دەیژمێـرن ﴿٤٧﴾ ڕستیشـم بـۆ گەلێـک ئاوەدانیـی سـتەمکار درێـژ کـردو دوایـی گرتمـن (سـزام دان)و، سـەرەنجامیش تەنیا بـۆ لای منـە ﴿٤٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(خَوَّانٍ): (**الخِيَانَـةُ مُخَالَفَـةُ الحَـقِّ بنَقْـضِ العَهْـدِ فِي السِّرِّ، وَنَقيضُهَـا الأَمَانـة، وَالخَـوَّانُ: صِيغَـةُ مُبَالَغَـةِ خَائِـن**)، (**خَـوَّانٍ**): لـە (**خيانـة**)ەوە هاتـوە، (**خيانـة**) بریتیـە لـە پێچەوانەی هـەق جووڵانـەوە، ئەویـش بـە هـۆی شـکاندنی پەیـمان بـە پەنهانیـی و، دژی (**خيانـة**) بریتیـە لـە (**أَمَانـة**) واتـە: پاراسـتنی بەڵێـن و پەیـمان، (**خَـوَّانٍ**): ڕێژگـەی زێدەڕۆییـە لـە (**خَائِـن**) واتـە: پەیمانشـکێن، بـە کوردییـش هـەر دەڵێـین: خیانەتـکار (**خَـوَّانٍ**)، واتـە: زۆر پەیـمان شـکێن، واتـە: زۆر موخەننـەت و خیانەتـکار.

(كَفُورٍ): (**المُبَالِـغُ فِي كُفْـرَانِ النِّعْمَـةِ، كَفَّـار: صِيغَـةُ مُبَالَغَـةِ كَافِـر، وَكُفَّـار جَمْـعُ كَافِـر وَكَفَـرَة: جَمْـعُ كَفُـور**)، (**كَفُـور**): ڕێژگـەی زێدەڕۆییـە بـۆ (**كافـر**) بـە مانـای سـپڵەو نادیدەگـری چاکـەو نیعمـەتی خـوا، وشـەی (**كافـر**): ڕێژگـەی زێدەڕۆییەکـەی بریتیـە لـە (**كَفَّـار**)، بێبـڕوا (**كافر**)یـش بـە (**كُفَّـار**) کۆدەکرێتـەوە، هەروەهـا بـە (**كَفَـرَة**)ش کۆدەکرێتـەوە، بـەڵام هەندێکیـش گوتوویانـە: کـۆی (**كفـور**) بریتیـە لـە (**كَفَـرة**) واتـە: ئەوانـەی زۆر سـپڵە و نـا سوپاسـن.

(صَوَٰمِعُ ): (جَمْـعُ صَوْمِعَـةٍ، مَعْبَـدُ الرَّاهِـبِ، كُلُّ بنَـاءٍ مُتَصَمِّـعِ الـرَّأْسِ: مُتَلَاصِقُـهُ)، (صَوَامِع) كـۆی (صَوْمِعَة)یـە، واتـە: پەرسـتگای بابـای ڕاهیـب، واتـە: گۆشـەگیر، هـەر خانوویـەک کـە سـەرەکەی هاتبێتەوەیـەک، بـە شـێوەیەک سـەرەکەی مەیلـەو تیژبـێ، پێـی دەگوتـرێ: (صَوْمِعَـة)، واتـە: سـەرەکەی پێکـەوە نووسـاوبێ.

( وَبِيَعٌ ): (جَمْـعُ بِيْعَـة: مَعْبَـدُ النَّصَـارَى)، (بِيَـعْ) کـۆی (بِيْعَة)یـە، بـە پەرسـتگای نەصرانییـەکان دەگوتـرێ.

( وَصَلَوَٰتٌ ): (جَمْـعُ صَـلاة: كَنِيْسَـةُ اليَهـود، بَيْـتُ العِبَـادَةِ لليهـود)، (صَلَوات)یـش کـۆی (صلاة)ە، کەنیشـتەی جوولـەکان، یـان پەرسـتگای جوولـەکان، هـەروەک چـۆن (مسـاجد) کـۆی (مسـجد)ە، پەرسـتگای مسـوڵمانان.

( مَّكَّنَّٰهُمْ ): (مَكَّنْتُـهُ وَأَمْكَنْتُـهُ) واتـە: دەستڕۆیشـتووم کـرد، (مُتَمَكِّـن: ذِي قَـدْرٍ وَمَنْزِلَـة)، (مُتَمَكِّـن): وەک چـۆن بـە دەستڕۆیشـتوو دەگوتـرێ، بـە خـاوەن پلـەو پێگـەش دەگوتـرێ.

(فَأَمْلَيْتُ ): (الإمْـلاءُ: الإمْـدَادُ، أَمْلَيْـتُ: أَمْهَلْـتُ)، (إمْـلاَء) بـە مانـای ڕسـت بـۆ درێژکـردن و مۆڵەتدانـە، (أَمْلَيْـتُ) واتـە: مۆڵەتمـدان، بـوارم پێـدان.

(نَكِيرِ ): (أَنْكَـرْتُ عَـلَى فُـلاَنٍ وَنَكَّـرْتُ عَلَيْـهِ، إِذَا فَعَلْـتَ بِـهِ فِعْـلاً يَرْدَعُـهُ)، (نَكِـير) بـە مانـای (إنـكار)ە، واتـە: نکوولّیلێکـردن، دەگوتـرێ: (أَنْكَـرْتُ عَـلَى فُـلاَنٍ وَنَكَّـرْتُ عَلَيْـهِ) ئەگـەر کارێکـی پێبکـەی کـە بیگێڕێتـەوە، بیپرینگێنێتـەوە لـەوەی دەیـکات.

( فَـكَأَيِّن): (كَأَيِّـن) بـە مانـای (كَـم الخَبَرِيَّة)یـە، بـۆ زۆریـی بـەکاردێ ( فَـكَأَيِّن مِّن قَـرْيَةٍ )، واتـە: زۆر لـە ئاوەدانییـان.

(خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ): واتـە: دیـوارەکانی بەسـەر سـەربانەکاندا کەوتـوون، (جِدْرَانُهَـا سَـاقِطَةٌ عَـلَى سُـقُوفِهَا، أَصْـلُ الخَـوَاءِ: الخَـلاَءُ وَالفَـرَاغُ، خَـوِيَ بَطْنُـهُ مِـنَ الطَّعَـامِ، أي: خَـلِيَ وَفَـرَغ)، وشـەی (خـواء): لـە ئەصڵـدا بـە مانـای بۆشـایی و بەتاڵایـی دێ،

دەگوترێ: (**خَوِيَ بَطْنُهُ مِنَ الطَّعَامِ**) سکی لە خواردن خاڵیی بوو، واتە: برسیەتیی، (خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا) خانووەکان کەسیان تێدا نەماوەو چۆڵ بوون، بۆیە دیوارەکان ڕووخاون (عَلَىٰ عُرُوشِهَا) (**عُرُوش**) کۆی (**عَرْش**)ە، کە بە مانای سەقف و سەربان دێ، واتە: پێشێ سەربانەکان ڕووخاون و دیوارەکان هەر بە پێوە ماون، دواییش دیوارەکان بەسەر سەربانەکاندا ڕووخاون.

(مُعَطَّلَةٍ): (**العَطَلُ: فُقْدَانُ الزِّيْنَةِ وَالشُّغْل، وَعَطَّلَهُ مِنَ العَمَلِ فَتَعَطَّلَ**)، (**عَطَل**): بریتیە لە نەمانی ڕازاوەیی و نەمانی کار، دەگوترێ: (**فُلان عَاطِلٌ باطِلٌ**) واتە: فڵانکەس بێ ئیشە و خەریکی شتی پووچە، (**عَطَّلَهُ مِنَ العَمَلِ فَتَعَطَّلَ**) یەکی لە ئیشێ خست، ئێستا پەککەوتوە، کەواتە (**مُعَطَّلْ**) واتە: پەکخراو یاخود کارپێنەماو.

(وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ): (**قَصْر**) بە مانای کۆشک دێ، (**مَشِيد: بُنِيَ بالشيد**)، بە (**شيد**) بینا کراوە (**شيد**) یان گەچە، یاخود شتێکی وەک گەچە، یانی: سواق دراوە، یاخود (**مَشِيدٍ**) بە مانای (**مُطَوَّل**) دێ، یانی: بەرز هەڵچوو، هەروەها (**شَيَّدَ قَوَاعِدُها: أَحْكَمَهَا**) واتە: (**مشِيدٍ**): بە مانای مەحکەمیش دێ، هەروەک دەگوترێ: (**أَشَادَ بِهِ يَشِيدُ، الإِشَادَةُ: رَفْعُ الصَّوْتِ**) (**إشادة**) دەنگ بەرزکردنەوەیە بە شتێک.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتی ژمـارە (٣٩)و ئایەتـەکانی دوایـی، لـەو بـارەوە ئـەم گێڕدراوەیـە دێنیـن:

{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ قَـالَ: لَـمَّا أُخْـرِجَ النَّبِـيُّ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ مِـنْ مَكَّـةَ قَـالَ أَبُـو بَكْـرٍ: أَخْرَجُـوا نَبِيَّهـم: إِنَّـا للـهِ وَإِنَّـا إِلَيْـهِ راجعـون، لَيَهْلِكُنَّ الْقَـوْمُ، فَنَزَلَـتْ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ﴾، فَعَرَفْـتُ أَنَّـهُ سَـيَكُونُ قِتَـالٌ، قَـالَ ابْـنُ عَبَّـاسٍ: وَهِـيَ أَوَّلُ آيَـةٍ نَزَلَـتْ}[1].

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) دەڵـێ: کاتێـک پێغەمبـەر ﷺ لـە مەککـە دەرکـرا، ئەبـوو بەکـر (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبەرەکـەی خۆیانیـان دەرکـرد (إِنَّـا للـهِ وإِنَّـا إِليـهِ راجعـون)، ئێمـە هـی خوایـن و ئێمـە تەنیا بـۆ لای خـواش دەگەڕێینـەوە، (ئەمـە لـە کاتی بـەڵادا دەگوتـرێ)، بـە دڵنیایـی لەبەیـن دەچـن (مـادام پێغەمبـەری خوایـان ﷺ دەرکـرد، واتـە: ناچاریانکـرد دەربچـێ)، ئنجا بـەو بۆنەیـەوە، ئـەم ئایەتـە موبارەکـە هاتـە خـوار: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ﴾، ئەوانـەی جەنگیـان لـە دژ دەکـرێ و ستەمیشـیان لێکـراوە، مۆڵەتـە کـە بەرگریـی لـە خۆیـان بکـەن، ئەبـوو بەکـر (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: (فَعَرَفْـتُ أَنَّـهُ سَـيَكُونُ قِتَـالٌ)، زانیـم کـە لەمـەو دوا جەنـگ ڕوودەدات، عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە یەکەمیـن ئایەتـە لەبـارەی جەنگـەوە دابەزیبـێ.

ڕایەکەشی ڕاستە.

---

(١) أخرجـه عبدالـرزاق في التفسـير، ج٢، ص٣٩، أحمـد في المسـند: ج١، ص٢١٦، ومـن طريقـه (الضيـاء المقـدسي) في (المختـارة) برقـم: ٣٨٤ والترمـذي: ٣١٧١، والنسـائي في (المجتبـى) ج٢، ص٦، وفي الكـبرى: ٤٩٩٢، ١١٣٤٥، وابـن أبي حاتـم في (تفسـيره) كـما في (تفسـير القـرآن العظيـم) ج٢، ص٢٣٥، والطـبري في (جامـع البيـان) ج١٧، ص١٢٣، ابـن حبـان: ٦٨٧، غيرهـم، قـال مؤلِّفـا الإسـتيعاب، قُلنـا: وهـذا إسـناد صحيـح عـلى شرط الشـيخين ولم يخرجـاه. انظـر: (الاسـتيعاب في بيـان الأسـباب) ج٢، ص٥١٠).

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک پێشتر گوتمان: تەوەری سەرەکیی ئەم یازدە (١١) ئایەتە موبارەکانە، بریتیە لە دەستکردنەوەی بڕواداران بۆ دەستەوکەرو بەرگریی لە خۆکردن و، فیداکارییکردن لە پێناوی خواداو لە بەرگرییکردن لە دینی خواو لە حورمەتەکانی مسوڵمانان و پیرۆزییەکانی ئیسلام.

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، بە دڵنیایی خوا بەرگریی لەو کەسانە دەکات کە بڕوایان هێناوە، لەسەریان دەکاتەوەو پشتیان دەگرێ، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ﴾، بە دڵنیایی خوا هەموو زۆر خیانەتکارێکی زۆر سپڵەی خۆشناوێ، واتە: بەرانبەرەکانیان زۆر خیانەتکارو بێ پەیمانن، پەیمانیان لەگەڵ خوادا هەڵوەشاندۆتەوە، پەیمانی زگماک (فطرة) کە خوا لێی وەرگرتوون، دەبێ خواناس و خواپەرستبن، هەروەها پەیمانی عورفیی و عەقڵییان لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانیدا هەڵوەشاندۆتەوە، کە ئەوانەش هاووڵاتیی و هاوشاریی بوون، بەڵام دەریانکردن و ئەزیەتیاندان و ناڕەحەتیانکردن، ئنجا ئەوانە زۆر سپڵەو ناسوپاس بوون، خوا ئەو هەموو چاکانەی پێداون، بە تایبەت چاکەی ڕەوانەکردنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ لە نێویاندا، ئەوە گەورەترین چاکەی خوا بوو لە ژیانیاندا، کەچی سپڵەو ناسوپاس بوون بەرانبەر بەو چاکە گەورەیەی خواو، بەرانبەر بە چاکەکانی دیکەی خواش، بۆیە خوا ﷻ بەرگریی دەکات لە کەسانێک کە بڕوایان هێناوە، لە بەرانبەر کەسانێکدا کە زۆر خیانەتکارو زۆریش سپڵەو ناسوپاسن.

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْ﴾، مۆڵەت درا بۆ ئەوانەی جەنگیان لە دژ دەکرێ، بە هۆی ئەوەوە کە ستەمیان لێکراوە، واتە: بە هۆی ئەوەوە

کە ستەمیان لێکراوە، مۆڵەتیاندرا، یاخود کە جەنگیان لە دژ دەکرێ، بە هۆی ستەملێکراوییەوەیە، جەنگیان لە دژ دەکرێ، نەک ئەوان شتێکیان کردبێ پاساوی ئەوەبێ کە بەرانبەرەکانیان جەنگیان لە دژ بکەن و، شەڕیان پێبفرۆشن، ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ﴾، بەدڵنیایی خواش لەسەر پشتگرتن و سەرخستنی وان بە توانایە.

ئنجا خوا ﷻ باسی ستەمدیدەیی و ستەملێکراویی و چەوسێنراوەیی ئەو بڕوادارانە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ﴾، ئەوانەی لە ماڵ و حاڵی خۆیان وەدەرێ نراون، بەبێ هیچ هەقێک، مەگەر ئەوە کە دەڵێن: پەروەردگارمان خوایە، واتە: هیچ هەقێکیان لەسەریان نەبووە، مەگەر ئەوە بە هەق دابنرێ، کە گوتوویانە: پەروەردگارمان خوایە، ئنجا ئەوە پاساوی ئەوە بێ، شەڕیان لە دژ بکەن! بۆیە زانایان دەڵێن: لێرەدا ئەم (إلاَّ)یە بۆ هەڵاواردنە، بەڵام هەڵاواردنی دابڕاو (**إستثناء منقَطِع**)ە، بۆچی؟ چونکە ئەو هەقەی کە کافرەکان لەسەر بڕوادارانیان بێ، ئەوە نیە کە دەڵێن: پەروەردگارمان خوایە، ئەوە هەقی ئەوان نیە لەسەریان، بۆیە هەڵاوێردراو (**مستثنى**) لە جینسی لێ هەڵاوێردراو (**مستثنى منه**) نیە، بۆیە ئەمە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنێکی دابڕاو.

دەشگونجێ (إلاَّ) بە مانای بەڵام (**لكن**) بێ، یانی: تەنیا گوتوویانە: پەروەردگارمان خوایە، هیچ هەقێکیان لەسەریان نەبووە، بەڵام گوتوویانە: پەروەردگارمان خوایە، ﴿ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ ﴾، ئەگەر خوا هەندێک لە خەڵکی بە هەندێکیان پاڵ پێوە نەنابایە، واتە: هەندێک لە خەڵکی ستەمکاری بە هەندێ خەڵکی ستەملێکراو، کە لێیانیان هاندەداو پشتیان دەگرێ، بەوانی پاڵ پێوەنەنابان، زەوی لێ خاوێن نەکردبانەوە، چی ڕوویدەدا؟ ﴿ لَّهُدِّمَتۡ ﴾، ئەوە کاول دەبوو، دەڕمان، ﴿ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ ﴾،

١- ﴿ صَوَٰمِعُ ﴾ كۆی (**صَوْمَعة**)یە، بە مانای پەرستگای بابای ڕەبەن، گۆشەگیر.

٢- ﴿ وَبِيَعٌ ﴾، كۆی (**بِيعْة**)یە، پەرستگای نەصرانییەكانە، كە ئێستا پێی دەڵێن: كڵێسا، كەنیسە.

٣- ﴿ وَصَلَوَٰتٌ ﴾، كۆی (صَلاة) كە هەندێ دەڵێن: لە (**صلوت**)ەوە هاتوە، مەرج نیە لە (صَلاة)ی بە مانای نوێژەوە بێ، بە مانای كەنیشتەیە واتە: پەرستگای جوولەكەكان.

٤- ﴿ وَمَسَٰجِدُ ﴾ یش كۆی (**مسجد**)ە واتە: شوێنی كڕنووش تێدا بردن، كە پەرستگای مسوڵمانانە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴾، ئەمە دوو ئەگەری هەن: ئایا كە دەفەرموێ: یادی خوایان زۆر تێدا دەكرێ، تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ مزگەوتەكان، یان دەگەڕێتەوە بۆ كۆی پەرستگایەكان؟ هەردووك ئەگەری هەن، بەڵام پێم وایە وا ڕاسترە بگەڕێتەوە بۆ هەموویان، چونكە خوا ﷻ وەك پاساودانەوەی ئەوە كە خوا جەنگ و جیهادی پێویست كردوە، دەفەرموێ: ئەگەر جەنگ و جیهاد نەبووایە و، خەڵكی ستەمكار بە هۆی خەڵكی دیكەوە پاڵ پێوەنەنرابان، كە جەنگ و جیهادیان لە دژ بكەن ئەوە: دێرەكان و كڵیساكان و كەنیشتەكان (ی جوولەكەكان) و مزگەوتەكان (ی مسوڵمانان) دەڕمان، كە زۆر یادی خوایان تێدا دەكرێ، ﴿ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ﴾، بە دڵنیاییش هەر كەسێ خوا سەربخات، خواش سەریدەخات، واتە: هەر كەسێك پێغەمبەری خوا ﷺ سەربخات، یاخود ئایین و بەرنامەی خوا سەربخات، خوا سەریدەخات و پشتی دەگرێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾، بەدڵنیایی خوا زۆر بەهێزی باڵادەست و زاڵە.

ئنجا خوای كارزان ئامانجی جەنگ و جیهادو، هەبوونی هێزو توانا بۆ بڕواداران ڕووندەكاتەوە.

﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەوانەی هەر کاتێک ئێمە دەستڕۆیشتوومان کردن لە زەویدا، توانامان پێدان، چی دەکەن؟ ﴿ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ ﴾، نوێژ بەرپا دەکەن و، زەکات دەدەن و، فەرمان بە پەسند دەکەن و، ڕێگریی لە ناپەسند دەکەن، ﴿ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ﴾، سەرەنجامی کارەکانیش هەر بۆ لای خوا ﷻ دەگەڕێتەوە.

ئنجا ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکات و دەفەرمویْ: ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾، ئەگەر خەڵکەکەشت، کۆمەڵگایەکەشت تۆ بەدرۆ دابنێن و پاڵتدەنە لای درۆ، پێت بێ بڕوا بن، دڵت لەخۆت دانەمێنێ، ئەوە عادەتی لەمێژینەی ئەهلی کوفرە، ﴿ فَقَدۡ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ ﴾، بەدڵنیایی لە پێش وانیشدا بەدرۆیان دانا، کێ؟ ﴿ قَوۡمُ نُوحٖ وَعَادٞ وَثَمُودُ ﴾، هەر کام لە گەلی نووح و، گەلی عادو گەلی سەموودیش پێغەمبەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ دانا، گەلی نووح نووحیان بەدرۆ دانا، گەلی عاد هوودیان بە درۆ دانا، گەلی سەموود، صاڵحیان بە درۆ دانا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلام**)، ﴿ وَقَوۡمُ إِبۡرَٰهِيمَ وَقَوۡمُ لُوطٖ ﴾، هەروەها گەلی ئیبراهیم و گەلی لووطیش، هەر کام لە ئیبراهیم و لووطیان بە درۆ دانان، ﴿ وَأَصۡحَٰبُ مَدۡيَنَۖ ﴾، هەروەها هاوەڵانی مەدیەن [(مەدیەن) ناوی شار و وڵاتەکەیە)] ئەوانیش پێغەمبەری خۆیان بە درۆ دانا، کە شوعەیب ﵇ بوو، ﴿ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ ﴾، هەروەها مووساش بە درۆ دانرا، لە لایەن کێوە؟ لە لایەن قیبطییەکانەوە، لە لایەن فیرعەون و داروودەستەو گەلەکەیەوە.

بەڵام ئایا خوا ﷻ چی لێکردن؟ ﴿ فَأَمۡلَيۡتُ لِلۡكَٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ ﴾، واتە: ڕستم درێژکرد بۆ ئەوانەی بێبڕوان، بواری ئەو گەلە کافرانەم دا، مۆڵەتم دان، بەڵکو بگەڕێنەوەو چاو بەخۆیان دا بگێڕنەوەو، واز لە کوفرو ملهوڕیی بێنن، بەڵام دوایی کە هەر بەردەوام بوون، ﴿ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ ﴾، دوایی گرتمن، واتە: سزامدان، وەک چۆن کەسێک بە دوای کەسێکدا دەگەڕێ و دەیگرێ، ئاوا گرتمانن، گرتن (**أخذ**) لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ سزادان، ﴿ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾،

ئنجا ئایا نکووڵییلێکردنی من چۆن بوو؟ بێگومان خوا نکووڵیی لە شتێک بکات و ڕەخنەی لە شتێک هەبێ، لەسەری سزا دەدا، ڕەخنە لە کەسێک بگرێ، سزای دەدا، ئایا نکووڵییلێکردنی من، واتە: نکووڵییلێکردنی من و ڕەخنەگرتنم و سزادانم چۆن بوو؟ یانی: وابوو کە بە زەحمەت وەسف دەکرێ، **(لا يُحِيطُ بِهِ وَصْفٌ)**، وەسف ناکرێ، هێندە بێڕەزاو گەورە بوو.

﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَٰهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ﴾، ئنجا زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندن، واتە: خەڵکی ئاوەدانییان فەوتان، کە ئەو ئاوەدانییانە خەڵکەکەیان ستەمکار بوو، واتە: خوا ﷻ بە هۆی ستەم و دەستدرێژیی و سنوورشکێنییەوە، خەڵکی ئاوەدانییەکان لەبەین دەبات، ﴿ فَهِىَ ﴾، ئنجا ئێستا ئەو ئاوەدانییانە کە فەوتێندراون ﴿ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، یانی: **(سَاقِطَةٌ جِدْرَانُهَا عَلَى سُقُوفِهَا)** دیوارەکانیان بە سەر سەربانەکانیاندا ڕووخاون، عادەت وایە کە بینایەک دەڕووخێ، پێشێ سەربانەکەی دەڕووخێ و، دیوارەکانی دەمێننەوە، دوایی بە درێژایی ڕۆژگار وردە وردە دیوارەکانیش بنکۆڵ دەبن و دەڕزن و، ئەوانیش بەسەر سەربانەکاندا دەڕووخێن، ﴿ وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴾، هەروەها لە شوێنەوارەکانیان، جگە لە دیوارە ڕووخاوەکان بەسەر سەربانەکاندا، زۆر بیری پەکخراو، بیری ئاو، کە کەس ئاوی لێ هەڵناهێنجێ، ﴿ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴾، زۆر کۆشکی بەرز هەڵچوو، یاخود کۆشکی گەچکاریی کراو و سپییکار کراو و سواقدراو، یاخود کۆشکی مەحکەم دروستکراو، ماوەنەوە، لە شوێنەوارەکانیان.

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾ ئنجا ئایا (ئەی موحەممەد ﷺ! یان هەر کەسێک کە قورئان دەخوێنێ!) بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری تۆ بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ ﴿ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ ﴾، دڵانێکیان هەبن پێیان تێبگەن، ﴿ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ﴾ یان گوێیانێکیان هەبن، پێیان ببیستن، ﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَٰرُ ﴾، بە دڵنیایی چاوەکانیان کوێرنین، ﴿ وَلَٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴾، بەڵام ئەو دڵانە کوێرن، کە لە سینەکاندان.

لێرەدا خوا ﷻ دڵی داناوە بە چەقی تێگەیشتن، هەڵبەتە مرۆڤ بە مێشک (دماغ) شت تێدەگات، ئەوە شتێکی زانستییەو، ئێستا سەلمێنراوە، بەڵام ئێستا زانست ئەوەشی بۆ دەرکەوتوە کە بەشێک لە ئیدراک و زانین پەیوەندیی بە دڵیشەوە هەیە، ئنجا ئەگەر گریمان ئیدراک و زانین هەمووشی بە عەقڵ و بە مێشک بێ، کە لە کەللەی سەردایە، بەڵام سەرەنجام ئەو زانیارییانەی بە عەقڵ و مێشک دەزانرێن، لە دڵەوە بڕیاریان بۆ دەدرێ: ئەو زانیارییانە چۆن کاریان پێ بکرێ و، چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ؟ بۆ وێنە:

أ- کەسێک بە عەقڵێک کە لە مێشکی دایە، لە کەللەی سەری دایە، دەزانێ کە جگەرە کێشان زیانبەخشە، بەڵام بڕیاری کێشان و نەکێشانی جگەرە، تەنیا بەو زانینەی لەسەردایە، نادرێ، بەڵکو لە دڵەوە بڕیار دەدرێ.

ب- فیرعەون دەیزانی مووسا ڕاستگۆیە و، ئەبوو جەهل هەر دەیزانی موحەممەد ﷺ ڕاست دەکات و ئەمینە و، هەموو زلەزلانی ئەهلی کوفر بەزۆریی زانیویانە کە پێغەمبەران ڕاست دەکەن، بەڵام خەڵکە ڕەش و ڕووتەکەیان هەڵخەڵەتاندوەو گوتوویانە: ئەوانە جادووگەرن، فاڵچیین، خۆیانتان بەسەردا فەرز دەکەن! ئەگەرنا خۆیان زانیویانە ڕاستدەکەن، بەڵام بۆچی بڕوایان نەهێناوە؟ بە مەعلووماتێک کە لە مێشکیاندا هەیە، زانیویانە هەق لە کوێیە، بەڵام بڕیار بە دڵ و دەروونی و نێو سینە دەدرێ، بۆیە خوا ﷻ لێرەدا باسی ئەو دڵانە دەکات کە لە سینەکاندا هەن، دەفەرموێ: ئەو دڵانەیان کوێرن، ئەو دڵانەیان باش هەق ناپێکن و، هەق نابینن، ئەو هەقە، بە چاوی سەر دەیبینن و، بە گوێ بیستوویانەو، بە عەقڵ تێیگەیشتوون، بەڵام بە دڵ ڕەفزی دەکەن، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی بەرژەوەندییان بە هۆی ئەو هەقەوە تێک دەچێ، ئەوان بەرژەوەندیی ناشەرعییان هەیە، ئەوان بەهۆی ستەم و دەستدرێژییەوە، بەرژەوەندییان بەسەر یەکەوە ناون، ئێستا ئەو هەقە کە بە عەقڵیان دەرکیان کردوەو، دەزانن ڕاستە، بەڵام ئەو هەقە لەگەڵ ئەو بەرژەوەندییە ناشەرعییەی ئەوان دا تێک دەگیرێ،

بۆیە دەبێ ئەو هەقە ڕەفز بکەن، تاکو بەرژەوەندییە ناشەرعییەکانیان، ئەو بەزم و بازاڕە ناشەرعییەی، پێکیانەوە ناوە، پارێزراوبێ.

لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِٱلْعَذَابِ﴾، پەلەشت لێدەکەن بە هاتنی سزا (ئەی موحەممەد! ﷺ) هەڵتدەپێچن و دەڵێن: سزای خوا کەنگێیە؟ بابێ، ﴿وَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥ﴾، هەرگیز خواش بەڵێنی خۆی دواناخات، بەڵێنی خوا هەرگیز پێچەوانە نابێ و، گفت و بەڵێنی خوا هەردەم ڕاست دەردەچێ، ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، بەڵام ڕۆژێک لەلای پەروەردگارت بە ئەندازەی هەزار ساڵ لەوەیە کە ئێوە دەیژمێرن، کەواتە: ئەو پەلە پەلەی لە ئێوەیەو، ئەو کورتبینییەی ئێوە، لە لای خوا سُبحانه وتعالى حسابێکی دیکەیە، ڕۆژێک لەلای خوا، ڕۆژێکی خوا، بە قەدەر هەزار ساڵی ئێوەیە، کەواتە: ئەگەر زوو سزای نەدان، وامەزانن خوا بێ بەڵێن دەرچووە! بەڵێنی خوا هەر دێتەدی، سزای خواتان بۆ دێ، ئەمڕۆنا سبەینێ، خوا سُبحانه وتعالى پەلەی نیە.

﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ﴾، زۆر ئاوەدانییش هەبوون، مۆڵەتم داون، ڕستم بۆ درێژ کردوون، لە حاڵێکدا کە ستەمکار بوون، ﴿ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ ٱلْمَصِيرُ﴾، دوای گرتوومن، ئەو ئاوەدانییانەم گرتوون، ئەو وڵاتانەم گرتوون و سزام داون و، سەرەنجامیش تەنیا بۆ لای منە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بە هۆی ئەوەوە خوای دادگەر بەرگریی لە بڕواداران دەکات، کە حەز بە چارەی بێبڕوایانی پەیمان شکێنی سپڵەو، خیانەتکاری پێنەزان ناکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ٣٨﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ﴾، بە دڵنیایی خوا بەرگریی لەوانە دەکات کە بڕوایان هێناوە، وشەی (إِنَّ) بۆ چەسپاندن و جەختکردنەوەیە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ﴾، بە جەختکردنەوەو بە دڵنیاییەوە خوا بەرگریی دەکات لەوانەی بڕوایان هێناوە، لەسەریان دەکاتەوە، پشتیان دەگرێ، ئەمە یاسایەکی گشتیی خوایە لە ژیانی بەشەردا، کە خوا پشتگیریی بڕواداران دەکات، بەڵام بە مەرجێک بە ڕاستیی بڕوادارbن، ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بڕوایان بەچی هێناوە؟ بڕوایان بە هەموو ئەو شتانە هێناوە کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، بڕوایان بە خوا ﷻ هێناوە، بەو شێوەیەی خوا فەرموویەتی بڕوای پێبێنن، بڕوایان بە فریشتەکانی خوا هێناوە، بڕوایان بە کتێبەکانی خوا هێناوە، بڕوایان بە پێغەمبەرانی خوا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلام**)، هێناوە، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هێناوەو، بڕوایان بە نەخشەو ئەندازەگیریی خوا هێناوە، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، شایستەی ئەوەن خوا بەرگرییان لێبکات و لەسەریان بکاتەوە.

٢)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ﴾، بەدڵنیایی خوا هەر خیانەتکارێکی سپلەی خۆشناوێ، ئەمە وەک پاساو دانەوەی ئەو ڕستەیەی پێشێیە، واتە: بۆیە خوا بەرگریی دەکات لە بڕواداران، چونکە خوا هەر زۆر خیانەتکارێکی سپڵەی خۆش ناوێ و، حەز بەچارەی ناکات.

پێشتر گوتمان: (**خَوَّانٍ: صِيغةُ مبالغَة خَائِن**)، (**خَائِن**) واتە: ناپاک، پەیمان شکێن، (**خَوَّانٍ: يَعْنِي الشَّدِيد الخَون، والخون كَالخِيَانَةِ والخِيَانَةُ: الغَدْر**) یان (**الغَدْرُ: عَدَمُ الوَفَاءِ بالعَهْدِ والوَعْد**)، (**خَوَّانٍ**)، واتە: کەسێک کە زۆر (**خَوْن**)ی هەبێ، (**خَوْن**)یش وەک (**خيانة**) وایە، چاوگە، (**خيانة**)یش بە مانای پەیمان شکێنیی دێ و، بە مانای زایەکردنی سپاردەو ئەمانەتیش دێ، (**كَفُورٍ**)یش واتە: زۆر سپڵە و پێنەزان و نادیدەگری چاکەکانی خوا، هەڵبەتە هەموو کافرێک خائینیشە، بێگومان کەسێک بێبڕوابێ، دیارە خیانەتی کردوە بە پەیمانی زگماکی (**العهد الفطري**) خوا کە لێی وەرگرتوە، هەروەها هەموو سپڵەو پێنەزانێکیش، سیفەتی کافرانی تێدایە کە خیانەتە، (**كفور**)یش دەگونجێ بە مانای بێبڕوابێ و دەشگونجێ بە مانای سپڵەو ناسوپاس بێ، چونکە دەگونجێ مەبەست لە (**كَفُورٍ: الشَّديدُ الكُفْر**)بێ، واتە: کەسێک کە زۆر بێبڕوایە، دەشگونجێ (**كَفُورٍ**) مەبەست پێی زۆر سپڵەو ناسوپاس بێ، بەرانبەر بە چاکەکانی خوا.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿كُلَّ خَوَّانٍ كَفُورٍ﴾، واتە: تێکڕای ئەوانەی زۆر خیانەتکارن و، زۆر سپڵەو ناسوپاسن، یاخود زۆر خیانەتکار و بێبڕوان، خوا حەز بە چارەیان ناکات.

ئەم یاسایەش یاسایەکی گشتیی خوایە لە ژیانی بەشەردا، کە خوا بەرگریی دەکات لە بڕواداران، لە چەند شوێنێکی دیکەی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (**غافر**)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَـٰدُ ﴿٥١﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە پێغەمبەرانمان (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)و بڕواداران سەردەخەین، لە ژیانی دنیاشدا سەریان دەخەین و، لەو ڕۆژەش دا کە شایەدەکان هەڵدەستن و ڕاستدەبنەوەو، شایەدیی دەدەن، واتە: لە ڕۆژی قیامەتیش دا.

٢- لە سوورەتی (**الصافات**)یشدا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی وشەی ئێمە (بڕیاری

ئێمە) پێشکەوتووە بۆ بەندە ڕەوانەکراوەکانمان، کە بە دڵنیایی ئەوان سەرخراون و، بەدڵنیایی سەربازەکانی ئێمە زاڵ و سەرکەوتوون.

**٣-** هەروەها لە سووڕەتی (**محمد**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾﴾، واتە: ئەگەر ئێوە خوا سەربخەن، خواش سەرتاندەخات و، پێیەکانتان دەچەسپێنێ.

یەکێک بۆی هەیە لێرەدا بپرسێ: ژمارەیەک لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلام**) شەهیدکراون، وەک زەکەرییاو یەحیا، هەروەها زۆربەی پێغەمبەران دەرکراون و، خوا دەربازی کردوون و، سزاو بەڵای بۆ گەلەکانیان ناردوە! ئنجا ئایا سەرخستنی خوا بۆیان، کوا؟!

زانایان دەڵێن: هیچ پێغەمبەرێک بە سوپاو هێز لەگەڵ نەیارەکانیدا ڕووبەڕوو نەبۆتەوە، مەگەر سەرکەوتوە، ئەگەر تەماشای مێژوو بکەین، دیارە، هیچ پێغەمبەرێک لە هیچ ڕووبەڕووبوونەوەیەک و جەنگێکدا تێکنەشکاوە، بەڵام ئەگەر ڕووبەڕووبوونەوە نەبووبێ، پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلام**) سەرخستنەکەیان و سەرخستنی بڕواداران، مەبەست پێی سەرخستنە بە بەڵگەو، سەرخستنە بە مانەوەیان لەسەر ڕێبازەکەی خۆیان و، سەرخستنیانە بەوە کە بەو شێوەیە ژیانەکەیان گوزەراندوە و، بەو شێوەیە مامەڵەیانکردوە، کە خوا لێیان ڕازیبێ و جێگای ڕەزامەندیی خوای پەروەردگار بێ.

کەواتە: پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلام**) و بڕوادارانی ڕاستەقینە، سەرکەوتووبوون لە مەیدانی ڕووبەڕووبوونەوەدا، هەرکاتێ ڕووبەڕووبوونەوە هاتبێتە پێش، ئەگەر ڕووبەڕووبوونەوەش نەهاتبێتە پێش، پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلام**)و بڕواداران سەرکەوتووبوون بەسەرکەوتنی مەعنەویی، قسەی ئەوان ڕاست بووە، بەڵگەی ئەوان ڕاست بووە، پاشان ئەوان پەرێز پاک و، پاک و چاک بوون، هەر کەسێ تەماشای ئەوان و، تەماشای نەیارەکانیانی کردبێ،

زانیویەتی ئەوان لەسەر هەقن، ئێستاش هەروایە، ئێستاش شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلام) خاوەنی بەڵگەن و، لەسەر ڕێی ڕاستن و، خاوەنی دڵنیایین، پاشان ڕازاوەن بە سیفەت و ڕەوشتە بەرزەکان و، بە هەڵوێستی جوان و، بە مامەڵەی ڕاست و، نەیارەکانیشیان پڕ لە درۆو خیانەت و ناپاکیی و گەندەڵیی و خراپەکارییـن.

**مەسەلەی دووەم:**

**مۆڵەتدران بە شەڕپێفرۆشراوانی ستەمدیدەی بێتاوانی، لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دەرکراو، کە بەرگریی لە خۆیان بکەن و تۆڵە بکەنەوەو، خواش پشتگیریانە، ئەگەر جەنگ و بەرەنگارییش نەبووایە، ئەهلی کوفرو ستەم، پەرستگاکانی: گۆشەنشینان و، نەصرانیی و، جوولەکەو، مسوڵمانانیان تێک دەڕووخاندن، کاتێکیش بڕواداران باڵادەست دەبن: نوێژو زەکات و، فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند، دەکەنە پیشە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا ۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە (١٤) بڕگە:

١)- ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟﴾، مۆڵەت درا بۆ ئەوانەی جەنگیان لە دژ دەکرێ، بە هۆی ئەوەوە کە ستەمیان لێکراوە.

وشەی (أُذِنَ) خوێندراویشەتەوە: (أَذِنَ)، (يُقَـٰتَلُونَ) خوێندراویشەتەوە: (يُقَاتِلُونَ)، (أَذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتِلُونَ) (خوا) مۆڵەتی دا بەوانەی دەجەنگن، ﴿بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟﴾، بە هۆی ئەوەوە کە پێشتر ستەمیان لێکراوە، ئەگەر (أُذِنَ)ش بێ واتە: مۆڵەت درا بەوانەی جەنگیان لە دژ دەکرێ، بە هۆی ئەوەوە کە ستەمیان لێکراوە، لێرەدا خوا ﷻ مۆڵەت بۆدراوەکەی قرتاندوە (**حذف المَأْذونُ لَهُ**) بەڵام

بەهۆی ﴿ يُقَـٰتَلُونَ ﴾ەوە دەزانین کە: مۆڵەت بۆ دراوەکە، بریتی بووە لە جەنگ (أُذِنَ فِي القِتَالِ) مۆڵەت درا بۆ جەنگ کردن.

یاخود وشەی (أُذِنَ) مانای (أُخبِرُوا)ی خراوەتە نێو، (أُذِنَ) یانی: مۆڵەت درا، (أَذِنَ) یانی: مۆڵەتیدا، ئنجا ئەگەر (أُذِنَ) بێ، مانای (هەواڵیان پێدرا) (أُخبروا)ی خراوەتە نێو، کە ئەمەش تیژکردنی بڕوادارانەو، هاندانیانە لەسەر جەنگ، (أُذِنَ) واتە: مۆڵەت دراو، هەواڵیشیان پێدرا.

بەڵام ئەگەر (أَذِنَ) بێ، یانی: خوا مۆڵەتیداو، هەواڵیشی پێدان.

بە کورتیی: (أُذِنَ) لەسەر ڕواڵەتەکەی خۆی، یانی: (رُخِّصَ) مۆڵەت درا، بەڵام مانای: هەواڵیان پێدرا (أُخْبِرُوا)شی خراوەتە نێو، ئەگەر (أَذِنَ)ش بێ مانای: هەواڵیدا (أَخْبَرَ)ی خراوەتە نێو، بە هۆی ئەوەوە کە بە (ب) بەرکاری خواستوە: ﴿ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ ﴾، مەبەستیش لەم تەعبیرە ئەوەیە: ئێوە ستەمتان لێکراوە، بۆیە مۆڵەتدران کە بجەنگن.

٢)- ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴾، بە دڵنیاییش خوا لەسەر سەرخستنیان بە توانایە، لەسەر پشتگیریی کردنیان بۆ ئەوەی سەربکەون، بە توانایە.

٣)- ﴿ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ ﴾، ئەوانەی کە لە ماڵ و حاڵی خۆیان، لە خانووەکانی خۆیان، لە جێگەو ڕێگەکانیان وەدەرنراون، بەبێ هیچ هەقێک (أَي: لَمْ يَكُنْ عَلَيْهِمْ حَقٌّ لأَحَدٍ مُوجِبٌ لإِخْراجِهِم) هیچ کەسێک مافێکی وای لەسەریان نەبوو ئەوە پێویست بکات و پاساوی ئەوە بێ، لە ماڵ و حاڵی خۆیان وەدەربنرێن، ئەدی بۆچی وەدەرنران؟

٤)- ﴿ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ﴾، مەگەر ئەوە کە بڵێن: پەروەردگارمان خوایە، ئەم هەڵاواردن (إستثناء)ە زانایان دەڵێن: (هذا إِستِثْناءٌ عَلى سَبِيلِ التَّهَكُّم مِثْل: لاَ عَيْبَ فِيهِم غَيْرَ أَنَّ سِيُوفَهُمْ ... بهِنَّ فُلُولٌ مِنْ قِرَاعِ الكَتَائِبِ) ئەمە هەڵاواردنێکە لەسەر شێوەی توانج و گاڵتە پێکردن، واتە: هیچ هەقێکیان لەسەریان نەبوو، مەگەر ئەوە بە هەق دابنرێ کە گوتیان:

پەروەردگارمان خوایە، ئەگەر ئەوە هەقی کافرەکان بێ، لێیان بکەنەوە، ئەو هەقەیان لێ بستێننەوە کە نابێ بڵێن پەروەردگارمان خوایە! ئەمە وەک شیعری شاعیرێک وایە کە مەدحی قەومەکەی خۆی دەکات دەڵێ:

**لاَ عَيْبَ فِيهِم غَيْرَ أَنَّ سِيُوفَهُمْ ... بهنَّ فُلُولٌ مِنْ قِرَاعِ الكَتَائِبِ**

خەڵکەکـەی مـن هیـچ عەیبیـان نیـە، ئـەوە نەبـێ شمشـێرەکانیان پاچاونـەوە، ئەوەنـدەی شـەڕە شمشـێریان پـێ بکـەن.

کـە بێگومـان ئـەوەش عەیـب نیـە، چونکـە: خەڵکێـک ئەوەنـدە شمشـێربازیی کردبـێ، شـەڕە شمشـێری کردبـێ، شمشـێرەکەی نوشـتابێتەوە، پاچابێتـەوە، مانـای وایە زۆر ئازایـە، خـوای پەروەردگاریـش دەفەرمـوێ: کافـرەکان هیچیـان لـێ بـە ڕەخنـە نەگرتـن و، هیـچ هەقێکیـان لەسـەر ئـەو بڕوادارانـە نەبـوو، کـە لـە زێـدی خۆیـان وەدەریـان نـان و دەریـان کـردن، مەگـەر ئـەوە کـە گوتیـان: پەروەردگارمـان خوایـە، کـە بێگومـان ئـەوەش پێـی دەگوتـرێ: هەڵاواردنێکـی دابـڕاو، چونکـە ئـەوە کـە گوتوویانـە: پەروەردگارمـان خوایـە، هەقێکـی کافـرەکان نیـە لەسـەر بـڕواداران بـێ، واتـە: هەڵاوێـردراو (**مُسْـتَثْنى**) لـە (**جِنـس**)ی لێهەڵاوێـردرا و (**مُسْـتَثْنى مِنْـهُ**) نیـە.

٥)- ﴿ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ ﴾، ئەگەر ئەوەش نەبووایە کە خوا هەندێک لە خەڵکی بە هەندێکیان پاڵ پێوە دەنێ، وشەی (**لَوْلَا**) لێرەدا (**حَرْفُ امْتِناعٍ لِوُجُود**) پیتی ڕێنەدانە بەهۆی بوونەوە، یانی: (**لَولا الدَّفْعُ لَصَارَ الهَدْمُ**)، ئەگەر خوا هەندێک لە خەڵکی کە مەبەست پێی خەڵکی ستەمکارو دەستدرێژکارە، بە هەندێکی دیکە، کە مەبەست پێی خەڵکی بڕوادارو بەرگرییکارە، کە جەنگ دەکەن و بەرگریی لە خۆیان و پیرۆزییەکانیان دەکەن، ئەگەر ئەوە نەبووایە: پەرستگایەکان دەڕووخێنران.

٦)- ﴿ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ ﴾، ئەوە دێرەکان و کڵێساکان و کەنیشتەکان و مزگەوتەکان هەموویان دەڕووخان، (**لَّهُدِّمَتۡ**) خوێندراویشەتەوە: (**لَهُدِمَت**) واتە: بەبێ گیره (**شَدَّة**) کە هەر یەک واتایان هەیە.

١- (صَوَامِعُ) كۆی (صَوْمِعَة)یە، كە بە پەرستگای ڕەبەن و گۆشەگیرەكانی نەصرانییان دەگوترێ كە لە شوێنێک، لە چۆڵاییەک، لە چیایەک، پەرستگایەكیان دروست كردوە و بە زۆریی وایە سەرەكەی باریک بووە، بە تەنیا خواپەرستییان تێدا كردوە، بە كوردیی (دێر).

٢- (بِيَع) كۆی (بِيعَة)یە ئەویش بە پەرستگای نەصرانییەكان دەگوترێ.

٣- (وَصَلَوَٰتٌ )یش هەندێک لە زانایان دەڵێن: لە (صَلُوتا)وە هاتوە، كە بە زمانی عیبریی بە مانای پەرستگای جوولەكانە، ئنجا (صَلَوَات) كۆی (صلوتا)یە، نەک كۆی (صَلاة) بە مانای نوێژ.

٤- (مَسَاجِدُ)یش كۆی (مَسْجِد)ە، مزگەوت، كەواتە: هەموو ئەو پەرستگایانەی كە جوولەكەو نەصرانیی و مسوڵمانان خوایان تێدا دەپەرستن، هەروەها كەسانێک كە بەتەنێ گۆشەگیرو گۆشەنشینن، خوا دەپەرستن، هەموو ئەوانە دەڕووخان، بە هۆی ستەمی ستەمكارانەوە.

٧)- ﴿يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًا﴾ زۆر یادی خوایان تێدا دەكرێ، دەگونجێ ڕاناوی (فِيهَا)، بگەڕێتەوە بۆ مزگەوتەكان واتە: لە مزگەوتەكاندا زۆر یادی خوا دەكرێ، دەشگونجێ بچێتەوە بۆ هەموو پەرستگاكان، بۆ (صَوْمِعَة)كان و (بِيعَة)كان و (صَلُوتا)كان واتە: بۆ پەرستگاكانی ڕەبەنەكان و هی نەصرانییەكان و هی جوولەكەكان، هەروەها مزگەوتەكانی مسوڵمانانیش، كە زۆر یادی خوایان تێدا دەكرێ، مانای دووەمیش زیاتر پێدەچێ، بەڵێ لە پەرستگای نەصرانیی و جوولەكاندا ڕەنگە یادی خوا كەمتر بكرێ، یاخود بە هەڵە یادی خوا بكرێ، بەڵام مادام خوا ﷻ باسی كردوون و ناوی هێناون، وا پێدەچێ ڕاناوی (فِيهَا) بۆ هەموویان بچێتەوە.

ئنجا ئەگەر ئێستا دوای هاتنی ئیسلام بە هەڵە یادی خوا لە دێرەكان و لە پەرستگای نەصرانیی و جوولەكاندا دەكرێ، بەڵام كاتی خۆی پێش ئیسلام، ئەو یادی خوا كردن و بەندایەتییەی كردوویانە، هەر ئەوەیان زانیوە و بە پێی ئایین و

بەرنامەی خۆیان، ڕێک و ڕاست و تەواو بووە، با لادان و هەڵەو پەڵەش هەر بووبێ، کە ئێستا لە نێو مسوڵمانانیشدا هەر هەیە.

٨)- ﴿ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ﴾، بە دڵنیایی خواش، هەر کەسێ خوا سەر بخات، سەریدەخات، واتە: هەرکەسێک ئایین و بەرنامەکەی خوا سەربخات، پێغەمبەرەکەی ﷺ سەربخات، خواش سەریدەخات و پشتی دەگرێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ ﴿٧﴾﴾محمد، ئەگەر ئێوە پشتیوانیی خوا بکەن و خوا سەربخەن، خواش سەرتان دەخات.

٩)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾، بێگومان خوا زۆربە هێزی زاڵە، ئەمە وەک شیکردنەوەی ڕستەی پێشێیە، یان هۆکاردۆزیی (**تعليل**)ە بۆ ڕستەی پێشێ، بۆچی خوا هەر کەسێ سەریبخات، سەریدەخات؟ چونکە خوا زۆر بەهێزە و زۆریش باڵادەستە.

ئنجا باسی ئامانجەکانی جیهادو جەنگ، فەڕزکردنی بەرگریی لەخۆکردن دەکات، کە خوا ﷻ بۆچی پێویستی کردوە؟ یان مسوڵمانان دوای ئەوەی باڵادەست دەبن و جەنگ و جیهاد دەکەن، دەبێ چی بکەن؟

١٠)- ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەوانەی کاتێک دەستڕۆیشتوومان کردن و کردمانن بە خاوەن تواناو بڕست لە زەویدا، (وەڵامەکەی دوایی دێ) ( مَّكَّنَّٰهُمۡ ): (**التَّمْكِينُ: التَّوْفِيقُ، وَأَصْلُهُ إِقْرَارُ الشَّيْءِ فِي مَكَانٍ، وَهُوَ مُسْتَعْمَلٌ فِي التَّسْلِيطِ وَالتَّمْلِيك**)، (**تَمْكِين**): بە مانای قاییم کردنە، بەڵام ڕیشەکەی بریتیە لە چەسپاندنی شتێک لە شوێنێک، کە لێرەدا بەکارهێنراوە بۆ باڵادەست کردن و خاوەندار کردن و، دەستڕۆیشتوو کردن، هەر کاتێک دەستڕۆیشتوومان کردن لە زەوی دا، چی دەکەن؟

١١)- ﴿ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژ بەرپا دەکەن، نوێژ بریتیە لە پایەی مەعنەویی دینداریی و مسوڵمانەتیی واتە: جارێ پێش هەموو شتێک، پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ خوادا مەحکەم دەکەن، پەیوەندیی خۆیان و کۆمەڵگاکەیان کە لە ژێر ڕکێفیاندایە، هەوڵدەدەن لەگەڵ خوادا توندو مەحکەمی بکەن.

١٢)- ﴿وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ﴾، هەروەها زەكات دەدەن، واتە: پەیوەندییشیان لەگەڵ كۆمەڵگاو دەوروبەردا مەحكەمە، كە ئەگەر نوێژ پایەی مەعنەوییە، ئەمەش پایەی ماددیی و ئابوورییە، ئەگەر نوێژ هەقی خوایە، زەكاتیش هەقی خەڵكە، واتە: وێڕای ئەوەی كە هەقی خوا دەدەن، هەقی خەڵكیش دەدەن، وێڕای ئەوەی كە دیندارییەكەیان لایەنی مەعنەویی و ڕووحیی تێدایە، لایەنی ئابووریی و ماددییشی تێدایە، وێڕای ئەوەی كە خواپەرستیی تێدایە، خەڵك دۆستیشی تێدایە.

١٣)- ﴿وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾، هەروەها فەرمان بە هەرچی شتی پەسندە دەكەن و، ڕێگریی لە هەرشتی ناپەسندە دەكەن، هەرچی شتی پەسندە لە ڕووی بووناسییەوە، لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، لە ڕووی پەرستشەكانەوە، لە ڕووی ڕەوشت و ئاكاری شەخصییەوە، لە ڕووی ئەدەبە كۆمەڵایەتییەكانەوە، لە ڕووی ئیدارەدانی كۆمەڵگاوە، لە ڕووی حوكم و سیاسەتەوە، لە ڕووی پەیوەندییەكان و، لە ڕووی جەنگ و ئاشتییەوە، هەرچی شتی پەسندە، هەوڵدەدەن بیچەسپێنن و، هەرچی شتی ناپەسندو خراپە، هەوڵدەدەن كۆمەڵگاو دەوروبەری خۆیانی لێ بێزار بكەن، لە هەموو بوارەكانداو، لە هەموو ڕووەكانەوە.

یەكێك لە زانایان دەڵێ: (**المَعْرُوفُ مَا هُوَ مُقَرَّرٌ مِنْ شُؤُونِ الدِّينِ، سَوَاءٌ كَانَ مَعْرُوفاً لِلأُمَّةِ عَامَّةً، أَوْ لِلعُلَمَاءِ خَاصَّة**).

واتە: پەسەندو بە پەسند زانراو، ئەوەیە كە لە كاروبارەكانی دین دا، چەسپێنراو بێ، ئنجا چ بە گشتیی لە لایەن ئۆممەتەوە بە باش زانرابێ، چ تەنیا زانایان بیزانن {كە شتێكی پەسندو چاكە، یان پێویستە}.

هەروەها ناپەسەند (**مُنْكَر**)یش بە هەمان شێوە، ناپەسندیش دیسان، چ خەڵك بە گشتیی بزانن ناپەسندە، چ تەنیا زانایان بزانن، كە ئەو كاتە خەڵكیش پابەند (**مُلْزَم**)ن بەوەكە زانایان دەزانن: ناپەسندە و، پێویستە لێی دوور بن و، ئەوەی پەسندە، پێویستە بیكەن، چونكە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٧﴾ الأنبیاء، واتە: ئەگەر نازانن لە خاوەنانی زانست بپرسن.

**١٤)-** ﴿وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ﴾، سەرەنجامی کارەکانیش تەنیا بۆ لای خوایە، **(العَاقِبَةُ: آخِرُ الشَّيْءِ وَمَا يَعْقُبُ الحَاضِرَ، وَتَأْنِيثُهَا لِمُلاَحَظَةِ مَعْنَى الحَالَة)**، **(عاقِبَة)**: بە مانای کۆتایی شتە و، بە مانای ئەوەیە کە بە دوای ئێستادا دێ، بەڵام بۆیە **(عاقِبَة)** بە **(مُؤَنَّث)**ی هاتوە، لەبەر ئەوەی مانای حاڵەتی تێدایە، یانی: **(الحالَةُ العَاقِبَة)** ئەو حاڵەتەی کە دوایی دێ.

### مەسەلەی سێیەم:

**بە درۆ دانانی کافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بۆی، شتێکی چاوەڕوانکراوەو گەلانی: نووح و عادو سەموودو، گەلی ئیبراهیم و گەلی لووطو هاوەڵانی مەدیەن بۆ پێغەمبەرانیان، و گەلی فیرعەونیش لە میسر بەرانبەر مووسا هەروا بوون، ئنجا ئەو گەلە بێبڕوایانە، شوێنەواری زۆریان لێ بەجێماون و، ئەگەر بە چاوی عەقڵ و دڵ سەرەنجی شوێنەوارەکانیان بدەن، پەندیان لێوەردەگرن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَاهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَابُ مَدْيَنَ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَافِرِينَ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَٰكِن تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە (١٦) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِن يُكَذِّبُوكَ ﴾، خوا ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر بە درۆت دابنێن، یانی: کۆمەڵگاکەی خۆت و دەوروبەرەکەت، ئەگەر بە درۆت دابنێن، ئەمە بە تەئکید دڵدانەوەیە بۆ پێغەمبەر ﷺ واتە: بێبڕوا بوون و بە درۆ دانانی خەڵکەکەت بۆ تۆ، شتێکی چاوەڕوانکراوە، هەڵبەتە (إن)، (إِنْ الشَّرْطِيَّة)یە، بە مەرجێک ئەوان بە درۆت دابنێن، وەڵامی مەرجەکە قرتێنراوە و چەند شتێک دەگرێتەوە:

١- ئەگەر بە درۆت دابنێن، شتێکی سەیر نیە.

٢- ئەگەر بە درۆت دابنێن، شتێکی چاوەڕوانکراوە.

٣- ئەگەر بە درۆت دابنێن بۆ تۆ کەم و کەسری نیە.

بۆیەش خوا ﷻ وەڵامەکەی قرتاندوە، تاکو هەموو ئەو واتایانەو زۆری دیکەش بگرێتەوە.

بەڵام ئەگەر فەرمووبای: (وَإِنْ يُكَذِّبُوكَ فَلاَ عَجَبَ) ئەگەر بەدرۆت دابنێن، سەیر نیە.

یاخود: (وَإِنْ يُكَذِّبُوكَ فَلاَ غَضَاضَةَ عَلَيْكَ) ئەگەر بەدرۆت دابنێن، هیچ کەم و کەسریی نیە بۆ تۆ، هیچ نەقوستانیی نیە بۆ تۆ.

یاخود: (وَإِنْ يُكَذِّبُوكَ فَهُوَ شَيْءٌ مُتَوَقَّع) ئەگەر بەدرۆت دابنێن، شتێکی چاوەڕوانکراوە، هەر ئەوەی دەگرتەوە، کە باسکراوە، بەڵام بۆیە خوا وەڵامی مەرجەکەی قرتاندوە، تاکو هەموو ئەو واتایانەی گوتمان و جگە لەوانەش بگرێتەوە.

٢)- ﴿ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ ﴾، بە دڵنیایی لە پێش ئەواندا بە درۆیان دانان یانی: پێغەمبەرانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بە درۆ دانان، پەیامەکانی خوایان بە درۆ دانان، ئنجا پێیاندادێ:

٣)- ﴿ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَاهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَابُ مَدْيَنَ ﴾، حەوت گەل و کۆمەڵگایان باس دەکات، کە لە زۆر لە سوورەتەکاندا خوا ﷻ باسی ئەو کۆمەڵگایانەی بە تەفصیڵ هێناوە، لە سوورەتەکانی: (الشعراء والأعراف وهود)و هەندێکی دیکە لە سوورەتەکان دا، خوا بەسەرهاتی ئەو گەلانەی هێناون، بۆیە لێرە تەنیا هەڵوێستی بە درۆدانەرانەیان بۆ پێغەمبەرەکانیان (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلام) باس دەکات، یانی: ئەی موحەممەد! ئەگەر کۆمەڵگایەت بە درۆت دابنێن، لە پێش وانیشدا گەلی نووح، پێغەمبەری خوایان بە درۆ دانا، کە نووح عليه السلام بوو، گەلی عادیش، هوودیان عليه السلام بە درۆ دانا، ئەو پەیامەی خوا بە هووددا بۆی ناردبوون، هەروەها گەلی (ثمود)یش صاڵیحیان بە درۆ دانا و ئەو پەیامەش کە خوا بە صاڵیحدا بۆی ناردبوون، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر صاڵیح بێ.

﴿ وَقَوْمُ إِبْرَاهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴾، هەروەها هەردوو گەلی ئیبراهیم و گەلی لووط عليه السلام کۆمەڵی ئیبراهیم و کۆمەڵی لووط، کە کۆمەڵی ئیبراهیم سەرەتا لە ناوچەی

حەڕران بوون، لە باکووری شام، بەڵام گەلی لووط لەو شوێنەی کە ئێستا بۆتە دەریاچەی مردوو، لە نێوان ئوردون و فەڵەستیندا، لەوێ بوون، ئەو دوو گەلەش ئەو دوو پێغەمبەرانەی خوایان بە درۆ دانان.

﴿ وَأَصۡحَٰبُ مَدۡيَنَ ﴾، هەروەها هاوەڵانی مەدیەنیش، [مەدیەن ناوی شارو وڵاتەکەیە]، پێغەمبەرەکەیان ناوی شوعەیب ﷵ بوو، ئەوانیش شوعەیبیان بە درۆ دانا.

٤)- ﴿ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ ﴾، مووساش ﷵ بە درۆ دانرا، لە لایە فیرعەون و گەلەکەیەوە بە درۆ دانرا، بۆیە خوا ﷻ، بۆچی بۆ ئەو نەیفەرمووە (**قوم**)؟ چونکە بەدرۆ دانەرانی مووسا، قەومی مووسا نەبوون، گەل و کۆمەڵگای ئەو نەبوون، بەڵکو کۆمەڵەکەی ئەو بەنوو ئیسرائیل بوون، بەڵام ئەوانەی مووسایان بە درۆ دانا، قیبتییەکان بوون، فیرعەون و دارودەستەکەی بوون.

ئنجا ئایا کە ئەوانە پێغەمبەرانیان (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) بە درۆ دانان، پەیامەکانی خوایان بە درۆ دانان، کە بە پێغەمبەراندا ناردبوونی، خوا چی لێکردن؟ ئایا وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون؟ نەخێر.

٥)- ﴿ فَأَمۡلَيۡتُ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: سەرەتا ڕستم بۆ درێژ کردن، بێبڕوایانم مۆڵەتدان، خوا ﷻ دەیتوانی بفەرموێ: (**فَأَمْلَيْتُ لَهُم**) مۆڵەتم دان، بەڵام بۆچی دەفەرموێ: ﴿ فَأَمۡلَيۡتُ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴾؟ (**وُضِعَ الظَّاهِرُ مَوْضِعَ الْمُضْمَرِ إِيماءً إِلى عِلَّةِ الإِمْلاءِ وَالأَخْذِ، وَهُوَ الكُفْر**) بۆیە ئەوەی کە ئاشکرایە کە سیفەتی کافرایەتییە لە شوێنی ڕاناوەکە دانراوە، تاکو ئاماژە بێ بۆ هۆکاری ئەوە کە بۆچی خوا مۆڵەتی دان و دوایی سزای دان؟ یانی: لەبەر بێبڕواییەکەیان، دوای مۆڵەتدان، سزای دان.

٦)- ﴿ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡ ﴾، دوایی گرتمن، (**أَخْذ**) بۆ سزادانە لە زمانی عەرەبییدا (**الأَخْذُ حَقِيقَتُهُ: التَّناوُلُ لِما لَمْ يَكُنْ فِي اليَد، وَاسْتُعِيرَ هُنا لِلْقُدْرَةِ عَلَيْهِم بِإِهْلاكِهِم بَعْدَ إِمْهالِهِم**)، (**أَخْذ**) ڕاستە مانایەکەی بریتیە لەوەی شتێک بەدەستەوە نەبێ، بە دەستەوە بگیرێ،

وەک من ئەم موصحەفە موبارەکە بە دەستەوە دەگرم دەڵێم: (**أَخَذْتُ المُصْحَفَ**)، بەڵام لێرەدا (**أَخْذ**) خوازراوەتەوە بۆ دەسەڵات بەسەردا هەبوون، بەوە کە دوای ئەوەی مۆڵەت دراون، هەر نەگەڕاونەوە و خواش فەوتاندوونی و قڕەبڕی کردوون.

٧)- ﴿ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴾، ئنجا ئایا نکووڵییکردنم چۆن بوو؟! (نَكِيرِ ) لێرەدا بە مانای (**إِنْكَارَ**)ە واتە: نکووڵییکردنی من چۆن بوو؟ ئەم پرسیار کردنە بۆ سەرسوڕماندنە (**إسْتِفْهامٌ تَعْجيبِيٌّ**) واتە: نکووڵییکردنی من، ڕەخنە گرتنی من لێیان، دوایی سزادانی من بۆیان، هێندە مەزن بوو، هێندە زەبەلاح بوو، ناگونجێ وەسف بکرێ و جێی سەرسوڕمانە.

ئەمە ئەوەش دەگەیەنێ کە ئەگەر ئێوەش وا بکەن، هەمان سەرەنجامتان بەسەر دێ، هەروەها ئەوەش دەگرێتەوە: وامەزانن کە ئێستا ڕستم بۆتان درێژ کردوە، دەرباز دەبن، کافرەکانی پێش ئێوەش ڕستم بۆ درێژ کردن، بەڵام کە لەسەر کوفرو ستەمی خۆیان بەردەوام بوون و نەگەڕانەوە، بەو شێوەیە سزام دان، ئێوەش ئێستا بوارتان دەدەم، بەڵام وا مەزانن ئەو بواردانە، پشتگوێ خستنە، بەڵکو ڕست بۆ درێژ کردنە و مۆڵەت دانە، بوارو دەرفەت پێدانە، بیقۆزنەوە و وەک وان مەکەن کە بەهرەیان وەرنەگرت لەو مۆڵەتدانەی خوای میهرەبان، بۆیە سەرەنجام دوای مۆڵەتدرانەکە، خوا گرتنی و سزای دان، کەواتە ئێوەش ئەگەر وەک وان بکەن، لە مۆڵەتدرانەکەی خوا بەهرە وەرنەگرن، سزادرانیشتان بۆ دێ.

پێشێ وەک بەسەرهات گێڕانەوە، باسیکرد، ئنجا خوا ﷻ شوێنەوارەکانیان وەک دیمەنی بەرجەستەو بەرچاو، پێشانی کافرو بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و دوای ئەویشیان دەدات، دەفەرموێ:

٨)- ﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ﴾، زۆر ئاوەدانییمان لەبەین بردن، لە کاتێکدا ستەمکار بوون، (**كَأَيِّنْ: اسْمٌ دَالٌّ عَلَى الإِخْبارِ عَنْ عَدَدٍ كَثِير**)، (**كَأَيِّنْ**) بە مانای (**كَم الخَبَرِيَّة**)یە، ناوێکە دەلالەت دەکات لەسەر هەواڵدان بە ژمارەیەکی زۆر، (**كَأَيِّنْ**) یانی: زۆر، ﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ ﴾، یان ﴿ وَكَم مِّن قَرْيَةٍ ﴿٤﴾ ﴾ الأعراف،

هەردووكیان هاتوون لە قورئاندا، یان: ﴿ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً ۝١١ ﴾ الأنبياء، واتە: زۆر ئاوەدانییمان پشت شكاندن، كە ستەمكار بوون، (**كَأَيِّنْ**) دەبێتە نیهاد (**مُبْتَدَأ**) و ئەوەی لە دوایەوە دێ، دەبێتە گوزارە (**خَبَر**).

﴿ وَهِيَ ظَالِمَةٌ ﴾، لە حاڵێكدا كە ستەمكار بوون، خوا ﷻ لە زۆر شوێنی قورئاندا بەیانی كردوە كە: هیچ ئاوەدانییەک، هیچ كۆمەڵگایەک سزا نادات، ئەگەر ستەمكار نەبێ، ستەم (**ظُلْم**)یش:

١- بە مانای كوفر دێ.

٢- بە مانای شیرک دێ.

٣- بە مانای دەستدرێژیی كردن بۆ سەر مافی ئەوانی دیكە دێ.

٤- بە مانای بەدرۆ دانانی پێغەمبەران دێ (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**).

٥- بە مانای نادیدە گرتنی چاكەكانی خوا دێ.

هەموو ئەو واتایانەی هەن، بەڵام ئەسڵی واتایەكەی: (**الظُّلْمُ: وَضْعُ الشَّيْءِ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ المُناسِب**)، (**ظُلْم**) بریتیە لە دانانی شتێک لە شوێنێک كە شوێنی گونجاوی خۆی نەبێ.

بێگومان هەر پێنج واتایەكەی قورئان بۆیان بەكاری هێناوە، ئەو مانا ئەسڵییەی دەیانگەیەنێ.

٩)- ﴿ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، ئێستا ئەو ئاوەدانییە زۆرانە كە فەوتاندمانن بە هۆی ئەوەوە كە ستەمیان كرد، دیوارەكانیان بەسەر سەربانەكانیان دا ڕماون، (خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا) (**سَاقِطَةٌ جِدْرَانُهَا عَلَى سُقُوفِهَا**) دیوارەكانیان بەسەر سەربانەكانیان دا ڕووخاون، عادەت وایە كە خانوویەک، بینایەک دەڕووخێ، پێشێ سەربانەكەی دەڕووخێ، دوایی بە تێپەڕ بوونی كات، ئنجا دیوارەكانیش بەسەر سەربانەكاندا دەڕووخێن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا ﴾، دیوارەكانی بەسەر سەربانەكاندا ڕماون.

**١٠)-** ﴿وَبِئۡرٖ مُّعَطَّلَةٖ﴾، هەروەها ئەوەی کە لێیان بەجێماوە: بیرێکی پەکخراو، (بئْرٍ معطَّلة) (**البِئْرُ: الَّتِي عُطِّلَت الإنْتِفَاعُ بِهَا مَعَ صَلاَحِهَا لِلإِنْتِفَاع**) بیرێک کە سوود لێوەرگرتنی پەکیخراوە، لە حاڵێکدا کە بە کەڵکی سوود لێوەرگرتن دێ، بەجێهێڵراوە، هەرچەندە ئاویشی تێدایە و بە کەڵکیش دێ.

**١١)-** ﴿وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ﴾، هەروەها کۆشکی بەرزکراوە، یاخود کۆشکی مەحکەم، (مَّشِيدٍ) چەند واتایەکی هەن، وەک پێشتریش گوتمان:

**١-** (**أَي: المَبْنِيُّ بالشِّيدِ وَهُوَ الجِصُّ وَالجِيرُ**) واتە: دروستکراو بە گەچ، یاخود سواق دراو بە گەچ، سپیکار کراو.

**٢-** یاخود (مَّشِيدٍ) بە مانای (**حَصِين**) دێ، زۆر قایم و مەحکەم.

**٣-** یان (مَّشِيدٍ) بە مانای (**عالِي، مُرْتَفِع**) بەرز، هەڵچوو، کۆشکی بەرز دێ، لە یەک کاتیشدا دەکرێ هەر سێ واتایەکان بگرێتەوە، بۆیە خوا وشەی (مَّشِيدٍ)ی بەکارهێناوە، دەیتوانی بفەرموێ: (**قَصْرٍ عالِي**)، یان بفەرموێ: (**قَصْرٍ مُجَصَّص**)، یان (**قَصْرٍ حَصِين**)، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ﴾، کە نەمبینیوە لە تەفسیرەکاندا ئاماژە بەوە بکرێ، خوا فەرموویەتی: (وَقَصۡرٖ مَّشِيدٍ) تاکو ئەوە بگەیەنێ کە ئەو کۆشکە:

**أ-** هەم بەرز بووە و بەرز کراوەتەوە.

**ب-** هەم بە گەچ، یاخود بە ماددەیەک وەک گەچ، سواقدراوەو سپییکار کراوە.

**ج-** هەم زۆریش مەحکەم و قاییم بووە.

**١٢)-** ﴿أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون؟ لێرەش و لە زۆر شوێنی دیکەش وشەی (سَيْر) ڕۆیشتن، بە دوو واتا هاتوە، وەک گوتراوە: (**السَّيْرُ سَيْرَانِ: سَيْرٌ مادِّي وَسَيْرٌ مَعْنَوِي**) ڕۆیشتن دوو ڕۆیشتنە: ڕۆیشتنی ماددیی، کە خەڵک بڕوا بە پێیان، بە سەیارە، بە هەر شێوازێک بڕواو تەماشای شوێنەوارەکان بکات، ڕۆیشتنی مەعنەوییش هەیە، کە بە چاوی عەقڵ و دڵ ئەو کۆشک و تەلارو شوێنەوارانەی بەجێیان هێشتوون،

بێنیە بەرچاو، چاوی خەیاڵی خۆت، یاخود مێژوو بخوێنیەوە، کە قورئان دەخوێنیەوە و، سەرچاوەکانی مێژوو دەخوێنیەوە، بە چاوی عەقڵ و دڵ بیهێنیە بەرچاوی خۆت، ئەوەش هەر ڕۆیشتنە، بەڵام ڕۆیشتنی مەعنەویی، کەواتە: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، ئایا بە پێیان نەڕۆیشتوون، یان بە ئامڕازەکان، یاخود بە فیکرو ئەندیشەو عەقڵ نەڕۆیشتوون؟

١٣)- ﴿ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ ﴾ ئنجا دڵانێکیان هەبن پێیان تێبگەن.

١٤)- ﴿ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ﴾ یان گوێیانێکیان هەبن پێیان ببیستن.

١٥)- ﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴾، بە دڵنیایی چاوەکان کوێر نین، یانی: چاوی سەریان، کە دەفەرموێ: (**فَإِنَّهَا**) ئەمە ڕاناوەکەی: (**ضَمِيرُ الْقِصَّةِ وَالشَّأْنِ**) دەچێتەوە بۆ حاڵەت و بەسەرهات یانی: حاڵ وایە، بەسەرهات وایە، کە ئەوانە چاویان کوێر نیە، چاوی سەر، بەڵکو ئەو دڵانەیان کوێرن، کە لە سینەکانیاندان.

١٦)- ﴿ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴾، بەڵکو ئەو دڵانەیان کوێرن، کە لە سینەکانیاندان.

شایانی باسە: ئێستا لە ڕووی زانستییەوە دەرکەوتوە، کە ئامڕازی زانین و دەرككردن مێشکە، کە لە کەللەی سەردایە و، لە قورئاندا وشەی (**فُؤاد**)ی بۆ ئەو بەکارهاتوە و، بە (**أَفْئِدَة**) کۆدەکرێتەوە، بۆیەش (**أَفْئِدَة**)و (**فُؤاد**) لە قورئاندا زەم نەکراون، وەک چۆن (**سَمْع**)و (**أَبْصَار**)یش زەم نەکراون، چونکە ئەوانە ئامڕازن، دەگونجێ ئینسان هەقیان پێ ببیستێ و ببینێ و بناسێ، دەشگونجێ لە ئەرکی سروشتیی خۆیاندا بەکاریان نەهێنی، بۆیە نە سەرزەنشت کراون، نە ستایش کراون، بەڵام دڵ (**قَلْب**) کە بە (**قُلُوب**) کۆدەکرێتەوە، لە قورئاندا جاری وا هەیە ستایش کراوە و، جاری واش هەیە زەم کراوە، بۆ وێنە:

أ- ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد، واتە: ئاگادار بن! بە یادی خوا دڵان ئارام دەگرن.

ب- ﴿ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الْإِيمَانَ ﴿٢٢﴾ ﴾ المجادلة، یانی: (خوا) ئیمانی لە دڵیان دا نووسیوە.

ج- ﴿ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴿٢﴾ ﴾ الأنفال، واتە: دڵەکانیان راچڵەکین (موچڕکەیان پێداهات).

ئەوانە هەموویان ستایش و مەدحن بۆ دڵانێکی شایستە و پاک.

بەڵام لە بەرانبەریشدا دڵ هەیە، زەم دەکرێ، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ خَتَمَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ ﴿٧﴾ ﴾ البقرة، خوا مۆری بەسەر دڵەوە ناون، یان کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ ﴾ بەدڵنیایی چاویان کوێر نین، بەڵکو ئەو دڵانەی لە سینەکان دان کوێرن.

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە دڵ چەقی ویستن و نەویستنە، چەقی بڕیاردانە، بۆیە هەم زەم دەکرێ، ئەگەر بڕیاری خراپ بدات و بەلای خراپەدا بچێ، هەم مەدح دەکرێ، ئەگەر بڕیاری چاک بدات و بەلای چاکەدا بچێ، بەڵام بیستن و دیتن و دەرککردن، بە گوێ و بە چاو و بە عەقڵ (**فُؤاد**)، ئەوانە ئامڕازن، دەگونجێ چاکەیان پێ دەرک بکرێ و، ڕوویان پێ لە چاکە بکرێ، یان ڕوویان پێ لە خراپە بکرێ، ئنجا ئەوەی کە ڕوویان پێ دەکاتە چاکە، یان خراپە، دڵەکەیە، لەوێوە بڕیاریان بۆ دەدرێ.

بەڵام وێڕای ئەوەش: ئێستا بەهۆی زانستەوە دەرکەوتوە، کە ئەندازەیەک لە زانین و ئیدراک، پەیوەندیی بە دڵیشەوە هەیە.

هەر کام لە: (**الأَبْصَار، القُلُوب، الصُّدُور**) کە (أل)ی ناساندنیان لەسەرە، هەموو ناساندنەکان یان: مەبەست پێیان ناساندنی (**جِنْس**)ە، واتە: تێکڕای ئەو دڵانە، تێکڕای ئەو چاوانە، تێکڕای ئەو سینانە کە دڵەکانیان تێدان، هی بێبڕوایان، ئنجا ئەگەر بۆ (**جِنْس**) بن، یانی: تێکڕای چاوو سینەو دڵی کافران بەو شێوەیەن.

دەشگونجێ (أل)ەکە بۆ ناساندن بێ، بەڵام بۆ (**عَهْد**) بێ، دڵەکانیان و چاوەکانیان و سینەکانیان، هی کافرەکان - کە قسەیان لە بارەوە دەکرێ - بەو شێوەیەن.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**بێبڕوایان پەلەی هاتنی سزای خوا دەکەن و، خواش بەڵێنی خۆی ناشکێنێ، بەڵام پێوەری کات لەلای خوا جیاوازەو، گەلێک ئاوەدانییش ڕستیان بۆ شل کراوەو دوایی گیراون:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ ۚ وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴿٤٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَسْتَعْجِلُونَكَ بِالْعَذَابِ ﴾، پەلەت لێدەکەن بۆ هاتنی سزا، وەک لە سوورەتی (الأنفال)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِذْ قَالُوا اللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ الْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ السَّمَاءِ أَوِ ائْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: یاد بکەوە! کاتێک گوتیان: ئەی خوایە! ئەگەر ئەمە (ئەم قوڕئانە) هەقە لە لایەن تۆوەیە، بەردمان بەسەردا ببارێنە، یاخود سزایەکی بە ئێشمان بۆ بێنە، لە جیاتی بڵێن: خوایە! هیدایەتمان بدە، گوتیان: بەرد بارانمان بکە، یاخود سزای بە ئێشمان بۆ بنێرە، خوا دەفەرمووێ: پەلەت لێدەکەن لە هاتنی سزا.

٢)- ﴿ وَلَن يُخْلِفَ اللَّهُ وَعْدَهُ ﴾، خواش بەڵێنی خۆی دوا ناخات، (أَخْلَفَ وَعْدَهُ: لَمْ يَفِ بِهِ)، (أَخْلَفَ وَعْدَهُ) پەیمانەکەی پێوەی پابەند نەبوو، بەڵێنی نەبردە سەر، خوا ﷻ خاوەنی هەرچی سیفەتی بەرزو پەسندو چاکە، یەکێک لە سیفەتە بەرزو پەسندو چاکەکان، کە فەرمانیشی پێکردوە خۆمانی پێ بڕازێنینەوە، بریتیە لە وەفاداریی بە بەڵێن و پەیمان، پابەندیی بە بەڵێن و پەیمانەوە: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ ﴿١﴾ ﴾المائدة، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وەفادار بن بە گرێبەستەکان.

ئنجا خوا ﷻ لەسەر زمانی بەندە چاکەکانی دەفەرموێ: ﴿إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ١٩٤﴾ آل عمران، واتە: خوایە! تۆ بەڵێن و پەیمان زایە ناکەی و دوای ناخەی.

٣)- ﴿وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ﴾، ڕۆژێک لە لای پەروەردگارت بە ئەندازەی هەزار ساڵە، لەوەی کە ئێوە دەیژمێرن، لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا ئەم تەعبیرە بەم شێوەیە هاتوە: ﴿وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِۚ وَلَوۡلَآ أَجَلٞ مُّسَمّٗى لَّجَآءَهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَيَأۡتِيَنَّهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ٥٣ يَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ٥٤ يَوۡمَ يَغۡشَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۡ وَيَقُولُ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٥٥﴾.

واتە: پەلەت لێدەکەن بە هاتنی سزا، ئەگەر کاتێکی دیارییکراویش نەبووایە، سزایان بۆ دەهات، کت و پڕیش بۆیان دێ، بەبێ ئەوەی هەست پێ بکەن، پەلەت لێ دەکەن بە هاتنی سزا، دۆزەخیش دەوری بێبڕوایانی داوە، ئەو ڕۆژە کە سزا دایاندەپۆشێ لە سەریانەوە و لە ژێریانەوە، (خوا) پێیان دەفەرموێ: بیچێژن سزای ئەوەی دەتانکرد.

کەواتە: کە سزای خوا یەکسەر بۆتان نایەت، لەبەر ئەوەیە کە پێوەری کات لە لای خوا جیایە، ڕۆژێک لە لای خوا بە قەدەر هەزار ساڵی ئێوەیە، ئێوە زۆر پەلە دەکەن، بەڵام خوا ﷻ کات و شوێن و هەموو شتێک، دنیاو دواڕۆژ لە ژێر دەستی خۆیدایە، پەلەی نیە، خوا ئەم گەردوونەی بە سیستم (**نظام**) داناوە، هەر شتە لە کاتی خۆیدا دێ، بە هۆی ئارەزوو کردنی خەڵکەوە و، بە هۆی داوا کردن و پەلە کردنی خەڵکەوە، خوا سیستمی خۆی تێکنادات.

٤)- ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَمۡلَيۡتُ لَهَا﴾، زۆر ئاوەدانییش هەبوون ڕستم بۆ درێژ کردوون، مۆڵەتم داون، پێشێ فەرمووی: ﴿فَكَأَيِّن﴾، ئەوەیان دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن﴾، بۆچی؟ چونکە ئەوەی پێشێ یەکسەر بە (ف)ی بەدواداهاتن (**تَعْقِيب**) بە دوای ئەوی دیکەدا هات، بەڵام ئەمەیان بە (**و**) بادەدرێتەوە و سیاقەکان جیان.

٥)- ﴿ وَهِىَ ظَالِمَةٌ ﴾، لە کاتێکدا کە ستەمکاریش بووە، لە حاڵێکدا کە ستەمکار بوون

٦)- ﴿ ثُمَّ أَخَذْتُهَا ﴾، دوایی گرتوومن، پێشتریش گوتمان: (أَخْذ) بە کارهێنراوە بۆ سزادان، چونکە کەسێک بیەوێ کەسێک سزا بدات، دەیگرێ، دەگوترێ: پشتە ملی گرت، ئنجا دوایی سزای دەدات

٧)- ﴿ وَإِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴾، سەرەنجامیش هەر بۆ لای منە، ئەمە - پێشخستنی ژێردار کەرو ژێردارکراو (تقديم الجار والمجرور) - شێوازی کورت هەڵێنانە واتە: گەڕانەوە تەنیا بۆ لای منە.

**نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی:**

بۆچی خوا لەوەی پێشێدا فەرموویەتی: ﴿ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ﴾، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ﴾، هی پێشێ بە (ف) و، هی دوایە بە (و) بادراوەتەوە؟!

چونکە دوای ئەوەی لە پێش دا باسی فەوتاندنی حەوت لە گەلە پێشووەکانی کردوە، بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَكَأَيِّن ﴾، واتە: ئەو گەلانە فەوتاون، ئێوەش چاوەڕێ بکەن، ئەم (ف)ە، دەگونجێ (فَاء الجَزَائِيَّة) بێ، بۆ سەزا بێ، ئێوەش چاوەڕێ بکەن وەک ئەوان سزا بدرێن، یاخود (فَاء التَّعْقِيب) بێ، یانی: بە دوای ئەواندا چاوەڕێ بن، ئێوەش ئاوا سزا بدرێن.

بەڵام لێرەدا ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ ﴾، لەبەر ئەوەی داوایان کردوە بە پەلە سزای خوایان بۆ بێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێوە پەلە دەکەن لە حاڵێکدا {ئەم (و)ە دەگونجێ (واو الحالِيَّة)بێ یانی: بۆ بادانەوە (عطف)یە، بەڵام دەگونجێ مەبەست پێی حاڵ بێ} زۆر شارو ئاوەدانیی لە ڕابردوودا ڕستم بۆ درێژ کردوون و مۆڵەتم داون، لە حاڵێکدا کە ستەمکار بوون، دوایی گرتوومن و سزام داون، سەرەنجامیش هەر بۆ لای منە.

کەواتە: ئێوە نابێ پەلە بکەن، تەماشای مێژوو بکەن! ئنجا قەناعەتتان دێ، کە: هەر گەل و کۆمەڵگایەک ستەمکار بووبێ و یاخیی بووبێ، لایدابێ و لاڕێ بووبێ، دەرباز نەبووە لە سزای خوا، ئەوە شوێنەوارەکانیان، تەماشایان بکەن!

خوای پەروەردگار بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتیمان بدات، زیاتر لە کتێبە موبارەک و پڕ پیت و پێزەکەی تێبگەین و، زیاتر بە هۆیەوە پێبگەین، یارمەتییشمان بدات تێگەیشتن و پێگەیشتنەکەی خۆمان بگوازینەوە بۆ دەوروبەریشمان، دەوروبەریشمان تێبگەیەنین، پێبگەیەنین، خوا بە هۆی قورئانەوە، بە هۆی ئەم کتێبە موبارەکەوە، تەمەنمان زیاتر پڕ بەرەکەت بکات بە لوتف و کەرەمی خۆی و، لە هەرچی خراپەو هەڵەو پەڵەو پیسیی هەیە، پاکمان بکاتەوە و، بە هەرچی چاکیی و پاکیی و ڕاستیی و ساغیی هەیە، بمانڕازێنێتەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هـەژدە (١٨) ئایـەت، پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (٤٩ - ٦٦)، کـە خـوا ﷻ پێنـج بابـەتی سـەرەکیی تێیـان دا خسـتوونە ڕوو:

١)- فەرمانکردن بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ بە مرۆڤایەتیی ڕابگەیەنێ: ئاگادارکەرەوە و ترسێنەرێکی ڕۆشنە بۆ هەموویان، بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، ئنجا بڕوادارانی کردەوە باش، لێبوردن و بژیوی باش و، ناحەزانی ئایەتەکانی خواش ﷻ، دۆزەخی بڵێسەداریان بۆ دانراوە.

٢)- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هەمیشە شەیتان بۆ پێغەمبەرانی خوا و ڕەوانەکراوان، لە بۆسەدایە: خوتخوتەی خراپیان بخاتە دڵ، بەڵام خوا ﷻ پیلانەکەی (ئیبلیس)ی هەڵوەشاندۆتەوە و، سەرەنجام دڵنەخۆشان و دڵڕەقان، زەرەرمەند و، زانایانی بڕوداریش بەهرەمەند بوون لە ئایەتەکانی خواو، لە پەیامی خوا کە بە پێغەمبەرانی دا ناردوویەتی.

٣)- بێبڕوایان هەمیشە لە دوو دڵیی دابوون و دەبن، لە بارەی قورئانەوە، هەتا کاتی مەرگیان، یان کاتێ سزای بە ئێشیان بۆ دێ و، لە قیامەتیشدا هەر کەسە بەپێی خۆی، پاداشت یان سزای پڕ بە پێست وەردەگرێ.

٤)- ستایشی کۆچکەرانی تێکۆشەر و فیداکار لە پێناوی خوادا، کە پاداشتی بەرز و سەرەنجامێکی پڕ ڕەزامەندییان هەیە و، خوای دادگەر و باڵا دەستیش پشتیوانی ستەملێکراوانە.

٥)- خستنە ڕووی دوازدە (١٢) کردەوەی گەورە و گرنگی خوا ﷻو، وەسفکردنی خوا ﷻ بە شازدە (١٦) لە سیفەتە بەرز و پەسندەکانی، کە سەرجەم دەکەنە: بیست و هەشت (٢٨).

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِىٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ لِّيَجْعَلَ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ فِتْنَةً لِّلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓا۟ أَوْ مَاتُوا۟ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُۥ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِىَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٦٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةً ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦٤﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٌ ﴿٦٦﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{(ئـەی موحەممـەد!) بڵـێ: ئـەی خەڵکینـە! بـە دڵنیایـی مـن بـۆ ئێـوە تەنیـا ترسـێنەر و ورياکەرەوەیەکـی ئاشـکرام ﴿٤٩﴾ ئنجـا ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە و، کـردەوە باشـەکانیان کـردوون، لێبـوردن و بژیوێکـی پەسـندیان هەیـە ﴿٥٠﴾ ئەوانـەش کـە لـە دژی ئایەتەکانمـان تێکۆشـان بـۆ پەکخسـتنیان، ئەوانـە هاوەڵـی کڵپـەی ئاگرن ﴿٥١﴾ لـە پێـش تۆشـدا (ئـەی موحەممـەد ﷺ) هیـچ ڕەوانەکـراو و پێغەمبەرێکـمان نەنـاردوە، مەگـەر کاتێـک ئـاواتی خواسـتوە، شـەیتان (خوتخوتـەی خراپـی) فڕێداوەتـە نێـو ئاواتەکەیـەوە، ئنجـا خـواش (یاسـای وابـووە کـە) ئـەوەی شـەیتان فڕێیـداوە، لایدەبـات و دوایـی (کاریگەریـی) ئایەتـەکانی پتـەو و قایـم دەکات و، خـوا زانـای کارزانـە ﴿٥٢﴾ تاکـو لـە ئەنجامـی ئـەوەدا (خـوا ﷻ)، ئـەو (خولیـا و خوتخـوت)ەی شـەیتان فڕێیـداوە، بیکاتـە تاقیکردنـەوە بـۆ ئەوانـەی دڵیـان نەخۆشـیی تێدایـە و، ئەوانـەش کـە دڵیـان ڕەق و سـەختە، ستەمکارانیش لـە ناکۆکییەکـی دوور و قووڵـدان (لەگـەڵ خـوا و پێغەمبـەرانی دا) ﴿٥٣﴾ هەروەهـا تاکـو ئەوانـەش کـە زانیارییـان پێـدراوە، بزانـن و دڵنیابـن کـە ئـەو (قوڕئـان)ە هەقـە لـە پەروەردگاریانـەوە، ئنجـا سـەرەنجام بـڕوای پـێ بێنـن و، دڵیـان بـۆی نـەرم و ملکـەچ بـێ، بێگومـان خـواش ڕێنماییـکاری ئەوانەیـە کـە بڕوایـان هێنـاوە بـەرەو ڕاسـتە ڕێ ﴿٥٤﴾ بەردەوامیـش ئەوانـەی بێبـڕوان لـە بـارەی (قوڕئـان)ەوە، لـە دوو دڵیـی دان، هەتـا کت و پڕ کۆتایی (مەرگ)یـان دێ، یـان سـزای ئـازاری ڕۆژێکـی نـەزۆک و بـێ خێریـان بـۆ دێ ﴿٥٥﴾ لـەو ڕۆژەدا حوکـم و دەسـتەڵات تەنیـا هـی خوایـە، دادوەرییـان لـە بەینـدا دەکات، ئنجـا ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە و کـردەوە چاکەکانیـان کـردوون، لـە بەهەشـتە پـڕ نـاز و نیعمەتـەکان دان ﴿٥٦﴾ ئەوانـەش کـە بێبـڕوا بـوون و ئایەتەکانمانیـان بـەدرۆ دانـاوە، ئـا ئەوانـە ئازارێکـی ڕیسـواکەریان هەیـە ﴿٥٧﴾ هەروەهـا ئەوانـەی لـە ڕێـی

خـوادا کۆچیـان کـردوە، دوایـی کـوژراون، یـان مـردوون، خـوا ﷻ بـە بژیویٚکـی بـاش ڕۆزییـان دەداتـێ و، مسـوٚگەر هـەر خـواش باشـترین بژیـودەرە ﴿٥٨﴾ بـە دڵنیایـی دەیانخاتـە مەنزڵگایەکـەوە کـە پەسـندیانە و، بێگومـان خـواش زانـای هێدییـە ﴿٥٩﴾ (ئـەوەی باسـکرا) هـەر بـەو شـێوەیەیە و، هـەر کەسـێک بـە گوێـرەی پـێ سـزادرانی، سـزای بەرانبـەر بداتـەوە و، دوایـی دەسـتدرێژیی بکرێتـە سـەر، بێگومـان خـوا سـەری دەخـات، بـە دڵنیایـی خـوا چاوپۆشـییکاری لێبوردەیـە ﴿٦٠﴾ ئەویـش بـە هـۆی ئـەوەوە کـە خـوا شـەوگار بـە نێـو ڕۆژگاردا دەکات و، ڕۆژگاریـش بـە نێـو شـەوگاردا دەکات و، بێگومـان هـەر خـوا بیسـەری بینـەرە ﴿٦١﴾ بـە هـۆی ئەوەشـەوە کـە خـوا هـەر خـۆی هەقـە و، ئـەوەی (هاوبەشـدانەران) لێـی دەپاڕێنـەوە، ناهەقـە و، بێگومـان هـەر خـواش بـەرزی گەورەیـە (بەڕەهایـی) ﴿٦٢﴾ ئایـا سـەرنجت نـەداوە کـە: خـوا ﷻ لەسـەرێوە ئـاوی دابەزانـدوە، یەکسـەر زەوی سـەوز هەڵگـەڕاوە! بێگومـان خـوا پەنهانـکاری شـارەزایە ﴿٦٣﴾ هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و لـە زەوی دایـە، هـی ویـە و بـە دڵنیایـی هـەر خـوا دەوڵەمەنـدی ستایشـکراوە ﴿٦٤﴾ ئایـا (بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ) نابینـی کـە خـوا هەرچـی لـە زەوی دایـە، بـۆی ڕام و دەسـتەمۆ کـردوون و، کەشـتییەکانیش بـە فەرمـانی وی لـە دەریـادا دەڕۆن (دێـن و دەچـن) و ئاسـمانیش دەگـرێ و ناهێڵـێ بەسـەر زەوی دا بکـەوێ، مەگـەر بـە مۆڵـەتی خـۆی، بـە دڵنیایـی خـوا بەرانبـەر بـە خەڵکـی، یەکجـار بـە پـەرۆش و میهرەبانـە ﴿٦٥﴾ هەروەهـا بـەس ئەویـش دەتانژیەنـێ، دوایـی دەتانمرێنـێ، پاشـان زیندووتـان دەکاتـەوە، بـە ڕاسـتیی مـرۆڤ (ی بێبـڕوا) زۆر سـپڵە و پـێ نەزانـە ﴿٦٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مُعَـٰجِزِينَ): واتــە: دەســتە وســانکەران (أَعْجَـزْتُ فُلَانَـاً وَعَجَّزْتُـهُ وَعَاجَزْتُـهُ: جَعَلْتُـهُ عَاجِـزاً)، ئـەم سـێ کـرداره، (أَعْجَـزْتُ وَعَجَّزْتُـهُ وَعَاجَزْتُـهُ) واتـە: دەستەوسـانم کـرد و دەستەپاچەم کـرد، یـانی: فـڵان کەسـم دەسـتە پاچـە و بـێ دەسـەڵات کـرد (مُعَـٰجِزِينَ) خوێندراویشـەتەوە: (مُعَجِّزِيْـن)، واتـە: دەسـتە وسـان کـەر و دەسـتە پاچـەکار.

(تَمَنَّىٰٓ): واتــە: خۆزگــە و ئــاواتی خواســت، (التَّمَنِّــي: تَقْدِيـرُ الـشَّيْءِ فِي النَّفْـسِ وَتَصْوِيـرُهُ فِيهَـا، وَلَـمَّا كَانَ أَكْثَرُهُ عَـنْ تَخْمِـينٍ، صَارَ الْكَـذِبُ لَـهُ أَمْلَـكُ، فَأَكْثَرُ التَّمَنِّي تَصَـوُّرُ مَـا لَا حَقِيقَـةَ لَـهُ، وَالأُمْنِيَّـةُ: هِـيَ الصُّـورَةُ الْحَاصِلَـةُ فِي النَّفْـسِ مِـنْ تَمَنِّـي الـشَّيْءِ)، (تَمَنِّـي) بریتیـە لـە ئەندازەگیریـی کـردنی شـتێک و وێناکـردنی شـتێک لـە دەروونـدا، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی بـە زۆریـی ئـەو ئەندازەگیریـی کـردن و وێناکـردنی شـتانە، بـە زەیـن و گۆترەیـە، بۆیـە زیاتـر مانـای درۆ دەگەیەنـێ، چونکـە زۆربـەی ئـاوات و خۆزگـەکان، وێناکـردنی شـتێکن حەقیقەتیـان نیـە و (أُمْنِيَّـة) کـە بـە (أَمَـانِي) کـۆ دەکرێتـەوە، بریتیـە لـەو وێنەیـەی لـە ئەنجامـی خۆزگـە خواسـتن و بـە ئـاوات خواسـتنی شـتێکدا، لـە دڵـدا پەیـدا دەبێ.

(شِقَاقٍ بَعِيدٍ): واتــە: ناکۆکییەکـی دوور، (الشِّـقَاقُ: الْمُخَالَفَـةُ)، واتـە: ناکۆکیـی و دووبەرەکیـی، (لأنـه يَكُـونُ فِي شِـقٍّ غَـيْرِ شِـقك)، چونکـە ئـەو لەلایـەک دەبـێ، جیـا لەلایەکـەی تۆ.

(فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ): دڵیـان بـۆی نـەرم بـێ و ملکـەچ بـێ، (الخَبْـتُ: الْمُطمَـئِنُّ مِـنَ الأَرْضِ: الْمُنْخَفِـضُ، الإِخْبَـاتُ: اللِّيْنُ وَالتَّوَاضـع)، (خَبْـت) بـە شـوێنێکی گۆماڵیـی و تەخـت دەگوترێ لـە زەوی، کـە نـزم بـێ و لـەوەوە خوازراوەتـەوە بـۆ (إِخْبَـات) واتـە: نەرمیـی و تەسـلیم بـوون و ملکەچیی.

(مِرۡيَةٖ): (**المِرْيَـةُ: الـتَّرَدُّدُ فِي الأَمْـرِ، وَهُـوَ أَخَـصَّ مِـنَ الشَّـكِّ**)، (**مِرْيـة**) واتـە: لـە بـارەی شـتێکەوە دڵ لـە دڵ بـدەی و دوو دڵ بی، کـە تایبەتـترە لـە (**شَـكّ**)، (**شَـكّ**) ئەوەیـە کـە دوو لای شـتێکت پـێ وەک یـەک بـن، بـوون و نەبوونیـت پـێ وەک یـەک بـن، تییـدا دوو دڵ بـی، بـەڵام (مِرۡيَةٖ) لـەوە تایبەتـترە، ئەوەیـە کـە دڵـت بێـت و بچـێ لـە بەینیانـدا، یـان: (مِرۡيَةٖ) ئەوەیـە کـە لـە شـتێکدا دوو دڵ بی و، ئـەو دوودڵییـە هیـچ پاسـاوێکی نەبێـت، (مِرۡيَةٖ) لـە (**شَـكّ**) تایبەتـترە.

(بَغۡتَةً): (**البَغْـتُ: مُفَاجَـأةُ الـشَّيءِ مِـنْ حَيْـثُ لَا يُحْتَسَـبُ**)، بریتیـە لـە ڕوودانی کـت و پـڕی شـتێک بـە شـێوەیەک کـە چاوەڕوان ناکـرێ.

(عَقِيمٍ): (**أَصْلُ العُقْـمِ: اليُبْـسُ المَانِـعِ مِـنْ قُبُـول الأَثَـرِ**)، (**عُقـم**) بریتیە لە وشـکییەک کـە ڕێگـر بـێ لـەوەی ئـەو شـوێنەوارە قبـووڵ بـکات، (**يَـوْمٍ عَقِيْـم**)، یـانی: (**لَافَـرَحَ فِيْـه**)، ڕۆژێـک کـە هیـچ دڵخۆشـییەکی تیـدا نەبـێ و، ڕۆژێکـی نـەزۆک و بـێ خێـر، ﴿ٱلرِّيحَ ٱلۡعَقِيمَ ٤١﴾ الذاریـات، واتـە: بایەکـی نـەزۆک، بایـەک کـە هیـچ خێـری پێـوە نەبـێ، بـای سـزا دان.

(مُّدۡخَلٗا): خوێندراویشـەتەوە: (**مَدْخَـلًا**)، ئەگـەر (**مَدْخَل**)بـێ، ئـەوە لـە (**دَخَـلَ يَدْخَـل**)ەوە، واتـە: چـووە نێـو، دەچێتـە نێـو، بـەڵام ئەگـەر (**مُدْخَل**)بـێ، لـە: (**أَدْخَـلَ يُدْخِـلُ**) هاتـوە، واتـە: خسـتیە نێـو، دەیخاتـە نێـو.

(يُولِجُ): (**الوُلُـوجُ: الدُّخُـولُ فِي مَضِيْـق**)، (**ولـوج**) بریتیـە لـە چوونـە نێـو شـتێکی تەنگەبـەر و تەسـک.

(مُخۡضَرَّةً): (**المَـكَانُ الكَثِـيرُ الخُـضْرَة**)، (**مخـضرة**) شـوێنێکە زۆر سـەوزایی لـێ بێـت و سـەوز هەڵبگـەڕێ، هەروەهـا خوێندراویشـەتەوە: (**مَخْـضَرَة**)، (**المُخْـضَرَّةُ: الَّتِـي صَـارَ لَوْنُهَا الخُـضْرَة**)، (**مُخْـضَرَّة**) واتـە: شـتێک کـە ڕەنگەکـەی سـەوز بـێ و سـەوز هەڵگەڕابـێ.

(لَكَفُورٞ): (**المُبَالِـغُ فِي كُفْـرَانِ النِّعْمَـة**)، (**كَفُـور**) بریتیـە لە کەسـێک کـە زێدەڕۆیی کردبـێ لـە نادیدەگرتنی چاکـە و نیعمەتـەکانی خوادا ﷻ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەو باسـانەدا کـە ڕابـردن، کـە کۆتـا بـاس سـەرەنجدانەوەیەکی مێـژووی گـەلانی پێشـوو بـوو، کـە لـە ئەنجامـی ملهووڕیـی و سـەرپێچییان لـە فەرمـانی پێغەمبـەرانی خـوا (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) و، پابەنـد نەبوونیـان بـە بەرنامـەکانی خـواوە ﷻ، چۆن دووچـاری سـزای پـڕ بـە پێسـتی خـوا ﷻ بـوون، لـە دنیـادا و، لە دواڕۆژیشـدا سـزای گەورەتـر چاوەڕێیانـە، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰ ﴾ (١٢٧) طـە، سـزای ڕۆژی دوایـی سەختریشـە و بەردەوامتریشـە، دوای ئـەوە خـوا ﷻ ڕوو دەکاتـە پێغەمبـەری خاتـەم و ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ﴾، بڵـێ: ئـەی خەڵکینـە! ئـەی خەڵکینـە، واتـە: بـە ڕەش و سـپییەوە و، بـە عـەرەب و عەجەمـەوە، بـە هەمـوو زمانەکانـەوە و، هەمـوو ڕەنگەکانـەوە و، لـە هەمـوو چـوار تـەرەفی دنیـا و، هەمـوو ئەوانـەی لـە ئـادەم و حـەواوە هاتـوون، ﴿ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، مـن تەنیـا هۆشـیارکەرەوە و ترسـێنەرێکی ئاشـکرا و ڕوونـم بـۆ ئێـوە، واتـە: تەنیـا ئەرکـی مـن ئەوەیـە کـە هۆشـیار و وریاتـان بکەمـەوە و، بتانترسـێنم و ئاگادارتـان بکەمـەوە کـە: بەهەوەنتـە و بـێ حیکمـەت نەهاتوونـە ئـەو ژیانـە دنیایـەوە، خوایەکـی پـەروەردگار هێنـاونی و، بـۆ ئـەرک و بـۆ حیکمەتێـک هاتـوون و، ژیانیـش بـەس ئـەوە نیـە کـە لـە چوارچێـوەی دنیـادا هەیـە و، قۆناغـی دیکـەی ژیانتـان لـە پێشـن، لەبـەر ئـەوە بزانـن چـۆن دەژییـن و، ئـەو پێنـج و دوو ڕۆژەی دنیـا چـۆن دەگوزەرێنـن؟

ئنجـا بـاسی سـەرەنجامەکەیان دەکات: ﴿ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾، ئنجـا ئەوانـەی کـە بڕوایـان هێنـاوە و کـردەوە باشـەکانیان کـردوون، بڕوایـان هێنـاوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ و، کـردەوە باشـەکانیان کـردوون، واتـە: هەمـوو ئـەو جموجـۆڵ و چالاکییانـە، چ پەنهان

بن و پەیوەندییان بە دڵ و دەروونەوە هەبێ، چ زارەکیی بن و پەیوەندییان بە قسە و دەربڕینەوە هەبێ، چ جەستەیی بن و پەیوەندییان بە ئەندامەکانی جەستەوە هەبێ، چ لە بوار و جوغزی تاکیی، یان خێزانیی، یان کۆمەڵایەتیی، یان سیاسیی دابن، هەموو ئەو جموجوڵ و کردەوە باشانە، کە بە پێی شەریعەتی خوا ﷻ باشن و، عەقڵی سەلیم و فیترەتی ساغ بە باشیان دەزانێ، هەموو ئەوانەی ئاوا بوون: ئیمانیان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێندرێ و، جموجوڵ و چالاکییە باشەکانیان ئەنجام داون، ﴿لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ﴾، لێبوردنێکی مەزن و بژیوێکی زۆر پڕ ڕێز و حورمەتیان بۆ هەیە، لە ڕۆژی دواییدا.

﴿وَٱلَّذِينَ سَعَوۡاْ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ﴾، ئەوانەش کە تێکۆشاون و هەوڵیان داوە و خۆیان ماندوو کردوە، کە ئایەتەکانی ئێمە پەک بخەن و، دەستەوسان و ناکارایان بکەن، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾، ئا ئەوانە هاوەڵانی کڵپەی ئاگری دۆزەخن، (ٱلۡجَحِيمِ) واتە: کڵپەی ئاگر، (أَصۡحَٰبُ) کە کۆی (صَاحِبَ)ە، هەم بە مانای خاوەن دێ و، هەم بە مانای هاوەڵ دێ، ئنجا ئەوانە دەبنە هاوەڵانی دۆزەخ و لێی جیانابنەوە و، دەبنە خاوەنی دۆزەخیش، ئەگەر شتێک هەبێ ئەوانە خاوەنداریەتیی بکەن، لە ڕۆژیی دواییدا، بریتیە لە ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ.

ئنجا دوای ئەوە خوا ﷻ ڕاستییەکی مەزن بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ و، بە ئۆممەتەکەی و شوێنکەوتووانی و، بە مرۆڤایەتیش ڕادەگەیەنێ، مرۆڤایەتییش لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ هەمووی هەر بە ئۆممەتی موحەممەد ﷺ لە قەڵەم دەدرێ، هەموو مرۆڤایەتیی ئۆممەتی موحەممەدە ﷺ، ئنجا ئەو ئۆممەتەش دوو بەشە:

١- ئۆممەتی وەڵامدەرەوە (**الأمة المستجيبة**) کە ئێمە و مانانین.

٢- ئۆممەتی بانگکراو (**الأمة المدعوّة**) سەرجەم خەڵکی دیکە، کە بانگکراون لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئنجا خوا ﷻ ئەو ڕاستییە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ ڕادەگەیەنێ و بە مرۆڤایەتییشی ڕادەگەیەنێ، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، تاکو بەرچاو ڕوون بن، کە شەیتان هەمیشە لە بۆسەدایە و لە کەلێن دەگەڕێ، بۆ ڕەوانەکراوان و پێغەمبەرانی خوا.

دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ ﴾، لە پێش تۆدا، (ئەی موحەممەد ﷺ) هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە، هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوان نەکردوە، مەگەر کاتێک کە خۆزگە و ئاواتێکی خواستوە، شەیتان فڕێی داوەتەوە نێو خۆزگە و ئاواتەکەیەوە، ئایا چی فڕێداوە؟ بێگومان ئەوەی لە شەیتان چاوەڕێ دەکرێ فڕێی بدات خوتخوتە و خولیای خراپ و پڕوپاگەندەی خراپ و بیرۆکەی خراپ ﴿ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، دوایی خوا ﷻ ئەوەی شەیتان فڕێی داوە، لای دەبات و دەیسڕێتەوە و، ئایەتەکانی خۆیشی مەحکەم دەکات.

یانی: کاریگەریی ئایەتەکانی مەحکەم دەکات و، پیلان و فێڵی شەیتان و خوتخوتە و خەیاڵەکەی کە ویستوویەتی، ئاوێتەی خۆزگە و ئاواتی پێغەمبەر ﷺ ی بکات، دەیسڕێتەوە و لای دەبات، ﴿ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾، خواش زانای کارزانە.

ئنجا ڕەنگە یەکێک بپرسێ: بۆچی خوا ﷻ مۆڵەتی داوە و، بواری بۆ شەیتان ڕەخساندوە وابکات، خولیا و خوتخوتەی خراپ، ڕەگەڵ ئاوات و خۆزگەی پێغەمبەران بخات؟

أ- چ بیخاتە گەڵ خۆزگە و ئاواتەکانی کە لە دڵی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)دان.

ب- چ بیخاتە دڵی ئەوانەوە کە گوێیان لە ئایەتەکانە.

ج- چ مەبەست ئەوە بێ پڕوپاگەندەی خراپ بڵاوبکاتەوە لە دژی ئایەتەکان.

هەر سێ واتاکەی هەن و دوایی باسیان دەکەین، یەکێک بۆی هەیە بڵێ: بۆچی خوا ئەو بوارەی بۆ شەیتان ڕەخساندوە؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: ﴿ لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡ ﴾ (بۆیە خوا ﷻ ئەو بوارەی بۆ شەیتان ڕەخساندوە): تاکو ئەوەی شەیتان فڕێی دەدات، بیکاتە تاقیکردنەوە بۆ ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە و، ئەوانەش کە دڵیان سەخت و ڕەقە، هەموویان پێی تاقی دەکرێنەوە.

﴿ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴾، بێگومان ستەمکارانیش لە ناکۆکییەکی دوور دان، واتە: ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە و ئەوانەی کە دڵیان سەخت و ڕەقە لە بەرانبەر هیدایەتی خوادا، لە ناکۆکییەکی دوور دان، بۆیە بەو خوتخوتە و خەیاڵ و دنەدانەی شەیتان، کارتێکرا و دەبن و، خوا ﷻ کردوویەتی بە ماددەی تاقیکردنەوە بۆیان.

﴿ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ ﴾، هەروەها تاقیکردنەوەشە بۆ ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، کە بزانن ئەوە هەقە و لە پەروەردگارتەوەیە، یانی: ئەو قورئانە هەقە، ﴿ فَيُؤۡمِنُواْ بِهِۦ فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡ ﴾، سەرەنجام بڕوای پێ بێنن، وێڕای ئەو ئیمانەی هێناویانە، ئیمانی دیکەشی پێ بێنن و ئیمانیان زیاد بێ، ﴿ فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡ ﴾، سەرەنجام دڵیان بۆ ئەو فەرمایشتەی خوا ﷻ نەرم و میهرەبان و ملکەچ بێت.

تەماشا دەکەین: هەر یەک خوتخوتە و دنەدانی شەیتانە، بەڵام ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، یان دڵیان سەخت و ڕەقە، لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا، بۆیان دەبێتە مایەی بەڵا و نەگبەتیی، بەڵام بۆ ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، دەبێتە مایەی زیادبوونی ئیمانیان و، زیاتر ملکەچ بوونیان و نەرم بوونی دڵ و دەروونیان، ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، بە دڵنیایی خواش ڕێنماییکاری ئەوانەیە، کە بڕوایان هێناوە بەرە و ڕاستە شەقام.

ئنجا باسی بابەتێکی دیکە دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان، بەردەوام لە بارەی (قورئان)ەوە لە دوو دڵیی دا دەبن، {یان: لە بارەی پێغەمبەر موحەممەدەوە ﷺ،} تاکو کت و پڕ ئاخیر زەمانیان بۆ دێ، یاخود سزای ڕۆژێکی نەزۆک و بێخێریان بۆ دێ، ئاخیرزەمان، چ مەبەست پێی ئاخیر زەمانی گەورەبێ، کە بەسەر هەمموو خەڵکی سەر زەویدا دێ، چ مەبەست پێی ئاخیر زەمانی تایبەتی ئەوان بێ، کە بریتیە لە کاتی مەرگ و مردنیان.

﴿ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ﴾، لەو ڕۆژەدا دەسەڵات و دەست ڕۆیشتوویەتیی، تەنیا هی خوایە، دادوەرییان لە نێواندا دەکات.

ئنجا سەرەنجامی دادوەرییەکەش بەم شێوەیە دەبێ: ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، لە باغ و بێستانە پڕ ناز و نیعمەتەکاندان، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، بەڵام ئەوانەی بێبڕوابوون، بە هەمموو ئەو شتانەی کە دەبووایە ئیمانیان پێ بهێنن، ﴿ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾ هەروەها ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ دانان:

١- چ ئایەتە خوێنراوەکان، کە قورئانە.

٢- چ ئایەتە بینراوەکان، کە دیاردە و دیمەنەکانی سروشتن.

٣- چ ئایەتە نێردراوەکان بە پێغەمبەراندا، کە موعجیزەکانی پێغەمبەرانن (**عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**).

٤- چ ئەو ئایەتانەی لە ژیانی بەشەردا ڕوویانداوە، ئایەتەکانی خوا کە بریتین لە: سەرخستنی خوا بۆ پێغەمبەران و، لە بەین بردنی دوژمن و ناحەزانیان.

وشەی (**آيات**) لە قورئاندا، بۆ هەر کام لەو چوارانە بەکارهاتوە، ئنجا ئەوانەی کە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناون، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾، ئا ئەوانە سزایەکی ڕیسواکەر و زەبوونکەریان بۆ هەیە.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دیکە، چونکە لە ئەنجامی بە درۆدانانی ئەهلی کوفر بۆ ئایەتەکانی خوادا، زۆرجاران مسوڵمانان جێ و ڕێیان پێ سەغڵەت دەبێ و نارەحەت دەبن و، ناچاردەبن خاک و وڵات و زێد و کەس و کاری خۆیان بەجێبێڵن، بۆیە باسی ئەوە دەکات کە ئەوانە زیانیان لێ ناکەوێ، بەڵکو چ بکوژرێن یان بمرن و، چ بمێنن، لە دنیا و لە دواڕۆژدا، خوا ﷻ لەگەڵیانە و پشتیوانیانە و بە دەمیانەوەیە، دەفەرموێ:

﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ﴾، ئەوانەش کە کۆچیان کردوە لە ڕێی خوادا، دوایی کوژراون، یاخود مردوون، ﴿لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنًا﴾، بە دڵنیایی خوا بژیوێکی باشیان پێدەدات، واتە: لە بەهەشتدا، چونکە دەفەرموێ: ﴿قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ﴾، ئەگەرنا دەگونجا بۆ دنیاش بێ، بەڵام دوای مردن و کوژران، لە دواڕۆژدا ئەو بژیوە باشە هەیە، کە لە بەهەشتدایە، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ باشترینی بژیوەدەرانە.

﴿لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥ﴾، دەیانخاتە شوێنێکەوە، جێگا و ڕێگایەکەوە کە دڵپەسندیانە و لێی ڕازیین، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ﴾، بە دڵنیایی خواش ﷻ زۆر زانایە و زۆریش هێدیی و مەندە، پەلە ناکات.

﴿ذَٰلِكَ﴾، ئەوەی کە باسکرا، هەر بەو شێوەیە ﴿وَمَنۡ عَاقَبَ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ﴾، هەر کەسێک سزای بەرانبەرەکەی بدات، بەو شێوەیەی کە پێی سزادراوە، تۆڵەی خۆی بکاتەوە، ﴿ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ﴾، بەڵام دوایی دەستدرێژیی بکرێتەوە سەر، ﴿لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ سەری دەخات،

کە مەبەست پێی بە پلەی یەکەم مسوڵمانانێکە، کە لە مەککە سزا دەدران، دواییش کە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، لەوێش کافرەکان دەیانویست لەسەر سزادان و ئازاردانی خۆیان بەردەوام بن، بەشەڕ پێفرۆشتن و گێچەڵ پێکردن، ئنجا

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئەگـەر ئێـوە بتانـەوێ تۆڵـەی خۆتـان بکەنـەوە، سـزای ئـەو ناحـەز و دوژمنانەتـان بـدەن، دوای ئـەوەی کـە ئەوانـە هـەر لەسـەر دەسـت درێژیـی خۆیـان بەردەوامـن، ئـەوە بـە دڵنیایـی خـوا ﷻ سـەرتان دەخـات، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا ﷻ زۆر چاوپۆشـیکاری لێبوردەیـە، واتـە: ئەگەرنـا دەبووایـە زووتـر و زیاتـر سـزای ئـەو کافرانـە بـدات، بـەڵام خـوا پـەروەردگاری خەڵکـە و دەرفەتیـان پێـدەدات بگەڕێنـەوە و، هەڵوێسـتە لارەکـەی خۆیـان ڕاسـت بکەونـەوە.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ﴾ یـانی: بەرگریـی کـردن و پشـتگیریی کردنـەی خـوا ﷻ بـۆ بـڕواداراني سـتەملێکرا و، لەبـەر ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ حوکمـڕان و هەمـەکارەی گەردوونـە: خـوا ﷻ شـەوگار بـە ئەسـپایی دەخاتـە نێـو ڕۆژگارەوە و، ڕۆژگاریـش دەخاتـە نێـو شـەوگارەوە، یـانی: شـەوگار دەخاتـە نێـو ڕۆژگار و ڕۆژگار درێـژ دەبـێ، جـاری واش هەیـە ڕۆژگار دەخاتە نێو شـەوگارەوە و شـەوگار درێـژ دەبـێ، کـە لەو شـوێنانەی ئێمـە، ڕۆژهـەڵاتی نێوەڕاسـت دا، جـاری وا هەیـە شـەوگار یـان ڕۆژگار، هـەر کامێکیـان دەبـن بـە شـازدە (١٦) سـەعات و، بەرانبەرەکـەی کـە شـەوگارە یـان ڕۆژگارە، دەبێتـە هەشـت (٨) سـەعات، واتـە: دوو هێنـدەی وی لـێ دێ، کـە لـە هەنـدێ شـوێنی دنیـادا زۆر زیاتریـش دەبـێ، بـۆ وێنـە: لـە دەوڵەتـانی ئەسـکەندەنافیی (سـوید، نەرویـج، فنلەنـدا، دانیـمارک) ئـەو سـاڵە ئێمـە سـەفەرمان کـرد، سـاڵی (٢٠١٤)، سـەفەری (سـوید و نەرویـج و فنلەندا)مـان کـرد، ڕۆژگار بیسـت (٢٠) سـەعات زیاتریـش بـوو، ئـەو کاتـە ئێمـە لـە شەشـەڵان دا بـە ڕۆژوو دەبووین، بـە پەلـە فریادەکەوتیـن بـەر بانـگ بکەینـەوە و، پـاروەوە نانێـک بخۆیـن و، نوێـژی شـێوان و خەوتنـان بکەیـن، دوایـی یەکسـەر پارشـێو و نوێـژی بەیـانی بەسـەردا دەهـات، هەڵبەتـە هەندێـک شـوێن، شـەوگار تێیـدا درێژتریشـە، یاخـود ڕۆژگار تێدایـە درێژتـرە، بـە نـۆرە.

ئنجـا ئەمـە دەسـتەڵاتی ڕەهـای خـوا ﷻ دەگەیەنـێ، کـە خـوا ﷻ سەرپەرشـتیی شـەوگار و ڕۆژگار دەکات، کەواتـە: کـە شـەوت بینـی درێـژ بـوو، لەسـەر حیسـابی

ڕۆژگار، یان ڕۆژگارت بینی درێژ بوو لەسەر حیسابی شەوگار، دەستەڵاتی خوات، بێتەوە یاد، ئنجا ئەم جۆرە ناسین و تەماشاکردنەی خوا ﷻ لە کوێ و، ئەوە لە کوێ کە لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، لەبەر ڕۆشنایی فەلسەفەی ئەڕەستۆ و فەیلەسووفەکانی یۆنان دا باوبوو، لە کاتێکدا کە خوا ناسیش بوون، کە دەیانگوت: خوا دنیای دروستکردوە و وەگەڕی خستوە و لێیگەڕاوە و، خوا لەوە مەزنترە کە زانیاریی دەربارەی دروستکراوەکانی خۆی هەبێ، یاخود مشووریان لێ بخوات، خوا زۆر لەوە بەرزترە، بیر لە دروستکراوەکانی خۆی بکاتەوە، کە ئەوەندە گچکە و نابووتن لە بەرانبەریدا!!

ئنجا ئەو بیرکردنەوە لاتەڵە لە کوێ و، ئەمەی کە قوڕئان دەفەرموێ لە کوێ! کە تۆ هەمیشە لە کاتێکدا، شەوگار و ڕۆژگارت بەسەردا دێن، تۆ بزانی کە خوا ﷻ شەوگار و ڕۆژگاران دەسووڕێنێ و بەسەر زەوییان دا دێنێ، کە شەوگارو ڕۆژگار لە ئەنجامی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، لە بەرانبەر خۆردا دێنە پێش، کە زەوی لە خولەکێک دا (٢٨) کیلۆمەتر و نیو، دەوری (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، واتە: لە سەعاتێکدا نزیکەی (٢٠٠٠) هەزار کیلۆمەتر دەبڕێ بە دەوری خۆیدا لە بەرانبەر خۆردا، لە ئەنجامی ئەوەدا شەو و ڕۆژ پەیدا دەبن.

هەروەک چوار کەشەکانی ساڵیش، لە ئەنجامی ئەوەدا کە زەوی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، لە ماوەی (٣٦٥) ڕۆژدا، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە سوڕگەکەی بە (٢٣/٥) پلە و نیو لارە، بۆیە چوار وەرزەکان پەیدا دەبن، ئەگەرنا هەمیشە نیوەی زستان دەبوو و نیوەی هاوین دەبوو و بەهار و پاییز نەدەبوون، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە، بیسەرە لە شەوێداو بینەرە لە ڕۆژێدا، هەروەها لە شەوێشدا بە تاریکییش هەر دەبینێ و، بە ڕۆژێش هەر دەبیستێ، بەڵام باسکردنی ئەو دوو سیفەتانە، بۆ ئەوەیە تۆ بزانی کاتێک، تاریک دادێ، خوا ﷻ هەموو شتێک دەبیستێ، لە ڕۆژی ڕوونیشدا خوا ﷻ هەموو شتێک دەبینێ، هەروەک لە تاریکییشدا دەبینێ و لە ڕووناکییشدا دەبیستێ.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾ ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە هەر خوا هەق و چەسپاوە.

هەق بریتیە لە شتێکی چەسپاو کە بوونەکەی لە خۆیەوە بێ و، نەبوونی بەسەردا نەیەت و، نەبوونی پێش نەکەوتبێ و نەبوونی بۆ نەیەت، ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴾، ئەوەش کە لێی دەپاڕێنەوە لە جیاتی خوا ﷻ پووچە، واتە: بوونەکەی بوونێکی خودیی نیە و، نەبوونی پێشکەوتوە و، بوونەکەی لە خۆیەوە نیە و پێی دراوە، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴾، بە هۆی ئەوەوەشە کە هەر خوا ﷻ بەرزی گەورەیە (بە ڕەهایی).

دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، ئایا سەرەنجت نەداوە بە چاوی سەر، کە خوا ﷻ لە ئاسمانەوە، لە سەرووەوە، ئاو دادەبەزێنێ، ئاو واتە: بەفر و باران و تەرزە، ﴿ فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةً ﴾، یەکسەر زەوی سەوز هەڵدەگەڕێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾، بێگومان خوا پەنهانکاری شارەزایە، ﴿ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، هی ئەوە و، بە دڵنیایی خوا زۆر دەوڵەمەندی ستاییشکراوە.

دووبارە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِى فِى ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ ﴾، ئایا سەرنجت نەداوە، خوا ﷻ هەرچی لە زەویدایە، دەستەمۆ و ڕامیکردوە و، کەشتییەکانیشی دەستەمۆ کردوون و لە دەریادا دەڕۆن بە فەرمانی خوا ﷻ، واتە: بە پێی ئەو یاسایانە کە خوا ﷻ وایکردوە، کەشتیی بتوانێ ئاو بدڕێ و بەسەریدا بڕوات، کە ئەگەر دەریا وەک زەوی بووایە، کەشتیی لەسەر وشکانیی ناڕوات، ﴿ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓ ﴾ (خوا) ئاسمانیش دەگرێ کە بەسەر زەویدا بکەوێ، مەگەر بە مۆڵەتی وی، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ بەرانبەر بە خەڵک یەکجار بە بەرۆش و میهرەبان و بەبەزەییە.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَحۡيَاكُمۡ﴾، دیسان هەر ئەویشە، هەر خوایە سُبۡحَانَهُۥ وَتَعَالَىٰ کە ئێوەی ژیاندوە و ژیانی پێ بەخشیون ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ﴾، دوایی دەتانمرێنێ و، ژیانتان لێ وەردەگرێتەوە، ﴿ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ﴾، دوایی جارێکی دیکەش دەتانژیەنێتەوە و ژیانتان بە بەردا دەکاتەوە، ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ﴾، بەڵام بە ڕاستیی ئینسان، ئینسانێک کە دەستی هیدایەتیی خوای پێ نەگەیشتوە، ئینسانێک کە نەکەوتۆتە سەر ڕاستە شەقامی خوا سُبۡحَانَهُۥ وَتَعَالَىٰ، زۆر سپڵە و ناسپاس و پێ نەزانە، بەرانبەر بە چاکە و نیعمەتەکانی خوا سُبۡحَانَهُۥ وَتَعَالَىٰ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کە مرۆڤایەتیی ئاگادار بکاتەوە، لەوەی هۆشیارکەرەوەیەکی ئاشکرایە بۆیان و، باسی سەرەنجامی چاک و بەختەوەرانەی بڕوادارانی کردار باش و، سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانی پیلانگێڕ لە دژی ئایەتەکانی خوا ﷻ:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوْا۟ فِىٓ ءَايَـٰتِنَا مُعَـٰجِزِينَ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥١﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾، بڵێ: ئەی خەڵکینە! واتە: خەڵک بە تێکڕایی، بە ڕەش و سپییەوە و بە عەڕەب و عەجەمەوە و، لە هەموو گۆشە و کەنارەکانی دنیادا.

٢)- ﴿ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، بە دڵنیایی من تەنیا هۆشیارکەرەوە و ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە، لە کێوە؟ بێگومان لە خواوە ﷻ.

(**النَّذِيرُ: المُحَذِّرُ مِنْ شَرٍّ يُتَوَقَّع**) (نَذِیر) بریتیە لە ترسێنەرێک و وریاکەرەوەیەک لە خراپە و زیانێک کە چاوەڕێ دەکرێ بێ.

ئنجا کە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾، (**وَفِي تَقْدِيمِ الْمَجْرُورِ الْمُؤْذِنِ، بِالإِهْتِمَامِ بِنِذَارَتِهِمْ، إِيمَاءٌ إِلَى أَنَّهُمْ مُشْرِفُونَ عَلَى شَرٍّ عَظِيمٍ**)، ئەوە کە ژێردار کەرو

ژێـردار کـراو (**جـارّ ومجـرور**) پێـش کەوتـوون ﴿إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾، لـە جیـاتی بفەرمـوێ: (**إِنَّمَـا أَنَـا نَذِيـرٌ مُبِـين لَكُـم**)، ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ کـە بـۆ ئێـوە مـن وریاکەرەوەیەکـم، لەبـەر خاتـری ئێـوە و بـۆ ئێـوە و بـە قازانجـی ئێـوە و خراپـە و زیـان و مەترسـییەکی گـەورە چاوەڕێتـان دەکات.

**٣)-** ﴿فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾ ئنجا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، کردەوە باشەکانیان کردووە، لێبوردن و بژێوێکی هەرە باشیان هەیە ڕستەی: (**آمنوا**) وەک گوتمان: بەرکار (**مَفْعُول بە**)ەکەی قرتێندراوە، بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێندرێ، بە خوا ﷻ و بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەران و بە ڕۆژیی دوایی و بە قەدەر و، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەران (**عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، لە خواوە هەواڵیان پێداون، (وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ) هەروەها کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، چ پەیوەندییان بە دڵ و دەروونەوە و، چ بە دەربڕینەوە و، چ بە ئەندامەکانی جەستەوە هەبێ، ئا ئەو جۆرەکەسانە:

﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾، لێبوردنێکی مەزن و پاداشتێکی پڕ ڕێز و حورمەتیان بۆ هەیە، واتە: لێبوردنیان بۆ هەیە، لەسەر ئەو کوفر و شیرک و تاوانانەی کە ئەنجامیان داون، ئەگەر بگەڕێنەوە، (**وَأَجْرٌ كَرِيم**) پاداشتێکی پڕ ڕێز و حورمەتیشیان بۆ هەیە، (**كَرِيْم**) بریتیە لە باشترین شت لە جۆری خۆی، بۆیە خوا وشەی: (**كَرِيْم**)ی بەکارهێناوە بۆ پاداشت، هەروەها بۆ ڕووەک: ﴿مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ۝٧﴾الشعراء، لە هەر ڕووەکێکی زۆر بەرهەمدار، بڕوادارانی کردار باش، ئەوە چاوەڕێیان دەکات.

**٤)-** ﴿وَٱلَّذِينَ سَعَوْاْ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ﴾، بەڵام ئەوانەی کە لە دژی ئایەتەکانی ئێمە، تێدەکۆشن و، تێکۆشاون، کە ئایەتەکانی ئێمە پەک بخەن.

(**معاجزين**) خوێندراویشەتەوە: (**مُعَجِّزِيْنَ**) واتە: دەستە وسانکەرانە و پەکخەرانە لە دژی ئایەتەکانی ئێمە تێکۆشاون، (**سَعِي**)ش بریتیە لە ڕۆیشتنێکی خێرا، کە لێرەدا بۆ سووربوون لەسەر شتێک و هەوڵدانی زۆر بۆ شتێک، بەکارهێنراوە.

(المُعَاجِـزُ: الْمُسَـابِقُ الطَّالِـبُ الـذي عَجَّـزَ مُسَـايِرَهُ عَـنِ الْوُصُولِ إِلَى غَايَتِـهِ وَعَـنِ اللِّحَـاقِ بِـهِ)، (مُعَاجِـز) کەسـێکە پێشـبڕکە دەکات لەگـەڵ کەسـێکدا، تاکـو ئـەوەی لەگەڵیـدا پێشـبڕکە دەکات، دەستەوسـانی بـکات و بگاتـە ئامانجـی خـۆی و، پێـش وی بکەوێتـەوە و پێـی بـگات.

٦)- ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ﴾، ئا ئەوانە خاوەنی کڵپەی دۆزەخن، یاخود هاوەڵانی دۆزەخن، ئەوانەی کە هەوڵیان لە بارەوە درا، ئەوانە شایستەی ئەوەن کە بەو شێوەیە بن.

ئەمـە جۆرێـک لـە نوانـدن (تَمْثِيـل)ی تێدایـە و هەوڵدانی کافـرەکان، لە بـە درۆدانانی قورئـان و، نەهێشـتنی کاریگەریـی قورئـان و هەڵوەشـاندنەوەی کاریگەرییەکـەی کـە گوتوویانـە: جادوویـە و، شـیعرە و، قسـەی شـێتە و، ئەفسـانەی پێشـینانە، ئـەو هەوڵدانە و ئـەو جـۆرە قسـە و قاڵانەیـان، تەشـبیهکراوە و چوێنـدراوە، بـە هەوڵـی کەسـێکەوە کـە لـە ڕێیـە، پێشـبرکێ لەگـەڵ کەسـێک دا دەکات، تاکـو پێـشی بکەوێتـەوە.

کۆتایـی ئـەم دەرسـەمان بـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ دێنیـن، کـە دەفەرمـوێ: {إِنَّ مَثَلِي وَمَثَـلُ مَـا بَعَثَنِـيَ اللَّـهُ بِـهِ كَمَثَـلِ رَجُـلٍ أَتَى قَوْمَـاً، فَقَـالَ: يَـا قَـوْمِ! إِنِّي رَأَيْـتُ الْجَيْـشَ بِعَيْنَـيَّ، وَإِنِّي أَنَـا النَّذِيـرُ الْعُرْيَـانُ، فَالنَّجَـاءَ، فَأَطَاعَـهُ طَائِفَـةٌ مِـنْ قَوْمِـهِ، فَأَدْلَجُـوا، فَانْطَلَقُـوا عَـلَى مَهْلِهِـمْ، فَنَجَـوْا، وَكَذَّبَـتْ طَائِفَـةٌ مِنْهُـمْ، فَأَصْبَحُـوا مَكَانَهُـمْ، فَصَبَّحَهُـمُ الْجَيْـشُ، فَأَهْلَكَهُـمْ وَاجْتَاحَهُـمْ، فَذَلِـكَ مَثَـلُ مَـنْ أَطَاعَنِـي، فَاتَّبَـعَ مَـا جِئْـتُ بِـهِ، وَمَثَـلُ مَـنْ عَصَـانِي، وَكَـذَّبَ بِمَـا جِئْـتُ بِـهِ مِـنَ الْحَـقِّ} (أخرجـه البخـاري: ٧٢٨٣، ومسـلم: ٥٩١٣).

واتـە: (پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ:) وێنـەی مـن و وێنـەی ئـەوە کـە خـوا ﷻ منـی پـێ ڕەوان کـردوە (ئـەو پەیامـە) وەک وێنـەی پیاوێکـە کـە دەچـێ بـۆ لای خەڵکەکەی خـۆی، پێیـان دەڵـێ: خەڵکەکـەم! مـن بـە دوو چاوەکـەی خـۆم سـوپایەکم بینـی، بـەرە و ڕوومـان دێ و، مـن وریاکـەرەوەی ڕووتـم بـۆ ئێـوە، {کاتی خـۆی کەسـێک کـە چووبێتـەوە لای هۆزەکـەی خـۆی ئاگاداریـان بکاتـەوە لـە مەترسـییەک، ئەگـەر هیچی

پێ نەبووبێ، كراسەكەی داناوە و ڕای وەشاندوە، بۆ ئەوەی لە دوورەوە ببینن} ئنجا خۆتان دەرباز بكەن، خێرا بن، كۆمەڵێكیان بە قسەیان كردوە و بە شەوێ ڕۆیشتوون و، بە ئارامیی دەربازیان بووە، بەڵام كۆمەڵێكیان بە درۆیان داناوە و لە شوێنی خۆیان ماونەوە، تاكو بەیانی سوپایەكە بەسەری داداون و فەوتاندوونی و بنبڕی كردوون، ئەوە وێنەی من و وێنەی ئەو كەسەیە كە بەقسەم دەكات و، فەرمانبەرییم دەكات و شوێن ئەوە دەكەوێ، كە من هێناومە و، وێنەی كەسێكە كە سەرپێچییم لێ دەكات، لەوهەقەدا كە هێناومە.

خوا ﷻ ئێمە لەو كەسانە بگێڕێ، كە هەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەقی ڕەها لە خواوە هێناویەتی، فەرمانبەریی بۆ بكەین و، بە قسەی بكەین و شوێنی بكەوین.

**مەسەلەی دووەم:**

**خوا ﷻ هیچ ڕەوانەکراو و هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە، مەگەر لە کاتی خۆزگە و ئاوات خواستنیدا، شەیتان هەوڵیداوە: شتی بخاتە گەڵ، بەڵام دوایی خوا ﷻ ئەوەی شەیتانی لابردوە و، ئایەتەکانی خۆیشی مەحکەم و پتەو کردوون، بۆیەش ئەو بوارەی بۆ شەیتان ڕەخساندوە، تاکو ببێتە تاقیکردنەوە بۆ دڵنەخۆشان و دڵڕەقان، زانایانیش زیاتر هەقیەتیی وەحییان بۆ دەربکەوێ و، دڵیان بۆی نەرم و ملکەچ بێ و، شایستەی زیاتری ڕێنمایی خوا ﷻ بن بەرەو ڕاستە ڕێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٢﴾ لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤۡمِنُواْ بِهِۦ فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە (١٣) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ ﴾، لە پێش تۆدا (ئەی موحەممەد ﷺ)، هیچ ڕەوانەکراوێک و هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە:

أ- **(رَسُول)**: واتە: ڕەوانەکراو.

ب- **(نَبي)**: واتە: هەواڵپێدراو، یاخود هەواڵدەر.

هەڵبەتە هەموو **(رَسُول)**ێک **(نَبي)**یە، واتە: هەر کەسێک خوا ﷻ بە بەرنامە و پەیامێکەوە ڕەوانی کرد بێ، هەواڵدەریش بووە بە ناوی خواوە و،

هەواڵپێدراویش بووە لە لایەن خواوە، چونکە (نَبِيٌّ) لەسەر کێشی (فَعِيْل)ە و دەگونجێ بە مانای (مَفعول)بێ، واتە: (مُنَبَّأٌ بِهِ) هەواڵ پێدراو لەلایەن خواوە و، دەشگونجێ بە مانای (فَاعِل)بێ، واتە: هەواڵدەر، کە بە ناوی خواوە هەواڵ دەدات، جیاوازیی نێوان (رَسُول) و (نَبِي) من لە مەوسووعە عەرەبییەکەی خۆم: (**الإسلامُ كَمَا يَتَجَلَّى فِي كِتَابِ الله**)، لە (**الكِتَابُ السادس**)دا، کە باسی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ**) دەکەم، لەوێدا لێکۆڵینەوەیەکی باشم کردوە، کە جیاوازیی (**رَسُول**) و (**نَبِي**) چییە؟ کورتەکەی ئەوەیە: (**رَسُول**): کە بە مانای ڕەوانەکراو و، نێردراو دێ و، کۆیەکەی (**رُسُل**)ە، ئەو پێغەمبەرانەن (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ**)، کە خوا ﷻ بەرنامەیەکی سەربەخۆی پێدا ناردوون، (**أَرسَلَهُم بِشَرِيعَةٍ مُستَقِلَّة**).

بەڵام (**نَبي**): کە کۆیەکەی (**أنبياء ونبيّون**)ە، ئەوانەن کە یان بە دوای بەرنامەی پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوی پێش خۆیان کەوتوون، یاخود بەرنامەیەکیان پێدا نێردراوە، کە تەواوکەری ئەو بەرنامە سەربەخۆیەیە کە ڕەوانەکراوی پێش ئەو، پێیدراوە، بۆیە زانایان گوتوویانە: هەموو (**رَسُول**)ێک (**نَبيٌّ**)یە، بەڵام مەرج نیە هەموو (**نَبي**)ێک (**رَسُول**) بێ، هەڵبەتە دەشگونجێ بە مانا گشتییەکەی بڵێین: هەموو (**نَبي**)ێکیش (**رَسُول**)ە، چونکە خوا ﷻ هیچ کەسێکی نەناردوە بە تایبەت هەواڵی پێ بدات و بیکاتە پێغەمبەر، مەگەر ڕاشیسپاردوە کە دەبێ خەڵکی ئاگادار بکاتەوە، بەڵام وەک گوتم: جیاوازییە سەرەکییەکە ئەوەیە کە ئایا بەرنامەکەی بەرنامەیەکی سەربەخۆیە، یاخود بەرنامەیەکی شوێنکەوتوویی و، پاشکۆ و تەواوکەری بەرنامەی سەربەخۆی پێغەمبەر و ڕەوانەکراوەی پێش خۆیەتی؟

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: هیچ ڕەوانەکراوێک و هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە لە پێش تۆدا.

**٢)- ﴿إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ﴾**، مەگەر کاتێک کە خۆزگەی خواستوە، ئاواتی خواستوە و خولیایەکی بووە، (**التَّمَنِّي: طَلَبُ الشَّيءِ العَسِيرِ حُصُولُهُ**) (**تمنِّي**) داواکردن و خواستنی شتێکە کە بە

زەحمەت پەیدا دەبێ، (أُمنِيَة)ش بە (أَمَاني) كۆ دەكرێتەوە، واتە: (الشَّيءُ المُتَمَنَّى) شتێكی بە ئاوات خوازراو و خۆزگە پێ خوازراو.

٣)- ﴿أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ﴾، شەیتان فڕێیداوەتە نێو خولیا و خۆزگەكەیەوە، چی فڕێداوە؟ بەركار (مَفعول بِه)ەكەی قرتێنراو (مَحذُوف)ە، چونكە بە تەئكید دەزانرێ كە شەیتان هەر شتی خراپ فڕێ دەدات، یانی: (أَلْقَى الشَّرَّ فِي أُمْنِيَّتِهِ) یان (أَلْقَى الوَسْوَسَةَ) یان (التَّحرِيْضَ عَلَى الشَّرِّ)، ئنجا لەبەر ئەوەی بە پێی سیاق و سەلیقە دەزانرێ، بۆیە خوا ﷻ نەیفەرمووە، چونكە شەیتان هەر لێی چاوەڕێ دەكرێ، شتی خراپ فڕێبداتە نێو خۆزگە و ئاوات و خولیای پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ).

(الإِلقَاءُ: رَمِيُ الشَّيءِ مِنَ اليَدِ، وَاستُعِيرَ هُنا لِلوَسوَسَةِ، وَمَفعُولُ أَلقَى مَحْذُوفٌ دَلَّ عَلَيهِ المَقَامُ، لِإِنَّ الشَّيطَانَ يُلْقِي الفَسَادَ)، (إِلقَاء) ئەوەیە كە تۆ شتێكت بە دەستەوە بێ فڕێی بدەی و بیهاوێی، لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ خوتخوتە و دنەدان بەرەو خراپە و، بەركار(مَفعول بِه)ی (أَلْقَى) قرتێندراوە، چونكە سیاقەكە و شوێنەكە دەیگەیەنێ، شەیتان هەر خراپە فڕێ دەدات.

٤)- ﴿فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَٰنُ﴾، ئنجا خوا ﷻ ئەوەی كە شەیتان فڕێی داوە (بۆ نێو خولیا و خۆزگەی پێغەمبەران) (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لای دەبات و نایهێڵێ.

٥)- ﴿ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ﴾، دوایی خوا ﷻ ئایەتەكانی خۆی پتەو و مەحكەم دەكات، واتە: كاریگەریی ئایەتەكانی مەحكەم دەكات، ئەگەرنا ئەو تێفڕێدان و ڕەگەڵ خستنەی شەیتان بۆ خولیا و ئاواتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، ئایەتەكانی خوای بێهێز نەكردوە، كەواتە: شوێنەوار و كاریگەریی ئایەتەكانی مەحكەم دەكات، چونكە جاری وایە بەهۆی خوتخوتە و خەیاڵ و دنەدانی شەیتانەوە، كاریگەریی ئایەتەكان كاڵ دەبێتەوە، یاخود كاریگەریی پێویستیان نابێ، وەك دوایی زیاتر ڕوونی دەكەینەوە، واتە: خوا ﷻ ئایەتەكانی خۆی لەوە كە تەئویلكردن و مانای هەڵە لێدانەوەی، ئەوانەی مەبەستی خراپیان هەیە، بیانشێوێنن، ئایەتەكانی خۆی مەحكەم دەكات و كاریگەرییەكەیان، وەك بۆیان شایستەیە، دەیهێڵێتەوە.

٦)- ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾، خوا زانای کارزانە، ئنجا زانایی و کارزانیی خوا لەوەدا دەردەکەوێ، کە بواری داوە بە شەیتان ئەوە بکات، ئەگەرنا خوا ﷻ دەیتوانی نەیەڵێ شەیتان وا بکات، بەڵام بۆچی و حیکمەتی چییە؟ ڕوونی دەکاتەوە.

٧)- ﴿لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ﴾ {خوا ﷻ بۆیە بواری داوە بە شەیتان} تاکو ئەوەی شەیتان فڕێیدەدات، ببێتە مایەی تاقیکردنەوە، یاخود بیکاتە مایەی لادان و بەڵا و نەگبەتیی، دیارە ئەو (ل)ی (لِّيَجۡعَلَ)، (لامُ العَاقِبَة)ی پێدەڵێن، نەک (لامُ التَّعْلِيل)، یانی: خوا ﷻ بۆیە وای نەکردوە کە ئەوە پەیدا ببێ، بەڵێ، خوا ﷻ بۆیە دەرفەتی ڕەخساندوە، تاکو خەڵک تاقی بکرێتەوە، بەڵام ئەو دەرەنجامەی کە دێتە دی، خوا ﷻ مەبەستی نەبووە و ئامانجی نەبووە، بەڵکو ئەوە دەرهاویشتەی دڵنەخۆش بوون و، دڵڕەق و سەخت بوونی بێبڕوایەکانە، وەک خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (القصَص)دا، کە باسی دایکی مووسا خوا لێی ڕازی بێ دەکات، کە خوا ﷻ بەئیلهام پێی دەفەرموێ: مووسا بخە نێو سندووقێکەوە و فڕێیدە و بە ڕووباری نیلی دابدە، دوایی دەفەرموێ: ﴿فَٱلۡتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرۡعَوۡنَ لِيَكُونَ لَهُمۡ عَدُوّٗا وَحَزَنًاۗ ٨﴾القصص، واتە: ماڵی فیرعەون هەڵیانگرتەوە، تاکو بۆیان ببێ بە دوژمن و، مایەی دڵتەنگیی و پەژارە، کە سەرەنجام فیرعەون لەسەر دەستی ئەو مەلۆتکەیە کە هەڵیانگرتۆتەوە، لەبەین دەچێ، ئنجا دیارە بنەماڵەی فیرعەون نەیانویستوە، ئەو مەلۆتکەیە بۆیان ببێتە دوژمن و بۆشیان ببێتە مایەی خەمباریی، بەڵکو ئەو (ل)ە، (لام العَاقبة)یە، یانی: سەرەنجامەکەی و ئاکامەکەی وای لێ بێ و دەرهاویشتەکەی ئاوا دەبێ، ئنجا لێرەش بە هەمان شێوە: (ل)ی سەر (ليجعل) لامی سەرەنجامە.

٨)- ﴿لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡ﴾، بۆ ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە و، ئەوانەی دڵیان سەخت و ڕەقە، بەرانبەر بە هیدایەت و پەیام و بەرنامەکانی خوا، واتە: خوای کارزان بێبڕوایەکان و خراپەکارەکان، کە بەهۆی ئەو تێفڕێدانەی شەیتانەوە زەرەرمەند دەبن، کردوونی بە دوو بەشەوە:

**أ-** بەشێكیان دڵیان نەخۆشیی تێدایە.

**ب-** بەشێكیان دڵیان سەخت و ڕەقە.

ئنجا ئەو كەسەی دڵی نەخۆشیی تێدایە، نەخۆشیی تۆمەت و گومان (**مرض الشبهة**)ە، یان نەخۆشیی ئارەزوو (**شهوة**)، ئەوانەش كە دڵیان ڕەق و پتەو و سەختە، وەک بەردێک، بەڵكو لە بەردیش سەخترەو، كارتێكراو نابێ بە ئایەتەكانی خوا ﷻ.

**٩)-** ﴿وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقٍۭ بَعِيدٖ﴾، بێگومان ستەمكاران لە ناكۆكیی و دووبەرەكییەكی دووردان. ستەمكاران مەبەست پێی ئەو كافرانەیە كە بەشێكیان دڵیان نەخۆشیی تێدایە و، بەشێكیان دڵیان سەخت و پتەو و ڕەقە، بەڵام بۆیە وشەی (ٱلظَّٰلِمِينَ )ی بەكارهێناوە، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (**وَإِنَّهُمْ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيْد**)، ئەوانە كە باسیان كرا، لە ناكۆكییەكی دوور دان، تاكو خوا ﷻ ئەو سیفەتەشیان بخاتە گەڵ وەسفە خراپەكانی دیكەیان، كە ئەوانە ستەمكاریشن.

ئەوانە ستەمیان لە خۆیان و، لە پەیامیی خوا و، لە پێغەمبەری خوا كردوە و، ئەوانە لە ناكۆكییەكی دوور دان، بۆیە لە جیاتی ئەوەی بەهرەمەند بن لە ئایەتەكانی خوا ﷻ، لێیان تووشی زیان دەبن، وەک چۆن كەسێک نەخۆش بێ، خواردنێک كە دەیخوات، مادام میزاجی تەواو نەبێ، لە جیاتی ئەوەی لێی بەهرەمەند بێ، لێی زەرەرمەند دەبێ، كە ئەوە خەتای خواردنەكە نیە و خەتای میزاجی ناتەواوی خۆیەتی.

**١٠)-** ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾، حیكمەتێكی دیكەی خوا ﷻ لە دەرفەت پێدانی شەیتان دا، كە بتوانێ خوتخوتە و خولیای خراپ ڕەگەڵ خۆزگە و ئاواتی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمِ**) بخات، ئەوەیە كە ئەوانەی زانیارییان پێدراوە بزانن، كەئەوە هەقە لە پەروەردگارتەوە.

واتە: زیاتر بزانن و دڵنیاتر بن، کە ئەو قورئانە هەقە لە پەروەردگارتەوە.

١١)- ﴿فَيُؤْمِنُوا۟ بِهِۦ﴾، سەرەنجام بڕوای پێ بێنن، واتە: بڕوای پێ بێنن، زێدە لەو بڕوایەی کە هێناویانە، چونکە پێشتر زانیارییان پێدراوە و بڕوایان پێی هەبووە، بەڵام ئیمانیان پێی زیاد دەکات، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا، دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ﴿١٣٦﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئیمان بێنن بە خوا و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، واتە: ئیمانێکی زیاتر لە ئیمانی پێشوو، ئیمانیش پلە پلەیە.

١٢)- ﴿فَتُخْبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمْ﴾، سەرەنجام دڵیان زیاتر بۆی نەرم و ملکەچ بێ، پێشتر باسمان کرد: (الإِخبَاتُ: اللِّينُ وَالتَّوَاضُع) (إِخبات) یانی: نەرمیی و خۆبەکەمگرتن و ملکەچیی.

١٣)- ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ ڕێنماییکاری ئەوانەیە کە ئیمانیان هێناوە، بەرەو ڕێی ڕاستە شەقام.

واتە: دەیانخاتە سەر ڕاستە شەقام و، زیاتر بەرچاو ڕوونیان دەکات، ئەمە دڵخۆشکردن و دڵنیاکردنەوەی ئیماندارانە، بەوە کە خوا ﷻ لەگەڵیانە و، ڕێنماییان دەکات و، دەیانپارێزێ لە گومڕایی و بەهەڵەداچوون.

## کورتە باسێک:
## تێفرێدانی شەیتان بۆ نێو خۆزگەی پێغەمبەران

پێش هەموو شتێک دەڵێین: سەرنجی تەفسیرەکانم دا، کە زیاتر لە سی (٣٠) تەفسیرم لەبەر دەستە، مشت و مڕی زۆر لە بارەی ئەم سێ ئایەتانەوە بووە، لە نێوان ڕوونکەرەوانی مانا و مەبەستەکانی ئایەتەکانی قورئانی بەهێز و پێزدا.

ئنجا هەوڵدەدەم خوڵاسە و پوختەی قسەکانی ئەوان، بهێنم ئەوەی کە بە دڵمە و بەڕاستی دەزانم، هەروەها ئاماژەش دەکەم، بەوەی پێموایە تێیدا بە هەڵەدا چوون و بەڕاستی نازانم، هەڵبەتە لە قەدەر پانتایی گونجاو لەگەڵ قەبارەی ئەم تەفسیرەدا:

١)- کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ ﴾:

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەمیشە وابووە و هەمیشە ئیبلیس لە بۆسەدا بووە، بۆ تێکڕای ئەوانەی خوا ﷻ پەیامی خۆی پێدا ناردوون، چ پەیامێکی سەربەخۆ و، چ پەیامێکی تەواوکار، (**رَسُول**) کە بە (**رُسُل**) و (**مُرسَلِين**) کۆدەکرێتەوە و، (**نَبِي**) بە (**أَنبِياء**) و (**نَبِيِّين**) کۆدەکرێتەوە، هەموو ئەوانە دەگرێتەوەی کە پەیامی خوایان هێناوە، چ پەیامێکی سەربەخۆ و، چ پەیامێکی تەواوکار، هەموو ئەوانە ئیبلیس (شەیتان) بۆیان لە بۆسەدا بووە، بە هەموو شێوەیەک، ئنجا یەکێک لە شێوەکانی لە بۆسەدا بوونی شەیتان بۆیان، ئەوە بووە کە هەر کاتێک خۆزگە و ئاواتێکیان خواست، شەیتان خوتخوتە و دنەدان و خولیای خراپ بخاتە نێو ئەو خولیا و ئاوات و خۆزگەیەی پێغەمبەرانەوە (**عَلَيۡهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**).

**٢)-** کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ﴾، ئایا مەبەست لە (تَمَنَّىٰٓ) چییە؟

زانایان بە گشتی دوو واتایان بۆ ئەوە لێکداوەنەوە:

**أ)-** (تَمَنَّىٰٓ) لە (أُمْنِيَة)ەوە هاتوە، یانی: خۆزگە و ئاواتی خواست، (أُمْنِيَة)ش یانی: خولیا و ئاوات.

**ب)-** هەندێکیشیان گوتوویانە: (تَمَنَّىٰٓ) بە مانای (قَرَأَ) و (تَلَى)یە، یانی: کاتێک کە فەرموودەی خوا دەخوێنێ، شەیتان شتی خۆی فڕێدەداتە نێو خوێندنەوەی ئایەتەکان.

**٣)-** ئنجا ئەگەر مەبەست لە (تمنّى) خۆزگە خواستن بێ، وشەی (أَلْقَى) لە: ﴿أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ﴾، ئەو تێفڕێدانەی شەیتان، زانایان سێ ڕایان لەو بارەیەوە، هەن، وەک گوتمان: ئەوەی شەیتان فڕێی دەدات، قرتێندراوە، لەبەر ئەوەی ڕەوت و سەلیقە دەیگەیەنن، یانی: بیرۆکەی خراپ و خولیای خراپ فڕێ دەدات:

**یەک:** شەیتان شتەکەی خۆی فڕێ دەداتە نێو خولیا و خۆزگە خواستنی ئەو پێغەمبەرەوە ﷺ، بۆ وێنە:

**أ-** پەلە کردن.

**ب-** زیاد لە پێویست ساچاندن و دڵڕاگرتنی کافرەکان، لەسەر حیسابی مافە تایبەتییەکانی خۆی.

**ج-** شەیتان کارێکی وایکردوە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، جۆرێک لە دابەزینی جوزئیی بکەن، لە هەندیک لە شتەکانی خۆیان، لە پێناوی بەرژەوەندیی گەورەتردا وەک ئیجتیهادێکی تایبەتیی.

هەر سێ واتایەکان هاتوون، ئەوە ئەگەر تێفڕێدان (إلقاء) بۆ خۆزگە خواستنی پێغەمبەران ﷺ بێ.

**دوو:** واتایەکی دیکەی ئەو تێفڕێدان و ڕەگەڵ خستنە ئەوەیە کە: شەیتان شتێک بخاتە نێو دڵی بیسەرەکانەوە لە کافرەکان، واتە: خوتخوتە و خولیای خراپ دەخاتە نێو دڵی بیسەرەکانەوە، یاخود دڵی ئەوانەی کە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) پەیام و بەرنامەی خۆیانیان ئاڕاستە دەکەن.

**سێ:** واتای سێیەم: شەیتان بیرۆکەی خراپ و گومڕاکەر بڵاودەکاتەوە، لە دژی ئەو خولیا و ئاواتانەی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**).

ئەوە ئەگەر (**تَمَنَّىٰٓ**) بە مانای خۆزگە و ئاوات خواستن بێ.

بەڵام ئەگەر بە مانای خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا ﷻ بێ، کە ئەوەش ڕایەکە، بەڵام ڕایەکی بێهێزە، واتە: کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ ئایەتەکانی خوای خوێندوونەوە، شەیتانیش هەندێک قسەی کردوون، نێواخنی ئایەتەکانی کردوون، یاخود ئەوانەی کە گوێیان لە خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا بووە، لەلایەن پێغەمبەرانەوە، وا گوێبیست بوون، واتە: نەیخستوونە نێو ئایەتەکانەوە کە تێکەڵ بن، بەڵکو خستوویەتە گوێی بیسەرانەوە لە کافران، یان مەبەست ئەوەیە دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئایەتەکانی خوێندوونەوە، ئەو شەیتانەش هەندێک بیرۆکە و بۆچوونی گومڕاکەری بڵاوکردوونەوە، بۆ ئەوەی کاریگەریی ئایەتەکان نەهێڵێ.

**٤)-** لێرەدا هەندێک ڕیوایەت گێڕدراونەوە، زۆربەی تەفسیرەکان هێناویانن، ئنجا چ ئەوانەی ڕیوایەتەکانیان بەڕاست زانیبێ، کە کەمینەن، چ ئەوانەی کە ئەو ڕیوایەتانەیان بە ناڕاست و هەڵبەستراو زانیبێ، کە زۆرینەن، یەکێک لەو ڕیوایەتانە ئەوەیە:

**{عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمَكَّةَ «النَّجْمَ» فَلَمَّا بَلَغَ هَذَا الْمَوْضِعَ:** ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ١٩ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ٢٠﴾ النجم، **قَالَ: فَأَلْقَى الشَّيْطَانُ عَلَى لِسَانِهِ: «تِلْكَ الغَرَانِيقُ الْعُلَى . وَإِنَّ شَفَاعَتَهُنَّ لَتُرْتَجَى». فَفَرِحَ الْمُشْرِكُونَ بِذَلِكَ، فَقَالُوا: مَا ذَكَرَ آلِهَتَنَا بِخَيْرٍ قَبْلَ الْيَوْمِ. فَسَجَدَ وَسَجَدُوا، فَجَاءَ جِبْرِيلُ فَقَالَ: إِقْرَأْ عَلَيَّ مَا جِئْتُكَ بِهِ، فَقَرَأَ آخِرَ آيَةٍ، [تِلْكَ الْغَرَانِيقُ الْعُلَى، وَإِنَّ شَفَاعَتَهَا**

لَتُرْتَجَى]. فَقَالَ: مَا أَتَيْتُكَ بِهَذَا؟ فَقَالَ: هَذَا مِنَ الشَّيْطَانِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَـٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلْقِى ٱلشَّيْطَـٰنُ ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٢﴾ ﴾[1].

واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر کە یەکێکە لە زانایانی شوێنکەوتووانی هاوەڵان، {کەواتە: ئەمە بە (مُرسَل) دادەنرێ، چونکە لە هاوەڵەوە نەهاتوە، بەڵکو لە شوێنکەوتوو (تابع)ەوە هاتوە} دەڵێ: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە بوو، سوورەتی (وَالنَّجْمِ)ی خوێندەوە: ﴿ وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾النجم، تاکو دەگاتە ئەو شوێنەی کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّـٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ ﴾النجم، واتە: ئایا لات و عوززاتان بینین؟ هەروەها مەناتی سێیەمتان بینی؟ [کە ئەمانە ناوی سێ لە بتەکانی کافرەکانن]، کاتێک گەیشتە ئەوێ، شەیتان ئەوەی خستە سەر زمانی پێغەمبەر ﷺ: (تِلْكَ الْغَرَانِيقُ الْعُلَى، وَإِنَّ شَفَاعَتَهَا لَتُرْتَجَى)، واتە: ئەوانە باڵندە بەرزەکانن (یان پەرستراوە بەرزەکانن) و تکای ئەوان ئومێدەوار کراوە، کە خوا ﷻ لە دوای ئەمە، دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّـٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ ﴾النجم، واتە: ئایا لات و عوززاتان بینیون و، مەناتی سێیەمیشتان بینیوە؟ ئایا بۆچی خۆتان بە کوڕ نەبێ ڕازی نین، کەچی ئەو بتانە بە حیساب کچی خوان، پاڵتانداونە لای خوا ﷻ؟ ئەوە دابەش کردنێکی زۆر نادادگەرانەیە.

واتە: خۆتان بە کوڕ نەبێ ڕازی نەبن و ئەگەر کچتان ببێ، هەندێکتان زیندە بە چاڵی دەکەن و دەیکوژن، یان بە لای کەمەوە زۆر پێتان ناخۆشە، کەچی کچان پاڵبدەنە لای خوا ﷻ بڵێن: ڕۆڵەکانی وی مێینەن.

---

(١) أخرجه الطبري في جامع البيان ج١٧، ص١٣٣، وابن أبي حاتم في تفسيره كما في تفسير القرآن العظيم، لابن الكثير ج٤، ص٢٩٣.

ئنجا بە پێی ئەو ڕیوایەتە، کاتێک شەیتان ئەوەی خستە سەر زمانی پێغەمبەر ﷺ، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان زۆر دڵخۆش بوون و گوتیان: لەمەو پێش پەرستراوەکانی ئێمەی بە چاکە باس نەکردوون، بۆیە کاتێک پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ئایەتی سەجدە لە کۆتایی سوورەتی **(النجم)**دا و کڕنووشی برد، ئەوانیش لەگەڵیدا کڕنووشیان برد، بەڵام دوایی جیبریل هات فەرمووی: ئەوەی بەسەرمدا خوێندبوویەوە، لە سوورەتی **(النجم)** بۆم بخوێنەوە، پێغەمبەر ﷺ بۆی خوێندەوە، هەتا گەیشتە ئەو شوێنەی کە دەفەرمووێ: (**تِلْكَ الغَرَانِيقُ العُلَى، وَإِنَّ شَفَاعَتَهُنَّ لَتُرتَجَى**)[١]، واتە: ئەوانە باڵندە بەرز و جوانەکانن و تکا کردنیان چاوەڕوانکراو و ئومێدەوار کراوە، جبریل پێی فەرموو: ئەوەم بۆ نەهێناوی، ئەوە لە شەیتانەوەیە، ئنجا بەو بۆنەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلْقَى ٱلشَّيْطَٰنُ فِىٓ أُمْنِيَّتِهِۦ ﴾.

ئەمە یەکێک لە گێڕدراوەکانە، کە لەو بارەوە هاتوون، کە وەک گوتم: یەکێک لە تابیعین کە سەعیدی کوڕی جوبەیرە، پاڵدراوەتە لای وی، ئنجا ئەویش ئایا هی خۆیەتی یان نا؟ ئێستا با باسی بکەین:

تەماشای تەفسیرەکانم کرد، بە پێویستم نەزانی تەماشای هەموویان بکەم، (سی (٣٠) تەفسیر زیاترم لە لایە)، بەڵام سەرنجی بیست (٢٠) سەرچاوەم دا لە تەفسیرو غەیری تەفسیریش، ئەوانەی زیاتر سەرچاوەو بوڵا گەڕاوە (**مَرجِع**)ن و توێژەرەوانی قورئان بۆ ئەوان دەگەڕێنەوە، هەموویان دەڵێن: ئەم ڕیوایەتە هیچ سەنەدێکی ڕاستی نیە و، شتێکی بێ بنەما و هەڵبەستراوە، بۆ وێنە:

**١- (سُئِلَ ابنُ خُزَيمَةَ عَنْ هَذه القِصَّةَ فَقَالَ: هَذَا مِنْ وَضْعِ الزَّنَادِقَة)**، واتە: ئیبنو خوزەیمە کە زانایەکی زۆر موعتەبەرە، هەم لە تەفسیر و هەم لە فەرموودەناسیی دا، لە بارەی ئەم چیرۆکەوە پرسیاری لێکرا؟ گوتی: ئەوە لە داهێندراوی زەندیقەکانە[٢].

---

(١) {(الغَرَانِيقُ) کۆی (غُرنُوق)ە، واتە: باڵندەی جوان و بەرز}.

(٢) (زَنَادِقَة) کۆی (زِندِيق)ە، واتە: کەسێک کە بڕوای بە ئایین نیە و بڕوای بە هیچ شتێک نیە یانی: مولحید.

٢- (**البَیهَقي**) كە ئەویش زانایەكی زۆر موعتەبەری بواری تەفسیر و سوننەتە، گوتوویەتی: (**هَذِهِ القِصَّة غَیرُ ثَابِتَةٍ مِن جِهَةِ النَّقلِ**)، واتە: ئەم گێڕدراوە و چیرۆكە لە ڕووی سەنەدەوە چەسپاو نیە.

٣- (**ابنُ كَثِیر**) لە تەفسیرەكەی خۆیدا دەڵێ: (**لَمْ أَرَهَا مُسْنَدَةً مِنْ وَجْهٍ صَحِیح**)، واتە: من ئەو ڕیوایەتەم نەبینیوە كە لە ڕووێكی ڕاستەوە پاڵدرابێتە لای پێغەمبەر ﷺ.

٤- (**القَاضِي عِیَاض**) لە كتێبی: (**الشِّفَاء**)دا[١]، بە هەمان شێوە (كە دواییش باسی دەكەین)، قسەی زۆر توند دەكات لەسەر ئەو ڕیوایەتە.

٥- (**القُرْطُبِي**) لە (**الجَامِع لأحكَامِ القُرآن**)دا[٢]، دیسان ئەویش ئەو ڕیوایەتە بە درۆ و بە بێ بنەمای دادەنێ.

٦- (**الزَّیعَلي**) لە (**تَخرِیج أَحَادِیث الكَشَّاف**)دا[٣]، زۆری لەسەر دەڕوا، كە ئەصڵەن ئەو ڕیوایەتە هیچ سەنەد و بنەمایەكی نیە.

٧- (**الفَخرُ الرَّازي**) لە تەفسیرەكەی خۆی (**مَفَاتِیحُ الغَیب**) یان (**تَفسیرُ الكَبیر**)دا[٤]، زۆری لەسەر دەڕوا، كە ئەو ڕیوایەتە هیچ ئەصڵ و بنەمایەكی نیە.

٨- (**العَیني**) خاوەنی (**عُمْدَةُ القَارِيء**)[٥]، بە هەمان شێوە ئەو ڕیوایەتە بە درۆ دادەنێ.

٩- (**اِبْنُ العَرَبِي**) لە (**أَحْكَامُ القُرآن**)دا[٦]، دیسان ئەو ڕیوایەتە بە درۆ و بە هەڵبەستراو دادەنێ.

---

(١) بەرگی ٢، لاپەڕە: ١٢٥).

(٢) ج١٢ ص٧٠ -٧١.

(٣) ج٢ ص٣٩٢ – ٣٩٤.

(٤) ج٢٣ ص٤٩ – ٥٤.

(٥) ج١٩ ص٦٦.

(٦) ج٣ ص١٣٠ رقم: ١٣٠٥.

**١٠-** (**الشَّوكَاني**) لە (**فَتحُ القَدِير**)دا[١]، بە هەمان شێوە.

**١١-** (**الآلوسي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**رُوحُ المَعَاني**)دا[٢]، یازدە لاپەڕی لەسەر دەڕوات، کە ناگونجێ ئەوە شتێکی ڕاست بێ و، بێ بنەمایە.

**١٢-** (**صِدِّيق حَسَن خَان**)، لە تەفسیرەکەی خۆی (**فَتحُ البَيَان**)دا[٣]، بە هەمان شێوە.

**١٣-** فەرموودەناسی ناودار (**الألبَاني**)، کتێبێکی تایبەتی لەو بارەوە داناوە، بە ناوی: (**نَصبُ المَجَانِيق لِنَسْفِ قِصَّةُ الغَرَانِيق**)، واتە: دانانی مەنجەنیقەکان بۆ نەهێشتن و لێکهەڵوەشاندنی چیرۆکی غەڕانیق.

**١٤-** (**عَلي حسن الحَلَبي**) کە ئەویش قوتابی شێخ ئەلبانییە، نامیلکەیەکی نووسیوە بە ناوی: (**دَلائِلُ التَّحْقِيق لإِبطَالِ قِصَّةِ الغَرَانِيق**)، واتە: بەڵگەکانی ساغکردنەوە بۆ هەڵوەشاندنەوەی چیرۆکی (**الغَرَانيق**).

**١٥-** (**أَحمَد مُصطَفى المَرَاغي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا: (**تَفسِيرُ المَرَاغي**)[٤] بە هەمان شێوە ئەو ڕیوایەتە بە درۆ دادەنێ.

**١٦-** (**إِعرَابُ القُرءانُ الكَرِيم وَبَيَانُهُ**)ی (**مُحيَ الدِّين دَروِيش**)[٥] ئەویش زۆری لەسەر دەڕوا و، بە شتێکی درۆی دادەنێ.

**١٧-** (**سَيد قُطب**) لە (**فِي ظِلاَلِ القُرآن**)دا[٦] ئەویش بە هەمان شێوە بە شتێکی هەڵبەستراو و بێ بنەمای دادەنێ.

---

(١) ج٣ ص٤٦٢.

(٢) ج١٧ ص١٧٦ - ١٨٦.

(٣) ج٦ ص٢٤٥.

(٤) ج٦ ص١٢٩.

(٥) ج٦ ص٤٤٩ - ٤٦٦.

(٦) ج٤ ص٢٤٣١ - ٢٤٣٢.

**١٨- (الإستيعَاب فِي بَيانِ الأسباب)** هەردوو نووسەر: **(سَليم بنُ عَبيد الهِلالي وَمحَمَّد بنُ مُوسَى آل نَصر)**[1] بە هەمان شێوە زۆری لەسەر دەڕۆن، کە بێ بنەمایە.

**١٩- (البَحرُ المَديد فِي تَفسيرِ القُرآنُ المَجيد)**ی **(إبنُ عَجِيبة)**[2] بەهەمان شێوە بەدرۆ و بێ بنەمای دادەنێ.

**٢٠- (الشَّيخ مُحَمَّد عَبده)، (إعرَابُ القُرآن)**[3]، ئەم تەعبیرەی لێ دەخوازێتەوە دەڵێ: **(وَلَو صَحَّ مَا قَالَ نَقَلَةُ قِصَّةِ الغَرَانيق، لآرْتَفَعَتِ الثِّقَةُ بِالوَحِي، وَانتَقَضَ الإعتِمَادُ عَلَيهِ كَمَا قَالَهُ البَيضَاوي وَغَيرُهُ، وَلانهَدَمَ أَعْظَمُ رُكن لِلشرَائِع الإلهِيَّةِ وَهُوَ العِصْمَة)**.

واتە: ئەوەی کە گواستەرەوانی بەسەرهاتی **(الغَرَانيق)**، گواستوویانەتەوە، ئەگەر ڕاست بووایە، متمانە بە وەحیی نەدەما و پشت پێ بەستنی هەڵدەوەشایەوە، هەروەک **(بَيضَاوي)** و غەیری ئەویش گوتوویانە و، مەزنترین پایەی بەرنامەکانی خوا ﷻ هەڵدەوەشایەوە، کە بریتیە لە پارێزرانی پێغەمبەران **(عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)**، لەوە کە شەیتان بتوانێ شتێکیان بخاتە سەر زمان.

دیارە ئەو سەرچاوانەی ئاماژەم پێدان هەموویان لە بارەی ئایەتەکەوە قسە دەکەن و، لە بارەی ئەو ڕیوایەتەوە، دەدوێن و بەو ئیعتیبارەش گوتم: ئەوانەی مانا و مەبەستەکانی قورئانیان ڕوونکردوونەوە، ئەگەرنا هەندێک لە سەرچاوەکان کە ئاماژەم پێدان، کتێبی سوننەتن، نەک تەفسیر بۆ وێنە: **(القَاضي عِيَاض)** کە پێشتریش باسمان کرد، لە کتێبی: **(الشِّفَاء بِحُقُوقِ المُصطَفى)**دا، کە چوار بەرگە دەربارەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، سیرە و ژیانی و تایبەتمەندییەکانی، دەڵێ:

**(هَذَا حَدِيث لَم يُخَرِّجهُ أَحَدٌ مِنْ أَهْل الصِّحَة وَلَا رَوَاه ثِقَة بِسَنَد سَلِيمٍ مُتَّصِلٍ، وَإِنَّمَا أُولِع بِهِ وَبِمِثْلِه الْمُفَسِّرُون وَالْمُؤَرِّخُون الْمُولَعُون بِكُلّ غَرِيب، قَالَ أَبُو بَكر البَزَّار: وَهَذَا الحَدِيثُ لَا نَعلَمُهُ يُروَى عَنِ النَّبي بِإِسنادٍ مُتَّصِلٍ يَجوزُ ذِكرُهُ)**.

---

(١) ج٢ ص٥١٧ - ٥٣٠.

(٢) ج٤ ص٤٢٥ - ٤٢٦.

(٣) ج٦ ص٤٦٥.

(**قَـاضي عِيَـاض**) دەڵـێ: ئـەم فەرموودەیـە، هیـچ کـەس لەوانـەی کـە فەرمـوودە ڕاسـتەکانیان هێنـاون، نەیانهێنـاوە و، هیـچ کـەس بـە سـەنەدێکی ڕاسـتی سـەلامەتی پەیوەسـت نەیهێناوە، کـە متمانـە پێکـراو بـێ، بەڵکـو ئـەو توێژەرەوانـەی قوڕئـان و ئـەو مێژوونووسـانەی کـە زۆر هۆگـری شـتی سـەیر و سـەمەرەن، ئەوانـە زیاتـر گرنگییـان پێـداوە، وەک ئەبـوو بەکـری بەززاریـش گوتوویەتـی: ئـەم فەرموودەیـە نەمانزانیـوە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ بـە سـەنەدێکی پەیوەسـت گێڕدرابێتـەوە، کـە دروسـت بـێ بـاس بکرێ.

ئنجـا (**القُرطُبـي**) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1]، بـۆ ئـەوە ئەگـەر گریـمان (**تَمَنَّىٰ**) بـە مانـای: (**تَـلَى، قَـرَأَ**) بـێ، تەئویلێکـی جـوان دەکات و بـە دڵمـە، هەرچەنـدە وشـەی (**تَمَنَّىٰ**) لـە زمانـی عەرەبیـی دا بـە مانـای خۆزگـە و ئـاوات خواسـتن و خولیـا هاتـوە، نـەک بـە مانـای خوێندنـەوە، بـەڵام گریـمان ئەگـەر بـە مانـای خوێندنـەوەش بـێ، ئـەو تەئویلـەی (**القُرطُبـي**)م، زۆر بـە دڵـە کـە دەڵـێ:

**(وَالَّـذِي يَظْهَـرُ وَيَتَرَجَّـحُ فِي تَأْوِيلِـهِ عَـلَى تَسْلِيمِهِ أَنَّ النَّبِـيَّ ﷺ كَانَ كَـمَا أَمَـرَهُ رَبُّـهُ يُرَتِّـلُ الْقُرْآنَ تَرْتِيلًا، فَيُمْكِـنُ تَرَصُّـدُ الشَّـيْطَانُ لِتِلْـكَ السَّـكَتَات، وَدَسُّـهُ فِيهَـا مَـا اخْتَلَقَـهُ مِـنْ تِلْـكَ الْكَلِـمَاتِ، مُحَاكِيًـا نَغْمَـةَ النَّبِـيِّ ﷺ، بِحَيْـثُ يَسْـمَعُهُ مَـنْ دَنَـا إِلَيْـهِ مِـنَ الْكُفَّـارِ، فَظَنُّوهَـا مِـنْ قَـوْلِ النَّبِـيِّ ﷺ وأَشَـاعُوهَا).**

واتـە: ئـەوەی کـە دەردەکـەوێ و زاڵـە لـە ماناکردنـی ئـەوەدا {لەسـەر گریمانـەی ئـەوە کـە (**تَمَنَّىٰ**) بـە مانـای خوێندنـەوە بـێ و، پێغەمبـەر ﷺ شـتی وای بەسـەر زمانـدا هاتبـێ، یـان شـتی وای بەدەمـەوە گوترابـێ} ئەوەیـە کاتـێ خـوا ﷻ فەرمانـی پێکـردوە قوڕئـان بخوێنـێ، شـەیتان لـە کەمینـدا بـووە و لـە کاتێکـدا پێغەمبـەر ﷺ جارجـار وەسـتاوە، کـە ئایەتەکانـی خوێنـدوون، {هەموویـانی پێکـەوە نەبەسـتوون و لەسـەری ئایەتـەکان و لـە کۆتایـی بڕگـەکان دا وەسـتاوە} ئنجـا لـەو کاتـی وەسـتانەدا، شـەیتان ئـەو وشـانەی خسـتوونە نێـو خوێندنەوەکـە و، لاسـایی ئـاواز و دەنگـی

---

(١) الجَامع لأحكَامِ القُرآن: ج١٢، ص٧٠، ٧١.

پێغەمبەری ﷺ کردۆتەوە، بە شێوەیەک کە ئەوانەی نیزیک بوون، وایانزانیوە ئەوەش قسەی پێغەمبەرە ﷺ، {لە حاڵێکدا کە قسەی پێغەمبەر نەبووە و ﷺ، دەنگی ئەو نەبووە و دەنگی شەیتان بووە و ویستوویەتی تێکەڵ بە دەنگی پێغەمبەری ﷺ بکات، لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ وەستاوە بۆ پشوودانێک} ئنجا کافرەکانیش ئەوەیان وەرگرتوە و بڵاویان کردۆتەوە.

بەڵام وەک گوتم: لە ڕاستییدا ئێمە بێ نیازین لەو تەئویلەش، هەرچەندە تەئویلێکی تاکو ڕاددەیەک بەجێیە، بەڵام ئێمە بێ نیازین لەوەش، چونکە وشەی: (**تَمَنَّىٰٓ**) بە مانای (تَلَی) نایەت، بەڵکو بە مانای خۆزگە خواستن و ئاوات خواستنە.

کورتەی واتایەکەی ئەوەیە: پێغەمبەر ﷺ ئاوات و، خۆزگەی خواستوە، خولیای بووە، کە ئەو ئایین و پەیام و بەرنامەیەی خوا ﷻ پێیدا ناردوە، بیگەیەنێ بە هەموو خەڵک و خەڵکەکە لێی وەربگرن، بۆیە عەجایب نیە کە جار جار پێغەمبەر ﷺ بیری کردبێتەوە لە هەندێک شێواز و هەندێک ئامراز، کە هەر چۆن بێ ئەو هیدایەتە ئەو خەڵکە لێی وەربگرێ، ئنجا لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ لە بیرکردنەوە و خولیای ئەوەدا بووە، چۆن ئەو پەیامە هەرچی زووتر و زیاتر خەڵک لێی وەربگرێ و بیگەیەنێ، ڕەنگە بیری لە هەندێک شت کردبێتەوە و شەیتان دەرفەتی بینیبێ، جۆرێک لە دنەدان و خولیای خراپ بخاتە گەڵ خولیا و ئاواتەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ناڕاست بن، بۆ وێنە:

أ- کاتێک پێغەمبەر ﷺ (**عَبدُ الله ابن أُمِّ مَكتُوم**) هاتوە بۆ خزمەتی، وەک لە سووڕەتی (عَبَسَ)دا، خوا ﷻ ئاماژەی پێ دەکات: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلْأَعْمَىٰ ﴿٢﴾ ﴾، لەو کاتەدا سەرگەرم و سەرقاڵی قسە کردن بووە بۆ زلە زلانی قوڕەیش، ئەویش هاتوە، بۆ خزمەتی و گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ لەو ئایەتانەی خوا بۆی ناردووی، پێم ڕابگەیەنە، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕووی لێ وەرچەرخاندوە و، ڕووی لێ گرژ کردوە، کە

ئەوە ئیجتیهادێک بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ، کە لەو کاتەدا ئەو سەرگەرمی قسەکردن لەگەڵ ئەو زلە زلانەیە، کە ئەگەر ئەوانە مسوڵمان بن، پەیامەکە باشتر بڵاودەبێتەوە، ئیجتیهادی کردوە کە جارێ گوێ نەداتە (عَبدُ الله بن أُمِّ مَكتُوم) و ڕووی لێ وەرگێڕێ، خواش ﷻ لەسەر ئەوە سەر زەنشتی کردوە، ئنجا ئەوە یەکێک بووە لەو شتانە.

ب- یان وەک پێشتر لە سوورەتی (الأنعام)دا، باسمان کرد، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ﴿٥٢﴾﴾، واتە: ئەوانەی کە بەیانیان و ئێواران لە خوا دەپاڕێنەوە، (ڕەزامەندیی و) ڕووی خوا و دیداری خوا بە ئاوات دەخوازن، دەریان مەکە لە کۆڕەکەی خۆت.

ئنجا وەک لەوێ باسمان کرد، هەندێک لە هاوەڵان دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەنگە شتێکی بەدڵدا هاتبی، کاتێک کافرەکان لە سەریان بە مەرج گرت و گوتیان: ئەگەر دەتەوێ ئێمە بێینە کۆڕ و مەجلیسی تۆ، با ئەو کۆیلە و ڕەش و ڕووتانە نەیەنە مەجلیس و کۆڕی تۆوە، ئنجا ئێمە دێین، ئەگەرنا ئێمە ئەوانە بە شایستەی ئەوە نازانین لە کۆڕ و مەجلیسی ئێمەدا دابنیشن، پێغەمبەریش ﷺ ڕەنگە شتێکی بە دڵدا هاتبێ وەک ئیجتیهادێک، بەڵام بەس خولیا بووە و جێبەجێی نەکردوە، خواش ﷻ فەرمووی: ئەوە مەکە و دەریان مەکە، وەک ئەوان دەڵێن، دووریان مەخەوە لە کۆڕ و مەجلیسی خۆت بۆ دڵڕاگرتنی ئەو کافرانە، ئنجا ئەو جۆرە ئیجتیهاد و بیرکردنەوە و خولیایانەی پێغەمبەر ﷺ بوون، کە شەیتان ویستوویەتی شتێکی خۆییان بخاتە گەڵ، نەک شەیتان شتێک بخاتە گەڵ ئایەتەکانی خوا ﷻ.

بۆیەش خوا دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ يُحْكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦ﴾، واتە: خوا کاریگەریی و دەرهاویشتەی چاکی ئایەتەکانی خۆی قاییم دەکات، کە بە هۆی خوتخوتە و خەیاڵ و خولیا و دنەدانەکانی شەیتانەوە، کاریگەریی ئایەتەکان بەلاڕێدا نەبردرێ، یاخود ئەو بیرۆکانەی شەیتان بڵاویان دەکاتەوە بۆ دژایەتیی ئایەتەکانی خوا ﷻ، خوا کارێکی کردوە و ویستوویەتی ئەو کاریگەرییە خراپانەی ئەو بیرۆکە خراپانەی شەیتان نەهێڵێ و، کاریگەریی ئایەتەکانی خۆی مەحکەم بکات.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بێبڕوایەکان لە بەرانبەر قورئاندا، هەر لە دوو دڵییدا دەبن، هەتا مەرگیان دێ، یان ئازاری ڕۆژێکی بێخێریان بۆ دێ، لەو ڕۆژەشدا حوکمڕانیی بەس هی خوا دەبێ و، پاش دادوەریی کردن، بڕوادارانی کردار باش لە بەهەشتە پڕ ناز و نیعمەتەکانی خۆیدا و، بێبڕوایەکانیش کە بە درۆ دانەری ئایەتەکانی خوان، سزایەکی ڕیسواکەریان بە ملدا دێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾ الْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ۚ فَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا فَأُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٥٧﴾﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:**

١)- ﴿وَلَا يَزَالُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ﴾، بەردەوام ئەوانەی بێبڕوان، لە بارەیەوە (لە بارەی قورئانەوە) لە دوو دڵییدان.

﴿فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ﴾، لێی لە دوو دڵییدان، دوو دڵییەک کە هیچ پاساوێکی نەبێ، چونکە (مِرْيَةٍ) بریتیە لە دوو دڵییەکی تایبەت، (المِريَةُ: شَكٌّ خَاصٌّ)، ئەویش ئەوەیە کە هیچ پاساوێک و هیچ بیانوویەک نەبێ بۆ ئەو دوو دڵییە، کە دەفەرموێ: ﴿فِي مِرْيَةٍ مِّنْهُ﴾، ڕاناوەکەی بە سیاق دەزانین دەچێتەوە بۆ قورئان، واتە: لە بەرانبەر قورئاندا لە دوو دڵییدان، هەندێکیش گوتوویانە: لە بەرانبەر پێغەمبەردا ﷺ، کە لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە دەگونجێ، بەڵام وەک سەرنجدانی سیاقی ئایەتەکان، قسە لە بارەی قورئانەوەیە، واتە: زیاتر ئەو مانایە زاڵە کە لە بارەی قورئانەوە لە دوو دڵییدان.

٢)- ﴿ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغْتَةً ﴾، بەردەوام دەبن لەسەر ئەو دوو دڵییە بێ پاساوە، تاکو (ٱلسَّاعَةُ )یان، بۆ دێ کتوپڕ، (ٱلسَّاعَةُ ) واتە: ئاخیر زەمان، کە مەبەست پێی مەرگی خۆیانە، یاخود ئاخیر زەمانی گشتیی، کە بەسەر دنیادا دێ، بە کتوپڕیی.

٣)- ﴿ أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴾، یاخود سزای ڕۆژێکی بێ خێر و نەزۆکیان بۆ دێ، (عَقِيْم) بە ئافرەتێک دەگوترێ: کە منداڵی نەبن و، خوازراوەتەوە بۆ نەگبەتیی و بێخێریی، چونکە کافرەکان بەپێی بۆچوونی هەڵەی خۆیان، ئافرەتی نەزۆکیان پێ بێ خێر و نەگبەت بوو، واتە: سزایەکیان بۆ دێ لە ڕۆژێکدا کە بنبڕ دەبن، بۆ ئەوان ئەو سزایە، سزایەکی بێ خێر و نەگبەتە.

٤)- ﴿ ٱلْمُلْكُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّهِ ﴾، لەو ڕۆژەدا حوکمڕانیی و دەستەڵات تەنیا هی خوایە، ئەم تەنوینەی سەر ﴿ يَوْمَئِذٍ ﴾، قەرەبووی ڕستەیەکە واتە: ئەو ڕۆژەی کە ئاخیر زەمانی تێدا دێ، یاخود ئەو سزا نەزۆکەی تێدا دێ، حوکمڕانیی تەنیا هی خوایە.

دەشگونجێ کە دەفەرموێ: ﴿ أَوْ يَأْتِيَهُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَقِيمٍ ﴾، یان سزای ڕۆژێکی نەزۆکیان بۆ بێ، ئاماژە بێ بە ڕۆژی جەنگی بەدر، کە بۆ ئەوان ڕۆژێکی بێ خێر بوو، حەفتایان لێ کوژرا و، حەفتاشیان لێ بەدیل گیرا، دەگونجێ ئەمە هەواڵدان بە پەنهان و نادیار بێ، کە دوای دوو سێ ساڵ لە دابەزینی ئەم ئایەتانە، ئنجا جەنگی بەدر هاتۆتە پێش.

٥)- ﴿ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ ﴾، واتە: خوا ﷻ دادوەرییان لە نێواندا دەکات، دادوەریی واتە: لێکیان جیا دەکاتەوە، کێ لەسەر هەقە و کێ لەسەر ناهەقە.

٦)- ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فِى جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، ئنجا ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون، لە باخە پڕ نازونیعمەتەکان دان.

لە ئایەتی ژمارە (٥٠)دا، کە پێش ئەم ئایەتانە دابەزیوە، دەفەرموێ: ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴾، بەڵام لێرەدا لە ئایەتی (٥٦)دا

دەفەرموێ: ﴿ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، چونکە ئەو ئایەتەی پێشوو هەواڵدانە لە بارەی ژیانی دنیایانەوە، بەڵام ئەمەیان هەواڵدانە لە بارەی قیامەتەوە، وەک (**الخَطيبِ الإسكَافِي**) لە (**دُرَّةُ التَّنزِيل وَغُرَّةُ التَّأويل**)دا[1] وایگوتوە، واتە: ئەوەی پێشیان باسی ژیانی دنیا و سەرەنجامی ژیانی دنیایان دەکات، بۆیە فەرموویەتی: لێبوردنیان بۆ هەیە و بژێویێکی پڕ ڕێز و حورمەت، بەڵام ئەمەیان باسی ڕووداوەکانی ڕۆژی قیامەت و هەڵسانەوە دەکات، بۆیە دەفەرموێ: لە نێو باغ و بێستانە پڕ ناز و نیعمەتەکاندان، ئەدی ئەوانەی بێبڕوان چۆنن؟

٧)- ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا ﴾، بەڵام ئەوانەی بێبڕوا بوون بە ئایەتەکانی ئێمە، بێبڕوا بوون بە پێغەمبەران و، ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناون.

﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾، ئا ئەوانە سزایەکی ڕیسواکەر و زەبوونکەریان بۆ هەیە، (**مُّهِينٌ**) واتە: (**مُذِلّ**) یان (**مُخْزِي**) واتە: سزایەکە بۆ جەستەیانە، بەڵام ڕیسواکردن و زەبوونییەکە بۆ ڕووحیانە و، هەم لە ڕووی جەستەییەوە سزا دەدرێن، سزای جەستەیی و ماددیی و، هەم سزای مەعنەویی و ڕووحیی دەدرێن، کە لەوێدا ڕیسوا و زەبوون و شەرمەزار دەبن.



---

(١) ص٢١٧.

**مەسەلەی چوارەم:**

**کۆچکەرانی ڕێی خوا ﷻ بکوژرێن یان بمرن، باشترین بژێویان لە لای خوا هەیە و، دەیانخاتە جێگا و ڕێگایەکی دڵ پەسەندیان، هەر کەسێکیش دوای سزادانی ئەوانەی سزایان داوە، ستەمی لێ بکرێ، خوا ﷻ پشتی دەگرێ و سەری دەخات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنًاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ۝٥٨ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ۝٥٩ ۞ذَٰلِكَۖ وَمَنۡ عَاقَبَ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ۝٦٠﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، هەروەها ئەوانەی کۆچیان کردوە لەڕێی خوادا.

٢)- ﴿ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ﴾، دوایی کوژراون، یاخود مردوون.

٣)- ﴿لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنًا﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ بژیوێکی زۆر باشیان پێ دەدات.

٤)- ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾، مسۆگەر خوا ﷻ باشترینی بژیودەران و ڕۆزیدەرانە.

ئەم ئایەتە موبارەکە کە ئایەتی ژمارە: (٥٨)ە، لە سوورەتی (**الحج**)دا، زەمینە خۆشکەر و ڕێ ئاچووغکەرە بۆ مسوڵمانان، کە لەو ڕۆژگار و کاتەدا، لە مەککە لە سەغڵەتیی و تەنگانەیەکی زۆردا بوون، بە دەست ئەهلی کوفرەوە، ئنجا ئەمە

ئاماژە و زەمینە خۆشکەر و ڕێخۆشکەریانە کە کۆچ بکەن و، دوای کۆچکردنیش جەنگ و بەرخۆدان بکەن لە پێناوی خوادا و، دڵنیاش بن کە ئەگەر لە ئەنجامی کۆچ کردنەکەیاندا بکوژرێن، یاخود بە مردنی ئاسایی خۆیان بمرن، خوا ﷻ لە جیهانی بەرزەخ و لە ڕۆژی دوایی دا، باشترین بژیویان پێ دەدات، کەواتە: با دەربەست نەبن، کە ئەو پێنج و دوو ڕۆژەی ژیانی دنیایان لە دەست دەچێ، خوا ﷻ زۆر بە باشتر بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنًا﴾، خوا ﷻ بژیوێکی باشیان دەدات، ئەمە دەگونجێ هەم مەبەست پێی ژیانی دنیا بێ و، دەشگونجێ مەبەست پێی ڕۆژی دوایی بێ، بەڵام لەبەر ئەوەی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ﴾، دوایی کوژران، یاخود مردن، کەواتە: بە پێی سیاقەکە، ئەو مانایە مسۆگەر دەکات، کە مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، چونکە لە دوای مردن و کوژران، قۆناغی بەرزەخ و ڕۆژی دوایی دێتە پێش و، بژیوێک کە بە مرۆڤ دەدرێ، لە دوای مەرگ و بە جێهێشتنی ژیانی دنیایە، ئەگەرنا دەگونجا بڵێین: مەبەست پێی ئەوەیە: ئەوانەی لە پێناوی خوادا کۆچ دەکەن، خوا ﷻ دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە و، بژیوێکی باشیان پێ دەدات، با دەربەستی ئەو زێد و نیشتیمان و کار و کەسابەتە نەبن، کە بەجێی دێڵن، خوا ﷻ بە باشتر بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە.

دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ: ئەوانەی لە پێناوی خوادا کۆچ دەکەن، ئەگەر بمێنن، خوا ﷻ لە دنیادا بژیوێکی باشیان پێ دەدات و، دەرووی خێریان لێ دەکاتەوە و، ئەگەر بشکوژرێن یاخود بمرن، ئەوە لە ڕۆژی دوایی دا، خوا ﷻ بۆیان قەرەبوو دەکاتەوە، وەک لە سوورەتی **(النساء)**دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُهَاجِرۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُرَٰغَمٗا كَثِيرٗا وَسَعَةٗۚ وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٠٠﴾، واتە: هەر کەسێک لە پێناوی خوادا کۆچ بکات، زێد و کەس و کار و وڵاتی خۆی بەجێ بهێڵێ، لەسەر زەویدا (واتە: لە غەیری ئەو شوێنەدا کە بە جێی هێشتوە،

لەو شوێنەدا کە بۆی دەچێ)، ﴿يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً﴾، (**مُرَاغَم**) کۆی (**مَرْغَم**)ە، واتە: دەرفەتی وای بۆ هەڵدەکەوێ کە دوژمنانی پێ نارەحەت بێن و فراوانییشی دەست دەکەوێ، لە بژێو و، هاتن و چوون و ئەوانەدا، واتە: با دەربەست نەبێ، ئەوە بۆ دنیای، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِن بَيْتِهِ مُهَاجِرًا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ يُدْرِكْهُ الْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ﴾**النساء**، هەر کەسێک لە ماڵی خۆی بچێتە دەرێ، وەک کۆچ کردن بەرەو خوا و پێغەمبەری خوا، دوایی مردنی بگاتەسەر، ئەوە پادشتی کەوتۆتە سەر خوا ﷻ.

ئایەتەکەی سوورەتی (**النساء**) هەردوو حاڵەتەکان دەگرێتەوە، واتە: مرۆڤ کە لە پێناوی خوادا کۆچ دەکات، ئەگەر بمێنێ فراوانیی چنگ دەکەوێ و، حاڵەتێکی بۆ دێتە پێش کە دوژمنانی ناحەزانی پێی نارەحەت بن و لووتیان لە عەرز بچەقێ و، ئەگەر بشمرێ، ئەوە پاداشتی کەوتۆتە سەر خوا ﷻ، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ زیاتر باسی حاڵەتی دوای مەرگی کردوە، بۆیەش فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ قُتِلُوا أَوْ مَاتُوا﴾، بەڵام بێگومان ئەوانەی کۆچ دەکەن لە پێناوی خوادا، هەموویان هەر ناکوژرێن و نامرن، بۆیە دەگونجێ بڵێین: ﴿لَيَرْزُقَنَّهُمُ اللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا﴾، هەردوو حاڵەتەکە دەگرێتەوە، ئەگەر بمێنن خوا ﷻ لە دنیادا بژێوی باشیان دەداتێ و، ئەگەر بشکوژرێن یان بمرن، خوا ﷻ لە ڕۆژی دوایی و لە قۆناغی بەرزەخدا بژێوی باشیان پێ دەدات، ﴿وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ باشترینی بژێوەدەران و ڕۆزییدەرانە.

٥)- ﴿لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُ﴾، بە دڵنیایی دەیانخاتە نێو جێگا و ڕێگایەکەوە کە دڵپەسندیانە و لێی ڕازین.

وشەی (**مُّدْخَلًا**) بە (**مَدْخَلاً**)یش خوێندراوەتەوە: (**لَيَدْخِلَنَّهُم مَدْخَلاً**)، کە (**مَدْخَل**) لە: (**دَخَلَ يَدْخُلُ مَدْخَلاً**) هاتوە و (**مُدْخَل**) لە: (**أَدْخَلَ يُدْخِلُ مُدخَلاً**) ئنجا (**مَدْخَل**) بێ، یان (**مُدْخَل**) بێ، یان بە مانای (**إدْخَال**)ە، واتە: بردنە نێوێکی باش

دەیانباتــە نێــو جێــگا و ڕێگایەکــەوە، کــە دڵ پەســندیانە، یاخــود نــاوی شــوێن (**اســم مَــكان**)ە واتــە: دەیانخاتــە جێــگا و ڕێگایەکــەوە، کــە دڵ پەســندیانە، واتــە: وشــەی (**مُدْخَــل**) یــان بــە مانــای (**إِدْخَــال**)ە و چاوگــە، بــە بردنــە نێوێکــی بــاش دەیانخاتــە نێــو جێــگا و ڕێــگای دڵپەســندیان، یاخــود نــاوی شــوێن (**اســم مَــكان**)ە.

٦)- ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَـلِيمٌ حَلِيـمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا زانای هێدیی و مەندە، زانایە بەئێش و ژان و موعاناتیان، کە لە شوێنی خۆیان و، لە زێدی خۆیان بە دەست کافرەکانەوە، ئێش و ژان و موعاناتیان بووە، بۆیە ناچار بوون وڵات و نیشتیمانی خۆیان جێبێڵن، ﴿ حَلِيـمٌ ﴾، واتە: خوا هێدیی و مەندە، ئەگەرنا دەبوو ئەو کافرانەی ئەوانیان ئەزیەت داوە، یەکسەر قەلاچۆو بنبڕیان بکات.

یاخــود: خــوا هێدیــی و مەنــدە بەرانبــەر ئیماندارانێکــی کۆچکــەر، کــە ئەگــەر کــەم و کوڕیــی و نوقســانییەکیان هەبــێ، خــوا ﷻ لەگەڵیانــدا هێدیــی و مەنــد و چاوپۆشــییکارە.

ئنجا خوا ﷻ هەر لە هەمان سیاقدا، باسی مەسەلەیەکی دیکە دەکات، دەفەرموێ:

٧)- ﴿ ذَٰلِكَ ﴾،ئەوەی کە باسکرا بەو شێوەیە، لێرەدا وشەی (ذَٰلِكَ) کە چەند جارێک لەم سوورەتەدا دووبارە بۆتەوە، ئەمە وەک سەرنج ڕاکێشانێکە بۆ قسەیەک کە لەمەودوا دێ، واتە: ئەوەی کە ڕۆیشت بەو شێوەیە بە دڵنیایی، ئنجا گوێ بگرە بۆ ئەو قسانەی دواییش کە دێن، یاخود (ذَٰلِكَ)، بۆ جیاکردنەوەی دوو بابەتە، ئەو بابەتەی کە ڕابرد، ئەوە بەو شێوەیە بوو، ئنجا مەسەلەیەکی دیکەش دێتە پێش، گوێ بۆ ئەویش بگرە، کە دەفەرموێ:

٨)- ﴿ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْـهِ ﴾، هەر کەسێک سزا بدات بەو شێوەی کە سزادراوە، دوایی دەستدرێژی بکرێتە سەر، بە پێی سیاقی ئایەتەکان، یانی: هەر کەسێک جەنگ لەگەڵ کافرەکان بکات، وەک چۆن ئەوان شەڕیان پێ فرۆشتوە و گێچەڵیان پێکردوە، ئەویش بەرگریی لە خۆی بکات، دواییش دەستدرێژیی بکرێتە

سەر، کە پێشتر سزادراوە لە لایەن کافرەکانەوە و گێچەڵ و تەشقەڵەی پێکراوە، ئەویش بەرگریی لە خۆی کردوە و، تۆڵەی خۆی کردۆتەوە، بەڵام دووبارە دەستدرێژیی بکرێتە سەر.

٩)- ﴿لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ پشتی دەگرێ و سەری دەخات.

١٠)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾، بێگومان خوا ﷻ چاوپۆشییکاری لێبوردەیە.

شایانی باسە: ئەم ئایەتە موبارەکە وەک ئەو ئایەتەی سوورەتی **(الشورى)** دەچێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَا ۝٤٠﴾، واتە: سزای خراپەیەک خراپەیەکی وەک خۆیەتی، واتە: کەسێک تۆ ئەزیەتبدات، تۆش بۆت هەیە ئەو ئەزیەت بدەیەوە، وەک هەر جۆرێک لە ئەزیەتدان، بۆ وێنە: کەسێک قسەیەکت پێ دەڵێ، تۆش بۆت هەیە قسەکەی پێ بڵێیەوە، یان: کەسێک حەقێکت لێ زەوت دەکات، تۆش بۆت هەیە هەقی خۆتی لێ بستێنیەوە، بەڵام لە هەموو حاڵاندا مەرج نیە، ئیسلام پێی خۆش بێ بەوجۆرە مسوڵمانان ڕەفتار بکەن، نەک لە نێو خۆیاندا، ئەوە هیچ، بەڵکو لەگەڵ دەرەوەی خۆشیان، چونکە هەر لە هەمان ئایەتدا کە ئەو ڕستەیەی تێدا هاتوە، باسی لێبوردن و چاکسازییش کراوە: ﴿وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٤٠﴾ الشورى، واتە: سزای خراپەیەک خراپەیەکی وەک خۆیەتی، بەڵام هەر کەسێک چاوپۆشیی بکات و، چاکسازیی و چاکەکاریی بکات، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، بەدڵنیایی ئەو ستەمکارانی خۆشناوێن. واتە: با خراپەشی بەرانبەر بکرێ، بەڵام ئەو ئەگەر لە جیاتی ئەوەی خراپەکە بکاتەوە - کە بۆشی هەیە - بەڵام لە جیاتی ئەوەی بە داد **(عَدْل)** ڕەفتار بکات و، ئەگەر بە چاکە **(فَضْل)** ڕەفتار بکات، چاوپۆشیی بکات و چاکەکاریی بکات، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، ئەگەر تاقەتی بە خۆی بشکێ، ئەوە باشترە، بەڵام بە مەرجێک ئەو چاوپۆشیی کردن و چاکەکاریی کردنەی مسوڵمانی خراپە لەگەڵکراو و ستەم لێکراو، نەبێتە

هـۆی شـوول لێهەڵكێشـان و زیاتـر بوغـڕا بوونـی بابـای خراپـەكار، ئەگەرنـا ئـەو كاتـە ئـەو چاوپۆشـیی كـردن و چاكـە لەگەڵـدا كردنـە، جێـی خـۆی ناگـرێ و خاوەنەكـەی لەسـەری قـەرزدار دەبێتـەوە، بۆیـە گوتـراوە: (**لِـكُلِّ مَقَـامٍ مَقَـال**)، بـۆ هـەر شـوێنە قسـەیەک هەیـە و، یاسـایەک هەیـە.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ذَٰلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ﴾، وەک یاسـایەکی گشـتیی خـوا ﷻ فەرموویەتـی: هـەر کەسـێک بەرانبەرەکـەی خـۆی سـزا بـدات، وەک چـۆن سـزا دراوە.

یـانی: ئـەوە یاسـایەکی گشـتییە و مـرۆڤ بـۆی هەیـە وەک چـۆن سـزای دەدەن، سـزا بداتـەوە، بـەڵام بـە تەماشـا کـردن و تێوەڕامانـی بـارودۆخ و هەلومەرجـی ئـەم ئایەتانـە، کـە قسـەیان لێدەکەیـن، دەزانیـن کـە مەبەسـت پێـی مسـوڵمانانێکی ناچارکـراو بـۆ کـۆچ کـردن و، زێـد و نیشـتیمانی خـۆ بەجێهێشـتنە.

ئنجـا ئـەوە ئاماژەیـە بـەوەش کـە مسـوڵمانان ئەگـەر دوای ئـەوەی، زێـد و نیشـتیمانی خۆیـان بەجـێ دەهێڵـن، ئنجـا چ کاتـی خـۆی، کـە مەککەیـان بەجێهێشـتوە و چـوون بـۆ مەدینـە، چ لـە هـەر هەلومەرجێکـی دیکـەدا، مسـوڵمانان ناچـار بـن، زێـد و نیشـتیمانی خۆیـان جێبهێڵـن و، کـۆچ بکـەن بـۆ شـوێنێکی دیکـە، ئەگـەر ئەوانـەی ناچاریان کـردوون، مـاڵ و حاڵـی خۆیـان بەجێبهێڵـن و، دەریـان کـردوون، بـە پێـی بـۆ لـوان و توانـای خۆیـان، سـزایان بـدەن و تۆڵـەی خۆیانیـان لـێ بکەنـەوە، شـتێکی ڕەوایە.

ئنجـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ بُغِيَ عَلَيْهِ﴾، بـەڵام کەسـێک کـە سـزای بەرانبەرەکـەی داوەتـەوە، لەسـەر ئـەوەی سـزا دراوە، بـەو شـێوەیەی کـە سـزا دراوە، ئەویـش تۆڵـەی خـۆی لێکردۆتـەوە، کـە چـی دووبـارە دەسـتدرێژیی دەکرێتـەوە سـەر: ﴿لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا ﷻ پشـتی دەگـرێ و سـەری دەخـات، یـانی: بـا بـە چـۆک دانەیـەت و تەسـلیم نەبـێ، کـە ئەمـە دەگونجـێ مەبەسـت پێی ئـەوە بـێ: دوای ئەوەی مسـوڵمانان کـۆچ دەکـەن و ئـەو شـوێنەی کـە لێینـی، بەجێـی دەهێڵـن و دەچـن بـۆ

شوێنێکی دیکە، لەوێش ئەگەر مسوڵمانان هەوڵ بدەن، تۆڵەی خۆیان بستێننەوە و بەشێک لە حەقی خۆیان لە کافرەکان وەربگرنەوە، شتێکی ڕەوایە، هەروەک چۆن دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینە، ئەوە بوو ڕێیان لە کاروانی قوڕەیشییەکان دەگرت، تاکو بەشێک لە ماڵ و سامانیان، کە کافرەکان لێیان زەوت کردن و ناچاریان کردن جێی بهێڵن، لێیان بستێننەوە و بیگێڕنەوە، بەڵام کافرەکان لەوێش دووبارە دەهاتنەوە سەریان، وەک لە جەنگەکانی بەدر و ئوحود و ئەحزابدا، ڕوویدا، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەگەر دوای ئەوەی بەشێک لەو هەقەی خۆتان لەوان دەستێننەوە، کە چی دووبارە ئەوان دەستدرێژییتان دەکەنەوە سەر، دڵنیابن کە خوا ﷻ سەرتان دەخات و پشتتان دەگرێ.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ چاوپۆشییکاری لێبوردەیە، واتە: خوا ﷻ چاوپۆشییکارە بەو شێوەیەی کە ڕێگەی نەداوە بە دادگەریی نەبێ، سزای کەسێک بدەی، کە سزای داوی و، لێبوردەشە بۆ کەسێک کە واز لە ستەم و لە دەستدرێژیی و خراپەکاریی دێنێ.

دەڵێن: کاتی خۆی پرسیار لە کیسرا (پادشای فارس) کراوە: (**بِمَ دَامَ مُلْكُكُم؟ فَقَالَ: لأَنَّنَا نُعَاقِبُ عَلَى قَدَرِ الذَّنبِ، لَا عَلَى قَدَرِ الغَضَبِ**)، واتە: چۆن حوکمڕانیی ئێوە بەردەوام بووە؟ گوتوویەتی: لەبەر ئەوەی ئێمە بە ئەندازەی گوناهێک کە دەکرێ، بابای خراپەکار سزا دەدەین، نەک بە ئەندازەی توڕەبوونی خۆمان.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ﴾، دەشگونجێ ئەمە ئاماژە بەوە بێ کە کافرەکان و، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ئارەزوومەند بکرێن و، هانبدرێن کە بگەڕێنەوە و، دڵخۆشیش بکرێن بەوە کە خوا ﷻ چاوپۆشییشیان لێ دەکات و، لێشیان دەبووری.

هەروەها دەشگونجێ ئەمە ئاماژەبێ بۆ مسوڵمانانی کۆچکەر لە پێناوی خوادا و، جەنگاوەر لەڕێی خوادا، کە ئەگەر کەم و کوڕیی و نوقسانییەکیشیان ببێ، خوا ﷻ چاوپۆشییکار و لێبوردەیە بەرانبەریان.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**خستنەڕووی دوازدە (١٢) کرداری بێ وێنەی خوا و، سێزدە (١٣) سیفەتی بەرز و پەسندی و، سیفەتێکی زۆر خراپی مرۆڤی بێبڕوا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ٦١ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ٦٢ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصۡبِحُ ٱلۡأَرۡضُ مُخۡضَرَّةًۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ٦٣ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ٦٤ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ٦٥ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡۗ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ ٦٦ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست بڕگەدا:

١)- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ ﴾، ئەم ( ذَٰلِكَ )یە، وەک ( ذَٰلِكَ )ی پێشێ نیە، ( ذَٰلِكَ ) واتە: بەم شێوەیە، ناوی ئاماژە (**اسم إشَارَة**)یە، بەڵام لێرەدا ئەمە وەک ئەوەی پێشێ نیە، بۆ لێک جیاکردنەوەی دوو قسان بێ، بەڵکو ئەمە ناوی ئاماژەیە بەوەی ڕابرد، واتە: ئەوە کە خوا ﷻ پشتی بڕوادارانی کۆچکەر و جەنگاوەر لە پێناوی خوادا دەگرێ و، سەریان دەخات، ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ ﴾، ئەو پشتگرتنی خوا ﷻ بۆ بڕوادارانی کۆچکەر و جەنگاوەر لە پێناوی خوادا، کە ستەمیان لێکراوە، بە هۆی ئەوەوەیە کە خوا ﷻ شەوگار دەخاتە نێو ڕۆژگارەوە.

٢)- ﴿ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ ﴾، هەروەها ڕۆژگارییش دەخاتە نێو شەوگارەوە، واتە: لە شەوگار کەم دەکات و دەیخاتە سەر ڕۆژگار، هەروەها لە ڕۆژگاریش کەم دەکات و

دەیخاتە سەر شەوگار، کە سەرەنجام شەو و ڕۆژ کورت و درێژ دەبن، یاخود شەوگار بە شوێنی ڕۆژگاردا دێنێ و، ڕۆژگار بە شوێنی شەوگاردا دێنێ، مانای وشەی (إِیلَاج) ئەوەیە کە بە ئەسپایی و بەنەرمیی و، بە پەنهانیی شتێک بخرێتە نێو شتێکەوە، ئەوەش کە شەوگار و ڕۆژگار دەخرێنە نێو یەک، ئەوەیە کە بە شێوەیەکی پەنهان و نەرم کە هیچ دەنگی نەیەت شەوگار بە شوێنی ڕۆژگاردا دێ و، ڕۆژگار بە شوێنی شەوگاردا دێ، وەک لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ: ﴿ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا ﴿٥٤﴾ ﴾، بە خێرایی بەدوای دادێ، چونکە وەک پێشتر باسمان کرد: زەوی لە هەر خولەکێک دا (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا، هەروەک لە هەر چرکەیەکیشدا (٣٠) کیلۆمەتر دەبڕێ لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆردا، واتە: جووڵەی زەوی لە سووڕانەوە بە دەوری خۆردا (٦٠) ئەوەندەی جووڵەی زەوی لە سووڕانەوە بە دەوری خۆیدا، خێرایە، بەڵام ئێمە گوێمان لە دەنگە دەنگ و، هەرا هەرا و، فڕکە فڕک نابێ، چونکە زۆر بە نەرمیی ئەوە ئەنجام دەدرێ، چونکە ئەگەر گوێمان لەو هەموو دەنگە دەنگی سووڕانەوە ببووایە، وەک هی فڕۆکە، دیارە مرۆڤ ژیانی لەسەر زەوی نەدە بوو، بەڵام ئاگامان لەوە لە هیچی نیە و گوێبیستی نابین.

ئنجا ئەمە ئاماژەشە بەوە کە وەک چۆن شەوگار دەچێتە نێو ڕۆژگارەوە و ڕۆژگار درێژ دەبێ لەسەر حیسابی شەوگار، هەروەها دواییش ڕۆژگار دێتە نێو شەوگارەوە و شەو درێژ دەبێ لەسەر حیسابی ڕۆژ، بە هەمان شێوە ڕۆژەکانیش لە نێوان خەڵکدا دەستا و دەست دەکەن، ڕۆژێک ئەم سەر دەکەوێ و، ڕۆژێک ئەو سەر دەکەوێ، ئەمەش دڵدانەوەیەکە بۆ بڕواداران، کە ئەگەر کافرەکان ئێستا ئێوەیان ناچارکردوە، زێد و نیشتیمانی خۆتان بەجێ بهێڵن، وامەزانن دنیا هەروا دەبێ، کاتێکیش دێ ئێوە جێ بەوان لێژ دەکەن، کە هەر واش بوو، ئەوە بوو مسوڵمانان دوایی چوون مەککە و هەموو دوورگەی عەڕەبیی و، دواییش نیوەی دنیایان خستە ژێر سایە و سێبەری پڕ فەڕ و بەرەکەتی ئیسلامەوە.

کەواتە: بۆیە خوا ﷻ پشتی مسوڵمانانی کۆچکەر دەگرێ، چونکە خوا ﷻ هەموو گەردوونی بەدەستە و، شەوگار و ڕۆژگار بەدەوری یەکدا دێنێ، زەوی و مانگ و خۆر

دەخولێنێتەوە، ئەستێرەكان هەموویان لە سوورگەی خۆیاندا دەخولێنەوە، خوا ﷻ هەمەكارەی كەون و كائیناتە، كەواتە: ئەی بڕوادارینە! ئەی مسوڵمانانی مەزڵوومی ستەملێكراوی، نیشتیمانی خۆبەجێهێڵەری ناچاركراو بە كۆچ كردن! دڵ لە دڵ مەدەن و نارەحەت مەبن، چونكە ئێوە خوا لە پشتتانە، كە هەمەكارەی گەردوونە.

٣)- ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ﴾ ئەوەی ڕابرد بە هۆی ئەوەوەشە كە خوا بیسەری بینەرە، بیسەرە هەموو دەنگەكان دەبیستێ و، بینەریشە هەموو شتەكان دەبینێ، بیسەرە بە شەو و بە ڕۆژ و، بینەرە بە شەو و بەڕۆژ، دەشگونجێ بڵێین: لە تاریكایی شەودا خوا دەنگەكان دەبیستێ و، بە ڕۆژی ڕوونیش دەبینێ، هەڵبەتە بینینی خوا ﷻ ڕووناكیی و تاریكیی، كاریگەریی لەسەر نیە، خوا ﷻ سیفەتی دیتنی هەیە بە ڕەهایی و، سیفەتی بیستنی هەیە بە ڕەهایی و، هیچ شتێك نابێتە پەردە و دیوار لە نێوان ئەوەدا كە خوا هەموو دەنگەكان ببیستێ و، هەموو ڕەنگەكان و دیمەنەكان ببینێ.

دەشگونجێ كە دەفەرموێ: خوا شەوگار و ڕۆژگار دەخاتە نێو یەك و، بە دوای یەكیاندا دێنێ، ئاماژەش بێ بەوە كە شەوگار ڕەمزی كوفر و ستەم و خراپەیە و، ڕۆژگاری ڕوونیش ڕەمز و هێمای ئیسلام و ئەو دادگەریی و خێر و بەرەكەتەیە، كە ئیسلام لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ.

٤)- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ﴾، ئەم ( ذَٰلِكَ )یە، دووبارە كردنەوەی ئەوەی پێشێیە، واتە: ئەوەش بەهۆی ئەوەوە خوا ﷻ پشتی بڕواداران دەگرێ و سەریان دەخات، كە هەر خوا هەقە، هەر بۆیەش نە (و) نە (ف) بۆ بادانەوە (عَطف) بەكارنەهاتوون: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ﴾، ئەویش بە هۆی ئەوەوەیە كە بەس خوا هەقە، هەقیش بریتیە لە شتێكی چەسپاو، (**الحَقُّ: هُوَ الْمُطَابِقُ لِلوَاقِعِ أَي: الصِّدْقُ مَأخُوذٌ مِنْ حَقَّ الشَّيءُ: أَي ثَبَتَ، أَي: حَقٌّ فِي الإلهِيَّةِ**)، (حق) بریتیە لە شتێك كە لەگەڵ واقیعدا پڕ بە پێست بێ، واتە: ڕاست، لەوەوە هاتوە: (**حَقَّ الشَّيءُ أي: ثَبَتَ**)، شتەكە چەسپا، یانی: پەرستراویەتیی خوا و، پەروەردگارێتیی خوا هەقە و، چەسپاوە.

٥)- ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴾، هەروەها ئەوەش کە لە جیاتی خوا و، لە خوار خواوە لێی دەپاڕێنەوە، هەر ئەوە ناهەقە، پووچە، بێ بنەمایە، واتە: هەقیەتیی خوا و، پووچیەتیی پەرستراوەکان، هۆکاری ئەوەیە کە خوا ﷻ بڕواداران سەر دەخات و پشتیان دەگرێ و، بێبڕوایانی ستەمکار ژێر دەکەون و نابووت دەبن.

ئەم: ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**وَأَنَّمَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ**)، کە ئەمە ئاوڕدانەوەیە لە بێبڕوایەکان، کە: ئەوەی ئێوە لێی دەپاڕێنەوە ئەی بێبڕوایان! نا هەقە و، پووچە، بە خوێندنەوەکەی دیکەش: ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ ﴾، واتە: ئەوەی بێبڕواکان لێی دەپاڕێنەوە، پووچ و بێ بنەمایە.

٦)- ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴾، بە دڵنیایی هەر خوا بەرزی گەورەیە، بەرزە بە ڕەهایی، گەورەیە بە ڕەهایی، بەرزیی خوا ﷻ خوازراوەتەوە بۆ شکۆ و تێر و تەواویی خوا ﷻ، هەروەک گەورەیی خواش خوازراوەتەوە، بۆ ئەوە کە دەسەڵات و ویستی خوا ﷻ ڕەهایە و، بێ سنوورە و، هیچ پەرچ و لەمپەرێکی نایەتە بەر.

## نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی:

(**الخَطِيبُ الإسْكَافِي**) لە کتێبەکەی خۆی[1]دا، بەراوردێک دەکات لە نێوان ئەم ئایەتەی سوورەتی (الحج)دا، کە دەفەرمووێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ ﴾ و، ئەو ئایەتەی سوورەتی (لقمان)دا، کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ ﴾،

کە لە ئایەتەکەی سوورەتی (**لقمان**)دا، وشەی (**هُوَ**)، نیە، ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلْبَٰطِلُ ﴿٣٠﴾ ﴾، بەڵام لە هی سوورەتی (الحج)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴾، ئنجا ئایا ئەوە هۆکارەکەی چییە؟!

---

(١) دُرَّةُ التَّنزِيل وَغُرَّةُ التَّأوِيل، ص٢١٧ و ٢١٨.

دەڵـێ: هۆیەکـەی ئەوەیـە کـە لـە سـووڕەتی **(الحـج)**دا، شـەش جەختکردنـەوە **(تأكيـد)** هاتـوون، لەپێش ئـەو ڕستەیەدا، بۆیـە خـوا ﷻ بـە یـەک شێوە هەموویانـی هێنـاوە، چونکـە ئـەم (هُوَ)، بـۆ زیاتـر جەختکردنەوەیـە، بـۆ ئـەوەی لـە ڕیـزی ئەوانـەی پێـش خـۆی، ڕیزپـەڕ نەبـێ، با تەماشـا بکەیـن:

١- خوا ﷻ لە پێش ئەم ئایەتەدا، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوْ مَاتُواْ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًاۚ ﴾، (لَيَرْزُقَنَّهُمْ) ئەمە هەم (ل)ەکە، هەم (ن)ەکە، بۆ جەختکردنەوەن.

٢- ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، هەروەها بە دڵنیایی خوا ﷻ باشترین بژیودەرە.

٣- ﴿ لَيُدْخِلَنَّهُم مُّدْخَلًا يَرْضَوْنَهُۥ ﴾، بە دڵنیایی دەیانخاتە نێو جێگە و ڕێگەیەکەوە کە دڵپەسندیانە.

٤- ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا زانای هێدیی و مەندە.

٥- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾، ئەوەش بە هۆی ئەوەوەیە کە هەر خوا هەقە.

٦- ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴾، بە دڵنیایی بەس خوا بەرزی گەورەیە.

بۆیـە ئـەوەش لـە ڕیـزی ئەوانـدا هاتـوە و دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ ﴾، واتـە: ئـەوەی کـە لـە جیاتـی خـوا ﷻ لێـی دەپاڕێنـەوە، هـەر ئـەو ناهـەق و پووچـە، کەواتـە: لـە هـەر شـوێنێکدا خـوا ﷻ وشـەیەک و تەعبیرێـک بەکاردێنـێ، کـە لەگـەڵ ئـەو سـیاقەدا کـە تێیـدا هاتـوە، گونجـاو بـێ.

پاشان خوا دەفەرموێ:

٧)- ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴾، ئایا نابینی، سەرنج نادەی، کە خوا ﷻ لە ئاسمانەوە، لە سەرێوە ئاوی دابەزاندوە؟ وەک زۆرجاران گوتوومانە: ئەگەر فەرمووبای:

(**مَطَر**) هەر بارانی دەگرتەوە و، ئەگەر فەرمووبای: (**ثَلْج**) هەر بەفری دەگرتەوە و، ئەگەر فەرمووبای: (**بَرَد**) بەس تەرزەی دەگرتەوە، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، لە سەرێوە، لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندوە، بۆ ئەوەی هەم باران و، هەم بەفر و، هەم تەرزە و، هەم هەڵمی ئاو و، شەونم و ئەوانەش بگرێتەوە.

ئنجا لێرە بەولاوە خوا ﷻ چاکە و نیعمەتەکانی خۆی دەخاتەوە بیرمان: ئایا کە خوا ﷻ لەسەرێوە ئاوی دابەزاندوە، چی پێکردوە؟

٨)- ﴿فَتُصْبِحُ ٱلْأَرْضُ مُخْضَرَّةً﴾، یەکسەر زەوی سەوز هەڵگەڕاوە، واتە: پڕ بووە لە ڕووەک دار و درەخت و شینایی و، باغ و بێستان، وشەی (**تُصْبِحُ**) کرداری ئێستایە (**فِعل مُضارع**)ە و، بۆ ئەوەیە دیمەنەکەت بخاتە بەرچاو، کە تۆ دەیبینی، دوای ئەوەی ئاو دێتە خوار لە ئاسمانەوە، ئەو سەر زەوییە وشک و برینگ و، قاقڕەی پێ سەوز هەڵدەگەڕێ، سەوز دەنوێنێ، کە پێشتر ڕەنگێکی پەژموردە و ڕەنگێکی زەردباوی هەبووە، ئنجا سەوز هەڵدەگەڕێ و ژیانی تێدەگەڕێ.

٩)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ﴾، بە دڵنیایی خوا پەنهانکاری شارەزایە، زۆر بە پەنهانیی کارەکانی خۆی دەکات، بە بێ تەقە و ڕەقە و، بەبێ هەرا و هۆریا، ئەو ئاوە دێتە خوارێ، بە شێوەی باران و بەفر و تەرزە دێتە خوار و، زەوی پێ زیندوو دەبێتەوە و، سەوز هەڵدەگەڕێ.

١٠)- ﴿لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، هی ئەوە، ئەمیش دیسان بانەدراوەتەوە سەر ڕستەکانی پێشێ، واتە: نە (**و**) نە (**ف**) نە (**ثُمَّ**)ی بۆ بەکارنەهاتوون، بۆچی؟ چونکە ئەمە باسکردنی شتێکی گشتییە، لە دوای شتە تایبەتەکان، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، موڵکی ئەوە.

١١)- ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ﴾، بە دڵنیایی هەر خوا دەوڵەمەندی ستایشکراوە، دەوڵەمەندە پێویستیی بە جگە لە خۆی نیە و، ستایشکراویشە، لەسەر ئەو هەموو چاکە و نیعمەتانەی، کەواتە: ئەو کافرانە ئەگەر ستایشیشی نەکەن و،

شوکرانەبژێریی بۆ نەکەن، خوا ﷻ چ زۆرە دروستکراوانی دیکەی زۆرن، کە ستایشی دەکەن لە فریشتەکان و، لە جند و مرۆڤی مسوڵمان و، لەو هەمووو ژیاندارانە و، ئەو هەمووو دروستکراوانەی خوا ﷻ، کە وەک لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، دەفەرمووێ: ﴿وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴿٤٤﴾﴾، واتە: هیچ شتێک نیە کە خوا بە پاک نەگرێ و ستایشی نەکات، بەڵام ئێوە لە پاکگرتن و ستایشکردنەکەیان تێناگەن.

## نوکتەیەکی ڕەوانبێژیی:

دیسان (**الخَطيبُ الإسكافِي**) لە: (**دُرَّةُ التَّنزِيل وَغُرَّةُ التَّأوِيل**)(١)دا، بەراوردێکی دیکە دەکات لە نێوان ئەم ئایەتەدا کە دەفەرمووێ: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾ و ئەو ئایەتەی سوورەتی (لقمان)، کە دەفەرمووێ: ﴿لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾﴾، لێرەدا دەفەرمووێ: ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هی ویە، بەڵام لە سوورەتی (لقمان)دا، دەفەرمووێ: ﴿لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿٢٦﴾﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، هی خوایە، هەروەها لێرەدا دەفەرمووێ: ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ﴾، واتە: بە دڵنیایی هەر خوا دەوڵەمەندی ستایشکراوە، بەڵام لە سوورەتی (**لقمان**)دا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا دەوڵەمەندی ستایشکراوە.

هۆکارەکەشی هەر ئەوەیە کە لە سوورەتی (الحج)دا، هەمووو ڕستەکان بە جەختکردن (**تأکید**)ەوە هاتوون، بۆیە ئەمیش واهاتوە، تاکو وەک ڕستە و بڕگەکانی پێشوو بێ، بەڵام لە سوورەتی (**لقمان**)دا بەو شێوەیە نیە.

ئنجا کە دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ تَرَ﴾، چ لەم ئایەتەدا کە دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾، چ دواتر کە دێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا

---

(١) ص٢١٨.

﴿فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، ئەمە هەمووی: (الإستِفهَامُ الإنكَاريُّ لأنه نُزِّلت غَفْلَةُ كَثِيرٍ مِنَ النَّاسِ عَنِ الإعتِبَارِ بِهَذِهِ النِّعْمَةِ وَالإعْتِدَادِ بِهَا، مَنْزِلَةَ عَدَمِ العِلْمِ بِهَا فأُنكِرَ ذَلِك)، ئەم پرسیارکردنە کە دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ﴾، ئایا نەتبینیوە؟ یان سەرنجت نەداوە، یانی: بە چاوی سەر نەتبینیوە، یان بە چاوی عەقڵ و دڵ، ئەمە پرسیارکردنێکی نکووڵیلێکەرانەیە، چونکە بێ ئاگایی زۆرێک لە خەڵک لەو چاکە و نیعمەتانەی خوا ﷻ، وەک نەزانیی و بێ ئاگایی ئەوان دانراوە، ئنجا ئەوەش نکووڵییلێکراوە، کە چۆن دەبێ شتی وا نەزانن؟!

١٢)- ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، ئایا سەرنج نادەن، نابینن، کە خوا ﷻ هەرچی لە زەویدایە، بۆ ئێوەی دەستەمۆ کردوە؟ وشەی (تَسْخِير) لە ئەصڵدا بریتیە لە ئاسانکردنی لێ بەهرەمەند بوون، بۆ شتێک کە جۆرێک لە چەمووشیی و جۆرێک لە ئامادە نەبوون و لاملیی تێدا بێ، بەڵام دوایی بەکارهێنراوە بۆ هەموو جۆرە ئاسانکارییەک کە تۆ بەهۆیەوە بەهرەمەند ببی لەو شتانە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، ئایا سەرنج نادەی ئەی مرۆڤ! بە چاوی عەقڵ و دڵ، یان بە چاوی سەر نابینی؟ کە خوا ﷻ هەرچی لە زەویدایە بۆ ئێوەی دەستەمۆ و ملکەچ کردوە، بۆی ڕام کردوون؟

أ- ئینسان ئەگەر بیر بکاتەوە: ئەو زەوییە کە ئێمە لەسەری دێین و دەچین، ئەگەر ئەو توێخە زەوییە، ئەو خۆڵ و گڵە، ئەگەر ئاسن، تەنانەت مس، بەڵکو هەمووی زێڕ بووایە، یان زیو بووایە، ئەو کاتە دەنکە تۆیەکی سەوز نەدەکرد، بەڵام خوا ﷻ ئەو زەوییە، توێژی سەرەوەی کردوە بە گڵ، بۆ ئەوەی بگونجێ دار و درەخت و میوە و، سەوزە و دانەوێڵەی لەسەر بڕوێ.

ب- پاشان ئەگەر ئینسان بیهێنێتە بەرچاوی خۆی: ئەگەر ئاویش وەک گڵ بووایە، کەشتیی لەسەر گڵ ناڕوا، یان وەک بەرد بووایە، بەڵام ئاو ماددەیەکی شلە، کە دەگونجێ کەشتیی لەسەری بڕوا.

ج- یان ئەگەر ئینسان وێنا (تصوّر) بکات، کە بەرگە هەواش وەک ئاو بووایە، ئەو کاتە ئەو سوود و کەڵکانەی کە ئێستا ئێمە لە بەرگەهەوا، یان لەبەرگە ئاویی وەریدەگرین، یان لەو بەرگە گڵییەی کە هەیە بە دەوری زەویدا، بە تەئکید ئەو بەهرانەمان لێوەرنەدەگرتن.

د-ئنجا ئینسان زۆرجاران بە سادەیی و سەرکێڵیی تەماشای شتەکان دەکات، ئەگەر ئینسان ڕامێنێ دەزانێ: ئەو شتانەی مرۆڤ زیاتر و بەپەلەتر پێویستیی پێیانە، خوا ﷻ زۆرتری کردوون:

١- لە دوو سێ خولەک زیاتر مرۆڤ بەبێ هەوا ناژی، بۆیە خوا ﷻ هەموو گۆشە و کەنارێکی ئەم زەوییەی پڕ کردوە لە هەوا.

٢- ئنجا لە دوای هەوا، مرۆڤ زیاتر پێویستیی بە ئاوە، ئاویش لە زۆر شوێنان هەیە.

٣- ئنجا دوایی پێویستیی بە گڵە، گڵیش لە زۆر شوێنان هەیە.

٤- ئنجا پێویستیی بە خواردنەکانە، ئەو خواردنانەش دەگونجێ لە زۆر شوێنان پەیدا بن، بە ئەندازەی ئەوە کە شتەکان زۆر پێویستن، خوا زۆری کردوون، کەمتر پێویست بن، کەمتری کردوون، بۆ وێنە: کانزای زێڕ و زیو، مرۆڤ زۆر پێویستیی پێیان نیە، چونکە ژیانی پەکی لەسەریان نەکەوتوە، بەڵام بۆ خۆ ڕازاندنەوەن، بۆیە لە چەند شوێنێکی دیارییکراودا هەن! بۆیە کە دەفەرموێ: دەستەمۆ و ملکەچم کردووە، واتە: بۆم وا لێکردوون کە بتوانن لێی بەهرەمەند بن.

١٣)- ﴿ وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ ﴾، واتە: کەشتییەکانیشی بۆ ڕام و، دەستەمۆ کردوون، کە بە مۆڵەتی خوا ﷻ بە دەریادا دەڕۆن.

(أَمْر) لێرەدا مەبەست پێی (أَمْر)ی تەکوینییە، واتە: بە قەدەری خوا ﷻ و، بە پێی ئەو یاسایانەی خوا داینـاون و بە فەرمانی پەیداکردنانەی خوا، نەک بە فەرمانی یاسادانانە (تشريعي)ی خوا.

**١٤)- ﴿ وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ ﴾**، هەروەها (خوا ﷻ) ئاسمانیش دەگرێ (ڕایدەگرێ) لەوەی بکەوێتە سەر زەوی.

**١٥)- ﴿ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓ ﴾**، مەگەر بە مۆڵەتی خۆی، لێرەشدا وشەی (**إذن**) وەک وشەی (**أمْر**) لە ئایەتەکەی پێشێدا، هەردووکیان (**إذن**) و (**أمْر**)ی پەیداکردنانە (**تكويني**)ن، نەک یاسادانانە (**تشريعي**)، زانایان دەڵێن: بەلای کەمەوە لە شەو و ڕۆژێکدا یەک ملیۆن وردە بەرد لە خڕۆکە و ئەستێرەکانەوە بەرەو بەرگە هەوای زەوی دێن، بەڵام بەرگە هەوا هەموویان دەسووتێنێ، ئەو بەرگە هەوایەی کە هەتا هەزار (١٠٠٠) کیلۆمەتر بە بەرزیی دەڕوات.

**١٦)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴾**، بە دڵنیایی خوا ﷻ بەرانبەر بە خەڵکی بە پەرۆشە و بە بەزەییە، (**رؤوف: صِفَةٌ تَقْتَضِي صَرْفَ الضُّرِّ، وَالرَّحْمَةُ: صِفَةٌ تَقْتَضي النَّفْعَ لِمُحتَاجِهِ**)، وشەی (**رَأفَة**): سیفەتێکە، خوازیاری ئەوەیە زیان و زەرەر دووربخاتەوە، بەڵام ڕەحمەت سیفەتێکە خوازیاری ئەوەیە خێر و خۆشیی نیزیک بخاتەوە، واتە: خوا ﷻ هەم ئازار و ناڕەحەتییەکان لە خەڵک دوور دەخاتەوە و، هەم خێر و خۆشیی و بەرژەوەندییەکانیشیان بۆ دێنێ.

**١٧)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ ﴾**، خوا ﷻ هەر خۆیەتی کە ئێوەی ژیاندوە و، ژیانی بە ئێوە بەخشیوە.

**١٨)- ﴿ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ﴾**، دوایی دەتانمرێنێ.

**١٩)- ﴿ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ﴾**، ئنجا جارێکی دیکەش دەتانژیەنێتەوە.

**٢٠)- ﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ ﴾**، بێگومان مرۆڤ زۆر سپڵە و پێ نەزانە، یاخود (**كَفُور**) زێدەڕۆییە لە (**كَافِر**)دا، واتە: زۆر بێبڕوایە، هەردووکیان دەگرێتەوە، لە ڕاستییدا هەموو بابایەکی بێبڕواش سپڵە و پێ نەزانە، هەروەک هەموو بابایەکی سپڵە و پێنەزانیش سیفەتێکی کافرانی تێدایە، ئەگەر بێبڕواش نەبێ بەرانبەر بە خوا ﷻ.

کە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ﴾، دیـارە ئەلیـف و لامی سـەر ئینسـان بۆ ناسـاندن (تَعْرِيـف)ە، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی ناسـاندنی (عَهْـد)ە، (التَّعْرِيـفُ لِلعَهْـد) واتـە: مرۆڤـی بێبـڕوا، نـەک هەمـوو مرۆڤێـک، مرۆڤـی بـڕوادار نـە بێبڕوایـە، نـە سـپڵە و پـێ نەزانیشـە، یاخـود مەبەسـت پێـی (جِنْـس)ە، بـەڵام (جِنْـس)ی عورفیـی، واتـە: زۆربـەی خەڵکـی، زۆربـەی مرۆڤـەکان بـەو شـێوەیەن، هـەروەک دەگوتـرێ: (جَمَـعَ الأُسْـتَاذُ الطّـلاَبَ) واتـە: مامۆسـتا قوتابییەکانـی کۆکردنـەوە، (الطّـلاَبَ) ئەلیـف و لامـی ناسـاندنی لەسـەرە، یـانی: تێکـڕای قوتابییـەکان، بـەڵام مەبەسـت پێـی تێکـڕای ئـەو قوتابییانەیـە کـە لـە قوتابخانەکـەی ئـەودا هـەن و، ئـەو دەرسـیان پـێ دەڵـێ.

## دوازدە کردەوە و شازدە سیفەتی بەرز و بێ وێنەی خوا

لـەم نـۆ ئایەتـەدا، خـوا ﷻ باسـی دوازدە لـە کردەوەکانـی خـۆی و، شـازدە لـە سـیفەتە بـەرزو بـێ وێنەکانـی کـردوە:

### دوازدە (١٢) کردەوەکانیش ئەوانەن:

١)- ﴿ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓا۟ أَوْ مَاتُوا۟ لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ ﴾، (لَيَرْزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ) ئەوە کردەوەی یەکەمی خوایە، بە دڵنیایی پەروەردگاریان بژیوێکی زۆر باشیان پێ دەدات.

٢)- ﴿ ذَٰلِكَ وَمَنْ عَاقَبَ بِمِثْلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِىَ عَلَيْهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴿٦٠﴾ ﴾، بە دڵنیایی کەسێک بەرانبەرەکەی سزا بدات، وەک پێی سزادراوە، دوایی دەستدرێژیی بکرێتەوە سەر، بە دڵنیایی خوا ﷻ پشتی دەگرێ و سەری دەخات، ﴿ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُ ﴾، کردەوەی دووەمە.

٣و٤)- ﴿يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ﴾، شەوگار بە نێو ڕۆژگاردا دەكات و، ڕۆژگاریش بە نێو شەوگاردا دەكات، ئەمانیش كردەوەی سێیەم و چوارەم.

٥)- ﴿أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ﴾، لە سەرێوە و، لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاندوە، ئەمیش كردەوەی پێنجەم.

٦)- ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە، هی ئەوە، موڵكی ئەوە و كەسی دیكە بەشی پێوە نیە، ئەمیش كردەوەی شەشەم.

٧و٨و٩)- ﴿أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦ وَيُمۡسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ﴾، ئایا سەرنج نادەی! خوا هەرچی لە زەویدایە بۆ ئێوەو دەستەمۆ كردوە، كەشتییەكانیشی ڕامكردوون بە ویستی خوا بە دەریاكاندا دەڕۆن و، ئاسمانیش دەگرێ كە بەسەر زەویدا بكەوێ، مەگەر بە مۆڵەتی خۆی، بێگومان خوا بەرامبەر خەڵك بەپەرۆش و بەزەییە، ئەمانیش حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم.

١٠)- ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاكُمۡ﴾، خوا هەر ئەوە كە ئێوە زیندوو دەكات و دەژیەنێ، ئەمیش كردەوەی دەیەم.

١١)- ﴿ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ﴾، دوایی دەتانمرێنێ ئەمیش كردەوەی یازدەیەم.

١٢)- ﴿ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ﴾، دوایی جارێكی دیكەش زیندووتان دەكاتەوە، ئەمیش كردەوەی دوازدەیەم.

## شازدە سیفەتەكانیش بەو شێوەیەن:

١)- ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ باشترینی بژیوەدەرانە.

٢ و٣)- ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ﴾، بە دڵنیایی خوا زانای هێدیی و مەندە.

٤و٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا چاوپۆشییکاری لێبوردەیە.

٦و٧)- ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە.

٨ و٩ و١٠)- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ﴾، ﴿ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِيُّ ٱلْكَبِيرُ ﴾، ئەوەش بە هۆی ئەوەوەیە کە هەر خوا هەقە و، بە هۆی ئەوەوەیە کە خوا بەرزی گەورەیە.

١١ و١٢)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا پەنهانکاری شارەزایە.

١٣و١٤)- ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلْغَنِيُّ ٱلْحَمِيدُ ﴾، بە دڵنیایی خوا دەوڵەمەندی ستایشکراوە.

١٥ و١٦)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بەرانبەر بە خەڵک زۆر بە پەرۆشی یەکجار بە بەزەییە.

خوا ﷻ بۆیە لێرەدا ئەو هەموو کردەوانەی خۆی کە دوازدەن و، ئەو هەموو سیفەتە بەرزو بێ وێنانەی خۆی کە شازدەن و، کۆی هەموویان بیست و هەشت (٢٨) کردەوەو سیفەتن، هێناون، کە هەموو کردەوەکانی خواش دەچنەوە نێو سیفەتەکانی و نێو ناوەکانی، چونکە ئەم ئایەتانە لە سیاقێکدا هاتوون، کە یەکەمین ئایەتانێکن، وەک زەمینە خۆشکردن بۆ ئەو ئەرکە گەورە و گرنگەن، دانرانی ئەرکی جەنگ و جیهاد و کۆچ کردن لە پێناوی خوادا، ئەمانە زەمینە خۆشکەری دانراننی، ئنجا خوا ﷻ دەیەوێ ئەهلی ئیمان دڵنیا بکاتەوە، کە خوایەک خاوەنی ئەو هەموو کردەوە و ئەو هەموو سیفەتە بەرز و بێ وێنانە بێ، ئێوەش بە تەواویی پشتی پێوە ببەستن و، لێی دڵنیابن کە سەرتان دەخات و، پشتتان دەگرێ و مشوورتان دەخوات و لەگەڵتان دەبێ.

من کەمتر شوێنێکی دیکەی ئاوام پێ شک دێ، لە قورئاندا، کە خوا ﷻ ئەو هەموو سیفەتانەی خۆی و، ئەو هەموو کردەوانەی خۆی، لە یەک سیاقدا لە نۆ ئایەتی موبارەکدا بخاتە ڕوو.

## کورتە باسێک لە بارەی بنەڕەتی ژیانەوە

شایانی باسە: بیردۆزەی (گەشەساندن) بە تایبەت دوا ئاڵقەی ئەو بیردۆزەیە کە داریۆنیزمە، ئیددیعا دەکات، کە تێکڕای زیندەوەرەکان لە ژیانداریٚکی (زیندەوەرێک)ی یەک خانەییەوە، گەشەیان کردوە، کە پێی دەگوترێ: (سیانۆبەکتریا) و سێ ملیارو هەشت سەد ملیۆن (٣،٨٠٠،٠٠٠٠٠٠) ساڵ، لەمەو پێش، ئەو ژیانداره یەک خانەییە پەیدا بووە و، لەوەوە هەموو ئەو ژیاندارانەی کە دەیانبینی، لە هەوادا و لە ئاودا و لە زەویدا، پەیدابوون.

بەڵام ئێمە پێنج سەرنج، کە هەر کامیان بە تەنیا بایی ئەوە دەکات ئەو لاف لێدان (إدِّعاء)ەی بیردۆزەی گەشەسەندن هەڵبوەشێنێتەوە، چ جای هەموویان پێکەوە، دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** ملیۆنان جۆرە ژیاندار لە پەلەوەری ئاسمان و، ئاژەڵی زەمینیی و، ژیانداری دەریایی، بەو هەموو کۆئەندامە ئاڵۆزو پڕ وردەکارییانەوە، چۆن هەر لە خۆوە لە خانەیەکەوە پەیدابوون، بەبێ نەخشەدانەر و مشوور خۆرێک، ئەگەر گریمان بێردۆزەی گەشەسەندن ڕاستیش بێ؟!

چونکە خانە (**خلیة**) تەنیا خۆی کۆپی دەکاتەوە، ئەویش بە هۆی ئەو جینۆم و کرۆمۆسۆمانەوە، کە وەک پرۆگرامێکی یەکجار ورد تێیاندا تۆمارکراوە، واتە: خانە تەنیا دەتوانێ خۆی کۆپی بکاتەوە، دوو لەت دەبێ و کرۆمۆسۆمەکانیش دیسان (٤٦) بە (٤٦) دابەش دەبنەوە، بەڵام ئەوە کە خانەکان هەموو یەک بگرن و، ژیاندارێکی دیکە پێک بێنن، بۆ نموونە: مرۆڤ لە سەد (١٠٠) تریلیۆن خانە پێکدێ و، ئنجا ئەو خانانە هەموویان یەک بگرن و، چەند ئەندامێک پێک بێنن و، ئەوانیش چەند کۆئەندامێک پێک بێنن و، بە هەموویان جەستەی مرۆڤ پێک

بێنن، ئا ئەوە جیایە و لە سنووری توانای خانە بەدەرە، ئنجا ئەو جینۆمانەی لەسەر ئەو خانانە تۆمارکراون، زانیاریی زۆر وردن، هەر خانەیەک، سێ ملیار زانیاریی لەسەر تۆمار کراو، ئنجا ئایا کێ ئەو زانیارییانەی لەوێدا دانان؟ لە حاڵێکدا کە ماددە بۆ خۆی نە ژیانی هەیە، نە ویستی هەیە، نە گەشەکردنی هەیە، هیچی نیە!

**دووەم:** کوا شوێنەواری ئەو هەموو ئاڵقانەی زنجیرەی گەشەکردن (**حَلَقَاتُ سِلْسَلةُ التَطَور**)، لە کوێن؟ بۆچی لە تۆماری هەڵکۆڵدراوەکان (**سِجِلُّ الحَفْرِيّات**)دا دیار نین؟ کە ئەوە - وەک پێشتریش باسمان کردوە لە موسووعەی: {درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحییدا} - یەکێکە لە کۆسپە هەرە گەورەو بێ ڕەزایەکانی کە بەرۆکی بیردۆزەی داریۆنیزم و گەشەسەندن دەگرن.

**سێیەم:** (لویس باستۆڕ) لە ساڵی: (١٨٦٤)ز دا، واتە: پێنج ساڵ، دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی داروین: بنەڕەتی جۆرەکان (**أصل الأنواع**)، بە میکرۆسکۆبەکەی خۆی ئیسپاتی کرد، کە ماددەی زیندوو، لە ماددەی مردوو پەیدا نابێ و، هەموو دیاردەکانی کە لەو بارەوە هەن، بریتین لە گەشەکردنی بەکتریایەکان لەو ژینگانەدا، لەوانە: ئەسپێ و، کێچ و، کرم و... هتد، ئەوانە بەکتریاو میکرۆبن لەو ژینگانەدا گەشە دەکەن و گەورە دەبن و، دەبن بەو جۆرە زیندەوەرانەی کە دوایی ئێمە دەیانبینین، ئنجا لەو کاتەوە کە (لویس باستۆڕ) بە میکرۆسکۆبەکەی خۆی دەریخست: ماددەی ژیاندار و زیندوو لە مردوو پەیدا نابێ، کۆتایی بە بیردۆزەی: ژیانی خودیی (**الحياة الذاتية**) و لە دایکبوونی خودیی و، پەیدابوونی خودیی (**التولُّد الذاتي**) و (**التولُّد التلقائي**) هات، ئەمەش دەقی قسەکەی (لویس باستۆر)ە لەوبارەوە، کە وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی:

(**إنَّ عَقِيـدَة التَولُّـد الـذَّاتي لَـنْ تُشْـفَى أبَـداً مِـنَ الضَرْبَـةِ المَميْتَـة الَّتـي تَلَقَّتْهَـا مِـنْ تَجْريبِـي**)[1]، واتە: عەقیدەی لە دایک بوونی خودیی، هەرگیز لەو زەبرە

---

(١) التطور نظرة تأريخية وعلمية، تأليف: محمد صالح الهيلي، ص٦٤.

کوشندەیەی کە لە ئەزموونی من خواردوویەتی، چاک نابێتەوە، (واتە: هەرگیز شیفای بۆ نایەت و جارێکی دیکە هەڵناسێتەوە).

**چوارەم:** (ئەلیکساندەر ئۆبارین) زانای زیندەوەرناسی ڕووسیی، لە سییەکانی سەدەی بیست دا، زۆر هەوڵی دا بە تایبەت کە ئەو کاتە مارکسیزم و لینینیزم تەبەنیی کرا بوو، لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە، زۆر پێویستیی بەوە هەبوو کە بڵێ ژیان لە ماددە پەیدا دەبێ و، پێویستیی بە دەستێکی دەرەکیی نیە، خوا ﷻ ژیان بەسەر ماددەدا فەرز بکات، یاخود ژیان بخاتە نێو ماددەوە، زۆر پێویستیان بەوە هەبوو، ئنجا ئۆبارین پازدە بیست (١٥ - ٢٠) ساڵێک هەوڵیدا، بەڵام دانی بەشکستی خۆیدا هێنا، ئەمەش دەقی قسەکەیەتی کە (**مُعجزةُ خلق الإنسان**)ی (هاڕوون یەحیا)[1] هێناویەتی، دەڵێ:

(**إِنَّ أَصْلَ الخَلِيَّةِ الحَيَّةِ، يُشَكِّل أَظْلَمَ رُكْنٍ فِي نظَرِيَةِ التَّطُور مَعَ الأَسَفْ**)، واتە: بنچینەی خانەی زیندوو، تاریکترین پایەیە لە بیرۆزدەی گەشەسەندندا بەداخەوە، (واتە: هیچ ڕێبەدییەکی تێدا ناکرێ).

**پێنجەم:** هەتا ئێستاش نهێنیی ژیان (**سِرُّ الحيَاة**)، مەتەڵێکی هەڵنەهێنراوە، بۆ وێنە: (جیفری بادا bada jeffrey) زانای کیمیایی زەمینیی لە زانکۆی (سان دیگۆ) لە گۆڤاری (زەوی)، (heart) لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا، گوتوویەتی:

(**وَنَحْنُ نُخَلِّفُ القرن العشرين وَرَاءَنَا، فإِنَّنَا لَا نَزَالُ نُواجِهُ اللُّغْزَ نَفْسَهُ الذِّي وَاجَهْنَاهُ عِنْدَمَا دَخَلْنَا القَرْنَ العِشْرِيْنَ، ألاَ وَهُوَ: كَيْفَ ظَهَرَتَ الحيَاةُ عَلَى وَجِهِ الأَرْضِ؟!**)[2].

واتە: ئێمە کە سەدەی بیست بە جێ دێڵین لە پشت خۆمانەوە و کۆتایی پێ دێنین، هەروەک کاتێ کە هاتینە ئەو سەدەی بیستەوە، هەمان مەتەڵ لە بەردەممانە، ئەویش بریتیە لەوەی چۆن ژیان لەسەر ڕووی زەوی پەیدا بوو؟ (ئەویش دانپێدانانی ئەوە).

---

(١) ص ١٠٤.

(٢) معجزة خلق الإنسان، هارون يحيى، ص١٦٤.

لە کۆتایی ئەم کورتە باسەدا، دەڵێین:

لە بارەی بیرۆدزەی گەشەسەندن و داروینیزمەوە، لە باسی سێیەمی بەشی سێیەمی {درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد}دا، باسێکی وردو پوختمان کردوە و، چەندان پرسیاری زانایانی پسپۆڕ و شارەزای بواری زیندەوەرناسییمان ئاڕاستەی بیردۆزەی گەشەسەندنی داروینزم کردوونەوە، کە بە دڵنیایی ناتوانێ وەڵامیان بداتەوە، بەڵکو ئەو پرسیارانە هەر کامێکیان مایەی لەبەر یەک هەڵوەشاندن و، کۆتایی پێهێنانی ئەو بیردۆزەیەن، کە بە داخەوە بۆ خەڵکێکی زۆر، کراوە بە حەقیقەتێکی سەلمێنراو! لە کاتێکدا لە سەدەی نۆزدەشدا داروین ئەو بیردۆزەیەی خۆی دانا و، دوایی کە لە سەدەی بیستدا زانیاریی وردیلەکانی بواری زیندەوەرزانیی، بە تایبەت زانستی جینۆم، پەیدابوو، کە دەڵێ: هەر خانەیەکی زیندوو، ژمارەیەکی زۆر زانیاریی لەسەر تۆمار کراون، پاشان سیفەتەکان لەو خانەیەوە دەچن بۆ خانەی دیکە، لەو ژیاندارەوە دەچن بۆ ژیانداری دیکە و، لەو زیندەوەرەوە بۆ زیندەوەری دیکە و، ئنجا ئەو زانستە لە سەدەی نۆزدەدا، هەر سەرو سۆراغی نەبوو، بۆیە ئەم زانستە گەورەترین ئیشکال و پرسیاری لەسەر بیردۆزەی داروینیزم پەیداکردوە و، مایەی ئەوەیە کە بیردۆزەی داروینیزم وەک بیردۆزەیەک و بۆچوونێکی زۆر سپات بۆوە، تەماشا بکرێ، نەوەک وەک حەقیقەتێکی زانستیی کە بەداخەوە لەم وڵاتانەی ئێمەدا هەندێک لە بیردۆزەکان لە شوێنێ کە لێیەوە هاتوون، سپات بوونەوە و ڕەنگیان چۆتەوە و بە کەڵک نەماون، کەچی لێرە هەر بازاڕیان پێ گەرم دەکرێ و، مێشکی گەنجەکانی ئێمەیان پێ سەرقاڵ دەکرێ، لە حاڵێکدا کە لە شوێنی خۆیان لە مێژە لە برەو کەوتوون و ڕەونەقیان نەماوە.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە دوازدە (١٢) ئایەتـی کۆتایـی سـوورەتی (**الحـج**) پێـک دێ، کـە ئایەتەکانـی: (٦٧ - ٧٨)ن، لـەو دوازدە ئایەتـەدا، خـوا ﷻ کۆمەڵێـک بابەتـی خسـتوونە ڕوو:

١)- دانانی خوا پەرستیی تایبەت بۆ هەر کۆمەڵگاو ئۆممەتێک، یاخود دانانی خواپەرستییە تایبەتییەکان بۆ هەر کۆمەڵگە و ئۆممەتێک.

٢)- مشتومڕکردن بە باشترین شێوەو، دەرککردنی ئەو ڕاستییە، کە تەنیا خوا ﷻ دادوەریی دەکات و، بۆ لەیەک جیاکردنەوە هەق و ناهەق.

٣)- ئاماژە بە زانیاریی بێ سنووری خوا ﷻ.

٤)- بێ پشت و پەنایی پەرستراوەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران، لە ڕووی بەڵگەو ئیسپاتەوە.

٥)- هەڵوێستی گرژو توندو ئاڵۆزیی هاوبەش بۆ خوادانەرەکان، لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا و، هەڕەشە لێکردنیان بە سزای دۆزەخ.

٦)- وێنە هێنانەوە بە مێشە ڕەشە، بۆ دەستەپاچەیی پەرستراوە ساختەکان و، ڕەخنەلێگرتنی هاوبەش بۆ خوا دانەران، کە قەدری خوایان نەزانیوە.

٧)- باسی هەڵبژاردنی خوا ﷻ بۆ فریشتان و، بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) بە نوێنەرایەتیی خۆی و، زانایی خۆی بە هەموو حاڵ و باڵیان.

٨)- ڕاگەیاندنی دە (١٠) فەرمان و، پێنج ڕاستیی گرنگ، بە بڕوادارانی شوێنکەوتووی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ.

﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلْأَمْرِ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُواْ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُواْ لَهُۥ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ٱللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۩ ﴿٧٧﴾ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾﴾.

## مانای ده‌قاو ده‌قی ئایه‌ته‌کان

{بۆ هه‌ر كۆمه‌ڵێك له‌ خواپه‌رستان ڕێبازێكی خوا په‌رستییمان داناوه (ده‌یگرنه‌به‌ر)، با له‌ باره‌ی كاری خواپه‌رستییه‌وه مشتومڕت له‌گه‌ڵ نه‌كه‌ن، هه‌روه‌ها بانگه‌واز بۆ لای په‌روه‌ردگارت بكه‌، به‌ دڵنیایی تۆ له‌سه‌ر ڕێنماییه‌كی ڕێك و ڕاستی ﴿٦٧﴾ ئنجا ئه‌گه‌ر شه‌ڕه‌ قسه‌شیان له‌گه‌ڵ كردی بڵێ: خوا زاناتره‌ به‌وه‌ی ده‌یكه‌ن ﴿٦٨﴾ خوا له‌ ڕۆژی هه‌ڵسانه‌وه‌دا، له‌ باره‌ی ئه‌وه‌وه‌ كه‌ تێیدا كه‌وتوونه‌ كێشه‌وه‌، دادوه‌رییان له‌ نێواندا ده‌كات ﴿٦٩﴾ ئایا نه‌تزانیوه‌ كه‌ خوا هه‌رچی له‌ ئاسمان و زه‌ویدایه‌ ده‌یزانێ، ئه‌وه‌ له‌ نووسراوێك (تۆمارگه‌یه‌ك) دایه‌ و، ئه‌وه‌ بۆ خوا سێنایه‌ ﴿٧٠﴾ هه‌روه‌ها هاوبه‌شدانه‌ره‌كان شتێك له‌ جیاتی خواده‌په‌رستن، كه‌ هیچ به‌ڵگه‌یه‌كی سه‌لمێنه‌ری له‌سه‌ر نه‌ناردۆته‌ خوار و، هیچ زانیارییه‌كیان له‌ باره‌یه‌وه‌ نیه‌، سته‌مكارانیش هیچ پشت و په‌نایه‌كیان له‌ ڕۆژی دوایی دا نیه‌ ﴿٧١﴾ كاتێكیش ئایه‌ته‌ ڕۆشنه‌كانی ئێمه‌یان به‌سه‌ردا ده‌خوێنرێنه‌وه‌، نیشانه‌ی نكووڵیی و پێناخۆش بوون له‌ ڕووی ئه‌وانه‌دا ده‌بینی كه‌ بێبڕوان و، نیزیكه‌ په‌لاماری ئه‌وانه‌ بده‌ن، كه‌ ئایه‌ته‌كانمانیان به‌سه‌ردا ده‌خوێننه‌وه‌، بڵێ: ئایا هه‌واڵتان پێ بده‌م به‌ خراپتر له‌وه‌، كه‌ پێی تووڕه‌و په‌ست بوون؟ ئاگری دۆزه‌خ، خوا ﷻ گفتی وی داوه‌ به‌وانه‌ی بێبڕوان و، ئه‌ویش خراپترین سه‌ره‌نجامه‌ ﴿٧٢﴾ ئه‌ی خه‌ڵكینه‌! وێنه‌یه‌ك هێنراوه‌ته‌وه‌ (گوێی بۆ هه‌ڵبخه‌ن): به‌ دڵنیایی ئه‌وانه‌ی له‌ جیاتی خوا لێیان ده‌پاڕێنه‌وه‌، ئه‌گه‌ر هه‌مووشیان بۆی خڕ ببنه‌وه‌، هه‌رگیز مێشێكیش دروست ناكه‌ن و، ئه‌گه‌ر مێشیش شتێكیان لێ بستێنێ، پێیان لێی قوتار ناكرێ، داواكار و داوالێكراو بێهێزن ﴿٧٣﴾ وه‌ك بۆ خوا ﷻ شایسته‌یه‌ بێبڕوایه‌كان ڕێزیان له‌ خۆیان نه‌گرت و، به‌ به‌رزو مه‌زنیان نه‌گرت و، بێگومان خوا به‌ هێزی زاڵه‌ ﴿٧٤﴾ خوا له‌ فریشتان و له‌ خه‌ڵكیش نوێنه‌ران (ڕه‌وانه‌كراوان)

هەڵدەبژێرێ، بەڕاستیی خوا بینەری بیسەرە ﴿٧٥﴾ ئەوەی لە پێش دەستیانەوەو ئەوەی لە دوایانەوەیە (داهاتوو و ڕابردوویان) دەیزانێ کاروبارەکانیش هەر بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە ﴿٧٦﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بۆ خوا ڕکووع بەرن و، کڕنووش بەرن و، پەروەردگارتان بپەرستن و، چاکە بکەن، بەڵکو سەرفراز و بە ئامانج گەیشتوو بن ﴿٧٧﴾ هەروەها (بڕوادارینە!) وەک بۆ خوا شایستەیە لە پێناویدا تێبکۆشن، ئەو (خوا) ئێوەی هەڵبژاردوە (کە گێڕاونی بە شوێنکەوتووی قورئان و پێغەمبەری کۆتایی) لە ئاییندا هیچ سەغڵەتییەکی نەخستووەتە سەرتان و، ڕێبازی بابتان ئیبراهیم (بگرنە بەر) ئەو (خوا) پێشتریش و لەم قورئانەش دا، ناوی لێناون مسوڵمانان (خوا ئێوەی هەڵبژاردوە) تاکو پێغەمبەر بەسەرتانەوە شایەد بێ و، ئێوەش شایەد بن بەسەر خەڵکەوە، کەواتە: نوێژ بەرپابکەن و زەکات بدەن و، توند دەست بە ڕێسمانی خواوە بگرن، بەس ئەو دۆست و پشتیوانتانە، بە دڵنیایی ئەو باشترین سەرپەرشتیارو پشتیوان و، چاکترین یاریدەدەرو سەرخەرتانە ﴿٧٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(مَنسَكًا): بـە (مَنْسِكْ)یش، خوێندراوەتـەوە: (النُّسُكُ: العِبَادَةُ، وَالنَّاسِكُ: العَابِدُ، وَخُصَّ بِأَعْمَالِ الحَجِّ)، (مَنْسِك) یان (مَنْسَك)، بـە مانای (نَسْك) یان (نُسُكْ) یانی: خـوا پەرستیی (نَاسِكْ)، یانـی: (عَابْـد) خواپەرسـت، بـەڵام (مَنْسِـكْ) یـان (مَنْسَـكْ) کۆیەکـەی (مَنَاسِكْ)ە، زیاتـر تایبەتکـراوە، بـە خواپەرستییەکان و کردەوەکانـی حـەج و عومـرەوە.

(ٱلْمُنكَرَ): یانـی: پـێ ناخـۆش بـوون، یـان قەڵسـیی و توورەیـی، دەگوتـرێ: (نَكُرَ الأَمْرُ نَكَارَةً: صَعُبَ وَاشْتَدَّ)، واتـە: کارەکـە قـورس بـوو، بـە زەحمـەت بـوو.

(يَسْطُونَ): (السَّطْوَةُ: البَطْشُ بِرفْعِ اليَدِ، يُقَالُ: سَطَى بِهِ)، (سَطْوَة) یانی: گرتـن و، دەسـت لێوەشـاندن، بـە دەسـت بەرزکردنـەوە، دەگوتـرێ: (سَطَى بِـهِ)، دەسـتی لێوەشـاند، یـان پەلامـاری دا.

(ٱلذُّبَابُ): واتـە مێشـە ڕەشـە، زانایانـی شـارەزای زمـان دەڵێـن: (ذُبَـاب) لـەوەوە هاتـوە: (كُلُّ مَا ذُبَّ آبَ)، مێـش هەتـا دەربکـرێ، دێتـەوە.

(يَسْلُبْهُمُ): (سَلَبَ الشَّيءَ: إِنْ نَزَعَهُ قَهْرًا) واتە: بە زۆر لێی ستاند و زەوتی کرد.

(مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ): (القَدْرُ: المِقْدَارُ، وَالحُرْمَةُ، وَالوَقَار)، (قَدْر) بـە مانای ئەنـدازە و، پایـەو پێگـە و حورمـەت و ڕێـز دێ، کەواتـە: (مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ)، واتـە: وەک بـۆ خـوا شایسـتەیە، ڕێزیـان لـێ نەگـرت و، قـەدری خوایـان نەزانـی و، پێگـە و پایـەی بـەرزی خوایـان دەرک نەکـرد.

(حَرَجٍ)، (الحَرَجُ: غَيْضَةُ الشَّجَرَةُ المُلْتَفَّةِ، لَا يَقْدِرُ أَحَدٌ أَنْ يدخُلَ فِيهِ)، (وَالحَرَجُ: الشَّدِيْدُ الضَّيِّق) (حَرَجْ)، بـە درەختێکـی چـڕ و پـڕ، یاخـود بـە باغێکـی چـڕ و پـڕ،

دەگوترێ، کە درەختەکانی پێکداچوون و کەس ناتوانێ بچێتە نێوی، هەروەها (الحَـرَجُ) بە مانای سەختیی و سەغڵەتیی و تەنگانەش دێ.

(مِّلَّةَ)، بە مانای بەرنامە و ڕێباز، دێ، (مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ)، واتە: ڕێبازی بابتان ئیبراهیم، دین پاڵ دەدرێتە لای خوا ﷻ: ئایین و بەرنامەی خوا، بەڵام (مِّلَّةَ) پاڵ دەدرێتە لای مرۆڤ: (مِلَّةَ مُحَمَّد)، (مِلَّةَ مُوسَى)، (مِلَّةَ إِبْرَاهِيْم)، واتە: ئەو ڕێبازەی ئیبراهیم گرتوویەتە بەر، کە هەمان ئایینی خوایەو لەسەر ئەرزی واقیع بەرجەستە کراوە، لەمیانی ئاکارو کرداری ئەو پێشەوایەدا.

(وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ)، دەست بە خواوە بگرن، واتە: خۆتان بە هۆی خواوە بپارێزن، چونکە: (عَصَمَهُ: مَنَعَهُ، حَفِظَهُ)، پاراستیی، بەرگریی لێکرد، یانی: بە هۆی خواوە خۆتان بپارێزن، یاخود بەهۆی دەست پێگرتنی بەرنامەی خواوە، خۆتان بپارێزن لە لادان و خلیسکان.

(مَوْلَىٰكُمْ)، (أَي رَبُّكُمْ وَمَالِكُكُمْ وَمُحِبّكُم) (مَوْلى) بە مانای پەروەردگار و خاوەن و خۆشویست و مشووخۆر، دێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئەم سـوڕەتە موبارەکەدا، سـەرەتا باسـی ئـەو ڕاسـتییە دەکاتەوە، کـە ئـەوە هـەر ئۆممەتـی موحەممـەد ﷺ نیـە، ڕێبازێـک لـە خواپەرسـتیی و دینداریـی تایبەتیـی بـۆ دانـراوە، کـە لـە هەنـدێ شـتدا جیای دەکاتـەوە لـە ئۆممەتانـی پێشـوو، بەڵکـو هەمـوو ئۆممەتانـی پێشـوو، خـوا ﷻ بـە پێـی هەلومـەرج و ژینگـە و بارودۆخـی خۆیـان، ڕێبازێـک لـە خـوا پەرسـتیی و دینداریـی بـۆ دانـاون لـە وردەکارییەکانـدا، بەڵـێ هەندێـک تایبەتمەندیـی هەبـوون جیا بـوون، ڕێبـازی هـەر کام لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)، لـە وردەکارییـەکان دا جیـا بـوون، لەوانـی دیکـە، وەک لـە سـووڕەتی (المائدة)شـدا، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾، واتـە: بـۆ هـەر کامێکتـان بەرنامەیـەک و ڕێبازێکـمان دانـاوە، یـانی: تایبـەت بـە خـۆی لـە وردەکارییـەکان دا، ئەگەرنـا لـە هێڵـە گشـتییەکاندا، ڕێبـاز و بەرنامـەی هەمـوو پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)، یـەک بـووە.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ﴾، بـۆ هـەر کۆمەڵێـک، خـوا پەرسـتییەک یاخـود ڕێبازێکـی خواپەرسـتییمان دانـاوە، ئـەوان گرتوویانەتـە بـەر و پەیڕەوییـان لـێ کـردوە، ﴿فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلْأَمْرِ﴾، ئنجا بـا لـە کاری دینداریـی و مسـوڵمانەتییدا مشـتومڕت لەگـەڵ نەکـەن، واتـە: تـۆ مشـتومڕیان لەگـەڵ مەکـە و لەگەڵیـان مەچـۆرە نێـو شـەڕە قسـە و مشـتومڕەوە، ﴿وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ﴾، بانگەوازیـش بکـە بـۆ لای پـەروەردگارت، لەسـەر کاری خـۆت بەردەوامبـە و، بـا بـە شـەڕی لاوەکیـی و قسـەی لاوەکییـەوە نەتخافڵێنـن و، لـە کاری ئەسـڵی خـۆت لات نـەدەن، ﴿إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ﴾، بـە دڵنیایـی تـۆ لەسـەر ڕێنماییەکـی ڕێـک و ڕاسـتی، ﴿وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾، ئەگـەر مشتومڕیشـیان

لەگەڵدا کردی، بڵێ: خوا ﷻ زاناترە بەوەی ئێوە دەیکەن، یانی: خوا ﷻ زاناترە بە کردەوەکانی ئێوە، کە تاکو چ ڕاددەیەک ڕەوان، یاخود ناڕەوان، کەواتە: بزانن چۆن کردەوە دەکەن! بزانن کە خوای زانای پەنهانبین ناهێڵێ وەک بەرزەکی بانان بۆی دەربچن ﴿ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ﴾، خوا ﷻ لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا و، لە ڕۆژی زیندووکردنەوەدا، دادوەرییتان لە بەینەدا دەکات، ﴿فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾، لەوەدا کە تێیدا دەکەوتنە ڕاجیایی و ناکۆکییەوە.

ئنجا ڕوو دەکاتە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و، هەر کەسێکیش لە دوای پێغەمبەری خاتەمەوە، پەیڕەویی دەکات لەم قورئانە و، لەگەڵ نەیاران و ناحەزانیی ڕێبازی خوا، لە ڕۆژگاری خۆیدا، دەکەوێتە مشتومڕو شەڕە قسەو وتووێژەوە، دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ﴾، ئایا نازانی کە خوا ﷻ هەرچی لە ئاسمان و لە زەویدایە {هەرچی لە سەرێ و لە خوارێیە} هەمووی دەزانێ، ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَـٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾، ئا ئەوە لە نووسراوێکدایە و، ئەوە لە لای خوا ئاسانە، ئنجا ئەمە یان مەبەست پێی تۆمارکردنی ڕاستەقینەیە، کە بۆ خوا ئاسانە هەموو شتێکی لە بارەی دروستکراوەکانی خۆیەوە، تۆمارکرد بێ، یاخود: ئەوە ئاماژە و هێمایە، یانی: وەک چۆن ئێمە کاتێک شتێک تۆمار دەکەین و دەنووسین، لە بیرمان ناچێ، خواش ﷻ ئاوا هەموو زانیارییەکەی لە بارەی دروستکراوەکانی خۆیەوە، وەک نووسرا بێتەوە، هیچی لە بیرناچێ و فەرامۆش ناکات و، ئەوەش بۆ خوا ئاسانە.

ئنجا جارێکی دیکە باسی بێبڕواکان دەکاتەوە: ﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَـٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌ﴾، لە جیاتی خوا ﷻ شتێک دەپەرستن، کە خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردۆتە خوار و، هیچ زانیارییەکیشیان لە بارەیەوە نیە، واتە: بەس بە نەزانیی و نەفامیی شت دەپەرستن، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ بەڵگەی لەسەر نەناردۆتە خوار، ﴿وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾، ستەمکارانیش هیچ یارمەتییدەرێک و پشتیوانێکیان نیە.

ئنجا باسی هەڵوێستی چەوت و خراپیان دەکات، لە بەرانبەر خوێندرانەوەی ئایەتەکانی خوا ﷻ بەسەریاندا و دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾، کاتێک ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێندرێنەوە، ﴿تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ﴾، پێناخۆش بوون و قەڵسیی و تووڕەیی، لە ڕووی ئەوانەدا کە بێبڕوان، دەزانی، ﴿يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾، نیزیکە پەلاماری ئەوانە بدەن کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێننەوە و، هەڵمەتیان بۆ بەرن و زەبریان لێ بوەشێنن، ﴿قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ﴾، بڵێ: ئایا بە خراپتر لەوە هەواڵتان پێ بدەم، بە خراپتر لەوە، کە ئێوە پێی قەڵس بوون و پێتان ناخۆشە؟ ﴿ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾، ئەوە ئاگر (ی دۆزەخ)ە، کە خوا ﷻ بەڵێنی داوە، بەوانەی بێبڕوان (بەڵێنی ئاگری ئاگری دۆزەخی پێداون) و خراپترین چارەنووس و سەرەنجامیش (ئاگری دۆزەخ)ە.

هەڵبەتە لێرەدا کە خوا ﷻ باسی هەڵوێستی بێبڕوایەکان دەکات، لە بەرانبەر ئایەتەکانی خوادا، ئەوە تایبەت نەبووە، هەروەک هەموو هەڵوێستەکانی دیکەش تایبەت نین، بە ڕۆژگاری پێغەمبەرەوە ﷺ، بەڵکو ئێستاش هەر وایە، ئێستاش کەسانێک هەن، ئەگەر ئایەتێکیان بۆ بخوێندرێتەوە و گوێبیستی ئایەتێک و، گوێبیستی فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ و گوێبیستی یاسایەکی شەرعیی بن، یەکسەر کێچیان دەکەوێتە کەوڵ و قەڵس و نارەحەت دەبن، هەروەک لە سوورەتی (الزمر)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ﴾ ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ﴾، واتە: ئەگەر تەنیا باسی خوا بکرێ، ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، دڵیان وێک دێ و دەگوشرێ و بێزار دەبن.

دیارە هەر کەسە چی لە دڵدا هەبێ، بە پێی ئەوە کە لە دڵی دایە، هەڵوێست وەردەگرێ، کەسێک کوفری لە دڵدا هەبێ، بە کوفر دڵخۆشە و، بە

ئیمان سەغڵەت و ناڕەحەتە، کەسێکیش ئیمانی لە دڵدا هەبێ، بە ئایەتەکانی خواو، بەو شتانەی دەبنە هۆی زیادبوونی ئیمان، دڵخۆش دەبن، وەک لە سوورەتی (التوبة)دا، خوا ﷻ هەر لە بارەی هەمان هەڵوێستەوە، دەفەرمویٰ: ﴿وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ ١٢٤﴾، واتە: ئەگەر سوورەتێک دابەزێنرێ لەوانە، (لە دڵ نەخۆش و دەغەڵەکان) هەیە، دەپرسێ: کامتان ئەم سوورەتە ئیمانی بۆ زیاد کردن؟ لەبەر ئەوەی خوا ﷻ دەفەرمویٰ: ﴿وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا﴾الأنفال، دەیانەوێ ئەو قسەیەی خوا بە درۆ دابنێن و تانەی لێ بدەن، یانی: خوا ﷻ دەفەرمویٰ: ئەگەر ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێندرێتەوە، ئیمانیان زیاد دەکات، بەڵام کوا کامەتان ئیمانی پێی زیاد بووە؟ واتە: خوا ﷻ ڕاستی نەفەرمووە! بەڵام خوا ﷻ دەفەرمویٰ: بڕواداران ئیمانیان پێی زیاد دەبێ، نەک ئەهلی کوفر!

بۆیە خوا ﷻ دەفەرمویٰ: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ١٢٤﴾التوبة، کەچێ ئەوانەی بڕوادارن، ئیمانیان پێی زیاد دەبێ {بەو سوورەتە کە دادەبەزێ} و دڵخۆشیش دەبن، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ١٢٥﴾التوبة، بەڵام ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، هەر پیسییان بۆ زیاد دەکات و {پیسیی زیاتر دەخاتە گەڵ پیسییەکەی کە لە دڵیان دایە، کە شیرک و کوفرە} کاتێکیش دەمرن، بە بێبڕوایی دەمرن، کەواتە: بەڵێ، ئایەتەکانی خوا ﷻ ئیمان زیاد دەکەن، بەڵام لە دڵی ئیمانداراندا، ئەگەرنا بە نسبەت ئەهلی کوفرەوە، نەخۆشیی و پیسیی زیاد دەکات لە دڵیاندا، یانی: بێبڕوایان هەتا ئایەتێک زیاتر ببیستن، کوفر بەو ئایەتەش دەکەن، پێشتریش کوفریان بە هەندێک لە ئایەتەکانی خوا ﷻ کردوە و، پیسیی چۆتە نێو دڵیان و، لە ئەنجامی کوفر کردنێکی زیادەش دا، پیسیی زیادە دەچێتە نێو دڵ و دەروونیانەوە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓ ﴾، ئەی خەڵکینە! وێنەیەک هێنراوەتەوە گوێی بۆ هەڵبخەن، باش سەرنجی بدەن، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ﴾، وێنەکە ئەوەیە: ئەوانەی ئێوە لە جیاتی خوا ﷻ لێیان دەپاڕێنەوە {هەروەها خوێندراویشەتەوە: (إِنَّ الَّذِيْنَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ)، ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دانەران و کافرەکان، لێیان دەپاڕێنەوە} هەموو ئەوانە ئەگەر کۆشببنەوە سەر یەکدیی و هاوکاری یەکدییش بن، بە هەموویان مێشێکیان پێ دروست ناکرێ، ئنجا نەک هەر مێشێکیان پێ دروست ناکرێ، بەڵکو ئەگەر مێشەکە شتێکیشیان لێ بستێنێ، پێیان لێی دەرباز و قوتار ناکرێ، پێیان لێ ناستێنرێتەوە، داواکار و داوالێکراو بێهێزن، داواکەرەکە ئەو کەسەیە کە دەیەوێ شتەکە لە مێشەکە بستێنێتەوە، داوالێکراویش بریتیە لە مێشەکە، یاخود داواکەر: بتپەرستەکان و، داوالێکراویش پەرستراوەکەیە، هەردووکیان بێ هێزن، ﴿ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾، وەک بۆ خوا ﷻ شایستەیە، ڕێزیان لە خوا نەگرتوە، قەدری خوایان نەگرتووە و پایەی بەرزی خوایان دەرک نەکردوە، بەڵام بێگومان خوا بەهێزی زاڵە.

ئنجا باسی ئەوە دەکات کە وەنەبێ هاتنی موحەممەد ﷺ شتێکی بیدعەت و داهێنراوێک بوو بێ، پێشینەی نەبووبێ: ﴿ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴾، خوا ﷻ لە فریشتان و لە مرۆڤان، نوێنەران و ڕەوانەکراوان هەڵدەبژێرێ، بێگومان خوا بیسەری بینەرە، ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴾، ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیەو، ئەوەی لە دواشیانەوەیە هەمووی دەزانێ، واتە: داهاتوویان دەزانێ و ڕابردووشیان دەزانێ، یاخود: هەموو شتێکیان لە بارەوە دەزانێ و، کاروبارەکانیش بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان

هێناوە! بۆ خوا ﷻ ڕکووع ببەن و، کڕنووش ببەن و، پەروەردگارتان بپەرستن و، چاکە بکەن لەگەڵ بەندەکانی خوادا، بەڵکو سەرفراز بن، ئنجا خوا لەسەر ڕێنماییەکانی خۆی و، ئامۆژگارییەکانی بەردەوام دەبێ و، دەفەرموێ: ﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ﴾، وەک بۆ خوا شایستەیە لە پێناویدا تێبکۆشن و فیداکاریی بکەن، تێبکۆشن و خۆتان ماندوو بکەن، ﴿ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) ئێوەی هەڵبژاردوە، ئێوە کە بەندایەتیی بۆ خوا ﷻ دەکەن و، دوای پێغەمبەری کۆتایی و شوێن کتێبی کۆتایی خوا ﷻ دەکەون، کە قورئانە، ئێوە هەڵبژاردەی خوان، ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴾، (خوا) لە ئایینیشدا هیچ سەغڵەتیی نەخستۆتە سەرتان، ئەم ئایینە سەغڵەتتان ناکات و، بێزارتان ناکات، واتان لێناکات دەرنەبەن، بەڵێ ماندوودەبن و، ئارەقەی پێوە دەکەن، بەڵام وا نیە بۆتان جێبەجێ نەکرێ، ﴿ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ﴾، ئەمە هەمان ڕێبازی بابتان (ئیبراهیم)ە، بابی ڕووحیی و مەعنەوییتان ﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا ﴾، ئەو (خوا) ﷻ ناوی لێناون، مسوڵمانان لە پێشدا و لەمەشدا، واتە: لەم قورئانەشدا ئێوە نازناوی مسوڵمانانتان هەیە، بەس ئەو ناوەتان هەیە، کە هەمووتان کۆ بکاتەوە، ﴿ لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ ﴾، بۆیە خوا ﷻ ئێوەی هەڵبژاردوە وەک ئۆممەتی کۆتایی و شوێنکەوتووانی پێغەمبەری کۆتایی و کتێبی کۆتایی، تاکو پێغەمبەر ﷺ شایەد بێ بەسەرتانەوە، ﴿ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ﴾، ئێوەش شایەد بن، بەسەر خەڵکەوە، پێغەمبەر شایەدە بەسەرتانەوە و، بەڵگەیە بەسەرتانەوە، کە ئیسلام ڕاستە و، ئێوەش شایەد بن بەسەر مرۆڤایەتییەوە، کە تەنیا ئیسلام ڕاستە و بەرنامەی تێر و تەواوی ژیانە، ﴿ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ ﴾، کەواتە: نوێژ بەرپا بکەن، وەک پایەی مەعنەویی دینداریی و، زەکات بدەن، وەک پایەی ئابووریی و ماددیی، دینداریی و، لە هەموو کاروبارێکیشتاندا دەست بە ڕێسمانی خواوە بگرن ﴿ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ﴾، هەر ئەو (خوا ﷻ) سەرپەرشتیار و مشوورخۆر و کار سازو هاوکارتانە، ﴿ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) باشترین سەرپەرشتیارو باشترین هاوکار و یارمەتیدەرتانە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

خـوا ﷻ بـۆ هـەر ئۆممەتێـک بەرنامەیەکـی پەرسـتن و دینداریـی دانـاوە و، نابـێ مرۆڤـی مسـوڵمان قبووڵـی مشـت و مـڕ بـکات لـەو بـارەوە و، پێویسـتە لـە ڕاسـتیی ڕێبازەکـەی دڵنیابـێ و، لـە کاتـی شـەڕە قسـەش لەگـەڵ کەسـانێکی نەیـار و بێبـڕوادا لـە جیاتـی لەسـەر ڕۆیشـتن و، زۆر پێـوە چـوون، بڵـێ: خـوا وایدانـاوە و ئەویـش زاناتـرە و، لـە قیامەتیـش دادوەریـی لـە نێوان بەندەکانیـدا دەکات و، بـە دڵنیایـی خـوا هەرچـی لەسـەر و خـواری گـەردوون دایـە، دەیزانـێ و تۆمـاری کـردوە:

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِى ٱلْأَمْرِ ۚ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَ ۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِى كِتَٰبٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿لِّكُلِّ أُمَّةٍ جَعَلْنَا مَنسَكًا﴾، بۆ هەر کۆمەڵێک لە مرۆڤەکان، بۆ هەر ئۆممەتێک و کۆمەڵگایەک لەوانەی پێش ئێوە، ئەی موحەممەد ﷺ و کۆمەڵگا و ئۆممەتەکەی! جۆرێک لە دینداریی و پەرستنمان داناوە، کە لە وردەکارییەکانیدا کۆمەڵێ تایبەتمەندیی خۆی هەبوون، بەڵام لە چوارچێوەی فراوان و لە هێڵە گشتییەکاندا، بەرنامەیەک کە خوا ﷻ بۆ هەموو پێغەمبەرانی ناردوە، بەس یەک بووە، وەک لە سووڕەتی (**الشورى**)دا دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا

﴿بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ ﴿١٣﴾﴾، لەم ئایەتەی سووڕەتی (**الشورى**)دا، خوا باسی پێنج لە ڕەوانەکراوە هەرە گەورەکان دەکات، کە: نووح و ئیبراهیم و عیسا و مووسا و موحەممەدن (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، دەفەرمویٚ: (خوا) لە ئایینی خۆی بەرنامەیەکی بۆ هەمووتان داناوە...، بەڵام ئەوە لە هێڵە گشتییەکاندا، ئەگەرنا لە وردەکاریی و تایبەتمەندییەکادا کە پەیوەست دەبن بە هەل و مەرجی ژینگە و قۆناغی تێدا ژیانی تایبەتیی ئەو کۆمەڵگایە، هی هەر کامێکیان لە هی ئەوانی دیکە جیابووە، بۆیە کە دەفەرمویٚ: ﴿لِّكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكًا﴾، کە خوێندراویشەتەوە: (**مَنْسِكاً**)، (**مَنسَكًا**) و (**مَنْسِكاً**)، هەردووکیان، یان ناوی شوێنن، بۆ تێدا ئەنجام درانی خواپەرستیی، (**اسْمُ مَكَانٍ لِلنُّسُكِ**)، یاخود مەبەست پێی خواپەرستییە بە گشتی، واتە: (**مَنسَكًا**) یان (**مَنْسِكاً**) یان: ناوی شوێنە بۆ تێدا ئەنجام درانی خواپەرستییەکانی حەج بە تایبەت، یان خواپەرستییەکان، بە گشتیی.

دەشگونجێ (**مَنسَكًا**) و (**مَنْسِكاً**): بە مانای خواپەرستیی بێ بە گشتی، واتە: بۆ هەر کامێک لە ئۆممەتانی پێشێ، جۆرێک لە خواپەرستیی تایبەتمان داناوە، کە لە وردەکارییەکانی دا تایبەت بووە بەو پێغەمبەرەوە، کە لەو کۆمەڵگا تایبەتەداو لەو قۆناغە دیاریکراوەدا، نێردراوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست لێرەدا شوێنی تێدا ئەنجامدرانی خواپەرستییەکانی حەج بێ، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست پێی شوێنی تێدا سەربڕانی قوربانییان نیە، چونکە چەمکەکەی فراوانترە و ئەم ئایەتە لە مانادا پەیوەست دەبێتەوە بە ئایەتی پێشتری، کە دەفەرمویٚ: ﴿وَلِكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكًا لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۗ ﴿٣٤﴾﴾، کە پێشتر باسمان کرد.

هەڵبەتە لەو هەل و مەرج و بارودۆخەدا، کە قورئانی تێدا دابەزێندراوە، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، هەروەها جوولەکەکان و ڕەنگە نەصرانییەکانیش، مشت و مڕیان کردوە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و، مسوڵمانادا، لەسەر ئەو پەرستشانەی کە ئەنجامیان داون، بۆیە خوا ﷻ هەواڵیداوە و دەفەرمویٚ: بۆ هەر کۆمەڵگایەک و،

بـۆ هـەر کۆمەڵێـک، کۆمەڵێـک پەرستشـمان دانـاون کـە وەک دنیداریـی پێیانـەوە پاپەنـد بن.

٢)- ﴿ هُمۡ نَاسِكُوهُ ﴾، کە ئەو کۆمەڵگایە، ئەو ئۆممەتە خواپەرستییان تێدا ئەنجام داون، ئەگەر (منسك) ناوی شوێن بێ، (نَاسِكُوهُ): (أي نَاسِكُوْنَ فِيْهِ بِنَزعِ الخافض)، ئەوەی کە (مجرور)ی کردوە لابراوە و بۆتە: (نَاسِكُوهُ)، لە ئەسڵ دا ئاوایە: (أي نَاسِكُوْنَ فِيْهِ)، پەرستاری خوای پەروەردگار دەبن لەوێدا، لەو شوێنەدا، ئەگەر مەبەستیش لە (مَنْسَك) یان (مَنْسِك)، خواپەرستیی بێت بە گشتیی، یانی: (هُمْ نَاسِكُوْهُ)، یانی: پەرستارن بۆ خوای بەرز ومەزن، بە پێی ئەو پەرستنەی بۆی دیاریی کردوون.

٣)- ﴿ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلۡأَمۡرِۚ ﴾، ئنجا با لە بارەی ئایینەوە، لە بارەی ئەو دینداریيەوە، مشتومڕت لەگەڵدا نەکەن.

لێـرەدا ڕسـتەی: (مشـتومڕت لەگەڵـدا نەکـەن) پرسـیارێک دروسـت دەکات: بەدەسـت پێغەمبـەری خـوا ﷺ و، بـڕواداران و شـوێنکەوتووانی نەبـووە، کـە بەرانبەرەکانیـان مشـتومڕ دەکـەن، یـان نـا، ئـەدی ئەمـە یانـی چـی لێـرەدا؟ یانـی: تـۆ هەلومەرجێـک مەڕەخسـێنە، کـە ئـەوان بێنـە قسـە و مشـتومڕت لەگەڵـدا بکـەن، یـان ئەگـەر ئـەوان ویسـتیان مشـتومڕ و وتوویـژ و شـەڕە قسـە بکـەن، تـۆ لەگەڵیـان پێـوە مەچـۆ، بەڵکـو لاملیـان تێبکـە و وازیـان لێبێنـە.

٤)- ﴿ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ ﴾، هەروەها تۆ بانگەواز بکە بۆ لای پەروەردگارت، واتە: لە جیاتی شەڕە قسە و مشتومڕ لەگەڵ ئەواندا، تۆ خەریکی کاری خۆت بە و بانگەواز بکە، با بە لاڕێتدا نەبەن و بە شتی لاوەکییەوە سەرقاڵ و سەرگەرمت نەکەن، بانگەواز بکە بۆ لای پەروەردگارت، سەرگەرمی بانگەوازی خەڵک بە بۆ خوا بە یەککگرتن و، کاتی خۆت بەو شەڕە قسە و مشتومڕە لاوەکییانەی کە ئەوان دەیانەوێ بیانوروژێنن، کاتی خۆت بەوەوە بە فیڕۆ مەدە.

٥)- ﴿ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدًى مُّسْتَقِيمٍ ﴾، بە دڵنیایی تۆ لەسەر ڕێنماییەکەی ڕێک و ڕاستی.

ئەمە دڵنیاکردنی پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتووانیەتی، دڵنیابن کە ئێوە لەسەر ڕێنمایی و بەرچاو ڕوونیی ڕێک و ڕاستن و دڵ لە دڵ مەدەن!

٦)- ﴿ وَإِن جَٰدَلُوكَ ﴾، ئەگەر ئەوانیش هەر مشتومڕ و شەڕە قسەیان لەگەڵ کردی، سوور بوون، لە سەر دمبەدمەی خۆیان.

٧)- ﴿ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾، بڵێ: خوا زاناترە بەوەی ئێوە ئەنجامی دەدەن، واتە: لە جیاتی زۆر پێوەچوون و بە دواداچوونی ئەو قسانەی ئەوان دەیانوروژێنن، بڵێ: خوا زاناترە بەوەی ئێوە ئەنجامی دەدەن ( و بەوەش کە ئێمە ئەنجامی دەدەین) کەواتە: خوا ﷻ ئەو ڕێباز و بەرنامەی، دینداریيەی ئاوا بۆ ئێمە داناوە و، ئێمە پێوەی پابەندین و، ئێوەش خۆتان چی دەکەن، خوا زاناترە بەوەی ئەنجامی دەدەن، ئنجا ئەمە وەک ئەو ئایەتە موبارەکە وایە کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَٱنتَظِرۡ ﴿٣٠﴾ ﴾السجدة، پشتیان تێبکە و چاوەڕێ بە، کە لە چەند شوێنان لە قورئان دا، ئەوە هاتوە، چونکە زۆرجار ئینسانی بانگەوازکار کەسێک کە دەیەوێ پەیامی خوا بگەیەنێ بۆ کۆمەڵگاو دەوروبەری، ئەگەر لە خۆی وریا نەبێ، بە شتی لاوەکییەوە و بە قسە و باسی نەزۆک و بێجێوە، کاتێکی زۆری لێ بەفیڕۆ دەدرێ و، توانایەکی زۆری لێ بەخەسار دەچێ و دەبێ وریا بێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەگەر هەر سوور بوون لەسەر مشتومڕ لەگەڵدا کردنت، ﴿ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾، بڵێ: خوا زاناترە بەوەی کە دەیکەن.

٨)- ﴿ ٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، خوا لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا دادوەرییتان لە نێواندا دەکات.

٩)- ﴿ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴾، لەوەدا کە ئێستا ئێوە لەبارەیەوە لە ڕاجیایی دان، ئەمە ڕستەیەک و بڕگەیەکی تازەیە و، لەوە نیە کە خوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: پێیان بڵێ، بەڵکو خوا بۆ خۆی دەفەرموێ: خوا لە نێوان ئێوە و نەیارەکانیشتاندا کە مشتومڕ و شەڕە قسەتان لەگەڵدا دەکەن، دادوەرییتان لە نێواندا دەکات، بەڵام کەی؟ لە

ڕۆژی هەڵسانەوەدا، کەواتە: خۆتیان پێوە سەرقاڵ مەکەو، پشتگوێیان بخە و خەریکی کاری خۆت بە.

١٠)- ﴿ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ ﴾، ئایا نازانی کە خوا هەرچی لە سەرێ و لە خوارێیە، هەرچی لە ئاسمان و لە زەوی هەیە، دەیزانێ؟ ئەم پرسیارکردنە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە (**إستفهام إنكاري**)یە، یاخود پرسیارکردنێکی دانپێپێدا هێنەرانە (**إستفهام تقريري**)یە، یانی: بە دڵنیایی تۆ دەزانێ کە: خوا هەرچی لە ئاسمان و زەوییدا هەیە، دەیزانێ.

١١)- ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ ﴾، ئەوە هەمووی لە کتێبێک، لە تۆمارگەیەک دایە، تۆمار کراوە و نووسراوە.

١٢)- ﴿ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴾، ئەوە لەسەر خوا ئاسانە، سێنایە، کە هەموو شتێکی لە بارەی دروستکراوەکانی خۆیەوە تۆماری کردبێ، ئەمە یان کنارەیە بۆ کۆنترۆڵکردن و دەورەدانی زانیاریی خوا بۆ هەموو شتێک، یاخود مەبەست ئەوەیەکە بە کردەوە خوا ﷻ هەرچی لە بارەی دروستکراوەکانییەوە هەیە، نووسیویەتی، وەک لە قورئاندا بە (**لَوْح مَحْفُوظ**) و، (**كِتاب مبين**) و (**إمَامٍ مُبِين**)، هاتوە، دەشگونجێ مەبەست لەو وشانە: (**لَوْح مَحْفُوظ**)، (**كِتاب مبين**)، (**إمَامٍ مُبِين**)، زانیاریی خوای پەروەردگار بێ، بەڵام بۆیە خوای کاربەجێ ئەو وستانەی بەکارهێناون، تاکو ئێمە باشتر تێبگەیەنێ، کە وەک چۆن کاتێک شتێک تۆمار دەکەین، باش باشی دەزانین و لێمان تێکەڵ نابێ و لێمان تێک ناچێ، خواش ﷻ بەو شێوەیە، وەک هەموو شتەکان تۆمار کرابن، لە تۆمارگە و لە لیستێکدا بە وردیی نووسرابن، ئاوا دەیانزانێ و لێی پەنهان نین.

## مەسەلەی دووەم:

**بێبڕوایان لە جیاتی خوا شتێک دەپەرستن، کە هیچ بەڵگەی لەسەر نیەو، هیچ زانیارییشیان لە بارەیەوە نیە، کاتێکیش گوێبیستی ئایەتە ڕۆشنەکانی خوا دەبن، زۆر قەڵس و ناڕەحەت دەبن، نزیکە پەلاماری خوێنەرەوانی قورئان بدەن، بێگومانیش ناخۆشتر لەوە چاوەڕێیانە کە پێی قەڵسن، ئەویش بریتیە لە ئاگری دۆزەخ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٌ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ ۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ ۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ (٩) بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا ﴾، لە جیاتی خوا دەپەرستن، کە هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردۆتە خوار، هەموو ئەوانەی خواناپەرستن، لە جیاتی خوا شتانێک هەر دەپەرستن، پەرستراوانێکی دیکە دەپەرستن.

{لە جیاتی خوا شتانێک دەپەرستن} کە خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوونە خوار، (سُلْطَٰنًا) بە مانای بەڵگەیە، بەڵگەی دابەزێندراو، کە بریتیە لەو بەڵگەیەی لەسەر زمانی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، خوا ﷻ دایدەبەزێنێ، کەواتە: بۆ ئەوە کە دەبێ کێ بپەرسترێ و چۆن بپەرسترێ؟ تاکە بۆلاگەڕاوە (مرجع) و سەرچاوە کە دەبێ بەڵگەی لێوەبێ، خوای پەروەردگارە، وەحیی خوا و پەیامی خوایە و، بەبێ هەبوونی بەڵگە لە لایەن خواوە، دروست نیە شتێک بکرێتە پەرستراو (**مُعبود**)، کەچی ئەوانە لە جیاتی خوا و لە خوار خواوە، شتێک دەپەرستن، کە خوا هیچ بەڵگەی لەسەر نەناردوە.

**٢)-** ﴿وَمَا لَيۡسَ لَهُم بِهِۦ عِلۡمٌ﴾، هەروەها شتانێك (دەپەرستن) كە خۆشیان هیچ زانیارییان لە بارەیەوە نیە، واتە: بڕوایەكی مەحكەمیان پێی نیە بەو شتەی دەیپەرستن، چونكە بڕوای مەحكەم و ئیعتیقادی مسۆگەر و جێی دڵنیایی، لە زانیاریی و بەڵگەی یەكلاییكەرەوە پەیدادەبێ، ئەوانیش زانیاریی و بەڵگەیەكی جێی دڵنیایی و دڵنیاكەریان نیە، بۆیە لە جێیەكی دیكەش دەفەرموێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ ٢٣﴾النجم، واتە: تەنیا بە دوای گومان دەكەون، هەروەها لە سوورەتی **(النجم)**یش دا دەفەرموێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهۡوَى ٱلۡأَنفُسُ ٢٣﴾، واتە: بەس شوێن گومان و، شوێن ئەوە دەكەون كە نەفسەكانیان ئارەزووی دەكەن.

**٣)-** ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ﴾، ستەمكارانیش هیچ پشتیوان و یارمەتییدەرو هاوكارێكیان نیە، لە جیاتی بفەرموێ: **(وَمَا لَهُمْ)**، فەرموویەتی: **(وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ)**، بۆ ئەوەی سیفەتی ستەمیشیان بۆ بكاتە مۆرێک و بە نێو چاوانیانەوە بنێ.

**٤)-** ﴿وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ﴾، كاتێكیش ئایەتە ڕۆشنەكانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێندرێنەوە، چ جۆرە ئایەتێک؟ (بَيِّنَٰتٖ) ئەو ئایەتانەی زۆر ڕۆشنن و هیچ تەم و مژیان بەسەرەوە نیە و، دەزانرێ كە ئایەتی خوان، چونكە لێرەدا وشەی **(آیات)** ڕەوت، (سیاق) كە باسی خوێندنەوەی ئایەتەكان دەكات، ناچارمان دەكات بڵێین: مەبەست ئایەتە خوێنراوەكانی خوان، یانی ڕستەكانی قورئان، ئەگەرنا وشەی **(آیات)**، لە قورئاندا بە چوار واتا یان بەكارهاتوە:

**١-** بە مانای ڕستەكانی قورئان هاتوە.

**٢-** بە مانای دیمەن و دیاردەكانی گەردوونیش دێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ١٠٥﴾يوسف، واتە: زۆر ئایەت لە ئاسمانەكان و زەوییدا هەن، بەڵام بەلایاندا ڕەت دەبن و پشتیان تێدەكەن و لێیان ورد نابنەوە!

**٣-** هەروەها بەمانای موعجزەكانی پێغەمبەرانیش دێ، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ ١٠١﴾الاسراء، واتە: بێگومان نۆ نیشانەی ڕۆشنمان بە

مووسا دابوون، کە مەبەست پێی موعجیزەکانە، کەواتە: (**آيَات**)، بە مانای موعجیزەی پێغەمبەرانیش (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) دێ.

**٤-** هەروەها (**آيَات**)، بە مانای ئەو بەڵا و گرفتارییانەش دێن، کە خوا ﷻ بۆ کۆمەڵگاکانیان دەنێرێ.

بەڵام ئەوەی کە دیاریی دەکات کام لەو چوار چەمکە مەبەستە، کاتێک وشەی (**آيَات**)، یان (**آيَة**)، بەکاردێ؟ ئەو سیاقەیە کە ئەو وشەیەی تێدا بەکاردێ، بۆ وێنە: لێرەدا کاتێک دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ﴾، کاتێک ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، مەبەست پێیان ئایەتەکانی قورئانە.

**٥-** ﴿تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ﴾، تۆ پێناخۆش بوون و نکووڵییکردن و خراپە لە ڕووەکانی ئەوانەی بێبڕوادان، دەخوێنیەوە و دەزانی.

لێرەدا وشەی: (ٱلْمُنكَرَ)، واتە: پێناخۆشبوون (**الكَرَاهَة**)، یاخود: نکووڵییلێکردن (**إنْكَار**)، یان: خراپە و ناپەسند، وەک لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا دەفەرموێ: ﴿وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ﴿٢٩﴾﴾، ئێوە لە کۆڕ و مەجلیسەکەی خۆتاندا، کاری خراپ و ناپەسند و ناقۆڵا دەکەن، کەواتە: (ٱلْمُنكَرَ)، بە واتای ناقۆڵایی و ناپەسندیی، دێ، کەواتە: ﴿تَعْرِفُ فِى وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْمُنكَرَ﴾، سێ واتایان هەڵدەگرێ:

**١-** دەگونجێ مەبەست پێی نکووڵییلێکردن بێ.

**٢-** دەگونجێ مەبەست پێی پەستیی و توورەیی و بێزارییان بێ.

**٣-** دەشگونجێ مەبەست ئەوە بێ کە حاڵەتێکی ناپەسند و خراپ لە دەم و چاوی ئەواندا دەخوێنیەوە.

**٦-** ﴿يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا﴾، نیزیکە پەلاماری ئەوانە بدەن کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێننەوە، نیزیکە دەستیان لێ بوەشێنن، چونکە (**السَّطْوُ: البَطْشُ**)، پڕدان و پەلاماردان و زەبرلێوەشاندن، بێبڕوایان ئەوەندە توورە و پەست و قەڵسن بە ئایەتەکانی خوا، خەریکە ئەوانەی بەسەریان دا دەیانخوێننەوە، پەلاماریان بدەن،

بەڵکو جاری وا بووە پەلاماریشیان داون، وەک لەو بەسەرهاتەی کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دا (خوا لێی ڕازی بێ)، ڕوویداوە، کە سوورەتی **(الرحمن)**ی خوێندۆتەوە کاتێک دابەزیوە و، لە لای کەعبە خوێندوویەتەوە و کافرەکانیش زۆر ئەزیەتیان داوە و برینداریان کردوە.

٧)- ﴿قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ﴾، پێیان بڵێ: ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە خراپتر لەوە؟ کە زیاتر بۆ ئێوە خراپ بێ و، زیاتر جێی توورەیی و پەستیی بێ، هەواڵتان پێ بدەم بە شتێک کە لەوەی ئێستا پێی قەڵسن، زیاتر مایەی پەست بوون و توورەیی و بێزارییتان بێ؟ هەڵبەتە کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ﴾، ئەمە پرسیارکردنە و بەکارهێنراوە بۆ مۆڵەت لێوەرگرتن **(إِسْتِئْذَان)**، بەڵام دیسان مەبەست لەو مۆڵەت لێوەرگرتنەش، هەر جۆرێکە لە گاڵتەپێکردن، چونکە خوا ﷻ هەواڵی پێداون، لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی مۆڵەت بدەن، یان نەدەن!

کە دەفەرموێ: ﴿بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ﴾، پاڵیداوەتە لای خۆیان، یانی: بە خراپتر لەوە بۆ ئێوە، ئەگەرنا ئەوەی کە بەسەریان دا خوێندراوەتەوە، خراپ نیە، تاکو دۆزەخ لەگەڵ ئەودا بەراورد بکرێ و بگوترێ: دۆزەخ خراپترە لە ئایەتەکان! نا، بەڵام بە نسبەت ئەوانەوە، ئەو ئایەتانەی کافرەکان بڕوایان پێ ناهێنن، بۆیان دەبێتە مایەی سزای ئاگری دۆزەخ و، ئەویش لەو پێناخۆشبوون ناڕەحەت بوونەی ئەوان خراپترە، کە لە دواڕۆژدا لەگەڵیدا دەستە و یەخە دەبن.

٨)- ﴿ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، ئەوەی بۆیان خراپترە: بریتیە لە ئاگر، ئاگری دۆزەخ، کە خوا بەڵێنی داوە بەوانەی بێبڕوان، ئاگری بۆ بەڵێن داون، گفتی ئاگری دۆزەخی پێ داون.

دیارە وشەی (وَعْد)، زیاتر بۆ خێر و خۆشیی بەکاردێ، بۆیە ئەمەش جۆرێکە لە گاڵتەپێکردن، هەروەک لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾﴾ آل عمران، دڵخۆشیان بکە و، موژدەیان پێ بدە بە ئازارێکی بە ئێش، واتە: ئەگەر شتێک هەبێ جێی دڵخۆشیی و، موژدەبێ بۆ ئەوان، هەر بریتیە لە سزا و ئازار.

٩)- ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾، خراپترین سەرەنجامیش ئاگری دۆزەخە، یانی: (سَاءَتْ نِهَايَتُكُم وَمَرْجِعُكُمْ)، خراپترین کۆتایی و دەرەنجام و خراپترین شوێن، کە ئێوە بۆ لای دەگەڕێنەوە، بریتیە لە ئاگری دۆزەخ.

## مەسەلەی سێیەم:

**وێنە هێنانەوە بە مێش، لەسەر بێدەستەڵاتیی پەستراوە ساختەکان، کە بە هەمووشیانەوە نە مێشێکیان پێ دروست دەکرێ، نە ئەگەر مێشیش شتێکیان لێ بستێنێ و بڕفێنێ، پێیان لێ دەستێندرێتەوە و، دەرباز دەکرێ، کەواتە: هاوبەش بۆ خوادانەران، وەک بۆ خوا شایستەیە قەدریان نەگرتوە و بەرزیی و مەزنییان بۆی بڕیار نەداوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ﴾، ئەی خەڵکینە! وێنەیەک هێنراوەتەوە، وێنەیەک باسکراوە، گوێی بۆ هەڵبخەن، ئەگەر فەرمووبای: (**فاسْمَعُوا**)، واتە: گوێ بگرن، بەڵام (فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ)، واتە: باش بە سەرنج دانەوە گوێی بۆ هەڵبخەن (**سَمْع**) لە زمانی کوردییدا بریتیە لە گوێگرتن (**سَمِعَهُ**)، یانی: گوێی بۆ گرت، بەڵام (**إسْتَمِعْ لَهُ**)، واتە: گوێی بۆ هەڵخست، بەپێی بنەمای: (**زِيَادَةُ المَبْنَى تَدُلُّ عَلَى زِيَادَةُ المَعْنى**)، ئەمە لە زمانی عەرەبییدا بنچینەیەکە: وشەیەک تاکو پیتەکانی زیاتر بن، ماناکەشی بەهێزتر دەبێ، (**سَمِعَهُ**): بیستی، بەڵام (**إسْتَمِعْ لَهُ**): باش گوێی بۆ هەڵخست، ئنجا خوا دەفەرموێ: وێنەیەک هێندراوەتەوە ئەی خەڵکینە! گوێی بۆ هەڵبخەن.

(ضَرْبُ المَثَـلِ: ذِكْـرُهُ وبَيانُـهُ؛ اسْـتُعِيرَ الـضَّرْبُ لِلْقَـوْلِ والذِّكْـرِ تَشْـبِيهًا بِوَضْـعِ الـشَّيْءِ بِشِـدَّةٍ، أيْ أُلْقِـيَ إلَيْكـم مَثَـلٌ، وَالْمَثَـلُ: شَـاعَ فِي تَشْـبِيهِ حَالَـةٍ بِحَالَـةٍ، وَقَـالَ صَاحِـبُ الْكَشَّـافِ: الْمَثَـلَ هُنَـا الصِّفَـةُ الغريبـة تَشْـبِيهاً لها بِبَعْـضِ الْأَمْثَـالِ السَّـائِرَةِ)[1]، (ضَرْبُ المَثَـلِ)، (ضَرْبُ)، یانـی: لێـدان، (المَثَلِ)یـش، یانـی: وێنـە، کەواتـە: (ضَرْبُ المَثَـلِ)، یانـی: باسـکردنی وێنەیـەک.

لێـرەدا وشـەی لێـدان (ضَرْب) خوازراوەتـەوە بـۆ گوتن و باسـکردن، وەک چۆن شـتێک بـە هێـزەوە لەسـەر شـتێک دادەنێـی، بۆیـە وشـەی (ضَرْب)، بـۆ باسـکردن و خسـتنەڕوو خوازراوەتـەوە، واتـە: وێنەیـەک بـۆ ئێـوە خراوەتـە ڕوو، فڕێـدراوە، سـەرنجی بـدەن، وشـەی (المَثَلِ)یـش، بـاوە کـە بەکاردەهێـنرێ بـۆ وێچواندنـی حاڵەتێـک بـە حاڵەتێـک، خاوەنـی تەفسـیری (الْكَشَّـافِ)، (الزمخـشري) ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ، دەڵـێ: وشـەی (الْمَثَـلَ)، لێـرەدا مەبەسـت پێـی سیفەتێکی سـەیرە کـە چوێنـدراوە بـە هەندێـک لـەو قسـانەوە کـە خەڵـک بـە دەمیانـەوە دەگـرن.

کـە ئەمـە بـە کوردیـی پێـی دەڵێـن: «پەنـدی پێشـینان»، واتـە: ئـەو وێنـە هێنانەوەیـە وەک پەندێـک بـووە خراوەتـە ڕوو، یـانی: ئـەو وێنەهێنانەوەیـە خـوا چواندوویەتـی، بـە پەنـدی پێشـینانەوە و وەک پەندێکـی لێهاتـوە.

ئنجا باسی پەندەکە دەکات:

٢)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، هەڵبەتە (تَدۡعُونَ)، خوێندراویشتەوە: (يَدْعُونَ)، ئەگەر (تَدۡعُونَ)، بێ، یانی: ئەی خەڵکینە! خەڵکە بێبڕوا و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان! ئەو شتانەی ئێوە، لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە و دەیانپەرستن، بەڵام ئەگەر (يَدْعُونَ) بێ، واتە: ئەی خەڵکینە! ئەوەی کە هاوبەش بۆ خوادانەر و بتپەرستەکان لێیان دەپاڕێنەوە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج١٧، ص٣٣٨.

٣)- ﴿ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا ﴾، ئەوانە هەموویان، هەموو پەرستراوەکان ناتوانن مێشێک دروست بکەن، هەرگیز مێشێکیان پێ دروست ناکرێ.

بۆیەش خوا وێنەی بە مێش (**ذباب**) هێناوەتەوە، چونکە:

١- مێش زیندەوەرێکی زۆر بچووکە.

٢- زیندەوەرێکیشە وا دیارە لە هەموو دنیادا هەیە و زیندەوەرێکی نێو نەتەوەییە، من چووم بۆ زۆر لە وڵاتانی دنیا، لە هەموویان کەم و زۆر مێشی لێ هەبووە.

٤)- ﴿ وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ ﴾، ئەو پەرستراوانەی لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوە، ئەگەر هەمووشیان خڕببنەوە و کۆببنەوە سەر یەک، ناتوانن مێشێک دروستبکەن.

٥)- ﴿ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ﴾، نەک هەر ناتوانن مێشێک دروست بکەن، بگرە ئەگەر مێشەکەش شتێکیان لێ بستێنێ، لێ بڕفێنێ، پێیان لێی قوتار ناکرێ و پێیان دەرباز ناکرێ.

(**سَلْب**)، بریتیە لەوەی بە تۆبزیی شتێک لە کەسێک بستێنی و بیڕفێنی.

﴿ لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ﴾، هەموو ئەو پەرستراوانە ناتوانن ئەو شتە فڕێندراو و دزراوە، لەو مێشە دەربازبکەن و لێی قوتاربکەن، (**وَالإِسْتِنْقَاذُ: مُبَالَغَةٌ فِي الْإِنْقَاذِ مِثْلُ الإِسْتِحْيَاءِ وَالإِسْتِجَابَةِ**)، (**الإِسْتِنْقَاذ**)، یانی: (**الْإِنْقَاذِ**)، بەڵام زێدەڕۆیی تێدا کراوە، وشەیەک کە پیتەکانی زیاد دەکرێن، ماناشی بە هێزتر دەبێ، (**أَنْقَذَهُ مِنْهُ**): لێی دەرباز کرد، (**إِسْتَنْقَذَهُ مِنْهُ**): بە قورسیی لێی دەرباز کرد، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ﴾ یانی: ئەگەر هەمووشیان خڕ بنەوە، هەموو پەرستراوەکان و زۆر بە جیددیی هەوڵیش بدەن، ئەو شتەیان لەو مێشە کە ڕفاندوویەتی و بردوویەتی، بۆ دەرباز ناکرێ.

٦)- ﴿ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ﴾، بە دواداچوو و داوالێکراو، یان: داوالێکەرو داوالێکراو، بێهێزن، داواکار بتەکانن، پەرستراوەکانن و، داواکراویش مێشەکەیە کە شتەکەی بردوە، هەردووکیان بێهێزن.

واتایەکی دیکەی ئەوەیە: ئەوانەی لەو پەرستراوانە دەپاڕێنەوە، کە ناتوانن مێشێک دروستبکەن و ئەگەر مێشێک شتێکیان لێ بستێنێ، ناتوانن لێی وەربگرنەوە و پێیان لێ ناستێندرێتەوە، ئا ئەوانەی لەو پەرستراوانە دەپاڕێنەوە، بێهێزن و، پەرستراوەکانیشیان هەر بێهێزن، کە داوایان لێ دەکرێ و پەنایان پێ دەبردرێ، هەردووک واتایەکەی هەن:

أ- دەگونجێ: مەبەست پێی ئەوانەبێ کە بە دوای مێشەکە دەکەون، کە شتەکەی لێ بستێننەوە، هەم ئەوان و هەم مێشەکەش بێ هێزە.

ب- یاخود مەبەست پێی ئەوانەبێ، کە جگە لە خوا دەپەرستن، کە هەم خۆشیان و هەم پەرستراوەکانیشیان بێهێزن لە بەرانبەر مێشێکیشدا.

٧)- ﴿ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ﴾، وەک بۆ خوا شایستەیە، ڕێزی خوایان نەگرتوە، پایەی بەرزی خوایان دەرک نەکردوە.

(**الْقَدْرُ: المِقْدَارُ، وَالْقَدْرُ: الْعَظَمَةُ وَالمَقَامُ وَالرُّتْبَةُ، أي: مَا عَظَّمُوهُ حَقَّ تَعْظِيْمِهِ**)، وشەی (قَدْر)، هەم بە مانای ئەندازە دێ، هەم بە مانای پێگە و پایە دێ، کەواتە: مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە: وەک بۆ خوا شایستەیە، بە بەرز و مەزنیان نەگرتوە.

٨)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا بەهێزی زاڵە، واتە: بەهێزە هەر مەبەستێکی بیەوێ دەیهێنێتە دی، زاڵیشە هەر کەسێک دژایەتیی بکات، پشتی دەشکێنێ، کەواتە: پەرستراوێکی ئاوا، تاکە پەرستراوی بە هەق و شایستەیە بۆ پەرستن، کە هەم بەهێزە و هەم زاڵە و هەموو سیفەتەکانی خوا ﷻ لەو پەڕی تەواوییدان و ڕەهاو بێ سنوورن.

وەک شایستەیە ڕێزی خوا نەگرتن، چییەوچۆنە؟

شایانی باسە ئەم ڕستەیە: ﴿ مَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ﴾، لە هەموو قورئاندا لە سێ شوێن دا هاتوە:

**١)**- لە سووڕەتی (**الأنعام**)دا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ﴿٩١﴾ ﴾، واتە: وەک بۆ خوا شایستەیە ڕێزی خوایان نەگرت، کە گوتیان: خوا هیچ شتێکی دانەبەزاندوە بۆ سەر هیچ بەندەیەک.

کەواتە: ئەوە بێ ڕێزییە بەرانبەر بە خوا، بگوترێ: خوا مرۆڤەکانی وێڵ کردون و پشتگوێی خستوون و، بەرنامەی بۆ دانەبەزاندوون، ئایا خوا عزوجل سیستم دابنێ بۆ گەردیلە و، کەهکەشان و، زیندەوەران و، بۆ بەڕێوە چوونی هەموو ژیانداران، بەرنامە دانانێ بۆ مرۆڤ کە شاگوڵی گەردوونە و، هەڵبژاردەی نێو دروستکراوەکانی خوایە؟ کەواتە: کەسێک بڵێ: خوا بەرنامەی دانەبەزاندوە بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤ لەسەر ئاستی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی، کە عەلمانیەت، سیکۆلاریزم وادەڵێ، ئەوە بێ ڕێزە بەرانبەر بە خوا و، قەدری خوا و پایەی بەرزی خوا نازانێ و، نازانێ خوا چەندە بەبەزەییە! چەندە بەلوتف و میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانیدا، کە هەرگیز وێڵیان ناکات، ئەو هەموو پێغەمبەرانەی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، ناردوون، ئەو هەموو کتێبانەی دابەزاندوون، تاکو کۆتا پێغەمبەری بە کۆتا کتێبی خۆیەوە ناردوە، کە موحەممەدە ﷺ و قورئانی بۆ ناردوە، موحەممەدی ﷺ ڕەوانەکردوە بۆ هەموو مرۆڤەکان، بۆ هەموو بەشەر و، قورئانی دابەزاندوە، وەک دوا پەیام و بەرنامەی خۆی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، ئیدی دەروازەی وەحیی گاڵە درا و، دەرگای پێغەمبەرایەتیی پێوەدرا و تەواو، چونکە قورئان بەشی هەموو مرۆڤایەتیی دەکات و، ڕێبازەکەی موحەممەدیش ﷺ کە بریتیە لە بەرجەستەکردنی قورئان، بەشی هەموو مرۆڤایەتیی دەکات، بۆیە لە دوای هاتنی موحەممەد ﷺ و، لە دوای دابەزێندرانی قورئان، پێویست بە نێردرانی هیچ پێغەمبەرێک و، دابەزێنرانی هیچ کتێبێک ناکات.

**٢)**- لە سووڕەتی (**الحج**)دا کە دەفەرموێ: ﴿ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ ﴿٧٤﴾ ﴾، واتە: کەسانێک کە جگە لە خوا دەپەرستن، ئەو پەرستراوانە لە بەرانبەر دروستکردنی مێشێکدا دەستەپاچەن، ئەگەر مێشێکیش شتێکیان لێ بستێنێ، لە بەرانبەریدا دەستەپاچە و

بێ دەستەڵاتن، ئەوانە وەک پێویست ڕێزی خوایان نەگرتوە، ئەگەرنا شتێکی ئاوا بێ دەستەڵاتیان نەدەپەرست و، واز لە پەرستنی خوای بە هەق بێنن.

٣)- لە سوورەتی (الزمر)دا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ﴿٦٧﴾﴾، وەک پێویست ڕێزی خوایان نەگرت، قەدری خوایان نەزانی، لە حاڵێکدا کە خوا هەموو زەوی لە چەنگ دەگرێ لە ڕۆژی دواییدا و، ئاسمانەکانیش دەپێچێتەوە و بەڕاستەی دەیانگرێ، کە ئەمە وێناکردنی دەستەڵاتی ڕەها و بێسنووری خوایە بۆ ئێمە، ئەگەرنا مەسەلە ئەوە نیە سیفەتی چەنگ (قبضة) بۆ خوا دابنێ و، سیفەتی بن هەنگڵی ڕاست بۆ خوا دابنێ، نا، بەڵکو یانی: وەک چۆن یەکێک لە ئێوە شتێک لە چەنگ بگرێ، مانای وایە بەسەریدا باڵادەست و بە دەسەڵاتە و کۆنتڕۆڵی کردوە، هەروەها کەسێک شتێک بپێچێتەوە و بیخاتە بن هەنگڵی، مانای وایە دەوری داوەو بە تەواویی خستوویەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، خوای پەروەردگاریش وەک زەوی لە چەنگ بگرێ و ئاسمانەکان بپێچێتەوە، ئەوەندە بە دەستەڵات و بە توانایە.

لێرەدا مەبەست پێی پێشاندانانی دەسەڵات و هەیمەنەی خوایە لە گەردووندا، بەسەرو خواریەوە و، بە ئاسمانەکان و زەوییەوە، ئەگەرنا بێگومان هەر سیفەتێک ئێمە دڵنیابین خوا وەک سیفەت بۆ خۆی بەکاری هێناوە و، هەر ناوێک کە خوا بۆ خۆی بەکاری هێناوە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ بەکورتیی: هەر سیفەت و ناوێک لە قورئان و سوننەتدا هاتبێ، ئێمەش بۆ خوای پەروەردگاری بەکاری دێنین، مادام بزانین خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستیان بووە، بەڵام جاری وایە بە پێی سیاق دەزانین، تەعبیرێک بەکارهاتوە، مەبەست ئەوە نیە، خوا باسی سیفەتێکی خۆی بکات، یان باسی ئەوە بکات ناوێک بۆ خۆی دابنێ، بەڵکو دەیەوێ ئێمە تێبگەیەنێ لە دەستەڵاتی خۆی، بۆ وێنە: کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ ﴿٤٢﴾﴾، لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کە سیفەتی (سَاقٍ)، بۆ خوا بڕیار بدرێ، چونکە وشەی (ساق) لە قورئاندا تەنیا لەو شوێنەدا هاتوە، بەڵام

ئەو سیفەتانەی خوا ﷻ کە لە قورئاندا بۆ خۆی بەکاری هێناون، چەندان جار دووبارە بوونەوە، بەڵام ئەو شێوە تەعبیرانەی، وەک:

أ- ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴿٤٨﴾﴾ الطور، تۆ بە چاوەکانی ئێمەی، یان: ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ ﴿٣٩﴾﴾ طه، بۆ ئەوەی لەسەر چاوی من دروست بکرێی، یانی: لە ژێر چاودێریی ئێمەدا، بۆیە لە شوێنێک بە (عَيْنِيٓ) هاتوە و لە شوێنێک بە (بِأَعْيُنِنَا).

ب- هەروەها وشەی (يَدْ)، لە شوێنێک بە (يَدْ)، هاتوە: ﴿يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴿١٠﴾﴾ الفتح، لە شوێنێک بە (أَيْدِي)ی هاتوە: ﴿عَمِلَتْ أَيْدِينَآ ﴿٧١﴾﴾ یس، کە مەبەست پێیان چاکە و دەستەڵاتی خواو، نیعمەتەکانی خوای پەروەردگارە، کە لە ژیانی بەشەردا هەن، هەروەها وشەی (بيديّ) لە ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴿٧٥﴾﴾ ص دا، مەبەست پێی بە گرنگیی و بایەخپێدانەوە دروستکردنی ئادەمە.

هەڵبەتە هەر سیفەتێک خوا بەکاری هێنابێ و دڵنیابین وەک سیفەت بەکارهاتوە، ئێمەش دەڵێین: ئەوە سیفەتێکی خوای پەروەردگارە، یان ناوێکی خوایە ﷻ بەو واتایە، کە خۆی یان پێغەمبەرەکەی ﷺ، مەبەستیان بووە.

**مەسەلەی چوارەم:**

**خـوا لـە فریشـتەکانیش و لـە مرۆڤەکانیـش، نوێنـەر و ڕەوانەکراوانـی خـۆی هەڵدەبژێـرێ و، خـوا بیسـەر و بینەریانـە و، خـوا داهاتـوو ڕابردوویشیان دەزانـێ و، کاروبارەکانیـش بـەس بـۆ لای وی دەگێڕدرێنـەوە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴿٧٥﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٧٦﴾ ﴾.

**شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:**

١)- ﴿ ٱللَّهُ يَصْطَفِي مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، خوا نوێنەران و ڕەوانەکراوان هەڵدەبژێرێ لە فریشتەکانیش و لە خەڵکیش، واتە: ئەوانەی خوا هەڵیاندەبژێرێ لە فریشتان و لە مرۆڤان، ئەوە خوا هەڵیاندەبژێرێ وەک نوێنەرانی خۆی، کە پەیامی ئەو بێنن، نەک بپەرسترێن و بکرێنە هاوبەش بۆ خوا.

٢)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴾، بە دڵنیایی خوا بیسەری بینەرە، واتە: هەموو شتێکیان لە بارەوە دەبیستێ، هەر شتێک بڵێن، دەیبیستێ و، هەر شتێک بکەن، دەیبینێ و هیچ شتێکی ئەوان و جگە لەوانی لێ پەنهان نیە.

٣)- ﴿ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾، ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیە دەیزانێ و، ئەوەی لە دواشیانەوەیە دەیزانێ.

ئەمە سێ واتای هەن:

أ- ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیە واتە: ئەوەی جارێ نەهاتوە و بەرەو ڕووی دەچن و داهاتوو (مستقبل)ە، ئەوەی لە دوایانەوەیە، یانی: بەجێیان هێشتوە و ڕابردوە ئەوە واتایەکی.

**ب-** واتایەکی دیکەی: ئەوەی لە پێش دەستیانەوەیە یانی: ئەوەی ئاشکرای دەکەن، ئەوەی لە پشتیانەوەیە، یانی: ئەوەی پەنهانی دەکەن.

**ج-** واتایەکی دیکەی: خوا هەموو شتێکیان لە بارەوە دەزانێ، چونکە ئینسان شتێک یان لە پێشیەوەیەتی، یان لە دواوەیەتی و، مەبەست پێی ئەوەیە: هەموو شتێکیان لە بارەوە دەزانێ.

**٤)-** ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾، کاروبارەکانیش تەنیا بۆ لای خوا دەگێڕدرێنەوە. لێرەدا کە (**الجارّ والمجرور**) ژێردارکەر و ژێردارکراو، (**الخافض والمَخْفُوض**)، پێشخراون، ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ﴾، نەیفەرمووە: (**تُرجَعُ الأمورُ إلى الله**)، ئەمە کورتهەڵێنان (**حَصْر**) دەگەیەنێ، یانی: کاروبارەکان تەنیا بۆ لای خوا دەگێڕرێنەوە، نەک بۆ لای جگە لەو، واتە: لە ڕۆژی دواییدا، تەنیا خوا هەمەکارەی جینن و مرۆڤە و، هەمەکارەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، بۆ سزا و پاداشت و بۆ دادوەریی لە بەیندا کردنیان.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**خوا دە (١٠) ئەرک و فەرمان و، پێنج ڕاستیی گەورە و گرنگ، بە بڕواداران دەفەرموێ، وەک دوا فەرمایشتی خۆی، لەم سوورەتە موبارەکەدا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٧٧﴾ وَجَٰهِدُواْ فِى ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ ۚ هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِى هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ ۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆزدە (١٩) بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! کە یەکەم جارە خوا بەمجۆرە بانگی بڕواداران بکات، واتە: لە هەموو سوورەتی (الحج)دا، یەک جار خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەویش لەم ئایەتە دایە، کە ئایەتی ژمارە (٧٧)ە، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، بە خوا ﷻ و بە فریشتەکانی و، بە کتێبەکانی و، بە پێغەمبەرەکانی (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) و، بە ڕۆژی دوایی و، بە هەموو ئەوەی کە پێغەمبەرانی خوا، هەواڵیان لە بارەوە داوە، کە یەکێک لەوانە بریتیە لە قەدەر، ئەویش ئەوەیە کە خوا ﷻ نەخشە و بەرنامەیەکی داناوە بۆ هەموو دروستکراوەکانی و، هیچ شتێک لەو نەخشە و بەرنامەیەی خوا بەدەر نیە.

شایانی باسە کە خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا، یەک جار بەم شێوەیە بانگی بڕواداران دەکات، ئنجا بە دوایدا، دە (١٠) ئەرک دەخاتەڕوو و، پێنج (٥) ڕاستییش ڕادەگەیەنێ، ئەگەر ئیمانیش بە یەکێک لە ئەرکەکان دابنێین، دە (١٠) ئەرک و پێنج ڕاستیی، دەبنە پازدە (١٥) واتە: بە دوای ئەم ڕستەیەدا، خوا دە

(١٠) ئەرك وەك ئەركی شەرعیی، دەخاتە سەر شانی مسوڵمانان و، پێنج ڕاستیی گەورە و گرنگیشیان بۆ دەخاتە ڕوو.

شایانی باسە: لەم سوورەتی (**الحج**)دا، چوار جاران ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾، هاتوە:

أ- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ١﴾.

ب- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٖ مِّنَ ٱلْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٖ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ... ٥﴾.

ج- ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمْ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ٤٩﴾.

د- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥٓ... ٧٣﴾.

ئەمەش ئەو بۆچوونە پشت ڕاست دەكاتەوە: كە ئەم سوورەتە، سوورەتێكی مەككەییە، بەڵام وەك نێوانێكی قورئانی مەككەیی و مەدینەییە، یەك جاریش ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، تێدا هاتوە، كە لە سوورەتە مەدینەییەكاندا دێ، یانی: ئەم سوورەتە موبارەكەی (**الحج**)، وەك دەروازەیەك بووە بەرەو، دەستپێكردنی قۆناغی مەدینە و، دابەزینی قورئانی مەدینەیی.

هەروەها لەم سوورەتەدا سێ جاریش (**ومن الناس**) هاتوە:

أ- ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَٰنٖ مَّرِيدٖ ٣﴾.

ب- ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ٨﴾.

ج- ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٖ... ١١﴾.

كە وەك پێشتریش گوتمان، لێرەدا خوا مرۆڤەكان پۆلێن دەكات بۆ چوار جۆرە مرۆڤ، كە لە درێژەی تەفسیركردن و ڕوونكردنەوەكاندا باسمان كردن.

١)- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! کەواتە: ئەرکی یەکەم، ئیمان هێنانە.

٢)- ﴿ ٱرْكَعُوا۟ ﴾ ڕکووع بەرن.

٣)- ﴿ وَٱسْجُدُوا۟ ﴾، هەروەها کڕنووش ببەن، کە بێگومان لێرەدا: ڕکووع و سەجدە بردن، مەبەست پێیان نوێژە، چونکە سەجدەی بە جیا هەیە، وەک سەجدەی قورئان خوێندن، بەڵام ڕکووع نیە بە تەنیا، ڕکووع تەنیا لە نێو نوێژدایە و، بە زۆریی وایە کە ڕکووع و سەجدەش پێکەوە دێن، مەبەست پێیان نوێژە، چونکە دوو پێکهێنەری سەرەکیی نوێژن و، لە ڕاستییدا ئەو ملکەچیی و بەندایەتیی و خۆ بچووک پیشاندانەی مرۆڤ لە بەرانبەر خوادا، کە لە ڕکووع و سەجدەدا هەیە، لە هیچ شتێکی دیکەدا نیە، هەر بۆیەش ڕکووع و سەجدە بۆ جگە لە خوا دروست نین.

کەواتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ڕکووع ببەن و سەجدە ببەن، (بۆ خوا ﷻ) ڕکووع و سەجدە دوو پێکهێنەری نوێژن، نوێژ: یەکێکە لە خواپەرستییەکان و تایبەتترین جۆری خواپەرستییە و چڵە پۆپەی خواپەرستییە، بەڵام خواپەرستیی تەنیا لە نوێژدا کورت هەڵنەهاتوە، هەروەک چۆن نوێژیش تەنیا لە ڕکووع و سەجدەدا کورت هەڵنەهاتوە، نوێژ وێڕای ڕکووع و سەجدە، تەحییاتیشی تێدایە و شتی دیکەشی تێدایە و، خواپەرستییش وێڕای نوێژ، ڕۆژووشی تێدایە، حەج و عومرەشی تێدایە، پاڕانەوەی تێدایە، ماڵ بەخشینی تێدایە، گیان بەخشینی تێدایە، کەواتە: بەگشتیی و فراوانیی پەروەردگارتان بپەرستن.

٤)- ﴿ وَٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾، پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، ئەمە گشتییە بۆ هەموو چالاکییەکیان، کە گرنگترینیان ڕازییکردنی خوای پەروەردگارە، لە چوار چێوەی شەریعەتی خوادا.

٥)- ﴿ وَٱفْعَلُوا۟ ٱلْخَيْرَ ﴾، ئەمەیان لەوەی پێشێش گشتییترە: هەروەها چاکە بکەن، چاکەکردن چ پەیوەندیی بە نێوان خۆتان و خواوە هەبێ، کە بریتیە لە بەندایەتیی بۆ خوا، چ

نوێژ، لە نێو نوێژیشدا، چ ڕکووع و سەجدە، چ جگە لە نوێژ و، جگە لە ڕکووع و سەجدە، چ هەموو پەرستشەکانی دیکە، چ پەیوەندیی بە نێوان مرۆڤەکان خۆیانەوە هەبێ، کە بریتیە لەو هەموو جموجۆڵ و چالاکییانەی کە کۆمەڵگا لە نێو خۆیدا، پێیان هەڵدەستێ، وەک: سوود بە یەکدی گەیاندن و، هاوکاریی یەکدی کردن، کەواتە: ﴿ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ ﴾، چاکە بکەن، چەمک و واتایەکەی گشتییترە لە: ﴿ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ ﴾، هەروەک چۆن ﴿ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ ﴾ چەمکەکەی گشتییترە لە: ﴿ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ ﴾

ئنجا ئایا بۆچی ڕکووع بۆ خوا ببەین و سەجدەی بۆ ببەین و، پەروەردگارمان بپەرستین و، چاکەکاریی بکەین؟

٦- ﴿ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، بەڵکو سەرفرازبن، وشەی: (بەڵکو) پەیوەستە بە کردەوەکانی ئێمەوە، واتە: ئومێد و هیوا وایە کە ئێوە ئەگەر نوێژکەری باش بن، ئەگەر خواپەرستی باش بن، ئەگەر چاکەکار بن لە کۆمەڵگادا، ئومێد و هیوا وایە، نیزیکە سەرفرازیی بە دەست بێنن، بە هۆی ئەو کردەوانەوە.

شایانی باسە: ئێرە لەسەر ڕای زۆرێک لە زانایان، شوێنی سەجدەی قورئان خوێندنە (**سجدة التِّلَاوَة**)، بەڵام لەبەر ئەوەی ئێمە لە کۆتایی سوورەتی (**الأعراف**) دا، قسەمان لە بارەی کڕنووش بردنەکانی قورئان خوێندن (**سجدات التلاوة**)ەوە کرد، لێرە دووبارەی ناکەینەوە، بە نسبەت ئەم شوێنەوە بە تایبەت، چەند ڕستەیەکی کورتی لە بارەوە دەڵێین:

هەر کام لە (**مالك وأبُو حنيفة والثوري**)، دەڵێن: ئێرە شوێنی کڕنووش بردن نیە، بۆیە ئەگەر کەسێک ئەم ئایەتە موبارەکەی خوێند و، کڕنووشی قورئان خوێندنی نەبرد، ئەوە مانای وایە پێشەوایەکەی (**مالك وأبو حنيفة وثوري**)ین، کە هەر سێکیان زانا و پێشەوا و موجتەهیدی گەورە بوون، بەڵام (**شافعي وأحمد وإسحاق وفقهاء المدينة**)، دەڵێن: ئێرە شوێنی کڕنووش بردنە، کەواتە: کەسێکیش کە کڕنووشی برد، ئەوە پێشەوایەکەی: (**شافعي وأحمد وإسحاق وفقهاء المدينة**) و ئەو

زانایانەی دیکەن، کە ڕایان وایە، ڕەحمەتی خوا لە هەموو پێشەوایانی ئیسلام و مسوڵمانان بێت.

٧)- ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ﴾، لە پێناوی خوادا، وەک بۆی شایستەیە، تێبکۆشن، کە دەفەرموێ: (حَقَّ جِهَادِهِۦ)، (**الحَقُّ: الْخَالِص أَي: جِهَاداً خَالِصاً لَا شَوْبَ فِيْه**)، واتە: تێکۆشانێکی ساغ کە خڵتەی پێوە نەبێت، دەشگونجێ ئاوا لێکبدرێتەوە: (**وَانْتُصِبَ حَقَّ جِهادِهِ عَلَى الْمَفْعُولِ الْمُطْلَق الْمُبَيِّنِ لِلنَّوْعِ، وَأَصْلُهُ: جِهَادُهُ الْحَقُّ**)، (حَقَّ جِهَادِهِۦ)، بەرکاری ڕەهای ڕوونکەرەوەی جۆرە، لە ئەصڵدا: (**جِهَادُهُ الْحَقُّ**)ە، یانی: ئەو هەوڵ و تێکۆشانەی کە ڕاست و چاکە بۆ خوا، ئاوا بۆی تێبکۆشن، کە دەفەرموێ: (فِي ٱللَّهِ)، (**فِي: للتعْلِيلِ، أَي: لِأَجْلِ اللَّهِ، لِأَجْلِ نَصْرِ دِينِهِ**)، لە پێناوی خوا و لە پێناوی سەرخستنی بەرنامەکەیدا، ئەمە وەک فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ:

{**دَخَلَتْ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ رَبَطَتْهَا، فَلَمْ تُطْعِمْهَا وَلَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الْأَرْضِ**} (**أخرجه البخاري: ٢٢٣٦، ومسلم: ٢٢٤٢، وابن حبان: ٥٤٦، عَنْ ابْنِ عُمَرَ** رضي الله عنه).

واتە: ئافرەتێک بە هۆی پشیلەیەکەوە چووە نێو ئاگر، حەپسی کرد خۆی خواردنی پێ نەدا و، بەریشی نەدا، بۆ خۆی شتێک بخوات. {تاکو لە برسان و لە لاوازییان دا مرد}، کە دەفەرموێ: (**دَخَلَتْ امْرَأَةٌ النَّارَ فِي هِرَّةٍ**)، (**فِي: أَيْ لِأَجْلِهَا**)، بە هۆی پشیلەیەکەوە چووە نێو ئاگر، کە سزای دا و، لە برسان مراندی و لە تینووان خنکاندی، بە هۆی ئەوەوە خوا ﷻ سزای دا، هەروەک لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار کراوە: (**أَإِنَّ لنا في البهائم أجراً؟ قال: نعم**) {**إنَّ لنا في البهائم أجراً**} **أخرجه البخاري: ٣٦٣٢، ومسلم: ٤٤٢٢**، ئایا لە ژیانداراندا پاداشت هەیە بۆ ئێمە؟ فەرموویەتی: بەڵێ، یانی: وەک چۆن بە هۆی ئازار گەیاندن بە ئاژەڵێکەوە، سزا هەیە، بە هۆی سوود پێگەیاندنیشی، پاداشت هەیە لە لایەن خوای بەبەزەییەوە.

لە بارەی جیهادەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦ﴾، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە: {**الْمُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ فِي طَاعَةِ اللَّهِ**}

(أخرجه أحمد ٢٤٠٠٤، والترمذي: ١٦٢١، وإبن حبان: ٤٦٢٤، والطبراني في الكبير: ٧٩٧)، (واته: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ:) تێکۆشەر کەسێکە لەگەڵ خۆیدا تێبکۆشیّ لە فەرمانبەریی خوادا.

واتە: لە پێناوی خوادا، لەگەڵ خۆیدا خەبات بکات و خۆی ماندوو بکات {خۆی بخاتە ژێر باری شەرع و لەسەر ڕێبازی شەرع بڕوات، بۆ ئەوەی خوا لێی ڕازی بیّ، ئەوە تێکۆشەری ڕاستەقینەیە}.

٨)- ﴿ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ ﴾، خوا ئێوەی هەڵبژاردوە، یانی: ئێوەی هەڵبژاردوە بۆ شوێنکەوتنی ئایین و بەرنامەکەی، بۆ شوێکەوتنی کۆتا کتێبی و، کۆتا پێغەمبەری کە موحەممەدە ﷺ، کەواتە: کاتێک خۆت لە نێو پەیڕەوانی قورئاندا دەبینی و، لە نێو شوێنکەوتووانی موحەممەد دا ﷺ دەبینی، تۆ زۆر بەختەوەری، زۆر دڵخۆشبە و شانازیی بە خۆتەوە بکە، کە خوا هەڵیبژاردووی و گوڵبژێری کردووی.

٩)- ﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖ ﴾، خوا لە ئاینیدا، هیچ سەغڵەتیی نەخستۆتە سەرتان، واتە: لەو ئایین و بەرنامەیەدا کە ناردوویەتی و، قورئان دەیگرێتە خۆی و، پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەرجەستەکراویی پێشانی داون، لەمیانی ڕێباز و سوننەتەکەیدا، ئا ئەو ئایینە، هیچ سەغڵەتییەکی تێدا دانەنراوە لە لایەن خواوە، واتە: هیچ شتێکی تێدانیە، سەغڵەت و نارەحەتتان بکات، چونکە: (**الْحَرَجُ: الضِّيقُ وَمَشَقَّةٌ لَا تُطَاقُ**)،(**حَرَجْ**) تەنگانەیەک و نارەحەتییەکە لە وزەدا نەبیّ، (**حَرِج**) و (**حَرَج**)یش: (**الْمَكَانُ الضَّيِّقُ، الْمَكَانُ كَثِيْرُ الشَّجَر**) (**حَرَج وحَرِجْ**) بە شوێنی تەنگەبەر دەگوتریّ و، شوێنێکیش داروبار و، درەختێکی پێکداچووی چڕ وپڕی لیّ بیّ، ئێمە ئێستا کورتە باسێکی تایبەت لە بارەی ئەوەوە دەکەین، کە خوا لە ئایینی خویدا مرۆڤەکانی سەغڵەت نەکردوە و، هیچ شتێکی سەغڵەتکەر و نارەحەتکەری دانەناوە.

## کورتە باسێک
## لە ئیسلامدا سەغڵەتکردن نیە

ئەگەر تەماشای ژمارەیەک لە ئایەتەکانی قوڕئان بکەین، ئەو ڕاستییە زۆر زۆر جوان دەدرەوشێننەوە، کە بە داخەوە زۆرجار مسوڵمانان بە هۆی تێنەگەیشتنیان لە قوڕئان و سوننەتەوە و، بە هۆی ئەوەوە کە بە پێی تەبعی خۆیان دەجووڵێنەوە، نەک بە پێی شەرعی خوا، تەبیعەت دەکەنە بەرنامەیان نەک شەریعەت، زۆرجار خۆشیان و خەڵکیش تووشی سەغڵەتیی دەکەن، بە تایبەت ئەوانەی کە ئیددیعای ئەوە دەکەن بە دوای پێشینەی چاک دەکەون و، لافی ئەوە لێدەدەن لە خەڵکی دیکە مسوڵمانترن!، چونکە هەر ئەو لاف لێدان و خۆ پەسندییە، بەدڵنیایی لە خودی خۆیدا ناشەرعییە، خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ۝٣٢﴾ النجم، واتە: خۆتان پێ چاک نەبێ، بە کردەوە خۆتان پێ چاک و پاک بکەن، بەڵام بە قسە خۆتان پێ پاک و چاک نەبێ، ئنجا هەموو ئەوانەی کە خۆیان لە خەڵکی پاک و چاکترە و، خەڵکی بە کەم تەماشادەکەن، هەر خودی ئەوە، ئەو لاف لێدانە، لە خۆیدا ناشەرعییە و، هەڵەیەکی کوشندەیە و گوناهێکی گەورە و خراپە دەیکەن، ئنجا بە تایبەت ئەو جۆرە کەسانە، هەم خۆ سەغڵەتکردن و، هەم خەڵک سەغڵەتکردنیشیان زۆر دەبێ، کەچی ئایەتەکانی قوڕئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ئەوەمان پێ دەڵێن، بۆ نموونە:

١- لە سووڕەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ۝١٨٥﴾ البقرة، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ و، سەغڵەتیی و زەحمەتی بۆتان ناوێ.

٢- لە سووڕەتی (النساء)دا: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: خوا دەیەوێ لەسەرتان سووک بکات.

٣- لە سووڕەتی (البقرة)دا: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴿٢٨٦﴾ ﴾، واتە: خوا لەسەر هیچ کەس پێویست ناکات، مەگەر ئەوەی لە توانایدا هەیە.

٤- لە سووڕەتی (الطَّلاق)دا: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ﴿٧﴾ ﴾، واتە: خوا لە سەر هیچ کەسێک شتێک پێویست ناکات، مەگەر بەوەندەی کە پێی داوە.

چەندەی پێداوە ئەوەندەشی لێ داوا دەکات.

٥- لە سووڕەتی (التغابن)دا: ﴿ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ مَا ٱسْتَطَعْتُمْ ﴿١٦﴾ ﴾، واتە: ئەوەندەی دەتوانن پارێزکاریی بکەن، یانی: ئەوەندەی دەتوانن و بۆتان دەکرێ و پێوەی سەغڵەت نابن.

٦- لە سووڕەتی (المائدة)دا: ﴿ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: خوا نایەوێ هیچ سەغڵەتییتان بخاتە سەر.

٧- لە سووڕەتی (البقرة)دا: ﴿ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ﴿٢٨٦﴾ ﴾، واتە: پەروەردگارمان! شتێکمان لێ بار مەکە، کە لە وزەماندا نیە.

٨- دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ کە لە هەموو کەس ئاشناتر بووە بە شێوەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە چوار چێوەی ماڵ و خێزاندا و، بە وردەکاریی خێزانیی، دەڵێ: {**مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ أَمْرَيْنِ إِلَّا أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْماً فإن كان إثماً كان أبعد الناس عنه**} (**أخرجه البخاري: ٣٥٦٠، ومسلم: ٢٣٢٧**)، واتە: پێغەمبەر ﷺ سەرپشک نەکراوە لە نێوان دوو کاراندا، مەگەر کامەی ئاسانترە ئەوەی هەڵبژاردوە، ئەگەر گوناه نەبووبێ، ئەگەر گوناهیش بووبێ لە هەموو کەس لێی دوورتر بووە، کەواتە: مسوڵمان نابێ هەر بە دوای قورسەکاندا بگەڕێ.

٩- هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزَائِمُهُ**}، (**أخرجه الطبراني في الكبير: ١١٨٨٠، والبزار: ٩٩٠، قال المنذري: إسناده حسن، وابن**

**حبان: ٣٥٤، وقال الهيثمي: رواه الطبراني في الكبير، والبزار، ورجال البزار ثقات، وكذلك رجال الطبراني)**، واتە: بێگومان خوا حەز دەکات مۆڵەتەکانی لێ وەربگیرێن، وەک چۆن حەز دەکات فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێن.

بەڵام ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئینسانی مسوڵمان ئارەقە بە دینداریییەوە ناکات؟ نەخێر بەڵکو ئارەقەشی پێوە دەکات و دەبێ خوێنیشی لە پێناودا برێژێ و، وڵاتی بۆ بەجێ بهێڵێ و، خەبات و فیداکاریی بکات، ماڵ ببەخشێ و گیان ببەخشێ، بەڵام لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا مرۆڤ سەغڵەت نابێ، واتە: وای لێنایەت بگاتە بنبەست و بۆی نەکرێ، چونکە هەر کاتێک سەغڵەتیی و گەیشتنە بن بەست هەبێ، ئیسلام ئاسانیی داناوە، بۆ وێنە:

أ- کورتکردنەوەی نوێژەکان: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا ۝١٠١﴾، واتە: ئەگەر بە ڕێیدا ڕۆیشتن (سەفەرتان کرد) گوناهتان ناگاتێ کە نوێژەکان کورتبکەنەوە، ئەگەر ترسان ئەوانەی بێبڕوان ئازارتان بدەن.

بەڵام کۆکردنەوەی نوێژەکان، نەک تەنیا لە سەفەر، بەڵکو لە ماڵێش، هەر ڕەوایە وەک لەم دەقەدا هاتوە:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ جَمَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ، فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ (فِي حَدِيثِ وَكِيعٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: لِمَ فَعَلَ ذَلِكَ؟ قَالَ: كَيْ لاَ يُحْرِجَ أُمَّتَهُ)} (أخرجه مسلم: ١٦٦٧).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و، شێوان و خەوتنانی لە مەدینەدا پێکەوە کۆکردنەوە، بەبێ ئەوەی ترس هەبێ و بارانیش هەبێ.

وەکیع دەڵێ: پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد، بۆچی وایکرد؟ گوتی: بۆ ئەوەی ئۆممەتەکەی سەغڵەت نەکات.

جاری وایە پێویستە دەکات ئەو دوو نوێژانە (نیوەڕۆ و ئێوارە) و (شێوان و خەوتنان) پێکەوە بکەی، بەڵام دەبێ ئەوە نەکرێ بە عادەت.

ب- هەروەها بابای ڕێبوار و نەخۆش، بۆیان هەیە لە ڕ ومەزان دا بە ڕۆژوو نەبن و، دوایی ڕۆژووە فەوتاوەکانیان بگرنەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴿١٨٤﴾ ﴾البقرة، مادام سەفەرەکەی درێژ بێ و، مایەی سەغڵەتکردنی بێ، هەروەها نەخۆشییەکەی وابێ، پێی سەغڵەت ببێ.

ج- هەروەها بۆ کەسێک کە نەتوانێ بە پێوە نوێژەکەی بکات، با بە دانیشتنەوە بیکات، یان لەسەرتەنیشت، یان بە ئاماژە بیکات، بۆی هەیە، پێغەمبەری ﷺ خوا لەوبارەوە فەرموویەتی: **(صلِّ قائماً، فإن لم تستطعْ فعلى جَنْبٍ) رواه البخاري: ١١١٧ عن عمران بن الحصين رضي الله عنه.**

واتە: بەپێوە نوێژ بکە، ئنجا ئەگەر نەتتوانی بەدانیشتنەوە، ئنجا ئەگەر نەتتوانی لەسەر تەنیشت.

د- ئەوانەی کە کوێرن، شەلن، بێهێزن، جەنگ و جیهادیان لەسەر نیە، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ﴿٩٥﴾ ﴾النساء، (أُولِي الضَّرَرِ)، کەواتە: ئەوانەی لە جەستەیاندا ناتەواوییەک هەیە، وەک: کوێریی، شەلیی، گۆجیی، بێهێزیی، ئەوە لە پاداشتەکەیان کەم نابێتەوە، مادام نیەتیان هەبێ، با بەکردەوە جەنگ و جیهادیش نەکەن.

ه- هەروەها ئەوە کە ئەگەر ئینسان بە هەڵەدا بچێ و ڕۆژوو پێش بخات یان دوا بخات، لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزاندا، بە جیاوازیی بینینی مانگی یەک شەوەو دوو شەوە، گوناهی ناگاتێ، ئەمە یەکدەنگیی زانایانی لەسەرە.

و- بە هۆی مسوڵمانبوون و تەوبەوە، ئینسان لە گوناهان دەرباز دەبێ و، بە هۆی طاعەت و چاکەوە، پاک دەبێتەوە، وەک پێغەمبەری ﷺ خوا فەرموویەتی: (**...أَما علمت**

**أن الإسلامَ يَهدِم ما كان قَبْلَهُ، وأَن الهجرة تَهدِمُ ما كان قبلها، وأَن الحجَّ يَهدِمُ ما كان قبلَه...) رواه مسلم: ١٢١، عن عمرو بن العاص.**

ز- بەهۆی بژاردنەوە ئینسان هەقی خەڵکی لەسەر لادەچێ.

ح- کاتێک ئینسان ئەرکێکی شەرعیی دەچوێنێ، دەتوانێ بیگێڕێتەوە، هەروەها زۆر شتی دیکەش، هەموویان ئەوە دەگەیەنن، کە ئێمە بە هۆی دینداریەوە سەغڵەت نابین.

١٠)- ﴿ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، واتە: ڕێبازی باباتان ئیبراهیم بگرن، یاخود لێرەدا (ک)ێک قرتێندراوە: (**كَمِلَّةِ أَبِيْكُمْ إبْرَاهِيْمَ**)، یانی: ئەو ڕیبازەی ئێوە لەسەرینی، وەک هەمان ڕێبازی باباتان ئیبراهیمە، (مِّلَّةَ) کە (**منصوب**)ە، یانی: (**إلزَمُوْا مِلَّةَ أَبِيْكُمْ إبْرَاهِيْمَ**)، واتە: ڕێبازی باباتان ئیبراهیم بگرن، یاخود (ك)ێک تەقدیر کراوە و قرتێنراوە: (**كَمِلَّةِ أَبِيْكُمْ إبْرَاهِيْمَ**)، ئنجا کە (ک) لادەچێ، (مِّلَّةَ) حاڵەتی (**نَصْب**) وەردەگرێ.

## واتای بابایەتیی ئیبراهیم :

لە بارەی فەرمایشتی خواوە: ﴿ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، واتە: ڕێبازی باباتان ئیبراهیم، ئایا مەبەست پێی چییە؟ چونکە ئەگەر دوێنراوەکان (**مخاطبین**) تەنیا عەرەب بن، ڕێی تێ دەچێ بڵێین: ئەو عەرەبانە هەموویان دەچنەوە سەر ئیبراهیم عليه السلام، بەڵام خوا سبحانه وتعالى بە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئێمەی دواندوە، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئنجا ئەو کاتە چ لە مەککە، کە ئەم سوورەتە مەککەییە و، چ لە مەدینە و چ دواتر، جگە لە عەرەبیش هاتوونە نێو بازنەی ئیمانەوە، هەروەها ئایا عەرەبیش هەموویان دەچنەوە سەر ئیبراهیم عليه السلام؟ چونکە عەرەب هەموویان ئیسماعیلیی نین!

کەواتە: نابێ لێرەدا مەبەست لە بابایەتیی (**أبوَّة**)ی ئیبراهیم بۆ ئێمە: ﴿ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، بابایەتیی ڕەچەڵەک (**نَسَب**) و خوێن و گۆشت بێ، بەڵکو مەبەست پێی حاڵەتی مەعنەوییە.

لێرەدا حەز دەکەم ئاماژە بکەم بە هەوڵێکی **(الشيخ محمد مُتَولِّي الشعراوي)**، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەیەوێ وەڵامی پرسیارێک بداتەوە کە لێرەدا دروست دەبێ، دەڵێ: ئەوە نیە خوا دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمۡ ٤٠﴾الأحزاب، واتە: موحەممەد بابی هیچ کام لە پیاوەکانتان نیە.

ئنجا کە موحەممەد ﷺ بابی ئێمە نەبێت، ئیبڕاهیمیش ناگونجێ بابی ئێمە بێ، یان بابی نەتەوەی عەرەب بێ!! **(الشيخ الشعراوي)**، ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەیەوێ ئەوە تەئویل بکات و دەڵێ:

**(مَا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَاً لأحَدِكُمْ، بَلْ هُوَ أَبٌ للْجَمِيْعِ، فَالْمَنْفِيُّ أَنْ يَكُوْن رَسُوْلُ اللهِ أَبَاً لِوَاحِدٍ، لَا أَنْ يَكُونَ أَبَاً لِجَمِيْعِ أُمَّتِهِ، وَقَالَ بَعْدَهَا: ﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ٤٠﴾الأحزاب، وَمَادَامَ رَسُولَ اللهِ، فَهُوَ أَبٌ لِلجَمِيْعِ، وَمَا دَامَتِ الأَزْوَاجُ أُمَّهَاتٍ، فَالْزَّوْجُ أَبٌ، وَبِنَاءً عَلَى هَذِهِ الصِّلَةَ، يَكُوْنَ إبْرَاهِيْم عليه السلام أَبَاً لأُمَّةِ الإِسْلَامِ، وَإِنْ كَانَ فِيْهِم مَنْ لَيْسَ مِنْ سُلَالَتِهِ).**

واتە: خوا کە دەفەرموێ: ﴿مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمۡ ٤٠﴾الأحزاب، یانی: موحەممەد ﷺ بابی هیچ کام لە پیاوانتان نیە بە تەنیا، ئنجا ئەوەی لێرەدا لابراوە، ئەوەیە کە بابی یەکێک بێ بە تەنیا، بەڵام بابی یەکێک نیە بە تەنیا، بەڵکو بابی هەموو ئوممەتەکەیەتی، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ٤٠﴾الأحزاب، بەڵام ڕەوانەکراوی خوا و کۆتایی پێغەمبەرانە، ئنجا مادام ڕەوانەکراوی خوا بێ، کەواتە: بابی هەموو لایەکە و، مادام هاوسەرانی پێغەمبەریش ﷺ دایکانی بڕواداران بن، کەواتە: هاوسەرەکەشیان (کە موحەممەدە ﷺ) بابیانە {مادام هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ دایکانی بڕواداران بن، خۆیشی بابیانە} ئنجا بە پێی ئەو پەیوەستییە، ئیبڕاهیمیش بابە بۆ ئوممەتی ئیسلام، هەرچەندە لە نێو ئوممەتی ئیسلامدا کەسانێکی زۆر هەن، کە لە وەچەی ئیبڕاهیم نین.

---

(١) الخواطر، أو تفسير الشعراوي: ج١٦، ص٩٩٥٢.

ئەمە قسەکەی (الشیخ الشعراوي)یە، ویستم وەک خۆی بیهێنم، بەڵام لە ڕاستییدا باشتر وایە و، ڕاستتر وایە بگوترێ: هەم بابایەتیی پێغەمبەری خاتەم (موحەممەد ﷺ)، کە خوای پەروەردگار ئەوەی نەفەرمووە، بەڵکو خوا لە قورئاندا بەس دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَأَزۡوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمۡ ٦ ﴾الأحزاب، واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ بڕواداران لە خۆیان بۆیان لە پێشترە (لە خۆیان لێیان نزیکترە) و، هاوسەرەکانیشی (ژنەکانیشی) دایکیانن.

تەنیا ئەوەندە دەفەرموێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ ٤٠ ﴾الأحزاب، بەدڵنیاییی مەبەست ئەوەیە کە بە زەیدی کوڕی حاریسەیان دەگوت: (**زيدُ بنُ مُحَمَّد**)، زەیدی کوڕی موحەممەد، ئنجا خوای زانا و توانا، ئەوە هەڵدەوەشێنێتەوە کە موحەممەد بابی هیچ کام لە پیاوانەکان نیە، بە تایبەت زەید، کە تاکە هاوەڵێک (خوا لێیان ڕازی بێ)، ناوی لە قورئاندا هاتبێ، زەیدە: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيۡدٞ مِّنۡهَا وَطَرٗا زَوَّجۡنَٰكَهَا ٣٧ ﴾الأحزاب، بەڵام هەم بە نسبەت پێغەمبەری خاتەمەوە (محمد) ﷺ، کە وەک گوتمان: خوا فەرموویەتی: هاوسەرەکانی دایکمانن، دایکی بڕوادارانن، هەم بە نسبەت ئیبراهیمی خەلیلەوە عليه السلام، کە دەفەرموێ: ﴿ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَ ﴾، مەبەست بابایەتیی مەعنەوییە، یانی: بابێک بۆ منداڵەکانی چۆنە، چەندە بە ڕەحم و میهرەبانە، چەندە بە سۆز و پەرۆشە بۆیان، ئیبراهیمیش عليه السلام بۆ ئێوە ئاوا بووە، ئەی مرۆڤەکان بە گشتیی! بەڵام ئەی بڕواداران! لە پێش هەموویانەوە، کە هەر ئێوە لەو پەیام و بەرنامە و، لە دڵسۆزیی و پەرۆشییەی ئیبراهیم بەهرەمەندن.

هەروەها موحەممەدیش ﷺ بە هەمان شێوە بۆ ئێمە لە بابمان لەگەڵمان بە ڕەحمترە، لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، لە هەندێ شتدا کە جێی لێ شەرمکردنە، ئامۆژگاریی هاوەڵانی کردوە، دوایی فەرموویەتی: (**إِنَّمَا أنا لكم بمنزلة الوالد**) أخرجه النسائي وصححه الألباني في صحيح سنن النسائي برقم: ٤٩.

واتە: من لە جێی بابتانم، یانی: وەک چۆن منداڵ، کوڕ و کچ شەرم لە بابیان ناکەن، لەو ڕووەوە ئەگەر شتێکی شەرعیی بێ، پێیان ڕابگەیەنێ، منیش وەک بابم بۆ ئێوە، بەڵام لە قورئاندا ئەوە نەهاتوە، کەواتە: لە جیاتی ئەو تەئویلەی شێخ (**الشعراوي**) کردوویەتی، باشتر وایە بڵێین: مەبەست لە بابایەتیی، بابایەتیی مەعنەوییە، ئەو کاتە ئیبڕاهیم بابی مەعنەویی هەموو بڕوادارانە، چونکە سیاقەکەش باسی بڕواداران دەکات بە گشتیی، نەک باسی نەتەوەی عەڕەب بە تایبەتی.

١١)- ﴿هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾، ئەو ناوی لێناون مسوڵمانان، ئەم ڕاناوە (**هو**) بۆ کێ دەچێتەوە؟ دەگونجێ بۆ خوا بچێتەوە، یانی: خوا ناوی لێناون مسوڵمانان، دەشگونجێ بۆ ئیبڕاهیم بچێتەوە، ئیبڕاهیم ناوی لێناون مسوڵمانان، بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە بۆ خوا دەچێتەوە، خوا ناوی لێناون مسوڵمانان، چونکە خوا ناوی لە ئیبڕاهیمیش ناوە (**مسلم**)، وەک دوایی باسی دەکەین.

ئایا لە کوێ ناوی لە ئێمە ناوە مسوڵمانان، بۆ خوا ملکەچان؟

١٢)- ﴿مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا﴾، لە پێشدا و لەمەش دا، لە کتێبەکانی پێشەوەدا، ناوی لەو بڕوادارانە ناوە کە بە دوای پێغەمبەراندا دەڕۆن: بۆ خوا ملکەچان، مسوڵمانان، هەروەها لەم قورئانەشدا هەر ئەو ناوەی لێناون و، وشەی مسوڵمانانی بۆ بەکارهێناون، (وَفِي هَٰذَا)، ئەم (**هذا**)، کە ناوی ئاماژەیە، بێگومان بۆ قورئان دەچێتەوە.

١٣)- ﴿لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ﴾، تاکو پێغەمبەر بەسەرتانەوە شایەد بێ، ئەم (ل)ی (لِيَكُونَ)، دەگەڕێتەوە بۆ: (هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ)، واتە: خوا ئێوەی هەڵبژاردوە، تاکو پێغەمبەر ﷺ شایەد بێ بەسەر ئێوەوە.

١٤)- ﴿وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾، هەروەها ئێوەش شایەد بن بەسەر خەڵکەوە، پێغەمبەر ﷺ بە لە خۆدا بەرجەستەکردنی قورئان و ئیسلام، شایەدە بەسەر ئێوەوە، کە ئایینی خوا تێر و تەواوە، بێ هەڵە و پەڵەیە، ئێوەش هەروا بکەن، وەک پێغەمبەری خوا

ﷺ ئیسلام و قورئان و سوننەت لە خۆتاندا بەرجەستە بکەن، لە ژیانی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسییتان دا، تاکو ئێوە شایەد و بەڵگەی ڕاستیی ئیسلام بن بەسەر کۆمەڵگا و بەسەر بەشەرییەتەوە، کە ئەها ئیسلام چەندە ڕاستە! چاو لە مسوڵمانان بکەن، چەندە ژیانێکی تێر و تەواو و ڕێک و ڕاست و هاوسەنگیان هەیە، لە هەموو ڕووەکانەوە لە پێشەوەن، کە بە تەئکید کاتێک مسوڵمانان پابەند بوون بە قورئان و سوننەتەوە وابوون، بەڵام ئایا ئێستا وان؟ بە دڵنیایی نەخێر، ئێستا لە جیاتی ئەوەی شایەد و بەڵگەی ڕاستیی ئیسلام بین بەسەر مرۆڤایەتییەوە، حاڵەکەمان پێچەوانەوە بۆتەوە، ئێستا ئەهلی کوفر حاڵی ناتەواو و بێ سەر و بەری مسوڵمانان، دەکەنە بەڵگە و شایەدی ناڕاستیی ئایینەکەیان، هەر بۆیە ئێمە زۆر گوناهبارین و دەبێ زۆر هەست بە شەرمەزاریی بکەین لە بەرانبەر خوا و ئیسلامدا، کە بارودۆخەکەمان وایە لە جیاتی ئەوەی بەڵگە و شایەدی ئیسلام بین بەسەر خەڵکەوە، بووینە بیانووی بەرەو کوفر و بێ دینیی چوونی خەڵک، بەسەر ئیسلامەوە، کە خەڵک لە ئیسلام لابدات و بڵێ: مسوڵمانانێک ئاوا بن، دیارە خەتای ئایینەکەیانە! کە ئەوەش بێگومان ستەمە: بێ سەر وبەریی مسوڵمانان بکرێتە بیانوو پاساوی دوورکەوتنەوە لە ئیسلام و، بکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئیسلام ناڕاستە! چونکە مسوڵمانان کاتێک واقیعەکەیان دەکرێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی داخۆ ئیسلام چۆنە؟ کە پابەند بن بە ئیسلامەوە، بەڵام وەختێک لە ئیسلام لایانداوە، کاتێک ئیسلام دەڵێ: یەک بن و، ئەوان پارچە پارچەن، کاتێک ئیسلام دەڵێ: بە دوای قورئان و سوننەت و شەریعەت بکەون و، ئەوان کەوتوونە دوای ڕێچکە و بیردۆزەکان، کاتێک خوا دەفەرموێ: تەنیا وەحیی خوا پارێزراوە لە هەڵە، بەڵام ئەوان قسە و ئیجتیهاد و بۆچوونی زانایانیان لە خۆیان کردۆتە ئایین و لە جێی قورئان و سوننەتیان داناون و، زۆر شتی دیکەش، لە حاڵێکی وادا، دیارە ماڵی قەڵپ سەر بە خاوەنیەتی، مسوڵمانان هەڵەکانیان هەموو هی خۆیانن، لە ئاینەکەیاندا نەهاتوون، بەڵکو لە لادانیان لە ئاینەکەیانەوە، لە بەجێمانیان لە ئاینەکەیانەوە، هەڵە و پەڵەکانیان تێدا پەیدا بوون.

١٥)- ﴿فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، ئنجا نوێژ بەرپا بکەن.

١٦)- ﴿ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، هەروەها زەكات بدەن.

١٧)- ﴿ وَٱعْتَصِمُواْ بِٱللَّهِ ﴾، خۆشتان بە خوا بپارێزن، توند دەست بە ئایین و بەرنامەی خواوە بگرن.

١٨)- ﴿ هُوَ مَوْلَىٰكُمْ ﴾، هەر خوا سەرپەرشتیار و هاوكارتانە.

١٩)- ﴿ فَنِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴾ خوا باشترین سەرپەشتیارتانە و، باشترین یارمەتییدەر و پشتیوانتانە.

كەواتە: دە (١٠) ئەركەكان، كە ئەو دوو ئایەتە گرتوویاننە خۆیان:

١- ئیمان.

٢- ڕكووع بردن.

٣- كڕنووش بردن.

٤- پەرستنی خوا بە گشتیی.

٥- كردار چاكیی بە گشتیی.

٦- تێكۆشان لە پێناوی خوادا، وەك بۆ خوا شایستەیە.

٧- شایەدیی دان بەسەر خەڵكەوە و، بەڵگەبوون لەسەر خەڵك كە ئیسلام ڕاستە.

٨- بەرپاكردنی نوێژ، واتە: هەق پێدانی و ئەنجامدانی بەو شێوەیەی خوا فەرمانی پێكردوە.

٩- زەكات دان.

نوێژ، پایەی دینداریی مەعنەوییە، زەكاتیش پایەی ئابوویی و ماددییەتی.

١٠- دەست بە خواوە گرتن و خۆ بە خوا پاراستن، خۆ بە ڕێسمانی خوا پاراستن لە كەوتن و خلیسكان و ترازان بەملاو لادا.

## پێنج ڕاستییەكان:

١- سەرفرازیی بەرهەم و میوەی فەرمانبەریی كردنە بۆ خوا.

٢- خوا ئێمەی گوڵبژێر كردوە و، لە كاتێكدا ئێمە شوێن پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەكەوین، ئێمە هەڵبژاردەی لای خواین، بەڵام بە ئەندازەی پابەندییمان بە قوڕئان و بە ڕێبازی پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەو سیفەتی هەڵبژێردراوەییەمان تێدا بەرجەستە دەبێ، نەك هەر لە گۆترە.

٣- ئایین و بەرنامەی خوا، هیچ شتێكی سەغڵەتكەری تێدا نیە، سەغڵەت و ناڕەحەتت ناكات و وات لێناكات بۆت نەكرێ، نەك ئارەقەی پێوە نەكەی و پێوەی ماندووبەبی.

٤- ئەم ئایین و دینداریەی ئێمە، هەمان ڕێبازە كە بابمان ئیبراهیم ﷺ لەسەری بووە.

٥- ئێمە ناومان مسوڵمانە و، هیچ ناوێكی دیكەمان نیە، جگە لە ناوی مسوڵمانەتیی.

## کورتە باسێک
## ناوی جگە لە (مسوڵمانان) لە ئێمە نەنراوە

ئێمە تاکە ناو و نازناوێک پێی ناسرابین، هەم لە کتێبە پێشووەکاندا، هەم لەم قورئانەدا، بریتیە لە ناوی مسوڵمانان (**مُسْلمین**)، ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، هەر کام لە (نووح و ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و مووسا و هاروون و یوسوف)، هەموو ئەو پێغەمبەرانەی دیکەش (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، وشەی (**مُسْلِم**)یان بۆ خۆیان بەکارهێناوە، بۆ وێنە:

١- نووح ﷺ لە سوورەتی (**یونس**)دا دەفەرمویٚ: ﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى اللَّهِ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴿٧٢﴾ ﴾... فەرمانیشم پێکراوە کە لە مسوڵمانان بم، وشەی (**مُسْلِم**)، یانی ملکەچ بۆ خوا، (**مُسلمین**)، واتە: ملکەچان.

٢- لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەربارەی ئیبراهیم ﷺ دەفەرمویٚ: ﴿ رَبَّنَا وَاجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَا أُمَّةً مُّسْلِمَةً لَّكَ ﴿١٢٨﴾ ﴾، ئیبراهیم دوای ئەوەی کەعبە بنیات دەنێن لەگەڵ ئیسماعیلی کوڕیدا دەپاڕێتەوە، دەڵێ: پەروەردگارمان! من و ئەو کوڕەم بکە بە دوو مسوڵمان، دوو ملکەچ بۆ خۆت، لە وەچەکەشمان کۆمەڵێکی ملکەچ بۆ خۆت بڕەخسێنە و فەراهەم بێنە.

٣- هەروەها مووساش ﷺ وشەی (**مُسْلِم**)، بەکارهێناوە، لە سوورەتی (**یونس**)دا دەفەرمویٚ: ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ يَا قَوْمِ إِن كُنتُمْ آمَنتُم بِاللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوا إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾، مووسا ﷺ گوتی: ئەی گەلەکەم! ئەگەر بڕواتان بە خوا هێناوە، پشت بە خوا ببەستن، ئەگەر مسوڵمانن و بۆ خوا ملکەچن.

٤- هەروەها یوسوف عليه السلام لە سوورەتی (**یوسف**)دا دەفەرمویٚ: ﴿رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾﴾، ... بە مسوڵمانەتیی بمرێنە و پەیوەستم بکە بە چاکەکارانەوە.

٥- هەروەها هەر کام لە ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، وشەی (**مسلمون**)یان بۆ خۆیان بەکارهێناوە، وەک لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرموێ: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ ٱلْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِنۢ بَعْدِي قَالُوا۟ نَعْبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبْرَٰهِۦمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿١٣٣﴾﴾، واتە: یان ئایا ئێوە ئامادەبوون کاتێک کە مردن گەیشتە سەر یەعقووب، کاتێک کە بە کوڕەکانی گوت: لە دوای من (کێ دەپەرستن؟) چی دەپەرستن؟ گوتیان: پەرستراوی تۆ و پەرستراوی باب و باپیرانی تۆ دەپەرستین، ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق، یەک پەرستراوە (هیچ هاوبەشی نین) و، ئێمە بۆ وی ملکەچین[1].

وەک کۆتا قسە لەو بارەوە، ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، کە دەفەرموێ: {**مَنْ دَعَى بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ، فَإِنَّهُ مِنْ جُثَا جَهَنَّمَ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ؟ قَالَ: وَإِنْ صَلَّى وَصَامَ، فَادْعُوا بِدَعْوَى اللهِ الَّذِي سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ الْمُؤْمِنِينَ، عِبَادَ اللهِ**} (**أخرجه أحمد: ١٧٢٠٩، والترمذي: ٢٨٦٣، وابن خزيمة: ٩٣٠، وابن حبان: ٦٢٣٣، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح**).

واتە: هەر کەسێک بانگەوازی نەفامیی بکات، (بانگەشە بکات بۆ دروشمی غەیری ئیسلام) ئەوە لەوانەیە کە لە دۆزەخدا لەسەر ئەژنۆیان دەکەون، (یاخود لەوانە کە لە دۆزەخدا کۆدەکرێنەوە لەسەر یەک)، پیاوێک گوتی:

---

(١) ئێمە لە کتێبی دووەمی: مەوسووعەی: (بیرکردنەوەی ئیسلامیی لە نێوان وەحیی و واقیعدا) بە ناوونیشانی: (هێڵە گشتییەکانی جەماوەری مسوڵمانان) بە درێژیی لەو بارەوە دواوین.

ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەگەر ئەو کەسە نوێژیش بکات و بە ڕۆژووش بێت؟ فەرمووی: ئەگەر نوێژیش بکات و بە ڕۆژیش بێ، ئێوە تەنیا بە پەیام و بانگەوازی خوا بانگ بکەن، کە خوا ناوی لە ئێوە ناوەمسوڵمانان، بڕواداران، بەندەکانی خوا.

واتە: هیچ ناوو دروشمێکی دیکە بەکارمەهێنن، بۆ ئەوەی نەبنە خەڵووز و ڕەژووی دۆزەخ و، لە دۆزەخدا خڕ نەکرێنەوە سەر یەک.

خوا پەنامان بدات لەوە کە بچینە ژێر چەتر و بەیداغی جگە لە ئیسلامەوە و، خوا پەنامان بدات لەوە کە بە دوای جگە لە ڕێبازی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمُ**) بکەوین، بە تایبەتیی دۆست و نیزیکی خوا (**خليل الله**)، ئیبراهیم عليه السلام بابی ئیمانداران و، موحەممەد ﷺ سەروەری هەموو پێغەمبەران، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی سەرەنجاممان خێر بکات و بە ئیسلامەوە بمانژێنێت و، بە ئیمانەوە بمان مرێنێت و، سەر بەرزانە لە ژێر بەیداغ و چەتری پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ کۆمانبکاتەوە و، بە بەهەشتی خۆی و ڕەزامەندیی خۆی شادمان بکات.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک
## پێناسەی سووڕەتی (المؤمنون) و بابەتەکانی

بەڕێـــزان!

خـوا پشـتیوان بـێ، ئەمـڕۆ کـە (٧)ی مانگـی ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٤٠)ی کۆچییـە، بەرانبــەر (٢٠١٩/٥/١٢)ی زایینــی، دەســت دەکەیــن بــە تەفســیرکردنی ســووڕەتی **(المؤمنــون)**.

ســەرەتا وەک عــادەتی خۆمــان، تیشــک دەخەینــە ســەر ســووڕەتی **(المؤمنــون)**، لـە هەمـوو ئـەو ڕووانـەوە کـە پێویسـتە شـارەزایی گشـتیی وردمـان لـە بارەیانـەوە هەبێ، لـە حـەوت (٧) بڕگـەدا پێناسـەی ئـەم سـووڕەتە دەکەیـن و، نێوەڕۆکـەکـەشی دەخەینـە ڕوو:

### یەکەم: ناوی:

ئەم سووڕەتە چەند ناوێکی هەن:

١- باوترین ناوی (**سُورَةُ المؤمنون**)ە.

٢- بەڵام ناوێکی دیکەشی (**سُورَةُ قَدْ أَفلَحَ**)یە.

٣- ناوێکی دیکەی: (**سُورَةُ الفَلاَح**)ە.

٤- هەروەها (**سُورَةُ المؤمِنِين**)یشی پێگوتراوە، بە پاڵدانی سووڕەت بۆ لای ئیمانداران.

بـا لـەو بـارەوە تەماشـای ئەم دەقـە بکەین کە لە ڕووی سـەنەدەوە هەڵمبـژاردووەو، لـە ڕێیەکی ڕاسـت (**صحیح**)ەوە پێمان گەیشـتوە:

{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ رضي الله عنه، قَالَ صَلَّى لَنَا النَّبِيُّ ﷺ الصُّبْحَ بِمَكَّةَ، فَاسْتَفْتَحَ سُورَةَ الْمُؤْمِنِينَ، حَتَّى جَاءَ ذِكْرُ مُوسَى وَهَارُونَ أَوْ ذِكْرُ عِيسَى، أَخَذَتِ النَّبِيَّ ﷺ سَعْلَةٌ، فَحَذَفَ فَرَكَعَ} (**أَخْرَجَهُ عبد الرزاق: ٢٦٦٧، ومسلم برقم ٤٥٥، وأبو داود: ٦٤٩، والسائي في الكبرى: ١٠٧٩**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سائیب خوا لێی ڕازی بێ، (کە یەکێکە لە هاوەڵان) دەڵێ: ڕۆژێک پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەیانی پێکردین لە مەککە، سوورەتی (**المؤمنون**)ی دەست پێ کرد، هەتا گەیشتە باسی مووساو هاڕوون (**علَيهِما السَّلام**)، یاخود باسی عیسا ؈، پێغەمبەری خوا ﷺ کۆکەی هاتێ، بۆیە ئایەتەکانی قرتاند، (واتە: لەوێ وەستاو) چووە ڕکووع، (لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی بە بەردەوام بوون لەسەر کۆکەکەی، قوڕئانەکە بخوێنێ).

## دووەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

سوورەتی (**المؤمنون**) لە موصحەفدا، واتە: لەو موصحەفانەی کە لەبەر دەستمانن و، قوڕئانیان گرتۆتە نێو خۆیان، ژمارەی (٢٣)ی هەیە، واتە: بیست و سێیەمین سوورەتە، لە سوورەتی (**الفاتحة**)ەوە تێپەڕە بە (**البقرة**)و، (**آل عمران**) و، (**النساء**) و، (**المائدة**) ... هتددا، تاکو دەگاتە ئێرە، ژمارەی (٢٣)ی هەیە، بەڵام لە ڕیزبەندیی دابەزین (**تَرتِيب النُّزُول**)دا، بەلای زۆرێک لە زانایانەوە، ژمارەی (٧٦)ی هەیەو، دوای سوورەتی (**الطور**) و، پێش سوورەتی (الملک) دابەزیوە.

هەڵبەتە دەشگونجێ هەندێکی دیکە لە زانایان بڵێن: نەخێر (٧٦)ەمین سوورەت نیە، لە ڕیزبەندیی دابەزیندا، بەڵکو هەشتایەمینە، یاخود حەفتایەمینە، ئەوە ڕاجیایی زانایانی لەسەرە، چونکە زانایان بە مەزەندەو ئیجتیهادو بۆچوونی خۆیان، ڕیزبەندیی دابەزینی سوورەتەکانیان دیاریی کردوە.

## سێیەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە سـوورەتێکی مەککەییـەو، هەمان نێوەڕۆکـی سـوورەتە مەککەییەکانی دیکـەی هەیـە، لـە ناسـاندنی خـوای بـەرزو مـەزن ﷻ، لەمیـانی سیفەت و کـردەوەکانی داو، پێناسـە کـردنی بـڕوادارانی خواپەرسـت و، پاداشـتی چاوەڕوانکـراوی خـوا ﷻ بـۆ بـڕواداران، بـە پیـاوو ئافرەتـەوە لـە ڕۆژی دوایـی دا، پاشـان بـاسی بێبڕوایـان بـە گشـتیی، بـە تایبـەت بێبڕوایـانی هاوبـەش بـۆ خوادانـەرو، نکووڵییکـەر لـە زینـدوو کرانـەوەو، هەبـووونی سـزاو پاداشـت، واتـە: لـەو سـزایەی کـە لـە دواڕۆژدا چاوەڕێیانـە، ئەگـەر هـەر لەسـەر بێبڕوایـی و شـیرکی خۆیـان بـەردەوام بـن.

هەروەهـا بەسـەرهاتی پێغەمبـەرانی خوا (**عَلَيهِـمُ الصَّلاةُ وَالسَّـلاَم**)و، ناحەزەکانیان و، بـاسی دیـاردە سروشـتییەکان، وەک نیشـانەی پەروەردگارێتیـی خـوا ﷻ، کـە هەمیشـە خـوا دیـاردە سروشـتییەکان، دیمەنـە سـەرنج ڕاکێشـەکانی گـەردوون و بوونـەوەرو دەوروبـەر بـە نیشـانەکان (**آيـات**)، نـاو دەبـات، پاشـان بـاسی ڕووداوەکانی ئاخیـر زەمـان و قیامـەت و، ئـەوەی لـەو ڕۆژە مەزنـەدا دەگـوزەرێ، چ بـۆ ئەهـلی ئیـمان، چ بـۆ ئەهـلی کوفـرو لادان و تـاوان.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە بە یەکدەنگیی ژمێرەرانی ئایەتەکانی قوڕئان (١١٨)یە.

## پێنجەم: پێگەو گرنگیی ئەم سوورەتە:

لەو بارەوەش سێ دەق دێنین:

**١)- {عَن أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَال: لَمَّا خَلَقَ اللَّهُ جَنَّةَ عَدْنٍ، وَغَرَسَ أَشْجَارَهَا بِيَدِهِ، قَالَ لَهَا: تَكَلَّمِي، فَقَالَتْ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾﴾} (أَخْرَجَهُ الحَاكم: ٣٤٨٠، وقال:**

هذا حديث صحيح الإسناد و لم يخرجاه، وَالطَّبَرَاني فـي الكَبِير: ١١٤٣٢، وفـي الأوسط: ٧٣٨، قَالَ الهيثمي: أَحَدُ إِسْنَاد الطَبَرَانِي فـي الأَوسَطِ جَيِّد، وَذَكَرَه الألباني فـي ضعيف الجامع الصغير ج٣، ص٢٨٤١ وقال: ضعيف).

واتـە: ئەنـەسی کـوڕی مالیـک (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ دەگێڕێتـەوە، کـە فەرموویـەتی: کاتێـک خـوا بەهەشـتی هەمیشـەیی دروسـت کـردو، بـە دەسـتی خـۆی درەختـەکانی تێـدا ناشـتن، پێـی فەرمـوو: قسـە بکـە (بـدوێ)، بەهەشـتیش گـوتی: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ۝١﴾، بەڕاسـتیی بـڕوادران و سـەرفرازن و بەختـەوەرن، بـە ئـاکام و مـرادی خـۆ گەیشـتوون.

٢)- {عَن عُمَرَ بنِ الخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنهُ، يَقُولُ: كَانَ إِذَا نَزَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْوَحْيُ نَسْمَعُ عِنْدَ وَجْهِهِ كَدَوِيِّ النَّحْلِ، فَمَكَثْنَا سَاعَةً، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ وَرَفَعَ يَدَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ زِدْنَا وَلا تَنْقُصْنَا، وَأَكْرِمْنَا وَلا تُهِنَّا وأَعْطِنا وَلا تَحْرِمْنَا، وَآثِرْنَا وَلا تُؤْثِرْ عَلَيْنَا، وَارْضَ عَنَّا، ثُمَّ قَالَ: لَقَدْ أُنْزِلَ عَلَيْنَا عَشْرُ آيَاتٍ مَنْ أَقَامَهُنَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ، ثُمَّ قَرَأَ: قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ عَشْرَ آيَاتٍ} (أخرجه أحمد برقم: ٢٢٣، والترمذي برقم: ٣١٧٣، وقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، والنسائي فـي الكبرى برقم: ١٤٣٩، والحاكم برقم: ٣٤٧٩، وقال: صحيح الإسناد، وأخرجه أيضاً: عبد بن حميد: ١٥، والبزار: ٣٠١).

واتـە: عومـەری کـوڕی خەتتـاب (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ کـە وەحیـی دادەبەزیـە سـەر، لـە لای ڕوویـەوە وەک دەنگـی هەنـگ دەبیسـترا، (گرمـە گرمـی وەک دەنگـی ، پۆلـە هەنگێـک کـە بفـڕن و دەنگیـان بـێ)، ڕۆژێـک قورئـانی بـۆ دابـەزی ئێمـەش ماوەیـەک بـێ دەنـگ بوویـن و، ماینـەوە، هەتـا حاڵەتەکـەی لـێ لاچـوو[1]، دوای ئـەوەی حاڵەتەکـەی بەسـەر چـوو، ڕووی کـردە قیبلـەو هـەردووک

---

(١) چونکـە پێغەمبـەر ﷺ وەک لـە دەقـی دیکـەی سـوننەتدا هاتـوە، کاتێـک کـە وەحیـی بـۆ دادەبـەزی جۆرێـک لـە حاڵـەتی نائاسـایی ڕووی تێدەکـرد، حاڵەتێـک کـە نەدەگونجـا خەڵکـی دیکە لـەو کاتـەدا قسـەی لەگەڵـدا بـکات، دەچـووە حاڵەتێکـی ڕووحیـی تایبەتـەوە، لـە ڕۆژی سـەرمای زسـتاندا، زەنگـوڵ زەنگـوڵ ئارەقـەی پێـدا دەهـات، زەیـدی کـوڕی سـابیت خـوا لێـی ڕازی بـێ

دەستی بەرز کردنەوەو، پاڕایەوەو فەرمووی: ئەی خوایە! بۆمان زیادبکەو لێمان کەم مەکە، ڕێزمان بگرەو سووکمان مەکە، پێمان ببەخشەو بێ بەشمان مەکە، ئێمە هەڵبژێرە بەسەر خەڵکداو، خەڵکمان بەسەردا هەڵمەبژێرە، ڕازیمانبکەو لێمان ڕازیبە، دوایی فەرمووی: دە (١٠) ئایەتم بۆ دابەزیون هەر کەسێک جێبەجێیان بکات، دەچێتە بەهەشت، ئنجا خوێندیەوە: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١﴾، هەتاکو دە (١٠) ئایەتەکەی تەواو کردن.

**٣)- {عَنْ أَبِي عِمْرَانَ، قَالَ: قُلْنَا لِعَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ! كَيْفَ كَانَ خُلُقُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: «كَانَ خُلُقُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْقُرْآنُ»، ثُمَّ قَالَتْ: تَقْرَؤُونَ سُورَةَ الْمُؤْمِنِينَ؟ اقْرَؤُوا: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١﴾، حَتَّى بَلَغَ عَشْرَ آيَاتٍ، فَقَالَتْ: هَكَذَا كَانَ خُلُقُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ} (أَخرَجَهُ النَّسَائِي فِي الكُبرى: ١١٣٥٠، وَالحاكم: ٣٤٨١، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ).**

واتە: ئەبوو عیمڕان دەڵێ: گوتمانە: عائیشە (خوا لێی ڕازیبێ) ئەی دایکی بڕواداران! ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺو هەڵسوکەوتی چۆن بوو؟ گوتی: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان بوو، دوایی گوتی: سوورەتی (**المؤمنون**) دەخوێننەوە؟ (گوتوویانە: بەڵێ)، گوتی: بیخوێننەوە.

﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١﴾، هەتا گەیشتە دە ئایەت، گوتی: ئەوە ڕەوشتی پێغەمبەر بوو ﷺ، هەرچی خوا فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ کردوویەتی.

بۆیەش ناگوترێ: (**سُورَةِ المُؤمِنِين**)، هەرچەندە لە زمانی هاوەڵانەوە ئەوە گوتراوەو ئەوەش یەکێکە لە ناوەکان، بەڵام کە لە موصحەفدا کە نووسراوە: (**سُورَةُ المُؤمِنُون**)، یان نووسراوە (**المُؤمِنُون**)، بۆیە ناگوترێ: (**سُورَةِ المُؤمِنِين**)، تاکو وشەی (**مُؤمِنِين**)، ببێتە پاڵوەلادراو، (**مُضَافُ إِلَيهِ**)، چونکە (**المُؤمِنُون**)، ناوی عەلەمی ئەم سوورەتەیە، ئەگەرنا لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە دەبێ بڵێین: (**سُورَةَ**

---

دەڵێ: جارێک وەحیی بۆ هات ڕانی لەسەر ڕانم بوو، خەریک بوو ڕانم ورد بێ، یانی: زۆر قورسایی گەیشتە سەرم، وەک لە (صحيح البخاري)دا ژمارە: ٤٣١٦ هاتوە.

**المُؤمِنِين**)، سوورەت دەبێتە پاڵدراو (**مُضَافُ**)و، (**المُؤمِنِين**) دەبێتە پاڵ بۆ لادراو، (**مُضَافٌ إِلَيهِ**)، بەڵام لەبەر ئەوەی (**المُؤْمِنُون**)، بۆتە ناوی ناسێنەری ئەم سوورەتە موبارەكە، بۆیە هەر وەک خۆی هێڵدراوەتەوە.

## شەشەم: تایبەتمەندیی سەرەکیی ئەم سوورەتە:

قۆناغی دوای مەرگ و پێش ئاخیر زەمان و، پێش قیامەت، تەنیا لەم سوورەتەدا، وشەی (**برزخ**)ی بۆ بەکارهێنراوە، لەم سوورەتە موبارەكەدا خوا ﷻ باسی ئەو قۆناغەی كردوە كە دەكەوێتە نێوان دنیاو دوارۆژەوە، دوای ئەوەی مرۆڤ دنیا بەجێ دەهێڵێ و دەمرێ، چی لێ دێ؟ دەكەوێتە قۆناغێكی ڕاگوزەر (**مَرحَلَة إنتِقالِيَّة**)ەوە، ئنجا تەنیا لەم سوورەتەدا ئەم قۆناغە وشەی بەرزەخی بۆ بەكارهاتوە، كە وەک دوایی باسی دەكەین، (**برزخ**)، یانی: پەردەو نێوان، بۆیەش ئەو ناوەی لێنراوە، چونكە ئەو قۆناغە دەكەوێتە نێوان دنیاو دوارۆژەوە، بە نسبەت كەسێكەوە كە دەمرێ، ئەگەر نا بە نسبەت ئەوانەی كە لە ژیاندان، ژیانی دنیا هەر بەردەوامە، بەڵام وەک گوتراوە: (**مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ**)، هەر كەسێک مرد قیامەتی وی هاتوە، لە ڕاستییدا ئینسان دوای ئەوەی دەمرێ، لە خۆی حاڵی دەبێ، بەڵكو هەر لە سەرە مەرگدا لە خۆی حاڵی دەبێ، چۆنەو، سەرەنجامی چییەو بۆ كوێ دەچێ؟ بەڵێ، جەستەكەی، یان دەخرێتە نێو خاكەوە، یان قەل و داڵ دەیخوات، یان دەسووتێنرێ، یان لە ئاودا ماسی دەیخۆن، بەڵام ئەوە تەنیا جەستەكەی، بەڵام ڕووحەكەی، نەک هەر لە بەین ناچێ، بەڵكو بە پێی ئەو حاڵەتە، كە لە دنیادا لە سەری بووە، ڕووحەكەی یان پاداشت دەدرێتەوە، یاخود لە سزادا دەبێ، تاكو دوای جاری یەكەم، بۆ جاری دووەمیش فوو بە كەڕەنادا دەكرێ و، شەیپوور لێ دەدرێ و، دوای قۆناغی ئاخیر زەمان (**ساعة**)، قۆناغی قیامەت (زیندووبوونەوەو هەڵسانەوە) دێتە پێش.

## حەوتەم: دەرسەکانی ئەم سووڕەتە:

کۆی (١١٨) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکە دەکەینە شەش دەرس:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١١)، لەو یازدە (١١) ئایەتەدا خوا ﷻ، باسی سیفەتە بنەڕەتییەکانی بڕواداران دەکات.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٢ - ٢٢) ئەویش هەر یازدە (١١) ئایەتەو، لەم (١١) ئایەتەشدا خوا ﷻ، هەم باسی قۆناغەکانی دروست بوونی مرۆڤ و، هەم باسی حەوت ئاسمانەکان و، دابەزاندنی ئاوو، ڕواندنی باغ و میوە جۆراو جۆرەکان بەو ئاوە، پاشان باسی ئاژەڵ و سوودەکانی ئاژەڵی کردوە.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٢٣ - ٥٠) بیست و هەشت (٢٨) ئایەت، لەو (٢٨) ئایەتەدا، خوا ﷻ، سەرەتا بەسەرهاتی نووح عليه السلام دەگێڕێتەوە، دوایی باسی بەسەرهاتی پێغەمبەرێکی دیکە عليه السلام کە ناوی نەهێنراوە، بەڵام بە مەزەننە وا پێدەچێ، بەسەرهاتی صالح بێ لەگەڵ گەلەکەی (**ثمود**)دا، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ، باسی چۆنیەتی سزادانی گەلی سەرکەش و یاخیی ئەو پێغەمبەرە دەکات، کە ناوی نەهێندراوە، کە بە چریکەو دەنگێکی گەورە (**صَيْحَة**) لە بەین براون، کە وەک لە سووڕەتی (**الحِجْر**)و، شوێنەکانی دیکەشدا هاتوە، ئەو جۆرە سزادانە هی گەلی (**ثمود**) بووە، کە پێغەمبەرەکەیان ناوی (صالح) بووەو، دوایی خوا بە گشتیی باسی پێغەمبەران (**عَلَيهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) دەکات، کە پەیتا پەیتا بۆ مرۆڤایەتیی هاتوون و، دوایی بە تایبەت باسی مووساو هاڕوون دەکات (**علَيهِما الصَّلاةُ وَالسَّلاَم**)، کە بۆ لای فیرعەون و گەلەکەی ڕەوان کراون و، دوایی ئاماژەیەکی کورت دەکات بە (عیسا)و بە مەریەمی دایکی صەڵات و سەلامی خوا لەسەر عیساو خوا لە دایکی عیسا ڕازی بێ.

**دەرسی چوارەم:** ئایەتەکانی: (٥١ - ٧٧)، بیست و حەوت (٢٧) ئایەت، کۆمەڵێک بابەتی جۆراو جۆر، لەم دەرسی چوارەمەدا هاتوون:

**١-** خوای پەروەردگار بانگی پێغەمبەران (**عَلَيهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم**) دەكات، كە ئەوان یەک ڕێبازیان هەیە، كە بریتیە لە بەندایەتیی و، خۆ پارێزیی لە سزای خوا ﷻ.

**٢-** باسی ئەوانەی كە خوا ﷻ نازو نیعمەتیان پێ دەدا، كەچی پێی بوغڕا دەبن و، پێیان وایە خوا خۆشی دەوێن، بۆیە ئەو نازو نیعمەتەی دنیای پێداون! باسی ئەوانەو، ئەو خەیاڵ پڵاوەی ئەوان دەكات.

**٣-** باسی سیفەتە بنەڕەتییەكانی ئەو كەسانە دەكات، كە خوا خۆشی دەوێن و لێیان ڕازییە.

**٤-** جارێكی دیكە خوای پەروەردگار دێتەوە سەر باسی ئەوانەی كە خوانەناسن و هاوبەش بۆ خوا دانەرن و لادەرن، خوا ﷻ چەند پرسیارێكیان ئاڕاستە دەكات، كە بۆچی بڕوا بە پێغەمبەر ﷺ ناهێنن، بۆچی بڕوا بە هیدایەتی خوا ناكەن؟ چ بیانوویەكیان هەیە؟!

**دەرسی پێنجەم:** ئایەتەكانی: (٧٨ - ٩٨)، بیست و یەک (٢١) ئایەت، كە تێیان دا دیسان خوا ﷻ چەند قسەو بیرو بۆچوونێكی هەڵەی كافرەكان دەخاتە ڕووو، بەر پەرچیان دەداتەوە، دوایی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ، دەفەرموێ: چەند پرسیارێكیان ئاڕاستە بكات، سەبارەت بە پەروەردگارێتیی خوا، كە ناچارن مادام بە قسەی عەقڵ و مەنتیق بكەن، دان بە پەروەردگارێتیی خوادا بێنن، دوایی خوا دەفەرموێ: مادام بەس خوا ﷻ پەروەردگارو بەدیهێنەرو هەمەكارەی گەردوونە، بۆ كوێ لادەدرێن؟ بۆچی جادووتان لێ دەكرێ؟ بۆچی بەندایەتیی بۆ خوا ناكەن؟ دوایی خوا ﷻ چەند ڕێنماییەک ئاڕاستەی پێغەمبەری خاتەم دەكات ﷺ، لە مامەڵەكردنی لەگەڵ دەوروبەردا، كە نێوەڕۆكەكەیان ئەوەیە: بە چاكە، خراپەی ئەوان پاڵ پێوەبنێ و، خۆڕاگربێ و، پەنا بە خوا بگرێ لە خوتخوتەو دنەدانی شەیتانەكان.

**دەرسی شەشەم و كۆتایی:** ئایەتەكانی: (٩٩ - ١١٨)یە، بیست (٢٠) ئایەت دەگرێتە خۆی، لەم (٢٠) ئایەتەشدا خوا ﷻ، بە زۆریی باسی ڕۆژی دوایی دەكات، كە دوای ئەوەی شەیپوور لێ دەدرێ و فوو بە كەڕەنادا دەكرێ، نە ڕەچەڵەک

لە نێوان خەڵکدا دەخوێنرێتەوە، نە کەس لە کەس هیچ شتێک داوا دەکات، لە دوای فووی یەکەم کە بە کەڕەنادا دەکرێ و شەیپوور لێ دەدرێ، مرۆڤەکان ئەو حاڵەتەیان بەسەر دێ، کە ئاخیر زەمانی پێ دەگوترێ و، ئەم گەردوونە تێکدەچێ.

پاشان کە بۆ جاری دووەم فووی پێدا دەکرێ، بە جۆرێکی دیکە خوای تاک و پاک ئەم بوونە هەڵدەخاتەوە، وەک پێشتریش باسمان کردوە، لەو ئایەتانەدا زیاتر باسی ڕۆژی دوایی کراوەو، سەرەنجامی چاکی بڕوادارن و پارێزکاران و، سەرەنجامی شووم و خراپی بێ بڕوایان و هاوبەش بۆ خوا دانەران باسکراوە.

هەروەها خوا ﷻ پرسیارێکی ددان شکێنیان ئاڕاستە دەکات، کە ئایا ئەی بێبڕواینە! پێتان وایە ئێوەمان بەهەوەنتە خوڵقاندوەو بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە؟ ئایا کاری وا شایستەی خوای پەروەردگارە؟ کە یەکێ لە سیفەتەکانی بریتیە: لەوە کە زاناوو کاربەجێیە، ئنجا ئایا ئەوە شتێکی بێجێ نیە، کە خوا لە مرۆڤەکان بگەڕێ، هەر کەسە بەڕێی خۆیدا بڕواو، چۆن دروستی کردوون، ئاوا لە بەین بچن و، پاداشتی چاکەکاران نەدرێتەوەو، سزای خراپەکاران نەدرێ؟ بەو شێوەیە ئەو سووڕەتە کۆتایی پێ دەهێنرێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان ئایەتـەکانی: (١ - ١١)، واتـە: یـازدە (١١) ئایـەتی سـەرەتای سـوورەتی (**المؤمنون**)، دەگرێتـە خـۆی، خـوای زانـاو شـارەزا لـەو یـازدە (١١) ئایەتـەدا، بـە جەخـت کردنـەوەوە ڕایدەگەیەنـێ، کـە بـڕواداران سـەرفرازو بـە کام و مـراد گەیشـتوون، کـە بـە دڵنیایـی مەبەسـت لـەو سـەرفرازیی و بـە کام و مـراد گەیشـتنە، بـە ئامانـج گەیشـتنی ڕۆژی دواییـە، بـەڵام ژیـانی دنیـاش دەگرێتـەوە، پاشـان خـوای کارزان ئـەو بـڕواداره سـەرفرازو بـە مـراد گەیشـتووانە، بـە نـۆ (٩) لـە خەسـڵەتە بنەڕەتییەکانیـان وەسـف و پێناسـە دەکات:

١- ئیمان ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾.

٣،٢- نوێژکردن و گەردنکەچیی لە نوێژدا ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ﴾.

٤- زەکاتدان، یاخود خۆ تەزکیە کردن ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ﴾.

٥- پشت تێکردنی قسەو کرداری پووچ ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ﴾.

٦- پاراستنی داوێنی خۆ لە حەڕام ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ﴾.

٧، ٨- چاودێریی کردنی سپاردەو، بەڵێن و پەیمان ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ﴾.

٩- پارێزگاریی لێکردنی نوێژەکانیان ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ﴾.

سـەرەنجامیش گەیشـتن بـە فیـردەوس، وەک ماڤێکـی مسـۆگەریان، کـە لەوێـدا لـە شـادمانیی دا هەمیشـەیی دەبـن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ١٠ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١﴾.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ﴿٢﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ﴿٤﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١١﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . مسۆگەر بڕواداران سەرفرازن و بە مراد گەیشتوون (١) ئەوانەی لە نوێژەکانیاندا (بۆ خوا) زەبوون و ملکەچن (٢) هەروەها ئەوانەی پشت دەکەنە (قسەو ڕەفتاری) پووچ و بێ سوود (٣) هەروەها ئەوانەی زەکات دەدەن و، خۆیان تەزکیە دەکەن (٤) هەروەها ئەوانەی پارێزەری داوێنی خۆیانن (٥) مەگەر لە ئاست هاوسەرانیان و ئەو ئافرەتانەی خاوەنیانن (کەنیزەکەکانیان)، ئا ئەوانە لۆمەیان ناکرێ (٦) بەڵام هەر کەس جگە لەوە بخوازێ، ئەوانە سنوور شکێنن (٧) هەروەها ئەوانەی چاودێریی سپاردەو پەیمانەکانیان دەکەن (٨) هەروەها ئەوانەی پارێزگاریی لە نوێژەکانیان دەکەن (٩) ئا ئەوانە میراتگرانن (١٠) ئەوانەی فیردەوس بە میرات دەگرن و تێیدا هەر ماو دەبن (١١)}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(قَدْ): (قَـدْ: حَـرْفُ تَحْقِيـقٍ وَتَوكِيـدٍ، عِنْدَمَا يَدْخُـلُ عَـلَى الفِعْـلِ المَـاضِي، فَحَـرفُ قَدْ فـي الجُمْلَـةِ الفِعلِيَّـةِ يُفِيـدُ مَفَـادَ (إنَّ وَالـلاَّم) فـي الجُمْلَـةِ الإِسمِيَّة)، وشـەی (قَـدْ) پیتێکـە بـۆ ساغکردنەوەو جەختکردنـەوە بـەکاردێ، کاتـێ کـە دەچێتـە سـەر کـرداری ڕابـردوو: ﴿قَدْ أَفْلَحَ﴾، پیتـی (قَـدْ) لـە ڕسـتەی کرداریـی (الجُملَـةِ الفِعْلِيَّـة)دا، هەمـان واتـای (إنَّ)و (ل)، دەگەیەنـێ، لـە ڕسـتەی ناویـی دا، وەک خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوی: ﴿إِنَّهُۥ عَلَىٰ رَجْعِهِۦ لَقَادِرٌ ۝٨﴾ الطـارق.

(أَفْلَحَ): واتـە: سـەرفراز بـوو، (الفَلْـحُ: الشَـقُّ، وَالفَـلاَّحُ: الأَكَّارُ، وَالفَـلاَحُ: الظَفَـرُ وَإِدْرَاكُ البُغيَـة)، (أَفْلَـحَ) لـە (فَلْـح)ەوە هاتـوە (فَلْـح)، یـانی (شَـقّ)، واتـە: لەتکـردن، بۆیـە جوتیـار (أَكَّار) پێـی دەگوتـرێ: (فَـلاَّح)، (لأَنَّـهُ يَشُـقُّ الأَرْضَ)، (فَلاَحْ)یـش (بەبـێ گیـره)، بریتیـە: لـە سـەرکەوتن و، بـە ئامانـج گەیشـتن.

(خَٰشِعُونَ): (الخُشُـوعُ: الضَّرَاعَـةُ، وَأَكْـثَرُ مَـا يُسْـتَعْمَلُ الخُشُـوعُ فيـمَا يُوجَـدُ عَـلَى الجَـوَارِحِ، وَالضَّرَاعَـةُ فيـمَا يُوجَـدُ فـي القَلْـبِ)، (خُشُـوعُ)، یـانی: کڕووزانـەوە، بـە زۆریـی وشـەی (خُشُـوع)، بـۆ ئـەو حاڵەتـە، یـان ئـەو گۆڕانکارییـە بـەکاردێ، کـە لەسـەر ئەندامـەکان دەردەکـەوێ، بـەڵام وشـەی (ضَرَاعَـة)، زیاتـر بـۆ ئـەو حاڵەتـەی لـە دڵـدا هەیـە، بـەکاردێ. هەڵبەتـە ئـەوە ڕایەکـە، ئەگەرنا ڕای دیکـەش هەیـە کـە (خُشُـوع)، یـانی زەبوونیـی پێشـاندان و، ملکەچیـی و تەسـلیم بـوون لـە بەرانبـەر خـوادا ﷻ.

(ٱللَّغْوِ): (اللَّغـو مِـنَ الـكَلاَمِ: مـالا يُعْتَـدُّ بِـهِ، وَهُـوَ الَّـذِي يُـورَدُ لاَ عَـنْ فِكْـرٍ وَرَوِيَّـةٍ، فَيَجْـرِي مَجْـرَى اللَّغـا، وَهُـوَ صَـوْتُ الطُّيُـورِ)، (لَغـو)، لـە قسـە، هـەر قسـەیەکە گرنگیـی پـێ نـەدرێ، ئەویـش قسـەیەکە کـە بـە بـێ بیرلێکردنـەوەو، لێوردبوونـەوە بگوتـرێ، بۆیـە هـەر وەک (لَغـا)، مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکـرێ، (لَغـا)ش دەنگـی باڵندانـە.

بـە تایبـەتی دەنگـی چۆلەكـە پاسـاریی، كـە بـۆ ئێمـە هیـچ سـوودێكی نیـەو، تێیناگەیـن داخـۆ چییـە! بـەڵام بـە تەئكیـد باڵنـدەكان كـە دەجریوێنـن، یـان هـەر دەنگێكیـان هەیـە، بـۆ نێـوان خۆیـان لێـك حاڵـی دەبـن و، هـۆكارو ئامـڕازی لێـك تێگەیشـتنیانە.

وشـەی (لَغـو)، (راغِـب الأصفهـاني) لێـرەدا زیاتـر بـە مانـای قسـەی بـێ كەڵـك، قسـەی گرنگیـی پـێ نـەدراوی، لێكداوەتـەوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وشـەی (لَغـو)، هـەم قسـە، هـەم كـردەوەی بـێ سـوودو بـێ كەڵـك دەگرێتـەوە.

(مُعۡرِضُونَ ): پشـتهەڵكەران، (أَعْـرَضَ: يَعْنِـي: أَظْهَـرَ عُرضَـهُ أَي: ناحِيَتَـهُ)، (أَعـرَضَ)، واتـە: لامـلی تێكـرد، ئنجـا كاتێـك ئینسـان لامـل لـە شـتێك دەكات، لـە كەسـێك دەكات، مانـای وایـە ئیهـمالی دەكاو، پشـت گوێـی دەخـات.

(لِفُرُوجِهِمۡ ): بـۆ داوێنیـان، وشـەی (فُـرُوج)، كـۆی (فَـرج)ە، (الفَـرْجُ: الشـقُّ بَـيْنَ الشَّـيْئَيْنِ كَفُرْجَـةِ الحَائِـطِ، وَمَا بَيْنَ الرِّجلَـيْنِ وَكُنِّـيَ بِـهِ عَـنِ السَّـوءةِ)، (فَـرْج)، بـە دابڕاویـی نێـوان دوو شـتان دەگوتـرێ، وەک دیوارێـک کـە کەلێنـی هەیـە، تیـک و درزی دیـوار، دوایـی خوازراوەتـەوە، بـۆ نێـوان دوو لاقـەكانی مـرۆڤ، (پێـی دەگوتـرێ: داوێـن)، كـە كنارەیـە لـە عـەوڕەت (ئەندامـی زاوزێـی)، ئنجـا چ پیـاو چ ئافـرەت، ئەندامـی زاوزێـی (فَـرج)ی بـۆ بەكاردەهێـنرێ، كـە لـە ئەسـڵدا بـە مانـای كەلێـن دێ.

(غَيۡرُ مَلُومِينَ ): سـەركۆنە ناكرێـن، (اللَّـومُ: عَـذْلُ الإنْسَـانِ بِنسبَتِهِ إِلى مَـا فِيـهِ لَـومٌ)، (لـوم) بریتیـە: لـەوەی كەسـێك قسـەیەكی ئاڕاسـتە بكـرێ، كـە سـەر زەنشـت و سـەر كۆنەكـردن بگەیەنێ.

(وَرَآءَ ذَٰلِكَ ): (وَرَآءَ )، یـانی (خَلْـف)، پشـتەوە، دوایـە، (وَرَآءَ ذَٰلِكَ ): (أَي: طَلَـبَ أَكْـثَرَ مِـمَّا بَيَّنَّـاهُ)، ﴿ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ ﴾، یـانی: هـەر كەسـێك داوا بـكات و، بخـوازێ زیـاد لـەوەی كـە ڕوونمـان كردۆتـەوە، كـە بـۆ پیـاو ڕەوایـە، ئـارەزووی جینسـیی خـۆی لـێ تێـر بـكات كـە بریتیـە: لـە هاوسـەران، هەڵبەتـە كاتـێ كەنیزەكیـش هەبـوون،

ئەوانیش کە ئێستا ستایش بۆ خوا ئەو دیاردە قێزەونە نەماوەو، کاتێ ئیسلام هاتوە حاڵەتێکی باوی نێو دنیا بووە، بەڵام ئیسلام ڕەنگی ڕشتوە، بۆ بنەبڕکردنی وەک لە تەفسیری سوورەتی (النساء)دا باسێکی سەربەخۆمان لەو بارەوە کردوە.

(ٱلْعَادُونَ): (**العَدْو: التجَاوزُ وَمُنافاةُ الإلتِئَامِ**)، (**عادون**)، کۆی (**عادي**)یە، یانی: تێپەڕێنەران، چونکە: وشەی (**عَدْو**)، یانی: تێپەڕاندن و، پێچەوانەی پێکەوە گونجان و پێکەوە ڕێک بوونە، (**عَدو**)، یانی: تێپەڕاندن و سەرکێشیی کردن.

(رَٰعُونَ): واتە: ڕەچاوکەران، یاخود ئاگا لێبووان، چونکە (**الرَّعيُ: حِفْظُ الحَيوَانِ إمَّا بِغذائِهِ الحَافِظ لِحَياتِهِ، وَإمَّا بِذَبِّ العَدُوِّ عَنهُ، وَمُراعَاةُ الإنسانِ لِلأَمرِ: مُراقَبَتُهُ إلى ماذَا يَصِير**)، (**راعي**) شوان، بۆیە پێی دەگوترێ: (**راعي**) چونکە چاودێریی ئاژەڵەکانی دەکات، (**رَعي**)، بریتیە: لە پاراستنی ئاژەڵ، یان بەوە ئەو خۆراکەی مایەی پاراستنی ژیانیەتی، بۆی دابین بکات، (بیلەوەڕێنێ، ئالفی پێ بدا)، یان بەوە کە دوژمنی لێ دوور بخاتەوە، (چ گورگ چ هەموو دڕندەکانی کە دژی ئاژەڵن، چ حوشتر چ ڕەشەوڵاخ چ ئاژەڵی ورد، کە مەڕو بزنن)، کە دەگوترێ: مرۆڤ موراعاتی فڵان کارە دەکات، واتە: چاودێریی دەکات، کە چی لێدێ و، سەرەنجامی چۆن دەبێ؟.

(ٱلْفِرْدَوْسَ): (**الفِردَوسُ: البُسْتَانُ الوَاسِعُ الجَامِعُ لأَنْوَاعِ الثَّمَر**)، فیردەوس بە باخێکی فراوانی کۆکەرەوە بۆ هەموو جۆرەکانی میوە، دەگوتری.

# مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـەم یـازدە (١١) ئایەتـەی سـەرەتای سـوورەتی (**المؤمنون**)دا، دوای ئـەوەی دەفەرمـوێ: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـت پێکـردنی مـن بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندەیە، یـان بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە دەسـت پێدەکـەم، کـە ئـەوەش وەک زۆر جـاری دیکـە گوتوومانــە، واتە:

**١-** من ئەم کارە کە دەیکەم، بە ناوی خوای پەروەردگارە.

**٢-** بەپێی شەرع و بەرنامەی خوای بەرزو مەزنە.

**٣-** بۆ ڕازییکردنی خوایە، بۆ ئەوەیی کە ڕازیی بوونی خوای پەروەردگاری پێ دەستەبەر بکەم.

**٤-** بە وزەو تواناو بڕستێکە، کە لە لایەن خوای بەخشەرەوە بۆم ڕەخسێنراوە

ئێمـە پێشـتر لـە پێناسـەو ڕوونکردنـەوەی نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتەدا باسـمان کـرد، کـە لـەم یـازدە (١١) ئایەتـەدا خـواﷻ، کۆمەڵێک خەسـڵەتی بەرجەسـتەو گەورەو گرنگـی ئـەو بەندانـەی کـە لـە تـەرازووی خـوادا، بـە سـەرفرازو بەختـەوەرو بـە کام و مـراد گەیشـتوو دادەنرێـن، خسـتوونیە ڕوو، کـە دەتوانیـن بڵێیـن: نـۆ (٩) سـیفەتن.

**یەکەم:** ئیمان.

**دووەم:** نوێژکردن.

**سێیەم:** زەبوونیی و ملکەچیی لە نوێژدا.

**چوارەم:** پشت تێکردن و، واز لێهێنانی قسەو کرداری پووچ.

**پێنجەم:** زەکات دان، یاخود خۆ تەزکیە کردن.

**شەشەم:** پاراستنی داوێنی خۆ، لە حەڕام و قەدەغە.

**حەوتەم:** پاراستنی سپاردە.

**هەشتەم:** پاراستنی پەیمان.

**نۆیەم:** پارێزگاریی کردن لە نوێژەکان.

ئنجا ئەوانەی ئەو سیفەتە گەورەو گرنگانە لە خۆیاندا دێننە دی، سەرەنجامیان چۆن دەبێ؟ ئەوانە کەسانێکن، دەبنە میراتگر، میراتگری فیردەوس.

سەرەتا خوا دەفەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾، پێشتر باسمان کرد، کە وشەی ﴿قَدۡ﴾، لە زمانی عەرەبییدا کە دەچێتە سەر کرداری ڕابردوو **(فعل ماضي)**، بۆ جەختکردنەوەو ساغکردنەوەو چەسپاندن، بەکاردێ.

﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾، بە مسۆگەریی، بە دڵنیایی بڕواداران سەرفرازن، ئنجا ئەم ﴿ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾، مادام **(أل)**ی ناساندن، **(تعريف)**ی لە سەرە، واتە: تێکڕای بڕواداران، سەرفرازن، یاخود **(أل)** کە بۆ ناساندنە، بۆ **(عَهْد)** بێ، واتە: ئەو بڕوادارانەی بڕواداری تەواون، کە پێشتر باسکراون، ئەوانە سەرفرازو بەختەوەرن.

ئنجا دێتە سەر باسی سیفەتەکانیان، دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ﴾، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچن، زەبوونن، خۆ بە کەمزانن لە بەرانبەر خوادا ﷻ، کە بێگومان ڕووحی نوێژو خواپەرستیی بریتیە: لە (خشوع)، یانی: خۆ بەکەمگرتن، خۆ بەکەمزانیی، لە بەرانبەر خواداو زەبوونیی و ئاتاجیی پێشان دان و، لێ ترسان و، سام و هەیبەت هەبوون بەرانبەر بە خوا ﷻ.

سیفەتێکی دیکەیان: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ﴾، ئەوانەی کە واز دێنن لە لەغو، کە **(لَغْو)**، هەم قسە، هەم کردەوەی بێ کەڵک و بێ سوود، بە نسبەت ڕۆژی دواییەوە، دەگرێتەوە، کە لە ڕاستییدا مرۆڤایەتیی بە تایبەت

لەم ڕۆژگاری ئێستای ئێمەدا، پووچ (لغو) لە ژیانی دا زۆر زۆر بووە، هەم پووچی قسە، هەم پووچیی کردەوە، هەڵبەتە لەغوو ئەوەیە کە گوناح نەبێ، (لغو) قسەو ڕەفتاری پووچ و بێ کەڵکە، بەڵام ئەگەر درۆو غەیبەت و بوختان و، جنێو بێ، ئەوە گوناهن، خوای پەروەردگار باسی ئەوە ناکات بفەرموێ: بڕوادارانێک کە واز لە گوناهان دێنن، دەفەرموێ: واز لە قسەو کردارێک دێنن کە پووچەو بێ کەڵکە، بە نسبەت ڕۆژی دواییەوە، ئنجا ئێستا هەم قسەی پووچ زۆرە، هەم کرداری پووچیش زۆرە، بە تایبەتی لە نێو گەنج و تازە پێگەیشتوواندا، زۆرێك لەو فلیم و شتانەی تەماشا دەکرێن، پووچن، بەهۆی ئەو تەکنۆلۆجیای سەردەمەوە، خەڵک تەمەنێکی زۆری بە فیڕۆ دەچێ، بێ هوودە لە دەستی دەچێ، دەتوانین بڵێین: زۆر بەی مرۆڤایەتیی لەم ڕۆژگاری ئێستاماندا، لە زەلکاوی لەغوودا نغرۆ بووە، مەگەر ئەوانەی خوا ﷻ خستوونیە سەر ڕاستە شەقامی خۆی و، ڕێزی خۆیان دەگرن و، ڕێزی ژیانیان دەگرن و، ڕێزی کاتیان دەگرن.

سیفەتێکی دیکەیان: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴾، ئەوانەی کە ئەنجام دەرن بۆ زەکات، ئەوە دوایی باسی دەکەین، زانایان بە سێ واتایان لێکیان داوەتەوە، بەڵام واتای زیاتر کە دێتە بەرچاو ئەوەیە، کە مەبەست پێی زەکات دان بێ، واتە: زەکات لە ماڵی خۆیان دەردەکەن، بەڵێ ئەم سوورەتە مەککەییەو، ئەو کاتە زەکات بەو شێوەیەی کە دوایی دیار دەکرێ و، دەدرێ بە هەشت جۆرە کەس و، لە چەندەی چەند؟ پێغەمبەری خوا لە سوننەتدا ڕوونی کردۆتەوە، بەڵێ ئەوە لە مەدینە دیاریی کراوە، بەڵام لە مەککەش هاوکاریی کردنی خەڵک و ماڵی خۆ بەخشین، سیفەتێکی بنچینەیی بووە، وەک چۆن نوێژو خواپەرستیی، سیفەتێکی بنچینەیی بڕواداران بووە، ماڵی خۆ بەخشینیش هەر سیفەتێکی بنچینەیی بووە، بۆیە لە سوورەتی (الشورى)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمۡ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾.... هەروەها، لەوەی پێمان داون دەبەخشن، دیسان لە زۆربەی سوورەتە مەککەییەکاندا، خوای پەروەردگار باسی ماڵ بەخشین دەکات.

بەڵام هەندێکیان وایان لێک داوەتەوە کە: ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ﴾، ئەوانەی خۆیان تەزکیە دەکەن، یاخود ئەوانەی بە چەند کردارێک هەڵدەستن، کە مەبەستیان خۆ پێ پاک و چاک کردنە، واتە: بەهۆی ئەو کردەوانەوە، نەفسیان پاک و چاک دەبێ و پاڵفتە دەبێ و گەشە دەکات.

سیفەتێکی دیکەیان ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ﴾، ئەوانەی کە پارێزەرن بۆ داوێنی خۆیان، واتە: ئەندامی زاوزێی خۆیان دەپارێزن، لەچی؟ لەوەی غەریزەی جینسیی خۆیان تێربکەن، لە شتێک کە قەدەغەیە: ﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ﴾، جگە لە هاوسەرانیان، یاخود ئەو ئافرەتانەی کە لەبەر دەستیانن، کەنیزەکانیان، ﴿فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾، کەسێک کە لەگەڵ هاوسەری خۆی، یان لەگەڵ کەنیزەکی خۆیدا غەریزەی جینسیی خۆی تێر دەکات، لەگەڵی جووت دەبێ، ئەوانە سەرزەنشت ناکرێن و، لۆمەو سەر کۆنەیان نایەتە سەر، ﴿فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ﴾، بەڵام هەر کەسێک لە دوای ئەوەوە، جگە لەوە، بخوازێ، ئا ئەوانەن لەڕێ دەرچووان، ئا ئەوانەن سەرەڕۆیان، ئا ئەوانەن سنوور شکێنان، ﴿وَرَآءَ ذَٰلِكَ﴾، وەک دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین، هەموو جۆرە تێر کردنێکی غەریزەی جینسیی دەگرێتەوە، لە هەر ڕێیەکەوە بێ، جگە لە ڕێگەی حەڵاڵ و دیارییکراوەوە.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ﴾، هەروەها ئەوانەی کە بۆ سپاردەکانیان و، بۆ بەڵێن و پەیمانیان چاودێرن، پارێزەرن، ئاگایان لە سپاردەکانیانەو، ئاگایان لە بەڵێن و پەیمانەکانیانە، کە سپاردەکانیان زایە نەکەن و، بەڵێن و پەیمانەکانیشیان، نە شکێنن.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾، هەروەها ئەوانەی پارێزەرن بۆ نوێژەکانیان.

أ- لەوە کە بیانفەوتێنن،

ب- لەوەی لە کاتی خۆیاندا، نەیانکەن.

ج- لەوەدا کە ئەوەی لە ڕواڵەتی نوێژەکانیاندا بە مەرج وەرگیراوە، ڕەچاوی نەکەن.

د- یاخود ئەوەی کە لە پەنهانی نوێژەکانیادا بە مەرج گیراوە، ڕەچاوی نەکەن.

هـ- یاخود ئەوە کە نوێژەکانیان ئەو بەرهەم و دەرهاویشتە باشانەی لێ نەکەوێتەوە، کە خوا بە مەرجی گرتوون، کە بریتیە: لە خۆ پاراستنیان، لە هەموو ئەو شتانەی خوا پێی ناخۆشن.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴾، ئا ئەوانە میرات گرانن، ﴿ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئەوانەی فیردەوس بە میرات دەگرن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، بۆچی خوای بەرزو مەزن وشەی میراتی بەکارهێناوە؟

لەبەرئەوەی:

أ- میرات بەهێزترین شێوەی ماڵ و سامان وەدەست هێنانە.

ب- بۆ ئەوەیە خوای پەروەردگار پێمان بفەرموێ: ئەو بەهەشتە، ئەو فیردەوسە، لە بنەڕەتدا بۆ ئەهلی ئیمان دروستکراوە، بۆیە وەک چۆن کەسێک ماڵی بابی، یان ماڵی خزمێکی نیزیکی بە میرات دەگرێ، ئەو بەهەشتەی خواش ئاوا دەبێتە موڵکی، موڵکێک کە هیچ کەس ئیددیعاو دەعوای لەسەری نەبێ.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**مسۆگەربوونی سەرفرازیی و بە کام و مراد گەیشتنی بڕواداران:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾،

پێشتریش باسمان کرد کە وشەی ﴿ قَدۡ ﴾، (**حَرفُ تَحقِيقٍ وَتَوكِيد**)، ﴿ قَدۡ ﴾، لە زمانی عەرەبییدا کاتێک دەچێتە سەر کرداری ڕابردوو، (**الفعل الماضي**)، مانای ساغکردنەوەو چەسپاندن و جەختکردنەوە، دەگەیەنێ، خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، بەدڵنیایی بڕواداران سەرفراز بوون، بەختەوەر بوون، بە کام و مراد گەیشتوون، وشەی ﴿ أَفۡلَحَ ﴾، لە (**فَلْح**)ەوە هاتوە، (**فَلْح**)یش، بە مانای لەت کردن دێ، ئایا بۆچی وشەی (**فَلَاح**) بە مانای سەرفرازیی دێ و، ئەم وشەیە بۆچی وا هاتوە؟ لەبەر ئەوەی کەسێک هەم لە دنیادا هەم لە دواڕۆژدا سەرفراز دەبێ، کە کۆسپەکانی بەردەمی خۆی ببڕێ، کۆسپ و لەمپەرەکان ببڕێ و بەرەو ئامانج بڕوات.

لە ڕاستییدا بەبێ ئەوەی ئینسان بتوانێ ئەو کۆسپ و پەرچ و لەمپەرانەی دێنە بەردەمی، لایانبەرێ و، بڕوا بەرەو ئامانج، بە ئامانج ناگات، هەر کەسێک کۆسپێکی هاتە بەردەم، لەمپەرێک، تەگەرەیەکی هاتە بەردەم، بوەستێ، یان بکشێتەوە دوایە، مانای وایە بە ئامانج ناگات، بۆیە خوا ﷻ وشەی (فلاح)ی بەکارهێناوە، کە وەک چۆن جوتیار کە بە گاسنەکەی زەوی دەکێڵێ، ئنجا گاسنی جووتی گایە، یاخود جووتی ئەسپ و ماین و ئێسترو، یاخود هی تراکتۆرە، یاخود هەر شێوەیەکی دیکەیە، جوتیار کاتێک دەتوانێ دەغڵ و دانەکەی بنێژێ، دانەوێڵەکەی خۆی بخاتە نێو زەوی، کە زەوییەکە بکێڵێ و شەقی بکات.

ئنجا بێگومان سەرفرازیی هەرە مەزن و گەورە، سەرفرازیی ڕۆژی دواییە، ئەوەی دنیا شتێک نیە، چونکە دنیا بۆ خۆی کەم و کەم بایەخ و بچووک و کەم و کورتەو، تەنیا شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیە، نەک شوێنی تێدا حەسانەوە، بۆیە سەرفرازیی و بەختەوەریی و بە کام و مراد گەیشتن، ئەوەیە کە لە ڕۆژی دوایی دا دێتە دی.

(**راغب الأصفهاني**) کە بە ڕاستی مانا لێکدەرەوەیەکی زەبر دەستی وشەکانی قورئانە، دەڵێ: (**الفَلاَحُ الأُخرَوِيُّ: بَقاءٌ بلا فَناء، غِنىً بِلا فَقْر، عِزٌّ بِلا ذُلّ، عِلمٌ بِلا جَهْل**)، واتە: سەرفرازیی ڕۆژی دوایی بریتیە: لە مانەوە بەبێ لە بەین چوون، دەوڵەمەندیی بەبێ هەژار بوون، باڵادەستیی بەبێ زەبوون بوون و، زانیاریی بەبێ نەفامیی.

ئەو وایگوتوە: بەڵام من پێم وایە کە سەرفرازیی ڕۆژی دوایی، بریتیە: لە هاتنە دی هەموو ئەو ئامانج و مەبەستانەی کە مرۆڤ بۆیان عەوداڵەو، مرۆڤ بۆیان ئاتاجەو، مرۆڤ پێیان بەختەوەر دەبێ، نەک هەر ئەو چوارە، بەڵکو هەموو ئەو ئامانجانە کە مرۆڤ پێیان بەختەوەر دەبێ کە هەڵبەتە ئەو ویستوویەتی ئەو چوار ئامانجە باس بکات کە ئەوانی دیکە کۆ دەکەنەوە، بەڵام لە ڕاستیی دا، مەرج نیە ئەو چوارە، هەموو ئەو ئامانج و مەبەستانە کۆ بکەنەوە، کە دەبنە مایەی سەرفرازیی ڕەهاو بێ سنووری مرۆڤەکان، چونکە خوا کە دەفەرمویێ: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، بەڕاستیی بڕواداران سەرفرازن، واتە: بە شێوەیەکی بێ سنوورو بە ڕەهایی و یەکجارەکیی، بەڵام دەبێ بشزانین کە ﴿ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، کە وەک پێشتر گوتمان: (أل)ی ناساندن (تعریف)ی لەسەرە، واتە: بڕوادارانێک کە تێرو تەواون لە بڕوادا، بڕوادارانی تێرو تەواوو کامڵ، دەشگونجێ بڵێین: هەموو بڕواداران و، (أل) بۆ (إستغراق)ە، ئەوەش دەگەیەنێ، تێکڕای بڕواداران، بەڵام تێکڕای بڕوادارانێک کە ئیمان و بڕوایەکی تێرو تەواویان هەیە.

مەسەلەی دووەم:

**پێناسەکردنی بڕوادارانی سەرفراز بە: گەردنکەچیی لە نوێژداو، ڕوو وەرگێڕان لە قسەو کردەوەی بێ سوودو، زەکاتدان، یاخود خۆ تەزکیەکردن و، داوێنی خۆپاراستن لە حەرام و، چاودێریی کردنی سپاردەو بەڵێنەکان و، پاراستنی نوێژەکان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِأَمَٰنَٰتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١- ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ﴾، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا زەبوونن، ملکەچن، لە ناخەوە بەرانبەر بە خوا ﷻ تەسلیمن، بێگومان (**خشوع**) شوێنەکەی دڵە، مەڵبەندی (**خشوع**) دڵ و دەروونە، بەڵام (**خشوع**) کە لە دڵدا دەبێ، دوایی شوێنەواری لە سەر ئەندامەکانیش و لە سەر ڕواڵەتیش دەردەکەوێ، بۆیە لە هەندێ شوێنەواراندا هاتوە: کەسێک بیندراوە کە لە نوێژدا جووڵە جووڵی زۆری کردوە، گوتراوە: (**لَوَ خَشَعَ قَلْبُ هَذَا لَخَضَعَت جَوارِحُهُ**)، واتە: ئەگەر دڵی ئەمە خشووعی تێدا بووایە، ئەندامەکانیشی دادەسەکنان، ئەندامەکانیشی ملکەچ دەبوون، لەو بارەوە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ هەیە:

**{إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَإِنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُهُ ، فَلاَ فلا تُحَرِّكُوا الحَصَى} (أخرجه عبد الرزاق: ٢٣٩٩، وأحمد: ٢١٣٦٨، وأبو داود: ٩٤٥، والترمذي: ٣٧٩، وقال: حسن،**

**والنسائي: ١١٩١، وابن ماجه: ١٠٢٧، والدارمي: ١٣٨٨، وابن خزيمة: ٩١٣، وابن حبان: ٢٢٧٤ عَنْ أَبِي ذَرٍّ)**.

واتـە: ئەگـەر یەکێکتـان هەڵسـا بـۆ نوێـژێ، بەزەیـی خـوا ڕوو بەڕوویـەتی، بـا دەنکـە چەوانیـش نەجووڵێنـێ.

(**حَـصى**) کـۆی (**حَصـاة**)ە یانـی: دەنکـە چـەو، کـە لـە زیـخ گەورەتـرە، بـەڵام لـە بەردیـش گچکەتـرە، کاتی خـۆی: بەزۆریـی لەسـەر خاکـی زەوی یـان لە لمی بیابـان، یان لەسـەر چـەوو زیـخ، نوێژیـان کـردوە، فەرموویـەتی: بـا نوێژکـەر دەنکـە چەوەکانیـش نەجووڵێنـێ، خۆیـان پێـوە مەشـغووڵ بـکات و بخافڵـێ.

(خشـوع)یش لـە نوێـژدا پێویسـتە، بەڵکـو ڕووحـی نوێـژە،وەک لـە عوبـادەی کـوڕی صامیتـەوە هاتـوە: {**الخُشُـوعُ: أَوَّلُ عِلْـمٍ يُرْفَـعُ مِـنَ النَّاس**}(**أخرجـه الترمـذي: ٢٦٥٣، والدارمـي: ١٣٨٨، عـن أبي الـدرداء، قـال الألبـاني: صحيـح**)، واتـە: (خشـوع) یەکەمیـن زانیارییـە کـە لەنێـو خەڵکـدا هەڵدەگیـرێ، واتـە: خەڵـک نوێـژ دەکات، بـەڵام ملکەچیـی و زەبوونیـی لـە نوێـژدا نامێنـێ.

٢- ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ﴾: هەروەها ئەوانەی وازهێنەرن، پشت تێکەرن بۆ لەغوو، (**اللَّغو**)، (**اللَّغَا: وهو صَوْتُ العَصافِير، أو صَوتُ الطِيُور**)، (**اللَّغو**)، لە (لغا)، وەیەو جریوەی چۆلەکە پاساریی، یاخود جریوەی باڵندانە بە گشتیی، بەڵام دوایی (**لَغو**)، بەکارهێنراوە بۆ: (**مَا لا فائِدَةَ مِنهُ أُخرَوِيّاً، قَولاً كَانَ أَو فِعْلاً**)، ئەمە پێناسە ڕاستەقینەکەی (**لَغو**)یە، (**لَغو**) هەر شتێک کە سوودی تێدا نەبێ بۆ دواڕۆژ، چ قسە بێ، چ کردەوە بێ.

هەڵبەتـە وازهێنـان لـە لەغـوو، هـەر ئـەوە نیـە، ئینسـان خـۆی لەغـوو نـەکات، قسـەی پـووچ نـەکات و، کـرداری پـووچ نـەکات، بەڵکـو دەبـێ بەشـداریی لەغـووش نـەکات، نـە بـە تەماشـاکردن و نـە بـە گـوێ گرتنیـش، چونکـە جـاری وا هەیـە ئینسـان خـۆی، قسـەی پـووچ و کـرداری پـووچ نـاکات، بـەڵام گـوێ لـە قسـەی پـووچ دەگـرێ و، تەماشـای کـرداری پـووچ دەکات، بـەڵام بـڕواداراني ڕاسـتەقینە ئەوانـەن کـە نـە خۆیـان

ئەهلی لەغوون، نەلەگەڵ ئەوانەدا کە سەرگەرمی لەغوون بەشدار دەبن، وشەی ﴿ مُعۡرِضُونَ ﴾، پشتێکەرن ئەوە دەگرێتەوە، ئەگەر خوا فەرمووبای: (**وَالَّذِينَ يَترُكونَ اللَّغوَ**)، یان (**لِلَّغوِ تارِكُون**)، ئەوە هەر ئەوەی دەگرتەوە کە خۆیان نایکەن، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ﴾، واتە: پشت دەکەنە پووچ، یانی: وێڕای ئەوەی خۆیان لەغوو ناکەن، پشت دەکەنە ئەوانەش کە خەریکی قسەو کرداری پووچ و بێ کەڵکن.

دیارە ئینسان بە ئەندازەی ئەوەکە دەزانێ بۆچی هاتۆتە ئەم ژیانە، دەزانێ کە دەبێ چۆن بژی و، بۆچی بژی و چ حیکمەتێک لە پشتیەوە هەیە؟ بە ئەندازەی ئەوە کە ئەو قەناعەتە لە دڵ و دەروونی دا ڕۆ دەچێ، خۆی کۆنتڕۆڵ دەکات، کە بە هیچ جۆرێک توخنی لەغوو نەکەوێ، نە لە زاتی خۆی دا ئەهلی لەغوو بێ و، نە لەگەڵ کەسانێکیش دا کە خاوەنی لەغوون، تێکەڵ و بەشدار بێ، ئنجا کە واشبوو، ئەو کاتە کاتی زۆری بۆ دەگەڕێتەوەو، تەمەنەکەی بە فیڕۆ ناچێ و، دەتوانێ باشترین بەهرە لە تەمەن و بوونی خۆی وەربگرێ، با لەو بارەوە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ بهێنین کە دەفەرموێ:

**{إِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللَّهِ لاَ يُلْقِى لَهَا بَالاً، يَرْفَعُ اللَّهُ بِهَا لَهُ دَرَجَاتٍ، وَإِنَّ الْعَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالْكَلِمَةِ مِنْ سَخَطِ اللَّهِ، لاَ يُلْقِى لَهَا بَالاً، يَهْوِى بِهَا فِي جَهَنَّمَ} (أخرجه أحمد: ٨٣٩٢، والبخاري: ٦١١٣).**

واتە: بەندە وشەیەک دەڵێ، لە ڕەزامەندیی خوادا، گرنگیی پێ نادات، بەڵام خوا بە هۆی ئەو وشەیەوە، چەندان پلە بەرزی دەکاتەوە، (بە پێچەوانەشەوە) جاری وایە بەندە قسەیەک دەکاو وشەیەک بەکار دێنێ لە تووڕەیی خوادا، (قسەیەک کە مایەی تووڕەیی خوایە)، خۆی گوێی پێ نادا، بەڵام بە هۆی ئەو قسەیەوە، بە هۆی ئەو تەعبیرەوە، بەردەبێتەوە نێو دۆزەخ، (دەچێتە قووڵایی دۆزەخەوە).

خوا پەنامان بدات.

لێرەدا پێویستە ئەو تێبینییەش بخەمەڕوو کە (**القرطبی**) لە (**الحسن البصري**) یەوە، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەیهێنێ کە گوتوویەتی: (**اللَّغو: المَعَاصِي كُلُّهَا**)[1]، واتە: لەغوو هەمـوو گوناهەکانە، ئنجا (**القرطبي**) وەک پشـتگیریی کـردن و پشتڕاسـت کردنـەوەی ڕایەکـەی حەسـەنی بەصرایـی دەڵـێ: (**فَهـذا قَـولٌ جامِـعٌ**)، واتـە: ئەمـە قسـەیەکی کۆکەرەوەیـە، بـەڵام مـن دەڵێـم: لـە ڕاسـتییدا ئەگـەر حەسـەنی بەصرایـی وایگوتبـێ، ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ و، سـەنەدەکەی ڕاسـت بـێ، لـەوەدا نەیپێـکاوە، چونکـە لەغـوو بـە مانـای هەمـوو گوناهـەکان نایـەت، (**لغـو**) قەتـڵ و زینـاو دزیـی و ڕێگریـی و غەیبـەت و درۆو بوختـان ناگرێتـەوە، ئەوانـە هـەر کامیـان نـاوی تایبـەتی خـۆی هەیـە، بەڵکـو خـوا ﷻ لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: بـڕواداران سـەرفرازن، ئەوانـەی لـە نوێژەکانیانـدا بـۆ خـوا زۆر ملکەچـن، لـە ناخـەوە، (کارلێـک لەگـەڵ نوێژەکانیانـدا دەکـەن، دەزانـن لـە خزمـەت کێـدا وەسـتاون)، پاشـان ئەوانـەی کـە پشـت لە قسـەی پـووچ و کـرداری پووچیـش دەکـەن، نـەک لـەوێ بفەرمـوێ: لـە نوێژەکانیانـدا بـۆ خـوا زۆر ملکەچـن، دواییـش بفەرمـوێ: زینـا ناکـەن، قەتـڵ ناکـەن! پاشـان وشـەی (**لغـو**) لـە زمـانی عەرەبییـدا دەڵـێ: (**مـا لا فائِـدَةَ مِنْـهُ**)، ئـەو شـتەیە کـە سـوودی نەبـێ، بـا گوناهیـش نەبـێ.

٣) ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی ئەنجامدەرن بۆ زەکات، پێشتریش گوتمان: ئەمە زانایان، سێ واتایان بۆ هێناون:

**یەکەم:** (**الَّذِينَ يُؤَدُّونَ الزَّكاة**)، ئەوانەی زەکات دەدەن، بەڵام بۆچی خوای پەروەردگار بەو تەعبیرە هێناویەتی؟ ئەمە زیاتر ئەوە دەگەیەنێ کە باش زەکات لە ماڵی خۆیان دەردەکەن و، باش ماڵ و سامانی خۆیان لە ڕێیەکانی خێر، لە ڕەزامەندیی خوادا، سەرف دەکەن و ئەنجامدەرن بۆ ئەوە.

**دووەم:** کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، بۆ ئەوەی خۆیان تەزکیە بکەن، ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴾، ئاوای لێدێتەوە: (**وَالَّذِينَ هُم للزَّكاةِ، فاعِلونَ لِلأَعمَالِ الصَّالِحَة**)،

---
(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٢، ص٩٠.

یانی: ئەوانەی کە بۆ ئەوەی خۆیان تەزکیە بکەن، پاک و چاک بکەن، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن.

**سێیەم:** (**الَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم**)، ئەوانەی ئەنجامدەری زەکاتن، واتە: ئەنجامدەری تەزکیەو، خۆ پاک و چاک کردنن.

٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴾: هەروەها ئەوانەی پارێزەرن بۆ داوێنی خۆیان، لێرەدا با نەقڵێک لە (**إبن العربي**) خاوەنی (**الأحكام القرآن**) بکەین، کە (**القرطبي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا، زۆر پشتی بە (**أحكام القرآن**) (**إبن العربي**) بەستوە:

(**قَالَ ابنُ العَرَبي: مِنْ غَرِيبِ الْقُرْآنِ أَنَّ هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ الْعَشْرِ هِيَ عَامَّةٌ فِي الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ، كَسَائِرِ أَلْفَاظِ الْقُرْآنِ الَّتِي هِيَ مُحْتَمِلَةٌ لَهُمْ، فَإِنَّهَا عَامَّةٌ فِيهِمْ، إِلَّا قَوْلَهُ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴾المؤمنون: ٥، فَإِنَّهُ خِطَابٌ لِلرِّجَالِ خَاصَّةً دُونَ النِّسَاءِ، بِدَلِيلِ قَوْلِهِ: ﴿ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ ﴾المؤمنون: ٦، قَالَ القُرطُبِي: قُلْتُ: وَفِي هَذَا التَّأْوِيلِ فِي الأيَة، فَلا يَحِلُّ لامرَأَةٍ أَن يَطَأَها مَن تَمْلِكُهُ إجمَاعاً مِنَ العُلَماء، لأَنَّها غَيرُ داخِلَةٍ فِي الآيَةِ، لكِنَّها لَوِ أعتَقَتهُ بَعدَ مِلكِها لَهُ، جازَ أَن يَتَزَوَّجَهَا كَمَا يَجُوزُ لِغَيرِهِ عِندَ الجمهُور**)[1].

ئیبنو لعەرەبیی دەڵێ: لە شتە سەیرەکانی قورئان ئەوەیە کە ئەم دە (١٠) ئایەتە گشتیین بۆ پیاوان و ئافرەتان، وەک هەموو وشەکانی دیکەی قورئان کە ئافرەتان و پیاوان پێکەوە دەگرنەوەو گشتیین بۆ هەمووان، بەڵام لێرە (لەم دە ئایەتەدا)، ئەم ڕستەیە تایبەتە بە پیاوانەوە، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴾، ئەوانەی بۆ داوێنی خۆیان پارێزەرن، ئەمە خوا تەنیا پیاوانی پێ دواندوە، نەک ئافرەتان، بە بەڵگەی ئەوە کە دوایی دەفەرمووێ: ﴿ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ ﴾، مەگەر ئەوانەی کە لەگەڵ هاوسەرانی خۆیان، یاخود لەگەڵ کەنیزەکەکانی خۆیاندا جووت دەبن، قورتوبیی گوتوویەتی:

---

(١) الجامعُ لأحكامِ القُرآن: ج١٢، ص٩٠.

منیش دەڵێم: بە پێی ئەو واتایە لە ئایەتەکەدا، هیچ ئافرەتێک کە پیاوێکی کۆیلەی هەبێ، بۆی نیە لەگەڵیدا جووت بێ، ئەمە یەکدەنگیی زانایانی لەسەرە، چونکە ناچێتە نێو بازنەی ئایەتەکەوە، بەڵام ئەگەر ئەو ئافرەتە ئەو کۆیلەیەی خۆی ئازاد کردو، موڵکی ئەو نەما، ئەو کاتە بۆی هەیە ئەو ئافرەتە بێنێ، هەر وەک چۆن پیاوانی دیکەش بۆیان هەیە، هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکەن، وەک زۆربەی زانایان دەڵێن.

٥)- ﴿ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴾، مەگەر لەسەر هاوسەرانیان، یاخود ئەو ئافرەتانەی لەبەردەستیانن، (کەنیزەکەکانیان) ﴿ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴾، بە دڵنیایی لۆمەیان ناکرێ (ئەگەر لەگەڵ ئەواندا جووتبن و غەریزەی جینسیی خۆیان تێر بکەن، بە شێوەیەکی شەرعیی).

٦)- ﴿ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴾، بەڵام هەر کەسێک لە پشت ئەوەوە، جیا لەوە، شتی دیکە داوا بکات، (جیا لە هاوسەرو، کەنیزەک کە کاتی خۆی هەبووەو ئێستا نەماوە)، ئەوە ئەوانە سنوور بەزێنانن، سنوور شکێنانن.

بەپێی ئەم ئایەتە: هەم زینا، هەم نێر بازیی، هەم نیکاحی موتعە، کە شیعە کاری پێدەکەن، هەم ئاوی خۆ هێنانەوە، دەستپەڕ (إستمناء)، ئەوانە هەموویان ناڕەواو قەدەغەن، بەڵام دیارە هەر کامێکیان بە پلەی خۆی، با لەو بارەوە ئەم شوێنەوارە بێنین:

(رَوى مَعْمَـرٍ عَـنْ قَتَـادَةَ قَـالَ: تَسَرَّرَت إمـرَأَةٌ غُلامَها، فَذُكِـرَ ذَلِـكَ لِعُمَـر رَضِيَ اللـهُ عَنـهُ فَسَـأَلَها: مَـا حَمَلَـكِ عَـلَى ذَلِـك؟ قالَـتْ: كُنْـتُ أَراهُ يَحِـلُّ لِي بِمِلْـكِ يَمِينِـي، كـما يَحِـلُّ لِلرَّجُـلِ المَـرأَةُ مِلـكِ اليَمِـينِ، فَاستَشـارَ عُمَـرُ فـي رَجْمِهَـا أَصْحَـابَ رَسـولِ اللـهِ ﷺ فَقالُـوا: تَأَوَّلَـت كِتَـابَ اللـهِ عَـلَى غَـيْرِ تَأْوِيلِـهِ، لا رَجْـمَ عَلَيْهَـا)[1].

---

(١) الجامعُ لأحكامِ القُرآن: ج١٢، ص٩١و ٩٢.

واتـە: مەعمـەڕ لـە قەتـادەوە (کـە لـە زانایـانی شـوێنکەوتووان (**تابعـین**)ە، گێڕاویەتـەوە: دەڵـێ: ئافرەتێـک لەگـەڵ کۆیلەکـەی خۆیـدا جـووت بـوو بـوو، ئـەوە بـۆ عومـەر بـاس کـرا، عومـەر خـوا لێـی ڕازی بـێ بانگـی کـردو لێـی پـرسی: بۆچـی وات کـردوە؟ ئافرەتەکـە گـوتی: پێـم وا بـووە بـۆم حەڵاڵـە، لـە بـەر ئـەوە کـە بـە دەسـتی منەوەیـە (**مُلـكُ اليَمـين**)ە، کۆیلـەی منـە، هـەر وەک چۆن بـۆ پیـاو حەڵاڵـە، لەگـەڵ ئافرەتێـک کـە کەنیزەکیـەتی و بـەر دەسـتیەتی، جـووت ببـێ، عومـەر خـوا لـێ ڕازی بـێ لـە بـارەی بەردبارانکردنیـەوە ڕاوێـژی بـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـرد، گوتیـان: کتێبـی خـوای مانـا کـردوە، بەبـێ ئـەوەی مانـا ناڕاسـتەکەی بـێ، (واتـە: چەنـد ئایەتێکـی لێکداونـەوە بـە هەڵـە)، بۆیـە سـزای ڕەجمـی لەسـەر نیـە.

هەڵبەتـە دوایـی لـە تەفسـیری سـوورەتی (النـور)دا بـاس دەکـەم، کـە لە ڕاسـتیی دا سـزای بـەرد بـاران کـردن (رجـم)، یەکێـک نیـە لـەو سـزایانەی کـە لـە ئیسـلامدا هـەن، بـۆ کەسـانێک کـە زینـا دەکـەن، بەڵـێ لـە سـوننەتی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ بـووە، بـەڵام لـە قورئانـدا نیـەو، یـان بـە هـۆی قورئانـەوە نەسـخ بۆتـەوە، یـان پێغەمبـەر ﷺ کـە دوایـی بـاسی دەکەیـن، وەک بۆچـوون و ئیجتهادێکـی خـۆی ئـەوەی کـردوە، بـەڵام دوای دابەزینـی سـوورەتی (النـور)، ئـەو حوکمـە ئەگـەر هەشـبووبێ، کـە بـە تەئکیـد بـووە لـە سـوننەتی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ، نەسـخ بۆتـەوە، ئـەوە لـە شـوێنی خـۆی بـاسی دەکەیـن، خـوا پشـتیوان بێ.

٧)- ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴾، هەروەهـا ئەوانـەی چاودێریی سپاردەکان و پەیمانەکانی خۆیان دەکەن.

سـپاردە (**أمانـة**) کـە بـە (**أَمانـات**) کۆدەبێتـەوە، هـەر شـتێکە بـە مرۆڤ بسـپێردرێ، یـان پێـی سـپێردرا بـێ، کـە دەبـێ بیپارێـزێ، پەیـمان (**عَهـد**) کـە بـە (**عهُـود**) کۆدەکرێتـەوە، ئەویـش یـانی: بەڵێـن و پەیـمان، ئنجـا بێگومان هـەم (**أمانـة**)و هـەم (**عَهد**) دەگونجێ ماناکەیـان فـراوان بکـرێ و، هەمـوو ئـەوەی کـە مـرۆڤ لێـی داوا دەکـرێ،

بیپارێزێ، چ پەیوەندیی بە کاروباری دنیاییەوە هەبێ، چ ئایینی، چ پەیوەندیی بە نێوان خۆی و خواوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە نێوان خۆی و خەڵکەوە هەبێ، دەگونجێ هەمووی بگرێتەوە، بۆ وێنە: ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ، هەموویان ئەمانەتن لە لای مرۆڤ، ماڵ و سامانێک کە دێتە دەستی ئەمانەتە، ئەمانەت هەر ئەوە نیە کە خەڵک لە لای مرۆڤی دادەنێ، ماڵ و منداڵەکەی ئەمانەتە لە لای، هاوەڵ و دۆست ئەمانەتە، خزم ئەمانەتە لە ئەستۆیدا، دەبێ بیپارێزێ، کۆمەڵگا ئەمانەتە، دەگونجێ ئاوا مانای ئەمانەت فراوان بکرێ، بە تایبەتی کە خوا ﷻ بە کۆ هێناویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ ﴾، کە ئەمە خوێندنەوەیەکی دیکەشی هەیە: (**وَالَّذِينَ هُم لِأَمانَتِهِم وَعَهدِهِم**)، ئنجا ئەگەر ئەمانەت بێ، دیسان ماناکەی گشتیی دەبێ، یانی: هەموو جۆرە سپاردەیەک.

کە دەفەرموێ: ﴿ رَٰعُونَ ﴾، (**الرَّعيُ: مُراقَبَةُ الشَّيءِ بِحِفْظِهِ مِنَ التَلاشِي، وَبِإِصْلاحِ مَا يَفْسُدُ مِنْهُ**)، (**رَعِي**)، بریتیە: لە چاودێریی کردنی شتێک بۆ ئەوەی بیپارێزێ لە لەبەین چوون، یاخود ئەوەی کە لێی لە بەین دەچێ، لێی تێکدەچێ، چاکی بکاو ئاگای لێی بێ و بیپارێزێ.

وشەی (**عَهد**)یش، چ ئەو پەیمانەی لەگەڵ خوادا هەیە، چ ئەو پەیمانانەی لەگەڵ خەڵکدا هەن، چ ئەو پەیمانەی مرۆڤ لەگەڵ ماڵ و هاوسەریدا هەیەتی، یان ژن لەگەڵ مێردی هەیەتی، چ ئەوەی لەگەڵ منداڵەکانی هەیەتی، لەگەڵ دراوسێکان، لەگەڵ خزمان، لەگەڵ کۆمەڵگا، لەگەڵ حوکمڕانانێک کە دادگەرانە حوکم دەکەن، وشەی (**عَهد**)، ئەو پەیمان و بەڵێنانە هەموویان دەگرێتەوە، کە دەبێ مرۆڤ بیانپارێزێ و ئاگای لێیان بێ و چاودێرییان بکات.

٨)- ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی پارێزەرن بۆ نوێژەکانیان، یەکێ بۆی هەیە بڵێ: بۆچی پێشێ فەرمووی: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴾، لێرەش دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴾، لەوێ وشەی (**صَلاة**) بە تاک هاتوە،

لێرە بە کۆ هاتووەو، هەڵبەتە بە تاکیش هەر خوێنراوەتەوە؟ وەڵام لەوێ باسی نێوەڕۆکی نوێژی کرد، لێرە باسی نوێژ دەکات، بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، ئەوانەی پارێزەری نوێژەکانی خۆیانن، واتە: لە ڕووی ڕواڵەتەوە، نوێژەکانیان دەپارێزن، لە ڕووی دەروون و نێوەڕۆکەوە، نوێژەکانیان دەپارێزن، لە ڕووی لە کاتی خۆ ئەنجامدانیاندا، نوێژەکانیان دەپارێزن، لە ڕووی ئەوەوە، کە نوێژەکانیان ئەو شوێنەوارە چاکانەیان تێدا بەدی بێنێ، کە دەبێت لە نوێژکاراندا هەبن، نوێژەکانیان دەپارێزن، لەوە کە خۆیانیان بپارێزن لەو شتانەی کە دەبێ نوێژکاران خۆیان لێ بپارێزن، لەو بارەوە نوێژەکانیان دەپارێزن، کە شتێک نەکەن پێچەوانەی نوێژەکەیان بێ.

ئنجا چونکە (**خشوع**) لە نوێژدا مانایەکی تایبەت و دیارییکراوی هەیە، (صلاة)، بۆیە بە تاک هاتوە، بەڵام پارێزگاریی لە نوێژەکان مانایەکی گشتگیرو فراوانی هەیە، بۆیە بە کۆ (صلوات) هاتوە، هەم (**خشوع**)یش دەگرێتەوە، هەم لایەنی ڕواڵەتیی، هەم لە کاتی خۆ ئەنجام دان، هەم بە شێوەی ڕێک و پێک ئەنجامدان و، هەم دوای نوێژەکەشیان کە شتێک نەکەن، کردەوەیەکیان لێ نەپشکوێتەوە پێچەوانەی نوێژەکەیان بێ، ئەوانە هەموویان دەگرێتەوە.

بۆیەش خوا ﷻ لەوێ وا دەفەرموێ و، لەوێش وا دەفەرموێ.

جێی ڕامانیشە کە خوا ﷻ خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی ئیماندارانی بە نوێژ دەست پێکردووەو، بە نوێژیش کۆتایی پێهێناون: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝٢﴾، سیفەتی کۆتاییشیان ﴿وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾، ئەمەش گرنگیی و گەورەیی و پێگەو پلەو پایەی بەرزی نوێژ دیاریی دەکات، لە دینداریی مسوڵمانانەدا، چ لە دینداریی شەخسییاندا، چ لە دینداریی بە کۆمەڵیاندا، هەر بۆیەش لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَلَاتُهُ**} (**أخرجه أحمد: ١٦٩٩٥، وأبو داود: ٨٦٤، وابن ماجه: ١٤٢٦، والدارمي: ١٣٥٥، والحاكم: ٩٦٦**)، واتە: یەکەمین شتێک کە بەندە لێپرسینەوەی لە سەری دەکرێ لە گەڵیدا، لە ڕۆژی قیامەت دا، بریتیە: لە نوێژەکەی.

ئنجا ئەگەر لە نوێژەکەیدا باش بێ، دیارە لە شتەکانی دیکەشدا باش دەبێ، بێگومان هەر کەسێک نوێژ بەرپاکەری باش بێ، بە دڵنیایی نوێژەکەی بۆی دەبێتە قوتابخانەیەک، کە هەموو کردارو هەڵسوکەوتەکانی دیکەشی باش بن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە بڕوادارانی ڕازاوە بەو نۆ (٩) خەسڵەتە: (١- ئیمان، ٢- نوێژ، ٣- خوشوع، ٤- پشت کردنە لەغوو، ٥- زەکات دان، ٦- داوێن پاراستن، ٧-ئەمانەت پارێزیی، ٨- بەڵێنداریی، ٩- پارێزگاریی لە نوێژ)، ئەوانە دەبنە خاوەنی فیردەوس:**

وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

**١)-** ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴾، ئەوانە خۆیان میراتگرانن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾، ئەوانە ناوی ئاماژە (**إسم إشارة**)یە، ئەوە دەگەیەنێ کە شایستەی میراتگرییان هەبێ، لە کوێوە هاتوە ئەو شایستەییە؟ لە خۆ ڕازاندنەوەیان بەو نۆ سیفەتانەی پێشووەوە هاتوە، یانی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾، واتە: ئا ئەوانەی خاوەنی ئەو نۆ سیفەتانەن، ئا ئەوانە میراتگرانن.

بۆچی وشەی (میراتگران)یان بۆ بەکارهاتوە؟ (**اسْتُعِيرَ الوِرَاثَةُ لِلإِستِحقاقِ الثابِتِ لأَنَّ الإِرْثَ أَقْوَى الأَسْبَابِ لإِستِحقاقِ المالِ**)، وشەی (**وِرَاثَة**)، خوازراوەتەوە بۆ بوونە خاوەنێکی چەسپاو، چونکە میراتگرتن بەهێزترین هۆکارەکانی بوونە خاوەنی ماڵ و سامانە، یەکێک بە یەکێک دەڵێ: میراتی دایک و بابی نیە!.

**٢)-** ﴿ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ ﴾، ئەوانەی فیردەوس بە میرات دەگرن.

کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ ﴾، ﴿ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ ﴾، وەک پێشتریش باسمان کرد، (**البُستانُ الواسِعُ المُشتَمِلُ عَلَى أَنْوَاعِ الثَّمَر**)، بریتیە: لەو باغە فراوانەی کە هەموو جۆرە میوەکانی تێدایە، بەلام بە پێی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ بۆمان دەردەکەوێ، کە فیردەوس بەرزترین و خۆشترین و چاکترین شوێنی بەهەشتە، (**الفِردَوسُ أَشرَفُ**

**أَمَاكِنِ الجَنَّـةِ وَأَعلاَهَـا)**، گرنگترین و بەرزترین و چاکترین شوێنەکانی بەهەشتە، وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ:

**{فَـإذا سَـأَلتُمُ اللهَ فَسئَلُوهُ الفِـردَوسَ، فَإِنَّـهُ أَوسَـطُ الجَنَّـةِ وَأَعـلَى الجَنَّـةِ، وَمِنـهُ تَفْجُـرُ أَنهَـارُ الجَنَّـةِ} (أخرجـه البخـاري: ٢٧٩).**

واتە: ئەگەر داواتان لە خوا کرد، فیردەوسی لێ داوا بکەن، چونکە باشترین شوێنی بەهەشتەو، بەرزترین شوێنی بەهەشتەو، لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقووڵن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی بە قسمەتمان بکات، ئەو باشترین و بەرزترین شوێنەی بەهەشت، لەو بارەوە کە خوا ﷻ تەعبیری: ﴿يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ﴾، فیردەوس بە میرات دەگرن، ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە، ئەو دەقەی سوننەت دێنین کە تیشکمان بۆ دەخاتە سەر ئەو ئایەتە موبارەکەو، ئەوە دەچێتە نێو ئەوەوە کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، واتە: زیکرمان بۆ لای تۆ دابەزاندوە، تاکو ئەوەی بۆ خەڵک دابەزێنراوە، بۆیان ڕوون بکەیەوە، ئنجا ئەوەی کە پەیوەندیی بە لایەنی کردەییەوە هەیە، پێغەمبەر ﷺ بە کردەوە جێبەجێی بکات و ڕوون بێتەوە: چۆن جێبەجێ دەکرێ؟ هەندێ شتیش کە خوا بە کورتیی فەرموویەتی، پێغەمبەر ﷺ تیشک بخاتە سەری و ماناکەی ڕۆشنتر بێ، لێرە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە ئێستا دەیهێنین، تیشک دەخاتە سەر ئەوە کە چۆن و بۆچی بڕواداران بە ﴿ٱلْوَٰرِثُونَ﴾، میراتگران، وەسفکراوان؟

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

**{مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا لَـهُ مَنْزِلَانِ، مَنْـزِلٌ فِي الْجَنَّـةِ وَمَنْـزِلٌ فِي النَّـارِ، فَـإِذَا مَـاتَ فَدَخَـلَ النَّـارَ، وَرِثَ أَهْـلُ الْجَنَّـةِ مَنْزِلَـهُ، فَذَلِـكَ قَوْلُـهُ تَعَـالَى: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ﴾} (أَخْرَجَـهُ ابـنُ مَاجَـه: ٤٣٤١، قـال البوصيري: (٢٦٦/٤): هـذا إسـناد صحيـح عـلى شرط الشـيخين، والبيهقـي فـي شـعب الإيمـان: ٣٧٧، عَـن أَبِي هُرَيْـرَةَ).**

واتە: هیچ کام لە ئێوە نیە مەگەر دوو شوێنی هەن، (دوو جێگاو ڕێگای هەن) جێگاو ڕێگاو شوێنێک لە بەهەشت و، جێگاو ڕێگاو شوێنێک لە نێو ئاگری دۆزەخدا، ئنجا کاتێک کە مرۆڤ دەمرێ و دەچێتە نێو دۆزەخ، بەهەشتییەکان ئەو شوێنەی کە لە بەهەشتدا بۆی دانراوە، بە میراتی دەگرن، (لێی بە میرات دەگرن، بۆ وان دەبێ) ئەوەیە کە دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴾، ئا ئەوانە میرات گرانن، واتە: هی خۆیان بۆ خۆیانەو، ئەو شوێنانەی بێبڕوایانیش کە ئەگەر بڕوایان هێنابایە، بۆیان دانرابوون، ئەو شوێنانەش لەوان بە میرات دەگرن.

٣)- ﴿ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴾، ئا ئەوانە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

ئنجا لە درێژەی فەرموودەکەدا دەفەرموێ: هەروەها بڕوادارانێک کە دەچنە بەهەشت، ئەوانیش دیارە شوێنیان لە دۆزەخیشدا بۆ دانراوە، ئنجا کە شوێنیان لە دۆزەخدا بۆ داندراوە، کاتێک کە ئەوان دەچنە بەهەشت و شوێنی کافرەکانیش بە میرات دەگرن، کافرەکانیش کە دەچنە دۆزەخ، شوێنی خۆیان هی خۆیان و، هی بڕوادارانێکیش کە ئەگەر کافر بووبانایە ئەو شوێنەیان بۆ دادەنرا، لە دۆزەخدا شوێنی ئەوانیش بە میرات دەگرن.

ئنجا لە سوورەتی (التغابن) کە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلتَّغَابُنِۗ ٩ ﴾، کە لەوێدا ئەگەر تەمەن باقی بێ پێی گەیشتین، فەرمایشتەکە دێنین، ئەو بابەتە جارێکی دیکە ڕوون دەکەینەوە، واتە: هەر کامێکیان زیان بەوی دیکە دەگەیەنێ و، هەر کامێکیان شتێک کە بۆوی دانراوە، دەبێتە هی وی، بەهەشتییەکان شوێنی بە گریمانە بۆ دانراوی کافرەکان لە بەهەشتدا بە میرات دەگرن و، کافرەکانیش شوێنی بە گریمانە بۆ دانراوی بەهەشتییەکان و ئیمانداران بە میرات دەگرن.

## با لە دوو ڕەحمەتەکەی خوا بەهرەمەندبین!

بەڕێـــزان!

دەمـەوێ لـە کۆتایـی ڕوون کردنـەوەو تەفسـیرکردنی ئـەو یـازدە (١١) ئایەتـە موبارەکـەی سـەرەتای سـوورەتی (المؤمنـون)دا، دڵسـۆزانەو بـە پەرۆشـانە ڕوو بکەمـە هەمـوو لایـەک و بڵێـم:

بێگومـان خـوا ﷻ قورئـانی دابەزانـدوە، بـە هـەر (١١٤) سـوورەتەکەیەوەو، بـە هـەر (٦٢٣٦) ئایەتەکـەوەو، بـە هەمـوو وشـەکانیەوە، کـە (٧٧٤٣٩) وشـەیەو، بـە هەمـوو پیتەکانیـەوە، کـە (٣٢١١٨٠) پیتـە، خـوا ئـەم قورئانـەی دابەزانـدوە، ئەگـەر ئینسـان بیـری لـێ بکاتـەوە، بەڕاسـتیی کـەڕەم و لوتـف و میهرەبانیـی خـوا، بەزەیـی و پـەرۆشی خـوا، بـۆ مرۆڤـەکان سـنووری نیـە.

وەک پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێـک لـە جەنگێکـدا هـاوەڵان لـە دەوری بـوون، ئافرەتێکـی بینـی سەراسـیمە دەگـەڕا، زۆر بـە پەرۆشـەوە دەچـووە ئەمـلاو دەچـووە ئەمـلا، لـە منداڵێکـی خـۆی دەگـەڕا، دوایـی کـە منداڵەکـەی بینـی، یەکسـەر بـە سـینگی خۆیـەوە گـوشی و مەمکـی دایـەو لـە بـاوەشی گـرت، پێغەمبـەر ﷺ بـە هـاوەڵانی بەڕێـزی فەرمـوو: پێتـان وایـە ئـەم ئافرەتـە ئێسـتا ئـەو منداڵـەی خـۆی دەخاتـە نێـو ئاگـر، گوتیـان: نەخێـر ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ فەرمـووی: سـوێند بـەوەی گیـانی منـی بـە دەسـتە، خـوا ﷻ بەرانبـەر بـە بەنـدەکانی لـەو دایکـە بەرانبـەر بـەو منداڵـەی بـە بەزەییـترە[١].

---

(١) {عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَدِمَ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ سَبْيٌ فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنْ السَّبْيِ قَدْ تَحْلُبُ ثَدْيَهَا تَسْقِي إِذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِي السَّبْيِ أَخَذَتْهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا وَأَرْضَعَتْهُ، فَقَالَ لَنَا النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: أَتُرَوْنَ هَذِهِ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ؟ قُلْنَا لَا وَهِيَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ لَا تَطْرَحَهُ، فَقَالَ: لَلَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هَذِهِ بِوَلَدِهَا} أخرجه البخاري: ٥٩٩٩.

ئنجا ئایا بەزەیی خوا ﷻ لە چیدا بەرجەستە بووە؟ بە پلەی یەکەم لەم قورئانەدا، ئەم فەرمایشتەی خۆی، کە وەک گوتم: (٦٢٣٦) ئایەتەو، هەموو ئەو هەزاران ئایەتە بۆ ئەوەن کە بۆ ئێمە ببنە هیدایەت، بۆ تاک تاکمان و، بۆمان ببنە بەرنامەی ژیان، وەک کۆمەڵ و کۆمەڵگامان، تاکو هەم لە دنیادا ژیانێکی مرۆڤانەی تەندروستی ڕێک و پێک بگوزەرێنین و، بەختەوەر بین لە ژیانی دنیادا، چونکە ئەگەر قورئان پیادە بکرێ و، موسوڵمانان ئایەتەکانی قورئان لە ژیانی خۆیاندا جێبەجێ بکەن، لە هەموو چاکەیەک بەهرەمەند دەبن و لە هەموو خراپەیەک دوور دەبن، دادگەریی دەچەسپێ، زوڵم و ستەم نامێنێ، تەبایی و برایەتیی دەبێ، لێک جیایی و دوژمنکاریی نامێنێ و، مرۆڤەکان هەموو سیفەتە بەرزو پەسندەکانیان دەبن: ڕاستگۆیی، ڕەحم، ئینصاف، خێرخوازیی بۆ یەکدی، خاکیی بوون لەگەڵ یەکدی و، ...هتد، هەروەها لە هەموو سیفەتە خراپەکان دوور دەبن، یەکەمین بەرجەستەکەری ڕەحمەتی خواو میهرەبانیی و بەزەیی خوا بۆ مرۆڤەکان، بریتیە: لە قورئان و، دووەم: پێغەمبەر (محمد) ﷺ کە هەر نازناوی ڕەحمەتی بۆ دانراوە، وەک چۆن خوا ناوی لە قورئان ناوە ڕەحمەت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ یونس، واتە: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هاتووەو، شیفاو چارەسەر بۆ ئەوەی لە سینەکانتاندا هەیەو، ڕێنمایی و بەزەیی بۆ بڕواداران.

ئنجا وەک چۆن قورئان ڕەحمەتە، پێغەمبەری خواش ﷺ خوا بە ڕەحمەت پێناسەی کردوە: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾ الأنبياء، واتە: تۆمان نەناردوە مەگەر بەزەیی بی بۆ هەموو جیهانییان، نەشیفەرمووە (**لِلمُسلِمِين**)، تەنیا بۆ مسوڵمانان، بۆ هەموو جیهانییان، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، بەڵکو هەندێک لە زانایان دەڵێن: (**عَالَمِين**) تەنیا مرۆڤەکان ناگرێتەوە، بەڵکو مرۆڤ و جندو ژیانداروو ڕووەک، بەڵکو هەموو ئەو دروستکراوانەی خوا دروستی کردوون،

بەهۆی پەیامی پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ بەهرەمەند بوون، پەیامی پێغەمبەری خاتەمیش نێوەڕۆکەکەی قورئانە، خۆشی ئەو قورئانەی بەرجەستە کردوەو، جێبەجێی کردوە، بۆیە ئێمە ئەگەر بێت و کەمتەرخەمیی بکەین لەگەڵ قورئانداو لەگەڵ پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ ڕێبازو ڕێیەکەیدا، مانای وایە ئێمە نیعمەتی خوامان نادیدە گرتوەو، ئەو کاتە ئێمە سپڵە دەردەچین بەرانبەر بە خوای خۆمان، کە ئەو هەموو ڕەحم و بەزەیی و شەفەقەتەی بەرانبەر بە ئێمە نواندوە، تاکو ئێمە بەختەوەر بین، دەبێ هەموو لایەک بزانین کە خوا ﷻ لە ئەسڵدا ئێمەی بۆیە دروست نەکردوە سزامان بدات، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿مَّا يَفۡعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمۡ إِن شَكَرۡتُمۡ وَءَامَنتُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمٗا ١٤٧﴾ النساء، واتە: خوا چی دەکا لە سزادانی ئێوە، ئەگەر ئێوە سوپاس گوزار بن و ئیماندار بن.

یانی: ئەگەر سپڵە نەبن خوا چی داوە لە سزای ئێوە؟ بەڵام ئەوە خۆمانین خۆمان دەخەینە نێو سزاو ئازارەوە، کاتێک کە پشت دەکەینە نیعمەتی خوا، پشت دەکەینە هیدایەتی خوا، ئەوە خۆمانین ئەوە بەسەر خۆمان دێنین، ئەگەرنا خوا ﷻ بەندەکانی خۆی خۆش دەوێن، بە تەنگیانەوەیە، بۆیان بە بەزەییە، لەگەڵیان میهرەبانە، باشترین بەڵگەش ئەم قورئانەیە بەو هەموو سوورەتانەو، بەو هەموو ئایەتە موبارەکانەو، بەو هەموو نێوەڕۆکەوە، کە خێری دنیاو قیامەت دەگرێتە خۆی، پاشان پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ کە هەم قورئانی هێناوە کە ڕەحمەتەو، هەم بۆ خۆشی ڕەحمەت بووە، ئنجا بە ئەندازەی ئەوە کە مرۆڤایەتیی لەگەڵ قورئاندا ئاوێتە دەبێ و، کارلێک دەکات، لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺو شوێنی دەکەوێ، لە ڕەحمەتی خوا نیزیک دەبێ و، بە پێچەوانەوە: بەئەندازەی ئەوە کە مرۆڤایەتیی مسوڵمانان و ناموسوڵمانان، پشت دەکەنە قورئان و، پشت دەکەنە ڕێبازەکەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، لە ڕەحمەت دوور دەکەونەوەو تووشی زەحمەت دەبن، تووشی بەڵاو گرفتاریی دەبن، وەک ئێستا

دەیبینین، مرۆڤایەتیی چۆن گرفتار بووە، بە دەست دەیان و سەدان کێشەو گرفتاریی و، نەخۆشیی و ناخۆشییەوە، چ لەسەر ئاستی تاکەکان، چ لەسەر ئاستی دەوڵەتان و کۆمەڵگاکان و، چ لە دەروونی خۆیاندا، چ لە ڕواڵەتیاندا، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتیی ئێمەی مسوڵمان بدات، کە هەرچی زیاتر بەهرەمەند بین لە هەردوو ڕەحمەتەکەی خوا، هەم لە قورئان و، هەم لە پێغەمبەری کۆتایی ﷺو ڕێبازو بەرنامەکەی، کە ڕێبازەکەشی هەر بریتیە لە جێبەجێ کردنی قورئان و، چەسپاندنی قورئان و، پراکتیزە کردنی قورئان، لە هەموو بوارەکانی ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا.

سُبْحَانَك اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (١٢ - ٢٢)و، لەو یازدە (١١) ئایەتەدا خوای بەرزو مەزن باسی قۆناغەکانی دروستبوونی مرۆڤی کردوە، پاشان باسی مردنی و زیندوو کردنەوەی کردوە، هەروەها باسی دروستکردنی حەوت ئاسمانەکان و، چین لەسەر چین لەسەر یەک و، دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی بە ئەندازەو، جێگیر کردن و سەقامگیرکردنی ئەو ئاوە لە زەویی دا.

پاشان ڕواندنی باخی خورماو ترێ و میوەجاتی زۆر، بە تایبەت باسی درەختی زەیتوون کراوە، کە لە دەشتی سەیناء دەڕوێ، دوایی باسی ئاژەڵ و، شیری نێو سکی و، سوودی دیکەی زۆری و، بەکارهێنانی (بە تایبەت حوشتر) بۆ بارو سوار، وێڕای کەشتیی لەنێو دەریادا.

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّٰهُ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْءَاكِلِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە دڵنیایـی مرۆڤـمان لـە پوختەیـەک لـە قـوڕێ دروسـتکردوە ﴿١٢﴾ دوایـی گێڕامـان بـە نوتفەیـەک لـە نشـینگەیەکی چەسـپاوو مەحکەمـدا ﴿١٣﴾ دوایـی (نوتفەکـە) گێڕامـان بـە خوێنپارەیـەک و، (خوێنپارەکـە) کردمانـە پارچـە گۆشـتێکی زارجـوو ئاسـاو، (پارچـە گۆشـتەکەش) کردمانـە ئێسـک و ئێسکەکەشـمان بـە گۆشـت داپـۆشی، دوایـی لەشـێوەی دروسـتکراوێکی دیکـەدا پێـمان گەیانـد، بەرزیـی و پێـز بـۆ خـوای چاکترینـی بەدیهێنـەران ﴿١٤﴾ ئنجا دوایـی ئێـوە (ئـەی مرۆڤـەکان!) بـە دڵنیایی دەمـرن ﴿١٥﴾ دواییـش بـە دڵنیایـی ڕۆژی هەڵسـانەوە زینـدوو دەکرێنـەوە (بـۆ سـزاو پاداشـت) ﴿١٦﴾ بێگومانیـش لـە سـەرووتانەوە حـەوت چینـە ئاسـمانمان دروسـتکردوون و، ئێمـەش لـە دروسـتکراوی خۆمـان بـێ ئـاگا نیـن ﴿١٧﴾ لـە ئاسمانیشـەوە ئاوێکـی بـە ئەندازەمـان دابەزانـدوەو، لـە زەوییـدا سـەقامگیرمان کـردوەو، بـە دڵنیایـی ئێمـە لەسـەر (نەهێشـتن و) لابردنیـشی بـە توانایـن ﴿١٨﴾ ئنجا بـەو ئـاوە چەنـدان باغـی خورمـاو ترێـمان بـۆ ئێـوە پێگەیانـدن، کـە زۆر جـۆرە میوەیـان بـۆ ئێـوە تێـدان و لێیـان دەخـۆن ﴿١٩﴾ هەروەهـا درەختێکیـشی پـێ دەڕوێنیـن، لـە طـووری سـەیناء دێتـە دەرێ، کـە ڕۆن و پێخـۆری بـۆ خـۆرەران لـێ بەرهـەم دێ ﴿٢٠﴾ هەروەهـا لـە ئاژەڵانیشـدا پەنـد بـۆ ئێـوە هەیـە، کـە لـەوەی لـە سـکیان دایـە خواردنەوەتـان (شـیرەکەیانتان) بـۆ دەڕەخسێنین و، پێتـانی دەنۆشـین و، سـوود گـەلی زۆری تێـدان و لێشـیان (لـە گۆشـتەکەیان)، دەخـۆن ﴿٢١﴾ هەروەهـا ئامـڕازو هـۆکاری بـارو سـوارتان لەوانیـش و لـە کەشـتییانیش بـۆ ڕەخسـاوە ﴿٢٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(سُلَٰلَةٍ): (سَلَّ الشَّيءَ مِنَ الشَّيءِ: نَزَعَهُ، وَقِيلَ لِلوَلَدِ: سَلِيل، والسُّلاَلَةُ: الصَّفو الَّذِي يُسَلُّ مِنَ الأَرض)، (سَلَّ الشَّيءَ مِنَ الشَّيءِ)، لێی دارِنی، لێی وەرگرت، بە ڕۆڵەی مرۆڤ دەگوترێ: (سَلِيل)، (فُلان سَلِيلُ فُلاَنٍ)، چونکە لەوەوە هاتوە، لەوەوە وەرگیراوە، لێرەدا وشەی (سُلاَلَة) بریتیە لەو پوختەیەی کە لە زەوی وەردەگیرێ.

(نُّطْفَةً): (النُّطْفَةُ: المَاءُ الصَّافِي، والمَاءُ القَلِيْل، يُعَبَّرُ بها عَنْ مَاءِ الرَّجُل)، (نُطْفَة)، بە ئاوێکی بێ خەوش دەگوترێ، هەروەها بە ئاوێکی کەمیش دەگوترێ و، تەعبیریشی پێ دەکرێ لە ئاوی پیاو، (راغب) وایگوتوە، بەڵام من پێم وایە: (نُّطْفَةً)، بریتیە: لە کۆی ئاوی پیاوو ئافرەت.

(قَرَارٍ مَّكِينٍ): واتە: نشینگەیەکی مەحکەم، (مکین: مُتمَكِّن)، چەسپاو، (قَرار، مُستَقَرّ)، نشینگە، (وَالإقرارُ: إثبَاتُ الشَّيءِ)، (إقرار)، بریتیە: لە چەسپاندنی شتێک، سەقامگیرکردنی شتێک لە شوێنێکدا.

(عَلَقَةً): پارچە خوێن، (العَلَقُ: التَشَبُّثُ بِالشَّيءِ)، (عَلَقْ)، بریتیە لە دەستگرتن، یان خۆهەڵواسین بە شوێنێکەوە، (وَالعَلَقُ: الدَّمُ الجامِدُ، وَمِنهُ العَلَقَة..)، (عَلَق) بە خوێنی وشک و ڕەق هەڵهاتووش دەگوترێ، یان خوێنێکی پتەو، لەوەوە بە (عَلَقَة)، کە لەدوای (نُّطْفَةً)، ئەگەر خوا ﷻ بیەوێ ئەو مرۆڤە بە قۆناغەکاندا بڕوات، دەبێتە (عَلَقَة)ە، خوێنپارە لەوەوە بە (عَلَقَة)، گوتراوە: (عَلَقَة)، کە خۆی بە منداڵدانی ئافرەت هەڵدەواسێ.

(مُضْغَةً): (المُضْغَةُ: القِطْعَةُ مِنَ اللَّحْمِ قَدَرَ مَا يُمضَغُ وَلَم يَنْضَج)، (مُضْغَة)، بریتیە لە پارچە گۆشتێک، بە ئەندازەی ئەوە کە بجووڕێ، زارجوە گۆشت، بەڵام بە مەرجێک نەکوڵابێت، ئنجا پێی دەگوترێ: (مُضْغَة).

(سَبْعَ طَرَآئِقَ): (طَرَائِـقْ: جَمْـعُ طَرِيقَـة، وَجَمـعُ طَرِيـق: طُـرُق)، وشـەی (طَرَائِـقْ)، كـۆی (طَرِيقَة)یـە، بـەڵام وشـەی (طَرِيـق)، یـانی: ڕێـگا، بـە (طُـرُق)، كـۆ دەكرێتـەوە، (سبع طَرائـفَ)، بـە حـەوت چینـەكانی ئاسمان دەگوتـرێ، (أَطْبَـاقُ السَّـمَاء، يُقَـالُ لَهَـا: طَرَائِـق).

(بِٱلدُّهْنِ): (جَمْـعُ الدُّهْـنِ: أَدْهَـان)، (دُهْـن)، یـانی: ڕۆن، چەوریـی بـە (أَدْهَـان) كـۆ دەكرێتـەوە، چەوریيـەكان، ڕۆنـەكان.

(وَصِبْغٍ): (الصَّبـغ: مَصْـدَرُ صَبَغتُـهُ)، وشـەی (صِبْـغ)، چاوگـی (صَبَغتهُ)یـە، واتـە: بۆیـەم كـرد، ڕەنگـم كـرد، (الصِّبْغُ: المَصبُـوغُ)، (صِبْغ) بریتیـە لـە شـتی ڕەنـگ كـراو ﴿وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ﴾، (أُدمٍ لَهُـم)، واتـە: پێخـۆر، بـۆ خـۆرەران، ئەوانـەی كـە دەیخـۆن.

(لَعِبْرَةً): (عِـبرَة)، یـانی: پەنـد، لەبـەر ئـەوە لـە شـتێكەوە دەپەڕیـەوە بـۆ شـتێكی دی، دەڵـێ: (العِـبْرَةُ: الإعتِبَـارُ وَالعِـبْرَةُ بِالحَالَـةِ الَّتِـي يُتَوَصَّـلُ بِهَـا مِـنْ مَعْرِفَـةِ المُشَـاهَدِ إِلى مَـا لَيْـسَ بِمُشَـاهَدٍ)، لەبـەر ئـەوەی بەهـۆی زانینێكـەوە، كـە دەبیـنرێ، دەگوازیـەوە بـۆ شـتێكی دیكـە كـە نابینـدرێ، یاخـود نازانـدرێ، (عِـبرَة) بـە مانـای بەڵگـەش دێ، چونكـە لـەو بەڵگـەوە دەپەڕیـەوە بـۆ بەڵگـە لەسـەر هێنراوەكـە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەوەی لە یازدە (١١) ئایەتی پێشوودا، باسی سیفەتە بنەڕەتییەکانی بڕوادارانی سەرفرازی کرد، کە لە دەرسی پێشوودا باسمان کردن و، شیمان کردنەوە، ئنجا دێتە سەر باسی دروست بوونی مرۆڤ و، قۆناغەکانی دروست بوونی مرۆڤ، چ ئادەم و حەووای هاوسەری، صەڵات و سەلامی خوایان لێ بێ، چ وەچەکەیان، دەفەرموێ:

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤمان لە پوختەیەکی وەرگیراو لە قوڕێ، دروستکردووە، ئەمە دەگونجێ مەبەستی دروست بوونی ئادەم بێ، سەلامی خوای لێ بێ، کە ئادەم وەک پێغەمبەر ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، جەستەکەی لە هەموو جۆرەکانی گڵی زەوی یان قوڕی زەوی وەرگیراوەو، پوختەیەکی ئەو قوڕە بووە، قوڕیش بریتییە لە (ئاو + گڵ).

دەشگونجێ لێرەدا مەبەست لە ﴿ ٱلْإِنسَـٰنَ ﴾، مرۆڤ بێ بە گشتی، ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾، واتە: مرۆڤمان بە گشتی لە پوختەیەک کە لە قوڕێ وەرگیراوە، دروستکردووە، چونکە وەک دوایی باسی دەکەین: ئەو نوتفەیەی کە مرۆڤی لێ دروست دەبێ، کە بریتییە: لە کۆبوونەوەی حەیمەنێکی پیاو، لەگەڵ هێلکۆڵەیەکی ئافرەتداو، دوای ئەوەی کە دەپیتێنرێ و لە منداڵدانی دایکدا جێگیر دەبێ، پێی دەگوترێ: ﴿ نُطْفَةً ﴾، ئنجا ئەو نوتفەیەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ قوڕی زەوی، چونکە ئەو نوتفەیەش بێگومان لە خوێنی باب و دایک دروست بووە، خوێنەکەش دیارە لەو خواردن و خواردنەوەی کە خواردوویانە، خواردنەکەش بێگومان یان ڕووەکەو، یان ئاژەڵە، یان ئاوە، هەرچی هەیە هەر دەگەڕێتەوە بۆ زەوی[1].

---

(١) هەڵبەتە ئێمە دوایی بابەتێکی سەربەخۆ لە بارەی دروست بوونی مرۆڤەوە، دەخەینە

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾، دوایی ئەو پوختە وەرگیراوەمان لە قوڕ، کردە نوتفەیەک لە نشینگەیەکی مەحکەمدا، ئنجا ئەو پوختە وەرگیراوە، ئاوی ئادەم و حەووا، واتە: تۆو (منی)ی ئادەم و حەووا، بوە بە نوتفەیەک لە نشینگەیەکی مەحکەمدا، ئنجا دوایی لەوێوە شێوەی دروستبوونی مرۆڤان، لەوەوە کە ڕاستەوخۆ لە قوڕی زەوییەوە بێ، کە دروست بوونی ئادەم و حەووایە، گوازرایەوە بۆ جۆرێکی دیکە کە لە ڕێی نوتفەوە بێ، نوتفەیەک کە لە منداڵدانی ئافرەتدا سەقامگیر دەبێ و، گەشە دەکاو پێ دەگات، ئنجا بەو شێوەیە مرۆڤ دروست دەبێ.

﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴾، دوایی نوتفەکەمان کرد بە خوێنپارە، ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴾، خوێنپارەکەشمان کردە پارچە گۆشتێکی زارجوو ئاسا، ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا ﴾، دوایی پارچە گۆشتە زارجوو ئاسایەکەشمان کردە ئێسقان، گۆڕیمان بۆ ئێسک ﴿ فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ﴾، دواییش ئێسکەکەمان بە گۆشت داپۆشی، ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴾، ئنجا کردمان بە دروستکراوێکی دیکە، گواستمانەوە بۆ قۆناغێکی دیکە، بە شێوەیەکی دیکە پێمان گەیاند، کە زۆر جیابوو لەوەی پێشێ، کەوا پێدەچێ مەبەست لێرەدا ڕووح بە بەردا کردن بێ.

﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾، بەرزیی و پێز بۆ خوای باشترینی بەدیهێنەران.

ئنجا خوا ﷻ لە شێوەی نادیارەوە دەیگۆڕێ بۆ شێوەی دواندن، (**خِطاب**) پێشێ بە شێوەی نادیار خوا فەرمایشتی فەرموو، لە بارەی دروست بوونی مرۆڤەوە، ئەو جارە یەکسەر ڕوو دەکاتە مرۆڤان و دەیاندوێنێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴾، ﴿ ثُمَّ ﴾، لێرەدا دەگونجێ بۆ ئەوەبێ، کە ئەوەش قۆناغێکی دیکەیە، یاخود ﴿ ثُمَّ ﴾، ئەگەر مەبەست پێی کاتیش نەبێ، مەبەست پێی پلە (**رتبة**)یە، واتە: ئنجا ئێوە ئەی مرۆڤەکان! دوای ئەم ژیانە دەچنە پلەو قۆناغێکی

ڕووو، چ ئادەم ؑ هەروەها حەووای خێزانیشی، چ وەچەکەیان، مرۆڤەکانی دیکە.

دیکەوەو بە دڵنیایی دەمرن، ﴿ ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تُبۡعَثُونَ ﴾، دوای ئەوەش قۆناغێکی دیکەیەو، بە دڵنیایی لە ڕۆژی هەڵسانەوەشدا ئێوە زیندوو دەکرێنەوە.

﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ ﴾، بە دڵنیایی لە سەرووتانەوە حەوت چینمان دروست کردوون، واتە: حەوت ئاسمان، ﴿ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴾، ئێمەش لە دروستکراوی خۆمان بێئاگا نین، بە پێچەوانەی بیرو بۆچوونی ئەرەستۆو فەلسەفەی یۆنانیی بە گشتیی، ئەوانەیان کە خواناس بوون، پێیان وابووە، خوا ﷻ گەردوونی دروست کردوەو وەک سەعاتێک قورمیشی کردوەو لێیگەڕاوە، پێیان وابووە، خوا لەوە بەرزو مەزنترە بیر لە وردەکارییەکان بکاتەوە، یاخود سەرگەرمی وردە ئیشەکان بێ، ئەو وردە ئیشانەی بۆ مرۆڤان، یان بۆ فریشتان بەجێ هێشتوون! هەر بۆیە لە فەلسەفەی یۆنانییدا هەیە، کە هەندێک لە فەیلەسووفە مسوڵمانەکانیش پێی کار تێکراو (**متأثر**) بوون، هەندێکیان پێیان وابووە، کە زانیاریی خوا، پەیوەست نابێ بە وردە شتەکانەوە، (**عِلمُ اللهِ لا يَتَعَلَّقُ بالجُزئِيَّات**)!، کە بێگومان ئەوە بیرو بۆچوونێکی ئەفسانەییەو، دوورە لە پایەی بەرزی خوا، کە ئاگای لە دروستکراوەکانی خۆی نەبێ، بە وردو درشتەوە.

﴿ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَسۡكَنَّٰهُ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەروەها لە سەرووتانەوە بە ئەندازە ئاومان ناردۆتە خوارو، لە زەویی دا نیشتەجێمان کردوە، سەقامگیرمان کردوە، ئینسان ئەگەر بیر بکاتەوە: ئەوەندە بارانەی کە دەبارێ، ئەگەر خوا ﷻ بە ئەندازە نەیبارێنێ، کارەسات دەقەومێ، بۆ وێنە: ئەمساڵ کە لەم وڵاتی ئێمە، لە هەرێم و لە عێراق و ناوچەکەش، بارانی زۆر باری، لافاوی زۆری لێکەوتەوە، ئنجا تۆ گریمان بکەو دایبنێ، لە جیاتی ئەوەندەی باریوە، دوو ئەوەندە، سێ ئەوەندە بباری! دەبێ دنیا چی لێبێ؟ بۆیە خوا دەفەرموێ: بە ئەندازە لە سەرێوە ئاومان دابەزاندوە، وشەی ﴿ مِنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، یانی: لەسەرێوە، ﴿ ٱلسَّمَآءِ ﴾، بە مانای هەوریش هاتوە، بەڵام لێرەدا بە مانای سەرێیە، نەک ئەو حەوت ئاسمانانەی خوا ﷻ باسیان دەکات و، چین، لە سەر چین و، تا ئێستاش زانیاریی

شتێکی وایان لە بارەوە نازانیٚ، ﴿فَأَسْكَنَّٰهُ فِي ٱلْأَرْضِ﴾، ئەو ئاوەمان لە زەویی دا نیشتەجیٚ کردوە، سەقامگیرمان کردوە، ئەویش دیسان شتێکی یەکجار گەورەو گرنگە: ئەو ئاوە دەگونجا لە زەویی دا نیشتەجیٚ نەبیٚ و، بەناخی زەویی دا بچێتە خوار، یان هەمووی ببێتەوە بە هەڵم، بەڵام خوا ﷻ بۆمان عەمبار دەکا، لە خەزێنەو لە عەمبارەکانی نێو زەویی دا، خوا ﷻ ئەو ئاوە شیرین و زوڵاڵە کە لە هەورەکان دێتە خوار، بەشێوەی باران و بەفرو تەرزە، بۆمان عەمبار دەکات، بۆمان هەڵدەگریٚ، ﴿وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابِۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ﴾، ئێمە لەسەر لابردنی و نەهێشتنی توانا دارین، بەڵام لامان نەبردوەو، هێشتوومانەتەوە بۆ ئەوەی ژیانی ئێوەی پیٚ بەڕێوەبچیٚ، ﴿فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ﴾، بەو ئاوە، کە لە شێوەی باران و بەفرو تەرزەدا هاتۆتە خوار، پێمان پیٚ گەیاندوە چەند باخێک لە خورماو لە ترێیەکان، هەم لە درەختی خورماو، هەم لە درەختی مێوەکان، ﴿لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾، بۆ ئێوە لەو باخانەدا (جگە لە خورماو لە تریٚ) چەندان میوەی زۆر هەن، لێیان دەخۆن، جارانی دیکەش باسمان کردوە: بۆچی خوا ﷻ بە وشەی (**مَاء**)، باسی ئەوە دەکات کە لە سەریٚ بۆمان دادەبەزێنیٚ؟ نافەرمویٚ: (**مَطَر**) یان (**ثَلج**) یان (**بَرَد**)؟ بۆ ئەوەی هەرسێکیان بگرێتەوە، بەڵکو ئاونگ و شەونم و هەڵمیش بگرێتەوە، بەڵام هەر کامیانی هێنابایە، بەس یەکێکیانی دەگرتەوە، بەڵام کە دەفەرمویٚ: ئاو، واتە: چ لە شێوەی شل دا کە بارانە، چ لە شێوەی لە نێوان شل و ڕەقدا، کە بەفر، (**ثَلج**)ە، چ لە شێوەی ڕەق و بەستوودا، کە تەرزەیە.

هەروەها خوا ﷻ بە تایبەت باسی دار خورماو دار مێو (تریٚ) دەکات، بەڵام دوایی دەفەرمویٚ: ﴿لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾، ﴿فِيهَا﴾، ئەم ڕاناوە دەچێتەوە بۆ ﴿جَنَّٰتٍ﴾، واتە: لەو باخانەدا کە بە تایبەت درەختی خورماو درەختی ترێیان تێدایە، زۆر میوەی دیکەشیان تێدایە، بەڵام چونکە بەرزترینی درەختەکان دار خورمایەو، نزمترینیشیان دار مێوە، کە بەزەویدا بڵاو دەبێتەوە،

یان کەپری بۆ دەکەن و، بەرز نابێتەوە، ئنجا ئەوەی لە نێوان ئەو دووانەدا ئەو دار خورما بەرزانەو، ئەو دار مێوە کە بە زەویی دا ڕاخراوە، لە نێوانیاندا جۆرە میوەی دیکەی زۆر هەن!

دوایی بە تایبەت باسی درەختی زەیتوون دەکات، ﴿ وَشَجَرَةً تَخۡرُجُ مِن طُورِ سَيۡنَآءَ ﴾، هەروەها بەو ئاوە درەختێک پێ دەگەیەنین و دەڕوێنین، کە لە چیای سەیناء دەردەچێ، ﴿ طُورِ سَيۡنَآءَ ﴾، ﴿ طُورِ ﴾، یان بە ڕەهایی بەمانای چیایە، یان بە مانای چیایەکی تایبەتە، کە مووسا ﷺ لە سەری گفتوگۆی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا کردووەو، لە دەشتی (سَیناء)ە، کە هەم بە (سِیناء) خوێندراوەتەوەو هەم ﴿ سَيۡنَآءَ ﴾یش، ئەو درەختەش بە زۆریی لەوێ دەڕوێ.

ئنجا خوا ﷻ لە شوێنی دیکە ناوی زەیتوونی هێناوە، بەڵام لێرەدا باسی ناکات، بەس دەفەرموێ: درەختێک لەوێ دەڕوێ، کە وا پێدەچێ مەڵبەندو چاوگی بنەڕەتیی درەختی زەیتوون، ئەوێ بووبێ، ناوچەی شام ﴿ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ ﴾، کە ئەو درەختەش کە دەڕوێ، هەم ڕۆنی تێدایە، هەم پێخۆریش بۆ خۆرەران، ئەوانەی دەیخۆن، ﴿ وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗ ﴾ **(الأنعام)**، بەپێی ڕایەکی زانایان، ئەو چوارە دەگرێتەوە: (حوشترو ڕەشە وڵاخ و مەڕو بزن)، هەندێکیش دەڵێن: **(أنعام)** کۆی ئەو ئاژەڵانە دەگرێتەوە، کە مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبن، ئنجا دەفەرموێ: لە ئاژەڵانیشدا بۆ ئێوە پەندێکی گەورە هەیە، ﴿ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا ﴾، لەوەی کە لە سکیان دایە، بە ئێوەی دەنۆشێنین، واتە: ماددەیەکی خواردنەوەی بۆ ئێوە لێ دەڕەخسێنین کە مەبەست پێی شیرە، دوایی ئەو شیرە دەکرێتە ماست و، ماستەکە دەکرێتە ماستاوو، دەکرێتە دۆو، ڕۆن و ژاژو پەنیرو کەشك و زۆر شتی دیکەی لێ دروست دەکرێ، ﴿ وَلَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٞ ﴾، هەروەها بۆ ئێوە لەو ئاژەڵانەدا، سوودگەلی زۆر هەن، ﴿ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴾، لێشیان دەخۆن، لە گۆشتەکەیان دەخۆن، ﴿ وَعَلَيۡهَا وَعَلَى ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ ﴾، هەروەها ئێوە لەسەر ئەو ئاژەڵانەو لەسەر کەشتییەکانیش هەڵدەگیرێن، واتە: بۆ بارو سواریش بەکاریان دێنن!

ئنجا بەپێی ﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾، وا پێدەچێ وشەی (**أنعام**) چەمک و واتاکەی گشتییتر بێ، لەوەی تەنیا ئەو چوارە بگرێتەوە: (حوشرو ڕەشە وڵاخ و (گاو مانگاو گامێش و کەڵ)و، مەڕ بەنێرو مێیەوە، بەران و، مەڕ، هەروەها بزن، بزن و نێری)، وا پێدەچێ، چونکە حوشتر بەڵێ بۆ بارو سوار بەکاردێ، بەڵام گاو مانگا بە دەگمەن و، مەڕو بزنیش هەر بەکارنایەن، بۆیە وا پێدەچێ (**أنعام**) ئێسترو ئەسپ و کەرو ماین و بارگین، هەموویان بگرێتەوە.

کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ ژمارەیەک لە نازو نیعمەتەکانی خۆی، چاکەکانی خۆی، بۆ ئێمە دەخاتە ڕوو، تاکو ئێمە لەمیانی ئەو چاکەو نیعمەتانەی خوای پەروەردگاردا، زیاتر ئاشنابین بە خوای پەروەردگارمان و، بە ناوو سیفەتە بەرزەکانی و، بە میهرەبانییەکەی و، بە زانستەکەی و، بە دەستەڵاتەکەی.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

باسی دروستکردنی مرۆڤ بە حەوت قۆناغ:

١- پوختەیەک لە قوڕێ.

٢- نوتفە.

٣- خوێنپارە.

٤- زارجووە گۆشت.

٥- ئێسک.

٦- داپۆشرانی ئێسک بە گۆشت.

٧- پێکهاتنێکی دیکە، ڕووح بەبەردا کردن:

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤمان لە پوختەیەک لە قوڕێ دروست کردوە، وشەی ﴿سُلَـٰلَةٍ﴾، بە چەند واتایەک بەکارهاتوە، وەک:

(**إعجازُ القُرءان فِيما تُخفيهِ الأَرحام**)ی، (**كريم نَجِيبُ الأَغَر**)[1]، گوتوویەتی: بەلای کەمەوە شەش واتای هەن: ١- بە مانای ئاوی کەم دێ. ٢- بە مانای ماسییەکی درێژ دێ. ٣- بە مانای وەرگرتنی شتێک لە شتێک بە نەرمیی دێ. ٤- بە مانای دەرچوون لە قەڵەباڵغیی دێ. ٥- بە مانای دەرچوون لە شوێنی تەنگەبەرو تەسک دێ. ٦- بە مانای ڕۆیشتنی خێراش دێ.

ئەم شەش سیفەتەش هەموویان بەسەر ئەو نوتفەیەدا دەچەسپن، کە بریتیە: لە کۆی مەنیی پیاوو مەنیی ئافرەت، دوای ئەوەی کە لە منداڵدانی ئافرەتدا جێگیر دەبێ، وەک پێشتر باسمان کرد.

دەشگونجێ لێرەدا مەبەست لە ﴿ سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾: دروست بوونی ئادەم عليه السلام بێ، کە ئادەمیش لە پوختەیەکی وەرگیراو لە قوڕی زەوی دروست بووە.

دەشگونجێ مەبەست لە ﴿ سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾: ئەو ماددەیە بێ کە دوایی دەبێتە مەنیی پیاوو مەنیی ئافرەت، کە بێگومان ئەویش هەر لە خوێنەکەیان دروست دەبێ، خوێنەکەشیان لەو خواردنە هەزم کراوەو، خواردنەکەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ زەوی.

**٢)**- ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾، ئەمە قۆناغی دووەمە، دوایی کردمان بە نوتفەیەک لە نشینگەیەکی مەحکەمدا، کە بە تەئکید مەبەست لە نوتفە پێکگەیشتنی حەیمەنی پیاو هێلکۆڵەی ئافرەت و پیتێنرانیەتی، پاشان نیشتەجێ بوونیەتی لە نێو منداڵدانی ئافرەتدا.

**٣)**- ﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴾، ئەمە قۆناغی سێیەمە، دوایی نوتفەکەمان دروستکرد بە خوێنپارە (**عَلَقَة**)، واتە: کردمان بە عەلەقە، خوێنپارە، (**عَلَقَة**)، (**ما يَعلَقُ بِالشَيء**)، (**عَلَقَة**) ئەوەیە کە بە شتێکەوە پەیوەست دەبێ و خۆی پێوە هەڵدەواسێ.

---

(١) ص١١٣.

٤)- ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴾، ئەمە قۆناغی چوارەمە، دوایی خوێنپارەکەمان کرد بە پارچە گۆشتێکی زارجوو ئاسا، ﴿ مُضْغَةً ﴾، (ما يُمْضَغُ)، ئەوەی کە لە زاردا جێگەی ببێتەوە و بجووریێ.

٥)- ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا ﴾، ئەمە قۆناغی پێنجەمە، دوایی ئەو پارچە گۆشتە زارجوو ئاسایەمان کردە ئێسک، واتە: دەیگۆڕین بۆ ئێسک.

٦)- ﴿ فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ﴾، قۆناغی شەشەم: ئنجا ئەو ئێسکەمان بە گۆشت داپۆشیی، واتە: بە پێست و ماسولکەو گۆشت، ئێسکەکەمان داپۆشی.

٧)- ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴾، ئەمەش قۆناغی حەوتەمە: دوایی پێمان گەیاند بە شێوەی دروستکراوێکی دیکە، کە وا پێدەچێ مەبەست ڕووح بە بەردا کردنی بێ، چونکە مرۆڤ دوای ئەوەی ڕووحی بە بەردا دەکرێ، دەبێتە دروستکراوێکی دیکە، ئەگەرنا پێشێ ژیان (حَیاة)ی هەر تێدایە، بەڵام ڕووح جیایە لە ژیان، ژیان خاڵی هاوبەشی نێوان هەموو ژیانداران و زیندەوەرانە، بەڵام (روح)، بە کوردیی (گیان) تایبەتە بە مرۆڤەوە، بۆیە من پێم ڕاست نیە بگوترێ: گیانداران، واباشە بگوترێ: ژیانداران، خوای بەرزیش، دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ﴿٣٠﴾ ﴾الأنبياء، لە ئاو هەموو شتێکی ژیاندار، هەموو شتێکی زیندوومان دروستکرد، بەڵام ڕووح تایبەتە بە مرۆڤەوەو، لە قورئاندا وشەی ڕووح تەنیا بۆ مرۆڤ بەکار هاتوە، بەڵێ بە مانای وەحیی خواش هاتوەو، بە مانای جیبریلیش هاتوە، بەڵام ڕووح تەنیا بۆ مرۆڤ بەکارهاتوەو، ژیاندارانی دیکە وشەی (حَیاة)یان بۆ بەکارهاتوە، یان (حَيٌّ).

٨)- ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴾، بەرزیی و پێز بۆ خوای باشترینی بەدیهێنەران، هەڵبەتە خوا بەس خۆی بەدیهێنەرە، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا ئەوە تەعبیرێکی زانراوەو، باوە، ئەگەرنا جگە لە خوا هیچ بەدیهێنەری دیکە نین، مەگەر وشەی (خَلق)و (خالِق)، دروستکردن و دروستکەر، چەمکەکەیان گشتییتر بێ، واتە: هەر کەسێک کارێک دەکات، خوا باشترینی ئەو کەسانەیە کە کارێک دەکەن، پێشتریش باسمان کرد کە وشەی ﴿ ثُمَّ ﴾، بۆ قۆناغە سەرەکییەکان بەکارهاتوە، بەڵام وشەی (ف) بۆ قۆناغە خێرایەکان.

ئنجا با جارێکی دیکەش سەرنجی ئایەتەکان بدەینەوە:

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴾، ئینسانمان لە پوختەیەک لە قوڕێ، دروستکرد، چ مەبەست پێی ئادەم بێ، چ مەبەست تۆوی هەر کام لە پیاوو ئافرەت بێ، ئەوە قۆناغێکە.

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴾، نوتفەش قۆناغێکی دیکەی جیایە لە ئاوی پیاو بە تەنیاو، ئاوی ئافرەت بە تەنیا، هیچیان بە تەنیا منداڵیان لێ دروست نابێ، بەڵکو لە هەردووکیان کۆرپەلە دروست دەبێ، بۆیە وشەی ﴿ ثُمَّ ﴾ی بەکار هێناوە، دوایی کردمان بە نوتفەیەک لە نشینگەیەکی مەحکەم و جێگیردا.

﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴾، دیسان وشەی ﴿ ثُمَّ ﴾ی بەکارهێناوە، چونکە گۆڕانی نوتفەش بۆ خوێنپارە، ئەویش قۆناغێکی سەرەکییەو گواستنەوەیەکی سەرەکییە، لە قۆناغێکی سەرەتاوە بۆ قۆناغێکی پێشکەوتووتر، بەڵام دوایی ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴾، (عَلَقَة) خوێنپارەکەمان کردە پارچە گۆشتێکی ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا ﴾، دوایی پارچە گۆشتەکەمان کردە ئێسک، ﴿ فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ﴾، دوایی ئێسکەکەمان بە گۆشت داپۆشی.

ئەو قۆناغانە بەدوای یەکدا دێن، بۆیە پیتی (ف)، کە بۆ بەدوای یەکدا هاتن (تعقیب)ە، بۆیان بەکارهێندراوە، بەڵام دوایی ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴾، دوایی کردمان، پێمانگەیاند بە شێوەی دروستکراوێکی دیکە، کە وا پێدەچێ مەبەست پێی ڕووح بەبەردا کردن بێ، ئەویش قۆناغێکی جیایە، لەوانەی پێشێ.

هەڵبەتە پێشتریش باسمان کرد کە دەفەرموێ: ﴿ خَلْقًا ءَاخَرَ ﴾، مرۆڤ (واتە: کۆرپەلەی مرۆڤ) دوای ئەوەی ڕووحی بەبەردا دەکرێ، دەبێتە مەخلووقێکی دیکە، چونکە پێشتر هەر ژیاندار بووە، بەڵام دواتر کە ڕووحی بەبەردا دەکرێ، دەبێتە ئینسان.

بەڕێـــزان!

کورتـە باسێک دەربـارەی چۆنیـەتی دروسـت بـوونی مرۆڤـەوە، دەکەیـن، لـە سێ تـەوەردا:

**تەوەری یەکەم:** دروست بوونی ئادەم ﷵ:

**تەوەری دووەم:** دروستبوونی مرۆڤان.

**تەوەری سێیەم:** قۆناغەکانی دروستبوونی مرۆڤ.

بـۆ نووسـینی ئـەم باسـەش بـە پلـەی یەکـەم پشـت بـە کتێبێـک دەبەسـتم، بـە نـاوی: (**إعجـازُ القُـرآن فِيـما تُخفيـهِ الأَرحـام، وَمـا جَـاءَ فـي عِلـمِ الوَراثَـةِ وَالرِّضاعَـةِ وَبَـدءِ الخَلـق**)، نـووسراوی (**كَريـم نَجِيـب الأَغَـر**)[1].

بـەڵام کـە پشـتی پـێ دەبەسـتم، مانـای وا نیـە قسـەکانی ئـەو کـت و مـت دێنم، بەڵکـو لێـی بەهرەمەنـد دەبـم و، بێگومـان ڕوون کردنـەوەو شـێوازی دەربڕینـی خۆشـمی دەخەمـە سـەرێ.

## تەوەری یەکەم: چۆنیەتی دروست بوونی ئادەم ﷵ:

ئەگـەر تەماشـای قورئـان بکەیـن، خـوا ﷻ بـە چەنـد قۆناغێـک بۆمـان بـاسی دروسـت بـوونی یەکەمیـن مـرۆڤ دەکات، کـە ئادەمـە ﷵ.

١- جارێ لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێ: ﴿...وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ... ﴿٣٠﴾﴾، واتە: ئێمە هەموو شتێکی زیندوومان لە ئاوێ دروست کردوە، کەواتە: ئادەمیش، خاوەنی ژیانەو زیندوویە، ئەوە خاڵی هاوبەشی نێوان ئادەم و هەموو ژیاندارانی دیکەیە، ئەویش دیارە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئاو.

---

(١) الطبعة الأولى: ١٤٢٥هـ-٢٠٠٥م، دارالمعرفة: بيروت-لبنان، ص(٥٦-٤١٢).

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {**كُلُّ شَيْءٍ خُلِقَ مِنْ مَاءٍ**} (**أخرجه أحمد: ٧٩١٩، الحاكم برقم ٧٢٧٨)، وقال: صحيح الإسناد**)، واتە: هەموو شتێك لە ئاوێ دروست بووە، واتە: هەموو شتێكی زیندووو خاوەن ژیان.

**٢-** هەروەها خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ۝٥﴾ الحج، واتە: بە دڵنیایی ئێوەمان لە گڵ دروستكردوە، پێكهاتەی دووەمی مرۆڤ لە ڕووە جەستەییەكەیەوە، لە دوای ئاو بریتیە لە: گڵ.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ مِن قَبْضَةٍ قَبَضَهَا مِن جَمِيعِ الأَرْضِ**} (**أخرجه أحمد: ١٩٦٥٩، وأبو داود: ٤٦٩٣، والترمذي: ٢٩٥٥، وقال: حسن صحيح، والحاكم برقم ٣٠٣٧، وقال: صحيح الإسناد**)، واتە: بە دڵنیایی خوا ئادەمی لە چنگێك كە لە هەموو زەوی وەرگرت، دروستكرد، واتە: ئەو گڵەی كە ئادەمی لێ دروست بووە، لە هەموو زەوی وەرگیراوە.

وەك لە فەرمایشتی دیكەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، هەر بۆیەش، لەبەر ئەوەی كە گڵی زەوی هەم ڕەنگەكانی جیایەو، هەم سروشتەكەی جیایە، بۆیە مرۆڤەكانیش ڕەنگەكانیشیان و سروشت و تەبیعەت و پێكهاتەی باری دەروونیشیان جۆراو جۆرە.

**٣-** بە تەئكید ئاوو گڵ كە تێكەڵ دەكرێن، شتێكی سێیەمیان لێ پێكدێ، كە پێی دەگوترێ: قوڕ (**طِين**)، لە سوورەتی (السجدة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ۝٧﴾، واتە: خوا سەرەتای مرۆڤی لە قوڕێوە هێناوە، كە بە تەئكید ئینسان لێرەدا مەبەست پێی ئادەمە عليه السلام لە ڕووە جەستەییەكەیەوە، بە تەئكید لە قوڕ دروستبووە، قوڕیش بریتیە لە: (گڵ + ئاو)، ئنجا ئایا چ جۆرە قوڕێك بووە؟

**أ-** لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا كە ئێستا تەفسیری دەكەین دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ﴾، واتە: مرۆڤمان لە پوختەیەك لە قوڕێ دروستكردوە، نەك لە قوڕێكی ئاسایی، قوڕەكە پوختەیەك و بووە، گوشراوێكی بووە، ڕاپازنراوێكی بووە.

ئنجا دوایی خوا ﷻ چەند سیفەتێکی دیکە لەو قوڕە هەڵدەدا.

ب- لە سووڕەتی (الصافات)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴿١١﴾﴾الصافات، واتە: بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤەکانمان دروستکردوون لە قوڕێکی پێکەوە چەسپاو، ﴿لَّازِبٍ﴾، واتە: (مُلتَصِق)، پێکەوە چەسپاوو چڕو پێکەوە لکاو، کە بە دڵنیایی مەبەست پێی جەستەی ئادەمە ﷺ کە بەو قۆناغانەدا تێپەڕیوە.

ج- هەروەها لە سووڕەتی (الحجر)دا، سیفەتێکی دیکە لەو قوڕە کە ئادەمی لێ دروست بووە، هەڵدەدا، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی ئێمە مرۆڤمان لە قوڕێکی وشک هەڵاتوو، کە ئەویش لە قوڕێکی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆنکردوو بوو، واتە: قوڕەکە ڕەشهەڵگەڕاوەو بۆنی کردوە، دوایی وشک بۆتەوە، ئادەم لەوە دروست بووە.

د- لە سووڕەتی (الرحمن)دا سیفەتێکی دیکەی لێ هەڵدەدا، دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ ﴿١٤﴾﴾، واتە: خوا مرۆڤی هێناوەتە دی، لە قوڕێکی وشک هەڵاتووی کە دەستی لێ بدەی، یان شتێکی لێ بدەی، زرینگەی دێ، ﴿كَالْفَخَّارِ﴾، وەک گۆزە، (فَخَّار)، سواڵەت، خەزەف ئەو قوڕەیە کە گۆزەو دیزەو کووپەو شەربەو ئەوانەی لێ دروست دەکرێن، کە هەر قوڕە، بەڵام بە ئاگر دەسووتێندرێ و وشک دەبێتەوەو سەخت دەبێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەو قوڕەی کە ئادەمی لێ دروست بوو، وشک بووەوەو، شێوەی خەزەف (فَخَّار)ی هەبوو.

ه- هەروەها خوا ﷻ لە سووڕەتی (نوح)دا ئاماژە دەکات بە قۆناغێکی دیکەی دروست بوونی ئادەم ﷺ، دەفەرموێ: ﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾﴾، واتە: خوا ئێوەی لە زەویی دا ڕواندوە بە ڕواندن، کەواتە: ئەمەش دەبێ حاڵەتێک و، قۆناغێک بوو بێ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾﴾نوح، بۆچی ڕێزو حورمەتی خوای پەروەردگار وەک پێویست ناگرن، ئێوەی بە چەند قۆناغاندا تێپەڕاندوە، کەواتە کە خوا فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهُ أَنبَتَكُم مِّنَ الْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾﴾نوح، خوا ئێوەی لە

زەویی دا ڕواندوە بە ڕواندن، هەر چەندە دەشگونجێ مەبەست پێی چەمکە گشتییەکەی بێ، واتە: وەک چۆن ڕووەکێک لە زەوی دەڕوێ، ئێوەش لە زەویی دا پێگەیشتوون.

بەڵام دەشگونجێ وەک خاوەنی ئەم کتێبە: (**إعجازُ القُرآن فِيما تُخفِيهِ الأَرحام**)، گوتوویەتی: مەبەست ئەوەبێ کە ئەو جەستەیەی ئادەم، گۆڕانێکی دیکەشی بەسەردا هاتوە، وەک ئەوەی بەسەر ڕووەک دا دێ، لە ئەنجامی تیشکە پێکهاتن (**التَّمثِيلُ الضَّوءِ**)دا.

ئەوەی کە لێرەدا پێویستە لێی دڵنیابین ئەوەیە کە دروست بوونی ئادەم عليه السلام هیچ کەس نەیبینوەو، هیچ کەس ناشتوانێ بڵێ: شێوازێک یاخود بەرنامەیەکی دیاریکراو هەیە، بۆ دروستبوونی مرۆڤی یەکەم، چونکە ئەوە تایبەتە بە خواوە تعالى وەک بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلۡمُضِلِّينَ عَضُدٗا ٥١﴾ الكهف، ئێمە ئەوانمان ئامادەنەکردوە، (یاخود: ئاگادارمان نەکردوون)، کە ئاسمانەکان و زەویمان دروست کردوون و، ئامادەمان نەکردوون و ئاگاداریشمان نەکردوون کاتێ خۆشیانمان دروست کردوەو، من گومڕا کاران و سەر لێ شێوێنان ناکەمە پاڵپشت.

بەڵام ئەوەی دەتوانین ئێمە لێی بکۆڵینەوە، ئەوەیە کە ئەو ماددەیەی ئادەمی لێ دروستبووە عليه السلام، سیفەتەکانی ئەو ماددەیەو، پێکهاتەکانی تاکو ببێتە ماددەیەکی زیندوو، ماددەیەک کە لە خانەکان پێک دێ، پاشان ئامادەبێت کە ڕووحی بچێتە نێو، ڕووحی بەبەردابکرێ بە فەرمانی خوای پەروەردگار، بەپێی یاسا گەردوونییەکان کە خوا داینان، دەگونجێ لەوە بکۆڵینەوە، ئێمە لەم ئایەتانەو لەو چەند فەرموودەیەدا کە ئاماژەمان پێدان، دوو ڕاستیی گەورەو گرنگمان دەست دەکەون:

**یەکەم:** ئەوە کە ماددەی سەرەکیی، یاخود پێکهاتەی سەرەکیی جەستەی ئادەم بریتی بووە لە ئاو، وەک خوا تعالى دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ٣٠﴾ الأنبياء،

هەروەها کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**كُلُّ شَيءٍ خُلِقَ مِنْ مَاء**}، (**أخرجه: أحمد: ٧٩١٩، والحاكم: ٧٢٧٨، وصححه**)، واتە: هەموو شتێک لە ئاو دروست بووە، ئەوە شتێکی سەلمێندراوو مسۆگەرەو، لە ڕووی فیسۆلۆجییشەوە، جەستەی هەر مرۆڤێک نەک هەر هی ئادەم، ئێستاش جەستەی هەر مرۆڤێک زۆربەی پێکهاتەکەی ئاوە، سەدا حەفتا (٧٠٪)ی زیاتری.

**دووەم:** پێکهاتەی دووەمی کە جەستەی ئادەمی لێ پێکهاتوە بریتیە لە: گڵ، کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن تُرَابٍ ﴿٥﴾﴾الحج، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ مِن قَبْضَةٍ قَبضَها مِن جَمِيعِ الأَرضِ**}، (**أخرجه: أحمد: ١٩٦٥٩، وأبو داود: ٤٦٩٣، والترمذي: ٢٩٥٥، وقال حسن صحيح**)، کە پێشتریش باسمان کرد، هەڵبەتە کە ئاوو گڵ پێکەوە کۆدەبنەوە، قوڕ دروست دەبێ، ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ ٱلْإِنسَٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾﴾السجدة، پێشتریش باسمان کرد کە ئەو قوڕەیش:

**١-** چڕ پێکەوە لکاو بووە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَٰهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴿١١﴾﴾الصافات، (الطبري) گوتوویەتی: (**وَإِنَّمَا وَصَفَهُ جَلَّ ثَنَاؤُهُ بِاللُّزوبِ، لأَنَّهُ تُرَابٌ مَخْلُوطٌ بِماءٍ**)[1]، بۆیە خوا (**جلَّ ثناؤە**) بە وشەی (**لُزُوب**) وەسفی کردوە، چونکە گڵێکی تێکەڵکراو بووە بە ئاو، واتە: بۆتە قوڕێکی پێکەوە چەسپاو.

**٢-** سیفەتێکی دیکەی ئەو قوڕە ئەوە بووە، کە ڕەشهەڵگەڕاو بووەو، بە تەئکید دوای ئەوەی کە قوڕ ماوەیەک دەمێنێتەوە، بە باری ڕەشییدا دەچێ.

**٣-** هەروەها بۆن کردوو بووە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾﴾الحجر، کە لە (تاج العروس)دا، دەڵێ: (**حَمَأ: الحَمْئَةُ بفتحِ فَسكونٍ: الطِّينُ الأَسْوَد المُتَغَيِّر**)، یانی: قوڕێکی ڕەشی گۆڕاوە، هەروەها (القرطبي)یش دەڵێ: (**الحَمَأُ: الطِّينُ الأَسْوَدُ المَسنُونُ المُتَغَيِّر**)، (حَمَأ)، بریتیە لە قوڕی ڕەشهەڵگەڕاو، ﴿مَّسْنُونٍ﴾یش لە قوڕێکی گۆڕاوە.

---

(١) جامع البيان ج٢١، ص٢٠.

**٤-** سیفەتێکی دیکەی کە پێشتریش باسمان کرد، ئەوەیە کە ئەو قوڕە بۆنکردوو بووە، (ابن عباس و مجاهد) خوا لێیان ڕازی بێ، هەردووکیان دەڵێن: (**الحَمَأُ المَسنُون هُوَ المُنْتِن**)، قوڕی ڕەشهەڵگەڕاو بریتیە: لە قوڕێکی بۆنکردو، لە (**لسان العرب**)دا دەڵێ: (**المَسنُونُ: المُنتِن**)، واتە: بۆنکردوو.

**٥-** سیفەتێکی دیکەی ئەو قوڕە ئەوە بووە کە نەرم بووە، بە شێوەیەک کە بگونجێ هەر شێوەو دیمەنێکی لێ دروست بکرێ و، بگونجێ کە لە هەر شێوەیەکدا بجەستێنرێ و، پەیکەردار بکرێ، لە (لسان العرب)دا، دەڵێ: (**المَسنُون: المَصقُول**)، واتە: لووس کراو، یاخود ڕنراو، یان شێوەی پەیکەرێکی وەرگرتبێ، ئەمە بە کورتیی شێوەو حاڵەتی دروست بوونی یەکەمین مرۆڤە کە ئادەمە عليه السلام.

ماوەتەوە ئامازە بەوەش بکەین کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾﴾ نوح، خوا ئێوەی لە زەوییدا ڕواندوە بە ڕواندن، کە هەندێ لە تەفسیرەکان بۆ وێنە (**صفوة التفاسیر**) دەڵێ: (**أَنشَأَكُم مِنَ الأَرْضِ كَمَا يَخرُجُ النَّبَاتُ**)، لە زەویی دا ئێوەی پێ گەیاندوە، وەک چۆن ڕووەک لە زەویی دێتە دەرێ، (**أَي: أَنبَتَكُم مِنَ الأَرضِ بِالطَرِيقَةِ الَّتي اتُّبِعَتْ لِإنباتِ النَّبات**)، واتە: لە زەوییدا ڕواندوونی، بە هەمان شێوەی کە ڕەچاوکراوە بە ڕواندنی ڕووەک.

ئنجا ئەمە ڕەنگە ئاماژەبێ بەوە کە وەک ڕووەک لە ئەنجامی تیشکە پێکهاتندا پێ دەگات، دەگونجێ ئەو جەستەیەی ئادەمیشی لێ دروستبووە سەلامی خوای لێ بێ، ئەو قۆناغەشی بینیبێ کە حاڵەتی تیشکە پێکهاتن، وەک لە ڕووەکدا هەیە، لەویش دا بووبێ، وەک ئەو ئایەتە ئامازەی پێ دەکات، ئەمە تەوەری یەکەم بوو دەربارەی چۆنیەتی دروست بوونی یەکەم مرۆڤ، کە ئادەمە عليه السلام.

## تەوەری دووەم: دروستبوونی مرۆڤان:

پێشتر لە کۆمەڵگای یۆنان و هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی دیکەدا کە لەسەر زەوی ژیاون، هەتا سەدەی هەژدەیەم، دەوری ساڵی (١٧٧٥)ی زایینی، کە زانای ناودار: سپالانزانیی (spallanzani) ئیسپاتی کرد کە هەر کام لە حەیمەن (حیمن) و هێلکۆڵە (**بُویضَة**)، ڕۆڵیان هەیە لە دروست بوونی کۆرپەدا، پێشتر سێ ڕا هەبوون لەو بارەوە:

١- تەنها خوێنی حەیز دەبێتە هۆی دروستبوونی مرۆڤ (کۆرپەلە).

٢- تەنها تۆوی پیاو دەبێتە هۆی دروستبوونی کۆرپەلە.

٣- تەنیا ئاوی ئافرەت، هێلکۆڵەی ئافرەت دەبێتە هۆی دروستبوونی مرۆڤ.

بەڵام دوایی ئەو زانایە لە ساڵی (١٧٧٥ز)دا، ئیسپاتی کرد کە کۆرپەلە (جنین) لە ئنجامی بەیەکگەیشتنی مەنیی پیاوو مەنیی ئافرەتدا دروست دەبێ، هەڵبەتە ئێستا ئاشکرایە کە کۆرپەلە لە تۆو (مني)ی، (تۆوی) هەر کام لە پیاوو ئافرەت، دروست دەبێ، نەک لە هەموو ئاوەکەشیان هەمووی پێکەوە کۆبێتەوە بەڵکو لە بەشێکی، وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَا مِنْ كُلِّ الْمَاءِ يَكُونُ الْوَلَدُ، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ خَلْقَ شَيْءٍ لَمْ يَمْنَعْهُ شَيءٌ**} (**رَوَاهُ مُسْلِمٌ: ١٤٣٨**)، واتە: لە هەموو ئاوەکە مرۆڤ دروست نابێ، (بەڵکو لە بەشێکی) و هەر کاتیش خوا هەر شتێکی ویست هیچ شتێک نابێتە ڕێگری.

ئنجا ئێستا زانست دەری خستوە کە لە ئەنجامی ئەوەدا: زیندەوەری تۆوی (**الحَيوانُ المَنَوي**)، کە کورتەکەی دەبێتە (حیمن)، لەگەڵ هێلکۆڵە (**بُویضَة**)ەی نێو ئاوی ئافرەت، ئەو دووانە، حەیمەنێک لەگەڵ هێلکۆڵەدا یەکدەگرن، نوتفەیان لێ پێکدێ، کە دوایی باسی هەر کام لەو سێیانە دەکەین و، چەند زانیارییەک لە بارەی هەر یەک لە حەیمەن و، هێلکۆڵەو، نوتفەوە، دەخەینە ڕوو.

بەڵێ لە ئەنجامی یەکگرتنی حەیمەن و هێلکۆڵەدا، نوتفە دروست دەبێ و، دواییش نوتفەکە دەبێتە عەلەقەو، عەلەقەکەش دەبێتە موضغەو، قۆناغەکانی دیکە دەبڕێ و، ئەگەر خوا ئیزنی لەسەر بێ دەبێتە کۆرپەیەک و، دواییش لە دایک دەبێ، پێویستە بزانین کە ئاوی پیاو لە کاتی ئاو هاتنەوەیدا بە گشتیی، سێ مللیلیترو نیو دەبێ و، (٢/١)٣ملل، کە هەمووی دەوری سێ سەدو پەنجا ملیۆن (٣٥٠،٠٠٠،٠٠٠) حەیمەنی تێدایە، واتە: لە هەر یەک میللیلیتر سێجا (١ملل٣)دا، سەد ملیۆن (١٠٠,٠٠٠٠٠٠) حەیمەن لەنێو ئاوی پیاودا مەلە دەکەن.

پاشان حەیمەن (**الحیوان منوي**) نێو ئاوی پیاو، قەبارەکەی بریتیە: لە شەش لەسەر سەد میللیمەتر (١٠٠/٦ملم)، واتە: (٦٠) شەست مایکرۆن، کە مایکرۆنێک بریتیە: لە یەک لەسەر هەزاری میللیمەتر (١٠٠٠/١ملم)ێک، ئنجا ئەو حەیمەنە شەست مایکرۆن درێژەو، سەری حەیمەنەکە تەنیا پێنج مایکرۆنەو، ئەوی دیکەی کە (٥٥) مایکرۆنە، جەستەو کلکەکەی پێکدێنێ، ئەوە بە نسبەت حەیمەنەوە.

بە نسبەت هێلکۆڵە (**بُویضَة**)وە، تیرەکەی بریتیە: لە سێزدە لەسەر سەدی میللیمەتر (١٠٠/١٣)ملم ێک، واتە: زۆر گەورەترە لە حەیمەن و، هەموو ئاوەکەی کە لەگەڵیەتی: (١٠ - ١٥) میللیلیترە.

شایانی باسە هێلکەدان (**مَبِیض**)ی، ئافرەت، چوار سەد هەزار (٤٠٠،٠٠٠) هێلکۆڵە (**بویضة**)ی تێدایەو، هەر مانگەی هێلکۆڵەیەک دێتە خوارێ، بەرەو بۆڕی (فالوب)، تاکو حەیمەنێک بیگاتێ و، بیپیتێنێ و پێکەوە ببنە نوتفە، ئنجا ئەگەر نەپیتێنرێ، لەگەڵ خوێنی حەیز دێتە دەرێ، بەڵام لەو چوار سەد هەزار (٤٠٠،٠٠٠) هێلکۆڵەی نێو هێلەکەدانی ئافرەت، تەنیا (٤٠٠ - ٥٠٠)یان بۆ پیتاندن (تلقیح) هەڵدەبژێردرێن و، پێشتریش ژمارەی ئەو هێلکۆڵانە زۆر زیاترە، کاتێک کە کۆرپەلەیەکی مێینە تەمەنی دەبێتە پێنج حەفتە، پێنج ملیۆن (٥،٠٠٠،٠٠٠) هێلکۆڵە لە هێلکەدانەکانیدا هەن، بەڵام بەردەوام تاکو دەکەوێتە تەمەنەوە، هێلکۆڵەکان دەمرن و، ژمارەیان کەم دەبێتەوە، تاکو لێیان دەمێنێتەوە چوار

سەد هەزار (٤٠٠،٠٠٠)، لەو چوار سەد هەزارەش بە تەئکید ژمارەیەکی زۆر کەمیان ئەگەر خوا ئیزنی لەسەر بێ، بۆیان ڕێک دەکەوێ، کە هەر کامێکیان لەگەڵ حەیمەنێکی پیاودا یەک بگرێ و بپیتێنرێ و، ببنە نوتفەو، قۆناغەکانی دیکە ببڕن و ببنە کۆرپەلە.

ئاوی پیاو دوو جۆرە، لە ڕووی ڕەگەزەوە، جۆرێکیان ئێکس ئێکس (XX)ە، کە ئەوە هەر دەگونجێ مێینە دروست بکات و، جۆرێکیان ئێکس وای (XY)ە کە دەتوانێ نێرینە دروست بکات، بەڵام ئاوی ژن یەک جۆری، تێدایە ئێکس ئێکس (XX)ە.

بۆیە ئەوەی کە بەرپرسیارە لەوەدا کە ئەو کۆرپەلە نێر دەرچێ، یان مێ؟ لە ڕاستیی دا ئاوی پیاوە، چونکە ئاوی ئافرەت تەنیا دەتوانێ مێینە دەربچوێنێ، بەڵام ئاوی پیاو ئەگەر لە جۆری (XX) بێ، ئەوە لەگەڵ هی ئافرەتدا کە هەر (XX)ە، مێ دەردەچێ، بەڵام ئەگەر لە جۆری (XY) بێ، نێر دەردەچێ، کەواتە: نێر بوونی کۆرپەلە، هۆکارەکەی ئاوی پیاوە، ئەگەرنا ئاوی ئافرەت تەنیا دەتوانێ مێ دەربچوێنێ.

ئنجا با دەربارەی هەر کام لە هێلکۆڵە (هێلکۆڵەی نێو ئاوی ئافرەت)، (**بُويضَة**)و حەیمەنی نێو ئاوی پیاو (**حیمن**)، پاشان هێلکۆڵەی پیتێنراو یان هێلکۆڵەو حەیمەنی یەکگرتوو کە پێی دەگوترێ: نوتفە (**نطفة**)، لە بارەی ئەو سێیانەوە، هەندێک زانیاریی خێرا بە ئەندازەی ئەوە کە دەگونجێ لەگەڵ ئەم دەرسی تەفسیرەدا، بخەینە ڕوو:

### ١) هێلکۆڵە (بُويضَة):

هێلکۆڵە کە وەک باسمان کرد لە هێلکەدانی ئافرەت دایەو، هەموو مانگان هێلکۆڵەیەک دێتە خوار، ئنجائەگەر حەیوانێکی مەنەویی (**حیمن**)ی لێ هەڵکەوت، دەگونجێ کە بپیتێندرێ و، بە هەردووکیان نوتفە (**نطفة**)، پێک بێنن، ئەگەرنا

لەگەڵ خوێنی حەیز دێتە دەرێ، بۆیەش ئافرەت کە حەیزی پێداهات، مانای وایە تۆڵدار (حامل) نیە، ئەگەر دوو گیان بێ، خوێنە حەیزەکە نایەتە خوار.

هێلکۆڵەکانی نێو هێلکەدانی ئافرەت، هەر لە حەفتەی پێنجەمیەوە پێنج ملیۆن (٥،٠٠٠،٠٠٠) هێلکۆڵە بە هاوکۆیی (معدّل)ی لە نێو هێلکەدانی ئەو کۆرپەلەدا کە دوایی دەبێتە کچ هەن و، لەوێدا هەڵگیراون و، بێگومان ئەو هێلکۆڵەیە وەک خاڵێکی زۆر بچووکەو، ئەو هێلکۆڵەیە وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ٦ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ٧ ﴾الطارق، حاڵەتێکی دەرقوڵیوی هەیە، بۆ خۆی دەڕوات و تەکان دەداتە خۆی کە ئەوە بە نسبەت ئاوی پیاویشەوەو، بە نسبەت ئاوی ئافرەتیشەوە هەر وایە، کە کارگەی ئەو ئاوەش لە ئێسقانەکانی پشت و سینگ دایە، لەو نێوەندەدا هەم تۆوی پیاو، هەم تۆوی ئافرەت دروست دەبێ و، ئاوی ئافرەت شل و چڕییەکەی کەمەو، ڕەنگەکەی زەردەو، بەخێرایی دەڕواو، هێلکۆڵەی ئافرەت لە حەیمەن زۆر گەورەترەو، هێلکۆڵەی ئافرەت جینەکانی تێدان، کە سیفەتەکانی باب و دایک بۆ کورپەلە دەگوازنەوە، سیفەتەکانی دایک و باب، تاکو دەگاتەوە ئادەم و حەووا.

## ٢)- حەیمەن

واتە: ئەو زیندەوەرە بچووکەیە لە نێو ئاوی پیاودا هەیە، حەیمەنەکان لە قۆناغێکی زۆر زوودا دروست دەبن، کۆرپەلە کە جارێ هەر لە سکی دایکی دایە، زۆر بە گچکەیی و لە قۆناغی سەرەتاوە دروست دەبن و، لەوێدا هەڵدەگیرێن، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ۗ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْأَيَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ٩٨ ﴾الأنعام، واتە: ئەو (خوا) کەسێکە کە لە یەک نەفس پێیگەیاندوون لە نشینگەو عەمباردا (هەڵدەگیرێن)... (مُستَودَع)، یانی: شوێنێک کە شتی تێدا هەڵدەگیرێ و، عەمبار دەکرێ، حەیمەنی پیاویش زۆر بچووکە، زۆر بچووکترە لە هێلکۆڵەی ئافرەت و، ئاوی پیاویش کە حەیمەنەکانی

تیـدان، زۆر بـە خێرایـی دەردەقولـێ، وەک خـوا فەرموویەتـی: ﴿ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ٦ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ٧ ﴾الطـارق، پاشـان ئـەو حەیمەنـە لەنێـو ئـاوی پیـاودا، کـە ئـاوی پیـاو هەمـووی لـە (حَيامِـين) پێـک دێ، بـەڵام یەکێکیـان ئـەوەی خـوا ئیـزنی لەسـەر بـێ، خـۆی دەگەیەنێتـە هێلکۆڵـەو دەچێتـە نێـوی و، دەیپیتێنـێ، دیـارە ئـاوی پیـاو ڕەنگەکـەی سـپییەو چڕتـرەو، حەیمـەن شـێوەی ماسـییەکی درێـژی هەیـەو، وەک لـە نێوقەڵەباڵغیـدا بـڕوا، چونکـە بـە ملیۆنـان حەیمـەن حەڕەکـەت دەکـەن بـەرەو ئـەو هێلکۆڵەیـە، دیـارە یەکێکیـان پێـی دەگات و، بـە شـوێنی تەنگەبـەردا دەڕوا، کـە بریتیـە لـە دەروازەی منداڵـدان و، بەخێرایـی دەڕواو، ئەرکیـشی ئەوەیـە کـە ئـەو هێلکۆڵەیـە بپیتێنـێ و حەیمـەن جیناتی تێـدا هـەن، واتـە: ئـەو سیفەتانەی کـە دەبـێ لـە دایـک و بابـەوە بیانگوازێتـەوە بـۆ ڕۆڵـە و، هـۆکاری نێـر بـوون و مـێ بـوونی کۆرپەلـە، ئـەو حەیمەنانـەی پیـاون، وەک پێشـتریش باسـمان کـرد.

### ٣)- نـوتـفــــــە

نوتفـە، واتـە: هێلکۆڵـەی پیتێـنراو (البُوَیضَـة المُلَقَّحَة)، لـە ئەنجامی بە یەککەیشـتنی حەیوانێکـی مەنەویـی لەگـەڵ هێلکۆڵەیەکـدا، حاڵەتێکـی سـێیەم پێکـدێ، کـە پێـی دەگوتـرێ: نوتفــە، خــوای پــەروەردگار دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ٢ ﴾الإنسـان، واتــە: ئێمــە مرۆڤــمان لــە نوتفەیەکــی تێکــەڵ، (تێکــەڵ و ئاوێتـە لـە حەیمەنـی پیـاوو هێلکۆڵـەی ئافـرەت، دروسـتکردوە).

شـایانی باسـە: ئـەو هێلکۆڵـەی ئافـرەت لەگـەڵ ئـەو حەیمەنـەی پیـاودا، لـە دەرەوەی منداڵدانـدا پێکدەگـەن و دەپیتێنرێـن و، دوایـی دەچێتـە نێـو منداڵـدان، دەگونجـێ حەیمـەنی پیـاو هەرچـی سـیفەتە لـە پیاوەکـەوە، لـە بـاب و دایکیـەوە تاکـو دەگاتـەوە ئـادەم و حـەووا، هەروەهـا هێلکۆڵەکـەی ئافـرەت هەرچـی سـیفەتی ئافرەتەکـە، هەروەهـا بـاب و دایکیەتـی، تاکـو دەگاتـەوە ئـادەم و حـەووا بیهێنـن، بۆیـە جـاری وا هەیـە منداڵـی مـرۆڤ دەچێتـەوە سـەر مامـان، یـان دەچێتـەوە سـەر

خاڵان، بە واتایەکی دیکە، دەچێتە سەر بەرەی بابی، یان بەرەی دایکی، بەڵکو جاری واش هەیە، وەک هیچ کام لە باب و دایکی ناچێ، یاخود بە بەرەی دایکی و بەرەی بابی ناچێ، بۆچی؟ چونکە دەگونجێ تاکو دەگاتەوە ئادەم و حەووا، بە هەر کەسێک بچێ.

ئنجا دوایی ئەو نوتفەیە کە خوا ﷻ بە تەعبیری ﴿نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ۝٢﴾ الإنسان، واتە: نوتفەیەکی تێکەڵ، ئاوێتە، ناوی بردوە، لەنێو منداڵداندا جێگیر دەبێ و، خۆی بە دیواری منداڵدان هەڵدەواسێ و، لەوێدا پێدەگات، ئەگەر خوا مۆڵەتی لەسەربێ، لەوێدا قۆناغەکان دەبڕێ، لە حاڵەتی نوتفەوە دەگۆڕێ بۆ خوێنپارە (**علقة**)، پاشان لە خوێنپارەوە (**علقة**)وە دەگۆڕێ بۆ زارچووە گۆشت (**مضغة**)و دوایش دەبێتە ئێسک (**عظام**)، دوایی ئێسکەکە بە گۆشت دادەپۆشرێ، ﴿فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا﴾، دوایش قۆناغێکی دیکەی پێگەیاندنی بۆ دێتە پێش، کە بریتیە: لە ڕووح بەبەردا کردن، ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ﴾.

## تەوەری سێیەم: قۆناغەکانی دروست بوونی مرۆڤ[1]:

سەرەتا پێویستە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بێنین، پێغەمبەر ﷺ لە درێژەی فەرموودەیەکدا دەفەرموێ:

**{وَإِذَا كَانَ الْيَوْمُ السَّابِعِ جَمَعَهُ اللهُ، ثُمَّ أَحْضَرَ لَهُ كُلَّ عِرقٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَ آدَمَ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ٨﴾ الانفطار} (أخرجه: الطبراني في الكبير: ٦٤٤، وفي الأوسط: ١٦١٣، وفي الصغير: ١٠٦، قال الهيثمي (١٣٤/٧): رجاله ثقات، وأخرجه أَيْضاً: الديلمي: ٩٥٨).**

واتە: دوای ئەوەی نوتفە دەگاتە ڕۆژی حەوتەمی، خوا کۆی دەکاتەوە، دوای هەر دەمارێک لەنێوان ئەوو ئادەمدا، هەمووی بۆ ئامادە دەکات، (واتە: دەگونجێ هەتا دەگاتەوە ئادەم، هەروەها لەولاش تا دەگاتەوە حەووا، بەهەر کەسێک بچێ و، سیفەتی هەر کامێک لەوانە بەدەست بێنێ)، دوایی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی خوێندەوە: ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ٨﴾ الانفطار، لە هەر وێنەیەکدا کە خوا بیەوێ، تۆی پێک هێناوە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی دیکەدا، دیسان ئاماژە دەکات بەو قۆناغانە بە گشتیی، دەفەرموێ: **{إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ} (أخرجه أحمد: ٣٦٢٤، والبخاري: ٣٠٣٦، ومسلم: ٢٦٤٣، وأبو داود: ٤٧٠٨، والترمذي: ٢١٣٧، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٧٦)**، واتە: یەکێک لە ئێوە دروستکرانی لە سکی دایکی دا لە ماوەی چل (٤٠) ڕۆژاندا کۆدەکرێتەوە، دوایی لە وێنەی ئەو ماوەیەدا دەبێتە عەلەقە، دوایی لە وێنەی ئەوەدا دەبێتە موضغە.

---

(١) إعجازُ القُرآن فِيما تُخفِيهِ الأَرحام: ص(٣٩٨-٤٠٣).

مەبەست ئەوە نیە کە چل (٤٠) ڕۆژ نوتفە بێ و، چل ڕۆژ عەلەقە بێ و، چل ڕۆژ موضغە بێ، بەڵکو یانی: لە ماوەی ئەو چل ڕۆژەدا ئەو قۆناغانە دەبڕێ، قۆناغەکانی: (نوتفەو عەلەقەو موضغە).

ئێستا با تەماشا بکەین خاوەنی ئەو کتێبە، دەڵێ: دروستبوونی مرۆڤ بە چوار قۆناغی سەرەکییدا دەڕوات، ئەو چوار قۆناغەش، هەر کامێکیان بۆ چەند وردە قۆناغێک دابەش دەبێ:

قۆناغی سەرەکیی یەکەم: دوازدە (١٢) وردە قۆناغە، پێش ڕۆژی حەوتەم، واتە: پێش ئەوەی ئەو نوتفەیە حەوت ڕۆژی بەسەردا تێپەڕن لەنێو منداڵداندا، هەروەها لە دەرەوەی منداڵدان، دوایی دەچێتە نێو منداڵدان، دوازدە وردە قۆناغان دەبڕێ.

قۆناغی سەرەکیی دووەم: ئەویش لە ڕۆژی حەوتەمەوە تاکو ڕۆژی چلەمین، سێ وردە قۆناغی دیکەش دەبڕێ.

قۆناغی سەرەکیی سێیەم: ئەویش لە نێوان چلەمین ڕۆژ تاکو چوار مانگ و دە (١٠) ڕۆژ، چوار وردە قۆناغی دیکە دەبڕێ.

قۆناغی سەرەکیی چوارەم: لە چوار مانگ و دە (١٠) ڕۆژ، تاکو لە دایک بوون، سێ وردە قۆناغی دیکەش دەبڕێ.

هەڵبەتە ئەو هەر بیست و دوو (٢٢) قۆناغەکەی پێکەوە هێناون، واتە: چوار قۆناغە سەرەکییەکە کە دوایی دابەش دەبنەوە، یەکیان بۆ دوازدەو، یەکیان بۆ سێ و، یەکیان بۆ چوارو، ئەوی دیکە بۆ سێ، ئەو هەمووی بە یەکەوە هێناون، (١٢ + ٣ + ٤ + ٣ = ٢٢).

قۆناغی یەکەم: بریتیە لە دەرچوونی پێکهێنەرەکانی ئاو، چ ئاوی پیاو، چ ئاوی ئافرەت، چ تۆوی پیاو، چ تۆوی ئافرەت، ئەمە قۆناغی یەکەمە کە دەتوانین لەم

ئایەتە قورئانییە هەڵیبهێنجین، کە دەفەرمووێ: ﴿ فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾ ﴾الطارق، با مرۆڤ سەرنج بدات لەچی دروست بووە!، لە ئاوێکی دەرقوڵیو دروست بووە، کە لە نێوان پشت و سینگ، (یان: ئێسکەکانی پشت و سینگ) دێتە دەرێ، ئەمە قۆناغی سەرەتایی کە ماددەی تۆوی پیاوو، ماددەی تۆوی ئافرەت کارگەکەیان لەو ئێسکانەدایە، کە دەکەونە نێوان پشت و سینگەوە.

قۆناغی دووەم: دروست بوونی حەیمەنەکانی پیاوو، هێلکۆڵەکانی ئافرەت لە قۆناغێکی زووداو، هەرکامێکیان ئەو سیفەتانەی کە لەو مرۆڤەدا هەن، ئەویش بە ڕەچەڵەکی خۆی دا دەڕوا، هەر کامێکیان ئەو سیفەتانە وەردەگرێ، ئەمیش لەم ئایەتە موبارەکەی ژمارە (٩٨)ی سوورەتی (الأنعام)، وەردەگیرێ، کە دەفەرمووێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: خوا ئێوەی لە یەک نەفس پێکهێناوە، (کە ئادەمە عليه السلام): ﴿ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ ﴾، ئنجا ئەو نوتفانە کە لە ئادەم و حەوواوە هاتوون، هەم شوێنێکیان هەبووە تێیدا نیشتەجێ بن، کە منداڵدانەکانن، هەم ﴿ وَمُسْتَوْدَعٌ ﴾، شوێنێکیان هەبووە کە تێیدا هەڵبگیرێن، (کە ئێسکەکانی پشت و سینگی پیاوو ئافرەتن)، ﴿ قَدْ فَصَّلْنَا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ ﴿٩٨﴾ ﴾الأنعام، ئاوا ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ کەسانێک کە ورد تێبگەن، واتە: هەر لەو قۆناغە زووەوە ئەو سیفەتانەی باب و دایکان، لە نێو حەیمەنەکانی پیاوو هێلکۆڵەکانی ئافرەتدا پەیدادەبن، وەک ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێدەکات:

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلاَمًا أَسْوَدَ، وإنِّي أنكرتُه قَالَ: هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ نَعَمْ، قَالَ فَمَا أَلْوَانُهَا؟ قَالَ حُمْرٌ، قَالَ: فِيهَا أَوْرَقُ؟ قَالَ: نعم، قَالَ: فأنّ هو؟ قَالَ: لعلّه يا رسول الله يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ له، قَالَ له النبيُّ: وَهَذَا لعلّهُ يَكُونَ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ} (أخرجه**

**مسلم: ٣٨٣٩، زَادَ مُسْلِمٌ فِي رِوَايَةٍ وَهُوَ حِينَئِذٍ يُعَرِّضُ بِأَنْ يَنْفِيَهُ قَالَ: وَزَادَ فِي آخِرِ الْحَدِيثِ قَالَ: وَلَمْ يُرَخِّصْ لَهُ فِي الإِنْتِفَاءِ مِنْهُ).**

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێک لە هۆزی فەزارە (کەسێکی خێڵەکیی بووە) هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووەو، منیش نکووڵییم لێکردوە (کە لەمن بێ)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: حوشترت هەنە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ڕەنگیان چۆنە؟ گوتی: سوورن، فەرمووی: ئایا هیچی سپیان تێدا هەن؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ئنجا ئەو سپییە چۆن لەو سوورانە پەیدابووە؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ! ڕەنگە دەمارێک وەری گرتبێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کوڕەکەی تۆش لەوانەیە دەمارێک بێ، (لە یەکێک لەو باپیرانەو، لە یەکێک لە دایکان، کە تاکو دەچنە سەر ئادەم و حەووا) وەری گرتبێ، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی نەدا کە نکووڵیی بکات لەو منداڵە.

قۆناغی سێیەم: قۆناغی دەرقوڵینی ئاو، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ۝٦ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ۝٧ ﴾ الطارق، واتە: (مرۆڤ) لە ئاوێکی دەرقوڵیی و دروست بووە، کە لە نێوان ئێسقانی پشت و سینگ دێتە دەرێ، هەڵبەتە بە نسبەت هەردووکیانەوە، پیاویش و ئافرەتیش، مەڵبەندی دروست بوونی تۆوی پیاوو ئافرەت، ئەو ئێسکانەن کە دەکەونە لای نێوان پشت و سینگ.

قۆناغی چوارەم: زاڵبوونی هەندێک لە تۆوی پیاوو ئافرەت بەسەر یەکدیی دا، کە لە ئەنجامی ئەوەدا نێر دەردەچێ، یان مێ دەردەچێ، وەک لەم فەرمایشتەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، دەفەرموێ:

**{مَاءُ الرَّجُلِ أَبْيَضُ، وَمَاءُ الْمَرْأَةِ أَصْفَرُ، فَإِذَا اجْتَمَعَا فَعَلاَ مَنِيُّ الرَّجُلِ مَنِيَّ الْمَرْأَةِ، أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللَّهِ، وَإِذَا عَلاَ مَنِيُّ الْمَرْأَةِ مَنِيَّ الرَّجُلِ، آنَثَا بِإِذْنِ اللَّهِ} (أخرجه مسلم: ٣١٥، والنسائي: ٩٠٧٣، وابن خزيمة: ٢٣٢، وأبو عوانة: ٨٤٣، وابن حبان: ٧٤٢٢، والطبراني: ١٤١٤).**

ئاو (تۆو)ی پیاو سپییەو، ئاو (تۆو)ی ئافرەت زەردە، ئنجا هەر کاتێک ئەو دوو ئاوە کۆبوونەوە، (واتە: نوتفەیان پێکهێنا)، ئەگەر تۆوی پیاو بەسەر تۆوی ئافرەتەکەدا سەرکەوت، بە مۆڵەتی خوا نێر بەرهەم دێنن، بەڵام ئەگەر تۆوی ئافرەتەکە بەسەر تۆوی پیاوەکەدا سەرکەوت، مێینە بەرهەم دێنن بە مۆڵەتی خوا.

وەک پێشتر باسمان کرد کە جۆری ئاوی ئافرەت هەمووی (ئێکس ئێکس) (XX)ە، بەڵام جۆری ئاوی پیاو، ئێکس ئێکس (XX)و، ئێکس وای (XY)ە، ئنجا ئاوی ئافرەت زاڵبوونەکە، ئەوەیە کە ئاوی پیاو، هەر (ئێکس ئێکس) بێ و، هی ئافرەتیش هەروا، بە تەئکید ئەو کاتە مێینە دەردەچێ و، ئەگەر ئاوی پیاو زاڵ بوو، بەسەر هی ئافرەتدا - (ئێکس وای)یەکە، لەگەڵ (ئێکس ئێکس)دا یەکی گرت- ئەو کاتە نێرینە دەردەچێ.

قۆناغی پێنجەم: پێکگەیشتنی دوو تۆوەکان کە لە ئەنجامی ئەوەدا، نێرینەو مێینە پەیدادەبێ، وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ ...﴿٢﴾﴾الإنسان، ئێمە مرۆڤمان لە نوتفەیەکی تێکەڵ، (ئاوێتە) دروستکردوە، واتە: لە هەردووکیان، هەروەها پێغەمبەر ﷺ وەک لە فەرمایشتی پێشێ دا هاتبوو، دەفەرموێ: ئاوی پیاو سپییەو ئاوی ئافرەت زەردەو، کاتێ کۆبوونەوەو، ئاوی پیاوەکە زاڵ بوو بەسەر ئاوی ئافرەتدا، نێرینە دەردەچوێنن بە مۆڵەتی خواو، ئەگەر تۆوی ئافرەتەکە زاڵ بوو بەسەر ئاوی پیاوەکەدا، مێینە دەردەچوێنن بە فەرمانی خوا.

قۆناغی شەشەم: کۆچکردنی نوتفە پیتێنراوەکە بۆ نێو منداڵدان، ئەمیش ئەم ئایەتە ئاماژەی پێدەکات: ﴿خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ﴿٧﴾﴾الطارق، واتە: مرۆڤ لە ئاوێکی دەرقوڵیو دروست بووە، کە لە نێوان ئێسقانەکانی پشت و سینگ دێتە دەرێ.

هەروەها لەم شوێنەوارەشدا هاتوە:

{**قَالَ عَبد اللـه بْنِ مَسْعُود: إِذَا وَقَعَتِ النُّطْفَة فـي الرَّحـم بَعَثَ اللهُ عَزَّ وَجَلّ مَلَكاً فَقَالَ: يَا رَبّ مخلّقة أو غير مخلقة؟ فَإِنْ قال: غير مُخلَّقَة مجّتها الأَرْحَامُ دماً، وَإِنْ قَالَ: مخلّقَة، قَالَ: يَا رَبّ فَمَا صِفَةُ هَذِهِ النطفة؟**}.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێ: ئەگەر نوتفە چووە نێو منداڵدانەوە، خوا فریشتەیەک دەنێرێ، فریشتەکە دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم! تەواو بێ و قۆناغەکان ببڕێ، یان قۆناغەکان نەبڕێ؟ ئەگەر فەرمووی: (**غَيرُ مُخَلَّقَةٍ**) با قۆناغەکان نەبڕێ، ئەوە منداڵدان دەری داوێ، بەشێوەی خوێن (لەگەڵ خوێنی حەیزدا دێتە دەرێ)و، ئەگەر خوا فەرمووی: (خوا مۆڵەتی لەسەر بوو) کە قۆناغەکان ببڕێ و تێرو تەواو بێ، ئنجا فریشتەکە دەڵێ: ئەی خوایە! سیفەتی ئەو نوتفەیە چی بێ و چۆن بێ؟

قۆناغی حەوتەم: بریتیە لە پێکەوە ئاوێتە بوونی دەمارو ڕیشاڵەکانی ئەو نوتفەیە، وەک لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە: {**إِذَا كَانَ حِينَ الوَلَـدِ اضطربت العـرُوقُ كُلُّهَا لَيسَ مِنها عـرقٌ إلاَّ يَسأَلُ اللهَ أَن يَجعَلَ الشَّبَهَ لَـه**} (**أَخرَجَهُ الحَكِيمَ التِّرمُذي: ٢٢**).

واتە: کاتێ کە منداڵ دروست دەبێ، هەموو دەمارەکان دەکەونە جووڵە، هیچ کامێک لەو دەمارانە نیە، مەگەر داوا لە خوا دەکات: ئەو منداڵە وەک ئەو بچێ.

واتە: لە خەتی دایکیەوە تاکو دەگاتەوە حەووا، لە خەتی بابیەوە تاکو دەگاتە ئادەم، دەگونجێ بە هەر کامێک لەوانە بچێ.

قۆناغی هەشتەم: تێکدا توانەوەی نێوکی هێلکۆڵەو حەیمەن، ئەمیش وا پێ دەچێ ئەم ئایەتە ئاماژەی پێ بکات، کە دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ

ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ الفرقان، واتە: خوا ﷻ ئەو کەسەیە کە لە ئاو مرۆڤی هێناوەتە دی، گێڕاویەتی بۆ هی پشتێ و هی بەرێ و، پەروەردگارت بە توانایە.

واتە: ئەو مرۆڤە دەگونجێ، سیفەتەکانی پشتێ، لە بابیەوە تاکو دەگاتە ئادەم سیفەت بێنێ و، لە سیفەتەکانی دایکیشی، لە دایکیەوە تاکو دەگاتەوە حەووا سیفەت بێنێ.

قۆناغی نۆیەم: تێکەڵبوونی ڕەگەکانی نوتفە بە ئەندازەگیریی کران، وەک ئایەتی (١٩)ی سوورەتی (عبس) ئاماژەی پێ دەکات ﴿مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾﴾ عبس، خوا مرۆڤی لە نوتفەیەک هێناوەتە دی، کە دروستی کردووەو ئەندازەگیریی کردوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِذَا أَرَادَ اللهُ أَن يخْلُق النَّسَمَةَ، فَجَامَعَ الرَّجُلُ المَرْأَةَ، طَارَ مَاؤُهُ فِي كُلِّ عِرْقٍ وعَصَبٍ مِنهَا**} (**أخرجه الطبراني في الكبير: ٦٤٤، وفي الأوسط: ١٦١٣، وفي الصغير: ١٠٦، قال الهيثمي: رجاله ثقات، وَالديلمي: ٩٥٨**).

واتە: هەر کاتێ خوا ویستی مرۆڤێک دروست بکات و، پیاوەکە لەگەڵ ژنەکەدا جووت بوو، ئاوی پیاوەکە بە هەموو ڕەگ و ڕیشاڵ و دەماری ئافرەتەکەدا دەفڕێ و بڵاودەبێتەوە.

واتە: لەگەڵ هێلکۆڵەدا ئاوێتە دەبێ، هەڵبەتە هێلکۆڵە گەورەیەو، وەک لە وێنەکاندا کراوە، هێلکۆڵە زۆر لە حەیمەن گەورەترەو، حەیمەن زۆر بچووکە، حەیمەنەکە شێوەی کەچکە ماسییەکە، خۆی تێ دەچەقێنێ و لەوێدا دەتوێتەوەو، بە هەموویدا بڵاودەبێتەوە.

قۆناغی دەیەم: لەتبوونی نوتفە، نوتفە دوای ئەوەی لە حەیمەنی پیاوو هێلکۆڵەی ئافرەت دروست دەبێ، ئنجا دەچێتە نێو منداڵدان و، دەست دەکات بە لەتبوون، قڵیشانی نوتفە (**إنفِلاقُ النُّطفَة**)، وەک ئەم ئایەتەی سوورەتی (الأنعام) ئاماژەی پێ دەکات: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۖ يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ ٱلْمَيِّتِ

﴿مِنَ ٱلْحَيِّۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٩٥﴾﴾الأنعام، واتە: خوا لێک جیاکەرەوەی تۆوەکان و نێوکەکانە، زیندوو لە مردوو دەردێنێ و دەرهێنەری مردوویە لە زیندوو، ئا ئەوەتان خوایە، بۆ کوێ لادەدرێن؟ نوتفە قڵیشان (إنفِلاق) دەکات، دەبێتە دوو، دەبێتە چوار، دەبێتە هەشت و ...هتد، دوایی گەشە دەکات و زۆر دەبێ، دوایی دەبێتە ملیۆنان خانەو، ئەو خانانە قۆناغەکانی دیکە بەو نوتفەیە، یاخود بەو کۆرپەلەیە دەبڕن.

قۆناغی یازدەیەم: نوتفە دوای ئەوەی دەچێتە نێو منداڵدان، دەگونجێ بەردەوام بێ و، دەشگونجێ لە باربچێ، (**إجهاض**) ببێ، وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**النُّطْفَة الَّتِي يخلق مِنْهَا الْوَلَد تُرْعدُ لَهَا الْأَعْضَاء وَالْعُرُوق كُلُّهَا إِذَا خرجت وَقعت فِي الرَّحِم**} (**الدر المنثور ج٦، ص٩٦، عَن ابْن عَبَّاس مَرْفُوعاً، والديلمي: ج٢٣**).

واتە: ئەو نوتفەیەی کە منداڵی لێ دروست دەبێ، هەموو دەمارەکان بۆی دەکەونە جووڵە، ئنجا هەر کاتێک دەرچوو، دەچێتە نێو منداڵدان و لەوێدا نیشتەجێ دەبێ.

قۆناغی دوازدەیەم: قۆناغی کێڵران، یان قۆناغی چێنران، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ ﴿٢٢٣﴾﴾، واتە: ژنەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە، واتە: وەک چۆن تۆوێک لە کێڵگەیەکدا دەچێنرێ، بە هەمان شێوەش تۆوی پیاویش کە دەچێتە نێو منداڵدانی ئافرەتەوە، وەک چۆن دەنکە تۆوێک لە زەویی دا سەوز دەبێ و پێدەگات، ئەو تۆوەی پیاویش کە حەیمەنەکەیە دەچێتە نێو هێلکۆڵەکە، دوایی دەبێتە نوتفە لەنێو منداڵداندا پێدەگات و گەشە دەکات.

قۆناغی سێزدەیەم: ئەمە کە لە ڕۆژی حەوتەمەوە (حەوتەم بەو لاوە) دەست پێدەکات، کۆکردنەوەی خانەکانی کۆرپەلەو، نیشتەجێ بوونی نوتفە لەنێو منداڵداندا و، کەم بوونی نوتفەکە لە نێو منداڵداندا، وەک ئایەتەکە ئاماژەی پێ

دەکات: ﴿وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ...﴿٨﴾﴾ الرعد، هەروەها لە فەرمایشتی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ پێشتریش باسمان کرد:

{ إِنَّ النُّطْفَةَ إِذَا اسْتَقَرَّتْ فِي الرَّحِمِ أَحْضَرَ اللَّهُ كُلَّ نَسَبٍ بَيْنَهَا وَبَيْنَ آدَمَ، أَمَا قَرَأْتَ هَذِهِ الْآيَةَ فِي كِتَابِ اللَّهِ ﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾﴾ الانفطار}، (أخرجه الطبراني في الكبير: ٦٤٤، وفي الأوسط برقم ١٦١٣، وفي الصغير: ١٠٦، قال الهيثمي: رجاله ثقات، والديلمي: ٩٥٨، وقال ابن رجب في جامع العلوم والحكم (ص ٤٨) إسناد ضعيف.

واتە: کاتێک نوتفە لە منداڵدان جێگیر دەبێ، خوا لە نێوان ئەو نوتفەیەدا تاکو دەگاتەوە ئادەم، هەموویان کۆدەکاتەوە، دوایی فەرمووی: ئایا ئەو ئایەتەت نەخوێندۆتەوە: لە هەر وێنەیەکدا کە خوای پەروەردگارت ویستی دروستت دەکات.

هەروەها ئەم شوێنەوارەش ئاماژەی پێدەکات: {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، قَالَ: إِنَّ النُّطْفَةَ إِذَا اسْتَقَرَّتْ فِي الرَّحِمِ أَخَذَهَا مَلَكٌ بِكَفِّهِ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ، مُخَلَّقَةٌ أَمْ غَيْرُ مُخَلَّقَةٍ؟ فَإِنْ قِيلَ غَيْرُ مُخَلَّقَةٍ؛ قَذَفَتْهَا الأَرْحَامُ دَمًا..} (أخرجه: ابن أبي حاتم في تفسيره: ١٣٧٨١).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: نوتفە کاتێ لە منداڵداندا نیشتەجێ دەبێ، فریشتەیەک دێ بە دەستی وەری دەگرێ[1]، دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! تێرو تەواو بێ و قۆناغەکان ببڕێ، یان قۆناغەکان نەبڕێ؟ ئەگەر فەرمووی: قۆناغەکان نەبڕێ، نابێتە مرۆڤ، منداڵدان لەگەڵ خوێندا فڕێی دەداتە دەرێ.

هەروەها ئەم ئایەتەش ئاماژەی پێ دەکات: ﴿ٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَحْمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلْأَرْحَامُ وَمَا تَزْدَادُ...﴿٨﴾﴾ الرعد، واتە: خوا ئەوەی هەر مێینەیەک هەڵیدەگرێ و، ئەوەی منداڵدانەکان کەمی دەکەن و، ئەوەش کە زیادی دەکەن، هەمووی دەزانێ.

---

(١) ئەوانە هەموویان تەعبیری ڕەمزیین، بۆ تێگەیشتنی ئێمە.

قۆناغـی چواردەیـەم: پێکهاتنـی عەلەقـە لەمیـانی کلێنجـە، (عَجْـبَ الذَّنَـبِ)داو، زیـاد بـوونی منداڵدانـەکان بـە کۆرپەلـە، واتـە: گەشـەکردنی کۆرپەلـە لـە منداڵدانـداو، فـراوان بـوونی منداڵـدان، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً ﴾، واتـە: دوایـی نوتفـە دەگۆڕیـن بـۆ عەلەقـە، نوتفەکـە (تۆویلکەکـە) دەگۆڕیـن بـۆ خوێنپـارەو، لـە فەرمایشـتدا هاتـوە، پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: {**كُلُّ ابْـنِ آدَمَ تَأْكُلُـهُ الأَرْضُ إِلاَّ عَجْـبَ الذَّنَـبِ، مِنْـهُ خُلِـقَ وَفِيـهِ يُرَكَّـبُ**} (**أخرجـه مسـلم: ٢٩٥٥، وأبـو داود: ٤٧٤٣، والنسـائي: ٢٠٧٧، عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ**)، واتـە: هەمـوو جەسـتەی ڕۆڵـەی ئـادەم گڵ دەیخـوات، جگـە لـە ئێسـکی کلێنجـە لـەو پێکهاتـوەو، لەویـش دروسـت دەبێتـەوە.

ئەمـە ئێسـتا زانسـتی تـازە دەری خسـتوە، کـە لـە دوای ڕۆژی حەوتەمـەوە، لـەو شـوێنەوە کـە دوایـی دەبێتـە ئێسـکی کلێنجـە، لەوێـوە هەمـوو خانـەکانی دیکـەی کـە ئەندامـەکانی کۆرپەلـە دروسـت دەبـن، ئـەوێ کارگەکەیانـەو، ئـەوێ مەڵبەنـدو سـەرچاوەکەیانە.

قۆناغـی پازدەیـەم: دروسـتبوونی زارجـوو (**مُضْغَـة**) کـە پارچـە گۆشـتێکە وەک زارجـوو، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً ﴾، دوایی عەلەقەمان کـردە پارچـە گۆشـتێکی زارجـوو، هەروەهـا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ ﴾القیامـة، دوایـی دەبێتـە عەلەقـەو خـوا دروسـتی دەکات و ڕێکـی دەخـات، واتـە: لـە دوای قۆناغـی عەلەقـە، ئنجـا دروسـت بـوون و ڕێکخسـتن کـە قۆناغـی زارجـوو (**موضغه**)یـەو، دوایـی قۆناغـەکانی دیکـە دەسـت پـێ دەکـەن.

قۆناغـی شـازدەیەم: کـە لـە ڕۆژی چلەمینـەوە دەسـت پـێ دەکات، بریتیـە لـە دروسـتکردنی ئێسـقان و، ڕێکخسـتن و، وێنەکێشـان و، نیشـتەجێ کـردن، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا ﴾، دوایی پارچە گۆشـتەکەمان کردە ئێسـک.

هەروەهـا پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرمایشـتێکدا دەفەرمـوێ: {**إِذَا مَـرَّ بِالنُّطْفَـةِ ثِنْتَـانِ وَأَرْبَعُـونَ لَيْلَـةً، بَعَـثَ اللَّـهُ إِلَيْهَـا مَلَـكاً، فَصَوَّرَهَـا وَخَلَـقَ سَـمْعَهَا، وَبَصَرَهَـا، وَجِلْدَهَـا،**

**وَلَحْمَهَا، وَعِظَامَهَا، ثُمَّ قَالَ: يَا رَبِّ أَذَكَرٌ أَمْ أُنْثَى؟} (أخرجه مسلم: ٢٦٤٥، الطبراني: ٣٠٤٤، وابن حبان: ٦١٧٧، والبيهقي برقم ١٥٢٠١، عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ).**

واتە: هەر کات چل و دوو (٤٢) شەو بەسەر نوتفەدا تێپەڕی، {یانی: دوای ئەوەی نوتفە دەچێتە نێو منداڵدان چل و دوو شەوی بەسەردا تێپەڕی کە دەکاتە شەش حەفتە (٦ × ٧ = ٤٢)}، خوا فریشتەیەک دەنێرێ، وێنەی دەکێشێ و، بیستن و، دیتنی و، پێستی و، گۆشتی و، ئێسقانی بۆ دروست دەکات، دوایی دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئایا نێر بێ یان مێ بێ؟

ئەمەش دیسان زانست ئێستا دەریخستوە کە لە قۆناغی دواتردا، نێر بوون و مێ بوونی ئەو کۆرپەلەیە دەردەکەوێ، وەک لە سوورەتی **(الحج)**دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ مِن مُّضْغَةٍ مُّخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِّنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى... ﴿٥﴾ ﴾، واتە: دوایی خوا لە پارچە گۆشتێکی تەواو یاخود ناتەواو، (واتە: دەبێتە مرۆڤ یاخود نابێتێ)، تاکو بۆتان ڕوون بکەینەوەو، دوایی لە منداڵداندا هەر کەسێک بمانەوێ تا کاتی دیاریکراو، نیشتەجێی دەکەین.

قۆناغی حەڤدەیەم: داپۆشینی ئێسک بە گۆشت و، پاشان ڕێکخستن، دوایی وێنە کێشان، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ﴾، دوایی ئێسکەکەمان بە گۆشت داپۆشی، هەروەها لە سوورەتی (القیامة)دا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: دوایی دەبێتە عەلەقە، پاشان خوا دروستی دەکات و ڕێکی دەخات.

قۆناغی هەژدەیەم: دروست بوونی پێست و گۆشت، یاخود داپۆشینی ئێسقان بە گۆشت، کە ئەمیش هەر لە نێو قۆناغی پێگەیاندن و ڕێکخستن دایە، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴾، دوایی ئێسقانەکانمان بە گۆشت داپۆشین، دوایی بە شێوەیەکی دیکە دروستمان کرد، بەرزیی و پیز بۆ خوای باشترینی بەدیهێنەرەکان.

لـە سـووڕەتی (الإنفِطار)یشـدا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ ﴾، واتـە: ئـەو (خوا)یـەی تـۆی هێناوەتـە دی، دوایـی تـۆی ڕێکخسـتوە، دوایـی تـۆی هاوسـەنگ کـردوە.

قۆناغـی نۆزدەیـەم: نێـر بـوون و مـێ بـوون، کـە ئەمـە کۆتایـی پێکهاتنەکەیـەتی و، پێـدانی وێنـەی تایبەتیـی کەسـیی بـەو کۆرپەلەیـەو، تەواوکـردنی دروسـتکرانەکەی، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِىٓ أَىِّ صُورَةٍ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ ﴾الانفطـار، واتـە: خـوا ئـەو زاتەیـە کـە تـۆی هێناوەتـە دی، ئنجـا ڕێکـی خسـتووی، هاوسـەنگی کـردووی، لـە هـەر وێنەیەکدا کـە ویسـتوویەتی تـۆی پێکهێنـاوە، وەک لـە سـووڕەتی (القیامـە)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَجَعَلَ مِنْهُ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ ﴾، ئنجا لـەو کۆرپەلەیـە، هـەردووک جـووتی نێـرو مێـی لـێ دروسـت کـردن.

قۆناغـی بیسـتەم: لـە چـوار مانـگ و دە (١٠) ڕۆژ بـەرەو دوا، ئنجـا لـەو قۆناغـەدا ئافـرەت هەسـت دەکات بـە جووڵـەی کۆرپەلەکـەی، هـەر بۆیـە خـوا ﷻ ئامـاژەی پـێ دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَٰجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ...﴿٢٣٤﴾ ﴾البقـرة، واتـە: ئەوانەتـان کـە لـە ئێـوە (لـە پیاوانتـان) دەمـرن و، ژنـان لـە دوای خۆیـان بەجـێ دێڵـن، دەبـێ ئـەو ژنانـە چـوار مانـگ و دە شـەوان چاوەڕێ بکـەن، (بـەر لـە شـووکردنەوە، ئنجا ئەگـەر تۆڵـدار بـێ، ئـەو ئافرەتـە کۆرپەلەکـە لـە سـکی دا دەجووڵـێ و، هەسـتی پـێ دەکات).

قۆناغـی بیسـت و یەکـەم: کـە کەمتریـن مـاوەی دوو گیـان و تۆڵـدار بـوونی ئافرەتەکـە بریتیـە: لـە شـەش مانـگ، واتـە: دەگونجـێ کۆرپەلـە بـە شـەش مانگیـی لە دایـک ببـێ، وەک ئـەم دوو ئایەتـە لێیـان وەردەگیـرێ:

١)- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَـٰلُهُۥ ثَلَـٰثُونَ شَهْرًا...﴿١٥﴾ ﴾الأحقاف، واتە: هەڵگرتنی لە سكداو لە شیر بڕینەوەی، لە ماوەی سی (٣٠) مانگدا.

ئنجا ئەگەر هەر کام لە تۆلداریی و شیر پێدان و لە شیر بڕینەوە، هەردووکیان سی (٣٠) مانگ بن.

٢)- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ...﴿٢٣٣﴾﴾البقرة، واتە: دایکان دوو ساڵی تەواو شیر بە کۆرپەکانیان دەدەن، بۆ هەر کەسێک بیەوێ ماوەی شیر پێدان تەواو بکات، کەواتە: دوو ساڵەکە دەکاتە بیست و چوار (٢٤) مانگ، (٢٤) مانگ لە سی (٣٠) مانگ دەرکەی شەش (٦) مانگ دەمێنێتەوە، (٣٠-٢٤=٦) ئنجا زانایان لەوە هەڵیانهێنجاوە: (**أَقَلُّ مُدَّةَ الحَمْلِ سِتَّةُ أَشهُر**)، کەمترین ماوەی تۆلدار بوونی ئافرەت بریتیە: لە شەش مانگ.

هەروەها لە سووڕەتی (لوقمان)دا خوا دەفەرموێ: ﴿وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ ﴿١٤﴾﴾، واتە: لە شیر بڕینەوەی لە ماوەی دوو ساڵاندا، وەک گوتم: دوو ساڵەکە دەکاتە (٢٤) مانگ، کە دەفەرموێ: ﴿وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ...﴿١٥﴾﴾الأحقاف، پێ دوو گیان بوونیی و لە شیر بڕینەوەی، لە ماوەی سی (٣٠) مانگدا، ئەگەر لە شیر بڕینەوەکەی دوو ساڵ بێ، کەواتە: شەشە مانگ دەمێنێتەوە بۆ دوو گیان بوونەکەی.

قۆناغی بیست و دووەم و کۆتایی: ئەوەیە کە خوا ﷻ ڕێ ئاسان دەکات، بۆ ئەو کۆرپەلەیە بێتە دەرێ، وەک دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾﴾عبس، واتە: دوایی خوا ڕێی بۆ ئاسان دەکات، وەک دەفەرموێ: ﴿قُتِلَ ٱلْإِنسَٰنُ مَآ أَكْفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنْ أَىِّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطْفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ﴿٢١﴾﴾عبس، واتە: مرۆڤی کافر لە بەین بچێ، چەند سپڵەیە، (خوا) لەچی دروستیکردووە؟ لە نوتفەیەک، لە (تۆویلکەیەک)، دروستیکردوە، ئنجا ئەندازەگیریی بۆ کردوە، تاکو پێ دەگات و، دەبێتە کۆرپەلە، دوایی ڕێی بۆ ئاسان دەکات بۆ لە دایک بوونی.

بەڕێـــــزان!

دەزانـن لـە دایـک بـوونی منداڵ، چەنـد پڕۆسـەیەکی قـورس و هەسـتیارە، تەماشا بکەن! ئەگەر ئەو منداڵە لە پێشدا لە جیاتی ئەوەی سەری بێ، وەک لە ئەسڵدا منـداڵ سـەری لـە لای سـەرێیەو، پێیـەکان و دەسـتەکانی لـە لای خوارێنـە، لـە نێـو منداڵدانی دایکی دا، بەڵام لە کاتی لە دایک بووندا، یەکسەر ئەو منداڵە تەقڵەیەک لێ دەداو، سـەری دەکەوێتـە خـوارێ و، دەسـت و پێیـەکانی دەچنـە سـەرێ، دایبنێ ئەگـەر پێـی بـێ، یـان دەسـتی بێـت، چـۆن دێتـە دەرێ؟! بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ٢٠﴾، خـوا ڕێـی بـۆ ئاسـان کـرد، واتـە: ڕێـی هاتنـە دەر لەنێـو منداڵـدانی دایکـی، ڕێـی لـە دایـک بـوونی ﴿ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقْبَرَهُۥ ٢١﴾، دوایـی ماوەیـەک ژیـان دەگوزەرێنـێ لەسـەر دنیـا، ئنجـا خـوا دەیمرێنـێ و وای لێـدەکات بخرێتـە گـۆڕەوە.

## مەسەلەی دووەم:

**حەتمیی بوونی مردنی هەموو کەس و، زیندووکرانەوەیان بۆ پاداشت و سزا درانەوەیان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴾، ئنجا بە دڵنیایی ئێوە لە دوای ئەوە، مردووان دەبن، یانی: دوای ئەو شێوە دروستکران و دوای ئەو ژیانە کاتییە، کە خوا ﷻ بۆی دیارییکردوون لەسەر زەوی، بە دڵنیایی و زۆر بە جەختکردنەوە: ئێوە، هەمووتان ئەی مرۆڤەکان دەمرن، پێشێ خوا ﷻ بە شێوەی نادیار (غائب) باسی دروستکردنی مرۆڤ دەکات: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ ﴾، بەڵام دوایی شێوەی دەربڕینەکە لە نادیار (**غائب**)ەوە، دەگۆڕێ بۆ ئامادە (**حاضر**)، کە ئەوە پێی دەگوترێ: ئاوڕدانەوە، ﴿ ثُمَّ ﴾، لێرەدا (**لِلتَّرتِيب الرُّتبي**)، بۆ ڕیزبەندیی، پلە بەندییە، چونکە کە لێرەدا باسی مردن دەکات، بیرخستنەوەی مردن، بەهێزترە لە باسکردنی چۆنیەتی دروست بوون، ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ﴾، ئەوە باسی دروستبوونە، ئەو ﴿ ثُمَّ ﴾یە لە ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴾دا بۆ گواستنەوەیە بۆ ڕیزبەندیی پلەو پایە، چونکە بە نسبەت ئەوانەوە کە دوێنراون و، بە نسبەت هەموو مرۆڤەکانیشەوە، ئەوە کە بزانن مردنیان دێتە سەر، کە دەشزانن، گرنگترە لە زانینی چۆنیەتی دروستبوونیان، بەڵام ئەوەش دیسان ڕێخۆشکردنە بۆ ڕستەی دواتر.

لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴾، لێرەدا ئەو ڕستەیە هەم بە (إِنَّ)، کە بۆ جەختکردنەوەیە، هەم بە (ل) کە ئەویش بۆ تەئکیدە، بەڵکو هەندێک لە زانایان دەڵێن: (ل) (مُمَهِّدَةٌ لِلقَسَم)، ڕێ خۆشکەرە بۆ سوێند،

جەختكردنەوەی ئەوە بە (إِنَّ)ەو بە (ل)، لەگەڵ ئەوەشدا كە گومانیان نەبووە لە مردندا، بۆ چییە؟ ئەو جەختكردنەوەیە لەبەر ئەوەیە كە هەرچەندە بە ڕواڵەت گومانیان نەبووە لە مردندا، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا كە بیریان نەكردۆتەوە لەوەی لە دوای مردن، بۆیان دێتە پێش، كە سزاو پاداشتە، وا مامەڵەیان لەگەڵدا كراوە، كە ئێوە بڕواتان بە مردن نیە، بۆیەش بۆیان جەختكراوەتەوە.

٣)- ﴿ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ﴾، جارێكی دیكە ﴿ثُمَّ﴾، بەكاردەهێنرێ، ئەویش دیسان هەر بۆ ڕیزبەندیی پلەو پایەیە، (**لِلتَّرتِيب الرُّتبِي**)، واتە: دوای مردنیشتان، ئنجا لەوەش گرنگترو گەورەترو بەرزتر دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە كە ئێوە بە دڵنیایی لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا زیندوودەكرێنەوە، بۆ سزاو پاداشت.

## مەسەلەی سێیەم:

**خوای زاناو توانا لە سەروومانەوە حەوت ئاسمانی چین چینی دروستکردوون و، لە دروستکراوەکانی خۆیشی بێ ئاگا نیەو، بەردەوام چاودێرییان دەکات و مشووریان دەخوات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ ﴾، بە دڵنیایی لە سەرووتانەوە حەوت چینمان دروستکردوون، دیسان (ل) و (قَد)، بۆ جەختکردنەوەن، (قَد) کە دەچێتە سەر کرداری ڕابردوو، جەختکردنەوەو ساغکردنەوە دەگەیەنێ، (ل)ەکەش هەر بۆ جەختکردنەوەیە.

﴿ سَبْعَ طَرَآئِقَ ﴾، وەک لە سوورەتی (**الملك**)دا، دەفەرموێ: ﴿ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ طِبَاقًا ﴿٣﴾ ﴾، (**طِبَاق**)، یانی چین لەسەر چین، (**طَرائِق**)، کۆی (**طَرِيقة**)یە، بە مانای چینی ئاسمان دێ، هەروەک (**طُرق**)، کۆی (**طَرِيق**)ە، بە مانای ڕێگایە.

**٢)-** ﴿ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە لە دروستکراو بێ ئاگا نین، واتە: لە دروستکراوەکانی خۆمان، وەک لە سوورەتی (**الرحمن**)دا، دەفەرموێ: ﴿ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِي شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: خوا هەموو ڕۆژێک (ڕۆژ لێرەدا مەبەست پێی کاتە)، یانی: لە هەموو کاتێکدا خوا کاری هەیەو، مشووری دروستکراوەکانی خۆی دەخوات.

## سەرنجێک لە گەردوون و
## مشوور خواردنی بەردەوامی خوا بۆی

شایانی باسە: ئێمە لە سوورەتی (**یونس**)دا، بە درێژیی باسی گەردووغان کردوە[1]، هەروەها لە مەوسووعەی (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد)دا، درێژتر باسی گەردووغان کردوە، چۆنیەتی سەرهەڵدانی و، تەمەنی گەردوون و، پێکهاتەکانی گەردوون کە کەهکەشانەکانن، بۆیە لێرە ناچینە نێو وردەکاریی ئەوەوە.

ئەوەندە دەڵێین: کە تاکو ئێستا نوێترین بیردۆزە کە زانایان پێی گەیشتوون، لە بارەی قەبارەی گەردوونەوە، ئەوەیە کە تیرە (**قطر**)ی گەردوون بە (١٣ - ١٥) ملیار ساڵی تیشکیی مەزەندە دەکرێ، ساڵی تیشکیی ئەوەیە کە تیشک لە چرکەیەکدا (٣٠٠،٠٠٠) سێ سەد هەزار کیلۆمەتر دەبڕێ، ئنجا بۆ ئەوەی بزانین لە خولەکێکدا چەند دەبڕێ (٣٠٠،٠٠٠ جارانی ٦٠) دەکەین، خولەکمان بۆ دەردەچێ، دوایی جارێکی دیکە جارانی (٦٠) شەستی دەکەین، ئەنجامەکەی کاتژمێرمان بۆ دەردەچێ، چونکە هەر خولەکێک (٦٠) چرکەیەو، هەر کاتژمێرێکیش (٦٠) دەققەیە، ئنجا بۆ ئەوەی ئەو ماوەیەی تیشک لە هی شەوو ڕۆژێکدا دەیبڕێ، بۆمان دەربکەوێ دەبێ ئەنجامی ئەوەی کە پێشتر هاتۆتە دەستمان، جارانی (٢٤)ی بکەین، (٢٤) سەعات، بۆ ئەوەی شەوو ڕۆژمان بۆ دەربکەوێ، دواییش ئەنجامەکەی جارانی (٣٦٥) دەکەین، بۆ ئەوەی ساڵمان بۆ دەربکەوێ، کە دەکاتە: (٩٤٦١،٠٠٠٠٠٠٠٠) نۆ تریلیۆن و چوار سەدو شەست و یەک ملیار کیلۆمەتر.

---

(١) هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (فصلت)و سوورەتی (الرحمن)یشدا باسی گەردووغان کردوە.

ئنجا ئەو ماوەیەی تیشک لە (١٣ - ١٥) ملیار ساڵدا دەیبڕێ، بریتیە: لە تیرەی گەردوون، ئەمسەر بۆ ئەو سەری گەردوون.

ژمارەی کەهکەشانەکانی گەردوون، هەندێک لە گەردووناسان دەڵێن: (٢٠٠) ملیارو، هەندێک دەیگەیەنە (١٠٠٠) هەزار ملیار، واتە: یەک تریلیۆن کەهکەشان لە گەردووندا هەیە، کە ئەوە هەمووی مەزەنەیە.

ژمارەی ئەستێرەکانی کاکێشانی ئێمەش بە هەزار (١٠٠٠) ملیار، واتە: یەک تریلیۆن ئەستێرە مەزەندە دەکرێ، کە خۆری ئێمە یەکێکە لەو تریلیۆن ئەستێرەیەی لە کەهکەشانی ئێمەدا هەن.

وەک پێشتریش ئاماژەمان پێداو باسمان کرد، ئەگەر مرۆڤ وا هەست بکات: خوا ﷻ بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنیەتی و هەمیشە ئاگای لێیەتی، سەرپەرشتیی دەکات، چ هی ئەو وەک مرۆڤێک، چ هی ئەم گەردوونە پان و پۆڕو فراوان و زەبەلاحە، چ هی بچووکترین دروستکراو لە دروستکراوەکانی خوا، چ لە ژیانداران، وەک ئەمیبا، یان لە ئەمیبا گچکەتر، میکۆپلازما، چ لە دروستکراوە بێ ژیانەکان، وەک گەردیلە، بەڵکو پێکهاتەکانی گەردیلە، بەڵکو پێکهاتەی پێکهاتەکانی گەردیلە، کە باسمان کردوە، ئەگەر گەردیلە لە سێ بەشی سەرەکیی پێک دێ: (پرۆتۆن و نیوترۆن) لە نێوکدا، (ئەلیکترۆن) کە بە دەوری نێوکدا دەخولێتەوە، ئێستا دەرکەوتوە هەر کام لە پرۆتۆن و نیوترۆنیش، یەکێ لە سێ کوارگ پێک دێن، ئنجا ڕەنگە ئەوانیش دیسان لە شتی بچووکتر پێک بێن.

هەموو ئەوانە خوا ﷻ ئاگای لێیانە ﴿وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ﴾، چونکە ﴿ٱلْخَلْقِ﴾ بە چاوگ هاتوە، بەڵام مەبەست پێی (مخلوق)ە، یانی: هەموو دروستکراوەکانی خوا، خوا ﷻ لێیان بێ ئاگا نیە، بەڵێ ئا ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە، زۆر جیایە لەوەی کە لە لایەن ئایینی نەصرانیی و جوولەکەوە تەبەنیی کرابوو، کە ئەویش بیردۆزەی فەیلەسووفەکانی یۆنان بوو، کە پێیان وابووە خوا گەردوونی

وەک کاتژمێـر قورمیـش کـردوەو لێـی گـەڕاوەو، کاری بەسـەریەوە نیـە، بەڵکـو زانیارییـشی لـە بـارەی وردەکارییەکانـەوە نیـە! ئـا ئـەو بیـرو بۆچوونـە سـەقەتە، کـە بێگومـان پێچەوانـەی پایـەی بـەرزی خـوای پـەروەردگارە، چـۆن دەبـێ خـوا ئـاگای لـە دروسـتکراوەکانی نەبـێ؟ پاشـان ئەگـەر ئـاگای لێیـان نەبـێ چـۆن بەڕێوەدەچـن؟ دەفەرمـوێ: ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَىۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠﴾ طـه، واتـە: پەروەردگارمـان ئـەو زاتەیـە بـوونی بـە هـەر شـتێک داوەو دواییـش خستوویەتە سـەر ڕێ، ڕێنمایـی کـردوە، ڕاستەڕێی کـردوە، ﴿كُلَّ شَىۡءٍ﴾، وەک چۆن مـرۆڤ دەگرێتەوەو ژیانـدارانی دیکـە دەگرێتـەوەو، کەهکەشـان و ئەسـتێرەکان و خڕۆکـەکان دەگرێتـەوە، بەهەمـان شـێوە گەردیلـەکان و ژیانـداره وردەکانی نێـو دەریـاو نێـو هـەواو سـەر زەویـی و ژێـر زەویـش دەگرێتـەوە، ئنجا ئـەو بیـرو بۆچوونـە سـەقەتە وا لـە مـرۆڤ دەکا، کـە هـەر بـۆ خـۆی دەژی و، خـوا ﷻ هەقـی بەسـەریەوە نیـەو ئـاگای لـێ نیـە، ئـا ئـەوەش بـوو زەمینـەی خـۆش کـرد لـە ڕۆژئـاواو لـە ئەورووپـا بـۆ سـیکۆلاریزم کـە بڵـێ: مـادام خـوا کاری بەسـەر مرۆڤەکانـەوە نیـەو، گـەردوونی دروسـتکردەوەو لێـی گـەڕاوەو وێڵـی کـردوە، کەواتـە: مرۆڤـەکان دەبـێ بـۆ خۆیـان خەمـی خۆیـان بخـۆن! ئـەوە وای لـەوان کـرد کـە سـەر بـەرەو ئاسـمان بـەرز نەکەنـەوەو چاوەڕوانییەکیـان لـە خـوا نەبـێ، بەرنامـەو هیدایەتیـان بـۆ بنێـرێ، پەیامیـان بـۆ بنێـرێ، کـە ئـەوەش بـە تەئکیـد پێچەوانـەی سیفەتە بـەرزەکانی خوایـەو، پێچەوانـەی واقیعیشـە، کـە خـوا ﷻ لـە ئادەمـەوە تاکـو خاتـەم سـەدو بیسـت و چـوار هـەزار (١٢٤،٠٠٠) پێغەمبـەری نـاردوە، صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ، وەک لـە موسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتـوە.

پاشـان ئـەوە کـە وەک حەقیقـەت و واقیعیـش وایـە، مـرۆڤ ئەگـەر هەمیشـە لەگـەڵ خـوای خۆیـدا ڕازو نیـازی هەبـێ و، وابزانـێ کـە بـە خولیایـەکانی نێـو دڵ و دەروونیـشی، بـە بیـرو بۆچوونـەکانی نێـو مێشـکیشی و بـە وشـەو تەعبیـرەکانی سـەر زمـانی و، بـە کـۆی هەڵسـوکەوتەکانی، ئـاگادارە، ئـا ئـەوە وا لـە مـرۆڤ دەکات کـە

بە وریاییەوە بژیێ و، بزانێ چۆن دەژیێ، پاشان هەست بە لەگەڵ بوونی خواو، پشتیوانیی خواو مشوورخۆریی خوای پەروەردگار دەکات، ئا ئەو شێوە هەست و نەستە کە ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، کە تاکە ئیمان و عەقیدەی ڕاستەو، ئەو تێڕوانینە کە بوونناسیی ئیسلامیی دروستی دەکات، کە ڕاستترین بوونناسییە، بەڵکو تاکە بوونناسیی ڕاست و دروستە کە هەموو پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەو بوونناسییەیان هێناوەو، هەموو پێغەمبەرانیش (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ئەو شێوە ئیمان و عەقیدەیان هێناوە، ئەوە بە تەئکید زۆر جیایە لەوەی کە کاتی خۆی فەلسەفەی یۆنانیی گوتوویەتی و، دوایی کڵێسا تەبەنیی کردوە، شوێنەوارێک کە بوونناسیی و ئیمانی ئیسلامیی لە مرۆڤدا دروستی دەکات، زۆر جیایە لەو شوێنەوارەی کە ئەو جۆرە بوونناسیی و عەقیدەیەی کاتی خۆی لە لایەن ئەورووپاییەکانەوە تەبەنیی کرابو و، دروستی دەکات.

## مەسەلەی چوارەم:

**خوای میهرەبان بە ئەندازە ئاوی لە ئاسمان دابەزاندوەو جێگیری كردوەو، چەندان باغی خورماو ترێیی بۆ مرۆڤەكان پێی ڕواندوە، كە چەندان جۆرە میوەیان تێدایە، بە تایبەت درەختی زەیتوون، كە ڕۆن و پێخۆریشی تێدایە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ ۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ ﴿١٨﴾ فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِ جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَّكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَاءَ تَنبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِّلْآكِلِينَ ﴿٢٠﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ﴾، لەسەرێوە بە ئەندازە ئاومان دابەزاندوە، وشەی (ماء) ئاو: باران و بەفرو تەرزەش دەگرێتەوە، بۆیە بەزۆریی خوا ﷻ مەگەر سیاقەكە بیخوازێ، ئەگەرنا هەر وشەی (ماء) بەكاردێنێ، بۆ ئەوەی هەرسێكیان بگرێتەوە.

كە دەفەرموێ: ﴿بِقَدَرٍ﴾، واتە: بە ئەندازەگیریی كردن و دیارییكردن، (**التَّقْدِيرو وَالتَّعيين**)، چەند بێ و چۆن بێ؟

پێشتریش ئاماژەیەكم پێدا دەبێ ئینسان بیر بكاتەوە، ئەگەر ئەو ئاوەی لە ئاسمان دێتە خوار، لە سەرێ دێتە خوار بۆ سەر زەوی، ئێستا چەندە، ئەگەر دوو هێندە، سێ هێندە، چوار هێندە بووایە، ژیانی مرۆڤ چی لێ دەهات؟ بە تەئكید ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی نەدەبوو، چونكە ئەوەتا بەو ئەندازەیەش، بۆ وێنە: ئەمساڵ (٢٠١٩ز) كە بارانی زۆر باری، بەو ئەندازەیەش ئەو هەموو لافاوو لێزماوە پەیدابوون، كە دوایی ئەو هەموو شوێنەوارە خراپانەیان لێ پەیدا بوون، ئەدی ئەگەر دوو ئەوەندەو سێ ئەوەندەو زیاتر بووایە، بە تەئكید دەرهاویشتەی زۆر خراپتری دەبوون.

٢)- ﴿ فَأَسْكَنَّهُ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، ئنجا نیشتەجێمان کردوە، سەقامگیرمان کردوە لە زەویی دا، (**الإسكانُ: جَعلُ الشَّيءِ فِي مَسكَنٍ وَهُوَ مَحَلُّ القَرَار**)، (**إِسْكَان**)، بریتیە لەوەی شتێک لە نشینگەدا دابنرێ، کە شوێنی تێدا سەقامگیربوونە.

ئەمیش بۆ خۆی زۆر گرنگە، وەک لە مەوسووعەی: (دەرەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد)دا باسمان کردوە، باسی بەرگە ئاویی دەوری زەویی و، بەرگە هەوای دەوری زەویمان کردوە، کە نیشتەجێ بوونی ئاوی شیرین لە زەوییداو، عەمبارکردنی و هەڵگرتنی، دوایی دەرکەوتنەوەی بە شێوەی کانیی و سەرچاوە، یاخود بیرو کارێز، ئەوەش بۆ خۆی لەخۆیدا نیعمەتێکی زۆر گەورەی خوای پەروەردگارە، ئەگەرنا ئاوی شیرینمان لە کوێ دەبوو؟ ئەگەر ئەو ئاوە کە بەشێوەی باران و بەفرو تەرزە دێتە خوار، کۆنەکرابایەوە لە نێو ناخی زەویدا، خوا بۆی عەمبار نەکردبایەن، چۆنمان وەدەست دەهێنا؟ دەبوو هەموو جارێ کە باران و بەفرو تەرزە دەباری، خەڵک تەشت و مەنجەڵی وەبەر نابان تاکو پڕ بن لە ئاو! ئنجا ئەوە لە کوێ و، ئەوە لە کوێ کە خوای پەروەردگار بۆی داکردووین و، بۆی کۆکردینەوە لە زەوییدا، دوایی لە کاتی پێویستیی ئێمەدا خۆی دێتە دەر، بە شێوەی کانیی و سەرچاوە، دەردەقوڵێ، یاخود ئێمە دەیهێنینە دەرێ بەشێوەی بیرو کارێز.

٣)- ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابِۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ ﴾، ئێمە لەسەر لابردنی ئەو ئاوە، دوورخستنەوەی و، نەهێشتنی بە توانایین، وشەی ﴿ ذَهَابِۭ ﴾، بە نەناسراو (**نكرة**) هاتوە، ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابِۭ بِهِۦ ﴾، بۆ مەزن پێشاندان و قەبە پێشاندان، چونکە بە زۆر شێوە دەگونجا ئەو ئاوە نەمێنێ، ببێتە هەڵم، بە ناخی زەویی دا بچێتە خوارو نەیدۆزینەوە، یاخود کە دەچووە نێو ناخی زەوی، گۆڕانی بەسەردا بێ و، بە کەڵکی خواردنەوە نەیەت، بەزۆر شێوەی دیکە، کە دەگونجێ مرۆڤ لە لای خۆی وێنایان بکات، دەگونجا لابرێ و نەهێڵرێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَآؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍۭ ﴿٣٠﴾ ﴾الملك، واتە: بڵێ: ئایا ئەگەر ئاوەکەتان ڕۆبچێ، نغرۆ بێ، دابچێتە خوار، ئاوی کانیی و سەرچاوە کە دەبینرێ و، دەڕوا، کێ بۆتان دێنێ؟

٤)- ئنجا خوا ﷻ باسی بەرهەمەکانی ئەو ئاوە دەکات، دەفەرمویٚ: ﴿فَأَنشَأْنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ﴾، بەو ئاوە بۆ ئێوەمان پێگەیاند، چەندان باخ لە دارخورمایەکان.

٥)- ﴿وَأَعْنَٰبٍ﴾، هەروەها لە لە ترێیەکان، لە دار مێوەکان.

بە بۆچوونی من ڕەنگە لە تەفسیرەکانیشدا هەبێ، بەڵام لە یادم نیە بینیبێتم بۆیە خوا ﷻ هەم لێرە، هەم لە زۆر شوێنی دیکەش باسی دار خورماو دار مێو دەکات، لەبەر ئەوەی بەرزترین درەختی میوەدار، دار خورمایە، لە هەمووان بەرزترەو، نزمترین درەختی میوەداریش، مێوە، بەتایبەتی مێوی دێمەکار، لەسەر زەوی پان ڕادەخریٚ، هیچ بەرز نابێتەوە، یاخود خەڵک کەپرو ساباتی بۆ دەکات، لەوێش هەر ڕادەخریٚ و، دار مێو کورتترین و نزمترینیەتی و، دارخورماش بەرزترین درێژترینیەتی، ئنجا خوای بەرزو مەزن دەفەرمویٚ: لە بەرزترینیەوە کە دارخورمایە، تاکو نزمترینی کە دار مێوەو، ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، ئەوانەمان هەموویان بۆ ئێوە هێناونە دی.

٦)- ﴿لَّكُمْ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٌ﴾، بۆ ئێوە لەو (باخ)انەدا میوەی زۆری زەوەند هەن، ﴿فِيهَا﴾، ئەم ڕاناوە دەچێتەوە بۆ ﴿جَنَّٰتٍ﴾، نەک بۆ ﴿نَّخِيلٍ وَأَعْنَٰبٍ﴾، ئەگەر نا دەیفەرموو: (لَكُم فِيهِمَا)، ﴿لَّكُمْ فِيهَا﴾، واتە: لەو باخانەی کە لە نێویاندا دار خورماو دارتریٚ هەن، دواتر باسی دەکات کە زەیتوونیش هەیە، زۆر جۆرە میوەی دیکەش هەیە.

٧)- ﴿وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ﴾، هەروەها لێیان دەخۆن، وشەی ﴿فَوَٰكِهُ﴾، کۆی (فَاكِهَة)ە، (**وَهِيَ الطَّعَامُ الَّذِي يُتَفَكَّهُ وَيُتَلَذَّذُ بِأَكلِهِ مِنْ غَيرِ قَصدِ القُوتِ، فَإِن قُصِدَ القُوتُ قِيلَ لَهُ: طَعَام**)، (**فَاكِهَة**) بریتیە لەو خواردنەی کە مرۆڤ دەیخوات تەنها بۆ لەززەت و خۆشیی، نەک مەبەستی ئەوەبێ کە پێی بژی، وەک بژیو، ئەگەر مەبەست پێی بژیو بێ، وشەی خۆراک (**طَعَام**)ی بۆ بەکاردێ.

ئنجا دوای ئەوەی باسی دار خورماو دار مێوەکانی کرد، بە تایبەت باسی زەیتوون دەکات، دەفەرمویٚ:

٨)- ﴿ وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِن طُورِ سَيْنَآءَ ﴾، درەختێکیش کە لە کێوی سەیناء ﴿ طُورِ سَيْنَآءَ ﴾، دێتە دەرێ بۆ ئێوەمان ڕواندوە، وشەی ﴿ سَيْنَآءَ ﴾ ئەمە جۆرە خوێندنەوەیەکەو، بە (سِينَاء)یش خوێنراوەتەوە، (طُورِ سِينَاء)، بۆیەش لێرە باسی زەیتوون دواخراوە لە دارخورماو دارمێو (ترێ)، چونکە ویستراوە چاکەی خوا ﷻ زیاتر دەربخرێ لە زەیتووندا، کە هەم وەک میوە بەکاردەهێنرێ و، هەم وەک بژیویش.

٩)- ﴿ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ ﴾، کە ڕۆنتان بۆ دەڕوێنێ، یانی: کە دەڕوێ ڕۆنی گرتوەتە نێو خۆی.

١٠)- ﴿ وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ ﴾، پێخۆریش بۆ خۆرەران، وشەی ﴿ تَنۢبُتُ ﴾ خوێنراویشەتەوە: (تُنبِتُ)، ﴿ تَنۢبُتُ ﴾، لە: (نَبَتَ، يَنبُتُ)، بە مانای ڕوا، دەڕوێ هاتوەو ، (تُنبِتُ) لە: (أَنبَتَ، يُنبِتُ)، چ بە سیانیی (ثُلاثِي) چ بە چواریی (رُباعِي) بێ، هەردووکیان، مانایەکیان هەیەو، لێرەدا (لازم)ن نەک تێپەڕکەر (متعدي).

ئنجا ﴿ طُورِ سَيْنَآءَ ﴾یش، بە تەئکید ﴿ طُورِ ﴾، یان بە مانای هەر کێوێک و، هەر چیایەکە، یان بە مانای چیایەکی دیاریکراوە کە لە دەشتی سینایە، وشەی (دُهن)یش یانی: ڕۆن، چەوریی، کە بە (أَدهَان)، کۆ دەکرێتەوە، (صِبغ)یش، شتێکە شتێکی دیکەی پێ ڕەنگ بکرێ، کە لێرەدا مەبەست پێی پێخۆرە، لەبەر ئەوەی زەیت کە مرۆڤ پارووی لێ دەدات، نانەکە ڕەنگ دەکات و، هەر شتێکی دیکەش کە پێخۆرە، (صِبْغ)ی، پێ دەگوترێ، پێغەمبەر ﷺ لە بارەی زەیتەوە فەرموویەتی: {**كُلُوا الزَّيْتَ وَادَّهِنُوا بِهِ، فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ**}[1]، واتە: زەیت بخۆن و خۆشتانی پێ چەور بکەن، چونکە لە درەختێکی پڕ پیت و پێزە.

پێشتریش گوتمان: کە (سِينَاء)، وەک چۆن بە ﴿ سَيْنَآءَ ﴾یش، خوێنراوەتەوە، بە (سِينِين)یش، لە سوورەتی (التين)دا، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ١

---

(١) أخرجه الترمذي: ١٨٥١، والحاكم: ٧١٤٢، وقال: صحيح على شرط الشيخين، حديث أبي أسيد، وأخرجه أحمد: ١٦٠٩٧، والترمذي: ١٨٥٢، وقال: غريب، والطبراني: ٥٩٧، والحاكم: ٣٥٠٤، وقال: صحيح الإسناد، وله شاهد آخر بإسناد صحيح، والبيهقي في شعب الإيمان: ٥٩٣٨.

﴿وَطُورِ سِينِينَ ۝٢﴾ التین، بە (سِينِين)یش، هاتوە، هەمووشی مەبەست پێی ئەو ناوچەو دەڤەرەیە کە پێی دەگوترێ: دەشتی سینا، کە ئێستا قەوارەی جوولەکە وەک چۆن دەستی بەسەر فەڵەستیندا گرتوە بە داگیرکاریی و ستەم، خۆی لەوێش سەپاندوە بە دەست لە پشت دانی زلهێزان و، دەستیشی بەسەر ئەو ناوچەی سینادا گرتوە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**ئاژەڵیش پەندێکی گەورەی تێدایە، کە لە شیری نێو سکی دەخۆنەوەو، سوود گەلی زۆری تێدان و، وێڕای کەشتییان بۆ بارو سواریش بەکاردێ (بە تایبەت حوشتر):**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٢١﴾ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِنَّ لَكُمْ فِي ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ﴾: خوا ﷻ لەسەر ژماردن و سەرژمێرکردن و، خستنە ڕووی چاکەو نیعمەتەکانی خۆی بەردەوامە، دەفەرموێ: بە دڵنیایی لە ئاژەڵانیشدا بۆ ئێوە پەند هەیە، عیبرەت بە مانای پەندو دەرس دێ، لەبەر ئەوەی مرۆڤ لێیەوە دەپەڕێتەوە بۆ شتێکی دیکە، بۆ وێنە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١١١﴾ ﴾یوسف، باسی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) دەکات، لە کۆتایی سوورەتی یوسفدا،واتە: بە دڵنیایی لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکانیاندا پەند هەیە، بۆ خاوەن عەقڵان.

چونکە ئەوەی هاتۆتە ڕێی ئەو پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)و، ئەوان چۆن هەڵوێستیان تێدا نواندوە، تۆ لەوەوە ئەنجامگیرییەک دەکەی، تۆش وەک ئەوان بکەی، واتە: لەوێوە دەپەڕیەوە بۆ شتێکی دیکە، دەشگونجێ لێرەدا مەبەست لە عیبرەت بەڵگە بێ، واتە: لە ئاژەڵەکاندا بەڵگە هەیە بۆ ئێوە، لەسەرچی؟ لەسەر پەروەردگارێتیی خوا، لەسەر مشوورخۆرێتیی خوا، لەسەر بەزەیی و میهرەبانیی خوا بەرانبەر بە مرۆڤەکان، وشەی ﴿ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴾، پێشتریش باسمان کردوەو، سوورەتێکیش لە قورئاندا بەو ناوە هاتووە، ئێمە بە کوردیی دەڵێین: ئاژەڵەکان، زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەم چوار جۆرە دەگرێتەوە: ڕەشە

وڵاخ دەگرێتەوە بە نێرو مێ، واتە: گاو مانگاو، گامێش و کەڵ، پاشان مەڕ دەگرێتەوە، ئەویش دیسان بە هەردوو جۆری نێرو مێ، مەڕو بەران، دوایی بزن دەگرێتەوە، ئەویش بە هەردوو جۆری بزن و نێریی، حوشتریش دەگرێتەوە، ئەویش دیارە بە هەردوو جۆری نێرو مێی (**نَاقَة**) و (**جَمَل**)، لە کوردییدا هەر دەڵێین: حوشتر، یان ئەگەر بگوترێ: حوشترە نێر یان حوشترە مێ، چونکە لە کوردستاندا نەبووەو، ناوێکی تایبەتییان بۆ نێرو مێیەکەی دانەناوە، بەڵام لە زمانی عەرەبییدا لەبەر ئەوەی زیاتر لە نێو گەلی عەرەبدا بووە، بە نێرەکەی دەڵێن: (**جَمَل**)، بە مێیەکەی دەڵێن: (**نَاقَە**)و، بە هەردووکیان دەڵێن: (**إبل**) و (**بَعير**)، بۆ هەردووکیان بەکاردێن.

٢)- ﴿ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا ﴾، لەوەی کە لە سکیان دایە بە ئێوەی نۆش دەکەین، بە ئێوەی دەخۆینەوە، خوێنراوەتەوە: ﴿ نُّسۡقِيكُم ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**نَسقِيكُم**)، چونکە (**سَقَاهُ**)، یانی: خواردنەوەی پێداو (**أَسقَاهُ**)ش، هەر یانی: خواردنەوەی پێدا، مەبەستیش لەوەی لە سکیان دایە، شیرەکەیانە.

٣)- ﴿ وَلَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٞ ﴾، بۆ ئێوە سوود گەلی زۆریان تێدایە، لەو ئاژەڵانەدا، لە خورییەکەیان، لە تووکەکەیان، لە مووەکەیان، خوری مەڕ، تووکی حوشتر، مووی بزن، پێستی ڕەشە وڵاخ، بەڵکو لە پاشەڕۆکیشیان، لە قشپل و شیاکەو ڕیخەکەشیان و، لە ئێسکەکانیشیان، لە هەموو شتێکیان ئێمە دەتوانین بەهرە وەربگرین.

٤)- ﴿ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴾، لێشیان دەخۆن، کە مەبەست پێی گۆشتەکەیانە.

ئنجا هەر ئەوەندەش نا.

٥)- ﴿ وَعَلَيۡهَا وَعَلَى ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ ﴾، لەسەر ئەوان (ئەو ئاژەڵانە)و، لەسەر کەشتییش هەڵدەگیرێن، واتە: بۆ بارو سواریش بەکاریان دێنن، هەڵبەتە ئەوەی لەنێو ئاژەڵاندا بە کەڵکی بارو سوار بێ، حوشترە بە پلەی یەکەم و، بە پلەیەکی دیکەش گامێش و کەڵ، لەگەڵ گاو مانگا، بەڵام هەندێ لە زانایان گوتوویانە: وشەی (**الأنعام**)، وێڕای ئەو چوار

جۆرە، ئەوانی دیکەش دەگرێتەوە، واتە: کەرو ئێسترو ماین و بارگین و ئەسپ، ئەوانەش هەموویان دەگرێتەوە، ئنجا ئەگەر ئەوان بگرێتەوە، ئەو کاتە ئەم واتایە لێرەدا باشتر دەچەسپێ، چونکە مەگەر بە دەگمەن، ئەگەرنا مەڕو بزن هیچ بەکارناهێنرێن بۆ بارو سوار، چونکە توانای ئەوەیان نیە، بەڵکو ڕەشە وڵاخیش کەمتر وایە بەکاربهێنرێ، بەڵام حوشتر بە تەئکید بەکاردەهێنرێ.

بەڵام ئەگەر بڵێین: **(الأنعام)**، وێڕای ئەو چوارانە کە گۆشتیان دەخورێ، ئەوانی دیکەش دەگرێتەوە، کە وڵاخە بەرزەو کەرو ئێسترن، ئەو کاتە ئەو بۆچوونە زیاتر پشتگیریی ئەو ڕایە دەکات، کە وشەی **(الأنعام)**، هەر ئەو چوارە ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو چوارانە دەگرێتەوە، لەوانەی گۆشتیان دەخورێ، بەڵام ئاژەڵەکانی دیکەش دەگرێتەوە کە بۆ بارو سوار بەکاردەهێنرێن.

سوننەتە کاتێ ئینسان خواردن دەخوات، ئنجا ئەگەر گۆشت بێ، ئەگەر هەر شتێکی دیکە بێ، ئەم دوعایە بخوێنێ:

**{الحَمْدُ للهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا، وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلاَ قُوَّةٍ} (أخرجه أحمد برقم ١٥٦٧٠، وأبو داود برقم ٤٠٢٣، والترمذي برقم ٣٤٥٨، وقال: حسن غريب، وابن ماجه: ٣٢٨٥، والطبراني برقم ٣٨٩، والحاكم: ١٨٧٠، وقال: صحيح على شرط البخاري)**، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی ئەو خواردنەی پێدام و کردیە بژێووم، بەبێ جووڵەو توانایەک لەمنەوە، (خوای پەروەردگار ڕەخساندوویەتی).

**(محمد راتب النابلسي)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] تۆزێک بۆمان باسی چۆنیەتی دروست بوونی شیر دەکات، دەڵێ:

خانە گوانییەکان **(الخلايا الثدية)**، ((**ثُدي**)، هەم بە مانای گوان و، هەم بە مانای مەمکیش دێ)، کە لە مانگادا هەن، وەک: گومبەزێک وان، چەندان وردە دەماریان تێدان، زۆر بچووک و باریکن، ئەو وردە دەمارانە خوێنیان تێدایە، ئەو

---

(١) ج ٦، ص ٣٠.

خانەیە لە هەرچی زانای سەر زەوییە زاناترە، چونکە لەو خوێنە پێویستیی خۆی، لە خوێ و شەکرو ڤیتامینەکان و ماددە کانزاییەکان وەردەگرێ و، شیرێکی خۆش و ئاسان چووە خوار لە گەرووی لێ دروست دەکات، دڵۆپێک لەو شیرە دەخاتە نێو ئەو گومبەزەوەو، لەوێدا کۆدەبێتەوە (لە گوانی مانگادا)، سەرەنجام ئێمە شیرێکی خۆش و زۆڵاڵ و بەتامان دەست دەکەوێ.

ئنجا ئەوە بە نسبەت مانگاوە، وایگوتوە، بەڵام بە نسبەت حوشتریشەوە، (مێیەی حوشتر)، هەروەها بە نسبەت مەڕو بزنیشەوە، هەر وایە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَيْهَا وَعَلَى ٱلْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾، واتە: ئێوە لەسەر ئەو ئاژەڵانەو، لەسەر کەشتییش سوار دەکرێن، واتە: هەم لە وشکانیی، هەم لە دەریادا، وەک لە سوورەتی (**الإسراء**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ﴿٧٠﴾ ﴾، واتە: ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوەو، هەڵمانگرتوون لە وشکانیی و لە دەریا، لە وشکانیی لەسەر پشتی ئەو وڵاخانەو، لە دەریاش دا لەسەر کەشتیی، هەڵبەتە کاتی خۆی بەس بارەبەری ژیاندار هەبوون، بە هەموو جۆرەکانیانەوە، بەڵام ئێستا خوا یارمەتی مرۆڤی داوە کە زۆر هۆکاری دیکەی بارو سوارو هاتوچۆ دروست بکات، هەر لە سەیارەو شەمەندەفەرو، فڕۆکەو هەموو ئەو ئامڕازانەی دیکە، کە بەکاردەهێنرێن بۆ بارو سوارو هاتن و چوون، لە ئاو وشکانیی و هەوادا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی (٢٣ - ٥٠)، واتە: بیست و هەشت (٢٨) ئایەت دەگرێتە خۆی و، لەو (٢٨) ئایەتەدا، خوا ﷻ سەرەتا باسی بەسەرهاتی نووح و گەلەکەی گێڕراوەتەوە، پاشان باسی پێغەمبەرێکی دیکە کراوە صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ، کە ناوی نەهێنراوە، بەڵام بە مەزەننە پێ دەچێ صالح بێ، کە بۆ گەلی (**ثمود**) نێردراوە صەڵات و سەلامی خوا لەسەر صالح.

دوایی بە گشتیی باسی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)و گەلەکانیان کراوە، کە سەرجەمیان بە هۆی کوفرو بە درۆ دانانیانیەوە، فەوتێنراون، دوایی باسی مووساو هاڕوونی برای (**عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلام**) کراوە، کە بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەکەی نێرراون و، سەرەنجام فیرعەون و گەلەکەی، بەهۆی خۆ بەزلگریی و خۆ بەرز کردنەوە بەسەر مووساو پەیامەکەیدا، شایستەی سزادان بوون و فەوتێندراون.

دوایش ئاماژەیەکی کورت بە عیساو دایکی کراوە، صەڵات و سەلامی خوا لەسەر عیسا بێ و، خوا لە دایکی (مەڕیەم) ڕازی بێ.

﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ۙ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ

وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ ۖ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۖ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ
﴿٢٧﴾ فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾
وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ
أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ
أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ
أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم
مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا
نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ
رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ
فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾
مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ۖ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ ۚ
فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَٰهُمْ أَحَادِيثَ ۚ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ
وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِي۟هِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا
عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ
ٱلْمُهْلَكِينَ ﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً
وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴿٥٠﴾.

# مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها بە دڵنیایی نووحمان نارده لای گەلەکەی، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، جگە لەو هیچ پەرستراوێکتان نیە، (شایستەی پەرستران بێ)، ئایا پارێز (لە خوا) ناکەن؟ (کە جگە لەوی بپەرستن) ﴿٢٣﴾ دەستڕۆیشتووانی بێبڕوا لە گەلەکەی گوتیان: ئەم (نووح)ە، تەنیا بەشەرێکی وەک ئێوەیە، دەیەوێ خۆیتان بەسەردا هەڵبژێرێ (وەک سەرۆک)، ئەگەر خوا ویستبای (پێغەمبەر بنێرێ) فریشتەیەکی دادەبەزاند، شتی وامان لە باب و باپیرانی پێشوومانداندا نەبیستوە ﴿٢٤﴾ ئەو بەس پیاوێکە شێتیی تووش بووە، بۆیە بۆ ماوەیەک چاوەڕێی بکەن (بمرێ یان چاک بێتەوە) ﴿٢٥﴾ (نووح) گوتی: پەروەردگارم! لە بەرانبەر بە درۆدانانیاندا سەرمبخەو پشتم بگرە ﴿٢٦﴾ ئێمەش سروشمان بۆلا کرد، کە لەژێر چاودێرییماندا بەپێی ڕێنماییمان، کەشتیی دروست بکە، ئنجا هەر کات فەرمانمان هات و تەندوور دەرقوڵی، لە هەر جووتێک (لە ژیانداران)، دووان و خێزانەکەشتی، جگە لەوەی بڕیاری پێش وەختی لەبارەوە دراوە، (کە بفەوتێ)، بیخە نێوی و، لە بارەی ئەوانەشەوە کە ستەمیان کردوە، مەمدوێنە، چونکە بە دڵنیایی خنکێنراون ﴿٢٧﴾ ئنجا هەر کات خۆت و ئەوانەی لەگەڵتن، سواری کەشتییەکە بوون، بڵێ: ستایش بۆ ئەو خوایەی لە کۆمەڵی ستەمکاران دەربازی کردین ﴿٢٨﴾ هەروەها بڵێ: پەروەردگارم! لەجێیەکی بەپیز دامبەزێنەو، تۆش باشترین دابەزێنەرو نیشتەجێ کاری ﴿٢٩﴾ لەو (بەسەرهات)ەدا، نیشانە گەل هەن و، ئێمەش تاقیکەرەوەین (بۆ مرۆڤەکان) ﴿٣٠﴾ دوایی پاش ئەوان سەدەیەکی دیکەمان (لە خەڵک) پێگەیاند ﴿٣١﴾ لە نێویاندا پێغەمبەرێکمان نارد، پێی گوتن: خوابپەرستن هیچ پەرستراوێکی دیکەتان نیە، (شایستەی پەرستران بێ)، ئایا پارێز ناکەن (لە سزای خوا لەسەر هاوبەشدانان)؟! ﴿٣٢﴾ دەستڕۆیشتووە بێبڕوایەکانی گەلەکەی کە بڕوایان بە دیداری

دواڕۆژ نەبووو، لە ژیانی دنیادا خۆشگوزەرانمان کردبوون، گوتیان: ئەمە تەنیا بەشەرێکی وەک خۆتانە، هەر لەوە دەخوات کە ئێوە لێی دەخۆن و، لەوەش دەخواتەوە کە ئێوە لێی دەخۆنەوە ﴿٣٣﴾ بە مسۆگەرییش ئەگەر فەرمانبەریی بەشەرێکی وەک خۆتان بکەن، کەواتە: ئێوە لە زیانبارانن ﴿٣٤﴾ ئایا بەڵێنتان پێ دەدات کاتێک مردن و بوونەوە بە خۆڵ و ئێسکە (پڕتووکاوە)کان، ئێوە لە زەوی دەردەهێنرێنەوە؟! ﴿٣٥﴾ ئەوەی گفتتان پێ دەدرێ، دووره دوور ﴿٣٦﴾ ژیان تەنیا ژیانی دنیامانە، دەمرین و دەژین و، ئێمە لە زیندوو کراوان نابین ﴿٣٧﴾ ئەو (پیاو)ە بەس پیاوێکە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ و، ئێمەش بۆی نابینە بڕوادار ﴿٣٨﴾ (پێغەمبەرەکەیان) گوتی: پەروەردگارم! لە بەرانبەر ئەوەدا کە بە درۆیان داناوم، پشتم بگرەو سەرم بخە! ﴿٣٩﴾ (خوا) فەرمووی: دوای کەمێک ئەوانە لە پەشێمانان دەبن ﴿٤٠﴾ یەکسەر چریکەو هاڕەیەکی بە هەق گرتنی و، کردماننە پووش و پەڵاش، ئنجا کۆمەڵی ستەمکاران هەر دووربن ﴿٤١﴾ ئنجا دوای وان چەند سەدەیەکی دیکەمان (لە خەڵک) پێگەیاندن ﴿٤٢﴾ هیچ کۆمەڵێک (لەو سەدە فەوتێنراوانە) لە ئەجەلی خۆی نە پێش کەوتوەو نە دواکەوتوە ﴿٤٣﴾ دوایی پەیتا پەیتا بە دوای یەکدا پێغەمبەرانی خۆمامان ناردن، هەر کۆمەڵێک پێغەمبەرەکەی دەهاتە لای، بە درۆیان دادەنا، ئیدی هەندێکیانمان بە دوای هەندێکیان خستن (لە فەوتاندندا)و، کردماننە قسەو بەسەرهاتی کۆڕو مەجلیسان، کۆمەڵێک کە بڕواناهێنن با هەر دووربن ﴿٤٤﴾ دوایی مووساو هاڕوونی برایمان بە نیشانەکانمان و بەڵگەیەکی ڕوونەوە ناردن ﴿٤٥﴾ بۆ لای فیرعەون و دەست و پێوەندەکان، بەڵام خۆیان بە زلگرت و کۆمەڵێکی خۆ بەرز کەرەوە بوون ﴿٤٦﴾ گوتیان: ئایا بڕوا بە دوو بەشەران بێنین، کە وەک خۆمانن و، گەلەکەشیان ملکەچمانن و ژێر دەستمانن؟ ﴿٤٧﴾ ئیدی بە درۆیان دانان و سەرەنجام لە فەوتاوان بوون ﴿٤٨﴾ بە دڵنیاییش کتێب و بەرنامەمان بە مووسا دابوو، بەڵکو ڕێی ڕاست بگرن ﴿٤٩﴾ کوڕی مەریەم (عیسا)و دایکیشیمان کردنە نیشانەیەکی مەزن و، لە شوێنێکی بەرزی ئارام و سەرچاوەدار، پەنامان دان و سەقامگیرمان کردن﴿٥٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَتَفَضَّلَ عَلَيۡكُمۡ): واتە: دەیەوێ خۆیتان بەسەردا فەرز بکات، خۆیتان بەسەردا هەڵکێشێ، (**الفَضْلُ: الزِّيَادَةُ عَنِ الإقتِصَادِ، وَالتَّفَضُّلُ تَكَلُّفُ الفَضلِ وَطَلَبُهُ، وَالمَقصُودُ بِهِ زِيادَةُ الشَّرَفِ وَالرِّفعَة**)، (**فَضل**)، واتە: زیادە لە حاڵەتی میانجیی، (**تَفَضُّل**)، بریتیە لەوە کە ئینسان زۆر لە خۆی بکات، خۆی بە خاوەن زیادە دابنێ، یاخود داوای بکات، لێرەدا مەبەست پێی پلەو پایەو بەرزییە، واتە: دەیەوێ خۆیتان بەسەردا بسەپێنێ و خۆیتان لێ بکاتە گەورە.

(جِنَّةٌ): یانی: شێتیی، (**التَّنوِينُ لِلنَّوعِيَّةِ أَي شَيءٍ مِنَ الجُنُونِ خَفِيفٍ، لاَ تَبْدُو آثَارُهُ عَلَيْهِ، وَهَذَا احتِرَازٌ مِنَ التَورِيط فِي حَالٍ لاَ يَقدِرُونَ عَلَى إِثبَاتِهِ**)، بۆیە دەڵێن: ﴿بِهِۦ جِنَّةٌ﴾، یانی: شتێک لە شێتیی، حاڵەتێکی شێتیی تووش بووە، وەک گوتراوە: (**وَالجُنُونُ فُنُونٌ**)، شێتییش زۆر جۆری هەن، ئەم تەنوینە بۆ جۆرە، (**جِنَّةٍ**)، یانی: جۆرێک لە شێتیی، واتە: جۆرێکی سووک کە شوێنەوارەکەی زۆر پێوە دیار نیە، ئەمە بۆیە وایانگوتوە: بۆ ئەوەی خۆیان نەخەنە نێو قسەیەکەوە کە دوایی نەتوانن ئیسپاتی بکەن، ئەگەر کەسێک گوتبای: کوا ئەوە نیە زۆر عاقڵەو زۆر تێگەیشتوویە؟ دەیانگوت: نا، ئاخر گوتوومانە: جۆرێک لە شێتیی.

(وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ): (**الفَورُ: شِدَّةُ الغَلَيَانِ وَالهَيَجَان**)، (**فَور**) بریتیە لە حاڵەتی کوڵین و هەڵچوون، ﴿وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ﴾، واتە: هەر کاتێک ئاو لە تەندوور دەرقوڵیی.

(ٱسۡتَوَتۡ): یانی: (**رَكِبَتَ، وَارتَفَعَتَ، وَاعتَدَلَتَ**)، واتە: دوای ئەوەی خۆت و ئەوانەی لەگەڵتن، سواری کەشتییەکە بوون، بۆ سەری بەرز بوونەوەو هاوسەنگ بوون لەسەری.

(وَأَتۡرَفۡنَٰهُمۡ ): واتـە: خۆشـگوزەرانمان کردبـوون، (**التُّرفَـةُ: التَّوَسُّـعُ فِي النِّعمَـةِ، أَتـرَفَ فَهُـوَ مُـتْرَف**)، (**تُرْفَـة**) بریتیـە لـە فراوانیـی لـە نـازو نیعمەتـداو، دەگوتـرێ: (**أَتـرَفَ**)، واتـە: خۆشـگوزەران بـوو، (**فَهُـوَ مُـترَفٌ**)، ئـەو خۆشـگوزەرانە.

(هَيۡهَاتَ هَيۡهَاتَ ): ئـەم وشـەیە بەکاردەهێـنرێ بـۆ دوور خسـتنەوەی شـتێک، واتـە: (**بَعُـدَ بَعُـدَ**)، یـانی: زۆر دوورە زۆر.

(ٱلصَّيۡحَةُ ): (**رَفـعُ الصَّـوتِ**)، دەنـگ بەرزکردنـەوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا (**صَيْحَـة**)، یـانی: چریکـەو هـاڕژن و، دەنگێکـی زۆر بـێ ڕەزا.

(غُثَآءٗ ): (**غُثـاءُ السَّـيلِ وَالقِـدْر: وَهُـوَ مـا يَطفـحُ وَيَتَفَـرَّقُ مِـنَ النَّبَـاتِ اليابِـسِ**)، (**غُثَـاءُ السَّـيلِ وَالقِـدرِ**) ئـەو پـووش و پەڵاشـەی لەسـەر لێزمـاو لافـاو دەردەکـەوێ، یاخـود ئەو کـەف و کوڵـەی لەسـەر مەنجـەڵ دەردەکـەوێ، پێـی دەگوتـرێ: (**غُثَـاء**) هەروەهـا ئەو پـووش و پەڵاشـە وشـکە تێکشـکاوەی کـە بـا ڕای دەماڵـێ، پێـی دەگوتـرێ: (**غُثَـاء**).

(تَتۡرَا): (**تَـترا: عَـلَى فَعْـلَى مِـنَ المُوَاتَـرَةِ، أَي: المُتَابَعَـةِ وَتْـراً وَتْـراً، وَأَصلُهَـا وَاوٌ فَأُبدِلَـت مِثْـلُ: تُـرَاث وَتُجَـاه**)، ﴿ تَتۡرَا ﴾، لەسـەر کێـشی (**فَعْـلى**)، لـە (**مُواتَرَة**)یـە، واتـە: بـە دوای یەکـدا هاتـن، یـەک یـەک (**وَتـراً وَتـراً**)، لـە ئەصڵـدا واوە، بـەڵام دوایـی گـۆڕدراوە وەک: (**تُـراث و تُجَـاه**)، ئەگەرنـا ئەصڵـی خـۆی (**وَترَا**)یـە.

(أَحَادِيثَ): دوو واتـای هـەن، یـان کـۆی (**حَدِيـث**)ە، کـە بریتیـە لـە هـەر قسـەیەک کـە دەگاتـە ئینسـان لەڕێـی بیسـتنەوە، لەحاڵـەتی بێداریـی یـان لـە حاڵـەتی خەوتنـدا، یاخـود کـۆی (**أُحْدوثَة**)یـە، وەک (**أَعَاجِيـب**) کـۆی (**أُعجُوبـة**)ە، واتـە: ڕووداوێکی سـەیر.

(رَبۡوَةٍ ): (**المَكَانُ المُرْتَفِع**)، واتە: گرد، شوێنی بەرز، تەپۆڵکە.

(قَرَارٖ ): واتە: نیشتەجێ، شوێنی نیشتەجێ بوون.

(وَمَعِينٖ): (**مَاءٌ مَعِين: ظَاهِرٌ لِلعُيُونِ**)، ئاوێک کە بڕوات و بێ و چاوەکان ببینن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین: ئێمە سوپاس و ستایش بۆ خوا، لە تەفسیری سوورەتی (هود)دا، بە تێرو تەسەلیی باسی بەسەرهاتی (نووح)مان کردوە سەلامی خوای لەسەر، نووح لەگەڵ گەلەکەیدا، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (**الحجر**)دا، باسی بەسەرهاتی صاڵح و گەلی (**ثمود**)مان کردوەو، لە تەفسیرکردنی سوورەتی (**مريم**)دا باسی بەسەرهاتی عیسا عليه السلامو دایکی (مەریەم)، (خوا لێی ڕازیی بێ) مان کردوە، هەروەها لە بەسەرهاتی مووساو هاڕوون (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)و گەلەکانیان و فیرعەونمان لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (**الأعراف**)دا باسکردوە، ئەوەی ماویشە لە بەسەرهاتی مووساو هاڕوون صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ، لە تەفسیری سوورەتی (**القصص**)دا دەیخەینە ڕوو.

بۆیە لێرەدا بە کورتیی لەسەر هەم مانا گشتییەکەو، هەم مەسەلە گرنگەکانیش، دەوەستین مەگەر ئەوەی پێویست بێ بۆ لێ تێگەیشتنی ئایەتەکان، بۆیە ئەوەی لەوێ گوتراوە، بە بەس (کافي) دەزانین، لە بارەی بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانەوە (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) لێرە زۆر ناچینە نێو وردەکارییەکانەوە، چ لێرەدا، چ دوایی لە خستنە ڕووی مەسەلە گرنگەکاندا.

خوا تعالى لەم سوورەتە موبارەکەدا دوای ئەوەی لە بیست و دوو (٢٢) ئایەتی ڕابردوودا، هەم باسی سیفەتە بنەڕەتییەکانی ئیمانداراني کردو، هەم باسی چۆنیەتی دروستبوونی مرۆڤی کردو، دوایی باسی دروستکردنی حەوت ئاسمانەکان و، دابەزاندنی ئاو لە سەرێوەو، ڕواندنی باخ و بێستانەکانی خورماو ترێ و زەیتوون و میوەکانی دیکەوە، باسی ئاژەڵ و سوودو کەڵکەکانی کە لە ئاژەڵان وەردەگیرێن، باسی ئەوانەی هەموویان کرد:

ئنجا خـوا ﷻ بـاسی بەسـەرهاتی هەنـدێ لـە پێغەمبـەران دەكات، كـە یەكێكیـان ناویـان دێنـێ كـە نووحـەو، هەیـە نـاوی ناهێنـێ، كـەوا پێدەچـێ صالـح علیه السلام بـێ، هەروەهـا ئاماژەیـەک بـە مووسـاو هـاڕوون و عیسـاو دایكیـشی كـراوە.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾.

ئایا گـەلی نـووح چ گەلێـک بـوون؟ ناویـان نەهاتـوە، گـەلی هـوود پێیـان گوتـراوە: گەلـی عـاد، گـەلی صالـح پێیـان گوتـراوە: گەلـی ثەمـوود، بـەڵام گـەلی نـووح ناویـان نەهاتـوە، وەک كاتی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (هـود)، لـە كاتی توێژینـەوەی بەسـەرهاتی (نـوح)دا باسـمان كـردوە، وا پێدەچـێ ئەوەنـدە مرۆڤـە لەسـەر زەوی ژیا بـن، كـە (نووح)یـان بـۆ لا ڕەوانـە كـراوە صـەڵات و سـەلامی خـوای لەسـەر بـێ، بۆیـە خـوای پـەروەردگار ناوێكـی دیاریكـراوی لـێ هەڵنـەداون، چونكـە هـەر ئەوەنـدە مرۆڤـە بـوون، خـوا دەفەرمـوێ: بـە دڵنیایـی نووحـمان بـۆ لای گەلەكـەی ڕەوان كـرد، بـۆ لای كۆمەڵـە خەڵكەكـەی كـە دەبووایـە پەیامـی خوایـان پـێ بگەیەنـێ، فەرمـووی: ئـەی گەلەكـەم! خـوا بپەرسـتن، جگـە لـەو، پەرسـتراوێكی دیكەتـان نیـە، واتـە: جگـە لـەوی پەرسـتراوێكی دیكەتـان نیـە، شایسـتەی پەرسـتران بـێ، ئەگەرنـا پەرسـتراوانی سـاختەو بـێ نێـوەڕۆک هـەر بـوون و بەردەوامیـش هـەن، ﴿أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾، ئایا پارێـز ناكـەن؟ یانـی: ئایـا خۆتـان ناپارێـزن لـە سـزای خـوا؟ لەسـەر ئـەوەی كـە جگـە لـە خـوا بپەرسـتن؟

﴿فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾، (مَلأ)، پێشـتریش باسـمان كـردوە، واتـە: ئەوانـەی چـاوو دڵـی خەڵـک پـڕ دەكـەن لـە سـام و هەیبـەت و، لـە زریـق و بریـق، بـەڵام باشـتر وایـە بڵێیـن: دەسترۆیشـتووان و، بڕیـار بـە دەسـتان، زلـە زلـەكان، یانـی: دەسترۆیشـتووەكانی كـە بێبـڕوا بـوون لـە گەلەكـەی، لـە خەڵكەكـەی، گوتیـان: ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾، ئەمـە (واتـە: ئـەم نووحـە) علیه السلام هـەر مرۆڤێكـی وەک خۆتانـە، ﴿يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾، دەیـەوێ خۆیتـان بەسـەردا بسـەپێنێ،

خۆی لە ئێوە بە چاكتر دابنێ، یاخود بەسەرتاندا باڵادەست بێ و، خۆیتان بەسەردا بسەپێنێ، ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾، ئەگەر خواش ویستبای (ئەگەر خوا ویستبای پێغەمبەر بنێرێ)، فریشتەیەكی دادەبەزاند، ﴿مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴾، شتی ئاوامان نەبیستوە لە باب و باپیرانی پێشووماندا، ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ﴾، ئەمە تەنیا پیاوێكە جۆرێك لە شێتیی تێدایە، بۆیە چاوەڕێی بكەن، تاكو كاتێكی دیاریكراو، كە یان شێتییەكەی نامێنێ، واز لەو قسانە دێنێ، یاخود دەمرێ و لە كۆڵمان دەبێتەوە.

لێرەدا ئەگەر سەرنج بدەین! دەبینین گەلی نووح ئەوانە پێنج شتیان هێناونەوە، دەسترۆیشتووانی گەلی نووح، بۆ پەرپەرچدانەوەی نووح و، بۆ پاساو دانەوەی ئەوە كە بڕوای پێ ناهێنن، پێنج شتیان باس كردوون.

**یەكەم:** گوتوویانە: ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ﴾، ئەمە بەس مرۆڤێكی وەك خۆتانە، ئەمە بیانوویەكی لەمێژینەی هەموو دوژمن و ناحەزانی پێغەمبەران بووە، كە مرۆڤ بوونی پێغەمبەرانیان كردۆتە، بەڵگە لەسەر ئەوەی ڕاست ناكەن، ڕەوانەكراوو پێغەمبەری خوا بن.

**دووەم:** گوتوویانە: ﴿يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ﴾، دەیەوێ خۆیتان بەسەردا هەڵكێشێ، خۆی لەئێوە بە چاكتر دابنێ، خۆیتان بەسەردا بەرز بكاتەوە، كە لەڕاستییدا ئەوان خۆیان وابوون، ئەو خۆ بەزلگرو ئەو دەسترۆیشتووانە، خۆیان بەسەر خەڵكە ڕەش و ڕووت و جەماوەرە هەڵخەڵەتاوەكەدا سەپاندوە، وەك گوتراوە: (هەر كەسە لە هەمبانەی خۆیدا گوێزان دەژمێرێ)، ئەوانەش (**قِياسُ النَّفس**)یان كردوە، ئەوەی لە خۆیاندا هەبووە، وایانزانیوە (نووح)یش هەر وایە، ئێستاش هەر وایەو، ئێستاش كەسانێك كە بە ڕێی خواو پێغەمبەری خوادا ﷺ دەڕۆن و، خەڵك بانگ دەكەن بۆ لای شەریعەتی خواو هیدایەتی خوا، حیزبە عەلمانیی و دنیاییەكان، كە سەر بەرەو ئاسمان بەرز ناكەن و، حیساب بۆ خواو پێغەمبەری خواو بۆ وەحیی خوا ناكەن و، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی

نیە، خەڵک ئاوا چەواشە دەکەن، دەڵێن: ئەوانەش تەنیا مەبەستیان کورسییەو هەر دەیانەوێ دەسەڵات وەربگرن!!

ئنجا هەرچەندە ئەوە ڕاست نیە، بەڵام گریمان ڕاستیش بکەن، بێگومان کورسییەک کە لەسەری دادەنیشی بە جوانیی و بەڕێکیی و هەقیی خۆی پێ دەدەی و، بۆیە لەسەری دادەنیشێ خزمەتی خەڵک بکەی و، خوا لە خۆت ڕازیی بکەی، زۆر جیایە لە کورسییەک یان لە شێوە دانیشتن لەسەر کورسییەک، کەسێك بۆیە لەسەری دادەنیشێ، خۆی بەسەر خەڵکیدا بکاتە پەرستراوو تەقدیسی بکەن و، لە جیاتی خوا بیپەرستن و، قسەکانی لە جیاتی ئایەتەکانی خوا دابنێن، ئەو دوو شێوە مامەڵە کردنە زۆر جیان!

ئەگەرنا ڕاستە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) نەهاتوون، بەس ئامۆژگاریی خەڵک بکەن و بڕۆن، بەڵکو هاتوون کۆمەڵگا بگۆڕن و، ئەمرو نەهی کۆمەڵگا بە دەستەوە بگرن، ئەگەر خەڵک پشتیان بگرێ، بەڵام بۆچی؟ ئایا بۆ ئەوەی ئیمتیازە ماددیی و مەعنەوییەکان بۆ خۆیان و بنەماڵەو خزم و دەوروبەریان قۆرخ بکەن، یان بۆ ئەوەی نیعمەتەکانی خوا لە خزمەت هەموو خەڵکدا دابنێن و، خۆشیان ژیانێکی سادەی وەک هی وەک خەڵک بگوزەرێنن، نەک بچنە بورجی بەرزەوەو، قۆرخکاریی و گەندەڵیی بکەن، وەک ئێستا هەموو دەسەڵاتدارانی خۆسەپێن، تەوژمی ئیسلامیی و خەڵکی موسوڵمان و دیندار تۆمەتبار دەکەن، بەوەی کە لەخۆیاندا هەیە و، لە هەمبانەی خۆیاندا گوێز دەژمێرن.

**سێیەم:** گوتوویانە: ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً﴾، ئەگەر خواش ویستبای نوێنەر بنێرێ و پێغەمبەر بنێرێ، فریشتەی دادەبەزاند، هەڵبەتە لە سوورەتی (**الأنعام**)دا، خوای پەروەردگار وەڵامی ئەوەی داوەتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ مَلَكًا لَّجَعَلْنَٰهُ رَجُلًا وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾﴾الأنعام، ئەگەر فریشتەیەکمان ناردبایە، دەبووایە لە شێوەی پیاوێکدا ناردبامان، چونکە فریشتە لەسەر شێوەی ئەصڵیی خۆی نابینرێ، ﴿وَلَلَبَسْنَا عَلَيْهِم مَّا يَلْبِسُونَ ﴿٩﴾﴾الأنعام، (**لَخَلَطْنَا عَلَيْهِم مَا يَخْلِطُون**)،

ئەو کاتە لێمان تێکەڵ دەکردن، ئەوەی کە لە خۆیانیان تێکەڵ کردوە، یانی: ئەگەر ئەو کاتە ئەو پیاوە بیگوتبایە: من فریشتەم، دەیانگوت: کێ دەڵێ تۆ فریشتەی، تۆش بەس مرۆڤی؟ لێیان تێکەڵ دەبوو.

ئەوانە چونکە بە پاشخانێکی بێبڕواییەوە تەماشای مرۆڤ دەکەن، بۆیە پێیان وایە: مرۆڤ شایستەی ئەوە نیە نوێنەرو ڕەوانەکراوی خوا بێ، بەڵام ئەگەر بە پاشخانی ئیمانیی تەماشای مرۆڤ بکرێ، مرۆڤ زۆر بەڕێزە، بەڵام ئەگەر بە پاشخانی کوفرەوە تەماشای مرۆڤ بکرێ، دەگوترێ: مرۆڤ مەیموون زادەیەو، لە قالۆنچەو ئەمیباوە هاتوە، بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی ئیمانەوە تەماشای مرۆڤ بکەین: مرۆڤ جێنشینی خوایەو، هەڵگری ئەمانەتی خوایە، مرۆڤ، خوا هەموو فریشتەکانی فەرمان پێکردوە کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم بەرن، بۆ بابی مرۆڤان، مرۆڤ زۆر بەڕێزەو، خواش دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾ الإسراء.

**چوارەم:** گوتوویانە: ﴿مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ﴾، ئێمە ئەوەمان نەبیستوە لە باب و باپیرانی پێشوومان‌دا.

کە ئەمەیان درۆ بووە، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾﴾ فاطر، هیچ کۆمەڵگایەک نەبووە (هیچ کۆمەڵە خەڵکێک نەبووە)، مەگەر ڕەوانەکراوو وریاکەرەوەیەکی تێدا نێردراوە.

**پێنجەم:** گوتوویانە: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ﴾، ئەمە بەس پیاوێکە جۆرێک لە شێتیی هەیە، ﴿فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ﴾، ئنجا چاوەڕێی بکەن تاکو کاتێکی دیارییکراو، یانی: بڕوای پێ مەهێنن، لێی لە بۆسەدا بن، کەنگێ دەفەوتێ، یان شێتییەکەی لادەچێ و واز لەو قسانە دێنێ.

﴿قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ﴾، نووح ﷺ گوتی: پەروەردگارم! بە هۆی ئەوەوە کە من بە درۆ دادەنێن، پشتم بگرەو سەرم بخە، یەکسەر خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَأَوْحَيْنَآ﴾، بە (ف)ی بەدوادا هاتن (تعقیب)، یەکسەر دوای

ئـەوە پەیامـمان بـۆ نـارد، ﴿ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا ﴾، کـە کەشـتیی دروسـتبکە لـە ژێـر چاودێریـی ئێمـەداو بـە پەیامـی ئێمـە، بەپێـی ڕێنمایـی ئێمـە.

﴿ فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ﴾، هـەر کاتێـک فەرمـانی ئێمـە هـات و، تەنـدوور دەرقوڵـی (ئـاوی لـێ هەڵقوڵـی)، ﴿ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ ﴾، لـە هەر جووتێـک دووانی بخـە نێـو ﴿ وَأَهۡلَكَ ﴾، هەروەهـا مـاڵ و خێزانەکەی خۆشـتی بخە نێـو، ﴿ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡ ﴾، جگـە لـەوەی کـە بڕیـاری پێشـوەختیان لەبـارەوە دراوە، (کـە ژنەکـەی بـوو، لەگـەڵ یەکـێ لـە کـوڕەکانی کـە دەڵێـن: نـاوی کەنعـان بـووە)، ﴿ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴾، لـە بـارەی ئەوانـەوە کـە سـتەمیان کـردوە مەمدوێنـە، بـە دڵنیایـی ئـەوان لـە خنکێندراوانـن، ئنجـا ئەوانـەی سـتەمیان کـردوە، چ ژنەکـەی، چ کوڕەکـەی، چ خەڵـک و زۆربـەی هـەرە زۆری کۆمەڵگایەکـەی.

﴿ فَإِذَا ٱسۡتَوَيۡتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلۡفُلۡكِ ﴾، ئنجا هـەر کاتێـک تـۆو ئەوانەی لەگەڵتدان، چوونـە سـەر کەشـتییەکە، سـەقامگیر بـوون لەسـەری، ﴿ فَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بڵێـن: سـتایش بـۆ ئـەو خوایـەی دەربـازی کردیـن لـە کۆمەڵـی سـتەمکاران، ئـەوان بـە تۆفـان دەخنکێـن و، لـە بەیـن دەچـن، ئێمـەش سـواری کەشـتیی نەجـات بوویـن و دەربازمـان بـوو، ﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا مُّبَارَكٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴾، بشـڵێ: پـەروەردگارم! لـە شـوێنێکی بـە پیـت و پێـزدا دامبەزێنـەو، تـۆ باشـترینی دابەزێنـەران و نیشـتەجێکەرانی، کـە لەسـەر چیـای جوودیـی کەشـتییەکە لەنگـەری گـرت، وەک خـوا فەرموویەتـی: ﴿ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ ﴿٤٤﴾ ﴾ هـود، چیـای جوودییـش، ئێسـتا دەکەوێتـە باکـووری کوردسـتان، بەشـە کوردسـتانی سـەر بـە دەوڵـەتی تورکیـا.

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ وَإِن كُنَّا لَمُبۡتَلِينَ ﴾، لەوەدا کە باسـکرا، لەو بەسـەرهاتەدا نیشـانەی زۆر هـەن و، ئێمـە لـە تاقیکەرەوانیـن، واتە: بەنـدەکانی خۆمان تاقـی دەکەینەوە.

ئەوە بەسەرهاتی نووح کە خوا بە کورتیی، ئاماژەیەکی پێکرد.

﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴾، ئنجا لە دواى وان، سەدەیەکی دیکەمان پێگەیاند، واتە: خەڵکێکی دیکە کە هاوتەمەن بوون و، هاو کات لە یەک کاتدا دەژیان، (قَرن)، (أناس يَعِيشُونَ مُقتَرِنِينَ فِي زَمَنٍ مُحَدَّدٍ)، خەڵکێک کە لە کاتێکی دیارییکراودا پێکەوە دەژین، ﴿ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ ﴾، لە نێو واندا پێغەمبەرێک لە خۆیانمان ڕەوان کرد، ﴿ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾، کە پێیگوتن: خوا بپەرستن، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، ﴿ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، ئایا خۆتان ناپارێزن؟ وەک پێشتر باسمان کرد لێرەدا ناوی پێغەمبەرەکە نەهاتوە صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ و، ناوی گەلەکەشیان نەهاتوە، بەڵام وەک دوایی دەیگەینێ بە مەزنندە وا پێدەچێ: گەلی ثەموود بووبن و، پێغەمبەرەکەشیان صالح ﷺ بووە.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، دەستڕۆیشتووان و بڕیار بەدەستان لە گەلەکەی، ئەوانەی بێبڕوا بوون و دیداری ڕۆژی دواییان بە درۆ دادەناو، لە ژیانی دنیادا خۆشگوزەرانمان کردبوون، گوتیان: ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، ئەمە (واتە: ئەم پێغەمبەرە)، تەنیا مرۆڤێکی وەک خۆتانە، ﴿ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴾، لەوەی کە ئێوە لێی دەخۆن دەخوات و، هەمان شتیش کە ئێوە دەیخۆنەوە ئەویش دەیخواتەوەو، واتە: بەڵگە دێننەوە لەسەر ئەوەی مرۆڤێکی وەک خۆتانە، لەبەر ئەوەی ئەویش وەک ئێوە خواردن و خواردنەوەی هەیە، ﴿ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴾، ئنجا ئەگەر ئێوە گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی مرۆڤێکی وەک خۆتان بکەن، بە دڵنیایی ئێوە لە زیانبارانن!

لە حاڵێکدا ئەو دەستڕۆیشتووانە خۆشیان ئەو خەڵکەیان ژێر چەپۆک و بندەست کردوەو، بە چاوی کۆیلەو خزمەتکار تەماشایان کردوون، بەڵام ئەگەر پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوا بێ، هیدایەتی خوایان بۆ بێنێ و، ئەو بەزم و بازاڕە لە زلەزلەکان و لەو بڕیار بەدەستە گەندەڵ و پووچەڵانە تێکبدا، خەڵکەکەیان

پێ زیانبارە! کە ئەوەی ئەوان گوتوویانە ڕێک پێچەوانەیەو، ئەگەر ئەو خەڵکە بە دوای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بکەوێ، هەم پێکەوە دەبنە براو، پێکەوە تەبا دەبن و، کەس کەڵکەڵەی کوێخایەتیی لە کەللەدا نابێ بەسەر ئەوانی دیکەدا، کەس بەوی دیکە ناڵێ من لە تۆ گەورەترم و چاکترم، هەموومان بەندەی خواین و پێکەوە تەباو براین، بەوە خەڵک قازانج دەکات، ئەو واقیعەی کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) هاتوون بیگۆڕن، خەڵکەکە بەوە زیانبار بووە، کە چەند کەسێکی وەک خۆیان، خۆیان بەسەردا فەرز کردوون و، حوکمێکی میراتیی و، بنەماڵیی و، حوکمێکی خۆ سەپاندنیان بەسەردا فەرز کردوون و، دەستیان بەسەر نازو نیعمەتەکانی ئەو وڵاتەدا گرتوەو، بۆ خۆیان و دارو دەستەکەیان لێی بەهرەمەند بوون، خەڵکیشیان وەک کۆیلەو خزمەتکار تەماشا کردوە، ئەوە حاڵەتە زیانبارییەکەی خەڵک و جەماوەرە فریودراوەکە بووە.

پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) هاتوون ئەو حاڵەتە زیانبارییە کە بۆ جەماوەرە ڕەش و ڕووتەکە هاتۆتە پێش، بیگۆڕن و، بیانخانە حاڵەتێکەوە کە تێیدا سەر بەرز بن و، مرۆڤ بن، کەس خۆیان لێ نەکاتە پەرستراوو پەروەردگار، یانی: ئەوەی کە ناحەزانی پێغەمبەران و بڕیار بە دەستان و خۆ فەڕز کەرەکان، گوتوویانە، ڕێک پێچەوانەی واقیع بووە.

دوایی دەڵێن: ﴿ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَامًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴾، ئایا هەڕەشەتان لێ دەکات، کە ئەگەر ئێوە مردن و، بوونەوە خۆڵ و، بوونەوە ئێسکی پڕتووکاو، ئێوە دەر دەهێنرێنەوە؟ ئایا بەوە هەڕەشەتان لێ دەکات؟ کە ئەگەر بڕوا بە پێغەمبەران نەهێنن، ڕۆژێک دێ سزا دەدرێن؟ ﴿ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴾، زۆر دوورە، زۆر دوورە، ئەوەی ئێوە هەڕەشەتان پێی لێ دەکرێ، هەرگیز شتی وا نابێ.

هەمیشە ئەهلی کوفر ویستوویانە خەڵک لە خوا دوور بخەنەوە، لە ئیمان هێنان بە خواو ڕۆژی دوایی بە فریشتەکان و بە کتێبەکان و بە وەحیی خوا دووری بخەنەوە، تاکو زەمینەیان بۆ خۆش بێ لە جیاتی خوا، خۆیانیان بەسەردا فەرز بکەن و، لە جیاتی پێغەمبەرانی خوا، خۆیان لێ بکەنە دەمڕاست و چاو ساغ و، لە جیاتی ئەوەی کە هەموویان بەندەی خوا بن، بیانکەنە کۆیلەی خۆیان و خزمەتکاری خۆیان و، کاریان زۆر لەسەر ئەوە کردوە: خەڵک بڕوای بە ڕۆژی دوایی نەبێ و، تەنیا دنیا ببینێ، ئنجا خەڵک ئەگەر تەنیا ژیانی دنیای بینی، ئەم تەنیا ژیانی دنیا دیتنە، وا لە مرۆڤ دەکات، بە هەر شێوەیەک بووە، ئەو ژیانە دنیایە بگوزەرێنێ، لەززەتێک وەربگرێ و، لە نازو نیعمەتەکان بەهرەمەند بێ، با لەسەر حیسابی و کەرامەت و ڕێزو مرۆڤایەتیشی بێ و، با بە کۆیلایەتیی و، ژێردەستەیی و بە ماستاو چییەتیش بێ، هەر چۆن بێ شتێکی دەست بکەوێ، مادام ژیان بەس ژیانی دنیایە، هەرچۆنێکی بگوزەرێ، پێنج و دوو ڕۆژێکە، با تۆزێک لەززەت بکات، بەڵام ئەگەر بڕوای بە ڕۆژی دوایی بێ، دەڵێ: نەخێر من بۆ پێنج و دوو ڕۆژێکی ژیانی دنیا، خۆم زەلیل و زەبوون ناکەم، کەرامەت و ڕێزی خۆم لە دەست نادەم، کۆیلایەتیی بۆ کەس ناکەم، کەم دەژیم و کەڵ دەژیم، بە مەردیی دەژیم و سەربەرزانەو جوامێرانە دەژیم و، بە ژیانێکی سادە ڕازییم، چاوم لە حەڕامێکی زۆرو بۆر نیەو، بە کەمێکی پاک و چاک و حەڵاڵ قەناعەت دەکەم!

بۆیە دەڵێن: ﴿إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ﴾، ژیان هەر ئەم ژیانە دنیایەمانە، دەمرین و دەژین و، ئێمە زیندوو ناکرێینەوە، هەڵناسێنرێینەوە، ئەوە بە نسبەت ڕۆژی دواییەوە، بە نسبەت پێغەمبەرەکەشەوە صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، گوتویەتی: ﴿إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا﴾، ئەمە تەنیا پیاوێکە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ، ﴿وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ﴾، ئێمەش بۆ ئەو نابینە بڕوادار، وایانزانیوە ئەگەر بڕوابێنن، دەچێتە

گیرفانی ئەوەوە، بەڵام نەیانزانیوە ئەگەر بڕوا بێنن، سوودەکەی بۆ خۆیانەو، ئەگەر بڕواش نەهێنن، زیانەکە لە خۆیان دەکەوێ.

﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴾، پێغەمبەرەکەیان صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، فەرمووی: پەروەردگارم! بەهۆی ئەوەوە کە منیان بە درۆ دانا، سەرمبخە، پشتم بگرە، خواش ﷻ یەکسەر وەڵام دەداتەوە:

﴿ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصۡبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴾، (خوا) فەرمووی: دوای ماوەیەکی کەم، ئەوانە لە پەشێمانان دەبن، ژیوان دەبنەوە، پەنجەی پەشێمانیی دەگەزن.

﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ بِٱلۡحَقِّ ﴾، چریکەو دەنگێکی گەورە، هاڕژنێک بە هەق گرتنی، ﴿ فَجَعَلۡنَٰهُمۡ غُثَآءٗۚ ﴾، ئنجا کردماننە پووش و پەڵاش، کردماننە کەفی سەر لێزماوو لافاو، کردماننە خڵتە، ﴿ فَبُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئنجا دووریی بۆ کۆمەڵی ستەمکاران، ﴿ ثُمَّ أَنشَأۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِمۡ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴾، دوای وانیش چەند سەدەی دیکەمان پێگەیاندن، ﴿ مَا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴾، هیچ کۆمەڵێک لە ئەجەلەکەی، (کاتی لە بەینبرانی) نە پێش دەکەوێ (نە پێش کاتی لە بەین برانی دەکەوێ)و نە لێشی دوا دەکەوێ، واتە: هیچ کۆمەڵگایەک هیچ ئۆممەتێک لەو کاتەی کە بۆی دانراوە، نە پێش دەکەوێ (پێشتر بفەوتێ)، نە دوا دەکەوێ (دواتر بفەوتێ)، ڕێک لەو کاتەدا کە بۆی دیارییکراوە دەفەوتێ، ﴿ ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا تَتۡرَاۖ ﴾، دوایی پێغەمبەرانی خۆمان پەیتا پەیتا بەدوای یەکدا ناردن، ﴿ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةٗ رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُۖ ﴾، هەر کاتێک کۆمەڵێک خەڵکێک پێغەمبەرێکیان بۆ دەهات، بە درۆیان دادەنا، (یانی: زۆربەیان)، ﴿ فَأَتۡبَعۡنَا بَعۡضَهُم بَعۡضٗا ﴾، ئێمەش هەندێکیانمان بە دوای هەندێکیان خست، (لە فەوتاندندا)، ﴿ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَۚ ﴾، هەروەها کردماننە قسەی بەرو مەجلیس، یاخود کردماننە ڕووداوی سەیرو سەمەرە، ﴿ فَبُعۡدٗا لِّقَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ ﴾، ئنجا دووریی بۆ کۆمەڵێک کە بڕواناهێنن.

ئنجا دێتە سەر باسی مووساو هاڕوونی برای، دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾، دوایی مووساو هاڕوونی برای صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، بە نیشانەکانمان و بە بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکراوە، ناردمانن، ﴿ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾، بۆ لای فیرعەون و دەست و پێوەندەکانی، بۆ لای بڕیار بەدەستانی دەوروبەری، کە هەر ماستاویان بۆ دەکردو چەپڵەیان بۆ لێ دەداو، بەدرۆ ئۆباڵیان بۆ دەکێشا، ﴿ فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا عَالِينَ ﴾، ئەوانیش خۆیان بە زلگرت و، هەر لە بنەڕەتیشدا خەڵکێکی خۆ بەرز کەرەوە بوون.

﴿ فَقَالُوٓاْ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴾، ئەوانیش (بە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانە)، گوتیان: ئایا بڕوا بە دوو مرۆڤی وەک خۆمان بێنین، کە خەڵکەکەشیان بۆ ئێمە کۆیلەن، ملکەچن، ژێر دەستن؟! ﴿ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُواْ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ ﴾، ئنجا بە درۆیان دانان، ئەو دوو پێغەمبەرانەی خۆیانیان بە درۆ دانان، ﴿ فَكَانُواْ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ ﴾، ئیدی سەرەنجام لە فەوتێندراوان بوون، ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴾، بە دڵنیایی بەرنامەو کتێبیشمان بە مووسا دابوو، بەڵکو ڕێی ڕاست بگرن، نەک بکەونە دوای فیرعەون و دارو دەستەکەی، (وا پێدەچێ مەبەست پێی گەلی مووسا بێت، یانی: گەلی مووسا ڕێی ڕاست بگرن، چونکە خوا ﷻ کە تەوراتی ناردوە، بۆ بەنوو ئیسرائیلی ناردوە، نەک بۆ قیبتییەکانی گەلی فیرعەون، چونکە وەختێ قەومی فیرعەون ئامادە نەبن، ئیمان بێنن، ئامادە نەبن ئەصڵی دین قبووڵ بکەن، مەعقووڵ نیە لق و پۆپەکان (فروع)ی ئایینیان بۆ بنێردرێن، بەڵام بەنوو ئیسرائیل دوای ئەوەی ئامادەییان دەربڕی بڕوا بە ئەصڵی دین بێنن، خوا بناسن، خوا بپەرستن و، بڕوا بە پێغەمبەری خوا بێنن، ئنجا خوای پەروەردگار تەوراتی بۆ ناردن کە شەریعەتێک بوو بۆ ڕێکخستنی ژیانیان.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً ﴾، کوڕی مەریەم و دایکیشیمان کردنە نیشانەیەک، نیشانەیەکی زۆر مەزن، کە چەندان نیشانەی لە خۆیدا کۆ کردوونەوە، ﴿ وَءَاوَيْنَٰهُمَآ ﴾، حەواندمانەوەو پەناشمان پێ بردن،

﴿إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ﴾، بۆ گردێک، بەرزاییەک، کە هەم شوێنی نیشتەجێ بوون بوو، هەم ئاوو سەرچاوەشی لێ بوو، کە بێگومان ئەو شوێنە لە فەڵەستینە، ئنجا ئایا لە جەلیل (جليل)ە، یان لە ناسیرە (ناصرة) یان شوێنێکی دیکە؟ لەو بارەوەش ڕاجیایی هەیەو، بەسەرهات و چیرۆکی عیساو دایکی (مەریەم)یشمان لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی مەریەمدا باسکردوە.

## مەسەلە گرنگەكان

### مەسەلەی یەكەم:

**ڕەوانە كردنی نووح بۆ لای گەلەكەی، بە پەیامی خوا بە یەكگرتنەوەو، تۆمەتباركردنی بڕیار بەدەستانی گەلەكەی بۆی بە: ١- مرۆڤبوونی، ٢- ویستنی خۆ فەڕزكردنی، ٣- گوایە شێتە، بیانوو هێنانەوەشیان بۆ بڕوا نەهێنانیان، كە دەبووایە فریشتەیان بۆ بێن و، شتی واشیان لە پێشووانیان نەبیستووە:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ ﴾.

### شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ ﴾، بە دڵنیایی نووحمان بۆ لای خەڵكەكەی ڕەوان كرد، پێشتر باسمان كرد كە خوا لە قورئاندا ناوی گەلی نووحی باس نەكردوە، وەک ناوی گەلی هەندێ لە پێغەمبەرانی دیكەی هێناوە، بۆ نموونە:

١- گەلی ثەموود كە صاڵح پێغەمبەریان بووە.

٢- گەلی (عاد) كە هوود پێغەمبەریان بووە.

٣- گەلی مەدیەن یان (**أَصحابُ الأَيكَه**)، كە شوعەیب پێغەمبەریان بووە. بەڵام باسی ناوی گەلی نووحی نەكردوە، كە چ گەلێک بوون؟ كەوا پێدەچێ گەلی نووح هەموو مرۆڤایەتیی ئەو كاتە بووبێ.

ئنجا ئایا بۆچی خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ ﴾؟ یانی: بە جەختکردنەوە؟ شارەزایانی زمان گووتویانە: (**تَأكِيدُ الجُملَةِ بِ(ل) القَسَمِ و (قَد) التحقيق، تَأكِيدٌ لِلمَضمُونِ التَهدِيدِيِّ مِنَ القِصَّة**)، واتە: ڕستەکە بۆیە بە (ل)ی سوێند خواردن، هەروەها بە (قَد)، بۆ ساغکردەنەوەو جەختکردنەوە هاتوە، چونکە ئەمە جەختکردنەوەیە بۆ نێوەڕۆکی هەڕەشەکارانە، کە لە بەسەرهاتەکەدا هەیە.

٢)- ﴿ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، ﴿ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**ما لَكُم مِنْ إلهٍ غَيرِهِ**)، واتە: دوو شێوە خوێندنەوە (**قراءة**)ی هەن، هەموو پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) زۆر بە نەرم و نیانیی و میهرەبانیی خەڵکی خۆیانیان دواندوە، ﴿ يَٰقَوْمِ ﴾، ئەی خەڵکەکەی خۆم! یانی: منیش یەکێکم لە خۆتان و، بۆتان دڵسۆزم، بۆتان بە پەرۆشم، ﴿ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ﴾، خوا بپەرستن جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، واتە: پەرستراوێکی دیکەتان نیە، کە شایستەی پەرستران بێت، ئەگەرنا بە تەئکید پەرستراوی ساختەو بێ نێوەڕۆکیان زۆر بوون.

٣)- ﴿ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، ئنجا ئایا پارێز ناکەن، خۆتان ناپارێزن! ئەوە نکووڵییکردنە لەوەی کە ئەوان پارێز بکەن، لە سزای خوا، بەهۆی ئەوەوە کە بڕوای پێ ناهێنن، واتە: ئێوە بۆچی خۆتان ناپارێزن، چ شتێک بۆتە هۆی ئەوەی خۆتان نەپارێزن لە سزاو ئازاری خوا؟ بە هۆی ئەوەوە کە ئیمان بێنن، چونکە ئەگەر ئیمانتان هێنا، دەپارێزرێن لە سزای خوا.

٤)- ﴿ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ ﴾، ئنجا دەستڕۆیشتووان و بڕیار بەدەستانی بێبڕوا لە گەلەکەی گوتیان، یەکسەر گوتیان:

٥)- ﴿ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، ئەمە تەنیا مرۆڤێکی وەک خۆتانە، هەڵبەتە هیچ کام لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ والسَّلام**) نەهاتوون لافی ئەوە لێ بدەن کە مرۆڤ نین، گوتوویانە: ئێمە مرۆڤین، ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ... ﴿٦﴾ ﴾فصلت، گوتوویانە: ئێمە تەنیا مرۆڤێکین وەک خۆتان، بەڵام بێگومان مرۆڤ تاکو مرۆڤ ئاسمان و ڕێسمانیان

جیاوازە، مرۆڤێک، شایستەی ئەوە بێ خوا بیکاتە نوێنەری خۆی، لەگەڵ مرۆڤێکدا کە ژیانێکی ئاژەڵانە دەگوزەرێنێ، زۆر لێک جیان، تەنیا لە جیهانی مرۆڤدا ئەو هەموو جیاوازییەو، ئەو هەموو بەرزیی و نزمییە زۆرە هەیە، ئەگەرنا هیچ ئەسپێک نیە بەرانبەر سەد ئەسپ بێ، یان گایەک بەرانبەری هەزار گا بێ، بەڵام مرۆڤ هەیە بەرانبەر ملیۆنان مرۆڤە ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا ...﴿١٢٠﴾ ﴾النحل، واتە: ئیبراهیم بۆ خۆی ئوممەتێک بوو، یان: ئەو لە خۆیدا ڕێبازێکی بەرجەستە کرد بوو، کە ڕێبازی تەنیا خوا پەرستیی و بەندایەتیی بۆ خوایە، بەڵام ئەوانە ویستوویانە بڵێن: مادام ئەو پێغەمبەرە مرۆڤە، بەکەڵکی ئەوە نایەت نوێنەری خواو ڕەوانەکراوی خوا بێ!!

ئنجا تۆمەتباری دەکەن:

٦)- ﴿ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ ﴾، دەیەوێ خۆیتان بەسەردا بکاتە سەرۆک، (**أَي: يُرِيدُ التَرَؤُّسَ وَالسِّيَادَةَ عَلَيكُم**)، دەیەوێ سەرۆکایەتیی و گەورەییتان بەسەردا بنوێنێ و، لاڤی ئەوە لێبدا کە زیادەی بەسەر ئێوەوە هەیە، نوێنەری خوایە.

٧)- ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً ﴾، ئەگەر پەروەردگارمان ویستبای، یانی: (**وَلَو شَاءَ رَبُّنَا إِرسَالَ رسُول أَنزَلَ مَلائِكَة**)، بەرکار (مفعول)ی (**شاء**) قرتێنراوە، لەبەر ئەوەی دیارە، یانی: ئەگەر پەروەردگارمان ویستبای پێغەمبەرێک بنێرێ، فریشتەی دادەبەزاند.

٨)- ﴿ مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، ئەمەمان لە باب و باپیرانی پێشوومانداا نەبیستوە، (**هذا**) ئاماژەیە بۆ خوا بە یەکگرتن (توحید)، کە لەڕاستییدا درۆشیان کردوە، هەرچەندە ئەگەر نەشیان بیستبایە (**إِنَّ عَدَمَ العِلمِ لا يَستَلزِمُ عِلْمَ العَدَمِ**)، زانیاریی نەبوون بە شتێک، بەڵگە نیە لەسەر نەبوونی ئەو شتە، ئەگەر نەشیانبیستبێ، ئەوە ئێستا دەیبیستن با لێی وردبنەوە.

٩)- ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ ﴾، ئەمە تەنیا پیاوێکە، جۆرێک لەشێتیی تێدایە، چونکە وشەی ﴿ جِنَّةٌ ﴾، تەنوینی لەسەرەو، ئەم تەنوینەش بۆ جۆرە، (**التَّنوِينُ لِلنوعِيَّة**)، واتە: جۆرێک لە شێتیی، پێشتریش باسمان کرد ئەوەیان بۆیە گوتوەو نەیانگوتوە: شێتی

تەواوە، بەڵکو گوتوویانە: شێتییەکەی جۆرێک لە شێتییە، چونکە ئەگەر گوتبایان: شێتیی ڕەها (**جنون مطلق**)ی هەیە، خەڵکەکەی بۆیان هەبوو بڵێن: وانیە، پیاوێکی عاقڵ و بە ماریفەت و نەجیب و ڕێک و پێکە، قسەکانی هەموویان قسەی نەستەق، هەڵسوکەوتی وەک هی شێتان ناچێ! بەڵام ئێستا بۆیان هەبووە بڵێن: نا، ئاخر خۆ ئێمە نەمانگوتوە شێتی تەواوە، بەڵکو جۆرێک لە شێتیی هەیە!

**١٠)- ﴿ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾**، ئنجا چاوەڕێی بکەن تاکو کاتێکی دیارییکراو، (**الحِينُ: إسمٌ للزَّمانِ غَيرِ المُحَدَّدِ**)، (**حِين**)، ناوە بۆ کاتێکی دیاریی نەکراو، (**تَرَبّص**)یش، بریتیە لە ڕاوەستان و چاوەڕێکردن، لە ئیشێکدا کە دەویسترێ بکرێ، واتە: جارێ بڕوای پێ مەهێنن و چاوەڕێ بکەن، واتە: چاوەڕێ بکەن، یان ئەوەتا دەمرێ و لە کۆڵمان دەبێتەوە، یان ئەوەتا شیفای بۆ دێ و، ئەو حاڵەتە شێتییەی نامێنێ و، واز لەو قسانە دێنێ.

## بیانووەکانی گەلی بۆ بڕوا پێ نەهێنانی و هەڵوەشاندنەوەیان:

گەلی نووح پێنج بیانوویان هێناونەوە، بۆ بڕوا نەهێنان بە نووح ﷺ:

**یەکەم:** گوتوویانە: مرۆڤێکی وەک خۆتانە ﴿ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾.

**دووەم:** گوتوویانە: دەیەوێ خۆیتان بەسەردا فەرز بکات و هەڵکێشێ. ﴿ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ ﴾،

**سێیەم:** گوتوویانە: ئەگەر پەروەردگارمان ویستبای پێغەمبەرێک بنێرێ، فریشتەی دادەبەزاند. ﴿ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً ﴾.

**چوارەم:** گوتوویانە: ئێمە شتی وامان نەبیستوە لە باب و باپیرانی پێشووماندا. ﴿ مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴾.

**پێنجەم:** گوتوویانە: ئەوە هەر پیاوێکە جۆرێک لە شێتیی تووش بووە: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ ﴾.

کـه بـه دڵنیایـی هـەر کامێـک لـەو بیانـوو تۆمەتانـە، بەرپەرچدانـەوەو هەڵوەشـانەوەیان زۆر ئاسـانە:

١) وەڵامـی بیانـووی یەکـەم: ﴿مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثۡلُكُمۡ﴾، ئنجـا بـا مـرۆڤ بـێ، بـۆ چـی مـرۆڤ ناتوانـێ ببێتـە نوێنـەری خـوا؟ ئەگـەر بـە پاشـخانی ئیمانیـی و لـە بووناسـیی ئیسـلامییەوە تەماشـای مـرۆڤ بکەیـن، دەبینیـن مـرۆڤ زۆر بەرێـزە، بـەڵام بـە بووناسـیی کوفـرو شـیرک و بـە تێڕوانینـی نەفامییانـە، تەماشـای مـرۆڤ بکەیـن، دەبینیـن مـرۆڤ شـتێکی زۆر بـێ نـموودو بـێ نرخـە.

٢) وەڵامی بیانـووی دووەم: کـه دەڵێـن: ﴿يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيۡكُمۡ﴾، لە ڕاسـتیی دا نـووح نەیویسـتوە خۆییـان بەسـەردا هەڵکێشـێ، بـەڵام ئـەوان لـە هەمبانـەی خۆیانـدا گوێزیـان ژمـاردوون، ئەگەرنـا ئـەو ویسـتوویەتی ئەو خۆ بەسـەردا هەڵکێشـانە لابـەرێ و، خەڵـک ئـازاد بـێ و، کـەس کۆیلـەی کـەس نەبـێ، هەموویـان بەنـدەی خـوا بـن و، بەیەکـەوە تەبـا بن.

٣) وەڵامـی بیانـووی سـێیەم: کـە دەڵێـن: ئەگـەر پەروەردگارمـان ویسـتبای فریشـتەی دادەبەزانـد، واتـە: ئەگـەر ویسـتبای پێغەمبـەر بنێـرێ، بـەڵام فریشـتە چـۆن دەتوانـێ لەگـەڵ مرۆڤـدا بـژی، مەگـەر بچێتـە سـەر شـێوەی مـرۆڤ؟!

٤) وەڵامی بیانـووی چـوارەم: کـە دەڵێـن: ئەوەمـان نەبیسـتوە لـە بـاب و باپیـرانی پێشـووماندا، ئـەم قسـەیان: **یەکـەم:** درۆ بـووە، چونکـە هیـچ کۆمەڵگایـەک نەبـووە پێغەمبـەرانی تێـدا نەبـن.

**دووەم:** پاشان با نەشیانبیستبێ، ئێستا ئەوە دەیبیستن، فەرموون دیقەتی لێ بدەن، ئایا هەر لەبەر ئەوەی پێشتر نەتبیستوە، بڕوای پێ ناهێنی؟ ئایا هەر شتێک پێشتر نەبووە، مانای وایە ڕاست نیە؟

٥) وەڵامی بیانووی پێنجەم: گوتووشیانە: ئەوە پیاوێکە جۆرێک لە شێتیی تێدایە، کە بێگومان ئەوەش درۆ بووە، چونکە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لە لووتکەی تێرو تەواویی دابوون، لە هەموو ڕوویێکەوە، لە هەموو کەسی ڕۆژگاری خۆیان عاقڵتر بوون، نەجیبتر بوون، پاکتر بوون، چاکتر بوون، ڕێکتر بوون، بەڵام بێگومان کەسێک لەپشت پەردەی ڕەشەوە تەماشای کەسێک بکات، ڕەشی دەبینێت و، ئەو زلە زلەو قسە ڕۆیشتوو و، بڕیار بەدەستانە، ئەمە زیاتر جەنگێکی دەروونیی بووە لە دژی پێغەمبەران و، بۆ چەواشە کردنی خەڵکەکەی خۆیان بووە، هەروەک چۆن لە سیرەی (إبن هشام)[1]دا هاتوە: کە (الأخنس بن شريق) لە ئەبوو جەهل دەپرسێ: ئەی ئەبوولحەکەم! پێتوایە موحەممەد ڕاست بکات، یان درۆ بکات؟ ئەویش دەڵێ: دەزانم موحەممەد هەرگیز درۆی نەکردوەو، ڕاست دەکات، بەڵام ئەگەر ئێمە بڕوای پێ بێنین، عەشیرەتی ئێمە (بنو عبد الشمس) بەدوای عەشیرەتی (بنو هاشم) بکەوێ و، ئێمە هەرگیز شتی وا ناکەین.

ئنجا ئەبوو جەهل بۆ چەواشەکردنی خەڵکەکە هەر گوتوویەتی: محمد ڕاست ناکات، نەیانگوتوە موحەممەد ڕاست دەکات!، هەروەک هەموو قسە ڕۆیشتووان و بڕیار بە دەستانی گەلانی پێشووش، بەهەمان شێوە بۆ چەواشەکردنی خەڵکەکەی خۆیان، نەچوون حەقیقەتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) چۆنە، بیخەنە ڕوو، بەڵکو تۆمەتیان بۆ هەڵبەستوون، تاکو کۆمەڵگاکانیان چەواشە بکەن.

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام: ج١، ص١٥٩، ط/٢٠٠٦م، دار بن الهيثم.

## مەسەلەی دووەم:

**پاڕانـەوەی نـووح ﷺ لـە پـەروەردگاری و سروشـکردنی خـوا بـۆی، کـە کەشـتیی دروسـت بـکات و، لـە هـەر جووتێـک دووانی تێبخـات، وێـڕای خێـزانی، (هاوسـەرو منداڵـەکانی)، جگـە لەوانـەی بڕیاریـان لـە بـارەوە دراوەو، هـەر کاتێکیـش سـواری کەشـتییەکە بـوون، سـتایشی خـوا بکـەن، کـە لـە سـتەمکاران قوتـاری کـردوون و، لـە خـواش داوا بکـەن، کـە لـە شـوێنێکی پـڕ پیـت و پێـز دایانبەزێنـێ، پاشـان ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە کـە لـە بەسـەرهاتی نووحـدا، نیشـانەی زۆر هـەن و، خـواش مرۆڤـەکان تاقیدەکاتـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَٰطِبْنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾ فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴾، نووح لە پەروەردگاری پاڕایەوە، گوتی: ئەی پەروەردگارم! بەهۆی ئەوەوە کە منیان بە درۆ داناوە، سەرم بخە، پشتم بگرە، (**نَصر**)، بریتیە لە سەرخستنی دەستدرێژیی بۆ سەرکراو بەسەر دەستدرێژییکاردا.

٢)- ﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا ﴾، ئنجا سروشمان بۆ لا کرد کە کەشتیی دروست بکە، لەژێر چاودێریی ئێمەداو بەپێی سروش و ڕێنمایی ئێمە.

﴿ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ ﴾، ڕسـتەیەکە مانـای (**أَوحَينـا**)، ڕوون دەکاتـەوە، واتـە: وەحیـی و سروشـەکە بریتـی بـوو لـەوە، کـە کەشـتیی دروسـت بکـە، لەژێـر چاودێریـی ئێمـەدا،

بەپێی ڕێنمایی ئێمە، چونکە وەک لە بەسەرهاتی نووح عليه السلام دا کاتێ خوای باسمان کردوە، وا پێدەچێ کەشتیی نووح، یەکەمین کەشتیی بووبێ، خوا ﷻ بە وەحیی و کە بۆ نووحی کردوە، ڕێنمایی کردوە ئەو کەشتییە چۆن دروست بکات!

٣)- ﴿ فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا ﴾، ئنجا هەر کاتێ فەرمانی ئێمە هات، واتە: فەرمانی ئێمە هات بە دەست پێکردنی تۆفان، ئەو تۆفان و لافاوە گەورەیەی کە هاتوە.

٤)- ﴿ وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ﴾، هەروەها تەندوور دەرقوڵی، ئەمە سێ واتای هەن:

أ- هەر کات تەندووری نان تێدا کردن، کە گەرمەو ئاگری تێدایە، ئاوی لێ دەرقوڵی، کە ئەمە نیشانەیەک بووە، بۆ نووح عليه السلام.

ب- کە تۆفان دەستی پێکرد یاخود مەبەست پێی ئەوەیە کە ئەگەر تەندوورێک کە ئاگری تێدایە ئاوی لێ دەربقوڵێ و هەڵبقوڵێ، دەبێ لە شوێنەکانی دیکە چۆن بێ؟ وەک خوا لە سوورەتی (القمر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا ...﴿١٢﴾ ﴾القمر، زەوییمان هەموو کردە سەرچاوەو تەقاندمانەوە.

ج- یاخود (فَارَ التَّنُّورُ)، ڕەمزو هێمایەو تەعبیرێکە، یانی: کار لە کارترازاوەو، تەندوور گەرم بوو، وەک لە سیرەی پێغەمبەردا هاتوە ﷺ کە لە جەنگی حونەیندا پێغەمبەر لە مەقامێکدا دەفەرموێ: (الآنَ حَمِيَ الوَطِيسُ) **{أخرجه أبي يعلى: ٣٦٠٦، عن أنس، قال حسين سليم بن أسد: إسناده حسن}**، واتە: ئێستا تەندوور گەرم بوو.

٥)- ﴿ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ﴾، لە هەر جووتێک دووانی تێبخە، لە هەر جووتێک، واتە: لە هەر جووتێک لەو ئاژەڵ و پەڕەورو ژیاندارانەی کە خوا ﷻ زانیویەتی لە ئاوێدا دەخنکێن، بۆ ئەوەی وەچەیان نەبڕێتەوە، ﴿ فَٱسْلُكْ ﴾، یانی: **(فَأَدْخِل)**، لە هەر جووتێک دووانی تێبخە، نێرو مێیەک، کە دەفەرموێ: ﴿ مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ﴾، ئەو تەنوینە یانی: **(مِن كُلِّ نَوعٍ)**، لە هەر جۆرێک، یان: **(مِنْ كُلِّ حَيوانٍ)**، لە هەر ژیاندارێک، خوێندراویشەتەوە: **(مِن كُلِّ زَوجَينِ اثنَينِ)**، یانی: لە هەر جووتێک دووان.

٦)- ﴿ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡ ﴾، هەروەها کەس و کارەکەشیی (یان: خێزانەکە شتی) تێبخە، سواربکە لە کەشتییەکەدا، مەگەر ئەوەی بڕیاری پێشوەختی لەبارەوە دراوە، کە بە تەئکید یەکیان ژنەکەی بووەو، ئەوی دیکەشیان لە قورئاندا دیارە کە کوڕەکەی بووە، کە دەڵێن: ناوی کەنعان بووە، ئەوانە بڕیاری پێشوەختەیان لەبارەوە دراوە، لەبەر ئەوەی بڕوایان بە نووح ﷺ نەهێناوە.

٧)- ﴿ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ ﴾، لە بارەی ئەوانەوەش کە ستەمیان کردوە، (چ لە کەس و کارەکەت، چ لە خەڵکی دیکە)، مەمدوێنە.

بـــۆچـــی؟

٨)- ﴿ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان خنکێنراون، واتە: بڕیاریان بۆ دراوە دەبێ بخنکێنرێن، نغرۆ بن لەو لافاوەدا.

٩)- ﴿ فَإِذَا ٱسۡتَوَيۡتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلۡفُلۡكِ ﴾، ئنجا هەر کاتێک خۆت و ئەوانەی لەگەڵتن سواری کەشتییەکە بوون، لە کەشتییەکەدا سەقامگیر بوون.

١٠)- ﴿ فَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بڵێ: ستایش بۆ ئەو خوایەی دەربازی کردین لە کۆمەڵی ستەمکاران، ئێمەی دەرباز کرد لەوان، ئەوان لە لافاوەکەدا خنکان و، ئێمە لەو کەشتییەدا دەرباز بووین.

١١)- ﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلۡنِي مُنزَلٗا مُّبَارَكٗا ﴾، (بپاڕێوە)، بڵێ: پەروەردگارم! دابەزێندێکی پڕ پیت و پێز دامبەزێنە، ﴿ مُنزَلٗا ﴾، خوێنراویشەتەوە: (مَنْزِلاً)، (مَنزِل)، واتە: شوێنی لێ دابەزین، یانی: لە شوێنێکی پڕ پیت و پێز دامبەزێنە، کە بە دەقی ئایەت لەسەر چیای جوودیی دابەزێنراوە: ﴿ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّ ...﴿٤٤﴾ ﴾هود، کەشتییەکە لەسەر چیای جوودیی لەنگەری گرت، ئەو چیایەی لە باکووری کوردستانە، کوردستانی سەر بە تورکیا.

١٢)- ﴿ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ ﴾، تۆ باشترین دابەزێنەرو باشترین نیشتەجێکەریی، ئەی پەروەردگار.

١٣)- ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ ﴾، لەوەدا نیشانەی زۆر هەن.

١٤)- ﴿ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴾، بێگومانیش ئێمە لە تاقیکەرەوان بووین،

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ ﴾، ئەو نیشانانەی کە لە بەسەرهاتی نووحدا هەبوون، زۆر زۆرن:

١- یەکێک لەوانە خوا پێغەمبەرانی خۆی سەر دەخاو پشتیان دەگرێ.

٢- یەکی دیکە، ئەو لافاوە کە هات هەموو دنیای داگرت، کە وەک کاتی خۆی باسمان کردوە، پێ دەچێ ئیقلیمگیر بووبێ و، هەموو دنیای داگرتبێ.

٣- پاشان دروستکردنی ئەو کەشتییە بە وەحیی خوای پەروەردگارو، بە ڕێنمایی خوا.

٤- نیشانەیەکی دیکە، ئەوەیە کە بەهۆی کوفرەوە باب و کور، ژن و مێرد، لە یەک جیا دەبنەوە.

٥- نیشانەیەکی دیکە ئەوەیە، کە خوای باڵادەست سەر زەوی جۆماڵ کردوەو، گەسکێکی لێداون لەو کافرە ملهوڕانە، بۆ ئەوە بەشەر قۆناغێکی دیکەی تازە بە پاکیی دەست پێ بکاتەوە.

٦- نیشانەیەکی دیکەش مانەوەی کەشتییەکەی نووحە لەسەر چیای جوودیی.

**مەسەلەی سێیەم:**

**ڕەخسێنرانی کۆمەڵگایەکی دیکەو ناردنی پێغەمبەرێک بۆیان و، هەڵوێستی ملهوڕانەی بڕیار بەدەستە کافرو خۆشگوزەرانەکانی و، دووبارەکردنەوەی بیانووە پووچەکان و نکوولییکردن لە هاتنی قیامەت و، تۆمەتبارکردنی پێغەمبەرەکەیان بە درۆ هەڵبەستن بە ناوی خواوەو، سەرەنجام لە خوا پاڕانەوەی ئەو پێغەمبەرەو، ناردنی دەنگ و هاڕژنێکی بێڕەزاو، بوونە پووش و پەڵاشی سەر لێزماوی، بێبڕوایان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەژدە بڕگەدا:

١)- ﴿ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ﴾، لەدوای وان، لەدوای گەلی نووح، سەدەیەکی دیکەمان پێگەیاند.

﴿قَرْنًا ءَاخَرِينَ﴾، سەدەیەکی دیکە، (قَرْن)، بە کۆمەڵگایەک دەگوترێ: (**يَقتَرِنُونَ بَزَمَنٍ مُحَدَّد**)، لە کاتێکی دیارییکراودا پێکەوە دەژین، واش پێدەچێ مەبەست پێی گەلی ثەموود بێ، کە صاڵح ﷺ پێغەمبەرەکەیان بووە.

٢)- ﴿ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ ﴾، لە نێویاندا پێغەمبەرێكمان لە خۆیاندا بۆ ناردن، هەڵبەتە بۆیەش خوا ﷻ ناوی پێغەمبەرەكەی نەهێناوەو، ناوی گەلەكەشی نەهێناوە، چونكە لە ڕاستییدا ئەو باس و خواسەی كە لەو بەسەرهاتەدا هاتوە، بەسەر هەموو پێغەمبەران و بەسەر هەموو گەلەكانیاندا دەچەسپێ، بۆ ئەوەی ئەو بەسەرهاتە نێوەڕۆكەكەی گشتگیر بێ، بۆ هەڵوێستی هەموو پێغەمبەران و، هەڵوێستی هەموو گەلە ملهووڕەكانی پێغەمبەران، كە بڕوایان پێیان نەهێناوە.

٣)- ﴿ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ﴾، (ئەو پێغەمبەرە پێی فەرموون:) بەندایەتیی بۆ خوا بكەن، جگە لەو پەرستراوێكی دیكەتان نیە، (شایستەی پەرستن بێ)، ﴿ مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (مِنْ إِلَٰهٍ غَيْرِهِ)، بە هەردوو شێوەكە خوێنراوەتەوە.

٤)- ﴿ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، ئایا خۆتان ناپارێزن؟ واتە: ئایا خۆتان ناپارێزن لە سزای خوا، بە هۆی بڕوا هێنانتان بە پەیامی خواوە؟

٥)- ﴿ وَقَالَ الْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِلِقَاءِ الْآخِرَةِ وَأَتْرَفْنَاهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ﴾، قسە ڕۆیشتووانی گەلەكەی ئەوانەی بێبڕوا بوون و، لە ژیانی دنیادا خۆشگوزەرانمان كردبوون، گوتیان:

٦)- ﴿ مَا هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ﴾، ئەمە تەنیا مرۆڤێكی وەك خۆتانە.

٧)- ﴿ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴾، لەوەی ئێوە لێی دەخۆن دەخوات و، لەوەی ئێوە لێی دەخۆنەوە، دەخواتەوە، خواردن و خواردنەوەی وەك هی ئێوەیە، مادام وابێ، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی مرۆڤێكی وەك خۆتانە.

وەك باسمان كرد: ئەمە دەردێكی لەمێژینەی ئەهلی كوفر بووەو، ئێستاش هەر وایە، ئێستاش هەر كەسێ خەڵك بانگ بكات بۆ لای خوا، بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەگوترێ: تۆ چیت، تۆ خۆت پێ لە ئێمە چاكترە؟ نەخێر بەڵام وەرن با هەموومان چاك بین، با هەموومان بەدوای پێغەمبەری خوا

بکەوین، با هەموومان بەندەی خوا بین، بەڵام ئەوانە بۆچی قەڵس بوون، بە بانگەوازی پێغەمبەران؟ چونکە بانگەوازی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) ئەگەر بچەسپێ، خوا بەیەکگرتن (**توحیدلله**)، ئەگەر بچەسپێ، دەبێ خەڵک هەمووی بەندەی خوا بێ و، پێکەوە تەبا بێ، بەڵام کاتێ شیرک و کوفر دێتە گۆڕێ، زوڵم دێتە گۆڕێ، چینایەتیی و قڕیی و پڕیی دێتە گۆڕێ: پاساویشی دەدەنەوە، بەوەی من جیام لە تۆ، ئەوە جیایە لە تۆ، ئەو عەشیرەتە لەو عەشیرەتە جیایە، ئەو حیزبە لەو حیزبە جیایە، ئەو شەخصە لەو خەڵکەی دیکە جیایە، بەڵام کاتێک خوا پەرستیی لە ئارادا بێ، پەیامی خوا بەیەکگرانەی پێغەمبەران لە ئارادا بێ، نەخێر، خەڵک هەمووی دێتەوە یەک ئاست، تەنیا خوا، پەرستراو (معبود) دەبێ، خەڵکی دیکە هەمووی دەبێ لە یەک ئاستدا بێ و، خۆیان بەسەر یەکدی دا فەرز نەکەن.

٨)- ﴿ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَاسِرُونَ ﴾، ئەم (ل)ە، زەمینە خۆشکەر بۆ سوێندە، واتە: ئەگەر ئێوە بە قسەی مرۆڤێکی وەک خۆتان بکەن و، فەرمانبەریی بۆ بکەن، بە دڵنیایی ئێوە لە زیانباران دەبن، ئەمە وەڵامی سوێندەکەیە، هەڵبەتە، ئەوە لە هەمبانەی خۆدا گوێز ژماردن بووە، چونکە ئەوانیش هەر مرۆڤی وەک خەڵکەکە بوون، کەچی خۆشیان بەسەردا فەرز کردوون، یان حوکمی میراتیی، یان حوکمی عەسکەرتاریی، یان حوکمی بنەماڵەییان بەسەردا کردوون، بەڵام لە هەمبانەی خۆیاندا گوێزیان ژماردوەو، زانیویانە ئەوەی کە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) دەیڵێن، ئەگەر بچەسپێ، ئەوان ئەو بەزم و بازاڕەیان لێ تێک دەچێ، پێغەمبەران دەڵێن: نەخێر نابێ کەس لە کەس زیاتر بەشی بە نیعمەتەکانی خواوە هەبێ، هەمووتان دەبێ پێکەوە تەبا بن، پێکەوە ڕێک بن، کەس خۆی بەسەر کەسدا هەڵنەکێشێ، تەنیا خوا بپەرسترێ و، پەیامی خواش جیاوازیی ناکاتە نێوان خەڵک، بەهۆی ڕەنگ و زمانیان، بەهۆی ڕەگەزیان، بە هۆی بارودۆخی کۆمەڵایەتییان و....هتدەوە.

٩)- دوایی دەڵێن: ﴿ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَامًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴾؟، ئەم پرسیارکردنە بۆ سەر سوڕماندنە: ئایا هەڕەشەتان لێ دەکات، کە ئەگەر مردن و بوونەوە خۆڵ و بوونەوە ئێسکی پڕتووکاو، ئێوە دەرهێنراوە دەبن (زیندوو دەکرێنەوە)؟

﴿ أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴾، کە ئێوە جارێکی دیکە دەردەهێنرێنەوە، ئایا بەوە هەڕەشەتان لێ دەکات؟ ئنجا، بۆچی دەڵێن: دەبێتەوە بە خۆڵ و دەبێتەوە بە ئێسک؟ چونکە گۆشتەکەی زوو دەبێتەوە بە خۆڵ و، ئێسقانەکانیش پڕتووکاو دەبن.

١٠)- ﴿ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴾، زۆر دوورە زۆر دوورە، ئەوەی کە هەڕەشەتان پێی لێ دەکرێ، وشەی ﴿ هَيْهَاتَ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**هَيهَاتِ**)، واتە: هەم بە سەر (فتح)و، هەم ژێر (کسر)یش خوێندراوەتەوەو، ئەمە وشەیەکی (**مبنيّ**)یە، هەم لەسەر فەتح و هەم لەسەر کەسر، کە پێی دەگوترێ: ناوی کردار (**إسمُ الفِعْل**) و، بۆ ڕابردوویە، یانی: (**بَعُدَ بَعُدَ**)، زۆر دوورە زۆر دوورە، ئەوەی کە ئەو هەڕەشەتان پێی لێ دەکات، ئەدی چۆنە؟

١١)- ﴿ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴾، ژیان تەنیا ژیانی دنیامانە، دەمرین و دەژین و، ئێمە زیندوو ناکرێینەوە، ئنجا ئەگەر ژیان تەنیا ژیانی دنیا بێ؟ خەڵک لە پێناوی ئەوەندە ژیانە دنیاییەدا کۆیلایەتیی دەکات، خزمەتکاریی دەکات، ژێردەستەیی قبووڵ دەکات و، زەبوونیی قبووڵ دەکات، چی دەکات بیکات، بەڵام ئەگەر ڕۆژی دوایی هەبێ، ڕۆژی دوایی غیرەت وەبەر ئینسان دەنێ، جەوهەر دەداتە بەر ئینسان، کە لە پێناو پێنج و دوو ڕۆژێکی دنیایی و، ژیانێکی کاتیی دا، خۆی زەبوون و زەلیل نەکات، چونکە مەنزڵگایەکی دیکە هەیە، ژیانی ڕاستەقینەی تێدایە.

١٢)- ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴾، ئەو (پێغەمبەر)ە تەنیا پیاوێکە، درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ.

١٣)- ﴿ وَمَا نَحْنُ لَهُ بِمُؤْمِنِينَ ﴾، ئێمەش بۆ ئەو نابینە بڕوادار.

وایانزانیـوە: ئەگـەر ببنـە بـڕوادار، تەنیـا بـۆ ویـە، لـە حاڵێکـدا ئیـمان هێنـان، قازانجەکـەی بـۆ خاوەنیـەتی، کوفریـش زەرەرەکـەی بـۆ خاوەنیـەتی، ئنجـا بـا بزانیـن پێغەمبەرەکەیـان چـی دەفەرمـوێ، لـە کۆتایـی دا؟

**١٤)-** ﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِی بِمَا كَذَّبُونِ ﴾، گوتی: پەروەردگار! بەهۆی ئەوەوە کە منیان بە درۆ دانا، پشتم بگرە، سەرم بخە.

**١٥)-** ﴿ قَالَ عَمَّا قَلِیلࣲ لَّیُصۡبِحُنَّ نَـٰدِمِینَ ﴾، (خوا ﷻ) فەرمووی: دوای ماوەیەکی کەم ژیوان دەبنەوە، بە پیتی (ف) نەیهێناوە، لەبەر ئەوەی پێی چووە، کە ئەو پێغەمبەرە پاڕاوەتەوە، مەرج نیە یەکسەر خوا گەلەکەی لە بەین بردبێ.

﴿ عَمَّا قَلِیلࣲ ﴾، یـانی: (**بَعـدَ قَلِیـلٍ**) دوای کەمێـک، ئـەم (ما)یـە، زیـاد کـراوە بـۆ تەئکیـد، (قلیل)یـش، سـیفەتی وەصفکراوێکـی قرتێنـدراوە، واتـە: (**بَعـدَ وَقـتٍ قَلِیـلٍ**) دوای کاتێکـی کـەم، ﴿ لَّیُصۡبِحُنَّ نَـٰدِمِینَ ﴾، پەشـێمان دەبنـەوە، لێـرەدا (**لَّیُصۡبِحُنَّ**)، دوو واتـای هـەن:

**أ-** لە (**أصبح**) هاتوە واتە: بوو (صار)، واتە: بەمزووانە پەشێمان دەبنەوە.

**ب-** لە بەرەبەیاندا پەشێمان دەبن و، پەنجەی پەشیمانیی دەگەزن، لە (**أصبح**) هاتوە یانی: چووە نێو بەیانیی، چونکە لە سووڕەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّیۡحَةُ مُصۡبِحِینَ ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: دەمەو بەرەبەیان چریکەیەکی گەورە گرتنی.

**١٦)-** لێرەش دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّیۡحَةُ بِٱلۡحَقِّ ﴾، چریکەو هاڕژنێکی گەورە گرتنی.

**١٧)-** ﴿ فَجَعَلۡنَـٰهُمۡ غُثَاۤءࣰ ﴾، کردمانن بە پووش و پەڵاش، کردمانن بە خڵتەو خاڵ.

**١٨)-** ﴿ فَبُعۡدࣰا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّـٰلِمِینَ ﴾، دووریی بۆ کۆمەڵی ستەمکاران، دووریی بۆ ئەوان لە ڕەحمەتی خوا، دووریی بۆ ئەوان لە زبڵدانی مێژوودا، با بڕۆن و، سەر زەوییان لێ پاک بکرێتەوە.

## مەسەلەی چوارەم:

**دوایی خوا ﷻ چەندان کۆمەڵگای دیکەی پێگەیاندن و، هیچ کۆمەڵگایەک لە ئەجەلەکەی پێش نەکەوتوەو، دواش نەکەوتوە، پەیتا پەیتاش خوا پێغەمبەرانی خۆی (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ) بۆ ناردوون، کەچی هەموویان، (ئەو کۆمەڵگایانە) پێغەمبەرانی خۆیانیان بە درۆ داناوەو، خوای دادگەریش هەموویانی یەک لە دوای یەک، فەوتاندوون و، کردوونیە بەسەرهات و قسەی بەرو مەجلیسان و، کردوونی بە ڕووداوی سەیرو سەمەرە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾ مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٤٣﴾ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ۖ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ ۚ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا وَجَعَلْنَـٰهُمْ أَحَادِيثَ ۚ فَبُعْدًا لِّقَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴾، ئنجا لە دوای وان سەدانێکی دیکەمان پێگەیاندن، یانی: دوای خەڵک و کۆمەڵگای نووح ؑو دوای کۆمەڵگایەکی دیکەش کە پێغەمبەرێکی بۆ نێردراوە، بەڵام خوا ﷻ ناوی ئەو پێغەمبەرەی نەهێناوە، کە ئێمە زیاتر ئەو ئەگەرەمان لەلا بەهێزە، کە دەبێ گەلی (**ثمود**) بووبێ، پێغەمبەرەکەشیان صاڵح ؑە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ باسی چۆنیەتی فەوتێندرانیان دەکات، بە دەنگ و چریکەیەکی گەورە، وەک لە سوورەتی (**الحجر**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾، ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (**الحجر**)دا، بە درێژیی باسی بەسەرهاتی صاڵح و گەلەکەی (**ثمود**)مان کردوە.

کە دەفەرمووێ: ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴾، لە دوای وان چەندان سەدەمان پێگەیاندن، (**القُرُونُ الأُمَم وهِي المُجْتَمَعاتُ الَّتِي لَمْ يُرْسَل لَها رُسُلٌ**)، (**قُرُونْ**) واتە: سەدەکان، کە مەبەست پێی ئەو کۆمەڵگاو خەڵکانەن، لە کاتێکی

دیارییکراودا پێکەوە ژیاون، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست ئەو کۆمەڵگایانە بن کە پێغەمبەریان بۆ نەنێردراون، لەبەر ئەوەی کتێب و بەرنامەو پەیامی پێغەمبەری پێشوویان (**عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، لە نێودا ماونەوە.

دەشگونجێ مەبەست ئەو کۆمەڵگاو سەدانە نەبن، کە پێغەمبەریان بۆ نەنێردروان، بەڵکو خوای زاناو توانا بە گشتیی باسی سەدەکان دەکات، کە پێغەمبەرانیشیان (**عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام**) بۆ لا هاتوون، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ لە سوورەتی (**الفاطر**)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: هیچ کۆمەڵگایەک نەبووە، مەگەر وریاکەرەوەو هۆشیارکەرەوەیەکی تێدا تێپەڕیوەو، ڕەوان کراوە.

**٢)**- ﴿ مَا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴾، هیچ کۆمەڵگایەک، هیچ کۆمەڵێک لەو سەدانە، پێش ئەجەلەکەی نەکەوتوەو، لێشی دوا نەکەوتوە، واتە: هەر کۆمەڵگاو گەلێک بڕوای بە پێغەمبەری خۆی نەکردبێ، ئەوکاتە یاسای خوا وابووە لە ژیانی بەشەردا، کە ئەو کۆمەڵگایە شایستەی ئەوەیە بفەوتێندرێ و، سزا بدرێ، ئنجا هیچ کۆمەڵگایەک لەو کۆمەڵگایانە، پێش کاتی فەوتێندرانی نەکەوتوە، بەر لەوە نەفەوتاوەو، لێشی دوا نەکەوتوە، بەڵکو ڕێک لەو کاتەدا، خوا ﷻ بۆی دیاریی کردوە، سزا دراوەو، فەوتێندراوەو، سەر زەوی لێ پاک کراوەتەوە، بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەکی دیکە لە نوێ، دەست بە ئەزموونێکی دیکە بکاتەوە.

**٣)**- ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ﴾ دوایی پێغەمبەرانی خۆمانمان (**عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام**) یەک لە دوای یەک بەدوای یەکدا ناردن، وشەی (**تَتْرا**) کە خوێنراویشەتەوە: (**تترًا**)، (**أي مُتَعاقِبِينَ مَعَ فَتَرَاتٍ وتَقَطُّعٍ**) واتە: ئەو پێغەمبەرانەمان (**عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام**) ناردن بە دوای یەکدا، بەڵام ماوەیان دەکەوێتە نێوان، چونکە (**تترا**) یانی: (**وَتْرًا وَتْرًا**)، یەک یەک، لە دوای یەک دەهاتن.

٤)- ﴿ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُ ﴾، هەر کاتێک کۆمەڵگایەک، پێغەمبەرەکەی بۆ دەهات، بە درۆیان دادەنا.

هەڵبەتە ئایەتەکە وا دەفەرمووێ: کە هەر کۆمەڵگایەک، پێغەمبەرەکەی، ڕەوانەکراوەکەی بۆ دەهات، بە درۆیان دادەنا، بەڵام مەرج نیە، هەموویان بە درۆیان دانابێ، بەڵکو ئەگەر زۆربەیان بە درۆیان دانابێ، ئەم تەعبیرە ئەوەش دەگرێتەوە، واتە زۆربەیان بە درۆیان دانا، دەشگونجێ هەمووشیان بە درۆیان دانابێ، بەڵام ئەگەر زۆربەش بووبن، حیساب بۆ زۆرینە دەکرێ لەو حاڵەتانەدا، لە یاسا گەردوونییەکانی خوادا، لە ژیانی بەشەردا، حیساب بۆ زۆرینە دەکرێ، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (**الأنفال**)دا دەفەرمووێ: ﴿ وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَّا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنكُمْ خَاصَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٢٥﴾ ﴾، واتە: خۆتان لە بەڵایەک بپارێزن کە تەنیا بە تایبەت تووشی ئەوانەتان نایەت کە ستەمیان کردوە، بەڵکو هەر کات کۆمەڵێک هەبوون لە کۆمەڵگایەک دا، کە ستەمیان کردو، خراپەیان کردو، کۆمەڵگایەکەش لە بەرانبەریان دا، دەستەوستان و بێ دەنگ بوو، دەستەپاچە بوو، دەستیان نەگرتن، ئەو بەڵایە کە دێ، هەرچەند بە هۆی ئەو ستەمکارانەوە دێ، بەڵام خەڵکەکەی دیکەش هەمووی دەگرێتەوە، وەک پێشینان دەڵێن: (کاتێک ئاگر بەردەبێتە لێڕەوار، تەڕو وشکی پێکەوە دەسووتێ).

٥- ﴿ فَأَتْبَعْنَا بَعْضَهُم بَعْضًا ﴾، هەندێکیانمان بە دوای هەندێکیان خست، لێرەدا کە دەفەرمووێ: هەندێکمان بە دوای هەندێکمان خست، ئێمە بەهۆی ڕەوت (سیاق)ەوە دەزانین، کە مەبەست فەوتێندرانیانە، یانی: لە فەوتاندن و لە بەینبردندا، هەندێکمان بە دوای هەندێکماندا خست، ئەگەرنا دەگونجا واتایەکی دیکە بگەیەنێ، بەڵام ڕەوت و شوێنەکە ناچارمان دەکەن بڵێین: مەبەست پێی ئەوەیە.

٦)- ﴿ وَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ ﴾، هەروەها کردمانن بە بەسەرهاتی گێڕدراوە، لە بەرو مەجلیسان دا، (**أَحَادِيْث**):

**أ-** کۆی (**حَديث**)ە، وەک قسە، کە پێشتر لە شیکردنەوەی وشەکاندا باسمان کردوە.

**ب-** یاخود کۆی (**أُحْدوثَة**)یە، ئنجا ئەگەر کۆی (**حَدِيْث**) بێ، یانی: کردمانن بە باس و خواسێک، کە لەبەرو مەجلیساندا بگێڕدرێنەوە، واتە: بوونە باس و خواسی مەجلیسان، یان: باس و خواسی نێو کتێبان، ئەگەر (**أحَادِيْث**) کۆی (**أُحْدوثَة**)ش بێ، (**الأُحْدوثَةُ: هي اسْمُ لِما يُتَلَهَّى النَّاسُ بالْحدِيثِ عَنْهُ، مِثْلُ أعاجِيب جَمْعُ اعْجوبَة**)، (**أُحْدُوثَة**) ناوە بۆ ئەو شتەی خەڵک دەخافڵێنرێن، بە هۆی قسە لەبارە کردنیەوە، واتە: ڕووداوێکی سەیر، وەک (**أعاجِيب**)، کە کۆی (**اعْجُوبَة**)یە، واتە: شتە سەیرەکان.

**٧)- ﴿فَبُعۡدٗا لِّقَوۡمٖ لَّا يُؤۡمِنُونَ﴾**، دووریی بۆ کۆمەڵێک کە بڕوا ناهێنن.

دووریی لە چی؟ دووریی لە بەزەیی خواو، دووریی لەوەی بتوانن بەردەوام بن لە ژیانداو، پاشان دووریی بۆ ئەوان لەوەی لە ڕۆژی دوایی دا، خوا ﷻ بەزەیی پێیاندا بێ، چونکە خوا ﷻ هیچ نزیکییەکی لەگەڵ کەسدا نیە، مەگەر بەهۆی ئیمانەوە نەبێ و، هیچ دوورییشی لەگەڵ کەسدا نیە، بەهۆی کوفرو نیفاق و شیرک و ئیلحادو، ئەو سیفەتە خراپانەوە نەبێ، ئەگەرنا خوا ﷻ بە یەک چاو تەماشای هەموو مرۆڤەکان دەکات، بەڵکو جندیش، بەڵام ئەوە خەڵک خۆیانن دیاریی دەکەن، لە خوا نیزیک دەبن، یان دوور دەبن، ئەگەر ئیمانی پێ بێنن، بەهۆی ئیمان و بەندایەتییەوە، لێی نیزیک دەبن و، ئەگەر کوفری پێ بکەن، بەهۆی کوفرو شیرک و نیفاق و گوناهو تاوانەوە، لێی دوور دەبن، پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا لە بارەی ئوممەتان و کۆمەڵگاکانی پێشووەوە دەفەرموێ: {**عُرِضَتْ عَلَيَّ الأُمَمُ فَجَعَلَ يَمُرُّ النَّبِيُّ مَعَهُ الرَّجُلُ، وَالنَّبِيُّ مَعَهُ الرَّجُلاَنِ، وَالنَّبِيُّ مَعَهُ الرَّهْطُ، وَالنَّبِيُّ لَيْسَ مَعَهُ أَحَدٌ**} (**أخرجه أحمد: ٢٤٤٨، والبخاري: ٥٤٢٠، ومسلم: ٢٢٠**)، واتە: ئوممەتانم بۆ ڕانوێنران، پێشانم دران، (دەبێ لە خەونداا بووبێ، یاخود لە شەوی میعراج دا بووبێ)، پێغەمبەری وام دەبینی، پیاوێکی لەگەڵ بوو، پێغەمبەری وابوو دوو پیاوی لەگەڵ دابوون، (بەس ئەوەندە ئیمانیان

پـێ هێنابـوو)، پێغەمبـەری وام دەبینـی کۆمەڵێکـی لەگەڵـدا بـوون، پێغەمبـەری واشـبوو کەسـی لەگـەڵ نەبـوو، (واتـە: هیـچ کـەس بـڕوای پـێ نەهێنـا بـوو).

بـۆ زانیاریـی هەمـوو لایـەک: زۆر جـار بـاس دەکـرێ، ئـەدی کـوا لـە نێـو گەلـی چیـن، کـوا لـە هیندسـتان، کـوا لـە فـڵان شـوێنی دووری دنیـا، بـۆ چـی بـاس و خواسـی هیـچ پێغەمبەرانمـان نەبیسـتوە، وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە: پێغەمبـەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) کـە هاتـوون بانگـەوازی خـواو پەیامـی خـوا بەیەکگرتـن (توحیـد) یـان هێنـاوە، کـە پێچەوانـەی بیرکردنـەوەی خەڵـک و، پێچەوانـەی بووناسـیی ئـەو خەڵکـە بـووەو، پێچەوانـەی ئـەوە بـووە، کـە ئـەوان کردوویانەتـە پیشـە، لـە شـێوەی ژیانـی ئابووریـی و سیاسـیی و کۆمەڵایەتیـی و فیکریـی و عەقیدەییـان دا، بۆیـە وەک پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ، پێغەمبـەری وا هەبـووە، هاتـوەو، کـەس ئیمانـی پـێ نەهێنـاوە، ئنجـا بـاس و خواسـەکەی چـۆن بزانـدرێ؟ هەبـووە یەکێـک یـان دووان، یـان کۆمەڵێکـی کـەم، بڕوایـان پـێ هێنـاوە، پێغەمبـەران هـەر بـە چەوسـاوەیی ژیـاون و، ئـەو کاتـەش وەک ئێسـتا نەبـووە، نووسـین و خوێنـدن و بـاس و خـواس و تۆمارکـردن، شـتێکی بڵاوبـێ و، لـە نێـو هەمـوو خەڵکـدا بـێ، ئـەو کاتـە زیاتـر خوێنـدن و نووسـین بـە دەسـتی دەسـتەڵاتدارانەوە بـووەو، ئەوانیـش مێژوویـان بـە کەیفـی خۆیـان نووسـیوەتەوە، ئـەوەی مەبەسـتیان بووبـێ، تیشـکیان خسـتۆتە سـەر، ئـەوەش کـە مەبەسـتیان نەبووبـێ، کپیـان کـردوە، کـە ئێسـتاش هـەر وایـە، ئێسـتاش دام و دەزگایەکانـی ڕاگەیانـدن، ڕووداوێـک ئەگـەر مەبەسـتیان بـێ، زۆر تیشـکی دەخەنـە سـەرو گـەورەی دەکـەن، زەقـی دەکەنـەوەو، کەسـانێک، یـان ڕووداوێـک، یـان حاڵەتێکیـش، کـە مەبەسـتیان بـێ، نادیـدە بگیـرێ، کـپ و، خەفـەی دەکـەن و ژێـر لێـوی دەخـەن.

## مەسەلەی پێنجەم:

**ناردنی مووساو هارِوونی برای (عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلَام)، بە نیشانە گەل و بەڵگەی ڕوونەوە بۆ لای فیرعەون و دارو دەستەکەی و، خۆ بەزلگریی و ئیمان نەهێنانیان بە بیانووی مرۆڤبوونی مووساو هارِوون و، ژێر دەستە بوونی گەلەکەیان و، سەرەنجام فەوتێنرانیان و، کتێب و بەرنامەدان بە مووساو، ڕێنمایی کردنی گەلەکەی:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٤٥﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا عَالِينَ ﴿٤٦﴾ فَقَالُوٓا۟ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ ﴿٤٨﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾.

پێشتریش باسمان کرد ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**الأعراف**)دا، بە درێژیی باسی بەسەرهاتی مووساو هارِوونی برای (**عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلام**)و، گەلەکەیان، (**بنو إسرائيل**)، هەروەها فیرعەون و هامان و قارِوون، ئەو سێ کوچکە شوومەو، ئەوانەی لەگەڵیان بوون، باسمان کردوە، کە ئێمە بەسەرهاتی مووساو هارِوون و (**عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلام**)و گەلەکەیان و، لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەی کردوومانە بە سێزدە (١٣) قۆناغ، هەشت (٨) قۆناغیمان لە سوورەتی (**الأعراف**) دا باسکردوون، پێنج (٥) قۆناغی ماون، ئەوانیش لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**القصص**)دا، خوا پشتیوان بێ باس دەکەین:

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش برگەدا:

١)- ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴾، دوایی مووساو هارِوونی برایمان ڕەوانەکرد، بە نیشانەکانمانەوەو، بە بەڵگەیەکی ڕوونەوە.

(**سـلطان**)، بـە بەڵگـە دەگوتـرێ، چونکـە بەڵگـەی ڕوون و ئاشـکرا، دەسـەڵاتی هەیـە لەسـەر عەقڵ و دڵـی مـرۆڤ، ئەگـەر ئـەو مرۆڤـە ڕێـزی عەقڵ و دڵـی خـۆی بگـرێ.

خوا بۆ کوێی ناردن؟

٢)- ﴿ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ ﴾، بۆ لای فیرعەون و دەستڕۆیشتووەکانی، (**الملأ: الَّذينَ يَمْلَئونَ عُيُونَ النَّاسِ وقُلُوبَهُم هَيْبَةً وبَهاءً**)، (ملأ) ئەوانەن کە چاوو دڵی خەڵک پڕ دەکەن، لە سام و هەیبەت و سەرسامیی.

کەواتـە: (مـلأ)ی فیرعـەون، ئەوانـەن لـە کـۆڕو مەجلیسـەکەی دا بـوون، کـە وا پێدەچـێ لێـرەدا مەبەسـت پێـی زانـاو جادووگـەرەکان بووبـن، کـە کـۆی کردوونـەوە، یاخـود ئەوانـەی کـە ڕاوێـژی پـێ کـردوون، لـە پێـش هەموویانـەوە هامـان و قـاڕوون.

٣)- ﴿ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمًا عَالِينَ ﴾، ئنجا خۆیان بە زلگرت و کۆمەڵێکی بەزلگرتوو بوون، بە (ف)ی (تعقیب)، هاتووە، یانی: ڕێک کە هات و چوون بۆ لایان، یەکسەر خۆیان بە زلگرت، بەبێ تێفکرین و، لێوردبوونەوەی پەیامەکەی، ﴿ وَكَانُواْ قَوۡمًا عَالِينَ ﴾، لەبەرئەوەی کۆمەڵێکی بەرز بوون، خۆ بە بەرزگربوون، خۆیان پێ بەرزتر بوو لەوە کە گوێ بۆ مووساو هاڕوونی برای (**عَلَيْهِما الصَّلاةُ وَالسَّلام**) بگرن، ئنجا چییان بە پاساو هێناوەتەوە؟

٤)- ﴿ فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴾، گوتیان: ئایا بڕوا بێنین بۆ دوو مرۆڤی وەک خۆمان، لە حاڵێکیشدا کە گەلەکەیان، خەڵکەکەیان بۆ ئێمە کۆیلەن، ملکەچن، ژێر دەستن؟!

هەڵبەتـە بەنـوو ئیسـڕائیل وەک کۆیلـە وابـوون، لەبـەر دەسـتی فیرعـەون دا، هەرچەنـدە کۆیلـە نەبـوون، بـەڵام پیاوەکان وەک کۆیلـەو، ئافرەتـەکان وەک کەنیزەک مامەڵەیـان لەگـەڵ دا کـراوە، ئەگەرنـا ئـازاد (حر) بـوون، کۆیلـە (رقیق) نەبـوون، بەڵام

بە چاوی كۆیلەو خزمەتكارو ژێر دەست تەماشا كراون، بۆیە فیرعەون وا دەڵێ، هەرچەندە ئەصڵی وشەی (عبادة) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای ملكەچیی دێ، واتە: قەومەكەیان بۆ ئێمە ملكەچن، فەرمانبەرن، ژێردەستن، كە دیارە بەنوو ئیسرائیلیش وەک گوتمان: خزمەتكارو بەردەست و ژێردەستی قیبتییەكان بوون، بە سەرۆكایەتیی فیرعەون و قارۆون و هامان، بۆیە وایانگوتوە، ئنجا بە پلەی یەكەم مووسا ﷺ كە ڕووبەری فیرعەون بۆتەوە، بۆ ئەوە بووە كە بەنوو ئیسرائیل لەو ژێر دەستیی و، زەبوونییە دەرباز بكات، وەک دەفەرمویّ: ﴿فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ﴿٤٧﴾﴾ طـه، واتە: بەنوو ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو، چی دیكە ئەشكەنجەیان مەدە! فیرعەون سۆغرەو بێگاری بە پیاوەكان دەكرد، ئافرەتەكانیشیان دەهێشتەوەو، نێرینەكانیان سەردەبڕی، ئافرەتەكانیان دەهێشتەوە بۆ خزمەت و بۆ پێ ڕابواردن و كاری خراپ.

٥)- ﴿فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُواْ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ﴾، بە درۆیان دانان، یەكسەر لە فەوتاوان بوون، بە (ف)ی بەدواداهاتن، (تعقیب)، یانی: كە چوون، یەكسەر بە بێ دواكەوتن بە درۆیان دانان، ﴿فَكَانُواْ مِنَ ٱلْمُهْلَكِينَ﴾، ئەویش هەر بە (ف)ی تەعقیب، واتە: سەرەنجام یەكسەر لە فەوتێنراوان بوون.

هەڵبەتە یەكسەر كە ئەوان ئەوانیان بە درۆ داناوە، واتە: فیرعەون و دارو دەستەكەی، مووساو هارۆونیان بە درۆ داناون، یەكسەر خوا ﷻ سزای نەداون، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بۆمان كورت دەكاتەوە، كە سەرەنجامەكە وابوو، ئەوان لە فەوتێندراوان بوون.

٦)- ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾، بە دڵنیایی كتێبیشمان بە مووسا دا، بەڵكو ڕێی ڕاست بگرن، كە كتێبەكە بریتی بوو لە تەوڕات، تەوڕاتیش بە زمانی عیبریی یانی: شەریعەت، بەرنامە، بۆچی؟

﴿لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾، بەڵكو ڕێی ڕاست بگرن، کێ ڕێی ڕاست بگرێ؟ بەنوو ئیسرائیل، كار بەو شەریعەتە بكەن، چونكە قیبتییەكان، گەلی میسر، كە (**أقباط**) یان پێ دەگوترا، ئەوانەی دارو دەستەی فیرعەون سەرپەرشتییان دەكردن، ئەوانە بڕوایان بە مووسا ﷺ نەهێنا بوو، تاكو ئەركدار (**مُكَلَّف**) بكرێن بە جێبەجێ كردنی شەریعەت، ئەوەی بڕوای بە ئەصڵی دین نەبێ، داوای لێناكرێ كە پابەند بێ بە لقەكانی دینەوە: {**مَنْ لَمْ يُؤمِن بأصُولِ الدِّين، لا يُكَلَّف بفُرُوعِ الدِّين**}.

**مەسەلەی شەشەم:**

**گێڕانی عیساو دایكی (علَيْهِما السَّلام)، بە نیشانەیەكی ناوازەی خواو، حەواندنەوەی خوا بۆیان لە شوێنێكی بەرزی ئارام و ئاودارداا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ۝٥٠ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ وَجَعَلْنَا ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً ﴾، هەروەها كوڕی مەریەم و دایكیمان كردنە نیشانەیەكی ناوازە.

وشەی (ءَايَةً)، بە نەناسراو (**نكرة**) هاتووە، بۆ بە مەزنگرتن، لەبەر ئەوەی نیشانەیەك بووە، زۆر نیشانەی دیكەی گرتوونە خۆی، نیشانەیەكی زۆر ناوازەو سەرسوڕهێنەر بووە، كە تەنیا عیسا ؈ لە نێو مرۆڤایەتیی دا بەو شێوەیە بووە، كە تەنیا دایكی هەبێت و بابی نەبێ، ئەوە نیشانەیەكی زۆر گەورەیە، مەریەم بە بێ ئەوەی دەستی هیچ پیاوێكی پێ بكەوێ، نە بە حەڵاڵیی، نە بە حەڕامیی، عیسا ؈ی بووە.

٢)- ﴿ وَءَاوَيْنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبْوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴾، ئەو دووانە، كوڕی مەریەم و دایكی، مەریەم و عیسامان (**علَيْهِما السَّلام**)، پەنامان دان بەرەو تەپۆڵكەیەك، بەرەو گردێك، بەرەو بەرزاییەك، بردمانن، كە ئەو گردو تەپۆڵكەیە خاوەنی نشینگە بوو، خاوەنی كانیی و سەرچاوەش بوو، (**الإيواءُ: جَعْلُ الغَيْرِ أوياً ساكِناً**)، (**إيواءُ**)، بریتیە لەوەی غەیری خۆت بحەوێنیەوەو، نیشتەجێی بكەی و، سەقامگیری بكەی.

(رَبْوَةٍ)، واتە: بەرزاییەك، گردو تەپۆڵكەیەك، ﴿ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ ﴾، (ذَاتِ)، (**أي: صاحبة**)، خاوەن، خاوەنی نشینگەو كانیی و سەرچاوە، ئەو گردە، ئەو

تەپۆڵکەو بەرزاییە وابوو، شوێنی نیشتەجێ بوون بووە، (قرار) یانی: مانەوە لە شوێنێک، یان نیشتەجێ بوون و، سەقامگیربوون لە شوێنێکدا.

(وَمَعِينٍ)، (معين) واتە: ئاوێکی بەرچاو، ئاوێک لەبەری بڕواو دیاربێ، (المعِينُ: المَاءُ الظَّاهِرُ الجَارِي عَلَى وَجْهِ الأَرْض)، واتە: ئەو تەپۆڵکە (ربوة)یە، هەم بە کەڵکی تێدا نیشتەجێ بوون دەهات، هەم کانیی و سەرچاوەشی لێ بوو، ئەمە نیزیکە لە مانای فەرمایشتی خوای بەرز کە لە سوورەتی (مريم)دا بە مەریەمی فەرمووە: ﴿ قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّي إِلَيْكِ بِجِذْعِ النَّخْلَةِ تُسَاقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾ فَكُلِي وَاشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا ﴿٢٦﴾ ﴾، خوا ﷻ مەریەم دەدوێنێ:

دەفەرمووێ: پەروەردگارت جۆگەلەیەکی، (کانیی و سەرچاوەیەکی لە ژێر تۆوە)، لە خوار تۆوە، (لە دامێن ئەو شوێنەی کە تۆی لێی) داناوە، تۆ لقی دار خورماکە ڕابوەشێنە، خورمای تەڕو پێگەیشتووت بۆ دەخاتە خوارێ، ئنجا (لە خورمایەکە) بخۆو، (لە ئاوەکەش، لە کانیی و سەرچاوەکەش) بخۆوەو، دڵنیابە، با چاوت سەقامگیرو، ئارامگربێ.

چونکە ئینسان ئەگەر ترسی لەسەر بێ، هەر چاو بەملاولادا دەگێڕێ، بەڵام ئەگەر هەستی بە دڵنیایی کرد، چاو بەو لاو لادا ناگێڕێ.

ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (مريم)دا بە درێژیی باسی بەسەرهاتی مەریەم و عیسای کوڕیمان کردوە، بۆیە لێرە بەکورتیی باسی دەکەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان بیسـت و حـەوت (٢٧) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، ئایەتەکانـی: (٥١ - ٧٧)، چەنـد بابەتێکـی جـۆراو جۆریـان گرتوونـە خۆیـان، دەتوانیـن بڵێـن: چـوار بابەتـی سـەرەکیین:

١)- دواندنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم)، کە ڕۆزیی باش و پاک بخۆن و، کردەوەی چاک بکەن و، یەکیەتیی ئایین و بەرنامەی خوا، یاخود: ئۆممەتی خوا بە یەکگرتن، بپارێزن.

٢)- ڕەخنەگرتن لە شوێنکەوتووانی لادەریان، کە پەرتەوازە بوون و خەیاڵ پڵاویش دەکەن، کە خوا خۆشی دەوێن!

٣)- پێناسەکردنی شوێنکەوتووانی ڕەسەنیان بە پێنج خەسڵەتی بنەڕەتیی، کە بریتین لە:

١- ترس و سام بەرانبەر بە خوا.

٢- ئیمان بە ئایەتەکانی خوا.

٣- هاوبەش بۆ خوا دانەنان.

٤- ئەنجامدانی هەرچی کردەوەی چاکەو لە توانایان دا هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەبوونی ترس و بیم و دڵەڕاوکە، لە سزای خوا.

٥- خێرایی کردن لە ئەنجامدانی چاکەکاندا و، پێشکەوتنەوە لە بەندایەتییدا بۆ خواو فەرمانبەریی بۆ خوا.

٤)- دووبارە هاتنەوە سەر باس و خواسی ئەوانەی لە ڕێبازی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، لایان داوەو، پێناسە کردنیان بە دوازدە (١٢) سیفەت و کردەوەی خراپیان، کە بریتین لە:

١)- بێئاگایی.

٢)- خۆشگوزەرانیی.

٣)- پشتکردنە هیدایەتی خوا.

٤)- خۆبەزلگریی.

٥)- قسەی پووچ.

٦)- شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینان.

٧)- نکووڵییکردن لە ڕاستێتیی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ.

٨)- تۆمەتبارکردنی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بە شێتیی.

٩)- ڕەتکردنەوەی هەق.

١٠)- پشتکردنە بەرنامەی خوا.

١١)- لادان لە ڕاستە ڕێ.

١٢)- مکووڕیی لەسەر سەرکێشیی و ملهوڕیی.

﴿ يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَٰذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾ فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٥٤﴾ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُمْ بِهِ مِنْ مَالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي الْخَيْرَاتِ بَلْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ هُمْ مِنْ خَشْيَةِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَالَّذِينَ هُمْ بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَالَّذِينَ هُمْ بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُولَٰئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا وَلَدَيْنَا كِتَابٌ يَنْطِقُ بِالْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٢﴾

بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ إِذَا هُمۡ يَجۡـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدۡ كَانَتۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ أَمۡ جَآءَهُم مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ وَلَوۡ رَحِمۡنَٰهُمۡ وَكَشَفۡنَا مَا بِهِم مِّن ضُرّٖ لَّلَجُّواْ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ فَمَا ٱسۡتَكَانُواْ لِرَبِّهِمۡ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا ذَا عَذَابٖ شَدِيدٍ إِذَا هُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ ﴿٧٧﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەی پێغەمبەرینـە! لـە خواردنـە پـاک و چاکـەکان بخـۆن و، کـردەوەی بـاش بکـەن، بێگومـان مـن بـەوەی دەیکـەن، زانـام ﴿٥١﴾ ئـەم ڕێبازەشـتان یـەک ڕێبـازەو، منیـش پەروەردگارتانـم، دەجـا پارێزکارییـم لـێ بکـەن ﴿٥٢﴾ کەچـی (ئۆممەتەکانیـان) ئایینـی خۆیانیـان بـۆ چەنـد بەشـێک بڕبـڕ کـرد، هـەر کۆمەڵـە بـەوەی لـە لایەتـی، زۆر دڵخۆشـە! ﴿٥٣﴾ دەجـا (ئـەی موحەممـەد) وازیـان لـێ بێنـە، بـا هەتـا ماوەیـەک لـە سـەرگەردانییاندا سەراسـیمە بـن ﴿٥٤﴾ ئایـا پێیـان وایـە ئـەو کـوڕان و سـامانەی بۆیـان دەڕەخسـێنین ﴿٥٥﴾ هـۆکاری ئەوەیـە کـە پەلـە دەکەیـن لـە چاکـە بـۆ هێنانـە پێشـیان دا؟ (خەیـاڵ پـڵاو دەکـەن)،بەڵکـو هەسـت ناکـەن و نافامـن (کـە ئـەوە پەلکێـش کردنیانـە بـەرەو سـزا) ﴿٥٦﴾ بـە دڵنیایـی ئێمـە ئەوانەمـان لـەلا پەسـندو خۆشەویسـتە، کـە بـە هـۆی تـرس و سـامیانەوە بەرانبـەر بـە پەروەردگاریـان، بیـم و مەترسـییان هەیـە، (تووشـی سـزا بـن) ﴿٥٧﴾ هەروەهـا ئەوانـەی بڕوایـان هەیـە، بـە ئایـەت و نیشـانەکانی پەروەردگاریـان ﴿٥٨﴾ هەروەهـا ئەوانـەی هاوبـەش بـۆ پەروەردگاریـان دانانێـن ﴿٥٩﴾ دیسـان ئەوانـەی هەرچـی پێیـان دەکـرێ (لـە کاری چـاک، یـان لـە بەخشـین) دەیکـەن و ئەنجامـی دەدەن، کەچـی دڵیشـیان هـەر بـە تـرس و لـەرزە، لـەوەی کـە دەگەڕێنـەوە لای پەروەردگاریـان ﴿٦٠﴾ ئـا ئەوانـە لـە کـردەوە چاکەکانـدا خێرایـی دەکـەن و، تێشـیاندا پێشـڕەون ﴿٦١﴾ جگـە لـە تواناشی ئـەرک ناخەینـە سـەر هیچکـەس و، لیستێکیشـمان لـە لایـە کـە (لـە ڕۆژی قیامـەت دا) بـە هـەق و ڕاسـتیی دەدوێ و، ئـەوان سـتەمیان لـێ ناکـرێ ﴿٦٢﴾ بەڵکـو (کافـرەکان) دڵیـان لـەوە بـێ ئاگایـەو، چەنـدان کـردەوەی خراپـی دیکەشـیان هـەن، کـە ئەنجامیـان دەدەن ﴿٦٣﴾ هەتـا کاتێـک کـە خوشـگوزەرانەکانیانمان بـە سـزاو ئـازار گـرت، لـەو کاتـەدا دادو فیغـان دەکـەن ﴿٦٤﴾ (پێیـان دەگوتـرێ:) ئەمـڕۆ هـاوارو ڕۆ

مەکـەن، لـە بەرانبـەر سـزای ئێمـەدا، سـەرناخرێن و هاوکاریـی ناکرێـن ﴿٦٥﴾ پێشـتر ئایەتەکانمتـان بەسـەردا دەخوێندرانـەوە، کەچـی لەسـەر پاژنەکانتـان دەکشـانەوە! ﴿٦٦﴾ بـە درۆدانەرانـە لەبەرانبەریـدا (لـە بەرانبـەر قورئانـدا) خۆتـان بـە زلدەگـرت و، شـەوگارتان بـە قسـەی خـراپ دەگوزەرانـد(و بەسـەر دەبـرد) ﴿٦٧﴾ ئایـا ئـەو (کافـر) انـە لـە فەرمایشـتەکەی خـوا وردنەبوونـەوە، یـان (هـۆکاری بێبڕواییـان ئەوەیـە کـە) شـتێکیان بـۆ هاتـوە، کـە بـۆ بـاب و باپیرانـی پێشـوویان نەهاتبـوو؟ ﴿٦٨﴾ یـان ئایـا پێغەمبەرەکەیـان (موحەممـەد) ناناسـن، بۆیـە نکوولّیـی لێدەکـەن؟ ﴿٦٩﴾ یـان ئایـا دەڵێـن: شـێتیی تێدایـە؟ بەڵکـو هەقـی بـۆ هێنـاون و، زۆر بەشـیان بـە هـەق قەڵسـن ﴿٧٠﴾ ئنجـا ئەگـەر هەقیـش شـوێن ئارەزووەکانیـان کەوتبایـە، ئاسـمانەکان و زەوی و هـەر کـەس کـە تێیاندایـە، تێکدەچـوون، بەڵکـو ئێمـە (قورئانـە) بیرخەرەوەکەیانمـان بـۆ هێنـاون، کەچـی ئـەوان پشـت لـە بیرخەرەوەکەیـان دەکـەن ﴿٧١﴾ یـان ئایـا تـۆ (ئـەی موحەممـەد!) پاداشـت و خەرجییـان لـێ داوا دەکـەی، بۆیـە بـڕوا ناهێنـن؟ ﴿٧٢﴾ بـە دڵنیایـی پاداشـتی پـەروەردگارت باشـترەو، ئەویـش چاکتریـن بژیـو دەرە ﴿٧٣﴾ بێگومـان تـۆ بـەرەو ڕاسـتە ڕێ بانگیـان دەکـەی، ئەوانـەش کـە بڕوایـان بـە دواڕۆژ نیـە، لـە ڕاسـتە ڕێ لامـل و لادەرن ﴿٧٤﴾ ئنجـا ئەگـەر بەزەییشـمان پێیـان دا هاتبایـەوەو، ئـەو ئـازارو ناڕەحەتییانەمـان لـێ لابردبـان، هـەر لەسـەر سەرکێشـیی خۆیـان، سـەرگەردانانە سـوور دەبـوون ﴿٧٥﴾ مسـۆگەر پێشـتریش سـزاماندان، کەچـی بـۆ پەروەدگاریـان هـەر ملکـەچ نەبـوون و نەکڕووزانـەوە ﴿٧٦﴾ (ئیـدی لەسـەر ئـەو عینادیـی و ملهورییـە بـەردەوام بـوون) هەتـا دەرگای ئـازارو سـزایەکی سـەختمان بەسـەردا کردنـەوە، ئنجـا لـەو حاڵـەدا، لەنێـو ئـازارو سـزایەکەدا، بـێ ئومێـدو تەمـا بـڕاو بـوون ﴿٧٧﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلطَّيِّبَٰتِ ): واتە: ڕۆزییە خۆش و بەتام و بەسوودەکان، دەگوترێ: (**طَابَ الشَّيءُ يَطِيبُ طَيْبَاً فَهُوَ طَيِّبٌ، الطَّيِّبُ مَا تَسْتَلِّذُّهُ الحَوَاسّ، وما تَسْتَلِذُّهُ النَّفْسُ، وَالطَّعَامُ الطَّيِّبُ فِي الشَّرْعِ ما كَانَ مُتَنَاوَلاً مِنْ حَيْثُ مَا يَجُوزُ**)، دەگوترێ: (**طَابَ الشَّيءُ يَطِيبُ طَيْبَاً فَهُوَ طَيِّبٌ**)، واتە: ئەو شتە پاک و چاک و بە کەڵک بوو، (**طَيِّب**)، شتێکە کە هەستەوەرەکان و، (نفس) چێژی لێ دەکات و، خواردنی (**طَيِّب**)، لە ڕوانگەی شەرعییەوە ئەوەیە: بە شێوەیەک بە دەست هێنرابێ کە ڕەوایە.

(زُبُرًا ): (**زُبُر**) کۆی (**زُبْرَة**)یە واتە: (**القِطْعَة**)، پارچە، بەڵام لێرە خوازراوەتەوە بۆ بەش، کەواتە: (**جَعَلُوا أمْرَهُم زُبُراً**)، یانی: ئایینەکەی خۆیان، کارەکەی خۆیان بەش بەش کرد، دابڕ دابڕ کرد.

(غَمْرَتِهِمْ): (**الغَمْرَةُ: مُعْظَمُ المَاءِ، السَّاتِرَة لِمَقْرَها**)، زۆربەی ئاو کە سەرچاوەکە دادەپۆشی، پێی دەگوترێ: (**غَمْرَة**)، واتە: قووڵایی ئاو، (**جُعِلَ مَثَلاً لِلجَهالَةِ الَّتِي تَغْمُرُ صَاحِبَها**)، لێرەدا کراوە بە وێنە، بۆ نەزانییەک کە خاوەنەکەی نقوم دەکات و دایدەپۆشێ.

(مُّشْفِقُونَ): واتە: بە ترس و لەرزن، (**الإشْفَاقُ: عِنَايَةٌ مُخْتَلِطَةٌ بِخَوْفٍ، لأنَ المُشْفِقَ يُحِبُّ المُشْفَقَ عَلَيْهِ ويَخَافُ مَا يَلْحقَهُ**)، (**إشْفَاقٌ**)، بریتیە لە چاودێریی کردنێکی تێکەڵ بە ترس، چونکە بابای (**مُشْفِق**)، ئەو کەسەی (**إشْفَاق**)کەی بۆ دەردەبڕێ، خۆشیدەوێ و، دەشترسێ کە شتی خراپی تووش بێ، دەتوانین بە کوردیی بڵێین: (**إشْفَاق**)، واتە: بە پەرۆش بوون، بە تەنگەوە بوون.

(**وَجِلَةٌ**): (**الوَجَـلُ: إسْتِشْعَارُ الخَـوْفِ**)، (**وَجَـلْ**)، واتـە: هەسـتكردن بـە تـرس، پێشـینان دەڵێـن: (دڵـی لـە مستێ دایـە).

(**يَجْـَٔرُونَ**): یانـی: هـاوارو ڕۆ دەكـەن، (**جَـأَرَ: إِذَا أَفْرَطَ فِـي الدُّعَـاءِ والتَـضَرُّع**)، (**جَأَرَ**) ئەگـەر كەسـێك زێدەڕۆیـی بـكات، لە پاڕانـەوەو كڕووزانـەوەدا.

(**عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ تَنكِصُونَ**): واتــە: پاشــەو پــاش، لەســەر پاژنەتــان دەكشــێنەوە، (**النكُـوصُ: الإِحْجَـامُ عَـنِ الـشَّيءِ**)، (**نكُـوصْ**)، ئـەوە كـە ئینسـان لـە شـتێك بچێتـە دواوە.

(**سَٰمِرًا**): واتـە: قسـەی شـەوێتان دەكـرد، شـەوتان بـە قسـەكردن بـە ڕێ دەكـرد، (**السَّـمَرُ: الحَدِيْـثُ لَيْـلاً، سَـمَرَ فُـلاَن: تَحَـدَّثَ لَيْـلاً**)، (**سَـمَرْ**) بریتیـە لـە قسـەی شـەوێ، شـەوگار بەسـەربردن بـە قسـە.

(**تَهْجُرُونَ**): (**الهُجْـرُ: الـكَلاَمُ القَبِيْـحُ المَهْجُـورُ لِقُبْحِـهِ**)، (**هُجْـرْ**) بریتیـە لـە قسـەیەكی ناشـیرین كـە وازی لـێ دەهێـنرێ لەبـەر ناقۆڵاییانـی، واتـە: ئێـوە شـەوانە هـەر خەریكـی قسـەی پـووچ و ناشـیرین بـوون.

(**خَرْجًا**): (**الخَـرْجُ: ضِـدُّ الدَّخْـلِ**)، (**خَـرْج**) ئەوەیـە كـە ئینسـان خەرجـی دەكات و، لێـی دەردەچـێ، (**دَخْـل**)، ئەوەیـە كـە بـۆی دێ.

(**فَخَرَاجُ**): (**الخَـرَاجُ: مُخْتَـصٌّ غَالِبـاً بِالضَّرِيبَـة عَـلَى الأَرْض**)، (**خَـرَاجْ**)، زیاتـر تایبەتـە بـەو باجـەی لـە زەوی وەردەگیرێ.

(**لَنَٰكِبُونَ**): (**أَي: عادِلُـون**)، عـادڵ: لادەر، (**نَكَـبَ عَـنْ كَـذَا: مَـالَ وعَـدَلَ**)، لایـداو، لاڕێ بـوو.

(**لَّلَجُّواْ**): (**اللِّجَـاجُ: التَّـمَادِي فِـي العِنَـادِ فِـي تَعَاطِـي الفِعْـلِ المَزْجُـورِ عَنْـهَ**)، (**لِجَـاج**)، بریتیـە لـە درێـژە پێدانـی كەللەڕەقیـی، لـە ئەنجامدانـی كردارێكیـدا كـە سەرزەنشـت كـراوەو، سـەركۆنە كـراوە.

(يَعۡمَهُونَ ): (العَمَهُ: التَرَدُّد في الأَمْرِ مِنَ التَحَيُّرِ)، (عَمَه)، بریتیە لە ئەوەی کەسێک لە بارەی شتێکەوە، دڵ لە دڵ بدات و، تێیدا سەراسیمەو سەرگەردان بێ.

(فَمَا ٱسۡتَكَانُواْ ): (أَي: فَمَا خَضَعُوا، وَمَا ذَلُّوا)، هیچ ملکەچ نەبوون، نەکڕووزانەوە، نەپاڕانەوە.

(يَتَضَرَّعُونَ ): (ضَرَعَ: ضَعُفَ وذَلَّ)، (تَضَرُّعَ) لە (ضَرْعْ)ەوە هاتووە ، (ضَرْع)، یانی: گوان، کەسێک، کە گوانی مەڕە، بزنە، مانگایە، دەیدۆشێ، (تَضَرُّعَ)یش، ئەوەیە کە ئینسان خۆی ڕابگوشێ و، بکڕووزێتەوەو، بلاڵێتەوە.

(مُبۡلِسُونَ ): (الإِبْلَاسُ: الحُزْنُ المُعْتَرِضُ مِنْ شِدَّة البَأْسِ)، (إِبْلاس) بریتیە لە دڵتەنگیی و خەمبارییەک، لە ئەنجامی نائومێد بووندا، پەیدابوونی کەسێک، زۆر تووشی سەغڵەتیی بووە، نائومێدو تەما بڕاو ببێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دوای ئەو ئایەتانەی ڕابردن، بە تایبەت دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتی نووح ؑو بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرەی لە دوای (**نووح**)دا هاتووە، کە وەک گوتمان: وا پێدەچێ صالح بێ، کە بۆ گەلی (**ثمود**) نێردراوە، هەروەها دوای ئەوەی بە گشتیی باسی پێغەمبەران و، کۆمەڵگاکانی کردو، دواتر ئاماژەیەکی کرد بە بەسەرهاتی مووساو هاروون (**عَلَيْهِمَا الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)، لەگەڵ فیرعەون و دارو دەستەکەیدا، پاشان ئاماژەیەکی کورتتری کرد، بە عیسا ؑو دایکی (مەریەم) خوا لێی ڕازی بێ دەکات، دوای ئەوە خوا ﷻ ڕوو دەکاتە پێغەمبەران و دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾، ئەی پێغەمبەرینە! ئەی ڕەوانەکراوینە! لە بژیوە چاک و پاک و سوود بەخشەکان بخۆن و، کردەوە چاکەکانیش ئەنجام بدەن، بە دڵنیایی ئەوەی ئێوە دەیکەن من پێی زانام و، لێی ئاگادارم.

کەواتە: بزانن چۆن هەڵسوکەوت دەکەن، ئێوە نوێنەری منن و، گەیەنەری پەیام و بەرنامەی منن، بۆ لای جندو مرۆڤان، دەبێ زۆر لە خۆتان وریابن، لەو ئاستە بەرزەدا بن، کە شایستەتانە.

کە بە تەئکید هەر واش بوون.

ئەمە لێرەدا، یانی: خوای پەروەردگار کاتی خۆی وای بە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) فەرمووە، یاخود ئێوە ئاگادار بن! کە خوا ﷻ بەو شێوەیە پێغەمبەرانی دواندوە، هەر کامێکیانی بە جیا دواندوە، بەو شێوەیە، کە: تەنیا بژیوی پاک و چاک بخوات، پاک لە ڕووی حەڵاڵیی و، چاک لە ڕووی ئەوە وە

کە مایەی ڕاگرتنی جەستەو، دابین کردنی تەندروستیی بێ، کردەوە چاکەکانیش ئەنجام بدات، هەموو پێغەمبەرێک (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، خوا ئاوای فەرمان پێکردوەو، ئاگاداریشی کردۆتەوە: من ئاگادارم، زانام بەوەی دەیکەن.

لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ} (أخرجه أحمد: ٨٣٣٠، ومسلم: ١٠١٥، والترمذي: ٢٩٨٩)، واتە: خوا بەوە فەرمانی بە بڕواداران کردوە، کە فەرمانیشی پێ بەپێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلَام) کردوە، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەوەی کە خوا بۆی ڕەوا کردوون، لە خۆتانی قەدەغە مەکەن و، سنورو شکێنیی مەکەن و، لەو ڕۆزییە پاک و چاکانەی خوا پێی داون، بخۆن.

هەڵبەتە ئیمانداران، شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانن، بۆیە: دەبێ ئیماندارانیش وەک پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بکەن، پێغەمبەران سەرمەشقی ئیماندارانن.

﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾، دیسان خوا ڕوو بە پێغەمبەران دەفەرموێ: ئەم بەرنامەیەشتان یەک بەرنامەیە، ئەمە ئەگەر وشەی ئۆممەت بە مانای دین و ڕێباز بێ، ئەگەر بە مانای کۆمەڵە خەڵکێک بێ، واتە: ئەو کۆمەڵە خەڵکە، کە پێغەمبەران سەرقافلەیانن، بە درێژایی مێژوو، یەک کۆمەڵە، هەمووی یەک جۆرە بووناسیی، یەک جۆرە ئیمان و عەقیدە، یەک جۆرە بەندایەتیی، یەک جۆرە ڕەوشت و ئاکار، لە هێڵە گشتییەکان دا، هەمووی یەک کۆمەڵە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ، لێرەدا مەبەست لە ئۆممەت، بەرنامەو ڕێباز بێ، واتە: ئەو بەرنامەو ڕێبازەی ئێوە، یەکێکە، کە بەرنامەو ڕێبازی خوا بەیەکگرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردنە.

﴿ وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴾، منیش پەروەردگارتانم، ئنجا پارێزم لێ بكەن، وریا بن بزانن چۆن، لەگەڵ ئەو ڕێبازەتاندا، مامەڵە دەكەن.

﴿ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ زُبُرًا ﴾، كەچی دوا بە دوای ئەوە، خەڵكەكە، شوێنكەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، ئەگەرنا بە تەئكید لێرەدا مەبەست پێی پێغەمبەران نیە، بەڵكو یانی: شوێنكەوتووانی پێغەمبەران، ئۆممەتەكانیان، كارەكەی خۆیانیان بەش بەش كرد، دابڕ دابڕ كرد، كە مەبەست ئایین و بەرنامەكەیانە، لە جیاتی ئەوەی بە یەكگرتوویی بیهێڵنەوە، بەش بەشیان كرد، یەكیان لایەكی گرت، یەكیان ئەو لای گرت، یەكیان ئەو لای گرت.

﴿ كُلُّ حِزْبِۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾، هەر كۆمەڵێك بەوەی بۆ خۆی لەسەریەتی، زۆر دڵخۆش بوون، ئنجا ئەوە ئێستا دەردێكە، ئۆممەتی پێغەمبەریش ﷺ تووشی بۆتەوە، بەشێك لە مسوڵمانان لایەنی سیاسیی دەگرن و، وا دەزانن ئیسلام هەر ئەوەندەیە، هەندێكیان لایەنی جەنگ و جیهاد دەگرن، هەندێكیان تەنیا لایەنی ڕووحیی دەگرن، هەندێكیان تەنیا لایەنی ئیمان و عەقیدە دەگرن، هەندێكیان تەنیا لایەنی پەروەردە دەگرن، هەندێكیان تەنیا لایەنی فیكریی دەگرن ... هتد، كە دواتر لە مەسەلە گرنگەكاندا زیاتر تیشكی دەخەینە سەر.

خوا دەفەرمووێ: ﴿ فَذَرْهُمْ فِى غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾، ئنجا لێیان گەڕێ، لەو گێژاوەی خۆیان دا، تا ماوەیەكی دیاریكراو لێیان گەڕێ با سەراسیمە بن، (غَمْرَة)، بە ئاوێكی زۆر دەگوترێ كە هەر شتێك تێیدا بێ، نوقمی بكات، ئەو حاڵەتە فیكرییە، ئەو سەرگەردانیی و، سەرلێشێواوەییەیان بە ئاوێكی زۆر دەچوێنێ، كە مرۆڤ دەیكەوێتێ و تێیدا نوقم دەبێ.

﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴿٥٥﴾ نُسَارِعُ لَهُمْ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴾، ئایا پێیان وایە ئەوەی ئێمە لە سامان و لە كوڕان، بۆ ئەوانی دەڕەخسێنین، ئەوە نیشانەی ئەوەیە، كە خێرایی دەكەین لە چاكەكاندا بۆیان، (واتە: خۆشمان دەوێن)؟!، ﴿ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴾، بەڵكو هەست ناكەن.

یانی: هەست ناکەن کاتێ کە خوا ﷻ کەسانێک کە لە ڕێبازەکەی لادەدەن و، ئەویش بە دەمیانەوە دەداو، ڕستیان بۆ درێژ دەکات، لە ڕاستییدا ئەوە پەلکێش کردنیانە، بەرەو سزای خوا، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ القلم، واتە: ئێمە وردە وردە، ڕستیان بۆ درێژ دەکەین و، پەلکێشیان دەکەین، بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر وەسف و پێناسەی ئەوانەی لە لای خوا خۆشەویستن و بەندەی پەسندن و، پێنج سیفەتی سەرەکییان لێ هەڵدەدا:

١)- ﴿ إِنَّ الَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لە ترسی پەروەردگاریان، دڵیان بە ترس و لەرزەو، مەترسییان بەرانبەر بە خۆیان هەیە.

٢)- ﴿ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی بڕوایان بە نیشانەکانی پەروەردگاریان هەیە، یانی: دیمەن و دیاردە گەردوونییەکان، یاخود ڕستەکانی فەرمایشتەکەی.

٣)- ﴿ وَالَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دانانێن، ئەهلی شیرک نین.

٤)- ﴿ وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی کە هەرچی لە تواناییاندا هەیە، دەیبەخشن، یاخود هەرچی لە تواناییان دایە ئەنجامی دەدەن، کەچی دڵیشیان لە ترس و لەرز دایە، دڵیان لە مستێ دایە، لەبەر ئەوەی دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەدگاریان، ئایا خوا کردەوەکانی لێ قبووڵ کردوون، یان نا! نەک بە کردەوە چاکەکانیان بوغڕا بین.

٥)- ﴿ أُولَٰئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ ﴾، ئا ئەوانەن کە خێرایی دەکەن لە ئەنجامدانی چاکەکانداو، پێشڕەویشن و پێشیش کەوتوونەوە.

خاوەنی ئەو پێنج سیفەتانە، ئەوانەن لەلای خوا ﷻ پەسندن و خۆشەویستن.

﴿ وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَلَدَيْنَا كِتَـٰبٌ يَنطِقُ بِٱلْحَقِّ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، هیچکەسیش ئەکدار ناکەین، لە هیچ کەسێکی داوا ناکەین، جگە لەوەی لە توانای دا هەیەو، لیستێکیشمان لە لایە، بە هەق دەدوێ و، ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ.

ئنجا خوا ﷻ دێتەوە سەر باس و خواسی ئەوانەی کە لە ڕێبازی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لایانداوە، لەو بەرنامە هەق و، تێرو تەواوەی کە پێغەمبەران هێناویانە، بۆ ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی، کە پێی بەڕێوەبچێ و، سەرەنجام ژیانێکی پێ بگوزەرێنێ، لە ڕووی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسییەوە، کە شایستەی مرۆڤ بێ، ئەوانە کە لایان داوە دێتە سەر باس و خواسیان و، دوازدە (١٢) سیفەتی خراپیان لێ هەڵدەداو دەفەرموێ:

﴿ بَلْ قُلُوبُهُمْ فِى غَمْرَةٍ مِّنْ هَـٰذَا ﴾، بەڵکو ئەوانە، ئەو لادەرانە، ئەو تاوانبارو خراپەکارانە کە لە ڕێبازی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لایانداوە، دڵیان بێ ئاگایە لەوە، لەو باس و خواس و سیفەتە بەرزانەی ئیمانداران و، لە نەزانییەکی قووڵ دایە.

﴿ وَلَهُمْ أَعْمَـٰلٌ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمْ لَهَا عَـٰمِلُونَ ﴾، جگە لەوەش، چەندان کردەوەی (خراپی) دیکەیان هەن، ئەنجامیان دەدەن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذْنَا مُتْرَفِيهِم بِٱلْعَذَابِ إِذَا هُمْ يَجْـَٔرُونَ ﴾، (ئیدی لەسەر ئەوە بەردەوام دەبن)، تاکو کاتێک کە ئێمە خۆشگوزارەکانیان بە سزا دەگرین، لەو کاتەدا دەست دەکەن، بە هاوارو ڕۆو دادو فیغان، بەڵام پێیان دەگوترێ: ﴿ لَا تَجْـَٔرُوا۟ ٱلْيَوْمَ ۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴾، ئەمڕۆ هاوارو ڕۆ ڕۆ مەکەن، دادو فیغان مەکەن، لە لایەن ئێمەوە سەرناخرێن، پشتیوانییتان ناکرێ، ﴿ قَدْ كَانَتْ ءَايَـٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَـٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴾، پێشتر ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنرانەوە، بەڵام ئێوە لەسەر پاژنە پێیەکانتان دەکشانەوە، لە جیاتی ئەوەی بەرەو ڕووی ئایەتەکان بێن، لێیان دەکشانەوە، ﴿ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ ﴾، لە بەرانبەر قورئاندا، بە شێوەی بە درۆدانەرانە،

خۆتـان بـەزل دەگـرت، ﴿ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ﴾، شـەوگارتان بـە قسـەی خـراپ و پـووچ بەسـەر دەبـرد.

ئنجـا دێتـە سـەر باسـی کافرەکانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ، دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ أَمۡ جَآءَهُم مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، ئایـا بیریـان لـە فەرمایشـتەکە نەکردۆتـەوە، (کـە قورئانـە) ﴿ أَمۡ جَآءَهُم مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، یاخـود شـتێکیان بـۆ هاتـوە، کـە بـۆ بـاب و باپیرانـی پێشـوویان نەهاتـوە، ﴿ أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴾، یاخـود پێغەمبەرەکـەی خۆیـان ناناسـن، نەیانناسـیوە، بۆیـە نکوولّیـی لـێ دەکـەن، ئایـا چاکـی ناناسـن کێیـەو کـێ نیـە؟ ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢ ﴾، یـان ئایـا دەڵێـن: شـێتیی تێدایـە؟ ﴿ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴾، بەڵکـو (ڕاسـتییەکەی ئەوەیـە) هەقـی بـۆ هێنـاون و، ئەوانیـش (دانوویـان لەگـەڵ هەقێـدا ناکوڵـێ و)، زۆربەیـان ڕقیـان لـە هەقـی هەڵدەسـتێ، بۆیـە پێغەمبەریـش ﷺ تۆمەتبـار دەکـەن بـە شـێتیی، بـۆ پاسـاو دانـەوەی هەڵوێسـتی کافرانـەی خۆیـان.

﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾، ئەگـەر هەقیـش بـە دوای ئـارەزووەکان کەوتبایـە، ئاسـمانەکان و زەوی و هـەر کەسـێ کـە تێیـان دایـە، هەموویـان تێکدەچـوون، ﴿ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ﴾، بەڵکـو ئێمـە بیرخـەرەوەی خۆیانیـان، یاخـود شـەڕەف و ڕێـزی خۆیانیانمـان بـۆ هێنـاوە، کەچـی ئـەوان پشـت دەکەنـە بیرخەرەوەکەیـان، یـان پشـت دەکەنـە ئـەو ئاییـن و بەرنامەیـەی، کـە مایـەی ڕێـزو حورمەتـە بۆیـان.

﴿ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، یـان ئایـا تـۆ خەرجیـی و مەسرەفیـان لـێ داوا دەکـەی، (بۆیـە بـڕوا ناهێنـن)؟ بـە دڵنیایـی خەرجیـی و بژێـوی پـەروەردگارت چاکـترەو، بـەس ئەویـش باشـترین بژێـودەرە.

﴿ وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، هەروەهـا بـە دڵنیایـی تـۆ ئـەوان بانـگ دەکـەی، بـۆ ڕاسـتە شـەقام، ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴾،

بەڵام ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، لادەرن لە ڕاستە شەقام، ﴿وَلَوۡ رَحِمۡنَٰهُمۡ وَكَشَفۡنَا مَا بِهِم مِّن ضُرّٖ لَّلَجُّواْ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾، ئەگەر گریمان ئێمە بەزەییشمان لەگەڵ نواندبان و، ئەو ئازارو ناڕەحەتییەی کە هەیانە، لێشمان لابردبانایە، هەر لەسەر سەرکێشیی و، یاخیبوونی خۆیان سەراسیمانە، بەردەوام دەبوون.

﴿وَلَقَدۡ أَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ فَمَا ٱسۡتَكَانُواْ لِرَبِّهِمۡ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ﴾، بە دڵنیایی پێشتریش ئێمە سزاماندان، کەچی بۆ خوا ملکەچ نەبوون، نەکڕووزانەوەو، لێی نەپاڕانەوە، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا ذَا عَذَابٖ شَدِيدٍ إِذَا هُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ﴾، هەتا کاتێک کە دەرگای سزایەکی سەختمان لێکردنەوە، ئەو کاتە کت و پڕ تووشی نائومێدیی بوون، تەما بڕاو بوون و، دەستیان لە هەموو پچکا بڕا، لە جیاتی ئەوەی پێشتر پەند وەربگرن، خۆیان تووشی ئەو سەرەنجامە شوومە کرد.

# مەسەلە گرنگەكان

## مەسەلەی یەكەم:

**فەرمانكردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، كە بژیوی حەلاڵ و چاك بخۆن و، كردەوەی باش ئەنجام بدەن و، هۆشداریی پێدانیان كە ڕێبازەكەیان یەكێكەو، با پارێز لە پەروەردگاریان بكەن و، لێی لانەدەن و تێیدا پەر تەوازە نەبن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٥١﴾ وَإِنَّ هَـٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱتَّقُونِ ﴿٥٢﴾﴾.

### شیكردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُوا۟ مِنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ﴾، ئەی پێغەمبەرینە! لە بژیوە پاك و چاك و سوود بەخشەكان بخۆن.

زانایان گوتوویانە: لێرەدا (كُلُوا۟)، فەرمان (أمر)ە، بەڵام (أَمْرُ إِبْاحـةٍ)، فەرمانی ڕەوانەكردن و ڕێ پێدانەو، ئەمە بەرپەرچدانەوەی كافرەكانە، كە پێیان وابووە، پێغەمبەران و، ئایین و بەرنامەو پەیامەكەیان، ڕێی لەزەت وەرگرتن و ژیانی خۆش، لە مرۆڤەكان دەگرێ، نەخێر، لە بژیوە پاك و چاكەكان بخۆن.

هەروەها لە ڕوویەكی دیكەشەوە، دیسان بەرپەرچدانەوەی كافرەكانە، كە ئەوان فەرقیان بە پاك و پیس نەكردوە لە خواردنەكانداو، پاك و پیس، چاك و خراپیان خواردوە.

یانی: ئەی پێغەمبەرینە! خۆتان و شوێنکەوتووانتان، تەنیا لە بژیوە پاک و چاک و سوود بەخشەکان بخۆن، شتانێک کە زیان بەخشن، پیسن، خراپن، خۆتانیان لێ دوور بگرن، ئنجا وەک پێشتریش گوتمان: ئەم دواندنەی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، ئاشکرایە لە دوای هاتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ نەبووە، بەڵکو خوا ﷻ بۆمان دەگێڕێتەوە، کە ئاوا پێغەمبەرانی دواندوە، هەر کامێکیان، تاک، تاک، ئاوای دواندوە، ئەگەرنا پێغەمبەران هەموویان لە یەک شوێن کۆنەبوونەوە، کە خوای پەروەردگار ئاوا بیاندوێنێ، بەڵام هەموو ئەو دواندنە تایبەتانەی کە خوا ﷻ پێغەمبەرانی پێ دواندوون، یەک یەکیان، هەموویانی لێرەدا کۆکردۆتەوە، دەفەرموێ: پێغەمبەرانم ئاوا دواندون، ئەی پێغەمبەرینە!، لە بژیوە پاک و چاکەکان بخۆن.

٢)- ﴿ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًا ﴾، لە کردەوە باشەکانیش ئەنجام بدەن، کردەوە باشەکان بکەن، ئنجا ئایا کردەوە باشەکان چین؟ تێکڕای جم و جۆڵ و چالاکییە فیکریی و دەروونیی و ڕواڵەتییەکان چ پەیوەندییان بە لایەنی بووناسییەوە هەبێ، چ بە ئیمان و عەقیدەوە، چ بە خواپەرستییەوە، چ بە ڕەوشت و ئاکارەوە، چ بواری کۆمەڵایەتیی، چ بواری سیاسیی، چ بواری بازرگانیی، هەمووی دەگرێتەوە.

٣)- ﴿ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴾، بە دڵنیایی ئەوەی ئێوە دەیکەن، من پێی زانام، ئەمە هاندانی پێغەمبەران و، شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانە، بۆ هەردووکیانە، کە: خوا ئاگادارە چ جۆرە بژیوێک دەخۆن و، چۆنی پەیدا دەکەن؟ هەروەها چ کردەوەیەکیش ئەنجام دەدەن؟ ئنجا مادام خوا ئاگادارە، لە خۆتان وریا بن.

دوایی خوای پەروەردگار لەسەر دواندنی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)، بەردەوام دەبێ، دەفەرموێ:

٤)-﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾، ئەم بەرنامەو ڕێبازەی ئێوە، یەک بەرنامەو ڕێبازە.

٥)- ﴿ وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ ﴾، منیش پەروەردگارتانم، دەجا پارێزم لێ بکەن، خۆتان بپارێزن، کە لە بەرنامەکەم لابدەن، یاخود پەرتەوازەبن، یاخود بەش بەشی بکەن.

(إِنَّ)، لە: ﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾ دا بە سێ جۆر خوێنراوەتەوە:

١- (إِنَّ).

٢- (أَنَّ).

٣- (وأَنَّ).

وشەی (أُمَّةً)یش، لە قورئاندا بە سێ واتایان هاتوە:

**یەکەم:** بە واتای کۆمەڵە خەڵکێک دێ: ﴿ وَجَدَ عَلَيْهِ أُمَّةً مِّنَ ٱلنَّاسِ يَسْقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ القصص، واتە: کۆمەڵە خەڵکێکی لەسەر دیتن (خەڵکی مەدیەن) کە ئاژەڵەکانیان ئاودەدا.

**دووەم:** بە مانای کات دێ: ﴿ وَٱدَّكَرَ بَعْدَ أُمَّةٍ ﴿٤٥﴾ ﴾ یوسف، دوای کۆمەڵێک (ساڵ و کات) بیری هاتەوە، هاتەوە یادی (یوسوف چی پێگوتبوو).

**سێیەم:** بە مانای ڕێبازیش، دێ.

کە لێرەدا دەگونجێ ئەم مانایەیان زیاتر بەهێز بێ: (**وَأَنَّ هَـٰذِهِ أُمَّتُكم**)، ئەمە ڕێبازو بەرنامەی ئێوەیە، ﴿ أُمَّةً وَٰحِدَةً ﴾، یەک ڕێبازو یەک بەرنامە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً ﴿١٢٠﴾ ﴾ النحل، ئیبراهیم ئۆممەتێک بووە، دەگونجێ بڵێین: کۆمەڵە خەڵکێک لە ئیبراهیم دا خولاسە بوو بوونەوەو، ئیبراهیم بە تەنێ بە قەدەر کۆمەڵێک خەڵک بوو، لە سیفەتی بەرزو چاک دا، دەشگونجێ مەبەست ئەوەبێ، کە ئیبراهیم بەرجەستەکەری ڕێبازێک و، بەرنامەیەک بوو، کە خوا ﷻ ناردوویەتی.

لە سوورەتی (الأنبیاء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُونِ ﴿٩٢﴾ ﴾، ئەم ڕێبازەی ئێوە یەک ڕێبازە و، منیش

پەروەردگارتانم، ئنجا تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، لێرە دەفەرمووێ: ﴿فَاتَّقُونِ﴾، پارێزم لێبکەن، ئنجا لەوێش دەگونجێ مەبەست پێی کۆی ئەهلی ئیمان بێ، بە سەرقافڵەیەتیی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، لێرەش هەر دەگونجێ، بەڵام لێرەش و لەوێش، وا پێدەچێ زیاتر مەبەست ئەوەبێ: ئەو بەرنامەو ڕێبازە، ئەی پێغەمبەرینە! کە لە ئادەمەوە تاکو خاتەم خوا نادوویەتی، یەک ڕێبازە، یەک بەرنامەیە، بیگرنە بەرو، تێیدا پەرتەوازە مەبن.

**مەسەلەی دووەم:**

**سەرزەنشتکردنی زۆرێک لە شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، لەسەر پەرتەوازەیی و ماڵماڵۆکێنەیان و خەیاڵپڵاویان، کە مادام خوا سامان و کوڕانیان بۆ دەڕەخسێنێ، دیارە ئەوانە دۆست و نیزیکی خوان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ۝٥٣ فَذَرۡهُمۡ فِي غَمۡرَتِهِمۡ حَتَّىٰ حِينٍ ۝٥٤ أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ ۝٥٥ نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ ۝٥٦ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗا ﴾، ئنجا کارەکەی خۆیانیان بڕبڕو پارچە پارچە کرد لە نێوانیاندا، هەرچەندە یەکسەر لە دوای باسی پێغەمبەران، خوا وا دەفەرمووێ، بەڵام بە سیاق و سەلیقە دەزانین کە ئەوانەی ئایین و کارەکەی خۆیانیان لە بەینی خۆیاندا، بڕ بڕو، پارچە پارچەو، بەش بەش کردوە، بە دڵنیایی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) نەبوون، بەڵکو شوێنکەوتووە سەرلێشێواوە لادەرەکانیان بوون.

بە (ف)ی بەدوادا هاتن (تعقیب) دەیهێنێ، یانی: یەکسەر لە دوای پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، شوێنکەوتووەکانیان، خۆیان تێدا ڕانەگرت، لەو ڕاستە شەقامەدا، بەڵکو ئایین و بەرنامەکەی خۆیان، ئیشەکەی خۆیان، لە بەینی خۆیان دا، بەش بەش کرد، (**زُبُرْ**) کۆی (**زَبْرَة**)یە، وەک (**قِطَع جمع قِطعة**) هەڵبەتە (**زُبُراً**)، خوێندراویشەتەوە: (**زُبَراً**)، یانی: (**قِطعاً**)، بەش بەشیان کرد.

٢)- ﴿ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ ﴾، هەر کۆمەڵێک بەوەی کە لەلایانە، زۆر دڵخۆش بوون، زۆر پێی سەرسام بوون، چونکە (**الفَرَحُ: شِدّة السرورِ**)، (**فرح**)، بریتیە لە زۆر دڵخۆش بوون، ئەمە لە مانای گشتییدا ئاماژەیەکمان پێداو گوتمان، لێرە زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

بەڕێـــــزان!

دەردی کوشندەی ئەهلی ئایین[1] و شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاةُ وَالسَّلام) ئەوە بووە، کە نەیانتوانیوە لەسەر ئەو ڕاستە شەقامە، ڕێک و ڕوون و بێ گرێ و گۆڵە، کە پێغەمبەران بەجێیان هێشتوە، چ لە ڕووی بووناسیی، چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدە، چ لە ڕووی پەرستشەکان، چ لە ڕووی ڕەوشت و ئاکارەکان، چ لە ڕووی ئەدەبە کۆمەڵایەتییەکان، چ لە ڕووی ڕێکخستنی ژیانی سیاسیی و، ئابوورییەوە، نەیانتوانیوە لەسەر ئەو ڕاستە شەقامە بمێننەوە، بەڵکو هەواو ئارەزووی خۆیان و غەیری خۆیان تێکەڵی کردوە، ئەفسانەیان تێکەڵ بە ئیمان و عەقیدە و بووناسییەکە کردوەو، هەواو ئارەزووی خۆیان تێکەڵ بە شەریعەت و بە پابەندییەکە کردوەو، عادات و نەریتی نەفامانەیان تێکەڵ بە ڕەوشت و ئەدەبە خێزانیی و، شەخصیی و، کۆمەڵایەتییەکان کردوە.

طاغووتە خۆبەزلگرو خۆسەپێنەکان، لە ڕووی سیاسیی و، لە ڕووی ئابوورییەوە، لادان و بە لاڕێ دا بردنیان، لە بەرنامەی ئایینی خوادا جێگیر کردوە، تاکو بتوانن خێرو بێری وڵات بۆ خۆیان قۆرخ بکەن و، خەڵک بچەوسێننەوە، ئەوە دەردی کوشندەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بووە، بۆیە خوا دەفەرمووێ: ﴿ فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرٗا ﴾، کاری خۆیان لە نێو خۆیاندا، بەش بەش کرد، کاری خۆیان چی بووە؟ ئایینەکەیان بووە، بەرنامەکەیان بووە، بەرنامەکەیان یەک بەرنامەی خوایە ﴿ وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴾، خوای کاربەجێ زۆر بە جەختکردنەوە، فەرموویەتی: ڕێبازەکەتان یەک ڕێبازە، کەچی ئەوان کردوویانەتە چەند ڕێبازێک.

---

(١) ئایین، دین، بە مانا عورفیی و باوەکەی، کە تەنیا بەرنامەی خوایی و ئاسمانیی دەگرێتەوە، نەک بە مانا زمانەوانیی (لغوي)یەکەی، کە گشتییە بۆ تێکڕای بەرنامەکان، چ خوا کردبن، چ مرۆڤکرد.

ئەگەر ئێستا تەماشا بکەین، جوولەکەکان چەندان جۆرن، هەروەها مەجووسییەکان، ئنجا صابیئە، دیسان نەصرانییەکان سێ کۆمەڵی سەرەکیین (بروتستانت) و (کاثولیك) و (ئەرثذۆکس)، ئنجا هەر کامێک لەوانەش چەند بەشێکە.

ئنجا مسوڵمانانیش لە ئەصڵدا هەموویان یەک ئۆممەتن، ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ ئەوانیش زۆربەیان وەک ناوێکی مێژوویی پێیان گوتراوە: ئەهلی سوننەت و جەماعەت، کەمینەکیش پێیان گوتراوە: شیعە، کاتی خۆی لە نێو شیعەدا (پەنجا، شەست)، کۆمەڵ و تاقم هەبووە، کە هەندێکیان لە تێپەڕێنەران (غلاة) بوون و، لە بازنەی ئۆممەت دەرچوون، هەروەها لە نێو لە ئەهلی سوننەتیشدا، دیسان کۆمەڵێک قوتابخانەی جۆراو جۆرو کۆمەڵێک لادان و خلیسکان بوون!

ئنجا ئائەوە دەردی کوشندەی شوێنکەوتووانی پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، بۆیەش خوا لێرەدا ئەوەمان بۆ باس دەکات، یانی: ئەی ئۆممەتی موحەممەد! ﷺ ئێوەش ئاگاداربن، بە دەردی ئەو ئۆممەتە پێشووانە نەچن، بە مەرەدی وان نەچن، ئێوەش ئایینی خۆتان لە بەینی خۆتاندا بەش بەش مەکەن، یەکێکتان تەنیا لایەنی فیکریی بگرێ و، یەکێکتان تەنیا لایەنی ڕووحیی بگرێ و، یەکێکتان تەنیا لایەنی پەروەردەیی و، یەکێک تەنیا لایەنی جەنگ و جیهاد و، یەکێک تەنیا لایەنی سیاسیی!، هەروەها هەر کامێکیشتان بڵێ: ئەوەی من دەیکەم، هەر ئەوە دینداریيە، کە لە ڕاستیی دا وانیەو، ئیسلام هەموو ڕەهەندەکانی ژیان دەگرێتەوە، ئیسلام هەم بووناسییەو، هەم ئیمان و عەقیدەیەو، هەم فیکرەو، هەم ڕەوشت و ئەدەب و ئاکاری شەخصیی و خێزانیی و کۆمەڵاتییەو، هەم لایەنی سیاسییە، هەم حوکمڕانییە، هەم جەنگ و جیهادو ڕووبەڕوو بوونەوەیە، لە کات و شوێنی خۆی داو، بە هەل و مەرجی خۆی، لە یەک کاتدا، هەموو ئەوانەیەو، گەلێک شتی دیکەشە.

٣)- ﴿ فَذَرْهُمْ فِي غَمْرَتِهِمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾، ئەی موحەممەد! ﷺ تۆ لێیان گەڕێ، لە شوێنکەوتووانی ئایین و بەرنامە پێشووەکان، گەڕێ، با لە نەزانیی و نەفامیی خۆیاندا بمێننەوە، تاکو ماوەیەکی کەم وازیان لێ بێنە.

(**الغَمْرَةُ: ما يَغْمُرُكَ، والمُراد بـه الحَيرَةُ والغَفْلَـةُ و الضَّلالَـة**)، (**غَمْـرَة**) هـەر شـتێکە تـۆ دابپۆشـێ، لـە ئەصڵـدا بـە ئـاوی زۆر دەگوتـرێ، بـەڵام لێـرەدا مەبەسـت پێـی سەرسـامیی و بـێ ئاگایـی و گومڕاییـە، یانـی: لێیـان گـەڕێ، بـا لـە گومڕایـی و سەرسـامیی و نەفامیـی خۆیـان دا، بمێننـەوە، مـادام گـوێ بـۆ تـۆ ناگـرن.

٤)- ﴿ أَيَحْسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾، ئایا پێیان وایە ئەوەی ئێمە دەیبەخشین بە وان، لە سامان و کوڕان، خێرایی دەکەین لەبەرژەوەندییەکانیان دا ؟ (**الإمدَادُ: إعْطَاءُ المَدَدِ وَهُوَ العَطَاء**)، (**إمدَادُ**): ئەوەیە ئینسان بواری بۆی درێژ بکرێ و، بیدرێتێ.

شایانی باسە: (**أَنَّما**) لە ئەسڵدا (**أَنَّ ما**)یە، یانی: (**أَنَّ الذي**)، ئەوەی کە....

﴿ مِن مَّالٍ وَبَنِينَ ﴾، لـە سـامان و کـوڕان، هـەم سـەروەت و سـامان، هـەم کـوڕان، هەڵبەتـە کچانیـش هـەر بەخششـی خـوان، بـەڵام خـوای پـەروەردگار بـە پێـی عەقڵ و سـەلیقەی خەڵکەکـە، قسـەی کـردوەو، ئـەوان زیاتـر دڵیـان بـە کـوڕان خـۆش بـووەو، بـە پشـت و قوەتیشـیان زانیـون، ئایـا پێیـان وایـە کـە ئەوەیـان بـۆ دەڕەخسـێنین، لـە مـاڵ و سـامان و لـە کـوڕان:

٥)- ﴿ نُسَارِعُ لَهُمْ فِي ٱلْخَيْرَٰتِ ﴾، ئەوە خێرایی دەکەین لە بەرژەوەندییەکانی ئەواندا، (**المسارعة: التعجيل**)، واتە: ئێمە پەلە دەکەین و خێرایی دەکەین، لە چاکەو سوودەکانیاندا؟

٦)- ﴿ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴾، بەڵکو هەست ناکەن، لێرەدا (**بَلْ**) لە ﴿ بَل لَّا يَشْعُرُونَ ﴾دا، (**للإضراب على المظنون لا على الظن**)، (بل) بۆ گواستنەوەیە، نەک لەو گومانەی کە بردوویانە، بەڵکو لەو شتەی کە گومانیان پێبردوە، کە ماڵ و سامان و کوڕان، بۆ ڕەخساندنیانە، دەفەرموێ:

ئەوە نیشانەو بەڵگەی ئەوە نیە کە خوا خۆشی دەوێن و، خێرایی دەکات لە دابین کردنی بەرژەوەندییەکانیاندا، بەڵکو لە ڕاستییدا ئەوان هەست ناکەن، ئەگەرنا ئەوە پەلکێش کردنیانە بەرەو سزای زیاترو، گومڕایی زیاتر.

وشەی (**خیرات**)، کۆی (**خیر**)ە، بە (ا، ت) کۆکراوەتەوە، کە ئەوە لە زمانی عەرەبییدا، لە کۆیە دەگمەنەکانە، (**خیر: خیرات**)، وەک: (**سرادق: سرادقات**)، سەراپەردە، کە ئەو جۆرە کۆیانە کەمن لە زمانی عەرەبییدا، وشەی (**خیر**) بە (ا، ت)، کۆبێتەوە، وەک کۆی مێینە (**جمع المؤنث**).

ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوەی ئەوانەی بەو شێوەیە لە ڕێبازی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، لایانداوەو، ئایینەکەی خۆیان بەش بەش کردوەو، هەر کامێکیان لەسەر بەشێکییەتی و زۆریش دڵخۆشە بە بەشەکەی خۆی و، پێشییوایە دینداریی هەر ئەوەیە کە ئەو دەیکات، خوا بە پێغەمبەری ﷺ فەرموە: لێیان گەڕێ، لەو سەرگەردانییەی خۆیاندا، ماوەیەک بمێننەوەو، دواییش ئەو خەیاڵ و پڵاوەی دەیکەن: کە مادام خوا ﷻ ئیمکانیەتی ماددیی بۆ ڕەخساندوون و، دەستڕۆیشتووی کردوون، کەواتە: دیارە خۆشی دەوێن و لێیان ڕازییە، دوای ئەوەی ئەو خەیاڵپڵاوەشی پووچاندنەوە، ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ئەوە کە کەسانێک خوا خۆشی دەوێن کێن و چۆنن؟

## مەسەلەی سێیەم:

**پێناسەکردنی بەندە نیزیک و پەسندەکانی خوا، بە پێنج لە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانیان:**

١- سام و هەیبەت بەرانبەر بە خوا.

٢- بڕواهێنان بە ئایەتەکانی خوا.

٣- هاوبەش بۆ خوا دانەنان.

٤- بوغڕا نەبوون بە کردەوەی باش.

٥- خێراییکردن و پێشکەوتنەوە لە چاکاندا.

ئنجا ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییەش، کە خوا لە توانا بەدەر لە هیچ کەس داوا ناکات:

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَلَدَيۡنَا كِتَٰبٞ يَنطِقُ بِٱلۡحَقِّۚ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾ بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

ئەوانەی خوای پەروەردگار خۆشی دەوێن و، لە لای بەندەی پەسندن، ئەگەر دەتانەوێ بیانناسن، خاوەنی ئەو پێنج سیفەتە بنەڕەتییانەن، کەواتە: ئەوە بکەنە ئاوێنەیەک و خۆتانی تێدا ببینن، چەندە لەو سیفەتانە لە ئێوەدا هەن و، خاوەنی چەند لەو سیفەتانەن، ئا ئەوانە ئەو بەندانەن کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرانن (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ**

وَالسَّلام) ماون و، لەسەر ڕاستە شەقامی پێغەمبەران دەڕۆن و، لەلای خواش بەندەی پەسندو خۆشەویستن،

١)- ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی کە لە سام و هەیبەتی پەروەردگاریان ترس و لەرزیان بەرانبەر بە خۆیان هەیە، چونکە وشەی (**الخشية: الخوف مع تعظيمٍ**)، (خَشۡيَةِ)، جیاوازیی لەگەڵ (**خوف**)، ئەوەیە (**خوف**)، یانی: لێترسان، بەڵام (خَشۡيَةِ)، ئەوەیە وێڕای لێترسان، بە مەزنگرتنیش هەبێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْۗ ٢٨﴾فاطر، واتە: بەڕاستیی بەندە زاناکان لە خوا دەترسن بە مەزنگرتنەوە، دەزانن خوا چەندە مەزنە، چەندە بەرزە، چونکە زانان بە گەردوونی خوا، بە دروستکراوەکان خوا.

ئنجا ئەوانەی کە بەهۆی ترس و بە مەزن گرتنی پەروەردگاریانەوە، حاڵەتی ئیشفاقیان بۆ دروست بووە بەرانبەر بە خۆیان، (**إشفاق**)یش بریتیە: لەوە کە مرۆڤ پەرۆشی خۆی بێ و، ترس و بیمی لە خۆی هەبێ، کە تووشی سزای خوا بێ، کەواتە: سام و هەیبەت هەبوون بەرانبەر بە خوا ﷻو، دڵ لە مست دا بوون و، دڵ لە ترس و لەرز دابوون، بەرانبەر بە مەزنیی و بەرزایی خوا، ئەمە یەکێکە لە سیفەتە بنەڕەتییەکانی ئەوانەی کە خوا ﷻ خۆشی دەوێن و، بۆ خوا صوڵحاون، نەک لە ئەنجامی ئەوەدا کە کابرا چوار عانەی دێنە گیرفانێ، یاخود سامان و ئیمکانیەتێکی دەبێ، یان دەوری خۆی قەڵەباڵغ دەبینێ، پێی بوغڕا ببێ و، بڵێ: دیارە خوا منی زۆر خۆش دەوێ، ئەها چی داومێ! بێ خەبەر لەوە کە خوا دنیا دەدا بە کەسانێک کە خۆشیدەوێن و کەسانێک کە خۆشیناوێن، بەڵام تەنیا ئەو کەسانە بەرەو ئیمان سەرکەوتوو دەکات و، پەلکێش دەکات، کە خۆشی دەوێن، ئەگەر نا دنیا دەدا بە هەموو کەس! ئنجا بەوە تاقییان دەکاتەوە، ئیماندار داخۆ شوکری لەسەر دەکات، کافریش داخۆ چی پێ دەکات؟ داخۆ بە نیعمەتی خوای دەزانێ و، بەهۆی نیعمەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، یاخود زیاتر پێی بوغڕا دەبێ و، پێی لە خۆبایی دەبێ؟!

٢)- ﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی کە بڕوا بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان دێنن، نیشانەکان (**آیات**):

١- دەگونجێ مەبەست پێی ڕستەکانی قورئان بێ.

٢- یان مەبەست پێی نیشانەکانی پەروەردگار بێ، لە گەردوون و لە دەورووبەردا.

٣- دەشگونجێ مەبەست پێی موعجیزەی پێغەمبەران بێ.

٤- دەشگونجێ مەبەست پێی ئەو ڕووداوانە بێ، کە خوا لە ژیانی بەشەردا هێناونیە دی، هەموو ئەوانە لە قورئاندا بە ئایەت تەعبیریان لێ کراوە، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاق دەزانرێ، کە زیاتر مەبەست پێی ئایەتەکانی قورئانە.

٣)- ﴿ وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی کە هاوبەش بۆ پەروەردگاریان دانانێن، چ هاوبەش دانانی گەورە (**الشرك الأكبر**)، کە مرۆڤی پێ لە بازنەی ئیمان و ئیسلام دەچێتە دەر، چ هاوبەش دانانی گچکە (**الشرك الأصغر**)یش، مرۆڤ پێی گوناهبار دەبێ، بەڵام هەر لە بازنەی ئیمان و ئیسلام دایە، ئێمە لە کۆتایی تەفسیری سووڕەتی (یوسف)دا، بە درێژیی لە بارەی شیرکی گەورەو گچکەوەوە، ئینسان بە چی دەبێ بە موشریک و، شیرک چۆنە و چەند جۆرە؟! بە درێژیی قسەمان لێ کردوە.

٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەی کە هەرچی پێیان دەکرێ، دەیبەخشن، کەچی دڵیشیان لە ترس و لەرزدایە، بەهۆی ئەوەی کە دەگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاریان، یاخود: ﴿ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ ﴾، واتە: هەرچی کە پێیان دەکرێ لە چاکە دەیکەن، چونکە ئینسان کە کردەوەیەک دەکات، وەک ئەوەیە ئەو کردەوەیە ببەخشێ، یانی: هەرچی لە توانایان دایە لە کردەوەی چاک، دەیکەن، کەچی دڵیشیان لە ترس و لەرز دایە، دڵیان لە مستێ دایەو، دڵە ڕاوکەیانە، نەک پێی لە خۆبایی بن بەڵکو، هەرچی پێیان دەکرێ لە چاکە دەیکەن، کەچی پشتێنیشیان لێ نەکردۆتەوەو، پشت بە کردەوەکانیان نابەستن و، بوغڕا نابن و، لە خۆیان دڵنیا نابن،

بەڵكو دڵیان لە مستێ دایە، دەبێ خوا وەری گرتبێ؟ دەبێ ئەوەی كردوومانە شایستەی پایەو مەقامی خوا ﷻ بێ؟!

لێرەشدا ئەم فەرمایشتە دێنینەوە:

{أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ ﴾، قَالَتْ عَائِشَةُ: أَهُمْ الَّذِينَ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ وَيَسْرِقُونَ؟ قَالَ: لاَ يَا بِنْتَ الصِّدِّيقِ! وَلَكِنَّهُمْ الَّذِينَ يَصُومُونَ، وَيُصَلُّونَ، وَيَتَصَدَّقُونَ، وَهُمْ يَخَافُونَ أَنْ لاَ يُقْبَلَ مِنْهُمْ، أُولَئِكَ الَّذِينَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ} (أخرجه الترمذي : ٣١٧٥، وابن ماجه: ٤١٩٨).

واتە: دایكمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ پرسی لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَٰجِعُونَ ﴾، پرسیم: ئایا ئەوانەن كە مەی دەخۆنەوەو، دزیی دەكەن؟ ئەویش فەرمووی: نەخێر، ئەی كچی صیددیق! بەڵكو ئەوانەن كە بە ڕۆژوو دەبن و، نوێژ دەكەن و، خێرو چاكە دەكەن و، دەبەخشن، لەگەڵ ئەوەش دا دەترسن كە خوا لێیان وەرنەگرێ، ئا ئەوانەن كە خێرایی دەكەن لە چاكەكاندا.

بەمجۆرە پێغەمبەر ﷺ وشەو تەعبیرێك، كە هاوەڵان لێیان ئیشكال بووبێ، بۆی ڕوون كردوونەوە.

٥)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾، ئەوانە كەسانێكن خێرایی دەكەن، لە ئەنجامدانی چاكەكاندا، (**الخَيْرُ: مَا يَرْغَبُ فِيه الكُلُّ**)، (**خير**)، هەر شتێكە هەمووكەس بۆی ئارەزوومەندە، (**إبن العربي**) گوتوویەتی: (**خير**)، ئەوەیە كە چاكەی لە زیانی زیاتر بێ، (**شرّ**)یش، ئەوەیە زیانی لە چاكەی زیاتر بێ.

چونكە لە ئەسڵدا (**خير**)، یانی: چاكتر، (**شرّ**)یش یانی: خراپتر.

٦)- ﴿ وَهُمْ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴾، هەروەها ئەوانەن کە لە ئەنجامی چاکەکاندا لە پێشەوەن، پێشکەوتوونەوە، یانی: (**یسبقون إلى أوقاتها: أو وهم مِنْ أَجْل الخَيْرَاتِ سَابقون**)، یانی: خێرایی دەکەن لە کاتی خۆیاندا، ئەنجامیان بدەن، یاخود بە هۆی ئەو چاکانەوە، پێشکەوتوونەوە.

٧)- ﴿ وَلَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، (خوا دەفەرموێ): لە هیچ کەسیش داوا ناکەین، هیچ کەسیش ئەرکدار ناکەین، مەگەر بەوەی لە توانایدا هەیە، خوا ﷻ زیاد لە توانا لە کەس داوا ناکات.

کەواتە: هەرچی خوا فەرزی کردوە، دیارە لە توانای مرۆڤەکاندا هەیە، ئنجا ئەگەر حاڵەتێکی ڕیزپەڕو نائاساییان بۆ هاتە پێش، کە نەتوانن ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن، خوای بەبەزەیی ئەو ئەرکەیان لەسەر سووک دەکات و، لایدەبات، وەک ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان، لە کاتی سەفەرو لە کاتی نەخۆشییدا، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴿١٨٥﴾ ﴾ البقرة.

هەروەها پێنج نوێژەکان لە کاتی سەفەردا کورت دەکرێنەوەو، کۆدەکرێنەوە، بەڵکو کاتی کە لە ماڵیشی، ئەگەر پێویست بوو نوێژەکان کۆدەکرێنەوە.

ئنجا لە کاتی ترسدا، شێوەی ئەنجامدانی نوێژ دەگۆڕێ، وەک لە سوورەتی (النساء)دا، بە تەفصیل باسمان کردوە، لەبەر تیشکی ئایەتی ژمارە (١٠٢)دا.

هەروەها کاتێک کەسێک کە هەڕەشەی کوژرانی جیددیی لێ دەکرێ، بۆی هەیە قسەی کوفر بکات، مادام دڵی ئارامگرتوو بێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ ﴿١٠٦﴾ ﴾ النحل.

کەواتە: ئەو شتانەی خوا فەرزی کردوون، هەموویان لە توانای مرۆڤدان و، هەر کات حاڵەتێکی بۆ بێتە پێش، نەتوانێ پێیەوە پابەند بێ، خوا حوکمەکەی لەسەر سووک دەکات، یاخود بۆی دوا دەخات یان لەسەری لادەبات.

٨)- ﴿وَلَدَيْنَا كِتَٰبٌ يَنطِقُ بِٱلْحَقِّ﴾، ئێمە نووسراوێکمان لەلایە کە بەهەق دەدوێ.

مەبەست پێی لیستی کردەوەکانە، کە خوا هەموو شتێکی تێدا تۆمار دەکات، یاخود مەبەست پێی (**لوح المحفوظ**)ە، کە ئەویش دەگونجێ هێما بێ بۆ زانیاریی بێ سنووری خوا، یاخود تۆمارکردنی کردەوەی مرۆڤەکان، بە شێوەیەک کە ئێستا نایزانین و ناتوانین وێنا (تصوُّر)ی بکەین، وەک لەم ڕۆژگارەدا لە ئەنجامی بەرەو پێشچوونی تەکنۆلۆجیادا، ئێمە هەندێ شێوەی تۆمارکردن دەزانین، کە کاتی خۆی نەبوون، کاتی خۆی کوا ئەوە هەبووە خەڵک بە شێوەی دەنگ و ڕەنگ، بە ڤیدیۆیی وێنەی بگیرێ و، هەموو هەڵسوکەوتەکانی تۆمار بکرێن؟

٩)- ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾، هەروەها ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێ، (**لا یبخسون حقهم**)، ئەو ماف و هەقەی هەیانە، لێیان کەم ناکرێتەوە، واتە: ئەو ئیماندارانە هەرچی کردەوەی چاک ئەنجام دەدەن، هەموویان بۆ تۆمار دەکرێ و، هیچیان لێ کەم ناکرێتەوە.

## مەسەلەی چوارەم:

**باسی بێبڕوایان لە ڕووی سەرگەردانیی و، کردەوە خراپیی و، خۆبەزلگریی و، شەوگار بەسەربردن بەقسەی پووچ و خراپەوە، پاشان هاوارو ڕۆکردنیان، لە کاتی هاتنی سزاو تۆڵەی خوادا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ إِذَا هُمۡ يَجۡـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدۡ كَانَتۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

**١)-** ﴿ بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا ﴾، بەڵکو دڵیان لە بێئاگایی و نەفامیی دایە، لەمەدا، (**هَٰذَا**): ئەمە یانی: (**مَا ذُكِرَ آنِفَاً مِنْ صِفَاتِ المؤمنِين**)، ئەوەی کە باسکرا لە سیفەتی ئیمانداران، ئەو پێنج سیفەتە، یانی: دڵیان لەوە بێ ئاگایە، (**غمرة**) پێشتریش باسمان کرد یانی: ئاوێکی زۆر کە شت نوقم دەکات.

کە لێرەدا نەزانیی و نەفامیی، ئەو وشەیەی بۆ خوازراوەتەوە، چونکە نەزانیی و نەفامییش، جاری وا هەیە ئابڵووقەی دڵ و عەقڵی ئینسان دەدات و، ئەو مرۆڤە نوقم دەکات.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا ﴾، ئەمە: (**إِضْرَابٌ إلى مَا هُوَ أَغْرَبُ مِمَّا سَبَق، وَهُوَ وَصْفُ غَمْرَة أُخْرَى انْغَمَسَ فِيهَا المشْرِكُون**)، پێشتر باسی (**غمرة**)ەمان کرد، کە دەفەرموێ: ﴿ فَذَرۡهُمۡ فِي غَمۡرَتِهِمۡ حَتَّىٰ حِينٍ ﴾، ئنجا ئەمەیان لێدان (**إضراب**)و، گواستنەوەیە بۆ حاڵەتێکی سەیرتر کە بریتیە لە نەزانیی و نەفامییەکی دیکە، کە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان تێیدا نغرۆ بوون.

٢)- ﴿ وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ ﴾، هەروەها چەندان کردەوەیان هەن، جگە لەو هەمووە کردەوانەی باسکران، لە کردەوە خراپەکانیان، چەندان کردەوەی دیکەشیان هەن، هی خراپ.

٣)- ﴿ هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴾، ئەوان ئەنجام دەری ئەو کردەوانەن.

٤)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ ﴾، (ئەوانە لەسەر ئەو حاڵەتەیان بەردەوام دەبن)، تاکو کاتێ کە ئێمە خۆشگوزەرانەکانیان بە سزا دەگرین، سزایان دەدەین، (**حَتَّى: الإبتدائية يَكُونُ مَا بَعْدَهَا شبْتِدَاءَ كَلَامٍ**)، لێرەدا (**حَتَّى**) بۆ ئەوە نیە، حاڵەتێک تاکو حاڵەتێکی دیکە، بەڵکو بۆ سەرەتای ڕستەیە، پێی دەگوترێ: (**حَتَّى: الإبتدائية**)، ئەوەی لە دوایەوە دێ دەسپێکردنی قسەیە، (**مُتۡرَفِيهِم أي: مُنَعَّميهم**)، ئەوانەی ناز پەروەرن، ئەوانەی خۆشگوزەران کراون.

٥)- ﴿ إِذَا هُمۡ يَجۡـَٔرُونَ ﴾، لەو کاتەدا دەست دەکەن بە دادو فیغان و هاوارو ڕۆ ڕۆ، یانی: یەکسەر ئەوان دەبینی هاوارو ڕۆ ڕۆ دەکەن و، دادو فیغان دەکەن، (**الجؤار: الصُّرَاخُ، جَأَرَ يَجَأَرُ: صَرَخَ وضرع**)، (**جُؤار**)، بە مانای هاوارکردن دێ، (**جأر يجأر**)، واتە: هاواری کرد، بە دەنگی بەرز، بە کڕووزانەوەوە.

بەڵام ئایا ئەو کاتە کە خوا ئەو خۆشگوزەرانەیان بە سزا دەگرێ و، ئەوان هاوارو ڕۆ ڕۆو، دادو فیغان دەکەن، دەکڕووزێنەوەو دەلاڵێنەوە، سوودیان پێ دەگەیەنێ؟ نەخێر.

٦)- ﴿ لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، ئەمڕۆ هاوارو ڕۆ ڕۆ مەکەن، سزا لێرەدا وا پێدەچێ مەبەست پێی سزای دنیایی بێ، پێیان دەگوترێ: ئەمڕۆ هاوارو ڕۆڕۆل مەکەن، ئەمە نائومێد کردنیانە لە دەرباز بوون.

٧)- ﴿ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە لەلایەن ئێمەوە سەرناخرێن، واتە: هیچ کەسێک ناتوانێ پەناتان بدات لە سزای ئێمە، یانی: (**إِنَّكُمْ مِنْ عَذَابِنَا لاَ تُنْقَذُون، وِمِنْ جِهَتِنَا لاَ تُنْصَرُون**)، لەلای ئێمەوە هیچ کەس ناتوانێ ئێوە لە سزای ئێمە دەرباز ناکرێن و، سەرتانبخات، پشتانبگرێ.

٨)- ﴿ قَدْ كَانَتْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾، بەدڵنیایی ئایەتەکانی ئێمەتان بەسەردا دەخوێندرانەوە، بێگومان لێرەدا کە دەفەرمووێ: ﴿ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾، مەبەست لە (**آيات**): ئایەتەکانی قورئانە، یانی: ئێوە ئایاتەکانی ئێمەتان بە سەردا دەخوێندرانەوە، بەڵام چیتان دەکرد؟

٩)- ﴿ فَكُنتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ تَنكِصُونَ ﴾، لە جیاتی ئەوەی پێشوازیی لە ئایەتەکانی خوا بکەن، لە فەرمایشتی خوا بکەن، بە دڵ و گیان وەری بگرن، لەسەر سەری دابنێن، کەچی ئێوە لەسەر پاژنە پێیەکانتان دەکشانەوە، (**أعقاب**) کۆی (**عقب**)ە، واتە: پاژنە پێ، (**تنكصون: واتە: ترجعون قهقرى**)، واتە: پاشەو پاش دەکشانەوە، (**النُّكوصُ: الرُّجُوعُ مِنْ حَيْثُ أَتَى، وَهُوَ الفِرَارُ، وَالأَعْقَابُ مُؤَخَّرُ الأَرْجُل**)، (**نكوص**)، ئەوەیە کەسێک چۆن هاتوە، ئاوا بچێتەوە دوا، کە ڕاکردنە، (**أعقاب**)یش، بریتیە لە پاژنە پێ، کۆتایی پێیەکان.

١٠)- ﴿ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ ﴾، (کە دەکشانەوە لەسەر پاژنە پێیەکانتان، لە جیاتی ئەوەی بەرەو ڕووی ئایەتەکان بێن و، پێشوازییان لێ بکەن)، لە بەرانبەر قورئاندا خۆتان بەزلدەگرت، ئەم (بِهِۦ)، ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ ئایەتەکان، چونکە لە مانای قورئاندان، ئەگەرنا دەبووە: (**مستكبرين بها**)، بەڵام ﴿ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ ﴾، واتە: لە بەرانبەر قورئاندا خۆتان بەزلدەگرت، ئنجا کە دەفەرمووێ: ﴿ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ ﴾، لە جیاتی بفەرمووێ: (**مستكبرين عنه**)، (**مستكبرين عليه**)، بۆچی دەفەرمووێ: (بِهِۦ)؟

چونکە (مُسْتَكْبِرِينَ، (**يعني: معرضين عنه، أو: ساخرين به أو: مكذِّبين به**)، واتە: وشەی (مُسْتَكْبِرِينَ)، ئەو مانایانەی خراونە نێو، کە لە زمانی عەڕەبییدا، بنچینەیەک هەیە پێی دەگوترێ: (**التضمين**): خرانە نێو، (مُسْتَكْبِرِينَ)، واتە: خۆبەزلگران، مانا ئەصڵەکەی خۆی هەیە، بەڵام کە بە پیتێکی دیکە بۆ بەرکار تێپەڕ دەکات، کە عادەتی نیە بەو پیتە تێپەڕ بکات، ئەو کاتە بە پێی سروشتی ئەو پیتە، مانایەکی دیکەی دەخرێتە نێو.

ئێستا ﴿ مُسْتَكْبِرِينَ بِهِۦ ﴾ دوو واتای هەن:

**یەک:** لە بەرانبەر قورئاندا خۆتان بەزلدەگرت.

**دوو:** وێڕای خۆبەزلگریی، بە درۆشتان دادەنا، یاخود گاڵتەشتان پێ دەکرد، یاخود پشتیشتان تێدەکرد.

**١١)-** ﴿ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴾، شەوگارتان بەسەردەبرد، قسەی پووچ و بێ واتاو، بێ کەڵکتان دەکرد، (**سَامِر: إسم لِجَمْعِ السَّامِرِين كَالحَاجِّ، وَالحَاضِر، بِمَعْنَى الحُجَّاج وَالحَاضِرِين**) چونکە دەفەرموێ: ﴿ سَٰمِرًا تَهْجُرُونَ ﴾، لێرەدا (**سامر**)، یانی: یەک کەس کە شەوگار بەسەردەبات، شەونخوونیی دەکات و، لە شەوێدا قسە دەکات، بەڵام مادام دوایی دەفەرموێ: ﴿ تَهْجُرُونَ ﴾، بە کۆ (جمع) هێناویەتی، کەواتە: (**سامر**)یش، ناوە بۆ کۆی ئەوانەی شەوگار بەسەر دەبەن، وەک: (**حاج**)، واتە: حاجییەکان و، (**حاضر**)، واتە: ئامادەبووەکان.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئێوە شەوگارتان بەسەردەبرد، بە قسەی پووچ و بێ واتا.

وشەی (**سَامِر**) لە (**سَمْر**)ەوە، هاتوە، (**سَمْرُ اللَّيلِ أي: ظُلْمَتُهُ**)، تارییکی شەو.

وشەی ﴿ تَهْجُرُونَ ﴾، بە دوو جۆر خوێنراوەتەوە: (**تَهْجُرون**)و (**تُهْجِرون**).

**أ-** (**تُهجِرُون**)، (**مضارع**)ی، (**أَهْجَر، يُهْجِر**)، ئەو کاتە (**الْهُجْرُ بِضَمِّ الْهَاءِ وَسُكُونِ الْجِيمِ: وَهُوَ اللَّغْوُ وَالسبُّ وَالْكَلَام السّيء**) (**هُجْرُ**) قسەی پووچ و جنێوو قسەی خراپ.

**ب-** بەڵام ئەگەر (**تَهْجُرون**) بێ: (**تهجرون، الهَجْر: مِنْ هَجَر إذا لغا**)، یانی: قسەی پووچ و بێ واتاو، بێ کەڵکی کرد.

لە بارەی قسەکردنەوە لە شەودا، ئەم دوو فەرمووەدەیە دێنێن:

**١)-** {**عَنْ سَيَّارِ بْنِ سَلَامَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا بَرْزَةَ الأَسْلَمِيَّ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُؤَخِّرُ الْعِشَاءَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ، وَيَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَهَا وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا...**} (**أخرجه البخاري: ٥٤٠٧، ومسلم: ٦٤٧، وأبو داود: ٣٩٨**).

واتە: سەییاری کوڕی سەلامە دەڵێ: لە ئەبوو بەرەزەم بیست دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ جاری وابوو، نوێژی خەوتنانی دوادەخست بۆ سێیەکی شەوو،

حەزی نەدەكرد لە پێش نوێژی خەوتناندا بخەوێ و، حەزیشی نەدەكرد لە دوای نوێژی خەوتنان قسە بكات.

ئەوە لە حاڵەتی ئاسایی دا، بەڵام دیارە ئەگەر شتێكی پێویست هاتبێتە پێش، وەک لە (**صحيح البخاري**) دا هاتوە، پێغەمبەر ﷺ جاری وا هەبووە، تاكو نوێژی بەیانیی نەخەوتوەو، قسەو باسی كردوەو تەگبیری كردوەو، ڕاوێژی كردوە بە هاوەڵانی، بەڵام بە زۆریی بنچینەی وابووە، لە پێش نوێژی خەوتناندا نەخەوتوەو، دوای نوێژی خەوتنانیش قسەی نەكردوون.

**٢)- {إِيَّاكُمْ وَالسَّمَرَ بَعْدَ هَدْأَةِ الرِّجْلِ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لاَ يَدْرِي مَا يَبُثُّ اللَّهُ تَعَالَى مِنْ خَلْقِهِ، وَأَغْلِقُوا الْأَبْوَابَ، وَأَوْكِوا السِّقَاءَ، وَخَمِّرُوا الْإِنَاءَ، وَأَطْفِئُوا الْمِصْبَاحَ} (أخرجه البخاري في الأدب المفرد::١٢٣٠).**

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: دوای ئەوەی خەڵک ئارام دەگرێ، لەشەوگاردا، شەونخوونیی مەكەن و، مەمێننەوە، چونكە هیچ یەكێک لە ئێوە نازانێ خوای بەرز لە شەوگاردا، چی لە دروستكراوەكانی خۆی بڵاودەكاتەوە، دەرگاكان پێوەدەن و، زاری مەشكەو كوندە، (ئەو دەفرانەی كە ئاو یان شلەمەنییان تێ دەكرێ)، ببەستن، قاپ و مەنجەڵ و كە خواردنیان تێدایە داپۆشن و، چراش بكوژێننەوە.

كاتی خۆی چرا فتیلەی هەبووەو، بە نەوت یان زەیت ئایساوە، مەترسیی هەبووە دوایی ماڵەكە گڕ بگرێ، هەر وەک ئێستاش زۆر جاران لە ئەنجامی بەكارهێنانی هیتەرو نەوت و غازو شۆڕتی كارەباوە، موصیبەت و بەڵا لەو بارەوە دەكەونەوە، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەم ڕۆژگارەش هەر ڕێنماییە.

**مەسەلەی پێنجەم:**

**خستنەڕووی هۆکارە ڕاستەقینەکانی بێبڕوایی کافرەکان و بیانووە بێ جێیەکانیان و پووچەڵکردنەوەیان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمْ لَمْ يَعْرِفُوا۟ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۚ بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلْحَقُّ أَهْوَآءَهُمْ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِذِكْرِهِمْ فَهُمْ عَن ذِكْرِهِم مُّعْرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ خَرْجًا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَلَمْ يَدَّبَّرُوا۟ ٱلْقَوْلَ ﴾، ئایا لە قسەکەوە ڕانەماون! کام فەرمایشتە؟بێگومان فەرمایشتی خوا (قوڕئان)، ئایا لە قوڕئان ڕانەماون؟ بۆیە بڕوای پێناهێنن؟ کە بە تەئکید وایە، هەر کەسێ لە قوڕئان تێبفکرێ، تێی ڕامێنێ، تێیدا قووڵبێتەوە، بە تەئکید ئەگەر ڕێزی عەقڵ و دڵی خۆی بگرێ و، بەرژەوەندیی ناشەرعیی ڕێی لێ نەگرێ و، لاسایی کردنەوەی کوێرانە ڕێی لێ نەگرێ، ئیمان دێنێ.

٢)- ﴿ أَمْ جَآءَهُم مَّا لَمْ يَأْتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، یان ئایا (بۆیە بڕواناهێنن بە قوڕئان)، لەبەر ئەوەی شتێکیان بۆ هاتوە، کە نەهاتبوو بۆ باب و باپیرانی پێشوویان؟ واتە: ئەوە هۆکاری بڕوا نەهێنانەکەیانە، کە لاسایی کەرەوەی کوێرانەی پێشووی خۆیانن، کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ جَآءَهُم مَّا ﴾، (ما): (الذي)، یانی: ئاینێکیان بۆ هاتوە، پەیام و بەرنامەکیان بۆ هاتوە، کە بۆ باب و باپیرانی پێشوویان نەهاتوە؟، ئنجا مادام باب و باپیرانی پێشوویان لەسەری نەبوون، ئەوانیش هەر شتێک پێشووەکانیان لەسەری نەبووبن، هەر لە ڕێوە، ڕەفزی دەکەن.

٣)- ﴿أَمْ لَمْ يَعْرِفُواْ رَسُولَهُمْ فَهُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ﴾، یاخود (بە هۆی ئەوەوە بڕواناهێنن)، کە پێغەمبەرەکەیان ناناسن، بۆیە نکوولّیی لێدەکەن؟ بەڵکو لە ڕاستیی دا باشیان ناسیوە، بەڵام حەسوودییان پێ بردوە، وەک لەو وتووویژەی نێوان (**الأخنس بن شريق**)و (**أبو جهل**)دا هاتوە، کە ئەخنەس لێی دەپرسێ، ئایا تۆ نازانی کە موحەممەد ﷺ ڕاست دەکات؟ ئەویش دەڵێ: درۆمان لە موحەممەد نەبیستوە، دەڵێ: ئەدی بۆچی بڕوای پێ ناهێنن؟ دەڵێ: لەبەر ئەوەی عەشیرەتی ئێمە (**بنو عبد الشمس**) لەگەڵ (**بنو هاشم**)دا، هەر پێشبڕکێمان بووە، ئەوان کارێکیان کردوەو، ئێمەش کارێکی دیکەمان کردوە، وەک دوو ئەسپ کە پێشبڕکە دەکەن، ئێستا ئەوان دەڵێن: پێغەمبەرێکمان لە نێودا هاتوە، ئێمە چۆن بە دوای پێغەمبەرەکەی وان بکەوین، بۆیە بڕوای پێ ناهێنین![1]

٤)- ﴿أَمْ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢ﴾، یان ئایا (هۆی بڕوا نەهێنانیان بە موحەممەد ﷺ، ئەوەیە) دەڵێن: شێتیی تێدایە، ئایا هۆکاری بڕوانەهێنانیان ئەوەیە کە دەڵێن: موحەممەد شێتە؟ کوان نیشانەکانی شێتیی؟ کەم و زۆری کوا لە موحەممەددا ﷺ هەن؟ کە لە لووتکەی عەقڵ و، حیکمەت و، مەعریفەت و، نەجابەت و، هەموو سیفەتێکی بەرز دایە؟!

٥)- ﴿بَلْ جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ﴾، بەڵکو (ڕاستییەکەی ئەوەیە کە) ئەو هەقی بۆ هێناون.

ئەوانیش هەق ڕەفز دەکەن و، دانوویان لەگەڵ هەقیدا ناکوڵێ، ئەویش بەس هەقی پێیە، بۆیە بڕوای پێ ناهێنن.

٦)- ﴿وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ﴾، (هۆکارەکەی ئەوەیە) کە زۆربەی ئەوانەش ڕقیان لە هەق هەڵدەستێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَأَكْثَرُهُمْ﴾، چونکە هەشیان بووە، هەقی خۆشویستوەو دوایی مسوڵمان بووە.

خوا ﷻ هێندەی گەردیلەیەک زێدەڕۆیی لە فەرمایشتەکەی دا نیە، دەفەرموێ: ﴿وَأَكْثَرُهُمْ لِلْحَقِّ﴾، زۆربەیان ڕقیان لە هەق هەڵدەستێ و، دانوویان لەگەڵیدا ناکوڵێ، چونکە دوایی هەندێکیان بڕوایان پێ هێناوە.

(١) السيرة النبوية لابن هشام: ج١، ص١٥٩.

وشەی (الحَقُّ: الثَّابتُ فِي الوَاقِعِ وَنَفْسِ الأَمْر)، (حق)، شتی چەسپاوەو، پێکەڵ پێکە لەگەڵ ئەوەی کە لە واقیعدا هەیە.

٧)- ﴿ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾، ئنجا ئەگەر هەق بە دوای ئارەزووەکانی ئەوان کەوتبایە، ئەوە ئاسمانەکان و زەوی و، هەر کەسێ کە تێیان دایە، هەمووی تێکدەچوو.

واتە: ئەگەر ئەو هەقەی کە خوا دایبەزاندوە، بە پێی ئارەزووی ئەوان بووایە، ئەوە پێچەوانەی هەموو سیستمی گەردوونەو، بە سەرەوەو خوارەوە، بە ئاسمان و زەوییەوە.

٨)- ﴿ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ ﴾، بەڵکو ئێمە یادخەرەوەی خۆیانیانمان بۆ هێناون.

(الذِّكْرُ: مَصْدَرٌ بِمَعْنَى التَّذْكِير، أو اسْمٌ لِلْكَلَامِ الَّذِي يُذَكِّرُ سَامِعِيهِ بِمَا غَفَلُوا عَنْهُ)، (ذِكْر) چاوگە بە مانای بیرخەرەوە، یاخود ناوە بۆ قسەیەک کە بیری بیسەرەکان دەخاتەوە، ئەو شتەی لێی بێئاگا بوون.

بەڵام دەشگونجێ بڵێن: ﴿ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ ﴾، وەک لە جێی دیکە فەرموویەتی: (إِنَّهُ لَذِكْرٌ لَكَ وَلِقَولِك)، (ذِكْر)، هەم بە مانای بیرخەرەوە دێ، هەم بە مانای شەرەف و ڕێزو ناوو ناوبانگیش دێ.

٩)- ﴿ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ﴾، ئەوان لەوە کە بیرخەرەوەو ئامۆژگارییکاریانە، یان مایەی ناو بانگ و شۆرەتیانە، پشت هەڵکردوون.

١٠)- ﴿ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا ﴾، یان ئایا (هۆی بڕوا نەهێنانیان ئەوەیە) کە تۆ داوای خەرجییان لێ دەکەی، داوای مەصرەف و ماڵ و سامانیان لێ دەکەی، (الخَرْجُ: العَطَاءُ المُعَيَّنُ عَلَى الذَّوَاتِ، أَو عَلَى الأَرَضِين، وَالخَرَاجُ وَالخَرْجُ وَاحِدٌ، وَقِيلَ الخَرْجُ مَا يُعْطَى تَبَرُّعاً، وَالخَرَاجُ لاَزِم)، (خَرْج) بریتیە لە بەخشینێکی دیارییکراو کە شەخصەکان دەیدەن، یاخود لەسەر زەوی دادەنرێ، (خرج وخراج)، هەندێک گوتوویانە: یەکن، هەندێکیش

گوتوویانە: (خَرْج) ئەوەیە کە خۆبەخشانە دەدرێ، بەڵام (خراج)، ئەوەیە کە پێویستە بدرێ و پێویست دەکرێ، ئایا تۆ داوای خەرجییان لێ دەکەی؟ داوای مەصرەفیان لێدەکەی؟ بارگرانییان دەخەیە سەر شان، بۆیە بڕوا ناهێنن؟!

١١)- ﴿ فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (فَخَرْجُ رَبّكَ خَيْرٌ) یانی: خەرجییەک و بژیوێک و ڕۆزییەک کە پەروەردگارت دەیدات، چاکترە، ﴿ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، ئەویش باشترینی بژیو دەرانە.

١٢)- ﴿ وَإِنَّكَ لَتَدْعُوهُمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، بە دڵنیایی تۆ ئەوان بانگ دەکەی بۆ ڕاستە شەقام، وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ، لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا، لاَ يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلاَّ هَالِكٌ**} (**أخرجه أحمد: ١٧١٨٢، وابن ماجه: ٤٣، والحاكم: ٣٣١، عَنْ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ**).

واتە: مسۆگەر ئێوەم لەسەر ڕاستە شەقامێکی سپی و ڕوون، بەجێهێشتوە، شەوەکەیشی وەک ڕۆژەکەیەتی، لە دوای من مەگەر کەسێک بۆ خۆی حەزی لە فەوتان بێ، ئەگەرنا کەس لێی لانادا.

١٣)- ﴿ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە، ئەوانە لە ڕاستە شەقام لادەدەن، (**النَّاكِبُ: العَادِلُ عَنِ الشَّيءِ، وَالمُعْرِضُ عَنْهُ**) (ناکب) لادەرە لە شتێک، کە پشتی تێبکات و وازی لێ بێنێ، واتە: بە هۆی بڕوانەهێنانیانەوە بە ڕۆژی دوایی و، بە دیداری خوا، بۆیە لە ڕاستە شەقام لادەدەن، ئەگەرنا ئەگەر بڕوایان بە دیداری خوا هەبووایە، کە دەچنەوە خزمەت خواو بەردەستی خوا، ئێستا ڕاستە شەقامی خوایان دەگرت.

### مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە ئەگەر گریمان خوا بەزەیی پێیاندا هاتبایەو، ئەو نارەحەتییەی لێ لابردبان، کە بە دەستییەوە گرفتارن، دیسان هەر لەسەر سەرکێشیی خۆیان مکوڕ دەبوون، بە بەڵگەی ئەوە کە دوای ئازار درانیان بە ملکەچیی و کڕووزانەوەوە، نەگەڕانەوە لای خوا، بۆیە هەر کات دەرگای سزایەکی سەختیان بەسەردا بکاتەوە، تەمابڕاوو نائومێد دەبن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ فَمَا ٱسْتَكَانُواْ لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

**١)-** ﴿ وَلَوْ رَحِمْنَٰهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّواْ فِي طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾، ئەگەر ئێمە بەزەییمان لەگەڵ نواندبانایەو، ئەو ئازارو نارەحەتییەی کە بەرۆکی گرتوون و، بە دەستییەوە گرفتارن، لێمان لابردبان، لەسەر سەرکێشیی و یاخیبوونی خۆیان هەر بەردەوام دەبوون و، سەراسیمەو سەرگەردان دەبوون.

(**كَشَفْنَا: أَزَلْنَا**)، لامان بردبایە، (**اللَّجَاجُ: الإِسْتِمْرَارُ عَلَى الخِصَامِ وَعَدَمُ الإِقْلاعِ عنه**)، (**لجاج**)، بریتیە لە بەردەوام بوون لەسەر ناکۆکیی و دووبەرەکیی و دەست لێهەڵنەگرتنی، (**الطُّغْيَانُ: أَشَدُّ الكِبْرِ، وَتَجَاوزُ الحَدِّ**)، (**طغيان**) یانی: یاخیبوون و سەرکێشیی و سنوور بەزاندن، (**العَمَهُ: التَرَدُّدُ في الضَّلاَلَةِ**)، (**عَمَهُ**) بریتیە لە سەراسیمە بوون لە گومڕایی دا، کە ئینسان نەزانێ چی بکات؟

**٢)-** ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ ﴾، ئنجا بەڵگە چییە کە خوا دەفەرموێ: ئەگەر بەزەییشمان پێیاندا هاتباو، ئەو ئازارو نارەحەتییەی لێشیانە، لامانبردبایە، هەر لەسەر

سەرکێشیی خۆیان بەردەوام دەبوون؟ دەفەرمویٚ: بە دڵنیایی ئێمە بە سزاو ئازار گرتمانن، لە ڕابردوودا، (**التَّعْرِيفُ فِي قَوْلِهِ بِالْعَذابِ لِلْعَهْدِ، أَيْ بِالْعَذَابِ الْمَذْكُورِ، حَتَّى إِذا أَخَذْنا مُتْرَفِيهِمْ بِالْعَذابِ**)، (**أل**)ی ناساندن بۆ (**عهد**)ە، واتە: سزایەکە، ئازارەکە، ئەوەی کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡعَذَابِ ﴾، هەتا کاتیٚ کە خۆشگوزەرانەکانمان بە سزا گرتن، ئەو سزایە کە زانراوە.

**٣)-** ﴿ فَمَا ٱسۡتَكَانُواْ لِرَبِّهِمۡ ﴾، کەچی بۆ پەروەردگاریان نەکڕووزانەوەو ملکەچ نەبوون و، لێی نەپاڕانەوە، (**الإِسْتِكَانَة: مَصْدَرٌ، بِمَعْنَى الخُضُوعِ مُشْتَقَّةٌ مِنَ السّكُونِ**)، (**إِسْتِكَانَة**) چاوگە بە مانای ملکەچیی، کە لە (**سكون**)ەوە، هاتوە، (**سَكَنَ، يَسْكُنُ، سكُونَاً**)، یانی: ئارام بوو، بێدەنگ بوو، ڕاوەستا، ئەوانە بۆ پەروەردگاریان ملکەچ نەبوون، دانەسەکنان.

**٤)-** ﴿ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴾، لێشی نەپاڕانەوە بە کڕووزانەوەو لاڵانەوەوە.

**٥)-** ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا ذَا عَذَابٖ شَدِيدٍ إِذَا هُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ ﴾، (ئیدی لەسەر ئەوە بەردەوام بوون)، هەتا کاتیٚ کە دەرگای سزایەکی سەختمان لیٚ کردنەوە، ئەو کاتە لەو سزایەدا نائومێد دەبن، تەمابڕوا دەبن.

(**الإِبْلاَسُ: شِدَّةُ اليَأسِ مِنَ النَّجَاة**)، (**إِبْلاَس**)، بریتیە لە نائومێدییەکی سەخت، لە دەرباز بوون، دەگوتریٚ: (**أَبْلَسَ: أَي ذَلَّ وَيَئِسَ مِنَ التخَلُّصِ**)، زەبوون بووو، نائومێد بوو لەوەی کە نەجاتی ببیٚ، کەواتە: هۆکارەکانی بڕوانەهێنانی کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بە موحەممەد ﷺ ئەم هەشتانە بوون:

**١)-** بیرنەکردنەوە لە قورئان و تێڕانەمانی.

**٢)-** لاسایی کردنەوەی کوێرانەی پێشینان.

**٣)-** نەناسینی پێغەمبەر ﷺ یاخود: خۆ لیٚ نەشارەزا کردنی و، خۆ لیٚ گێل کردنی.

**٤)-** ئەو تۆمەتەیان کە گوایە شێتیی تێدایە، جۆرێك لە شێتی، چونکە وەك پێشتریش گوتمان: تەنوینی (**جنّـةٌ**) بۆ جۆرە.

٥)- ڕق هەڵسانیان لە هەق.

٦)- پشت هەڵکردنیان لە شتێک کە بیریان دەخاتەوەو، مایەی شەڕەف و ڕێزیانە.

٧)- ئایا پێغەمبەر ﷺ داوای خەرجیی و مەصرەفیان لێ دەکات؟ کە بە تەئکید وا نەبووە.

٨)- لە ڕاستە شەقام لایانداوە، لەبەر ئەوەی بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە.

ئا ئەوانە هۆکارەکان و، بیانووەکانی کافرەکان بوون، لە بەرانبەر بڕوانەهێنان بە پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە بیست و یەک (٢١) ئایەت پێک دێ، ئایەتەکانی: (٧٨ - ٩٨)، سورگەی سەرەکیی ئەم دەرسەمان، باسی خوای بەرزو مەزن و، سیفەت و کردەوە بێ وێنەکانی و، باسی زیندووکرانەوەو باسی پاداشت و، باسی یەکتایی خوایە ﷻ.

لە کۆتایی دا چەند ڕێنماییەکی گەورەو گرنگ ئاڕاستەی پێغەمبەری خوا ﷺو، شوێنکەوتووانی کراون، لە بارەی چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ دەوروبەر، بە تایبەت نەیارانی لادەرو ستەمکاریاندا.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٩٠﴾ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَٰلِمِ

ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَٰدِرُونَ ﴿٩٥﴾ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە کە بیستن و، دیتنەکان و، عەقڵەکانی بۆ ڕەخساندوون (کەچی) بە کەمیی سوپاسگوزاریی بۆ دەکەن ﴿٧٨﴾ هەروەها (خوا) ئەو کەسەیە کە لە زەویدا دروستیکردوون و بڵاوی کردوونەوەو، هەر بۆ لای ویش کۆدەکرێنەوە ﴿٧٩﴾ دیسان (خوا) ئەو کەسەیە کە دەژیەنێ و، دەمرێنێ و، جێگۆڕکەو جیاوازیی شەوو ڕۆژانیش هەر هی ویە (و بەدەست ویە)، ئایا نافامن (کە جگە لەو شایستەی پەرستران نیە)! ﴿٨٠﴾ بەڵکو ئەوانیش وەک قسەی پێشووەکانیان گوت ﴿٨١﴾ گوتیان: ئایا ئەگەر مردین و بووینە گڵ و ئێسک (ی پرتووکاو)، ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟! ﴿٨٢﴾ ئەو بەڵێنە پێشتریش بە ئێمەو باب و باپیرانیشمان درابوو، ئەمە تەنیا ئەفسانەکانی پێشینانە ﴿٨٣﴾ بڵێ: زەوی و هەر کەس کە تێیدایە، هی کێیە، ئەگەر بزانن؟! ﴿٨٤﴾ دەڵێن: هی خوایە، بڵێ: ئەدی بۆچی بیرناکەنەوە (کە خوایەک خاوەنی هەموو شتێک بێ، دەشتوانێ مردووان زیندوو بکاتەوە)! ﴿٨٥﴾ بڵێ: کێ خاوەن و پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و، پەروەردگاری بارەگای مەزنە؟ ﴿٨٦﴾ دەڵێن: (هەمووی) هی خوایە، بڵێ: ئەدی خۆتان (بە هۆی ئیمانەوە لە سزایەکەی) ناپارێزن؟! ﴿٨٧﴾ بڵێ: کێ بە تەواویی حوکمڕانیی و موڵکی هەموو شتێکی بەدەستەوە، بەس ئەو هەر کەس بیەوێ، پەنای دەدات و دەیپارێزێ و، هیچکەسی لێ پەنا نادرێ و ناپارێزرێ، ئەگەر

بزانن (ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە)؟ ﴿٨٨﴾ دیسان دەڵێن: هەموو شتێک تەنیا هی خوایەو، بەس ئەویش پەنا دەدات، بڵێ: ئەدی چۆن جادووتان لێ دەکرێ (عەقڵ و هۆشتان کار ناکات و، جگە لە خوا دەپەرستن)؟! ﴿٨٩﴾ (وانیە کە ئەوان گومان دەبەن) بەڵکو ئێمە هەقمان بۆ هێناون و، ئەوانیش درۆکارن (کە دەڵێن: خوا هاوبەشی هەن) ﴿٩٠﴾ خوا نە ڕۆڵەی بۆ خۆی داناوەو، نە هیچ پەرستراویشی لەگەڵن (وەک ئەوان ئیددیعا دەکەن) ئەگەر گریمان وابووایە، هەر پەرستراوە دروستکراوی خۆی دەگرت و بەڕێوەی دەبردو، لە نێوانیشیاندا دەبووە کێشەو، خۆیان بەسەر یەکدی دا بەرز دەکردەوە! (ئنجا مادام ئەو حاڵەتە گریمانەییانە هیچیان دیارنین، کەواتە: قسەکەتان ڕاست نیەو) پاکیی بۆ خوا لەوەی پێی وەسف دەکەن ﴿٩١﴾ (خوا) زانای پەنهان و ئاشکرایە، بەرزیی بۆوی لەوەی دەیکەنە هاوبەشی ﴿٩٢﴾ بڵێ: پەروەردگارم! هەر کات ئەو (سزای) ەی هەڕەشەی پێدەکەی لێیان، پێشانت دام ﴿٩٣﴾ پەروەردگارم! (لە سزاداندا) مەمخە گەڵ کۆمەڵی ستەمکاران ﴿٩٤﴾ بە دڵنیاییش ئێمە تواناداریـن کە ئەوەی هەڕەشەی پێی لێیان دەکەین، پێشانتی بدەین ﴿٩٥﴾ (کەواتە:) تۆ بە کام شێواز باشترە، خراپە (ی وان) بەرپەرچ بدەوە، خۆمان زاناترین بەوەی باسی دەکەن (لە شیرک و کوفرو بێ ڕێزیی بەرانبەر بە خوا) ﴿٩٦﴾ هەورەها بشڵێ: پەروەردگارم! پەنات پێ دەگرم لە دنەدان و خوتخوتەی شەیتانەکان ﴿٩٧﴾ پەروەردگارم پەناشت دێنمەبەر لەوەی لەلام ئامادەبن (و تێکەڵی ئیش و کارم بن) ﴿٩٨﴾))

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَنشَأَ): پێیگەیانـدوە، (النَّشْـأُ وَالنَّشْـأَةُ: إِحْـدَاثُ الـشَّيءِ وَتَربِيَتُـهُ) (نَشْـأ) و (نَشْـأَةٌ) واتـە: پەیداکـردنی شـتێک و پـەروەردە کـردنی، پەیداکـردنی پلـە پلـە، وەک خـوا لـە سـوورەتی (الرعـد)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ ﴾، واتـە: هـەورە قورسـەکان پێدەگەیەنـێ و پێکدێنـێ و دروسـت دەکات، لەبـەر ئـەوەی هـەور پلـە پلـە دروسـت دەکـرێ.

(ذَرَأَكُمْ): واتـە: دروسـتی کـردن و بـڵاوی کردنـەوە، (الـذَّرْأُ: إِظْهَـارُ اللهِ مَـا أَبْـدَاهُ، ذَرَأَ اللهُ الخَلْـقَ: أَوْجَـدَ أَشْـخَاصَهُم) (ذَرْأ) بريتيـە لـەوەی شـتێک کـە خـوا دروسـتی کـردوە، دەریبخـات، دەگوتـرێ: (أَوْجَـدَ أَشْـخَاصَهُم) واتـە: جەسـتەکەیانی دروسـتکرد، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا (ذَرَأَ) یانـی: (بـثَّ) بڵاویکـردەوە، وەک لـە ئایـەتی یەکەمی سـوورەتی (النسـاء)دا هاتـوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ... ﴿١﴾ ﴾، (بَـثَّ منهـما رجـالًا كثيراً ونسـاءً) واتـە: لـەو دووانـە کـە ئـادەم و حـەووان، (خـوا) پیـاوان و ئافرەتانێکـی زۆری بڵاوکردوونـەوە.

(أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ): واتـە: ئەفسـانەکانی پێشـینان، (أَسَـاطِير: جَمْـعُ أَسْـطُورَة، نَحْـو أُرْجُوحَـةَ وأَرَاجِيـح، وَأُثْفِيَّـة وَأَثَافِـي، وأُحْدُوثَـة وَأَحَادِيـث)، (أَسَـاطِير) کـۆی (أَسْـطُورَة)یە، (أَسْـطُورَة) واتـە: ئەفسـانە، شـتێک کـە بنەمایەکـی نەبـێ، وەک (أُرْجُوحَـةَ) جۆڵانـە، کـە بـە (أراجيـح) کۆدەکرێتـەوە، (أُثْفِيَّـة) سـێکوچکە کـە مەنجەڵیـان لەسـەر داناوەو بـە (أَثَافِـي) کۆدەکرێتـەوە، (أُحْدُوثَـة) ڕووداوێکـی سـەر سـوڕهێنەرو سـەیر کـە بـە (أَحَادِيـث) کۆدەکرێتـەوە

(مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ): (المَلَكُـوتُ: مُخْتَـصٌّ بِمُلْـكِ اللهِ تَعَـالَى وَهُـوَ مَصْـدَرُ مُلْـك، أُدْخِلَـتْ فيـهِ التّـاء، نَحْـو رَحَمُـوت وَرَهَبُـوت)، کەسێک شـتێکی هەبـێ دەگوتـرێ: ئـەو

شتە موڵکی فڵانە، واتە: لەبەر دەستیەتی، (ملكوت) تایبەتە بە خوای بەرزەوە، کە چاوگی (**مُلْك**)ەو، (ت)ای خراوەتە سەر، بۆ ئەوەی مانایەکەی بەهێزتر بێ، وەک (**رحموت، رهبوت، جبروت**) کە ئەو کاتە ماناکەیان بەهێزتر دەبێ.

(**يُجِيرُ**): پەنادەدات، (**اسْتَجَرْتُهُ، فَأَجَارَنِي**) واتە: داوای پەنادانم کرد، ئەویش پەنای دام، (**وَالجَارُ مَا يَقرب مَسْكَنهُ مِنْكَ**) (جار) ئەوەیە کە ماڵێ لێتەوە نزیکە، یانی: تۆ ئەوت پەنا داوەو، ئەویش تۆی پەنا داوە.

(**هَمَزَاتِ**): کۆی (همز)ە، (**الهَمْزُ كَالعَصْرِ، هَمَزْتُ الشَّيءَ فِي كَفِّيٍّ، وَهمْزُ الإِنْسَانِ: اعتِيَابُه**)، (همز) وەک (عصر) وایە، دەگوترێ: (**هَمَزْتُ الشَّيءَ فِي كَفِّيٍّ**) شتەکەم لە نێو دەستی خۆمدا گوشی، (**هَمَزَ الإِنسانَ**)، یانی: بە خراپە باسی مرۆڤەکەی کرد (**الهمز حقيقَتُهُ: الضغط باليد وَالطَّعْنُ بالأُصْبُعِ ونحوه، وَيُسْتَعْمَلُ مَجَازاً بِمَعْنَى الأَذَى بالقَولِ أو بالإشارة** ﴿هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ١١﴾**القلم**، ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١﴾**الهمزة**)، وشەی (همز) مانا ئەصڵییەکەی بریتیە لە گوشارکردن بە دەست و پەنجەو وێنەی ئەوانە، بە مەجازیش بەکاردەهێنرێ بۆ ئەزیەتدان بە قسە یان بە ئاماژە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿هَمَّازٍ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ١١﴾، واتە: ئەو کەسەی زۆر قسە دێنێ و دەبات، ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١﴾، یانی: سزای سەخت بۆ هەر کەسێک کە پاشملەو ڕووبەڕوو خەڵک دەشکێنێتەوە. (**الهمزات جمع همزة، والهمز النَّخْس والدفع**)، وشەی (همزات) کۆی (**همزة**)یە، (همز) بریتیە لە نقورچ لێدان و پاڵ پێوەنان.

# مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ وەک لـە پێناسـەی ئـەم دەرسـەدا گوتمـان: لـە دوو توێـی ئـەم بیسـت و یـەک (٢١) ئایەتـەدا، سـەرەتا چەنـد پرسـیارێک دەکات و، چەنـد ڕاسـتییەک دەخاتـە ڕوو، دەربـارەی دەسـەڵاتی خـۆی و، دەسترۆیشـتوویەتی خـۆی، نیعمـەت و چاکەکانـی لـە ژیانـی مرۆڤـەکان دا، دوایـی چەنـد قسـەیەکی بـێ بنەمـای ئـەوان دەخاتـە ڕوو، پاشـان چەنـد پرسـیارێکی وا کـە نەتوانـن بـە نەرێنیـی وەڵامبدەنـەوە، دەکات و، لـە کۆتاییشـدا چەنـد ڕێنماییـەک بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺو شـوێنکەوتووانی ڕادەگەیەنێ، لـە چۆنیەتـی مامەڵەکـردن لەگـەڵ دەوروبەریانـدا، بـە تایبـەت نەیارانـی ستەمکاریان:

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلًا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴾، واتـە: خـوا ﷻ وێـڕای ئـەو شـتانەی کـە لـە ڕابـردوودا باسـکران، ئـەو کەسـەیە، ئـەو زاتەیـە کـە بیسـتن و دیتنـەکان و عەقڵەکانـی بـۆ ئێـوە پێکەیانـدوون، بـە کەمیـی نەبـێ سوپاسـگوزاریی ناکـەن، بۆیـە وشـەی (سـمع)، وەک دوایـی لە مەسـەلە گرنگەکانیشـدا باسـی دەکەین، لـە قورئانـدا بـە تـاک هاتـوە، وەک چـاوگ، لەبەرئـەوەی بیسـتراوەکان (**مسـموعات**) یـەک جـۆرن، دەنگەکانـن، بـەڵام هەمیشـە (أبصـار)، بـە کـۆ هاتـوە، کـە کـۆی (**بـصر**) ە، لەبـەر ئـەوەی بینـدراوەکان (مرئیـات) زۆرو جـۆراو جـۆرن، (**أفئـدة**)ش، کـۆی (**فـؤاد**)ە، زۆرێـک لـە توێـژەرەوان و، لـە زانایـان بـە مانـای (**قلـب**) دڵ، لێکیانداوەتـەوە.

بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وەک لـە مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجلـى فـي كتـاب اللـه**)و، هەندێـک لـە کتێبەکانـی خـۆم دا باسـمکردوە، (**أفئـدة**)، لـە زۆربـەی سیاقەکان دا لـە قورئانـدا کـە هاتـوە، بـە مانـای عەقڵەکانـە، (**فـؤاد**)، یانـی: عەقـڵ، چونکـە وشـەی عەقـڵ لـە قورئانـدا نەهاتـوە، لـە جیاتـی وی وشـەی (**فـؤاد**) هاتـوە، کـە بـە (**أفئـدة**)، کۆدەکرێتـەوە، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە هـەرکام لـە: وشـەی: (**سـمع**)، (**أبصـار**)، (**أفئـدة**)،

لە قورئاندا نە زەم کراون و نە مەدح کراون، بەڵام دڵ لەبەر ئەوەی چەقی وەرگرتن و، ڕەفزکردن و، ویستن و نەویستنە، مەدحیش کراوە: ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد، زەمیش کراوە: ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴿٧﴾ ﴾البقرة، ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴿١٠﴾ ﴾البقرة، بەڵام (**فؤاد**)، لەبەر ئەوەی ئامڕازی تێگەیشتنە، هەروەک چۆن (وَٱلْأَبْصَٰرَ) چاوەکان ئامڕازی بینینن و، (ٱلسَّمْعَ) بیستن، ئامڕازی بیستنە، ئنجا ئەوانە ئەگەر بۆ چاکە بەکاربهێنرێن، مەدح دەکرێن و، ئەگەر بۆ خراپە بەکاربهێنرێن، زەم دەکرێن، بەڵام لە خودی خۆیاندا بێ لایەنن، بۆیە خوا لە قورئاندا، نە زەمی کردوون و، نە مەدحی کردوون.

لە ڕاستییدا لێکۆڵینەوە لە بارەی کۆئەندامی بیستن و، کۆئەندامی بینین و کۆئەندامی عەقڵ و هۆش، زۆری دەوێ، وەک لە مەوسووعەی (درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماک و عەقڵ و زانست و وەحیی دا)، پانتاییەکی باشم تەرخان کردوە، بۆ لێکۆڵینەوە لەو سێ کۆئەندامە: عەقڵ و، کۆئەندامی بیستن و، کۆئەندامی دیتن، هەروەها سەرجەم کۆئەندامەکانی دیکەی مرۆڤ.

کە دەفەرموێ: ﴿ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾، واتە: ئێوە بە کەمیی سوپاسگوزاریی بۆ خوا دەکەن، لەسەر ئەو نیعمەتانەی پێی داون، مرۆڤ تاکو ئێستا نەک هەر ناتوانێ کۆئەندامی بیستن، یاخود دیتن، یاخود عەقڵ، دروست بکات، بەڵکو تا ئێستا نەیتوانیوە لە هەموو نهێنییەکانیشیان تێ بگات، لە هەموو وردەکارییەکانیشیان بزانێ، چ جای بتوانێ دروستیان بکات، کە خوا ﷻ بە ملیاران کۆئەندامی عەقڵ و بیستن و دیتنی، بۆ مرۆڤەکان و، بەڵکو بۆ ئاژەڵەکان و، دڕندەکان و، پەلەوەرەکان، دروستکردوون، هەر کامیان بە شێوەی خۆی، بۆیان دروست دەکات.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە ئێوەی لە زەوی دا دروستکردوەو بڵاوی کردوونەوە، ئنجا بەس بۆ لای ویش کۆدەکرێنەوە.

﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحۡىِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخۡتِلَٰفُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ ﴾، هەروەها خوا ئەو کەسەیە کە دەژیەنێ و دەمرێنێ و، جێگۆڕکەو جیاوازی شەوو ڕۆژانیش هەر بە دەست ویە، ﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئایا نافامن! ئایا نافامن کە پەرەوەردگارێک ئاوا بێ، دەتوانێ زیندووتان بکاتەوە و، پەروەردگارێک بەو شێوەیە بێ، دەبێ تەنیا ئەو بپەرسترێ.

﴿ بَلۡ قَالُواْ مِثۡلَ مَا قَالَ ٱلۡأَوَّلُونَ ﴾، بەڵکو وێنەی ئەوەیان گوت، کە پێشووەکان گوتوویانە، ئایا پێشووەکان چییان گوتوە؟

﴿ قَالُوٓاْ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴾، گوتیان: ئایا ئەگەر مردین و بووینە گڵ و ئێسکەکان، (مەبەستیان پێی ئەو ئێسکانەیە کە دەڕزن و، دەپڕتووکێن)، ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟ لەبەر ئەوەی مرۆڤ کاتێک کە دەخرێتە بن زەوی و، ئەگەر نەشخرێتە بن زەوی، گۆشتەکەی بە زوویی دەبێتەوە گڵ و خۆڵ و، ئێسکەکانی دەمێننەوە، تاکو ماوەیەکی زۆر، دوایی ئەوانیش وردە وردە دەپڕتووکێن و دەڕزن و، هەر دەبنەوە بە گڵ و خۆڵ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾ ﴾طـه، واتە: لەوێ دروستمان کردن و، دەشتانخەینەوە نێوی و، دوایی جارێکی دیکەش لەوێ دەرتان دێنینەوە.

﴿ لَقَدۡ وُعِدۡنَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبۡلُ ﴾، (دەڵێن): بە دڵنیایی ئێمەش و باب و باپیرانیشمان، ئەو بەڵێنەمان پێدرابوو، یاخود ئەو هەڕەشەیەمان لێکرابوو، کە زیندوو دەکرێینەوە، چونکە (وُعِدۡنَا)، هەم بەمانای (وعد) دێ، هەم بە مانای (وعید) دێ، ئنجا بە پێی سیاق دیاریی دەکرێ، واتە: پێشتر گفت و بەڵێن بە ئێمەش و بە باب و باپیرانیشمان درابوو، پێشتریش ئەو هەڕەشەیە لە ئێمەو لە باب و باپیرانمان کرابوو، بەڵام نەهاتە دی، ﴿ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، ئەمە بەس ئەفسانەی پێشینانە، واتە: مادام پێمان گوتراوە: زیندوو دەکرێنەوەو، بە باب و باپیرانیشمان گوتراوەو: تاکو ئێستاش زیندوو نەکراوینەوە، کەواتە: ڕاست نیە!

نەیانزانیوە کە سیستمی خوا ﷻ بە پێی ئارەزووی مرۆڤەکان نیە، خوا دایناوە ئەم قۆناغە قۆناغی ژیانی سەر زەوییەو، دەچنەوە ژێر زەوی، هەڵبەتە وەک جەستەکانیان، ئەگەرنا ڕووحەکانیان لە جیهانی بەرزەخ دان، کە دوایی باسی دەکەین، بەڵام لە قۆناغێکی دیکەدا کە قۆناغی قیامەت و هەڵسانەوەیە، بەپێی ئەو سیستمەی خوا دایناوە، لەوێدا زیندووبوونەوەی جەستەکان و، ئاوێتە بوونەوەیان لەگەڵ ڕووحەکان، دێتە دی، نەک ئێستا، خوا سیستمی خۆی بۆ خەڵک تێک نادات و، ئەوەش بەشێکە لەو تاقیکردنەوەیەی خوا ﷻ مرۆڤەکانی پێ تاقیدەکاتەوە، ئایا متمانەیان بە بەڵێنی خوا هەیە؟ بۆیە خوا ﷻ لە وەڵامی ئەو قسانەیان دا، چەند پرسیارێک بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، ئەو پرسیارانەیان لێ بکات؟

﴿ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، پێیان بڵێ: زەویی و ئەوەی لە زەویدا هەیە، هی کێیە ئەگەر دەزانن؟ کێ خاوەنیەتی؟ ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، دەڵێن: هەمووی هی خوایە، بڵێ: ئایا بیرتان ناکەوێتەوە، پەند وەرناگرن؟

هەڵبەتە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان و کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ زۆربەیان دانیان بە بوونی خوادا داهێناوە، یانی: لەگەڵ بەدیهێنەرێتیی و، پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خوادا گرفتیان نەبووە، بەڵام گرفتیان دوو پرسی سەرەکیی بووە:

**١)**- ئایا تەنیا خوا بپەرسترێ، یان هاوبەشی بۆ دابنرێ؟

**٢)**- ئایا دوای مردنیان و بوونەوە خۆڵ و ئێسکانی پرتووکاو، زیندوو دەکرێنەوە؟

ئەوەش لەبەرئەوەی خوایان چاک نەناسیوە، ئنجا ئەوان کە وەڵام دەدەنەوە دەڵێن: زەوی و هەرچی تێیدایە، هەمووی هی خوایە، بۆیە خوا بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، پێیان بڵێ: ئایا ناکەوێتەوە بیرتان؟ بیرناکەنەوەو،

پەند وەرناگرن؟ واتە: نازانن و بیرناکەنەوە، مادام دنیا هەمووی هی خوا بێ، دەشتوانێ زیندووتان بکاتەوە؟

﴿ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبۡعِ وَرَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴾، هەروەها پێیان بڵێ: کێ خاوەن و پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و خاوەنی بارەگای مەزنە؟ ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، دیسان دەڵێن: هەمووی هی خوایە و، خاوەنەکەی تەنیا خوایە، ﴿ قُلۡ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴾، پێیان بڵێ: مادام وایە ئەدی ئایا پارێز ناکەن، پارێز ناکەن لە سزای خوا، بەهۆی ئیمان هێنانەوە بە خوا، تاکو دووچارو گرفتاری سزاو جەزرەبەی خوا نەبن؟!

﴿ قُلۡ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾، پێیان بڵێ: کێ موڵکی فراوانی هەموو شتێک و، موڵکی ڕاستەقینەی هەموو شتێکی بەدەستەو، بەس ئەو پەنا دەدات و، کەسی لێ پەنا نادرێ، ئەگەر دەزانن؟ ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِۚ ﴾، دیسان دەڵێن: هەمووی هی خوایە، حوکمڕانیی ڕاستەقینەو، موڵکی تەواوی هەموو شتێک، لەبەر دەستی خوادایەو، بەس ئەویش پەنا دەداو، کەسیشی لێ پەنا نادرێ.

﴿ قُلۡ فَأَنَّىٰ تُسۡحَرُونَ ﴾، بڵێ: کەواتە: چۆن جادووتان لێ دەکرێ؟ واتە: ئێوە مادام ئەو پرسیارانە بە ئەرێنیی وەڵام دەدەنەوە، عەقڵ و مەنتیق و ویژدان وا دەخوازن، تەنیا ئەو پەروەردگارە بپەرستن و، هاوبەشی بۆ دانەنێن، ئنجا کەوا ناکەن، وەک کەسێک دێنە بەرچاو، جادووتان لێ کرابێ و، عەقڵتان لە کار خرابێ، ﴿ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِٱلۡحَقِّ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴾، بەڵکو ڕاستییەکەی ئەوەیە: ئێمە هەقمان بۆ هێناون و، ئەوانیش درۆ دەکەن، درۆ دەکەن کە دەڵێن: خوا ڕۆڵەی هەیەو، درۆ دەکەن کە دەڵێن: خوا هاوبەشی هەیە و، درۆ دەکەن کە دەڵێن: خوا ناتوانێ مردووان زیندوو بکاتەوە.

﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ ﴾، خـوا هیـچ ڕۆڵەیەکـی بـۆ خـۆی نەگرتـوەو، هیـچ پەرستراوێکیشـی لەگـەڵ نیـە، چونکـە ئەگـەر هیـچ پەرستراوی دیکـەی لەگـەڵ بوونایـە، ﴿ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ ﴾، ئـەو کاتـە هـەر پەرستراوە ئـەوەی کـە دروسـتیکردوە، بـۆ خـۆی سەرپەرشـتیی دەکـردو، مشـووری دەخـواردو، هـەر پەرسـتراوە، خـۆی کاروبـاری دروسـتکراوەکەی خـۆی بەڕێـوە دەبـرد، ﴿ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ﴾، هەروەهـا هەندێکیـان بەسـەر هەندێکیانـدا زاڵ دەبـوون و، لـە بەینیانـدا دەبـوو بـە کێشـەو ناکۆکیـی، ﴿ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، پاکیـی بـۆ خـوا لـەوەی کـە ئـەوان باسـی دەکـەن، ﴿ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾، خـوا زانـای پەنهـان و ئاشـکرایە، خـوا بـەرزە لـەوەی کـە ئـەوان دەیکەنـە هاوبەشـی.

ئنجـا دێتـە سـەر باسـی ئـەو ڕێنماییانـەی کـە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەگوترێـن: ئـەو ئامۆژگارییانـەی پێـی دەگوترێـن، بەویـش و بـە هـەر کەسـێکیش کـە لـە ڕێـی ئـەوەوە دەڕوا:

﴿ قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴾، بڵـێ: پـەروەردگارم! هـەر کاتـێ پێشـانت دام، ئـەوەی هەڕەشـەی پـێ لـەوان دەکـرێ، لێـرەدا (يُوعَدُونَ)، بـە مانـای گفـت و بەڵێـن نیـە، بـە پێـی سـیاق دەزانیـن، بەڵکـو بـە مانـای هەڕەشـە لێکرانـە، ﴿ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴾، پـەروەردگارم مەمخـەرە گـەڵ کۆمەڵـی سـتەمکاران و، بـا مـن لەگـەڵ ئـەوان دا سـزا نەدرێـم، ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَادِرُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە لەسـەر پێشـاندانت، ئـەوەی کـە هەڕەشـەی پـێ لێیـان دەکەیـن، بـە توانایـن، ﴿ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ ﴾، تـۆ (ئـەی موحەممـەد!) بـە کام سیفەتی باشـترە، خراپـەی ئـەوان پـاڵ پێوەبنـێ، یانـی: لـە بەرانبـەر خراپەیانـدا چاکـە بکـە، بەڵکـو چاکتر بکـەو، کامـە کـردەوە چاکترینـە ئـەوە بکـە، ﴿ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴾، ئێمـە دەزانیـن ئـەوەی ئـەوان دەیڵێـن و وەسـفی دەکـەن.

﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ﴾، هەروەها بڵێ: ئەی پەروەرگارم! پەنات دێنمە بەر، لە دنەدان و خوتخوتەو هاندانی شەیتانەکان، کە هەڵمپێچن و، هانم بدەن، ﴿وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ﴾، هەروەها ئەی پەروەردگارم! پەنات دێنمەبەر کە شەیتانەکان ئامادەم بن، توخنم بکەون و لێم نیزیک بن و، تێکەڵ بە ئیش و کارم بن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بیرخستنەوەی چەندان چاکە و نیعمەتی خوا، وەك عەقڵ و هەستەوەرەکان و، پێگەیەنران لە زەوی دا و، ژیان و مردن و، جێگۆڕکەی شەوو ڕۆژان، کەچی مکوڕبوونی بێبڕوایەکان لەسەر شوێنکەوتنی کوێرانەی پێشینانیان:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ وَلَهُ ٱخْتِلَٰفُ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُوا۟ مِثْلَ مَا قَالَ ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوٓا۟ أَءِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ قُل لِّمَنِ ٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهَآ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ﴾، هەروەها خوا ئەو زاتەو، ئەو کەسەیە، کە بیستن و دیتنەکان و عەقڵەکانی بۆ ئێوە پێگەیاندوون.

(إنشاء)، وەک پێشتریش باسمان کرد، هەرچەندە (**راغب الأصفاني**) بە مانای (**إحداث وإيجاد**) هێناویەتی، واتە: پەیداکردن و هێنانە دی، بەڵام (**إنشاء**)، بە دروستکردنی پلە پلەو، واتە: پێگەیاندنی، وردە وردە، دەگوترێ، ئنجا هەر کام لە کۆئەندامی بیستن و، کۆئەندامی دیتن و، کۆئەندامی عەقڵ، قۆناغ قۆناغ و، پلە

پلەو، وردە وردە لە كاتێكدا كۆرپەلە لە منداڵدانی دایكی دایە، ئەو كۆئەندامانەو، هەموو جەستەكەی وردە وردە پێ دەگات، قۆناغ بە قۆناغ.

شایانی گوتنە: لە هەموو قورئان دا وشەی (ٱلسَّمۡعَ)، هەر بە تاك هاتووەو (أبصار)یش بە زۆریی بە كۆ (جمع)، هۆكارەكەش: (**السَّمْعُ: أُفْرِدَ عَلَى المَصْدَر**)، لەبەر ئەوەی (**سمع**) بیستن، چاوگەو، سەرچاوەش پێویست بە كۆكردنەوە ناكات، (**أَو لِأَنَّ المَسْمُوعَاتِ نَوْعٌ وَاحِد، والمبَصرَاتُ كثِيرَة مُتَنوعَة**)، یان لەبەرئەوەیە بیستراوەكان یەك جۆرن، (دەنگەكان یەك جۆرن)، بەڵام بینراوەكان جۆراو جۆرن، ئەوە ڕەشە، ئەوە سپییە، ئەوە زەردە، ئەوە سوورە، ئەوە بۆرە، ئەوە مۆرە، ئەوە وەك ڕەنگەكان، ئنجا لە ڕووی قەبارەوە: ئەوە بەرزە، ئەوە نزمە، ئەوە گەورەیە، ئەوە گچكەیە، ئنجا لە ڕووی چۆنیەتییەوە ئەوە جوانە، ئەوە ناشیرینە، ئەوە زبرە، ئەوە نەرمە.

(وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ)ش، پێشتریش باسمان كرد، كۆی (**فؤاد**)ە، ئەویش بەڵێ لە هەندێك شوێنیش دەگونجێ بە مانای دڵ (قلب) بەكارهاتبێ، بەڵام بە زۆریی لە قورئاندا بە مانای عەقڵ بەكارهاتووەو، بە زۆریش (ٱلسَّمۡعَ)، (وَٱلۡأَبۡصَٰرَ)، (وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ)، لە قورئاندا پێكەوە هاتوون، چونكە هەموویان ئامرازی وەرگرتنی زانیاریین.

وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ٣٦﴾، واتە: شتێك كە زانیاریت دەربارەی نیە، بە دوای مەكەوە، چونكە بیستن و بینین و عەقڵەكان، هەر كامێك لەوانە لێی دەپرسرێتەوە، ئەوەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە: (وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ)، لەگەڵ (وَٱلۡأَبۡصَٰرَ) و، (ٱلسَّمۡعَ)، هەموویان ئەو كۆئەندامانەن كە ئینسان زانیاریان پێ وەردەگرێ، (سمع) دەنگەكان و، (بصر)، ڕەنگەكان و بینراوەكان و، (**فؤائد**)یش، زانراوەكان، بەڵام وشەی (**قلب**)یش، كە بە (**قلوب**)، كۆدەكرێتەوە، لە قورئاندا وەك چەق و مەڵبەندی و ویستن و نەویستن، خۆشویستن و ڕق لێبوونەوەو، چەقی خواستن و بڕیاردان هاتوە، خوا دەفەرموێ: خوا ئەو كەسەیە كە هێزی بیستن و دیتنەكان و عەقڵەكانی بۆ ڕەخساندوون، بۆ پێگەیاندوون.

٢)- ﴿ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴾، بەڵام بە کەمیی سوپاسگوزاریی بۆ (خوا دەکەن)، چونکە سوپاسگوزاریی بۆ خوا، ئەوەیە کە دەبێ هێزی بیستن و هێزی دیتن و هێزی دەرککردن و شت زانین، لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاربهێنرێن، ئا ئەوە سوپاسکردنی خوایە، لەسەر ئەو نیعمەتانە.

پیتی (ما) لە (**قَلِيلًا مَّا**)دا: (**مَا: مَصْدَرِيَّة أي: حَالَ كَوْنِكُم قَلِيْلاً شُكْرُكُم**)، لە حاڵێک دا کە ئێوە سوپاسگوزارییەکەتان کەمە.

٣)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، هەروەها (خوا) ئەو زاتەیە، کە دروستی کردوون و بڵاویکردوونەوە، بەڵام بۆیە دەڵێم: لێرەدا (**ذرأ**) زیاتر: بە مانای بڵاوکردنەوەیە، ئەگەرنا مانای دروستکردنیش دەگەیەنێ، چونکە (**ذرية**)، یانی: ئەو وەچەیەی کە دروستکراوەو پێگەیەندراوە، بەڵام وشەی (**ذرأ**)، وێڕای ئەوەی دروستکردوون و هێنانە دی، دەگەیەنێ، بڵاوکردنەوەش دەگەیەنێ.

٤)- ﴿ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، بەس بۆ لای ویش کۆدەکرێنەوە، کەواتە: تەنیا ئەو بە زەوی دا بڵاوی کردوونەتەوەو، بەس ئەویش کۆتان دەکاتەوە، ئاشکراشە لە زمانی عەرەبییدا، هەر کات بەرکار (**مفعول به**)، پێش کار (**فعل**)و بکەر (**فاعل**) کەوت، مانای کورتهەڵێنان (حصر) دەگەیەنێ، نافەرموێ: (**تُحْشَرون إِليهِ**) کۆ دەکرێنەوە بۆ لای وی، بەڵکو بەس بۆ لای وی کۆدەکرێنەوە.

٥)- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ﴾، هەروەها (خوا) ئەو زاتەیە کە دەژیەنێ و دەمرێنێ.

ژیاندن و مراندن گەورەترین کارن لە گەردووندا، بە تایبەت لە ژیانی بەشەرداو، لە ژیانی ژیانداراندا، بۆیە لە قورئاندا خوا ﷻ ئەو دوو وشەیەی زۆر هێناون و پاڵیشییداونە لای خۆی، چونکە ژیاندن و مراندن بە دڵنیایی و بە تەنیا لەبەر دەستی خوای پەروەردگار دان، جاری وایە مرۆڤەکانیش دەتوانن هۆکاری بەردەوام بوون لە ژیان، یان هۆکاری کۆتایی پێهێنانی ژیان بڕەخسێنن، بەڵام ئەوەی لە پشت دیاردەی ژیاندن و مراندنە، تەنیا خوای پەروەردگارە، ئەوی دیکە هەمووی ڕواڵەتەو هۆکاری ڕواڵەتین.

٦)- ﴿ وَلَهُ ٱخۡتِلَٰفُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ ﴾، (**اخْتِلَاف**)، دەگونجێ بە مانای جیاوازیی (**تنوّع**) بێ، دەشگونجێ بە مانای: (**خَلَفَ أَحَدَهُمَ الأَخَرَ**) یەکیان جێیی ئەوی دیکەی گرتەوە، بێ، یانی: جێگۆڕکێ، واتە: هەروەها جیاوازیی و جێگۆڕکەی شەوو ڕۆژگاریش هەر بە دەست ویە، بە دەست خوایە.

لێرەدا پێشێ دەفەرموێ: ﴿ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ ﴾، دواییش دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُ ٱخۡتِلَٰفُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ ﴾، ئنجا شەوگار دەکەوێتەوە بەرانبەر مردن و، ڕۆژگاریش دەکەوێتە بەرانبەر ژیان، واتە: ئەو زاتەی کە ژیاندن و مراندنی بەدەستن، هەر ئەویش ڕۆژو شەویشی بەدەستن.

٧)- ﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئایا نافامن؟ یانی: ئەگەر ئێوە بڕوا بەو پەروەردگارە نەهێنن، کە زیندووتان دەکاتەوەو، لێتان دەپرسێتەوە، بڕوای پێنەهێنن، کە تەنیا دەبێ بەندایەتیی بۆ وی بکەن و، هاوبەشی بۆ دانەنێن، مانای وایە لە عەقڵەکەی خۆتان بەهرەمەند نەبوون و، سوودتان لێ نەبینیوە، چونکە عەقڵ پەروەردگارو خاوەنی خۆتانتان پێ دەناسێنێ، بۆیە گوتراوە: (**رَأْسُ الحِكْمَةِ مَخَافَةُ الله**)، واتە: سەری زانیاریی بەسوودو حیکمەت، ترس و بیم و سامکردنە، بەرانبەر بە خوا ﷻ.

٨)- ﴿ بَلۡ قَالُواْ مِثۡلَ مَا قَالَ ٱلۡأَوَّلُونَ ﴾، بەڵکو هەمان شتیان گوت، کە پێشووەکان گوتوویانە، لێرە ئەم تەعبیرە ئاوڕدانەوەیە، پێشێ بە شێوەی دواندن (**خطاب**) دەیاندوێنێ، دوایی وەک نادیار (**غائب**) قسەیان لە بارەوە دەکات، کە ئەوە جۆرێکە لە ئاوڕدانەوە لە زمانی عەرەبییدا، بۆ ئەوەی مرۆڤ ماندووبوون (ملل) نەیگرێ، لە شێوازێکەوە بۆ شێوازێکی دیکە، قسەکردن و دەربڕینەکە دەگۆڕێ.

وشەی ( **بَلْ** )، لە زمانی عەرەبییدا بۆ گواستنەوە (**إضراب**)یە، حاڵەتێک بۆ حاڵەتێکی زیاتر، چ لە چاکەدا چاکتر، چ لە خراپەدا خراپتر، ئنجا لێرەدا: (**إِضْرَابٌ إِبْطَالِيٌ وَإِثْبَاتٌ لإِنْكَارِهِم البَعْثَ**)، ئەمە گواستنەوەیەکی بەتاڵکردنەوەیەو چەسپاندنی نکووڵییکردنیانە لە زیندووکرانەوە.

چونکە کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴾، ئایا نافامن؟ یانی: نافامن، بە بەڵگەی ئەوەش نافامن، کە هەمان شت دەڵێن، کە پێشووەکانیان گوتوویانە، ئنجا ئەگەر عەقڵیان هەبووایە، لاساییکردنەوەی کوێرانەی پێشینانیان نەدەکردو، عەقڵی خۆیان بەکاردەهێنا، کەسێک زیندووبێ، بەڵام مەحکوومی عەقڵی کەسێکی مردووبێ، مانای وایە لە عەقڵەکەی خۆی بەهرەمەند نەبووە، ئنجا ئەوە بۆ کافران ڕاستەو بۆ مسوڵمانانیش هەر ڕاستە، کە خۆیان پابەند بکەن بە فەتواو بۆچوونی زانایەکەوە، لە پێش واندا بووە، ئەو کە دەربارەی بارودۆخێکی دیکە، دواوەو لە ژینگەیەکی دیکەدا، وەڵامی پرسیارێکی دیکەی داوەتەوە، ئێستا تۆ ئەو وەڵامانە، ئەو بیرو بۆچوونانە بێنێ، بتەوێ چارەسەری کێشەو گیروگرفتەکانی ڕۆژگاری خۆتیان پێ بکەی! هەر کەس بیکات، مانای وایە لە عەقڵەکەی خۆی بەهرەمەند نەبووەو، زیندوویە، بەڵام مەحکوومی عەقڵی کەسێکی مردوویە!

هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوە نیە، ڕێز لە زانایان و، ڕێز لە پێشەوایان نەگیرێ و، لە کەلەپوورو بۆچوونەکانیان بەهرەمەند نەبین، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە نابێ ئەوەی مرۆڤەکان دەیڵێن و، هەڵیدەهێنجن لە وەحیی، لە شوێنی وەحیی دایبنێین و، بیکەینە پەردەو دیوارێک و وەحییمان لێ بشارێتەوە، ئەگەرنا هەر کەسێک ڕێز لە پێشینانی خۆی نەگرێ و، لە کەلەپوورو بەرهەمیان بەهرەمەند نەبێ، کە لەبەر ڕۆشنایی وەحیی (قورئان و سوننەت)دا، ئیجتهادیان کردووەو بۆ چوونەکانیان، خستوونە ڕوو، هەر کەسێک لەوانە بەهرەمەند نەبێ، خۆشی نازانێ چی دەکات! بەڵام بە دڵنیایی بەردەوام پرسیاری تازەمان بۆ دێنە پێش و، کێشەی تازەمان بۆ دێنە پێش، ئەو پرسیارە تازانەش، پێویستییان بە وەڵامی تازە هەیەو، کێشە تازەکان پێویستییان بە چارەسەری تازە هەیە.

(ٱلۡأَوَّلُونَ)، یانی: پێشینان، ئەوانەی لە پێشیان دابوون.

٩)- ﴿ قَالُوٓاْ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴾، گوتیان: ئایا ئەگەر مردین و بووینە گڵ و ئێسکە پرتووکاوەکان، ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوە؟

﴿ أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴾، ئەمە بە دوو شێوە خوێنراوەتەوە:

أ- (أإنّا لمبعوثون)؟.

ب- (إنّا لبمعوثون)، ئایا ئێمە زیندوو دەکرێینەوەو هەڵدەسێنرێینەوە؟

١٠)- ﴿ لَقَدۡ وُعِدۡنَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا هَٰذَا مِن قَبۡلُ ﴾، بە دڵنیایی ئا ئەمە، ئێمەو باب و باپیرانیشمان، پێشتریش بەڵێنمان پێدرابوو، یاخود: بەوە هەڕەشەمان لێکرابوو، جا بۆیەش ﴿ نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا ﴾ ، دووبارە کراوەتەوە، خۆمان و باب و باپیرانیشمان، تاکو پێشانی بدەن کە: ئەو بەڵێنە، یان ئەو هەڕەشەیە، هەر نەهاتە دی و، درۆیە!!

١١)- ﴿ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾، ئەمە هیچ شتێک نیە، جگە لە ئەفسانەی پێشینان، (إِنۡ )، لێرەدا (إِنۡ )ی لابردن (نافية)یە، (أساطير)یش کۆی (أسطورة)یە، (أسطورة)ش بریتیە لەو هەواڵە درۆیەی کە وەک سیفەتی ڕاستیی بوون، دادەپۆشرێ و، بەرگی ڕاستییبوونیی بەبەردا دەکرێ، وەک ئەو ئەفسانەو گێڕدراوە خەیاڵییانەی ساز دەکرێن، بە مەبەستی کات پێ بەسەر بردن.

واتە: مادام وێڕای ئێمە، پێشتریش ئەو بەڵێنە بە باب و باپیرانیشمان دراوەو، نەشهاتۆتە دی، کەواتە: دیارە ئەفسانەی پێشینانە، لێرەدا بێبڕوایەکان بە پێچەوانەی ئەو بنەمایەوە، ڕەفتاریان کردوە، کە دەڵێ: (عَدَمُ العِلْمِ لاَ يَسْتَلْزِمُ عِلْمَ العَدَمِ)، زانیاریی نەبوون بە شتێک، بەڵگەی نەبوونی ئەو شتە نیە، یاخود نەدیتنی شتێک بەڵگەی نەبوونی ئەو شتە نیە، یان: نەهاتنە دی شتێک ئێستا، بەڵگە نیە لەسەر سبەینێش نایەتە دی.

بە ڕاستیی بۆچوون و قسەکەیان یەکجار بێ جێیە، چونکە خوا ﷻ ئەم گەردوونەو ژیانی مرۆڤی بە سیستم (نظام) داناوەو، سیستم (نظام)یش نابێ

تێکەڵ و پێکەڵ بێ، خوا دایناوە کە ئێستا قۆناغی ژیانی دنیایەو، ئەوانەی دەمرن دەچنە قۆناغی بەرزەخەوە، دوایی قۆناغی ئاخیرزەمان (**الساعة**)، دێتە پێشێ، دوایی قۆناغی هەڵسانەوەو قیامەت دێتە پێشێ، هەر کارو قۆناغە لە کاتی خۆی دا دێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ ٣٨﴾ الرعد، یانی: بۆ هەر ئەجەلێک کاتێکی دیارییکراو هەیە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿لِّكُلِّ نَبَإٖ مُّسۡتَقَرّٞۚ وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ٦٧﴾ الأنعام، واتە: بۆ هەر هەواڵێک نشینگە (کات و شوێنێکی سەقامگیربوون) هەیە، لە مەودوا دەزانن (بۆتان دەردەکەوێ).

## مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی (محمد) ﷺ کە چەند پرسیارێکی ویژدان جووڵێن لە کافرەکان بکات، لە بارەی: خاوەنداریتیی زەوی و، دانیشتووانی حەوت ئاسمانەکان و عەرشی مەزن و، کاروباری گەردوون بەدەست بوون و هەمەکارە بوون، پاشان ڕاگەیاندنی ڕاستیی پەیامی خواو، درۆبوونی قسەی ئەوان و، پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی هەبوونی ڕۆڵەو هاوبەش بۆ خواو، ڕاگەیاندنی بەرزیی و پاکیی و بێ خەوشیی خوا ﷻ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾ بَلْ أَتَيْنَاهُم بِالْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٩٠﴾ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە بیست و یەك بڕگەدا:

**١)-** ﴿ قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا ﴾، (ئەی موحەممەد ﷺ!) بڵێ: ئایا زەوی و ئەو کەسانەی تێیدان، هی کێن؟

**٢)-** ﴿ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، ئەگەر زانیارییتان هەیە، ﴿ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، ئەمە مەرجە، بەڵام وەڵامەکەی قرتێنراوە، واتە: (أجيبوني) وەڵامی ئەو پرسیارەم بدەنەوە، ئنجا ئەمە هاندانە بۆ ئەوەی زانیاریی وەدەستبێنن و، واز لە نەفامیی بێنن، یانی: ئەگەر زانیارییتان هەیە، وەڵام بدەنەوەو، ئەگەر زانیارییشتان نیە، زانیاریی پەیدا بکەن،

دەربارەی خاوەندارێتیی کردنی زەوی و دانیشووانی، هی کێیە؟ ئایا دنیا شاری بێ خاوەنە! هیچ شتێک بێ خاوەن نیە، ئەم گەردوونە چۆن بێ خاوەنە!

٣)- ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ﴾، دەڵێن: زەوی و ئەو کەسانەی لە زەویدا هەن، هی خوان، خاوەنیان خوایە، واتە: بە خێرایی و بێ وە خران وەڵام دەدەنەوە، ئەگەر عەقڵ و ویژدانیان بکەنە دادوەر، دەڵێن: هەموو شتێک هی خوایەو، خوا حوکمڕان و خاوەنی ڕەهایە.

٤)- ﴿ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾، تۆش پێیان بڵێ: ئەدی بیرناکەنەوەو پەند وەرناگرن و، ڕانامێنن! ڕاستییەکانتان بیرتان نایەنەوە؟ (تَذَكَّرُونَ)، دوو جۆرە خوێندنەوەی هەن:

أ- (تَذَكَّرُونَ)

ب- (**تَذَّكَّرون**)، کە لە ئەصڵدا (**تتذكرون**)ە، (**تذكر**)یش، وەک زۆر جاری دیکە باسمان کردوە، ئەوەیە کە ئینسان شتێکی زانیبێ و، لە بیری چووبێتەوەو، بیر خۆی بێنێتەوە، بۆیە خوای پەروەردگار ئەو وشەیە زۆر بەکاردێنێ، چونکە هەموو ئەو ڕاستییانەی شەریعەت دەیانهێنێ، خوا لە فیترەتی مرۆڤدا دایناون، وەک ئەصڵەکەیان، نەک وەک وردەکاریی کە شەریعەت دەیهێنێ، بەڵکو وەک ئەصڵەکەیان، بە تایبەتی ڕاستییەکانی کە پەیوەندییان بە بووناسیی و ئیمان و عەقیدەوە هەیە، خوا لە ویژدان و زگماکی مرۆڤدا دایناون، بۆیە پێویستیان بەوە هەیە، بیر خۆیانیان بهێننەوە.

٥)- ﴿ قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ ﴾، بڵێ: کێ خاوەنی حەوت ئاسمانەکانە!

٦)- ﴿ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴾، هەروەها (کێ) خاوەنی بارەگای مەزنە!

٧)- ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ﴾، دەڵێن: هەمووی هی خوایە، ئەمە خوێنراویشەتەوە: (**سيقولونَ الله**)، دەڵێن: خوا (خاوەنی حەوت ئاسمانەکان و بارەگای مەزنە).

من ئەم خوێندنەوەیانم زیاتر بە دڵە، خوێندنەوەی (**حَفص**)، بە (لله)، هاتوەو، وەک ئەوی پێشترەو، دەڵێن: حەوت ئاسمانەکان و بارەگای مەزنیش، بەس هی

خـوان، یەکێـک لـە زانایـان گوتوویەتـی: (**قـراءة (للـه) عَـدول بِسَـبَب مُرَاعَـاةِ المَعْنَـى دُونِ اللَّفْـظ**)، یانـی: خوێندنـەوە (للـه) لادانێکـە بـە هـۆی ڕەچاوکردنـی مانـا نـەک بێژەکـە، بـەڵام ئەگـەر ڕەچاوی مانایەکـەی بکـرێ، کـێ خاوەنـی حـەوت ئاسـمانەکان و خاوەنـی بـارەگای مەزنـە؟ ڕەچـاوی ماناکـەی بکـرێ، دەگوتـرێ: (**ألله**)خـوا.

بۆیــەش نەیفەرمــوە: ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾، کــە لــە ڕســتەی پێشــێ دا فەرموویەتـی، چونکـە پەروەردگارێتیـی خـوا بـۆ حـەوت ئاسـمانەکان و بـۆ بـارەگای مـەزن، لـەلای کافـرەکان سـەلمێنراو بـووە، بـەڵام بـۆ خاوەندارێتیـی زەوی و ئەوانـەی لـە زەوی دا هـەن، زۆرجـار پادشـاو حوکمڕانـە خۆبەزلگرانـەکان گوتوویانـە: هەمـوو شـتێک هـی ئێمەیـەو، خەڵـک ڕەنگـە جۆرێـک لـە ئیشـکال و گومانـی بـۆ دروسـت بووبـێ، بـەڵام هیـچ کـەس نەیتوانیـوە بڵـێ: ئاسـمان هـی منـەو ئەسـتێرەکانی و، خرۆکـەکان هـی منـن.

٨)- ﴿قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ﴾، پێیان بڵێ: ئایا خۆتان ناپارێزن، پارێزناکەن، لێرەدا: بەرکار (**مَفعول بِهِ**)، (تَتَّقُونَ)، قرتێنراوە بۆ ئەوەی مانایەکەی فراوان بێ، ١- ئایا خۆتان ناپارێزن لە خوا؟ ٢- لە سزای خوا؟ ٣- لە سزای دنیایی؟ ٤- لە سزای ڕۆژی دوایی؟ ٥- لە لێپرسینەوە ....هتد، هەمووی دەگرێتەوە.

٩)- ﴿قُلْ مَنْ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ﴾، (پرسیارێکی دیکەیان لێ بکە) بڵێ: کێ موڵکی فراوان و ڕاستەقینەی هەموو شتێکی بەدەستە؟ پێشتریش گوتمان: (مَلَكُوتُ)، زێدەڕۆییە لە موڵک دا.

(**مَلَكُوت: المُلْكُ المُقْتَرِنُ بالتَصَرُّفِ فـي مُخْتَلِفِ الأَنْوَاعِ وَالعَوَالِـم**)، (**مَلَكُوت**)، بریتیە لـە موڵـک و خاوەنداریيـەک کـە جـووت بـێ لەگـەڵ دەستڕۆیشـتوویەتی لـە هەمـوو جۆرەکانـی داو، لـە هەمـوو جیهانییەکانـدا.

هەندێـک لـە زانایانیـش گوتوویانـە: (**مَلَكُـوت**) بریتیـە لـە دیـوی پەنهانـی و، خاوەندارێتیـی.

١٠)- ﴿ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ ﴾، هەروەها کێ بەس خۆی پەنا دەدات، هیچ شتێک و هیچ کەسێکی لێ پەنا نادرێ؟ (**يُجيرُ: يُغيثُ وَيَمْنَعُ مَنْ شَاء مِنْ الأَذى**)، یانی: دەفریا دێ و، هەر کەسێک بیەوێ لە ئازار پەنای دەداو، چاوگی (**يجير**) بریتیە لە (**إجارة**)، یانی: پەنادان و، مانای زاڵبوونیش دەگەیەنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ ﴾، یانی: هیچ کەسێک ناتوانێ هیچ کەسێک بپارێزێ لە سزای وی (خوا)، بۆیەش: (**يجار عليه**)، بە: (**بُني للمجهول**)، هێنراوە، چونکە مەبەست ئەوە بووە ئەو مەسەلەی پەنادانە، لە هەموو بکەرێک لا ببرێ، زۆر بە کورتیی، یانی: هیچ کەسێک نیە کە بتوانێ کەسێک لە بەرانبەر خوادا پەنابدات.

١١)- ﴿ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾، واتە: ئەگەر بزانن، وەڵامەکەی دیارە، یانی: هەوڵ بدەن زانیاریی پەیدا بکەن.

١٢)- ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ﴾، دووبارە دەڵێن: هەموو شتێک هەر هی خوایە، یان تەنیا خوا مەلەکووتی هەموو شتێکی بە دەستەوەیەو، بەس خوا پەنا دەداو لێی پەنا نادرێ.

١٣)- ﴿ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴾، کەواتە: چۆن جادووتان لێ دەکرێ؟

ئەویش: ﴿ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ﴾، (**سيقولون الله**) هەردوو خوێندنەوەکەی هاتوون.

(فَأَنَّىٰ ) یانی: لە کوێوە، یاخود: چۆن جادووتان لێ دەکرێ؟

ئەم پرسیارە بۆ سەرسوڕماندن (تعجیب)ە، (جادوو لێکران)یش لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ (هەڵخەڵەتێنران)، کڵاو لەسەرنران، چونکە جادوو ئەوەیە، حەقیقەتی نەبێ، چاوی خەڵک هەڵخەڵەتێنێ، یانی: ئێوە بۆچی عەقڵی خۆتان لە دەست دەدەن؟

١٤)- ﴿ بَلْ أَتَيْنَاهُم بِالْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴾، بەڵکو ئێمە هەقمان بۆ هێناون و، بە دڵنیایی ئەوانیش درۆ دەکەن، واتە: وانیە وەک خراوەتە خەیاڵ و ئەندێشەی ئەوانەوە، بەڵکو ڕاستییەکە ئەوەیە، ئێمە هەقمان بۆ هێناون و ئەوانیش درۆ دەکەن.

وەک دەبینین: پێشێ خوا ﷻ باسی خاوەنداریێتیی خۆی بۆ زەوی و حەوت ئاسمانەکان و بارەگای مەزن و، دواتر باسی خاوەنداریێتیی خۆی بۆ موڵکی هەموو شتێک دەکات، ئنجا دەفەرمویێ:

١٥)- ﴿ مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ ﴾، خوا هیچ ڕۆڵەیەکی بۆ خۆی نەگرتوە، چونکە کافرەکان دەیانگوت: فریشتەکان کچانی خوان و، شەیتانەکانیش کوڕانی خوان، ﴿ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۭ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ ١٠٠ ﴾الأنعام، بەڵام نا، خوا ڕۆڵەی نیە.

١٦)- ﴿ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنۡ إِلَٰهٍ ﴾، هیچ پەرستراوێکیشی لەگەڵدا نیە، هەر جۆرێک بێ، چونکە:

١٧)- ﴿ إِذٗا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهِۭ بِمَا خَلَقَ ﴾، ئەگەر هیچ پەرستراوی لەگەڵدابوونایە، هەر پەرستراوە سەرپەرشتیی دروستکراوی خۆی دەکرد.

١٨)- ﴿ وَلَعَلَا بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ ﴾، هەندێکیان بەسەر هەندێکیاندا زاڵ دەبوون و، دەبووە کێشەو مشتومڕیان، بەڵام کە ئێستا هیچ شتێکی وا لە گەردوون دا نابینین و، هەمووی بە یەک جۆرە سیستم بەڕێوە دەچێ، لە گەردیلە تاکو کەهکەشان، کەواتە: تەنیا خوا، خاوەن و پەروەردگاری هەموویەتی و، هەمووی بە ویست و توانای و زانیاریی ڕەهاو بێ سنووری پڕ حیکمەتی خۆی بەڕێوە دەبات.

١٩)- ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴾، پاکیی بۆ خوا لەوەی ئەوان خوای پێ وەسف دەکەن، لە پاڵدانی ڕۆڵەو هاوبەش بۆ لای (خوا).

٢٠)- ﴿ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ﴾، خوا زانای پەنهان و ئاشکرایە، هیچ شتێکی لەسەرو خواری دروستکراوەکانیدا لێ پەنهان و شێردراوە نیە.

٢١)- ﴿ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، بەرزیی (بۆ خوا) لەوەی دەیکەن بە هاوبەشی.

﴿ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴾، (ما)، لە (عمّا)دا چاوگیی (**مصدرية**)یە، یانی: **(تعالى عن شركهم)**، بەرزیی بۆ خوا لە هاوبەش بۆ دانانی ئەوان، کە شتی ئەفسانەیی و

بۆ بنەما دەکەنە هاوبەشی لە پەرستراندا، لە حاڵێکدا بەس خۆی بە تەنیا بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێکەو، تەنیا خۆیشی شایستەی پەرستران و بەندایەتیی بۆ کرانە.

## مەسەلەی سێیەم:

**ڕێنمایی خوا (و ئامۆژگاریی خوا)، بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺو، شوێنکەوتووانی، لە بارەی چۆنیەتی مامەڵەکردنیانەوە لەگەڵ بێبڕوایانی ئەفسانە پەرستی کەللە پووچدا، کە لە بەرانبەر خراپەیاندا، چاکتر بکەن و، پەناش بە خوا بگرن، لە شەڕو خراپەی شەیتانەکان و دنەدانیان و، تێکەڵبوونیان بە ئیش و کاریان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ ﴿٩٣﴾ رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٩٤﴾ وَإِنَّا عَلَىٰ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَادِرُونَ ﴿٩٥﴾ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ السَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴿٩٦﴾ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّي مَا يُوعَدُونَ﴾، (ئەی موحەممەد!) بڵێ: پەروەردگارم! هەر کات ئەوەت پێشاندام کە هەڕەشەی پێ لەوان دەکەی، یاخود: بەڵێنت پێ بەوان داوە.

وشەی (يُوعَدُونَ) دەگونجێ بە مانای بەڵێنیش بێ و، بە مانای هەڕەشەش بێ، (**وعد يعد وعداً، أوعد يوعِدُ وعيداً**) بەڵام بە پێی سیاق لێرەدا دەزانین کە بە مانای هەڕەشەیە، چونکە بە نسبەت کافرەکانەوە، هەر هەڕەشە لێکران بووە، نەک بەڵێن و گفت پێدران.

(**إمّا**)، لە ڕیشەدا (**إنّ ما**)یە، بەڵام (**ن**) لە (ما)دا دەغم کراوە، (**ما**)ش، زیادکراوە بۆ زیاتر تۆخکردنەوەی مانایەکەی، یانی: خوایە! هەر کات ئەوەی هەڕەشەی پێ لەوان دەکەی، پێشانم دەدەی، کاتێک من لە ژیاندام، دەیهێنیە دی.

٢)- ﴿رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِي فِي الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾، پەروەردگارم! من مەخە گەڵ کۆمەڵی ستەمکاران، یانی: ئەو کاتەی هەڕەشەی تۆیان بۆ دێ، با من لەوێ نەبم و،

من نەگرێتەوە، هەڵبەتە خوا ﷻ ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە ئاوا بفەرمویٚ، بە دڵنیایی ئەویش وای فەرمووەو، ئامۆژگاریی ئێمەش دەکات کە لە خوا بپاڕێینەوە: لە کاتی سزادانی کافرانی ملهوڕدا، ئەو سزادانە، ئێمە نەگرێتەوەو، ئێمە لە نێویاندا نەبین.

٣)- ﴿ وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَـٰدِرُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە توانادارین لەسەر ئەوە کە ئەوەی هەڕەشەی پێ لەوان دەکەین، پێشانتی بدەین، بێگومان ئەمە جۆرێکە لە گفت و بەڵێن دان بە پێغەمبەر ﷺ کە ئەوەی هەڕەشەی پێ لەوان دەکات، دێتە دی و، پێغەمبەر ﷺ دەیبینێ، بێ ئەوەی لە نێویاندا بێ، لەو کاتەدا، یاخود هەڕەشەو سزایەکەی خوا، ئەو بگرێتەوە.

ئنجا ئەوەش لە جەنگی بەدردا هاتە دی، کە حەفتا (٧٠) لە زلە زلانی کافرەکان، کافرە ملهوڕە قوڕەیشییەکان کوژران و، حەفتا (٧٠)شیان لێ بەدیل گیران و، تووشی زەبوونیی و شکستێک بوون، لە مێژووی خۆیان شتی وایان بەخۆیانەوە نەبینیبوو، ئنجا ئەوە بوو پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی حەفتا کوژراوەکە، تەرمەکانیان فڕێ درانە چاڵێکەوە (قليب بدر) (قليب)یش، چاڵێکە، بیرێکە چاک نەکرابێ، پێغەمبەر ﷺ ئەم ڕستە قورئانییەی خوێندەوەو فەرمووی: ﴿ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا ﴿٤٤﴾ ﴾الأعراف، فەرمووی: فڵان! فڵان! ناوی هێنان، بە تایبەتی زلە زلەکانیان، ئەوە ئێمە ئەوەی پەروەردگارمان بەڵێنی پێدابووین، بە چەسپاویی بینیمان، ئایا ئێوەش ئەوەی پەروەردگارتان هەڕەشەی پێ لێکردبوون، بۆتان هاتە دی؟ کە بە دڵنیایی هاتۆتە دی، هەتا هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ چۆن تۆ کەسانێک دەدوێنی کە بوونە تەرم و بۆنیان کردوە؟ فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئێوە لەوان باشتر قسەکەم نابیستن، بەڵام ناتوانن وەڵامم بدەنەوە[1].

---

(١) السيرة النبوية لابن هشام: ج٢، ص٣٤٦، ٣٤٧، (صحيح مسلم: ٢٨٧٤، وسنن النسائي: ٢٠٧٥، ومسند أحمد: ١٢٠٣٩، وابن حبان: ٨٨-٧).

٤)- ﴿ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ﴾، خوا ﷻ ئامۆژگاریی پێغەمبەر ﷺ دەكات، كە چۆن مامەڵەیان لەگەڵ دا بكات، دەفەرمووێ: بە كام سیفەتەی باشترە، تۆ خراپە پاڵ پێوەبنێ، (**إدفع إساءتهم بالأسلوب الأحسن والطريقة الحسنى**)، تۆ خراپەكردنی ئەوان بە شێوازی باشترو، كام ڕێباز جوانترە لە بەرانبەر خراپەی ئەواندا، تۆ چاكترو باشتر بكە.

یانی: بە شێوازی جوان كە شایستەی خۆت و بەرنامە بەرزەكەت بێ، مامەڵە بكە، تۆ مەرج نیە، هەر كەسێك چۆنی مامەڵە لەگەڵدا كردی، تۆش وا مامەڵەی لەگەڵدا بكەیەوە، ئەو بۆیە وا مامەڵە دەكات، بەرنامەكەی وایە، خۆی وایە، كەسایەتییەكەی وایە، بەڵام هەر كەسە لەوەی پێیەتی دەبەخشێ و، مرۆڤی مسوڵمان هەرگیز نابێ، ئەوەی خەڵكی دیكە لە خۆی دەوەشێنێتەوەو، لە بەرنامەكەی دەوەشێنێتەوە، ئەو لە خۆی بیوەشێنێتەوەو، بە شایستەی خۆی و بەرنامەكەی بزانێ.

٥)- ﴿ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَصِفُونَ ﴾، خوا دەفەرمووێ: ئێمە زاناترین بەوەی ئەوان باسی دەكەن و دەیڵێن، واتە: ئەوەی ئەوان دەیڵێن دەربارەی خوا ﷻو، نكووڵییكردن لە زیندووبوونەوەو، ئەوە كە گوایە خوا هاوبەشی هەیەو، ڕۆڵەی هەیە، هەروەها دەربارەی تۆ كە دەڵێن: جادووگەری، دەڵێن: ڕاست ناكەی، ئێمە زاناترین لە تۆ بە ئەوان.

كەواتە: با ئەوە تۆ زۆر نارەحەت نەكات، وات لێ بكات هاوسەنگییت تێكبداو، شتێكت لێ بپشكوێتەوە، قسەیەك، ڕەوشتێك، هەڵس و كەوتێك، كە شایستەی خۆت و بەرنامەكەت نەبێ، چونكە ئێمە زاناتریشین لە تۆ بەوەی ئەوان دەیڵێین، لە بارەی خوا ﷻو، لە بارەی پێغەمبەر ﷺو، لە بارەی ئیسلام و، لە بارەی قورئانەوە، كەواتە: بۆ ئێمەیان لێ بگەڕێ، خۆمان دەزانین چۆنیان سزا دەدەین، سزای پڕ بە پێست.

ئەوە بە نسبەت دوژمنە سەرسەختەكان و، كافرەكانەوە ئاوا مامەڵە بكە، ئەدی بە نسبەت شەیتانەكانەوە؟ لەو بارەوەش دەفەرمووێ:

٦)- ﴿ وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴾، هەروەها بڵێ: پەروەردگارم! پەنات پێ دەگرم لە دنەدانی شەیتانەكان.

(**همزات**) كۆی (**هَمْز**)ەو، بە مانای لێدان و فشار بۆ هێنان و ئەزیەتدان دێ، بە (**مجاز**)یش، بەكاردەهێنرێ بۆ ئازاردان، یاخود بۆ هاندان بۆ شەڕو خراپە.

٧)- ﴿ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴾، هەروەها (ئەی پێغەمبەر ﷺ هەر كەسێك لە ڕێیەی ئەوەوە دەڕوا)، بڵێ: پەروەردگارم! پەنا بە تۆ دەگرم لەوەی كە ئەوان ئامادەبن، واتە: شەیتانەكان لە لام ئامادەبن و تێكەڵ بە ئیش و كارم بن، پەنا بە تۆ دەگرم و، دێمە پەنای تۆ لە ئامادەبوونیان و لە نیزیكییان لە من، چونكە بەهۆی نیزیكییانەوە، دەتوانن زەفەرم پێ بەرن.

با لەو بارەوە لە كۆتایی شیكردنەوەمان بۆ ئەو ئایەتانەدا، ئەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ بێنین:

**١)- {عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ عَنِ خالد بْنِ الْوَلِيدِ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي أَجِدُ وَحْشَةً، قَالَ: إِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ فَقُلْ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ، وَعِقَابِهِ، وَشَرِّ عِبَادِهِ، وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَنْ يَحْضُرُونِ، فَإِنَّهُ لاَ يُضَرُّك وَبِالْحَرِيِّ أَنْ لاَ يَقْرَبَكَ} (أخرجه أحمد: ١٦٦٢٣، قال شعيب الأرنؤوط: حديث محتمل للتحسين بشواهده).**

واتە: موحەممەدی كوڕی یەحیای كوڕی حەببان دەیگێڕێتەوە: كە خالیدی كوڕی وەلید گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! شەوێ خەوم لێتێكچووە؟ (خەوی لێ دەزڕا)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: هەر كات چوویە سەرجێگایەكەت، بڵێ: پەنا بە وشە تەواوەكانی خوا دەگرم، لە تووڕەیی خواو، لە سزای خواو، لە خراپەی بەندەكانی، (خراپەی دروستكراوەكانی)و، لە دنەدانی شەیتانەكان كە لە لام ئامادەبن، ئەو كاتە بێگومان زیانت لێ نادات، بگرە شایستەیە، كە هەر نیزیكت نەكەوێ.

واتـه: بڵـێ: (أَعُـوذُ بِكَلِـمَاتِ اللَّـهِ التَّامَّـةِ مِـنْ غَضَبِـهِ، وَعِقَابِـهِ، وَشَرِّ عِبَـادِهِ، وَمِـنْ هَمَـزَاتِ الشَّـيَاطِينِ، وَأَنْ يَحْـضُرُونِ).

لـه ڕیوایەتـی دیکـەدا هاتـوه کـه خالیـد (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دوای ئـەوەی ئـەو دوعایـه دەخوێنـێ، ئـەو حاڵەتـی خـەو لێـزڕان و ترسـێنران و کابووسـەی نامێنـێ.

**٢)- {إِنَّ الشَّيْطَانَ يَحْضُرُ أَحَدَكُمْ عِنْدَ كُلِّ شَيْءٍ مِنْ شَأْنِهِ، حَتَّى يَحْضُرَهُ عِنْدَ طَعَامِهِ، فَإِذَا سَقَطَتْ لُقْمَةُ أَحَدِكُمْ، فَلْيَأْخُذْهَا فَلْيُمِطْ مَا كَانَ بِهَا مِنْ أَذًى، ثُمَّ لِيَأْكُلْهَا وَلاَ يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ، فَإِذَا فَرَغَ فَلْيَلْعَقْ أَصَابِعَهُ، فَإِنَّهُ لا يَدْرِي فِـي أَيِّ طَعَامِهِ الْبَرَكَةُ} (أخرجه مسلم: ٢٠٣٣).**

(واتـه: پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ:) شـەیتان ئامادەی یەکێکتـان دەبـێ، دێ بـۆ لای یەکێکتـان لـه کاتـی هەمـوو ئیـش و کارێکـی دا، تەنانـەت لـه کاتـی خواردنەکەیـدا دەیـەوێ لێـی نیزیـک بـێ، ئنجـا ئەگـەر یەکێکتـان پاروویێکـی لێکەوتـه خـوار، بـا ئەگـەر شـتێکی پێـوه بـوو، (پووشـکەیەک، شـتێکی پێـوه نووسـا) لێـی بکاتـەوەو، بیخـوات و، بـۆ شـەیتانی لێنەگـەڕێ و، هـەر کاتێـک تـەواو بـوو، بـا پەنجەکانیـش بلێسـێتەوە، (ئەگـەر چەورییـەک، شـتێکیان پێـوه هەبـوو)، چونکـه نازانـێ لـه کام لـه خواردنەوەکـەی دا پیـت و پێـزی خـوا هەیـه.

هەڵبەتـه لێـرەدا مەبەسـت ئـەو خواردنانەیـه، کـه دەگونجـێ هەڵبگیرێنـەوە، جـاری وایـه ئینسـان شـتێکی لێدەکـەوێ، پـاروه نانێکـه، شـتێکه لێـت دەکـەوێ، یـان میـوه قـاش دەکـەی، لێـت دەکـەوێ، شـوێنەکەش پیـس نیـه، ئەگـەر پووشـکەیەک، شـتێکی پێـوه نووسابێ، دەتوانـی لێـی بکەیـەوه و بیخـۆی، ئەگەرنـا خواردنێـک شـله بـێ و بـڕژێ، دیـاره کۆناکرێتـەوەو، مەبەسـت ئـەوە نیـه.

ئنجـا ئـەوەش هـەم قەناعـەت و شـوکرانه بژێریـی (سوپاسـگوزاریی) دەگەیەنـێ، هـەم جۆرێکـه لـه دەسـت پێوەگرتـن و شـت خەسارنەکردن، لـه ڕواڵەتەکەیـدا، لـه ڕووه مەعنەویـی و نابەرهەستەکەشـیەوە: هەمیشـه شـەیتانەکان دەیانـەوێ زیـان

بە مرۆڤ بگەیەنن لە ڕووی ئابووریی، لە ڕووی ئایینیی، لە ڕووی ڕەوشتیی، لە هەموو ڕوویەکەوە، مرۆڤیش دەبێ هەوڵ بدات، بە هیچ شێوەیەک شەیتان زیانی پێ نەگەیەنێ و، بەهرەمەندی نەکات لە هەڵس و کەوتەکانی خۆی و کەلێنی زیان لێدانی بۆ دروست دەکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان کـە دەرسـی کۆتاییـە لـە سـوورەتی (المؤمنـون)، بیسـت (٢٠) ئایەتـی کۆتایـی: (٩٩ - ١١٨)، دەگرێتـە خـۆی، کـە هەمـووی تەرخانکـراوە بـۆ باسـی قۆناغـی بـەرزەخ و ئاخیـر زەمـان و قیامـەت و، حاڵـی دژوارو پـڕ گرفتاریـی کافـرەکان لـە ڕۆژی دوایـی داو، پاڕانەوەیـان لـە خـوا کـە دەربازیـان بـکات و، وەڵامدانـەوەی نائومێـد کەرانـەی خـوا ﷻو، سەرزەنشـت کردنیـان لەسـەر هەڵوێسـتی خـراپ و سـتەمکارانەیان، لەگـەڵ بـڕواداران لـە ژیانـی دنیـادا.

پاشـان تەئکیـد کردنـەوەی ئـەو ڕاسـتییە، کـە خـوا بـە گاڵتـەو بـێ حیکمـەت دروسـتی نەکـردوون و، ناگونجـێ زیندووکردنـەوەو، پاداشـت و سـزای خـوا، لـە ئـارادا نەبـێ.

دوایـی جەختکردنـەوە لەسـەر یەکتایـی خـوا لـە پەرسـتراوێتیی دا، لـە کۆتاییـش دا فەرمـان بـە پێغەمبـەرﷺو شـوێنکەوتووانی کـراوە، کـە داوای لێبـوردن لـە خـوای بـە بەزەیـی بکـەن.

﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمٗا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا فَإِنۡ

عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّى جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾ قَٰلَ كَمْ لَبِثْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ فَسْـَٔلِ ٱلْعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا ۖ لَّوْ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بێبڕوایان لەسەر حاڵی خۆیان بەردەوام دەبن)، هەتا کاتێک یەکیان مردنی بۆ دێ، دەڵێ: پەروەردگارم! بمگێڕنەوە (بۆ ژیانی دنیا) ﴿٩٩﴾ بەڵکو لەوەدا کە جێم هێشتوە (ژیانی دنیا)، کردەوەی چاک بکەم، (پێی دەگوترێ:) نەخێر ئەوە هەر قسەیەکە خۆی دەیڵێ و، لە پشتیانەوە هەتا ڕۆژێ کە تێیدا زیندووەکرێنەوە، پەردەو نێوانێک هەیە ﴿١٠٠﴾ ئنجا هەر کات فوو بە کەڕەنادا کرا، نە ڕەچەڵەکیان لە نێواندا دەمێنێ و، نە داواش لە یەکدی دەکەن (چونکە دڵنیان بێ سوودە) ﴿١٠١﴾ ئنجا هەر کەس تای تەرازووەکانی چاکەی (یان کردەوە باشە کێشراوەکانی)، گران بن، ئەوە ئەوانەن سەرفرازان ﴿١٠٢﴾ هەر کەسێکیش تای تەرازووەکانی چاکەی (یان کردەوە باشە کێشراوەکانی) سووک بن، ئەوانە

خۆیـان لـە دەسـتداوە، لـە دۆزەخ دا هەمیشـەیین (هـەر مـاون) ﴿١٠٣﴾ (بڵێسـەی) ئاگـر لـە ڕوویـان دەدات و، تێیـدا دەم و لێـو هەڵقرچـاوو ددانگـرژ دەبـن ﴿١٠٤﴾ (خـوا پێیـان دەفەرمـوێ:) ئایا ئایەتەکانمتـان بەسـەردا نەدەخوێنرانـەوە، کەچـی (لـە جیاتـی ئیـمان پێهێنـان) بـە درۆتـان دادەنـان! ﴿١٠٥﴾ گوتیـان: پەروەردگارمـان! (بـە هـۆی کوفـرو تاوانـەوە) بەدبەختیـی بەسـەرمان دا زاڵبـووو، ئێمـە لـە گومڕایـان بوویـن ﴿١٠٦﴾ پەروەردگارمـان! لـە دۆزەخ دەرمـان بێنـە، ئەگـەر (جارێکـی دیکـە) گەڕاینـەوە (سـەر کوفـرو لادان و تـاوان) ئـەوە بێگومـان سـتەمکارین ﴿١٠٧﴾ (خـوا) فەرمـووی: تێیـدا ڕیسـواو زەبـوون بـن و مەمدوێنـن ﴿١٠٨﴾ (لـە دنیـادا) کۆمەڵێـک لـە بەندەکانـم دەیانگـوت: پەروەردگارمـان! بڕوامـان هێنـا، دەجـا لێـمان ببـوورەو بەزەییـت پێـمان دابـێ و، تـۆ بەبەزەییترینـی بـە بەزەییانـی ﴿١٠٩﴾ کەچـی ئێـوە (ی بێبـڕوا) کردبووتاننـە گاڵتەجـاڕ، هەتـا (گاڵتـە پێکردنیـان لەلایـەن ئێـوەوە) یـادی منیـان لەبیربردبوونـەوەو، ئێـوە پێیـان پێدەکەنیـن ﴿١١٠﴾ ئەمـڕۆش مـن بـە هـۆی خۆڕاگرییانـەوە، پاداشـتم داونـەوە (بـە بەهەشـت)و، بـە ڕاسـتیی تەنیـا ئـەوان سـەرفرازو بەمـراد گەیشـتوون ﴿١١١﴾ (خـوا) فەرمـووی: ژمـارەی چەنـد سـاڵان لـە زەوی دا ماونـەوە؟ ﴿١١٢﴾ گوتیـان: ڕۆژێـک یـان بەشـێکی ڕۆژێـک، لـە ژمێـرەران (حیسـاب ڕاگـران) بپرسـە ﴿١١٣﴾ (خـوا) فەرمـووی: تەنیـا کەمێـک ماونـەوە، ئەگـەر زانیباتـان (ژیانـی دنیـا لـە چـاو قیامـەت هێنـدە کـەم و کورتـە، لەسـەری تووشـی ئـەم حاڵـە نەدەبـوون) ﴿١١٤﴾ ئایـا پێتـان وایـە کـە بـە گاڵتـەو پـووچ دروسـتمان کـردوون و، وا دەزانـن بـۆ لامـان ناگێڕدرێنـەوە (بـۆ سـزاو پاداشـت)؟ ﴿١١٥﴾ بەرزیـی بـۆ خـوای حوکمڕانـی هـەق (کـە ئـەوە لـە خـۆی بوەشـێنێتەوە،) جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، خاوەنـی بـارەگای بەڕێـزە ﴿١١٦﴾ هـەر کەسـێکیش لەگـەڵ خـوادا لـە پەرسـتراوێکی دیکـە بپاڕێتـەوە، کـە بەڵگـەی لەسـەری نیـە، ئـەوە لێپرسـینەوەی لـەلای پەروەردگاریەتـی، بـە دڵنیایـی کافـران سـەرفراز نابـن ﴿١١٧﴾ بشـڵێ: پـەروەردگارم! لێـم ببـوورەو بەزەییـت پێـم دابـێ و، تـۆ باشـترینی بـە بەزەییانـی ﴿١١٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بَرۡزَخٌ): (الـبَرْزَخُ: الحَاجـزُ بَـيْنَ مكانـين)، (بـرزخ) بریتیـە نێوانێـک یـان پەردەیـەک کـە دەکەوێتـە نێـوان دوو شـوێنانەوە، لـە ئەصڵـدا لـە ڕووە زمانەوانییەکەیـەوە وایـە.

(ٱلصُّورِ): (الصُّـورُ: البُـوقُ الَّـذِي يَنْفـخُ فِيـهِ النَّافِخُ للتجَمُّـعِ وَالنَّفِيرِ)، (بـوق) کەڕەنای پـێ دەگوتـرێ، بریتیـە لـەوە کـە فووکەرێـک فـووی پێـدا دەکات، بـۆ ئـەوەی خەڵـک کۆبکاتـەوەو، هەڵسـن، مەبەسـت لـە (صور)یش ئەوەیـە ئـەو ئامێرەیـە کـە ئیسـڕافیل لـە قیامەتتـدا دوو جـاران فـووی پێـدادەکات، جارێکیـان بـۆ ئـەوە ئاخیـر زەمـان (سـاعة) بـێ و، ئـەم گەردوونـە تیکبچـێ، جارێکـی دیکـە شـیان بـۆ هەڵسـانەوەو، زیندووبوونـەوەی ئەوانـەی کـە خـوا ﷻ زیندوویـان دەکاتـەوە کـە مرۆڤـەکان و جینـن.

(تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ): واتـە: بڵێسـەی ئاگـر بـە توندیـی لـە دەم و چاویـان دەدات، (اللَّفْـحُ: شِـدَّةُ إِصَابَـةُ النَّـار) (لَفـح) بریتیـە لـەوەی بـە توندیـی بڵێسـەی ئاگـر لـە شـتێک بـدات.

(كَٰلِحُونَ): (جمـع كالـح: الَّـذِي بـهِ كُلـوحُ)، (كَالِـح) کەسـێکە حاڵـەتی کلووحـی تـووش بـووە، (الكُلـوحُ: تَكَشُّرُ فِـي عُبُـوسٍ)، (کلـوح) واتـە: ئەوەیـە کـە مـرۆڤ بـە گرژییـەوە ددانـەکانی گـڕ بووبـن، واتــە: لێوێکیانـی چووبێتـە سـەرو یەکێکیانـی چووبێتـە خـوارو، ددانـەکانی دەربکـەون و، گـڕ بـبن.

(غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا): (الغَلَـبُ: الإسْـتِيلاءُ وَالقَهْـرُ)، (غلـب) بریتیـە لە زاڵبوون و خسـتنە ژێـر کۆنتـڕۆڵ و ژێـر چەپـۆک، (مَفْعُـولُ غَلَبَـت مَحْـذُوفٌ)، بەرکارەکـەی قرتێـنراوە، (يَدلُّ عَلَيْـه «شِـقْوَتُنَا» لأنَّ الشِّـقْوَةَ تقابلهَـا السّـعَادَة، أي: غَلَبَـتْ شَـقْوَتُنَا السَّـعَادَة)، بـەرکاری

(**غَلَبَت**) قرتێنراوە، وشەی (**شَقْوَتُنَا**) دەیگەیەنێ، چونکە (**شِقْوَتُنَا**) واتە: بەدبەختیی، بەرانبەرەکەی بەختەوەرییەیانی: بەدبەختییمان بەسەر بەختەوەرییماندا زاڵ بووە.

(**ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا**): (**خَسَأَ، ذَلَّ**)، زەبوون بوو.

کە خوا ﷻ دەفەرمویّ: (**ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا**) لە دۆزەخدا زەبوون و زەلیل بن، من نەمویست لە تەفسیری قورئاندا ئەو وشەیە بەکاربێنم، ئەگەرنا لە تەفسیرەکاندا هاتووە: (**إخسأ**) بۆ دەنگدانی سەگ بەکاردێ، بە کوردیی دەگوترێ: چخە، بەڵام من پێم وایە خوا ﷻ بەس فەرموویەتی: بێ دەنگ بن، منیش وام ماناکردوە، کە خوا دەفەرمویّ: تێیدا ڕیسواو زەبوون بن و، بێ دەنگ بن و مەمدوێنن.

(**سِخۡرِيًّا**): خوێنراویشەتەوە: (**سُخْرِيًّا**) واتە: کردبووتانن بە گاڵتەجاڕ، مایەی گاڵتەپێکردن، یاخود (**سِخۡرِيًّا**) ئێوە ئەوانتان بە سۆغرەو بێگار دەگرت.

(**ٱلۡعَآدِّينَ**): ژمێرەران لە حیساب ڕاگران بپرسە، (**سَلِ الحُسَّاب**) یانی: بپرسە لەوانەی چاکیان ژماردوە، ئەگەرنا ئێمە پێمان وایە ژیانی دنیا ڕۆژێک بووە، یان کەمتر لە ڕۆژێک.

(**عَبَثٗا**): (**العَبَثُ: العَمَلُ الَّذِي لاَ فَائِدَةَ فِيهِ**)،(**عبث**) هەر کارێک کە سوودی نەبێ، واتە: هەوەنتە، بە پووچ و، بێ حیکمەت.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، واتـە: لـە بیسـت (٢٠) ئایەتـی کۆتایـی دا، کـە هەمـووی (١١٨) ئایەتـە، لـە ئایەتەکانـی: (٩٩ - ١١٨)دا، باسـی سـەرەنجامی هەمـوو لایـەک دەکات، بـە تایبـەت سـەرەنجامی ئەهلـی کوفـرو شـیرک، ئەوانـەی کـە بـەو شـێوە کەللـەڕەق و عینادییـە لەگـەڵ پەیامـی خـواو، لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا ﷺ مامەڵـە دەکـەن، ئایـا سـەرەنجامیان چـۆن دەبـێ؟ هـەم لـە سـەرەمەرگدا، هـەم لـە قۆناغـی بەرزەخدا، هـەم لـە قیامەتدا، کـە دەچنـە دۆزەخـەوە، سـەرەنجامیان چـۆن دەبـێ، هەروەهـا بـە بۆنـەی باسـکردنی ئەوانـەوە، ئاماژەیەکیـش کـراوە بـە سـەرەنجامی سـەربەرزانەو بەختەوەرانـەی ئەهلـی ئیـمان، کـە ئـەو کافرانـە زۆر ئازاریـان داون و، ناڕەحەتیـان کـردوون و، گاڵتەیـان پـێ کـردوون و، پێیـان پێکەنیـون، ئەوانیـش چ سـەرەنجامێکی بەختەوەرانـەو سـەربەرزانەیان دەبـێ، ئـەم ئایەتانـە باسـی ئـەوەن.

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴾، واتـە: بێبڕوایـان لەسـەر ئـەو حاڵەتـە کەللەڕەقانـەو نەفامانەیـان بـەردەوام دەبـن، لەسـەر بێبڕوایـی و هاوبـەش بـۆ خـوا پەیداکـردن و، لاسـایی کردنـەوەی کوێرانـەی پێشـینان و، ئەفسـانە پەرسـتیی، بـەردەوام دەبـن، هەتـا کـەی؟ ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ ﴾، هەتـا کاتـێ یەکێکیـان مردنـی بـۆ دێ، لـە سـەرەمەرگ دا: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴾، گوتـی: پـەروەردگارم! بمگێڕنـەوە، لـە پـەروەردگاری دەپاڕێتـەوەو، بـە فریشـتەکانیش دەڵـێ: بمگێڕنـەوەو، جـارێ مەممرێنـن، یاخـود بـە ڕاناوی کـۆ (جمع) باسـی خـوا ﷻ دەکات، پـەروەردگارم! بمگێڕنـەوە، ﴿ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ﴾، بەڵکـو لـەو ژیانـە دنیاییـەی کـە بەجێـم هێشـتوە، کـردەوەی بـاش بکـەم، ئەگـەر

تاكو ئێستا خراپەم كردوە، لەمەودوا كردەوەی باش بكەم، یانی: جارێكی دیكە تاقیم بكەوە، یاخود: جارێ مەممرێنە، دەبێ ئەوە لە حاڵەتی سەرەمەرگدا بێ، بەڵام پێی دەگوترێ: ﴿كَلَّآ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا﴾، واتە: نەخێر، ئەوە وشەیەكە (قسەیەكە) ئەو بێژەریەتی، وشەی (كَلَّا): (كلمة رَدْعٍ وَزَجْر)، بۆ بەرپەرچدانەوەو تێخوڕینە، واتە: نەخێر، با بێ دەنگ بێ، ئەو داوایەی وەرناگیرێ، ﴿إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا﴾، ئەوە وشەیەك و قسەیەكە بەس ئەو دەیڵێ و، كەس لێی وەرناگرێ، كەس نایبیستێ، چونكە پێچەوانەی سیستمی خوایە ﷻ، خوا هەر كەسەو ماوەیەك لە ژیانی بۆ داناوەو، لەو ماوەیەدا تاقی دەكرێتەوە، دەبێ لە ماوەی تاقیكردنەوەی خۆتدا، وەڵامی پرسیارەكانی خۆت بدەیەوە نەك دوایی!

ئایا قوتابییەك كە دەخرێتە هۆڵێكەوە، بۆ تاقیكردنەوەو وەڵامدانەوە، دوو سەعات، سێ سەعاتی كات بۆ دانراوە، دوای ئەوەی كاتەكەی بەسەردەچێ، بۆی هەیە بڵێ: ئەو دوو سێ سەعاتە خۆم خافڵاند، ئێستا وەڵام دەدەمەوە؟ نەخێر، كاروباری دنیاییش هەر وایە، چ جای سیستمی خوایی ﷻ، كە خوا بەوپەڕی حیكمەت و لێزانییەوە، نەخشەو بەرنامەی ژیان و گەردوون و دروستكراوەكانی خۆی داناوەو، دەستكاریی ناكرێ، هەر شتە لە جێی خۆی دایە، بۆیە دەفەرمویێ: ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾، لە پشتیانەوەش پەردەیەك هەیە، تاكو ئەو كاتەی تێیدا زیندوو دەكرێنەوە، واتە: دوای ئەوەی كە ڕووحیان لە جەستەیان جیادەبێتەوە، پەردە پۆش دەكرێن، پەردەیەك دەكەوێتە نێوان ئەوان و ژیانی دنیاوە، تاكو ڕۆژی دوایی، دەكەونە قۆناغێكی دیكەوە، ئێستا قۆناغی ژیانی دنیایە، كە ڕووحیان لە جەستە جیادەبێتەوە، دەكەونە قۆناغێكی دیكەوە، قۆناغێكی ڕاگوزەر (المرحلة الإنتقالية)ەوە، كە قۆناغی بەرزەخی پێ دەگوترێ، ئێمە دوایی لە كورتە باسێك دا، باسی قۆناغی بەرزەخ و جیهانی بەرزەخ دەكەین، ئنجا ئایا هەتا كەی ئەو قۆناغی بەرزەخە بەردەوام دەبێ؟ تاكو ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەكرێنەوەو هەڵدەستێنرێنەوە ﴿إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ﴾.

﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾، ئەو ڕۆژە کە فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، نە ڕەچەڵەکیان لە بەین دا دەمێنێ و، نە لە یەکدیش داوا دەکەن، واتە: با بە تەمای خزمایەتیی و، بە تەمای دەتناسم و ناتناسم نەبن و، (با ئیمانێ بە نیسکێ نەسپێرن)، با بە تەمای خزمایەتیی و، ڕەچەڵەک تێنەکەون و، خۆیان بە هەڵەدا نەبەن، یەک بڵێ: من خزمی پێغەمبەرم ﷺو، ئەوی دیکە بڵێ: من خزمی فڵان ئیمامەم و، ئەوی دیکە بڵێ: خزمی فڵان مامۆستایەم، خزمی فڵان شێخەم، ئەوە هیچ دەردێک چارە ناکات، لە لای خوای پەروەردگار ڕەچەڵەک (**نسب**)و واستەو واستەکاریی نیە، ئەوە لە دنیادا وایەو، لە دنیاش دا ئەوە ستەم (**ظلم**)ە، ئەگەرنا دەبێ هەر کەسەو بە پێی ماف و لێوەشاوەیی خۆی بێ، نەک لەبەر ئەوەی کەسێک کوڕی فڵانکەسەو، نەوەی فڵان کەسەو، حیزبی فڵانکەسە، یان عەشیرەتی فڵان کەسە، فڵان ئیمتیازەی پێ بدرێ و، بەسەر خەڵکی دیکەدا هەڵبکێشرێ!، ئەوە ستەمە، ئنجا شتێک کە خوا لە دنیادا حەڕامیکردوە و، زوڵم و ستەمە، یان خاتر گرتن و، واستەو واستەکاریی و.... هتد، شتێک کە خوا لە مرۆڤەکانی قەدەغە کردوە، چۆن بۆ خۆی دەیکات؟ خوا دەفەرموێ: هەر کات فوو بە کەڕەنادا کرا، نە ڕەچەڵەک و نەسەبیان لە بەیندا دەمێنێ و، نە داواش لە یەکدی دەکەن، بۆچی داوا لە یەکدی ناکەن؟ چونکە دەزانن بێ سوودە، وەک دوایی بە وردیی باس دەکەین.

ئەدی ئایا سەرەنجامەکان چۆن دەبن؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾، ئنجا هەر کەسێک تەرازووەکانی قورس بن، تەرازووی چاکەکانی، ئا ئەوانەن سەرفرازان، (مَوَٰزِينُهُۥ) کۆی (میزان)ە، واتە: تەرازووەکانی قورس بن، یاخود (مَوَٰزِينُهُۥ)، کۆی (**موزون**)ە، واتە: چاکە کێشراوەکانی قورس بن، (کردەوە چاکەکانی کە دەکێشرێن)، ئا ئەوانە سەرفرازن.

﴿ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾، بەڵام ئەوەی تەرازووەکانی (چاکەکانی)، کە مەرج نیە، تەنیا یەک تەرازوو بێ، خوا ﷻ کۆمەڵێک تەرازوو دادەنێ، وەک لە سەرەتای

تەفسیری سووڕەتی (**الأعراف**)دا، بە تەفصیل لەو بارەوە باسێکمان کردوە، کە: ئیمان تەرازووی خۆی هەیە، نوێژ تەرازووی خۆی هەیە، ڕۆژوو تەرازووی هەیە، هەر کام لە کردەوەکان، تەرازووی خۆیان هەیە، یاخود (موازین) یانی: کێشراوەکان، هەر کەسێک، چاکە کێشراوەکانی سووک بوون، ﴿فَأُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾، ئەوانە کەسانێکن، خۆیانیان لە دەست داوە، خۆیان دۆڕاندوە، ئنجا کەسێک خۆی لە دەست بدات و بدۆڕێنێ، مانای وایە هەموو شتێک چاکتر دەدۆڕێنێ، سەرەنجامیان چۆنە؟ ﴿فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ﴾، لە دۆزەخ دا هەرماو دەبن، بە هەمیشەیی دەمێننەوە، ئنجا ئایا چۆن دەگوزەرێنن لە دۆزەخ دا؟

﴿تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ﴾، بڵێسەی توندی ئاگر لە دەم و چاویان دەدات، ﴿وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ﴾، لە ئەنجامی ئەو لێدانی بڵێسە توندەی ئاگردا، حاڵەتی (**کلوح**) یان بەسەر دێ، (**کلوح**) یانی چی؟ یانی: لێوەکانیان هەڵدەقرچێن، دەم و چاوو پێستیان دەسووتێ و، لێوەکانیان هەڵدەقرچێن، لێوی سەرێ بەرەو سەرێ و، هی خوارێ بەرەو خوارێ، سەرەنجام ددانەکانیان گرژدەبن و، دەمیان دەکرێتەوە، دیمەنێکی زۆر ناشیرین!!

ئنجا خوا ﷻ پێیان دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِي تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾، ئایا ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێنرانەوە؟ ﴿فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾، کەچی ئێوە ئایەتەکانتان بە درۆ دادەنان، ئەمە پرسیارلێکردنی سەزەنشتکەرانە، (**إستفهام توبيخي**)یە، خوا بەسەرزەنشت و، بە تێخوڕینەوە، بەسەرکۆنە کردنەوە، دەفەرموێ: ئەدی ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێنرانەوە؟ ئەو ئایەتانەی دەیانفەرموو: تووشی ئەمڕۆ دێن، ئەو ئایەتانەی دەیانفەرموو: ئێوە بۆ تاقیکردنەوە لەسەر زەوی دانراون، ئەو ئایاتانەی دەیانفەرموو: بزانن بۆچی دروستکراون، خوای پەروەردگار دنیای نەکردوە بە شاری بێ خاوەن و، مرۆڤی بەهەوەنتەو پووچ نەخوڵقاندوە، مرۆڤ زیندوو دەکاتەوە، لێی دەپرسێتەوە، سزا هەیەو پاداشت هەیە، ئایا ئەو ئایەتانەتان بەسەر نەدەخوێنرانەوە؟

﴿ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا ﴾، گوتیان: پەروەردگارمان! بەدبەختییمان، ناخۆشحاڵییمان بەسەرماندا زاڵ بوو، (شِقوة)، کە خوێندراویشەتەوە: (شَقاوتنا)، (شَقِيَ)، واتە: ناڕەحەت بوو، بەد بەخت بوو، بێمراد بوو، پێچەوانەی (سَعِد) یە، یانی: بەختەوەر بوو، لێرەدا وەک دواییش باسی دەکەین، ﴿ غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا ﴾، واتە: بێمرادیی و بەدبەختییمان بەسەر بەختەوەریماندا زاڵ بوو، ﴿ وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴾، ئێمە کۆمەڵێکی گومڕاو سەرلێشێواوو سەرگەردان بووین، ئێمە لە ڕێ ون بوو بووین، (ضال) کەسێکە ون بووە، ئەگەرنا ڕێیەکە دیارە، بەڵام ئەو لەو ڕێیە ون بووە، لایداوەو دوورکەوتۆتەوە.

﴿ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴾، پەروەردگارمان! دەرمان بێنە لێی (لەم دۆزەخە)، ئەگەر گەڕاینەوە، ئێمە ستەمکارین، هەڵبەتە ئێستاش هەر ستەمکارن، بەڵام دەڵێن: ئەمجارە تاقیمان بکەوەو، دەرمان بێنە لە دۆزەخ و، بمانبەوە بۆ ژیانی دنیا، جارێکی دیکە تاقیمان بکەوە، ئنجا ئەگەر جارێکی دیکە گەڕاینەوە بۆ ئەوەی ئێستا لەسەری تووشی ئەم دۆزەخە بووین، ئەو کاتە ستەمکارین، بەڵام خوا چی دەفەرمویٚ؟

﴿ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾، (خوا) فەرمووی: تێیدا زەبوون بن و مەمدوێنن، زەبوون بن، ئەو ڕێزو حورمەتەی خوا لێی نابوون، ڕێزو حورمەتەکەتان لە دەستدا، بە هۆی کوفرەوە:

أ- خوا لە سووڕەتی (الإسراء)دا فەرموو بووی: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾ ﴾، واتە: ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرت.

ب- خوا فەرموو بووی: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾التين، واتە: ئینسانمان لە باشترین شێوەو پێکهاتە دروست کردوە.

ج- خوا فەرموو بووی: ﴿ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴿٣٠﴾ ﴾البقرة، واتە: من جێنیشینێک لەسەر زەوی خوا دادەنێم، ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴿٣٩﴾ ﴾فاطر، واتە: (خوا) ئەو کەسەیە گێڕاونی بە جێنیشینانی لە زەویدا....

بەڵام ئەو ڕێزو حورمەتەتان لەدەستدا، ئێستاش دەتانەوێ بە پێی هەواو ئارەزووی ئێوە خوا ﷻ سیستمی خۆی بگۆڕێ! شتی وا نابێ، ئنجا خوا ﷻ هەندێ شتیان دەخاتەوە بیر، کە ئێوە بەهۆی ئەو کردەوەو ڕەفتارانەوە، تووشی ئەم ڕۆژە بوون: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی کۆمەڵێک لە بەندەکانی من دەیانگوت: (واتە: لە دنیادا)، پەروەردگارمان! بڕوامان هێناو لێمان ببوورەو بەزەییت پێمان دابێ، تۆ باشترینی بە بەزەییانی، یانی: لە بیرتانە! کە کۆمەڵێ بەندەم هەبوون، بەو شێوەیە لە من دەپاڕانەوە!

﴿ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا ﴾، کەچی ئێوە کرتبووتان بە گاڵتەجارو، کردبووتانن بە مایەی گاڵتە پێکردن و جەفەنگی خۆتان، ﴿ حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى ﴾، تەنانەت هێندە دژایەتییتان دەکردن و بە گاڵتە پێتان ڕادەبواردن، هەتا یادی منیان لە بیرتان بردبۆوە، واتە: گاڵتەپێکردنی ئێوە بەوان، هێندە زۆر بوو، سەرقاڵی کردبوون و، نەتاندەپڕژایە سەر ئەوەی بیرێک لە من بکەنەوە، ﴿ وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴾، هەروەها ئێوە پێیان پێدەکەنین.

ئەمە هەم دڵدانەوەیە بۆ ئیمانداران، کە لە دنیادا ئەهلی کوفر گاڵتەیان پێ دەکەن، کە بزانن! ڕۆژێک دێ، خوا ئەوەیان دەخاتەوە بیرو، لەسەر ئەو گاڵتەپێکردنەی ئەوان بە ئێوەو، لەسەر پێکەنینیان بە ئێوە، تووشی سزای سەخت دەبن.

ئنجا خوا بە کافرەکان دەفەرموێ: ﴿ إِنِّى جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ ﴾، ئەمڕۆ من بەهۆی ئەوەوە کە خۆڕاگر بوون، پاداشتم دانەوە، پاداشتم داونەوە بە چی؟ ﴿ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾، پاداشتم بەوە داونەوە کە: بە دڵنیایی هەر ئەوان بە مراد گەیشتووو سەرفرازن.

ئنجا خـوا ﷻ پرسـیارێکیان ئاڕاسـتە دەکات: ﴿ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴾، (خـوا) فەرمـووی: لەسـەر زەوی ژمـارەی چەنـد سـاڵان ماونـەوە؟ یانـی: ئـەو ژیانـە دنیاییـە کـە لەسـەر زەوی گوزەراندتـان، مـاوەی چەنـد سـاڵ بـووە؟ ژمارەی سـاڵەکان چەنـد بـووە؟.

﴿ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ ﴾، گوتیـان: یـان ڕۆژێـک، یـان بەشـێک لـە ڕۆژێـک ماوینـەوە، ﴿ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ﴾، دەجـا لـە ژمێـرەران، لـە حیسـاب ڕاگران بپرسـە، یانی: ئێمـە هـەر ئەوەنـدەی لـێ دەزانیـن، کـە بـە بـەراورد لەگـەڵ قیامەتـدا ڕۆژێـک، یـان بەشـێک لـە ڕۆژێـک ماوینـەوە، چونکـە ئـەو کات (زمـن) دەوەسـتێ، کاتـی ئـەوێ بـێ کۆتاییـە، هـەر چـۆن ژیانـی دنیـای لەگەڵـدا بـەراورد بکـرێ، هـەر زۆر کـەم دێتـە بەرچـاو.

﴿ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾، (خـوا) فەرمـووی: نـە ماونـەوە جگـە لـە کەمێـک، تەنیـا کەمێـک ماونـەوە لـە ژیانـی دنیـادا، ﴿ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾، ئەگـەر ئێـوە زانیارییتـان ببووایـە، واتـە: ئەگـەر ئێـوە زانیارییتـان ببووایـە، کـە ئـەو قیامەتـە، ڕۆژی دوایـی، نابڕێتـەوە، ئەگـەر ئـەو زانیارییەتـان ببووایـە، لەسـەر ئەوەنـدە تـۆزە ژیانـە دنیاییـە، خۆتـان ئـاوا شـەرمەزارو خەجاڵەتـی خـواو، گوناهبـارو عەیبـدار نەدەکـرد.

ئنجـا لـە کۆتایـی دا پێیـان دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ﴾، ئایـا پێتـان وایـە: ئێوەمـان بـە پـووچ، بـە هەوەنتـەو، بـێ حیکمـەت دروسـتکردووەو، پێتـان وایـە ئێـوە بـۆ لای ئێمـە ناگێڕدرێنـەوە؟

یانـی: ئەگـەر نەگێڕدرێنـەوە بـۆ لای ئێمـەو، خـوا لێتـان نەپرسـێتەوە، کەواتـە: ژیانەکەتـان پووچـە، ژیانەکەتـان هەوەنتەیـەو، بـێ حیکمەتـە، ئنجـا ئایـا ئـەوە شایسـتەی خوایـەو، لـە خـوا دەوەشـێتەوە؟ نەخێـر.

﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ ﴾، بەرزیـی بـۆ خـوای حوکمڕانـی هـەق، کـە کاری بـێ حیکمـەت بـکات، شـتی پـووچ و هەوەنتـە بـکات، مرۆڤـەکان دروسـت بـکات و

بەریان داتە ژیانی دنیا، کێ چاکە دەکات بیکات و، کێ خراپە دەکات بیکات، دوایی ڕۆژێک نەبێت و، کەسێک نەبێ بە چاکەکارەکان بڵێ: چاکەتان کردو، ئەوەش پاداشت و، بە خراپەکارەکانیش بڵێ: خراپەتان کردو، ئەوەش سزا، ئەوە شتێکی پووچەو، خوا بەرزە، لەوەی کاری وای لێ بوەشێتەوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ﴿ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ﴾، خاوەنی بارەگای پڕ ڕێزو حورمەتە، بۆیە کاری پێچەوانەی ڕێزو حورمەت و، شتی پێچەوانەی حیکمەت لە خوا ناوەشێتەوە.

﴿ وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ ﴾، هەر کەسێ لەگەڵ خوادا لە پەرستراوێکی دیکە بپاڕێتەوە، کە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای نەبێ لەسەری، ﴿ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ﴾، بە دڵنیایی لێپرسینەوەی لەلای پەروەردگاریەتی، خوا لێی دەپرسێتەوە، پەروەردگاری حیساب و کیتابی لەگەڵدا دەکات، ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾، بە دڵنیایی بێبڕوایان سەرفرازنابن، بە کام و بە مرادی خۆیان ناگەن.

لە کۆتاییدا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، بڵێ: پەروەردگارم! ببوورەو بەزەیی بنوێنە، لە من ببوورەو بەزەییم لەگەڵدا بنوێنە، یاخود لە خۆم و لە شوێنکەوتووانم ببورەو بەزەییمان لەگەڵ دا بنوێنە، ﴿ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی تۆ باشترینی بە بەزەییانی.

ئێمەش دەڵێین: ﴿ رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، پەروەردگارمان! لێمان ببوورە لە کەم و کوڕییەکانمان، لە هەڵەو تاوانەکانمان و بەزەییمان لەگەڵدا بنوێنە، بە تەئکید خوا ﷻ خاوەن بەزەییەکە، کە هیچ کەس ئەو بەزەییەی نیە، چونکە هەر کەسی دیکە کە بەزەیی هەیە، بەزەییەکەی لە بەزەیی خواوە سەرچاوەی گرتوە، خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی سەرەنجامان خێر بکات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

کاتێک یەکێک لە کافران مردنی دەگاتە سەرێ، داوای گەڕانەوە بۆ ژیانی دنیا دەکات، تاکو ئەوەی لە دەستی چووە، قەرەبووی بکاتەوە، بەڵام قسەکەی بێ سوودەو، دوای گیان کێشران، مرۆڤەکان دەکەونە قۆناغی بەرزەخەوەو، کاتێکیش فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، ڕەچەڵەک ناخوێنرێتەوەو، هیچکەس هیچ شتێک لە کەس داوا ناکات، چونکە دەزانێ بێ سوودەو، سەرەنجام: ئەوانەی تا تەرازووی چاکەکانیان قورسە، سەرفرازو، ئەوانەی تا تەرازووی چاکەکانیشیان سووک بێ، دۆڕاون و، بڵێسەی دۆزەخ دەم و چاویان هەڵدەقرچێنێ و، دەم و ددانیان گڕ دێتە بەرچاو:

خوا دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَاۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلۡفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمۡ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ ﴾، هەتا کاتێک یەکێکیان مردنی بۆ هات، ئەم (حَتَّىٰٓ)یە، وەک شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن، دەگونجێ:

أ- (حَتَّىٰٓ: **الإبتدائية**)بێ و، پەیوەست نەبێتەوە بە شتێکی پێش خۆیەوە، یەکێک لە شێوازەکانی زمانی عەرەبیی ئەوەیە کە یەکسەر بە (حَتَّىٰٓ)، دەستیان پێکردوە، وەک سەرەتای قسە، نەک پەیوەست بێتەوە بە پێشوو.

ب- دەشگونجێ (حَتَّىٰٓ)، شتێکی بۆ بۆ دابنرێ، بۆ وێنە: (**يَسْتَمِرّونَ عَلَى مَا هُم عَلَيْهِ**: حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ)، لەسەر ئەو حاڵەی کە لەسەرینی بەردەوام دەبن، هەتا یەکێکیان مردنی گەیشتە سەرێ، ئەو کاتە ئاوا دەڵێ و، ئاوای لێ دەگوزەرێ.

٢)- ﴿قَالَ رَبِّ ٱرۡجِعُونِ﴾، (هەتا یەکێکیان کە مردنی گەیشتە سەر)، گوتی: پەروەردگارم! بمگێڕنەوە.

(ٱرۡجِعُونِ)، لە لایەکەوە دەڵێ: (قَالَ رَبِّ)، پەروەردگارم! واتە: بە تاک دەیهێنێ و، ناڵێ: (ربنا)، دەڵێ: (رَبِّ)، ئنجا دەڵێ: (ٱرۡجِعُونِ)، بمگێڕنەوە، بۆیە زانایانی شارەزای قورئان، لەو بارەوە ڕاجیایان هەیە:

أ- هەندێکیان دەڵێن: ڕاناوی کۆ (جمع) کە بەکارهاتوە، بۆ بە مەزنگرتنی خوای پەروەردگارە، یانی: پەروەردگارم! بمگێڕنەوە.

ب- یاخود ئەوەی پێشێیان پاڕانەوەیە لە پەروەردگارو، ئەوەی دووەمیان قسەکردنە لەگەڵ فریشتەکاندا، دەڵێ: پەروەردگارم! فریشتەکان بمگێڕنەوە، پێشێ لە پەروەردگار دەپاڕێتەوە، دوایی داوا لە فریشتەکان دەکات، کە جارێ گیانی نەکێشن و، بیگێڕنەوە لە دنیادا بژی بۆچی؟

٣)- ﴿لَعَلِّيٓ أَعۡمَلُ صَٰلِحٗا فِيمَا تَرَكۡتُۚ﴾، بەڵکو لەو ژیانە دنیاییەدا کە بەجێی دەهێڵم و، بەجێم هێشتوە کردەوەی باش بکەم.

(فِيمَا تَرَكۡتُۚ)، دوو ئەگەری هەن:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ژیانی دنیابێ، واتە: ئەو ژیانە دنیایەی بەجێم هێشتوە، یان خەریکە بەجێی دێڵم، بە ڕابردووش دەیهێنێ، ئەگەرنا جارێ لە گیانەڵا دایە، وا پێدەچێ ئەوە لە حاڵەتی سەرەمەرگدا بڵێ.

**ب-** دەشگونجێ (فِيمَا تَرَكْتُ)، یانی: ئەو شتەی پێشتر وازم لێهێناوەو، ڕەفزمکردوەو نکووڵییم لێکردوە، ئێستا بچم کردوەی باش بکەم و، قەرەبووی بکەمەوە.

بەڵام چی وەڵام دەدرێتەوە؟

**٤)-** ﴿كَلَّآۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا﴾، نەخێر ئەوە وشەیەکە ئەو بێژەریەتی، (**كَلاَّ: كَلِمَةُ رَدْعٍ للسَّامِعِ ليعلمَ بُطْلاَنَ طلبةِ الكَافِرِ**)، (**كَلاَّ**)، وشەیەکە یانی: نەخێر، (بەڵام بەس نەخێر نیە، بەڵکو تێخوڕین و سەرزەنشت کردنیشی لەگەڵ دایەو، نەخێرەکە بە توندییە) بۆ بابای بیسەریشە تاکو پووچیی داواکاریی بێبڕوا بزانێ.

﴿إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا﴾، ئەو قسەیەی دەیکات، وشەیەکە هەر خۆی بێژەریەتی، ئەم وشەیە شێوەی پێکهاتەکەی وایە، کە وەک پەندێک وایە، شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: لە داهێنراوەکانی قورئانەو، پێش قورئان، عەرەب بەکاریان نەهێناوە، واتە: ئەم قسەیە قسەیەکی بۆش و بێ سوودە، بێژەکەرەکەی خۆی قسەکە دەڵێ، ئەگەرنا کەس لێی وەرناگرێ و، هیچ دەرەنجامێکی لێ پەیدانابێ.

**٥)-** ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾، لە پشتیانیشەوە پەردەیەک هەیە، تاکو ئەو ڕۆژەی تێیدا زیندوو دەکرێنەوە.

وشەی (**وراء**) لێرەدا خوازراوەتەوە بۆ شتێک کە تووشی مرۆڤ دێ، هیچ بواری تێدا نیەو، حەتمەن بەسەری دێ، هەر چەندە ئەو پێی وابووە بەسەری نایەت، چونکە (**وراء**)، یانی: (**خلف**)، واتە: پشت، بەڵام ئەو کە دەمرێ بەرەو پێش دەچێ و، ئەو شتەی کە دێتە ڕێی لە پێشیەوەیە، ئەدی بۆچی وشەی (**وراء**) بەکارهاتووە؟

لەبەر ئەوەی ئینسان شتێک لە پشتڕا پێی بکەوێ، کە پێی وانیە ئەو شتە هەبێ، دەگوترێ: غافڵگیر بوو، یان: لە پشتەوەڕا لێیاندا، نەیزانیوە کە پێی

دەکەوێ، خوای پەروەردگار ئەو وشەیەی بەکارهێناوە، چونکە کافرەکان پێیان وانەبووە، دوای ئەوەی ڕووحیان لە جەستەیان جیادەبێتەوە، شتێکی دیکە هەیە، پێیان وابووە، مرۆڤ دەبێتە بەردی ونبوو، بۆیە خوا دەفەرموێ: (وَمِن وَرَآئِهِم)، واتە: لەو پشتەوەی کە هیچ حیسابیان بۆ نەکردوە، لەو کاتەدا کە دێ، وەک لە پشتیانەوە بێ، هەرچەندە کاتەکە لە پێشیانەوەیە، ئنجا ئەمە وەک ئەو تەعبیرەی دیکەی قورئانە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ﴿٢٠﴾ ﴾ البروج، واتە: خوا لە پشتیانەوە دەوری داون، واتە: لێی دەرباز نابن.

ئێمە دوایی کورتە باسێک دەربارەی بەرزەخ دەکەین، کە بەرزەخ، یانی: (**الحاجز بين مكانين، أو بين شيئين**)، پەردەو نێوانێکە لە نێوان دوو شوێنان، یان دوو شتان دا.

٦)- ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ ﴾، هەر کاتێک فوو بە سووڕدا کرا، (ٱلصُّورِ) بە (بوق) لێکدراوەتەوە، کە بە کوردیی (شەیپوور) و (کەڕەنا)ی پێ دەڵێن، ئەوەی ئیسڕافیل فووی پێدا دەکات، دووجاران فووی پێدا دەکات، جارێکیان کە جاری یەکەمە، فووی یەکەم، ئاخیر زەمان (**الساعة**) لە ئەنجامی ئەو فووەدا پەیدادەبێ و، ئەم گەردوونە تێکدەچێ، بۆ جاری دووەم کە فووی پێدا دەکات، قیامەت دێ، وەک خوا ﷻ لە سووڕەتی (الزمر) دا دەفەرموێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ﴿٦٨﴾ ﴾، واتە: فوو بە سووڕدا کرا هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، جگە لەوەی خوا بیەوێ، هەموویان مردن، یان: لە هۆش خۆیان چوون، ﴿ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ ﴾ الزمر، دوایی جارێکی دیکە فووی پێدا کرا، بینیت هەموویان هەڵساونەوەو، تەماشا دەکەن، ئنجا قیامەت یانی: هەڵسانەوە، لە ئەنجامی فووی دووەم دا پەیدادەبێ، بەڵام تێکچوونی ئەم گەردوونە، ئاخیر زەمان (**ساعة**) لە ئەنجامی فووی یەکەمدا پەیدادەبێ، کە لەو ئایەتەی سووڕەتی (الزمر)دا زۆر بە ڕوونیی باسی هەردووکیان کراوە، لە شوێنی دیکەشدا باسکراون، بەڵام زیاتر بە ئاماژە.

لەو بارەوە کە ئیسرافیل دوو جاران فوو بە کەڕەنادا دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمایشتێکی هەیە:

{**عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَيْفَ أَنْعَمُ وَقَدِ الْتَقَمَ صَاحِبُ الْقَرْنِ الْقَرْنَ، وَحَنَى جَبْهَتَهُ وَأَصْغَى سَمْعَهُ، يَنْتَظِرُ أَنْ يُؤْمَرَ أَنْ يَنْفُخَ، فَيَنْفُخَ»، قَالَ الْمُسْلِمُونَ: فَكَيْفَ نَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «قُولُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، تَوَكَّلْنَا عَلَى اللَّهِ رَبِّنَا»**} (**أَخْرَجَهُ التِّرْمِذِيُّ: ٣٥٥١، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ**)، واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چۆن خۆشیی و لەززەت وەربگرم لە حاڵێکدا کە خاوەنی قەڕن قەڕن (کەڕەنا، قۆچ)ی بە دەمەوە گرتوە و، نێوچەوانی خوار کردۆتەوەو گوێی هەڵخستوە، کەی فەرمانی پێدەکرێ فووی پێدا بکات، ئەویش فووی پێدا بکات؟ مسوڵمانان گوتیان: بڵێین چی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: بڵێن: خوامان بەسەو، ئەو باشترین کارپێسپێردراوە، پشتمان بە خوای پەروەردگارمان بەست.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ ﴾، ئنجا کاتێ فوو بە کەڕەنادا کرا مادام پێغەمبەریش ﷺ وا دەفەرموێ، دیارە ئامێرێک هەیە، زۆر زۆر گەورە بەو، ئەو فریشتەیە تەرخان کراوە، بۆ فوو پێداکردنی.

هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: ئەوە هێما (رمز)ێکە بۆ کۆکردنەوەی خەڵک لە ئەنجامی فووی دووەم دا.

٧)- ﴿ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ ﴾، (کاتێ فوو بە کەڕەنادا دەکرێ، واتە: جاری دووەم)، لەو ڕۆژەدا نە ڕەچەڵەکیان لە بەیندا هەن و، نە داواش لە یەکدی دەکەن.

ڕەچەڵەکیان لە بەیندا نیە، یانی: لەوێ خزمایەتیی نیە، فڵانکەس کوڕی فڵانکەسەو، فڵانکەس خزمی فڵانکەسە، وەک بەداخەوە زۆر لە مسوڵمانان خەیاڵپڵاو دەکەن، هەروەک عادەتی غەڵەت و پەڵەتی خاوەن کێیە پێشووە سەرلێشێواوەکان:

أ- جوولەکە کە دەیانگوت: ﴿لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ﴿٨٠﴾﴾ البقرة، جگە لە چەند ڕۆژێکی کەم ئاگرمان تووش نابێ.

ب- جوولەکەو نەصرانییەکان، وەک خوای زاناو توانا لێیان دەگێڕێتەوە: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ﴿١٨﴾﴾ المائدة، جوولەکەو نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواو خۆشەویستانی خواین.

ئنجا بە هەمان شێوە کەسانێکیش لە نێو ئەهلی ئیسلام دان، کە بە ڕەچەڵەک و نەسەب تێکەوتوون، چ ئەوەی بابی مامۆستاو زانایەک بووە، چ ئەوەی شێخێک بووە، چ ئەوەی کە سەیدی پێ دەگوترێ...هتد، بەڵام بە تەئکید وانیە، خوا زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ و، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {**وَمَن بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ**} (**أخرجه مسلم: ٢٦٩٩، عن أبي هريرة**)، واتە: هەر کەسێک کردەوەکەی دوای بخات، ڕەچەڵەکی پێشی ناخات، پێشینانیش گوتوویانە: (کەس بە مەلەی بابی ناپەڕێتەوە)، یانی: ئەگەر کوڕو بابێک بکەونە نێو ئاوێ، بابەکە مەلە بزانێ، بەڵام کوڕەکە مەلە نەزانێ، مەلە زانینی بابی دادی کوڕەکەی نادات، مەگەر دەستی بگرێ، ئەگەرنا هەر کەسە بۆ خۆی، هەروەها گوتراوە: (کە خۆت کۆسەی، ڕیشی بابت بە تۆ چی؟).

ئنجا لەو بارەوە کە لە ڕۆژی دوایی دا ڕەچەڵەک و نەسەب دادی کەس نادات و، کەس هیچ شتێک لە کەس داوا ناکات، ئەم فەرمایشتە هەیە:

**{عَنِ الْحَسَنِ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّهَا ذَكَرَتِ النَّارَ فَبَكَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَا يُبْكِيكِ؟» قَالَتْ:«ذَكَرْتُ النَّارَ فَبَكَيْتُ، فَهَلْ تَذْكُرُونَ أَهْلِيكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟» فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَمَّا فِي ثَلَاثَةِ مَوَاطِنَ فَلَا يَذْكُرُ أَحَدٌ أَحَدًا: عِنْدَ الْمِيزَانِ حَتَّى يَعْلَمَ أَيَخِفُّ مِيزَانُهُ أَوْ يَثْقُلُ؟ وَعِنْدَ الْكِتَابِ، حِينَ يُقَالُ: ﴿هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾﴾ الحاقة، حَتَّى يَعْلَمَ أَيْنَ يَقَعُ كِتَابُهُ أَفِي يَمِينِهِ أَمْ فِي شِمَالِهِ، أَمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِهِ؟ وَعِنْدَ الصِّرَاطِ، إِذَا وُضِعَ بَيْنَ ظَهْرَيْ جَهَنَّمَ}**[1].

---

(١) أخرجه أبو داود: ٤٧٥٥، والحاكم: ٨٧٢٢ وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين، ولو إرسال فيه بين الحسن وعائشة على أنه قد صحت الروايات أن الحسن كان يدخل وهو صبي

واتە: دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ)، ڕۆژێک باسی ئاگری (دۆزەخ) ی کرد گریا، پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی بۆچی دەگری؟ چ شتێک دەتگریەنێ، گوتی: یادی ئاگری دۆزەخم کرد، بەوە گریام، دوایی (دایکمان عائیشە) لە پێغەمبەری ﷺ پرس: ئایا لە ڕۆژی قیامەتدا ماڵ و خێزانی خۆتان لە بیر دەبێ؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە سێ شوێنان هیچ کەس، هیچ کەسی نایەتە بیر: لە کاتی تەرازوو کێشراندا، تاکو دەزانرێ تەرازووەکەی، سووک دەبێ، یان قورس دەبێ؟ لە کاتی نامەو لیستی کردەوان وێدرانەوەدا، کاتێ دەگوترێ: ﴿ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴿١٩﴾ ﴾الحاقّة، ها ئەوە لیستی منەو بیخوێننەوە، هەتاکو دەزانێ کە نووسراوەکەی، (لیستی کردەوەکانی)، چۆن وێ دەدرێتەوە؟ ئایا بە دەستی ڕاستی، یان بە دەستی چەپی، یان لە پشتیەوە؟ (شوێنی سێیەم و کاتی سێیەم، کە کەس کەسی لە بیر نابێ)، کاتی صیراط، ئەو پردەی ڕادەهێڵدرێ بەسەر پشتی دۆزەخدا، لەو کاتەش دا کەس کەسی لە بیر نابێ.

هەڵبەتە پێغەمبەری خوا ﷺ بە گشتیی فەرموویەتی و، بۆ خەڵک بە گشتیی، ئەگەرنا پێغەمبەری خاتەم ﷺو، پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)، بە پێی دەقەکانی دیکە، ئەوان خۆیان دەزانن، کە سەرەنجام و چارەنووسیان چۆنە، بەڵام خەڵکی دی، ئاوا خەمی خۆی دەکەوێتە بەرێ، ئاگای لە کەسی دیکە نامێنێ.

٨)- ﴿ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴾، هەروەها داواش لە یەکدی ناکەن، چونکە دەزانن بێ سوودەو، هیچکەس هیچ شتێکی بۆ هیچکەس پێناکرێ.

٩)- ﴿ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴾، ئنجا هەر کەسێک تا تەرازووەکانی قورس بن، (**موازین**) کۆی (**میزان**)ە، چونکە بۆ هەر کام لە کردەوەکان تەرازوویێک هەیە.

---

منزل عائشة رضي الله عنها وأم سلمة، قال الذهبي: على شرط البخاري ومسلم لولا إرسال فيه بين الحسن وعائشة.

یـان (**موازیـن**) کۆی (**موزون**)، واتە: کێشراوەکان، کردەوەکان کە هەڵدەسەنگێنرێن، هـەر کەسـێک کردەوەکانـی، یـان تـای تـەرازووی کـردەوە چاکەکانـی قـورس بـوو، ئـا ئەوانـەن بـە مراد گەیشـتوون، سـەرفرازن.

١٠)- ﴿ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم ﴾، هەر کەسێک تای تەرازووەکانی چاکەی سووک بوون، یان: کردەوە کێشراوەکانی سووک بوون، ئا ئەوانەن کەسانێکن خۆیانیان لە دەست داوە، خۆیان دۆڕاندوە، ئنجا ئەگەر ئینسان خۆی لە دەست بدات، ئەوە گەورەترین زیانبارییە، چونکە ئینسان هەرچی دەوێ، بۆ خۆی دەوێ، بەڵام وەختێ خۆی لە دەست بدات، ئەوە بە تەئکید خۆی و هەرچی هەیەتی لە دەستی داوە، ئنجا ئەوانەش خۆیانیان لە دەست داوە.

ئنجا ئایا ئەوانەی تا تەرازووی کردەوە چاکەکانیان سووک بن، چییان لێ دێ؟

١٢)- ﴿ فِي جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴾، لە دۆزەخدا دەمێننەوە، هەرماو دەبن.

١٤)- ﴿ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴾، بڵێسەی ئاگر بە توندیی لە دەم و چاویان دەدات، (**لَفَحَت: ضَرَبَت ضَرْبَ السَّيْفِ، وغيره بخِفَّةٍ أَو بشِدَّةٍ**)، (**لَفْح**)، بریتیە لەوە کە بە شمشێر لە شتێک بدەی بە سووکیی، یان بە توندیی.

بـەڵام مـن پێـم وایـە مەبەسـت پێـی توندییـە، ئنجـا شمشـێر بـێ، یـان قامچـی بـێ، یـان هـەر شـتێک بـێ، بـە توندیـی لـە شـتێکی بـدەی، واتـە: ئەوانـە بڵێسـەی ئاگـر لـە دەم و چاویـان دەدات بـە توندیـی، یاخـود ئەگـەر مەبەسـت سـووکیی بـێ، یانـی: هـەر بـە بڵێسـەیەکی کـەم و سـووکی ئاگـر کـە لـە دەم و چاویـان دەدات، چییـان لـێ دێ؟

١٥)- ﴿ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ ﴾، لەوێ دا حاڵەتی (**کلوح**)یان بۆ پەیدادەبێ، (**کلوح: حينما تَضْرِبهُم لَفْحةُ النَّارِ، ينكمِشُ جلدُ وجههم فتظهر أسنانهم بقبح ويتقلّص الشفتان**)، کاتێ کە بڵێسەی ئاگر لە دەم و چاویان دەدات، پێستی دەم و چاویان گرژ دەبێ و، ددانیان

دەردەکەون، زۆر بە ناشیرینیی و، لێوەکانیان هەڵدەقرچێن و ددان گڕ دەکەونە بەرچاو، ئەوە ئەگەر مەبەست لە (لَفَح) لێدانێکی سووک بێ، واتە: بە بڵێسە ئاگرێکی سووک کە لە دەم و چاویان دەدات، وایان لێدێ! ئەدی ئەگەر بە توندیی لێیان بدات! بەڵام ئەگەر (لفح) مەبەست پێ لێدانی توند بێ، واتە: بڵێسە ئاگرێکی توند لە دەم و چاویان دەدات، بەو شێوەیان لێ دێ.

ئەوەی لەو مەسەلەی یەکەمە وەردەگیرێ: سێ شتی سەرەکیین:

**١)**- ڕەچەڵەک لە قیامەتێ سوودی نیەو، گوتراوە: (نابێ کەس ئیمانێ بە نیسکێ بسپێرێ)، بە تەمای باب و باپیران و، بە تەمای ڕەچەڵەک و نەسەب، تێ بکەوێ.

**٢)**- کەس بە مەلەی کەس ناپەڕێتەوە، کەواتە: ئەوە کە دەروێشێک بە شێخەکەی هەڵادەڵێ:

بۆیە لە دنیا دەستم گرت وەتۆ ..... تاکو لە قیامەت نەبم ڕەنجەڕۆ.

لە ڕاستییدا ئەوە خەیاڵ پڵاوی کردوە، ئەگەر پێی وابێ: تەنیا دەست بە شێخ گرتن دادی دەدات، نەخێر دەبێ بۆ خۆت ئیمانت هەبێ و، کردەوەی باشت هەبێ، ئنجا ئەگەر ئەو کەسەش کە تۆ شوێنی دەکەوی و، لێی بەهرەمەند دەبی، لە ڕووی ئیمان و هیدایەت و شارەزایی لە دینەوە، ئەگەر لە لای خوای پەروەردگار قەدرو حورمەتێکی هەبێ، ڕەنگە تکایەکت بۆ بکات، بەڵام ئەصڵی هۆکاری دەربازبوونەکە، ئیمان و کردەوەی چاکی خۆتە و، شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺو ئەوانەی دیکە کە شەفاعەت و تکا دەکەن، شتێکی تەواوکارییە، ئەگەرنا کەسێک بۆ خۆی هیچی نەبێ، لە ڕاستییدا بە تەمای تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ تێ بکەوێ، زەرەر دەکات، چ جای خەڵکی دیکە!

**٣)**- گرنگیش ئەوەیە ئینسان تا تەرازووی چاکەکانی گران بێ، ئەوە سەنگی مەحەکەو، ئەوە هۆی دەرباز بوونە.

## کورتە باسێک لە بارەی بەرزەخەوە

ئایا جیهانی بەرزەخ چییەو چۆنە؟! لە کوێیەو؟ بەڵگە چییە لەسەر بوونی؟ ئایا بەرزەخ بۆ هەموو کەسە، یان بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراوە؟ ئایا حاڵ و باڵی بڕوادارانی چاکەکارو کافرانی بەدکار لە قۆناغی بەرزەخ دا چۆنە؟!

ئێمە هەوڵدەدەین لە چوار تەوەردا دا باسی بەرزەخ و ژیانی بەرزەخ بکەین:

### ١)- مانای بەرزەخ:

سەرەتا لە ڕووی زمانەوانییەوە: (**البرزخ: الحاجز بين مكانين أو شيئين**)، (برزخ) بریتیە لە پەردەیەک لە نێوان دوو شوێنان، یان دوو شتان دا.

(**الجرجاني**) لە کتێبە ناودارەکەی خۆیدا، فەرهەنگێکی هەیە بە ناوی (**التعريفات**)، ئاوا باسی بەرزەخ دەکات:

(**البرزخ: العَالَمُ المشْهُودُ بَيْنَ عَالَمِ المعاني المجردَّةَ وَعَالَمِ الأَجْسَامِ المَادِيَّة، أعني: الدنيا والآخرة ويعبر به عن عالم المثال، أي: عِنْدَ الفَلَاسِفَةِ القُدَمَاء**)[1] واتە: بەرزەخ بریتیە لەو جیهانە بینراوەی کە لە نێوان جیهانی مانا ڕووتەکان و جیهانی جەستە مادییەکان دایە، واتە: لە نێوان دنیاو دواڕۆژدایە، جاری واش هەیە وشەی بەرزەخ جیهانی وێنەکان (**عالم المثال**) بەکاردەهێنرێ، یانی: لە لای فەیلەسووفە کۆنەکان (لە جیاتی ئەوەی بڵێن: بەرزەخ، گوتوویانە: (**عالم المثال**)).

(**الجوهري**) کە یەکێکە لە شارەزایانی زمان، دەڵێ: (**البرزخ: الحاجز بين شيئين والبرزخ ما بين الدنيا والآخرة من وقت الموت إلى البعث، فمن مات فقد دخل في**

---

(١) التحرير والتنوير لابن عاشور، ج١٧، ص١٨٣.

**البرزخ**) واتە: بەرزەخ بریتیە لە پەردەو نێوانێک لە نێوان دوو شتانداو، بەرزەخ بریتیە لەوەی کە لە نێوان دنیاو دوارۆژدایە، لە کاتی مردنەوە تاکو کاتی زیندووبوونەوە، بۆیە هەر کەسێک مرد، دەچێتە قۆناغی بەرزەخەوە.

(**القرطبي**)، لە تەفسیرەکەیدا، هەم ئەو پێناسەیەی (**الجرجاني**)و، هەم پێناسەکەی (**الجوهري**)یشی هێناوەو، دوایی دەڵێ:

**(قَالَ رَجُلُ بحَضْرَةِ الشَّعْبيِّ: رَحِمَ اللهُ فُلانَاً فَقَد صَارَ مِنْ أَهْلِ الآخِرَة، فَقَالَ: لَمْ يَصِر مِنْ أَهْلِ الآخِرَة، وَلَكِنَّهُ صَارَ مِنْ أَهْلِ البَرْزَخِ، وَلَيْسَ مِنَ الدُّنيَا ولا من الآخرة)**[1].

واتە: لە شوێنێک کە شەعبیی لەوێبوو، (دیارە یەکێک مردووە)، کابرایەک گوتی: خوا بەزەیی بە فڵانکەس دا بێ، چووە نێو ڕیزی خەڵکی ڕۆژی دوایی، شەعبیی گوتی: نەخێر نەچۆتە نێو ئەوانەی خەڵکی ڕۆژی دواییـن، بەڵکو چۆتە نێو خەڵکی بەرزەخ، کە نە لە دنیایەو نە لە دوارۆژە، (بەڵکو قۆناغێکی ڕاگوزەرە لە نێوانی دنیاو دوارۆژدا).

### ٢)- بەڵگەی هەبوونی بەرزەخ:

هەندێک لە زانایان نکووڵییان کردوە، لەوە کە لە دوای مردن، قۆناغێکی دیکە هەبێ بە ناوی بەرزەخ و، ئەوەی پێی دەگوترێ: سزای گۆڕ (**عذاب القبر**)و خۆشی و نیعمەتی گۆڕ (**نعیم القبر**)، بەڵام ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەین، ئەمە زۆر زۆر ڕوونە، هەر کەسێ بڕوای بە قورئان و سوننەت بێ، ناتوانێ نکووڵیی لە ژیانی بەرزەخ بکات.

ئنجا ئەوانەی کە نکووڵییان کردوە لە جیهانی بەرزەخ، لە قۆناغی بەرزەخ، گوتوویانە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴾، یانی: دوای

---

(١) الجامع الأحكام القرآن: ج١٢، ص١٢٩، ١٢٦.

مردن پەردەو نێوانێک هەیە، ڕێگرە لە گەڕانەوەی مردووان بۆ دنیا! مەبەست پێی ئەوەیە کە پەردەو نێوانێک هەیەو، ئەوانە ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ دنیا، بەڵام مەبەست ئەوە نیە، کە جیهانێک هەیەو قۆناغێک هەیەو ژیانێک هەیە، لەوێ تاکو ڕۆژی دوایی!

بەڵام بە مسۆگەریی ئەو قسەیە هیچ نیە، چونکە خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾، کەواتە: بەرزەخ کەوتۆتە نێوان ژیانی دنیاو دواڕۆژەوە، نەک مردووان و ژیانی دنیاوە! خوا نەیفەرموە: (**ومن ورائهم برزخ بين الأحياء والأموات**)، لە پشتیانەوە نێوانێک لە نێوان زیندووان و مردووان دا هەیە، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿وَمِن وَرَآئِهِم بَرۡزَخٌ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ﴾، واتە: ئەو بەرزەخە درێژەی دەبێ تاکو ڕۆژی زیندووبوونەوە.

ئنجا بێجگە لەم ئایەتە موبارەکە، کە بە وشەی (بَرۡزَخٌ) باسی ژیانی نێوان دنیاو دواڕۆژ کرابێ، بەس لێرەدا هاتوە، بەڵام ئایەتی دیکەش هەن و، فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ زۆرن، لە بارەی قۆناغ و جیهانی بەرزەخەوە،

## یەکەم: چەند بەڵگەیەکی قورئانیی:

١)- خوا ﷻ لە بارەی (**آل فرعون**)ەوە فەرموویەتی: ﴿وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ۝٤٥ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ۝٤٦﴾غافر، کە ئەمە بەڵگەیەکی زۆر زۆر ڕوونە، لە بارەی سزاو نیعمەتی قۆناغی بەرزەخەوە، خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە دارو دەستەی فیرعەون فەوتان، دەفەرموێ: سزایەکی خراپ دەوری دارو دەستەی فیرعەونی دا، (ئەو سزا خراپە چییە؟) ئاگرێکە بەیانیان و ئێواران لەسەری ڕادەنوێنرێن، (ئەوە لە قۆناغی بەرزەخدا کە پێش ئەوەی قۆناغی قیامەت بێ)، ڕۆژێکیش کە ئاخیر زەمان (**ساعة**) دێ، (کە قیامەتی بەدوا دادێ، دەگوترێ:) دارو دەستەی فیرعەون بخەنە نێو سەختترین سزاوە.

یانی: نەک تەنیا بەیانیان و ئێواران، وەک قۆناغی بەرزەخ بەڵکو بەردەوام، کەواتە: ئازارو سزای بەیانیان و ئێواران، مەبەست پێی سزای دوای جیابوونەوەی ڕووحانە لە جەستان، لە جیهان و قۆناغی بەرزەخدا.

بەڵام ئەوەی دیکە: ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ﴾، دوایی ئاخیر زەمان، پاشان قیامەت دێ، ڕۆژی دوایی دێ، ئەو کاتە سزایەکی سەختتر بۆ فیرعەون و دارو دەستەی فیرعەون دەست پێدەکات.

**٢)**- لە سوورەتی (**الواقعة**)دا، لە ئایەتەکانی (١- ٥٦)دا خوا باسی ئاخیر زەمان و دوایی قیامەت دەکات، پاشان باسی دابەشبوونی مرۆڤایەتیی بۆ سێ بەشی سەرەکیی دەکات:

**أ**- (**أصحاب الميمنة**)،

**ب**- (**السابقون**)،

**ج**- (**أصحاب الشمال**)،

بە درێژیی باسی حاڵ و باڵیشیان کراوە، با ئێمە ئاماژەیەک بەو ئایەتانە بکەین، کە کەمتر بینیومە لە بارەی بە بەڵگە هێنانەوەی قورئان بۆ قۆناغی بەرزەخ، باسی ئەم ئایەتانە کرابێ، کە لە ڕاستییدا ئەو ئایەتانەی سوورەتی (**الواقعة**)، بەڵگەی زۆر زەقن، با تەماشا بکەین:

**أ**- لە ئایەتەکانی (١- ٥٦)دا، خوا باسی ڕۆژی دوایی دەکات، دەفەرموێ:

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ۝١ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ۝٢ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ ۝٣ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ۝٤ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ۝٥ فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ۝٦ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ۝٧﴾، ئەمە دیارە باسی ئاخیر زەمانەو، باسی ئەو ڕووداوە مەزنەیە کە بەسەر ئەم گەردوونەدا دێ!

واتە: کاتێ کە ڕووداو ڕوویدا، کە هیچ کەسێک ناتوانێ ئەو ڕووداوە بگێڕێتەوە، ئەو ڕووداوە بەرزکەرەو نزمکەرە، کاتێ کە زەوی تێکەوە ڕاشەقێنرا،

ڕاتەكێنراو، چیایەكان وردو خاش كران و بوونە تۆزو گەرد، ئێوەش بوونە سێ پۆل، (سێ بەش) ئەی مرۆڤایەتیی! ﴿ فَأَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ ﴾، هاوەڵانی لای ڕاست دەزانی هاوەڵانی ڕاستە چۆنن! هاوەڵانی لای چەپ، دەزانی هاوەڵانی لای چەپ چۆنن! پێشكەوتووەكان، ئەوانە زۆر نیزیكخراوەكانن.

ئنجا خوا ﷻ باسی حاڵ و باڵی هەر كام لەو سێ كۆمەڵانە دەكات: **(أصحاب الميمنة)**و، **(أصحاب الشمال)**و، **(السابقون)**، تاكو ئایەتی (٥٦)، كە دەفەرمووێ: ﴿ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: ئەمە كە میواندارییانی پێ دەكرێ لە ڕۆژی سزاو پاداشت دا.

كە مەبەست ڕۆژی قیامەتە.

ب- بەڵام لە چواردە (١٤) ئایەتەكانی: (٨٣ - ٩٦)دا، باسی ژیانی بەرزەخ كراوە، كە خوا ﷻ ئاوا دەفەرمووێ: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾ ﴾[1].

ئنجا ئایا لێرەدا بۆچی دەڵێین: ئەمە باسی قۆناغی بەرزەخە؟ چونكە ئەوەی پێشێ لە دوای باسی ڕاتەكێنرانی زەوی و، وردو خاش بوونی چیاكان و، بوونیان بە تۆزو گەردو، ڕوودانی ئەو كارەساتە مەزنەی كە بەسەر گەردووندا دێ، دوای ئەوە باسی ئەوە كراوە كە مرۆڤایەتیی دەبێتە سێ بەش: **(أصحاب الميمنة)**و، **(أصحاب الشمال)**و، **(السابقون)**.

---

(١) لە تەفسیری سووڕەتی (الواقعة)دا بە درێژیی تەفسیری ئەو ئایەتانە و چۆنیەتی دەلالەتیان لەسەر قۆناغی بەرزەخمان كردوە.

ئنجا لێرەشدا دیسان مرۆڤایەتیی دابەش دەکرێتەوە بۆ سێ پۆل، بەڵام دوای چی؟ دوای مردن و، گیان کێشران، دەفەرموێ:

﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴾، واتە: دەبووایە کە ڕووح دەگاتە گەروو، (ت)ی سەر (بَلَغَتِ)، دیارە ڕاناوی مێینەیەو بۆ ڕووحە، هەرچەندە باسی ڕووح نەکراوە، بەڵام بە سیاق دەزانرێ و، لە قورئاندا ئەوە زۆرە، کاتێ کە دەگاتە گەروو، ﴿ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴾، ئێوەش لەو کاتەدا تەماشای دەکەن، ئەو مرۆڤە لە گیانەڵاو لە سەرەمەرگ دایە، ئێوەش هەمووتان بە دەوریەوەن و تەماشای دەکەن.

﴿ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴾، ئێمەش لە ئێوە لێی نیزیکترین، بەڵام نابینن، کە مەبەست پێی فریشتەکانە، فریشتەکان، کەسانێک لە ئەهلی ئیمان، لەسەرە مەرگدا فریشتەکانی دیتوون و گوتوویانە: میوانم هاتن، ﴿ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ ﴾، دەبووایە ئەگەر ئێوە ملکەچ نین بۆ خوا، (وەک خەیاڵ دەکەن)، ﴿ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، ئەو ڕووحە بگێڕنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن، واتە: بیگێڕنەوە بۆ نێو جەستەی، کە ئێمە لە نووکی پێیەوە ڕووحەکە دێنین، پێشێ لاقەکانی سارد دەبن و، وشک دەبن، دوایی وردە وردە دێ، تاکو دەگاتە گەرووی.

ئنجا ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: **{إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ} (أخرجه أحمد: ٦٤٠٨، والترمذي: ٣٥٣٧، وقال: حسن غريب، وابن ماجه: ٤٢٥٣، وابن حبان برقم ٦٢٨، والحاكم: ٧٦٥٩، وقال: صحيح الإسناد، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ).**

واتە: خوا، پەشێمان بوونەوەو گەڕانەوەی بەندەی وەردەگرێ، مادام نەکەوتبێتە حاڵەتی گیانەڵاو، ڕووحەکەی نەگەیبێتە گەرووی کە دوایی هەناسەیەک دەداو، دەم پێکدەدات و ڕووحەکە دەردەچێت، دەفەرموێ: بۆچی نایگێڕنەوە ئەگەر ڕاست دەکەن؟

ئنجا باسی ئەو کەسانە دەکات کە بەو شێوەیە گیانیان دەکێشرێ، ئایا سەرەنجامیان چۆن دەبێ؟ دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴾، ئنجا خاوەنی ئەو ڕووحە، یاخود ئەو ڕووحە ئەگەرلە زۆر نیزیکخراوان بێ لەوانە بێ، کە زۆر لە خوا نیزیک بوون، ﴿ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴾، ئەوە فەڕەحنایی و بۆنی خۆش یاخود ڕەیحان، (وَجَنَّتُ نَعِيمٍ)، هەروەها باخانی پڕ لە نازو نیعمەتی هەن، ﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴾، بەڵام ئەگەر لە هاوەڵانی لای ڕاست بێ، کە بە دەستی ڕاستیان لیستی کردەوەکانیان وەردەگرنەوە، سڵاو لە تۆ، لە هاوەڵانی ڕاستەوە، یان: سڵاوی من بۆ تۆ، بیگەیەنە بە هاوەڵانی دەستە ڕاست.

﴿ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴾، بەڵام ئەگەر لە بە درۆ دانەرانی گومڕابووبێ، ﴿ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴾، ئەوە میوانداریی دەکرێ لە نێو ئاوی داغ و کوڵیودا، ﴿ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴾، هەروەها دەخرێتە نێو گڵپەی سەوزی ئاگری دۆزەخ، ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴾، ئەوەی باسکرا هەقێکی جێی دڵنیاییە، ﴿ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴾، ئنجا تۆ ناوی پەروەردگاری مەزنت بە پاک بگرە.

ئەمە زۆر ڕوونە کە لە دوای ڕووح کێشانەوە، خوا بەو شێوەیە مرۆڤەکان دابەش دەکات، کەواتە: ئەمە قۆناغی بەرزەخە.

بەڵگەیەکی دیکەش لەسەر ئەوەی کە پەنجاو شەش (٥٦) ئایەتی ئایەتی سەرەتای (**الواقعة**) لە بارەی پاداشت و سزای قیامەتەوەن و، چواردە (١٤) ئایەتەکەی کۆتاییش لە بارەی قۆناغی بەرزەخەوەن، ئەوەیە کە خوای کارزان بۆ سزاو پاداشتی قیامەت پەنجاو شەش (٥٦) ئایەتی تەرخانکردوون، بۆ هەر کام (**السابقون**)و (**أصحاب اليمين**)و (**أصحاب الشمال**)، کە ئەمەش دەقی ئایەتەکانە:

﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيْهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾ يَطُوفُ

عَلَيْهِمْ وِلْدَٰنٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَٰلِ ٱللُّؤْلُؤِ ٱلْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَٰمًا سَلَٰمًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصْحَٰبُ ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِى سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا۟ يُصِرُّونَ عَلَى ٱلْحِنثِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا۟ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ ٱلْأَوَّلِينَ وَٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ ﴾.

بەڵام لە چواردە (١٤) ئایەتی کۆتاییدا هەر بە ئاماژە ئاسا پاداشت و سزایەکان باسکراون:

**أ-** بۆ پاداشتی (ٱلْمُقَرَّبِينَ)، هاتوە: ﴿ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴾.

**ب-** بۆ پاداشتی هاوەڵانی لای ڕاست، هاتوە: ﴿ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴾.

**ج-** بۆ سزای (**أصحاب الشمال**)، کە لێرە بە (ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ)، ناوی هێناون، هاتوە: ﴿ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴾.

**٣)-** بەڵگەیەکی دیکە هەر لە قوڕئان، ئەوەیە کە لە ئایەتی (١٥٤)ی سوورەتی (**البقرة**) دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ

﴿وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ ١٥٤﴾البقرة، خوا لە مسوڵمانان قەدەغە دەکات، ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێن، کە هەر ناوی مردووشیان بۆ بەکاربهێنرێ، ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَن يُقۡتَلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتُۢ﴾، ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێن، پێیان مەڵێن: مردوون، ﴿بَلۡ أَحۡيَآءٞ وَلَٰكِن لَّا تَشۡعُرُونَ﴾، بەڵکو زیندوون، بەڵام ئێوە هەست ناکەن، ئەوە هەر زۆر بە ڕوونیی دیارە کە کوژراوانی ڕێی خوا لە قۆناغی بەرزەخ دا ژیانێکی تایبەتیان هەیە.

٤- بەڵگەیەکی دیکە: لە سووڕەتی (**آل عمران**) لە سێ ئایەتەکانی (١٦٩و ١٧٠و ١٧١)دا، دیسان زۆر بە ڕوونیی خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێن و شەهید دەبن، کە لە سووڕەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ: پێیان مەڵێن: مردوون و، بە مردوو ناویان مەهێنن، لێرەدا دەڵێ: هەر لە خەیاڵیشتاندا نەبێ کە مردوون، وەک دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ١٦٩ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ١٧٠ يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٧١﴾آل عمران.

واتە: ئەوانەی لە ڕێی خوادا کوژراون، پێتان وا نەبێ مردوون، بەڵکو زیندوون لە لای پەروەردگاریان بژیویان دەدرێ، دڵخۆشن بەوەی خوا پێیداون، لە بەخششی خۆی و، موژدەشیان پێ دەدرێ بەوانەی جارێ پێیان نەگەیشتوون، لە پشتیانەوە، دڵخۆش دەبن کە نە ترسیان لەسەرەو نە پەژارەش دادەگرن، دڵخۆش دەبن بە چاکەو بەخششی خوا، بەوە کە خوا، پاداشتی بڕواداران زایە ناکات.

لێرەش خوا زۆر بە ڕوونیی دەفەرموێ: پێتان وا نەبێ: کوژراوانی ڕێی خوا (شەهیدان) مردوون، بەڵکو زیندوون و بژیویان دەدرێتێ، ئنجا وەک دوایی باس دەکەین، لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ، ئەم ئایەتە موبارەکانە تیشکی زیاتریان خراوەتە سەر.

## دووەم: چەند دەقێکی سوننەت لەسەر جیهانی بەرزەخ:

فەرمایشت لەو بارەوە زۆر زۆرن، ئێمە بەس ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

**١)- {عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: الْمُسْلِمُ إِذَا سُئِلَ فِي الْقَبْرِ يَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾إبراهيم} (أخرجه أحمد: ١٨٥٠٥، والبخاري: ٤٤٢٢، ومسلم: ٢٨٧١، وأبو داود: ٤٧٥٠، والترمذي: ٣١٢٠، والنسائي: ٢٠٥٧، وابن ماجه: ٤٢٦٩، وابن حبان: ٢٠٦).**

واتە: بەرائی کوڕی عازیب (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مسوڵمان کە لە گۆڕدا، (واتە: لە دوای جیابوونەوەی ڕووحی لە جەستەی، ئەگەر نەشخرابێتە گۆڕەوە، قەل و داڵیش خواردبێتی و، لە ئاوێش دا خنکابێ و، یان سووتێنرابێ، مەبەست ئەوەیە! بەڵام چونکە بە زۆریی خەڵک دەخرێتە گۆڕەوە، بۆیە وایفەرمووە)، کاتێک لێی دەپرسرێ، ئەو شایەتیی دەدات کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیەو، موحەممەد ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە، ئنجا ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴿٢٧﴾ ﴾، خوا ئەوانەی بڕوایان هێناوە، بە قسەی چەسپاو لە ژیانی دنیاداو، لە دواڕۆژدا دەیانچەسپێنێ.

**٢- {وفي رواية أخرى: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ ﴾، قَالَ: نَزَلَتْ فِي عَذَابِ الْقَبْرِ، يُقَالُ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ فَيَقُولُ رَبِّيَ اللَّهُ وَنَبِيِّي مُحَمَّدٌ} (أخرجه البخاري: ١٣٠٣، ومسلم: ٧٣٩٩).**

واتە: لە گێڕدراوەیەکی دیکەدا لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە کە ئەو ئایەتەی خوێندەوە فەرمووی: ئەوە لە بارەی سزای گۆڕەوە هاتۆتە خوار، بەو مرۆڤە دەگوترێ: پەروەردگارت کێیە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەردگارم خوایەو، موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەرمە.

**٣)- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ، وَإِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ، أَتَاهُ مَلَكَانِ، فَيُقْعِدَانِهِ فَيَقُولَانِ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هذَا الرَّجُلِ (لِمُحَمَّدٍ ﷺ) فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ، فَيُقَالُ لَهُ: انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ، قَدْ أَبْدَلَكَ اللهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الْجَنَّةِ فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا، قَالَ قَتَادَةُ، وَذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَى حَدِيثِ أَنَس، قَالَ: وَأَمَّا الْمُنَافِقُ وَالْكَافِرُ فَيُقَالُ لَهُ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، كُنْتُ أَقُولُ مَا يَقُولُ النَّاسُ، فَيُقَالُ: لَا دَرَيْتَ وَلَا تَلَيْتَ، وَيُضْرَبُ بِمَطَارِقَ مِنْ حَدِيدٍ ضَرْبَةً فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَسْمَعُهَا مَنْ يَلِيهِ غَيْرَ الثَّقَلَيْنِ} (أخرجه البخاري: ١٣٠٨، ومسلم: ٧٣٩٥).**

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـک لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ دەگێڕێتـەوە، کـە فەرموویەتـی: بێگومـان بەنـدە دوای ئـەوەی دەخرێتـە گۆڕەکەیـەوەو، هاوەڵەکانـی، (ئەوانـەی ناشـتوویانە، بـە خاکییـان سـپاردوە)، دەڕۆن، گوێـی لـە دەنگـی پێڵاوەکانیان دەبـێ کاتێـک دەڕۆن، دوو فریشـتەی دێنـە لا، دایدەنیشـێنن، پێـی دەڵێـن: لـە بـارەی ئـەو پیـاوەوە (موحەممـەد ﷺ) چیـت دەگـوت؟ کەسـێک بـڕوادار بێ دەڵێ: شـایەتیی دەدەم کـە (موحەممـەد) بەنـدەی خـواو پێغەمبـەری خوایـە، پێـی دەگوتـرێ: دە تەماشـای شـوێنەکەت بکـە لـە ئاگردا، ئەگـەر بێبڕوابـای ئـەوە شـوێنت بـوو، ئێسـتا خـوا نشـینگەیەکی دیکـەی لـە بەهەشـت بـۆ تـۆ دانـاوە لـە جیاتـی ئـەوە، تەماشـا دەکات هەردووکیـان دەبینـێ، (هـەم شـوێنەکەی لـە دۆزەخـدا، ئەگـەر کافـر بووایـەو، هـەم شـوێنەکەی لـە بەهەشـتدا) (قەتـادە گوتوویەتـی: بۆمـان باسـکراوە: کـە گۆڕەکـەی بـۆ فـراوان دەکـرێ، دوایـی گەڕایـەوە بـۆ قسـەکەی ئەنـەس و گوتـی:) بـەڵام ئـەوەی مونافیـق یاخـود کافـر بـێ، پێیدەگوتـرێ: لـە بـارەی ئـەو پیـاوەوە چیـت دەگـوت؟ دەڵـێ: نازانـم، خەڵـک شـتێکی دەگـوت، منیـش دەمگـوت، پێـی دەگوتـرێ: نـە زانیوتـەو، نـە شـوێنیکەوتووی، (شـوێنکەوتووی پێغەمبەرنـی ﷺ)، ئنجا بـە گورزێکـی ئاسـن لێـی دەدرێ، چریکـەو هاوارێـک دەکات: هەرچـی لێـی نزیکـە (لـە دروسـتکراوان) هەموویـان دەیبیسـتن، جگـە لـە مـرۆڤ و جنـد.

**٤)- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالعَشِيِّ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَيُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ} (أخرجه البخاري: ٦١٥٠، ومسلم: ٢٨٦٦، والترمذي: ١٠٧٢، وابن ماجه: ٤٢٧٠).**

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێ) هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکێکتان کە مرد، شوێنەکەی پێشان دەدرێ، بەیانیان و ئێواران، {وەک چۆن خوا دەربارەی دارو دەستەی فیرعەون فەرمووی: ﴿ غُدُوًّا وَعَشِيًّا ﴾، وا دیارە سزای بەرزەخ و نیعمەتی بەرزەخ بەردەوام نیە، بەیانیان و ئێوارانە}، ئەگەر بەهەشتیی بێ، ئەوە بەهەشتییەو، ئەگەر دۆزەخیی بێ، ئەوە دۆزەخییە، پێی دەگوترێ: ئەوە شوێنەکەتە، تاکو ڕۆژی قیامەت خوا زیندووت دەکاتەوە.

ئنجا وەک لە فەرمایشتیی دیکەدا هاتوە، ئەوەی کە بەهەشتیی بێ، بۆن و بەرامەی نازو نیعمەت و ئەو بەهەشتەی خۆی بۆ دێ و، ئەوەی کە دۆزەخییش بێ، ئاگرو ناخوشیی و بڵێسەو ئەو شوێنە ناخۆشەی خۆی، بۆ دێ.

**٥)-** فەرمایشتێکی دیکە لەو بارەوە، ئەوەیە کە ئێمە هەمیشە لە تەحیاتیی نوێژیش دا دەیخوێنین: **{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا تَشَهَّدَ أَحَدُكُمْ، فَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ أَرْبَعٍ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ»} (أخرجه أحمد: ٧٢٣٦، ومسلم برقم ٥٨٨، وأبو داود: ٩٨٣).**

واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان شایەتمانی خوێند، ئەوە با پەنا بە خوا بگرێ لە چوار شتان، دەیفەرموو: ئەی خوایە! من پەنا بە تۆ دەگرم لە سزای دۆزەخ و، لە سزای گۆڕو، لە بەڵای ژیان و مردن و، لە بەڵاو ئاژاوەی مەسیحی دەججاڵ.

**٦)- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِقَبْرَيْنِ، فَقَالَ: إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ؛ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَبْرِى مِنَ الْبَوْلِ؛ وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ، فَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً، قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ! لِمَ فَعَلْتَ هذَا؟ قَالَ: لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا} (أخرجه ابن أبي شيبة: ١٣٠٤، وأحمد: ١٩٨٠، والبخاري: ٢١٥، ومسلم: ٢٩٢، وأبو داود: ٢٠، والترمذي برقم ٧٠، والنسائي: ٢٠٦٩، وابن ماجه: ٣٤٧).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە لای دوو گۆڕاندا تێپەڕی، فەرمووی: ئەو دووانە ئەشکەنجەو سزا دەدرێن، لەسەر شتێکی گەورەش سزا نادرێن، یەکیان عادەتی وابوو خۆی لە میز پاک نەدەکردەوە، ئەوی دیکەشیان قسەی دەهێناو دەبردو، (دووزمانیی دەکرد)، دوایی لقە درەختێکی تەڕی هێنا، (کە ژیانی تێدا بوو)، شکاندی و لەسەر هەر کامێک لەو دوو گۆڕە، پارچەیەکی چەقاند، (کاتەکەی وا بووە، بگونجێ بڕوێنەوە)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆچی واتکرد؟ فەرمووی: ئەگەر وشک نەبن، ڕەنگە لە سزایەکەیان کەم بکاتەوە.

**٧)- {عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رضي الله عنهُ، قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ، وَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: «اسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ، وَسَلُوا لَهُ التَّثْبِيتَ، فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ»} (أخرجه أبو داود: ٣٢٢١، والحاكم: ١٣٧٢، وقال: صحيح الإسناد)،** واتە: عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کە لە بەخاک سپاردنی مردوویەک دەبۆوە، لەسەری دەوەستا، (لەسەر گۆڕەکەی)و، دەیفەرموو: داوای لێبوردن بۆ برایەکەتان بکەن و، داوای بۆ بکەن، خوا بیچەسپێنێ، (زمانی بچەسپێنێ و، وەڵامیداتەوە)، چونکە ئێستا پرسیاری لێدەکرێ.

**٨)-** عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، لێی گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: **{نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ﴿١٥٤﴾﴾البقرة، فِي قَتْلى بدرٍ، وقتل مِنَ المسْلمين أَرْبَعَةَ عَشَرَ رَجُلاً، سِتَّة مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَثَمَانِيَة مِنَ الأَنْصَارِ، وَكَانُوا يَقُولُونَ: مَاتَ فُلاَنٌ، مَاتَ فُلاَنٌ، فَنَهَى الله أَن يُقَالَ فِيهِم: إِنَّهُم مَاتُوا}**[1].

---

(١) أسباب النزول، للنيسا بوري، ص٣٠، والتفسير الكبير ج٤، ص١٣٢.

واتە: ئەم ئایەتەی سوورەتەی بەقەڕە، کە دەفەرموێ: ئەوانەی لە ڕێی خوادا کوژراون، پێیان مەڵێن: مردوون، لە بارەی کوژراوەکانی بەدرەوە هاتە خوار، کە ئەو ڕۆژە چوارده (١٤) پیاو لە مسوڵمانان کوژران، شەشیان لە کۆچکەران و، هەشتیشیان لە پشتیوانان، ئنجا خەڵکەکە دەیانگوت: فلانکەس مردو، فلانکەس مرد، خواش لێی قەدەغە کردن بڵێن: ئەوانە مردوون.

لە بارەی سێ ئایەتەکەی سوورەتی (**آل عمران**)ەوە، ئەم دەقە هاتوە:

**٩- {عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: سَأَلْنَا عَبْدَ اللَّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾آل عمران، قَالَ أَمَا إِنَّا قَدْ سَأَلْنَا عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: «أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ، لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ، تَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ، ثُمَّ تَأْوِي إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ، فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمُ اطِّلَاعَةً، فَقَالَ: هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا؟ قَالُوا: أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي، وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا، فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا، قَالُوا: يَا رَبِّ نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى، فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ، تُرِكُوا»} (أخرجه مسلم: ١٨٨٧، والترمذي: ٣٠١١، وقال: حسن صحيح).**

واتە: مەسرووق دەڵێ: پرسیارمان کرد لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) لە بارەی ئەم ئایەتانەوە: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ... ﴾آل عمران، (عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود) گوتی: ئاگاداربن! ئێمە لەو بارەوە پرسیمان، (واتە: لە پێغەمبەر ﷺ)، ئەویش ئاوا وەڵامی دایەوە، فەرمووی: ڕووحەکانیان، (واتە: ڕووحی ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەکوژرێن)، لە نێو کەلەشی باڵندەی سەوزدان، (واتە: لە جیهانی بەرزەخدا، جەستەیەکیان بۆ دروست دەکرێ، وەک جەستەی باڵندە، لەبەر ئەوەی کە توانای فڕین و جموجۆڵیان هەیە، نەک وەک ئەو جەستە خاکییەی ئێرە کە بە پێیان بڕوات)، هێلانەو شوێنیان هەن بە عەرشی خواوە هەڵواسراون و، لە هەر شوێنێک بیانەوێ لە بەهەشتدا چلاوچڵ دەکەن، (دێن و دەچن)، دوایی دێنەوە نێو ئەو قەندیلانەو،

تێیانـدا دەسرەون، پەروەردگاریـان سـەرنجێکی دان، پێـی فەرمـوون: ئـارەزووی هیـچ ناکـەن؟ گوتیـان: ئنجـا ئـارەزووی چـی بکەیـن! کـە ئێمـە لـە بەهەشـتدا بـۆ هـەر شـوێنێک بمانـەوێ دێیـن و دەچیـن، (دەگەڕێیـن)، خـوا سـێ جـاران ئـەوەی لەگـەڵ کـردن، (خـوا سـێ جـاران هـەر دەیفەرمـوو: ئـارەزووی هیـچ شـتێک ناکـەن؟)، کاتێـک زانییـان وازیـان لێناهێـنرێ، دەبـێ داوای شـتێک هـەر بکـەن، گوتیـان: پەروەردگارمـان! داوات لـێ دەکەیـن، کـە ڕووحەکانمـان بگێڕیـەوە بـۆ نێـو جەستەکانمان، تاکـو جارێکـی دیکـە لـە ڕێـی تـۆدا بکوژرێیـن، کاتێـک خـوا زانـی: هیـچ ئیـش و پێویسـتییان نیـە، ئنجا وازیـان لێهێـنرا، (چونکـە ئـەوە کـە بگەڕێنـەوە بـۆ دنیـا، شـتێکی مەحاڵـە).

ئەمـە بـە نسـبەت بڕگـەی دووەمـەوە بەڵگەکانـی: (هەبوونـی ژیانـی بـەرزەخ و قۆناغـی بـەرزەخ)، بۆیـەش زیاتـر تیشـکم خسـتە سـەر، چونکـە هەندێـک خەڵکـی سـەرگەردان و سەرلێشـواو هـەن کـە نکووڵیـی دەکـەن لـە ژیانـی قۆناغـی بـەرزەخ، کـە بێگومـان، لـە ژێـر کاریگەریـی خەڵکـی عەلمانیـی و مولحیـدو، کەسانێک دان، کـە تەنیـا ئـەوەی بـە چـاوی سـەریان ببینـن، دانـی پێـدا دێنـن، کـە لـە ڕاسـتییدا ئـەوەش تەعبیـر دەکات لـە دواکەوتوویەتیـی فیکریـی ئـەو جـۆرە کەسـانە، چونکـە ئەگـەر بـەو پێیـە بـێ، دەبـێ دان بـە خـودی ماددەشـدا نەهێنـن، چونکـە خشـتی یەکەمـی مـاددەش، گەردیلـە کـە سـێ پێکهاتـەی سـەرەکییەکەی هـەن: پڕۆتـۆن و نیوتـڕۆن لـە نێوکـداو، ئەلیکـترۆن لـە سـوڕگەدا دەخولێتـەوە بـە دەوری نێوکـدا، ئەوانیـش هـەر کامێکیـان لـە چەنـد پێکهاتەیـەک کـە کوارکەکانـن پێکدێـن، کـە هیـچ کام لەوانـە نابینرێـن و، تەنیـا شـوێنەوارەکانیان دەزانیـن، ئنجـا ئەگـەر ئێمـە سـووربین لەسـەر ئـەوەی هـەر شـتێک بـە هەسـتەوەرەکان بۆمـان نەگیـرێ و، بەرهەسـت نەبـێ، دانـی پێدانەهێنـن، دەبـێ دان بـە خـودی مـاددەش دانەهێنـن، چ جـای سـزاو نیعمەتـی دوای جیابوونـەوەی ڕووح لـە جەسـتە، کـە لـە قورئانـدا باسـکراوەو، لە فەرمایشـتەکان دا، بـە ناوونیشـانی: سـزاو نیعمەتـی گـۆڕ هاتـوە، ئەگەرنـا مـەرج نیـە، ئـەو سـزاو نیعمەتـە لـە خـودی ئـەو گـۆڕەدا بـێ، ئەوەتـا فەرمایشـتەکان ئـەوە دەگەیەنـن و، ئایەتەکانیـش ئـەوە دەگەیەنـن، کـە ڕووحـی چاکـەکاران لـە بەهەشـتدا، لـە عالەمـی

بەرزەخـدا، لـە نێـو چەنـد کەلـەش و جەسـتەی بەرزەخیـی دان، هـەروەک هـی خراپەکارانیـش لـە دۆزەخ دا، ئەویـش دیسـان لـە چەنـد جەسـتەیەکی بەرزەخییـدا.

## ٣)- چۆنیەتیی ژیانی بەرزەخ:

ئەم بابەتە لە دوو خاڵدا تیشکی دەخەینە سەر:

**یەکەم:** دەتوانین بڵێین: جیهانی بەرزەخ تا ڕادەیەکی زۆر وەک حاڵەتی خەوتن وایە، خەوتن ڕووح تێیدا تاکو ڕاددەیەک ئازاد دەبێ، دەتوانین وەک بەڵگەهێنانەوە بۆ ئەوە سەرنجی ئەم ئایەتە بدەین: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾الزمر.

واتـە: خـوا نەفسـەکان وەردەگـرێ، لـە کاتـی مردنیانـدا، (هـەر کەسـێک کـە دەمـرێ، ڕووحـی لـە جەسـتەی جیادەبێتـەوە، خـوا وەریدەگـرێ)، ئـەوەش کـە نەمردبـێ لـە کاتـی خەوتنیـدا (ڕووحـەکان وەردەگـرێ)، ئنجـا ئـەوەی بڕیـاری مردنـی لەسـەر دابـێ، (دوای ئـەوەی خەوتـووە و ڕووحەکـەی وەرگیـراوە، خـوا ڕووحەکـە ناگێڕێتـەوە بـۆ نێـو جەسـتەکەی و)، دەیانهێڵێتـەوە، گلیـان دەداتـەوە (لـە بەرزەخـدا بەخەبـەر دێ)، ئەوانـی دیکـەش دەگێڕێتـەوە بـۆ نێـو جەسـتەکەیان، تاکـو کاتێکـی دیارییکـراو، (ئەوانیـش دوایـی هـەر دەمـرن)، لـەوەدا نیشـانە هـەن، بـۆ کۆمەڵێـک بیربکەنـەوە.

کەواتـە: ژیانـی بـەرزەخ لەگـەڵ حاڵەتـی خەوتنـدا، زۆر لێـک نیزیکـن، وەک (**أبـو حامـد الغـزالي**)، لـە (**إحيـاء علـوم الديـن**)دا بـاس دەکات، دەڵـێ: دوو کـەس لـە پەنـای تـۆ خەوتـوون، یەکێکیـان خەبـەری دەبێـتەوە بـە ڕووێکـی خـۆش و گەش و دڵخۆشـیی، لێـی دەپرسـن چـی بـوو؟ دەڵـێ: لـە خەونـم دا لـە باخێکـدا بـووم، لـە حاڵەتـی زۆر خۆشـدا بـووم، خۆزگـە خەبـەرم نەبووبایـەوە، ئنجـا ئـەو کەسـە، ئەگـەر بێـت و ئـەو

حاڵەتـە خۆشـییەی بـەردەوام بـێ، ئـەوە وەک نیعمەتـی جیهانـی بـەرزەخ و وەک قۆناغـی بـەرزەخ وایـە، ئـەوی دیکەشـیان خەبـەری دەبێتـەوە بـە شـپرزەیی و بـە ئاڵۆزیـی، دەڵێـن: چـی بـوو؟ دەڵـێ: خەونێکـی زۆر ناخۆشـم بینـی، زۆر ناڕەحـەت بـووم، ئنجـا: ئەگـەر ئەویـش خەبـەری نەبووبایـەوە، هـەر لەسـەر حاڵەتەکـەی بـەردەوام بووایـە، وەک سـزاو ناڕەحەتیـی قۆناغـی بـەرزەخ دەبـوو، کـە تەماشـای جەستەشـیان دەکـەی، هیچیـان پێـوە دیـار نیـە!

کەواتـە: نیعمـەت و سـزای بـەرزەخ بـۆ ڕووحەکانـە، وەک چـۆن دوو کـەس کـە، لـە حاڵەتـی خەوتنـدان، یەکێکیـان لـە نیعمـەت دایـە، ئـەوی دیکەیـان لـە ناڕەحەتیـی و لـە ئـازار دایـەو، هیـچ شـوێنەواریش بـە جەسـتەکانیانەوە دیـار نیـە.

ئنجـا لـە ڕاسـتییدا ڕووح دوای ئـەوەی لـە جەسـتەدا دێتـەدەر، دەچێتـە نێـو قاڵبێکـی دیکـەی پەنهانـەوە، کـە بـۆ ئێمـە پەنهانـە، لـە جـۆرە ماددەیەکـە ئێمـە نایبینیـن، وەک چـۆن جینـن، لـە ئاگـر دروسـت کـراون و، ئێمـە نایانبینیـن و، فریشـتە لـە ڕووناکیـی دروسـتکراون و ئێمـە نایانبینیـن، ئـەو قاڵـب و جەسـتەیەش گونجـاوە لەگـەڵ قۆناغـی بـەرزەخ دا، ئایەتەکانـی لـە قوڕئـان و فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەر ﷺ زۆر بـە ڕوونیـی ئـەوە دەگەیەنـن.

هەندێـک کـەس گوتوویانـە: حاڵەتـی بـەرزەخ لـە شـێوەی دۆناودۆنـی هیندۆسـییەکان (**تناسـخ الأرواح**) دایـە، بـەڵام، نـا چونکـە ئـەوان دەڵێـن: هـەر لـە دنیـادا کەسـێک کـە دەمـرێ، ئەگـەر چـاک بووبـێ، ڕووحەکـەی دەچێتـە بـەر ژیاندارێکـی بـاش و، ئەگـەر خـراپ بووبـێ، ڕووحەکـەی دەچێتـە بـەر ژیاندارێکـی خـراپ، بـەڵام ئـەوەی ئیسـلام دەیڵـێ جیایـەو، لـە دنیـادا نیـە، بەڵکـو لـە قۆناغـی بـەرزەخ دایـە، کـە ئێمـە هیـچ ئاگاداریـمان لێـی نیـە، ئنجـا ئـەوەی ئـەوان دەیڵێـن: ئەفسـانەیەو، هیـچ نیـە، ڕەنگـە هـەر ئـەو قۆناغـی بەرزەخـەی ئەهلـی ئیسـلامیش بـێ، بـە هەڵـەو پەڵـەوە، بـەو شـێوەیە تەعبیریـان لێکـردوە.

**دووەم:** خاڵێکی دیکە بۆ نیزیکخستنەوەی قۆناغی بەرزەخ لە عەقڵ، ئەوەیە کە جاری وایە ئینسان خەونێک دەبینێ و، شتەکەش دێتە دی، یان خەونێک دەبینێ، خۆش یان ناخۆش، دواییش شوێنەواری پێوە دیار دەبێ، یاخود خەونێک دەبینێ، بەڵایەکی بەسەر دێ، یان شتێکی خۆشیی بۆ دەبێ، دوایی شوێنەواری پێوە دیار دەبێ، حاڵەتی وا من بۆ خۆم بینیومە، خەڵکی دیکەش شتی وای بینیوە، بگرە خەڵک هەبووە نەخۆشیی و گرفتێکی هەبووە، لە حاڵەتی خەوتندا دوعای بۆ کراوە، یان کەسێک دەستی پێدا هێناوە، دوایی هەڵساوە، تەماشای کردوە ئەو گرفت و نەخۆشییەی نەماوە، کە ئەوەش بۆ ئەو کەسەی لێی ڕوودادوە، بۆ خۆی دڵنیایی هەیە، بەڵام بۆ خەڵکی دیکە ناتوانێ ئەو یەقینەیان بۆ پەیدا بکات، چونکە ئەوە ئەزموونێکی خوددیی (تجربة ذاتية)یە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو حاڵەتانە زۆرن.

## ٤)- ئیشکالێك و وەڵامەکەی:

هەندێ دەپرسن: ئەگەر قۆناغی بەرزەخ هەیە، بۆچی بابای بێبڕوا دەڵێ: زۆر کەم ماوینەوە؟ با تەماشای ئەم ئایەتانە بکەین:

أ- خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍۢ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَـٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ۖ فَهَـٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَـٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾﴾ الروم.

واتە: ڕۆژێک کە ئاخیر زەمان دێ، تاوانبارەکان سوێند دەخۆن، تەنیا یەک سەعات ماوینەوە، کاتی خۆشی هەر ئاوا لادەدران لە ڕێی ڕاست، (ئێستاش لادراون)، بەڵام ئەوانەی زانیاریی و ئیمانیان پێدراوە دەڵێن: لە کتێبی خوادا، تاکو ڕۆژی زیندووکرانەوە، ماونەوە، ئەمڕۆش ڕۆژی زیندووکرانەوەیە، بەڵام کاتی خۆی ئێوە نەتاندەزانی (کە ڕۆژی زیندووکرانەوە هەیە).

**ب)-** هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّورِ وَنَحْشُرُ الْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَافَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾﴾ طه.

واتە: ئەو ڕۆژەی کە فوو بە کەڕەنادا دەکرێ و، ئێمە بە ڕەنگی شین (یان بە چاوی شین) هەڵگەڕاو، تاوانبارەکان کۆدەکەینەوە، لە بەینی خۆیاندا بە سرکە (نهێنیی) قسە دەکەن، دەڵێن: تەنیا دە (١٠) شەوان ماونەوە، ئێمە زاناترین بەوەی ئەوان دەیڵێن، کاتێک ئەوەیان کە لە هەموویان ڕێی ڕاستری گرتوە، دەڵێ: تەنیا یەک ڕۆژ ماونەوە.

هەروەها لە شوێنی دیکەشدا هەر هاتوە، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: بەیانییەک یان ئێوارەیەک ماونەوە: ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَاهَا ﴿٤٦﴾﴾ النازعات.

ئنجا ئایا ئەمە چۆنە، ئەگەر قۆناغی بەرزەخ هەیەو، ئەوانە ئەو هەموو ژیانە لە بەرزەخ دا دەگوزەرێنن، بۆچی دوایی دەڵێن: سەعاتێک ماونەوە، یان بەیانیی و ئێوارەیەک، یان دە شەو؟!

وەڵامەکەی ئاوایە:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ڕۆژی دوایی زۆر دەخایەنێ و، ڕووداوەکانی کاتی زۆریان دەوێ و، ئەهلی دنیا ژیانی بەرزەخ و دنیایان لە چاو ئەوێ زۆر کەم و کورت دێتەوە بەرچاو، هەم ژیانی دنیاو، هەم قۆناغی بەرزەخیش، چونکە لە ڕۆژی دوایی دا، ئەوەی کە وەردەگیرێ و، بۆ ئێمە دێتە بەرچاو، ئەوەیە کە کات دەوەستێ، وەک چۆن بە پێی بیردۆزەی ڕێژەیی (**نظرية النسبية**)ی ئەنیشتاین دەڵێ: ئەگەر شتێک بە خێرایی، تیشک کە (٣٠٠،٠٠٠)، کیلۆمەتر لە چرکەیەک دا دەبڕێ، بڕوا، کات دەوەستێ، یانی: ئەگەر ڕۆکێتێک هەڵدەین، بە خێرایی تیشک بڕوا، دوای سەد (١٠٠) ساڵ کە دێتەوە بۆ سەر زەوی، ئەوانەی کە لە

نێو ڕۆکێتەکە، دەبینین لەسەر زەوی سەد (١٠٠) ساڵ تێپەڕ بووە، بەڵام ئەوان وەک تازە چووبن!

بەهەر حاڵ ئەوەش بیردۆزەیەکە.

گرنگ ئەوەیە ئەوەی دێتە بەرچاو، ئەوەیە کە لە بەرزەخ و لە قیامەتیش دا، کات وەک هی سەر زەوی نیەو وەستاوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: بەهەشتییەکان پیرنابن و، لە یەک تەمەندا دەمێننەوە، بۆیە دەبێ لەوێ کات نەڕوا، یان بە جۆرێکی دیکەیە، ئێرە شوێنی تاقیکردنەوەیە، بۆیە کات دەڕوات، قۆناغی منداڵیی هەیە، هەرزەکاریی هەیە، گەنجیی هەیە، کامڵ بوون هەیە، پیریی هەیەو.. هتد، بەڵام لەوێ شوێنی تاقیکردنەوە نیە، بۆیە شێوەیەکی دیکەیە، ئنجا ئەوان کە ئەو کاتە درێژە دەبینن و، ژیانی دنیاو قۆناغی بەرزەخی لەگەڵدا بەراورد دەکەن، هەروەک ڕۆژێک، یان وەک چەند ڕۆژێک، یان وەک چەند سەعاتێک دێتە بەرچاویان.

ئێمە لەوە زیاتر بە پێویستی نازانین ئەو بابەتە بتوێژینەوە، ئەگەرنا ئەو بابەتە لق و پۆپی زۆرن، ئنجا لە ڕاستییدا کەسێک کە بڕوای بە خوا ﷻ بێ، کە دەستەڵاتی بێ سنووری هەیەو، زانیاریی بێ سنووری هەیە، ئنجا خوا ﷻ بۆ خۆی بفەرمووێ: ئەوانەی لە ڕێی خوادا کوژراون مەڵێن: مردوون، بەڵکو بفەرمووێ: بە مردووشیان تێمەگەن، چونکە زیندوون لە لای پەروەردگاریان، بژیویان دەدرێتێ، واتە: ئێستا بژیویان دەدرێتێ و، دڵخۆشیش دەبن بە وانەی لە دوایانەوە دەچن، کاتێک خوا وا بفەرمووێ و، پێغەمبەر ﷺ وا بفەرمووێ، ئەوەی کە ئیماندارو مسوڵمان بێ، دەیسەلمێنێ و بۆی ملکەچ دەبێ، مسوڵمان و نامسوڵمان جیاوازییەکەیان ئەوەیە، کە مسوڵمان، [(**مسلم**) لەسەر کێشی (**مفعل**)ە‌و، (إسم **فاعل**)ە، یانی: ملکەچ)]، ملکەچە بۆ خوا، ئنجا ئەو شتەی کە خوا دەفەرمووێ، با تەواو لە عەقڵیشیەوە نەچێ، یان ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمووێ: تەواو لە عەقڵیشیەوە نەچێ، بەو واتایە نا کە دژی عەقڵ بێ، چونکە دژی عەقڵ نیە،

بەڵام بۆی وەرگیراو (**إستيعاب**) نەکرێ، بەڵام هەر ملکەچە، وەک زانایان گوتوویانە: جاری وایە شەرع شتێک دێنێ کە عەقڵ تێیدا سەرسامە، سەراسیمەیەو، باش بۆی هەزم و ئیستیعاب ناکرێ، بەڵام وەحیی ڕاست و دروستی خوا، هەرگیز شتێک ناهێنێ کە لەگەڵ عەقڵ دا دژ بوەستێ: (**قد يأتي الشرع بمحارات العقول، ولكن لا يأتي بمحالات العقول**).

**مەسەلەی دووەم:**

**لـە ڕۆژی دوایـی دا خـوای دادگـەر سەرزەنشـتی بێبڕوایـان دەکات و، ئەوانیـش دان بـە تاوانـی خۆیـان دادێنـن، بـەڵام داوای چوونـەدەر لـە دۆزەخ دەکـەن و، خواش ﷻ بێدەنگیـان دەکات و، لەسـەر گاڵتەکـردن بـە بـڕواداران سـەرکۆنەیان دەکات و، پێشیان ڕادەگەیەنـێ، کـە ئـەوان (بـڕواداران) ئێسـتا بەختـەوەرو سـەرفرازن:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخْسَـُٔوا۟ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّى جَزَيْتُهُمُ ٱلْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾، خوا پێیان دەفەرموێ: ئایا کاتی خۆی ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێنرانەوە؟ ئەم پرسیار کردنە، پرسیار لێکردنێکی نکووڵییلێکەرانەی سەرزەنشتکەرانەیە، (**إستفهامٌ إنكاري توبيخي**)، یانی: من نکووڵیی دەکەم، کە ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێنرابنەوە! پاشان بە سەرزەنشت کردنەوە دەفەرموێ: ئایا ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێندرانەوە! ئەو ئایەتانەی کە ئەگەر گوێتان بۆ گرتبان، هەموو نهێنییەکانی دنیاو گەردوونتان بۆ ڕوون دەبوونەوە، کەچی ئێوە لە جیاتی ئەوەی پێشوازیی لە ئایەتەکان بکەن و، بە دڵ و گیان وەریان بگرن، بە درۆتان دانان!

٢)- ﴿فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ﴾، کەچی ئێوە بێبڕوابوون بە ئایەتەکان و بە درۆتان دادەنان، واتە: ئایەتەکانی منتان بەسەردا خوێندرانەوە، کە ئەگەر لێی تێگەیبان و

وەرتان گرتبان، تووشی ئەمڕۆ نەدەبوون، بەڵام ئێوە لە جیاتی وەرگرتن و بڕوا پێهێنان، بە درۆتان دانان.

ئەوانە چی دەڵێن؟

٣)- ﴿ قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا ﴾، گوتیان: پەروەردگارمان! بەدبەختیی بەسەرماندا زاڵبوو، (شِقْوَتُنَا)، خوێنراویشەتەوە: (شَقَاوَتُنَا)، واتە: بەدبەختیی و گرفتاریی بەسەر بەختەوەرییمان دا زاڵبوو، یان: بەدبەختیی زەفەری پێبردین و بەسەرماندا زاڵبوو.

٤)- ﴿ وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴾، دانی پێدادەنێن، دەڵێن: ئێمە کۆمەڵێکی گومڕا بووین، دەشگونجا بڵێن: ﴿ وَكُنَّا ضَآلِّينَ ﴾، ئێمە گومڕا بووین، بەڵام ﴿ وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴾، واتە: ئێمە کۆمەڵێک بووین، گومڕایی یەکێک بووە لە خەسڵەت و سیماکانمان کە پێی دەناسراین.

٥)- ﴿ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْهَا ﴾، پەروەردگارمان! دەرمان بێنە لێی، یانی: لە دۆزەخ.

٦)- ﴿ فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴾، ئنجا ئەگەر گەڕاینەوە، بە دڵنیایی ئێمە ستەمکارین، یانی: ئەمجارە تاقیمان بکەوەو، بمانبەوە بۆ دنیایە، لە دۆزەخ دەرمان بێنە، ئەگەر جارێکی دیکە گەڕاینەوە بۆ گوناهو تاوان و کوفرو بێبڕوایی، ئەو کاتە ئێمە بێبڕواو ستەمکارین، واتە: ئێستاش ستەمکارین، بەڵام ئەو کاتە، ستەمکارێکی زۆر تۆخ دەبین، بەڵام ئایا وەڵامی ئەو داوایەیان دەدرێتەوە؟ بێگومان نەخێر.

٧)- ﴿ قَالَ ٱخْسَـُٔواْ فِيهَا ﴾، (خوا) فەرمووی: زەبوون و ڕیسوابن تێیدا، لە دۆزەخ دا.

٨)- ﴿ وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾، مەشمدوێنن، ئەو قسانە چین، خوا سیستمی داناوە، خوا بە یاسا ئەم گەردوونە بەڕێوە دەبات و، هەر شتە لە قۆناغی خۆی دا دەبێ، شتێک کە لە قۆناغێکدا دەبێ، دووبارە نابێتەوە، لە قۆناغی دنیادا ژیانێک بووە، تازە ئەوە تێپەڕیوە، کە قۆناغی ئاخیر زەمان دێتە پێش، جیایە، قۆناغی قیامەت و ڕۆژی دوایی دێتە پێش جیایە، ئێستا ئێوە لە قۆناغێکی دیکە دان، داوای شتێک دەکەن کە دەبوو کاتی خۆی

کردباتانایە، ئنجا خوا هەندێک شتیان دەخاتەوە بیر، لە کردەوە خراپەکانیان کە تووشی ئەمڕۆژەی کردوون و دەفەرموێ:

**٩)-** ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِى يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا ﴾، بە دڵنیایی کۆمەڵێک لە بەندەکانی من دەیانگوت: پەروەردگارمان! بڕوامان هێنا.

**١٠)-** ﴿ فَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَا ﴾، لێمان ببوورەو بەزەییت پێماندا بێتەوە.

**١١)-** ﴿ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، تۆش باشترینی بە بەزەییانی، واتە: ئەوەیان دەخاتەوە بیرو، ئەمە بیرخستنەوەی یەکێک لە کردەوە خراپەکانیانە، کە تووشی ئەو چۆرتمەی کردوون و، بەو مەرەدەی بردوون، ئنجا ئەمە سێ ئامانجمان دەپێکێ:

**أ-** کە بیرخستنەوەی ئەوانە لە دۆزەخ دا.

**ب-** هاو کات بۆ دنیاش هۆشداریی پێدانە، کە ئێستاکە گاڵتە بە بڕواداران دەکەن، ئاگاداربن! کاتێک دێ، ئەوەتان بە چاودا دەرێتەوە.

**ج-** دڵخۆشیشە بۆ بڕواداران، کە بڕوادارینە! ئەهلی کوفر کە گاڵتەتان پێ دەکەن، کاتێک دێ خوا ئەوەیان بەچاودا دەداتەوەو، لەسەر ئەوە تووشی سزاو جەزرەبەی توند دێن، کەواتە: خەم مەخۆن و زۆر دەربەست مەبن و، خۆتان ناڕەحەت مەکەن، بە گاڵتەپێکردن و پێکەنینی ئەوان.

**١٢)-** ﴿ فَٱتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا ﴾، کەچی ئێوە (ئەی بێبڕواینە!) ئەوانتان بە گاڵتەجار گرتبوو، (سِخْرِيًّا)، خوێنراویشەتەوە: (**سُخرياً**)، (**أي: جعلتموهم مَسْخُوراً بهم**)، واتە: ئەوانتان کردبوو بە گاڵتەجار، گاڵتەپێکراو، (سِخْرِيًّا)و، (**سُخرياً**)، هەردووکیان واتە: گاڵتەتان پێدەکردن، بەڵام (**الكسائي**)و (**أبو عبيدة**)، گوتوویانە: خوێندنەوەی (**سُخرياً**)، واتە: ئێوە سۆغرەو بێگارتان پێدەکردن، بەڵام (سِخْرِيًّا)، واتە: گاڵتەتان پێدەکردن.

**١٣)-** ﴿ حَتَّىٰٓ أَنسَوْكُمْ ذِكْرِى ﴾، ئەوەندە ئێوە گاڵتەتان پێدەکردن و، پێیان پێدەکەنین، هەتا یادی منیان لە بیر ئێوە بردبۆوە، واتە: لەبەر سەرقاڵییتان بە گاڵتەپێکردنی ئەوان، ئاگاتان لە من نەمابوو.

١٤)- ﴿ وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ ﴾، ئێوە بەوان پێدەکەنین و، پێتان ڕادەبواردن.

١٥)- ﴿ إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ ﴾، بەڵام من ئەمڕۆ بەهۆی ئەوەوە کە خۆڕاگربوون، پاداشتم داونەوە.

کـە ئەمـە: هاندانـەو زیاتـر خۆڕاگیرکردنـە بـۆ ئەهلـی ئیـمان، لـە بەرانبـەر گاڵتـەو جەفەنـگ و توانـج و پـلاری بێبڕوایـان دا.

١٦)- ﴿ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴾، (أَنَّهُمۡ)، خوێندراویشەتەوە: (إِنَّهُم)، هەردووکیان هاتوون، کە هەردووکیان (أنَّ)و (إنَّ)، بۆ جەختکردنەوەن، بە دڵنیایی هەر ئەوان سەرفرازن، هەر ئەوان بە کام و مراد گەیشتوون، هەر ئەوان بەختەوەری ڕاستەقینەن.

**مەسەلەی سێیەم:**

**پرسیارکردنی خوا لە بێبڕوایان کە چەند سالان لەسەر زەوی مانەوەو، وەڵامدانەوەیان کە کەمێک ماونەوەو، حەواڵەکردنیان بە ژمێرەران و حیساب ڕاگران و، پشتڕاستکردنەوەی خوا بۆ وەڵامەکەیان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ١١٢ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ١١٣ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ١١٤ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴾، (خوا ﷻ) فەرمووی: ژمارەی چەند سالان لە (ژیانی) سەر زەویدا ماونەوە؟ بە سیاق دەزانرێ کە خوا ﷻ بەو شێوەیە دەیاندوێنێ، هەڵبەتە مەرج نیە خوا ڕاستەخۆ بیاندوێنێ، لە ڕێی فریشتەکانەوە دەیاندوێنێ، واتە: چەندتان پێچووە؟

٢)- ﴿ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ ﴾، گوتیان: ڕۆژێک یان بەشێک لە ڕۆژێک ماوینەوە.

٣)- ﴿ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ﴾، لە ژمێرەران بپرسە، لە حیساب ڕاگران بپرسە، واتە: ئێمە دڵنیانین داخۆ چەند بووە؟

٤)- ﴿ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا ﴾، (خوا) فەرمووی: (وەک خۆتان گومانتان بردوە هەر وایە)، تەنیا کەمێک ماونەوە، (إِن لَّبِثۡتُمۡ): (مَا لَبِثْتم إلاَّ قَلِيلاً)، جگە لە کەمێک نەماونەوە لە ژیانی سەر زەوی دا، مانەوەتان ماوەیەکی کەم بوو.

٥)- ﴿ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴾، ئەگەر ئێوە دەتانزانی، وەڵامی ئەگەر (لَّوۡ)، قرتێنراوە، واتە: ئەگەر دەتانزانی، کە لە دوای ئەو ژیانە کەم و کورتەی دنیا، ئەم ڕۆژە چاوەڕێتان دەکات، هەڵوێستتان بەو شێوەیە نەدەبوو، ئەمەش بە تەئکید جارێکی دیکە، بۆ هۆشداریی پێدان و وریاکردنەوەی هەموو لایەکە، هی مرۆڤەکان بە گشتیی، چ کافرانی

خراپەکار، چ ئیماندارانی چاکەکار، کە ئەم ژیانە ژیانێکی کەم و کورتە، ژیانێکی زوو تێپەڕە، وریابن چۆنی دەگوزەرێنن، وریابن چۆنی بەڕێدەکەن، لەسەر پێنج و دوو ڕۆژێکی دنیایی، خۆتان شەرمەزارو ڕوو زەردی لای خوا مەکەن.

## مەسەلەی چوارەم:

**نکووڵیی کردنی خوا ﷻ کە مرۆڤی بەهەوەنتەو بێ حیکمەت دروستکردبن و، نەگەڕێنەوە لای بۆ سزاو پاداشت، بە بەڵگەی بەرزیی خوای حوکمڕانی هەق و خاوەنی بوونی بارەگای بەڕێزی، پاشان هەڕەشەکردنی لە هاوبەشدانەران و، فەرمانکردنی بە پێغەمبەر ﷺ، کە داوای لێبوردن و، بەزەیی نواندان لە خوا بکات:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ ﴿١١٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا ﴾، ئایا پێتان وایە ئێوەمان (بێ حیکمەت و، بەهەوەنتە)، بە پووچ و، بێ ئامانج دروستکردوە! ئەم پرسیارکردنە، پرسیارکردنێکی دانپێپێداهێنان و سەرزەنشت کردن (تقرير وتوبيخ)ە، چونکە ئەوان کە بڕوا بە زیندووبوونەوە ناکەن، مانای وایە بە پووچ خوڵقێنراون، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئێوە کە دان بەوەدا ناهێنن کە بۆیە خوڵقێنرابن، سزاو پاداشت هەبێ، مانای وایە دەڵێن: بە پووچ و بێ حیکمەت خوڵقێنراون، ئنجا ئایا ئێمە ئێوەمان بە پووچ و بێ حیکمەت و بەهەوەنتەو بێ ئامانج دروستکردوە! (عَبَثًا )، (العَبَثُ: العَمَلُ الَّذِي لاَ نَفْعَ فِيهِ)، (عبث)

هەر کردەوەیەکە سوودی نەبێ، هەروەها (**عبث**)، یانی: شتی پووچ و، بێ حیکمەت، کە ئامانجێکی لە پشتەوە نەبێ.

٢)- ﴿ وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾، ئایا پێتان وایە ئێوە بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە! (لَا تُرْجَعُونَ)، خوێندراویشتەوە: (**لا تَرجِعون**)، (لَا تُرْجَعُونَ)، ناگێڕدرێنەوە، (**لا تَرجِعون**)، ناگەڕێنەوە.

٣)- ﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴾، بەرزیی بۆ خوای حوکمڕانی هەق، (**التعالي: مبالغة في العلو**)، (**تعالي**)، زێدەڕۆیی کردنە لە بەرزیی دا، واتە: خوای حوکمڕانی هەق، زۆر لەوە بەرزترە کە مرۆڤەکان هەروەها جینن، بە پووچ و بێ ئامانج بخوڵقێنێ، بە هەوەنتە بیانخوڵقێنێ، دروستیان بکات و دوایی نەگەڕێنەوەو نەگێڕدرێنەوە بۆ لای خۆی، تاکو لێیان بپرسێ: ژیانی دنیایان چۆن گوزەراند؟ ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، خاوەنی بارەگای مەزنە، واتە:

١- خوایەتیی خوا ﷻ.

٢- حوکمڕانیەتیی و دەسترۆیشتوویەتیی خوا.

٣- هەقیی خوا ﷻ.

٤- تەنیا پەرستراویەتیی خوا ﷻ.

٥- خاوەنی بارەگای پڕ ڕێزو حورمەت بوونی خوا.

ئەمانە هەر پێنجیان نەگونجاون لەگەڵ ئەوەدا کە خوا مرۆڤەکان و جیننەکانی بە پووچ دروست کردبێ و، نەیانگێڕێتەوە بۆ لای خۆی و، سزاو پاداشتیان لەگەڵدا بەکارنەهێنێ، کەواتە: خوا ﷻ لێرەدا کە ئەو پرسیارە سەرزەنشتکەرانەیەو، نکووڵیلێکەرانەیان لێ دەکات، چەند بەڵگەیەک دێنێتەوە لەسەر ئەوەی ئەو بۆچوونەی ئێوە، ئەو پێوابوونەی ئێوە، پووچ و هەڵەو بێ بنەمایە، (أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا)؟، ئایا پێتان

وایە، خەیاڵتان وایەو، گومانتان وایە کە ئێوەمان بە پووچ خوڵقاندوەو، بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە؟ چەند بەڵگەیەک لەسەر پووچیی ئەوە دێنێتەوە:

١- ( فَتَعَـٰلَى ٱللَّهُ )، خوا بەرزە لەوە، خوایەتی خوا ﷻ، ناگونجێ لەگەڵ ئەوەدا کە دروستکراوەکان بە پووچ بخوڵقێنێ و، لێیان گەڕێ وەک بەرزەکی بانان بۆی دەربچن و، بە چاکەکار نەفەرموێ: چاکت کردو، بە خراپەکار نەفەرموێ: خراپت کرد، بەرزیی خوا ئەوەی لەگەڵدا ناگونجێ، خوایەتیی خوا، ئەوەی لەگەڵدا ناگونجێ، خوا لەوە بەرزترە.

٢- (ٱلْمَلِكُ )، دەستڕۆیشتوو، حوکمڕان.

٣- (ٱلْحَقُّ )، خوا حوکمڕان و دەستڕۆیشتوویکی هەقە.

٤- (لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ)، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، یەکتایی خوا لە پەرستراوێتییدا، دیسان لەگەڵ ئەوەدا ناگونجێ.

٥- (رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ )، خاوەنی بارەگای پڕ ڕێزو حورمەت، یان خاوەنی بارەگای بەخشندە، کەواتە: بە پێنج بەڵگان ئەو بۆچوونەی ئێوە شتێکی پووچەو، لەگەڵ بەرزیی خوای پەروەردگاردا ناگونجێ.

٤)- ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ﴾، هەر کەسێک لەگەڵ خوادا لە پەرستراوێکی دیکە بپاڕێتەوە.

٥)- ﴿ لَا بُرْهَـٰنَ لَهُۥ بِهِۦ ﴾، هیچ بەڵگەیەکی ڕوونی لەسەری نەبێ، ئەمە حاڵە لە: ﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ﴾، واتە: هەر کەسێک لەگەڵ خوادا لە پەرستراوێکی دیکە بپاڕێتەوە، لە حاڵێکدا کە هیچ بەڵگەی نیە لەسەری، بە تەئکید هەر کەسێک جگە لە خوا هەر شتێکی دیکە بە پەرستراو بزانێ و، لێی بپاڕێتەوە، بێ بەڵگەیە و پشت ئەستوور نیە بە هیچ بەڵگەیەک، چونکە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە.

ئنجا هەر کەسێک وا بکات:

٦)- ﴿ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ﴾، ئەوە لێپرسینەوەی لەلای پەروەردگاریەتی، واتە: خوا ﷻ تەنیا خۆی لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکات.

٧)- ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوان، سەرفراز نابن.

ئەگەر تەماشا بکەین، لە سەرەتای سوورەتەکەدا خوا فەرمووی: ﴿ قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝١ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ ۝٢ ﴾.

لێرەشدا: ﴿ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾، بە ڕاستیی بێبڕوایان سەرفراز نین، واتە: ئەم سوورەتە بە سەرفرازیی بڕواداران دەستی پێکردووەو، بە بێمرادیی و بەدبەختیی، کافران کۆتایی پێهات، پێچەوانەی حاڵی ئیمانداران.

٨)- ﴿ وَقُل رَّبِّ ٱغْفِرْ وَٱرْحَمْ ﴾، بڵێ: پەروەردگارم! لێم ببوورەو بەزەییم لەگەڵ دا بنوێنە، بۆ خۆم، یاخود بۆ خۆم و بڕوادارانی شوێنکەوتووم.

٩)- ﴿ وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴾، تۆ باشترینی بە بەزەییانی.

با کۆتایی ئەم دەرسەش، بەو دوو فەرماشتەی پێغەمبەر ﷺ بێنین:

**١)- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسعودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَرَأَ فِي أُذُنِ مُبْتَلًى، فَأَفَاقَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ الله ﷺ: وَمَا قَرَأْتَ فِي أُذُنِهِ؟ قَالَ: قَرَأْتُ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾ المؤمنون، حَتَّى فَرَغَ مِنْ آخِرِ السُّورَةِ، فَقَالَ رَسُولُ الله ﷺ: لَوْ أَنَّ رَجُلاً مُوقِناً قَرَأَهَا عَلَى جَبَلٍ لَزَالَ} (أخرجه أبو يعلى: ٤٠٤٥، قال حسين سليم أسد: إِسْنَادُهُ ضَعيف).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، ڕۆژێک بە لای نەخۆشێکدا تێپەڕی، (مەبەست لە (مُبْتَلًى) کەسێکە جیننی چۆتە جەستەوە، شێت و، حاڵ تێکچوو) شتێکی بە گوێدا خوێند، یەکسەر چاک بوو، بێدار بۆوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: چیت بە گوێدا خوێند؟ گوتی: ئەم ئایەتەم بە گوێدا خوێند: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴾، تاکو سوورەتەکەی تەواو کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر پیاوێکی بە

ڕاستیی بڕوادار، ئەم ئایەتانە لەسەر چیایەک بخوێنی، چیایەکە لە شوێنی خۆی لادەچێ.

**٢)- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِرَجُلٍ وَهُوَ يَعِظُهُ: اغْتَنِمْ خَمْسًا قَبْلَ خَمْسٍ: شَبَابَكَ قَبْلَ هَرَمِكَ، وَصِحَّتَكَ قَبْلَ سَقَمِكَ، وَغِنَاكَ قَبْلَ فَقْرِكَ، وَفَرَاغَكَ قَبْلَ شُغُلِكَ، وَحَيَاتَكَ قَبْلَ مَوْتِكَ} (أخرجه الحاكم: ٧٨٤٦، وقال: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه، تعليق الذهبي في التلخيص: على شرط البخاري ومسلم، والقضاعي في مسند الشهاب: ٧٢٩).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئامۆژگاریی پیاوێکی کرد، پێی فەرموو: لە پێنج شتان بەهرەمەند بە، پێش ئەوەی پێنج شتی پێچەوانەیان بێن: گەنجێتییت پێش پیربوونت، (دەرفەت لە تەمەنی گەنجێتییت وەربگرەو، لێی بەهرەمەند بە، پێش ئەوەی پیرییت بەسەردا بێت، ئەگەرنا دوایی پێت دەگوترێ: (هەتا گەنجی مەستی، ئەگەر پیری سستی، ئەدی کەی خوا دەپەرستی؟)، هەروەها تەندروستییت پێش نەخۆشییت، [کە تەندروستی، بەهرە وەربگرە لە تەمەنی خۆت و لە جەستەی خۆت و تواناکانی خۆت، پێش ئەوەی نەخۆش بی]، هەروەها دەوڵەمەندییت پێش هەژارییت، [هەتا دەوڵەمەندی و دەستت دەڕوا هەوڵبدە بەهرە وەربگری لە توانا ماددییەکانت، پێش ئەوەی هەژاریی و نەداریی و ئاتاجیی یەخەت بگرێ]، هەروەها دەست بەتاڵییت پێش سەرقاڵییت، [کە دەست بەتاڵیی و کاتت بە دەستەوە هەیە، کاتەکەت لێی بەهرەمەند بە، پێش ئەوەی سەرقاڵ بی و بە خۆشیی و ناخۆشیی و بە شەڕو هەراو، بە گێچەڵ، بە کارو کاسبیی]، هەروەها بەهرەمەند بە لە ژیانت پێش مردنت، (ژیانیش هەمووی دەرفەتە).

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێرێ، کە لەو هەموو نیعمەتانە بەهرەمەند دەبن، پێش ئەوەی پێچەوانەکانیان یەخەمان بگرن و،

خوا یارمەتییمان بدات، ئەو ژیانە دنیاییە بە جۆرێک بگوزەرێنین، کە مایەی سەربەرزیی و سەرفرازیی و ڕووسوورییمان بێ، لە خزمەت خوا ﷻ و، پێغەمبەری خوادا ﷺ کاتێک لە ڕۆژی دواییدا بە خزمەتیان دەگەین، بەڵکو پێش ڕۆژی دوایی لە قۆناغ و لە جیهانی بەرزەخدا، بە خزمەتیان دەگەین.

لێرەشدا دێینە کۆتایی تەفسیرکردنی ئەم سوورەتە موبارەکە

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

**مێژووی دوا پێداچوونەوەی:**

**١٢ ربيع الثاني ١٤٤٢ك**

**٢٠٢٠/١١/٢٧ز**

# نێوەڕۆک



## تەفسیری سووڕەتی الحج

## تەفسیری سوورەتی المؤمنون